# ئینسکلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆکێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ

**موسەدەق تۆڤی**

هاریکارێ سەرنڤیسەری
خالد سالح

## بەرگێ شەشێ

## هۆنەر،راگەهاندن،پەروەردە و فێرکرن، ئەندازیارێ، ئابوور،یاسای،بیبلۆگرافیا پەرتووکان

٢٠١٧ ز ٢٧١٧ ک ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك

# باشنڤیسی و باشنڤیسان ل بەهدینان

**دکتور فاخرحەسەن گولی**

## پێشەکی:

نڤیسین ئێك ژ مەزنترین داهێنانێن دیرۆکا مرۆڤایەتییە و ڕەنگە گرنگترینێ وان بئێتە هژمارتن، چونکی د ئێکەمین پێنگاڤدا جهێ خۆ د دیرۆکێ دا پێشچاڤکر، لێکۆلین د ڤی بیاڤیدا کارەکی پڕ دەمکرە و دشێین بێژین کارێن مرۆڤێن بسپوڕن، ئەوێن ڤەکۆلین د دیرۆکا نڤیسین و باشنڤیسیێ دا کرین، پێزانێن بمفا گەهاندینە مرۆڤایەتیێ و زەحمەت و بەرهەمێن وان بوونە جهێ مفاوەرگرتنا حەژێکەرێن نڤیسین و باشنڤیسیێ، ئەڤ کارێ هەنێ کورتە دیرۆکەك ل سەر نڤیسین و باشنڤیسیێ ل دەڤەرا بەهدینان، یانی دڤی کاریدا بزاڤ و پێکول هاتییەکرن کو ئەو تشتێن گرنگ و جهێ پویتەدانێ بهێنە باسکرن، لدەڤەرا بەهدینان وەکو هەمی جیهانا ئیسلامێ ب گشتی و کوردستانێ ب تایبەتی نڤیسین و باشنڤیسیێ رۆلەکێ سەرەکی دگێراند، تایبەتی باشنڤیسیا رێنڤیسیا پیتێن عەرەبی ئەڤ گرنگییە ژی بۆ موسلمان بوونا کوردان دزڤڕیت، مە ئەڤ لێکۆلینە سەر چەند خالێن سەرەکی دابەشکرینە وەك پەیدابوونا نڤیسینێ، کورتە دیرۆکەك ل سەر نڤیسینا بزماری، جۆرێن باشنڤیسینێن عەرەبی، بەرتالێن نڤیسین وباشنڤیسینێ، شێوازێ بکاربرنا نڤیسینێ و ل داویێ کورتە دیرۆکەك ل سەر باشنڤیسێن بەهدینان. هەژی گۆتنێیە کو باراپتر پێزانینێن ڤی بابەتی ژ لایێ مەڤە هاتینە بەرهەڤکرن و نڤیسین، لەورا د گەلەك بەرپەڕان دا ئاماژە ب ژێدەری نەهاتییەکرن تایبەتی کورتە ژیاننامە باشنڤیسێن دهۆکێ و چەندین مژارێن دیتر. بابەتێ مە ب ڤی شێوەیێ ل خوارێ هاتییە خەملاندن.

## پەیدابوونا نڤیسینێ:

بێگۆمان ئێك ژ گرنگترین و ڕەنگە حنێرترین ئافراندنێن مرۆڤان ل هزارەیا سیێ بەری زاینی پەیدابوونا نڤیسینێیە، دیرۆکا پەیدابوونا نڤیسینێ گەلەك ئالۆز و تەڤلیهەڤە، یا دیار ئێکەمین بزاڤ ژ بۆ بدەستڤەئینانا نڤیسینێ؛ گرێدایە ب هەلگرتنا ژمێریارا چالاکیێن کاروبارێن گرێدای ب چاندن و تەرش و تەوالان بوو، نیشانێن ب ڕێیا بازرگانان هاتین بکاربرن کو پشتی هینگی وەك جۆرەکێ نڤیسینێ هاتە بکاربرن، پەیدابوونا نڤیسینێ بۆ وەلاتێ سومەڕ (وەلاتێ ناڤبەرا دوو رووباران/بلاد ما بين النهرين) ئانکو(دیجلە و فورات/مێزوپوتامیا - عیراقێ) دزڤڕیت،

لێ گەلەك ب زەحمەتە ب شێوەیەکێ پشتراستکری بئێتە دیارکرن کو ئێکەمین جار خەلکێ کیژ وەلاتی پەیدابوونا نڤیسینێ بناڤێ خۆ توومارکر؟[1]، ب درێژیا دیرۆکێ هەر ژ دەستپێکێ هەتا نها چەندین جۆرێن نڤیسینێ پەیدابووینە و هەر ئێك ژ وان تایبەتمەندیێن خۆیێن هەین، ئەگەر پێداچوونەکێ د گشت بوارێن نڤیسنێ دا ل کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی بکەین، پێدڤیە ب کورتی سەر  نڤیسینا بزماری ب ئاخڤین و پاشان بابەتێ نڤیسینا ب پیتێن عەرەبی ب درێژی و تێر و تەسەل دیاربکەین.

## کورتییەك دیرۆکی ل سەر نڤیسینا بزماری:

نڤیسینا بزماری نڤیسینەکە کو ژ لایێ نەتەوێن ئاسیا رۆژئاڤا مینا سومریان، ئاشوریان، بابلیان، ئیلامیان و ئیرانییان ل هزارا سیێ بەری زایینی هەتا سەدێ ئێکێ زایینی ژ بۆ نڤیسینێ دهاتە بکارئینان، دڤێ نڤیسینێ دا پیت یان پەیڤێن وێ وەك بزمارێ دکەتنە بەرهەڤدو و دروستکرن، ئەڤ بزمارێن هەنێ ب مەرەما کەتنا رەخ ئێکڤە، چوار کەرەستەیان دادمەزراند و پێکئینان، کەرەستێ پێنجێ ژی یێ هەی کو ژ پێکهاتا دو بزماران ب شێوەیێ گوشە ب دەڤێ ڤەکری بسەمتا راست هاتییە دروستکرن. رەنگە سومەریان نیشانێن نڤیسینا بزماری نێزیکی (٢٩٠٠ پ.ز) ل دەشتێن ژێریا دیجلە و فوڕاتی ب سادەکرنا نڤیسینا وێنەیی چێکرن. هەروەسا ئەکەدیان ب مشەختبوونا سەمتا بابل، ژ سال (٢٤٠٠ پ.ز) نڤیسینا بزمارێ کو نڤیسینا وێنەیی ژ سومەریان فێربوون، لێ نڤیسینا ئەکەدی سومەری وێنەیێ گەلەك ئالۆز هەبوو، ئەڤ نڤیسینە پتر ژ (٢٠٠٠) نیشان و (٢٠٠٠٠) شرۆڤە هەبوون. پشتی هینگێ بابلیان ب کێمکرنا هژمارا نیشانێن نڤیسینا بزماری، ئەو گەهاندنە (٤٠٠) هەتا (٣٥٠) نیشانان. ل سەردەمێ فەرمانرەوییا ئەکەدیان ل بابل، نڤیسینا بزماری بەرەڤ ئاشور و ئیلام چوو، پشتی کێمەکێ ئاسیا بچووك ژی بەرێ خۆ دانە نڤیسینا بزماری. نڤیسینا بزماری ماوەیەکێ کێم پشتی سال (٢٠٠٠ پ.ز) گەهشتە سوریێ ژی، ژ ڤێ رێکێ هیتی ژی فێری نڤیسینا بزماری بوون، ئەڤ نڤیسینە نێزیکی (١٤٠٠ پ.ز) بوو نڤیسینا نێڤدەولەتی، پشکەکا مەزن ژ رۆژئاڤا ئاسیا دادمەزراند، ل هزارا ئێکێ بەری زایینی (ئوراڕتو)وان ژی نڤیسینا بزماری ژ ئاشووریان وەرگرتن و ئیرانیان ل سەدا پێنجێ بەری زایینی بۆ ئێکەمین جار ب فەرمانا (داریوشێ مەزن)، نڤیسینا پارسیێ کەڤن ژ نڤیسینا ئیلامی دروستکرن، نڤیسینا بزماریێ پارسی کەڤن ب ڤێ گۆمانێ کو ژ نڤیسینا ئیلامی هاتییە وەرگرتن، نڤیسینەکا سەربخۆیە و دشێن تنێ وێ نڤیسینا بزماری ئەلیف بائی ناڤکر.[2]

ل کوردستانێ ژی ب گشتی سەدان جهـ و شوینەوارێن نەخشاندی ب نڤیسینا بزماری سومەری، ئاشوری، میدی، هەخامەنشی و... یێن هەین، و دەڤەرا بەهدینان ژی ژ ڤێ چەندێ بێبەهر نینە و چەندین جهێن گرنگ و دیرۆکی ل بەهدینان یێن هەین لێ پرانییا وان ب نڤیسینا بزمارییا ئاشووری یە، ژ وان:

تێکێستا بزماریا خەنەس (١١٠٠ پ.ز) سەر ب دەڤەردارێا شێخان کو ژ هەموویان گرنگتر دئێتە هژمارتن[3]. لبنا نڤیسای (١٢٥٠-١١٠٠پ.ز) ل دەڤەرداریا سێمیل سەردەمێ ئاشووریان[4]، نڤیسینا سەر پەیکەرێ گودیا سەردەمێ سۆمەریان (٢٠٩٠پ.ز) دەڤەرا تلو[5]، هەروەسا نڤیسینا گریکی(ئەغریقی) ژێ ل کوردستانێ هەیە و بۆ سەردەمێ هیلینستی(٣٣٠-١٣٨پ.ز) دزڤریت و ل دەڤەرا شنگالێ هاتییە بدەسڤەئینان[6]، و چەندین تێکێستێن دیتر. ئەڤ پەیکەرێ ل خوارێ‌وەك نموونە، نڤیسینا بزماریە سەر پەیکەرێ گودیا سەردەمێ سۆمەریان (٢٠٩٠ پ.ز) دەڤەرا تلو هاتییە نڤیسین.

## جۆرێن باشنڤیسینێن عەرەبی

باشنڤیسی وەك بالکێشترین و بەرچاڤترین هۆنەر دبەرفرەهییا وەلاتێن موسلمانان دا دئێتە



ل قەلەمدان، دشێین وەك زمانەکێ هۆنەریێ هەڤپشك ژ بۆ تەڤایا مووسلمانان هژمێرین، هۆنەرێ باشنڤیسینێ خودی بهایەکێ تایبەتە ل دەڤ مووسلمانان، چونکی د بنەڕەتدا باشنڤیسی وەك هۆنەرێ بەرچاڤ و مەزنکرینێ ئاخڤتنا سرۆش (وەحیێ )هاتییە زانین، ئەوان نڤیسینا جوان و بالکێش نە ب تنێ دنڤیسینا قورئانا پیرۆز دا بکار دبرن، بەلکو دپرانییا هۆنەران دا بکار دبرن، پشتی ئایینێ ئیسلامێ رۆژ ب رۆژ و بەرە بەرە ل دونیایێ بەلاڤبووی، نڤیسینا ب پیتێن عەرەبی شوونا نڤیسینێن کەڤن گرت و ب ڤی چەندێ نڤیسینەکا ئێکگرتی ل وەلاتێن مووسلمانان چێبوو، هۆکارێ وێ ژی ئەوە بوو کو هۆنەرێن دینێ مینا نیگارکێشانێ و پەیکەرسازی ومۆزیك و..دناڤ مووسلمان دا دچارچوڤەکێ سنوردار دابوو ب ڤێ چەندی گرنگییا زێدە ب باشنڤیسینێ هاتەدان و چەندێن جۆرێن باشنڤیسینێ ل سەرانسەری وەلاتێن مووسلمانان دا پەیدابوون ژ وان باشنڤیسین ب شێوەیێ ل خوارێ نە:

## باشنڤیسیا کۆفی:

ئێکەمین جۆرێ باشنڤیسیا بەربەلاڤ بوو دناڤ مووسلمانان دا، کو بۆ ئێکەمین جار ئەحکام، تابلۆ، قورئانا پیرۆز و... ب وێ هاتینەنڤیسین، پشتی دامەزراندنا باژێرێن کوفە و بەسرا ل دووەمین دەهێکییا وەرارا ئیسلامێ، زانایێن گرانبها پەیدابوون کو گرنگی و پویتەدانەکا زێدە بەرامبەر زمان و باشنڤیسیا عەرەبی هەبوون، (کۆفی)یێ رۆلەکێ کاریگەر دباشنڤیسیا مەککی- مەدینی دا دگێڕاند، باشنڤیسیەکا نوو هاتە درۆستکرن، کو ب ناڤێ باشنڤیسێ کۆفی هاتە ناڤدارکرن، باشنڤیسیا ناڤهاتی ل نیڤا دووێ یا چەرخێ ئێکێ مشەختی گەهشتە بلندترین ئاستێ خۆ و سێ چەرخان بەردەوامی ب خۆڤە گرت، ب بۆرینا دەمی چەندین جۆرێن باشنڤیسێ کۆفی پەیدابوون، ڤەکۆلەرێن باشنڤیسیا کۆفی سەر سێ تەوەران دابەش دکەن و هەر تەوەرەك چەندێن جۆران بخۆڤە دگرن و ب ڤی شێوازێ ل خوارێ نە:

**پشکا ئێکێ،** دابەشکرنا چاڤلێکرێ باشنڤیسێ کۆفی(کوفیێ سانەهی، بەلگدار، گۆلدار، زەخرەفی و ئەندازیاری).

**پشکا دووێ،** دابەشکرنا باشنڤیسێ ژ ئالیێ هشکاتی ونەرماتیێ ڤە(کوفیێ ئیسماعیلی، مەککی، مەدەنی، ئەندەلوسی، شامی، عیراقی، عەبباسی، بەغدادی، موشەعەب، رەیحانی، موحەرەر و میسرێ).

**پشکا سێیێ،** دابەشکرنا باشنڤیسێ ژ لایێ پێدڤی و بکاربرنێ (کوفیێ یادگاری، پەرتووکی)[(٧)]، چونکی باشنڤیسیا کۆفی کەڤنترین و ئێکەمین باشنڤیسییە دیرۆکا ئیسلامی دا ب چەند رێز و بەربەران ب داوی نائیتەڤە، لەوما مە پێکول کر پوختەیا وێ دیاربکەین.

هەژی یە بێژین ل دەڤەا بەهدینان نڤیسینا کۆفی ب گشت جۆرێن خۆڤە ژ لایێ بسپۆرێن باشنڤیسێ ڤە دهاتنە بکاربرن و هەتا نها ب شێوەیەکێ بەرفرەهتر دهێنە بکاربرن، نەمازە

نڤیسینا کۆفی ب شێوازی کوفیێ ئەندازیاری و نوو، گەلەك باشنڤیسێن بەهدینان پێنگاڤ د پێشڤەبرنا نڤیسینا کۆفی دا ئاڤێتینە و هەولێن باش داینە. ئەڤ هەر دو نموونەیێن ل خوارێ ژ نڤیسینێن دو باشنڤیسێن بەهدینان دئێنە هژمارتن:

تابلۆیێ ئێکێ ئایەتا (٥٤و٥٥) سورەتێ (القمر) ژ قورئانا پیرۆز ( إن المتقين في جنات ونهر* في مقعد صدق عند مليك مقتدر) ژ نڤیسینێن باشنڤیس (سەدیق حامد نزارکی)[٨]، یا دووێ پەیڤا (الله) ب شێوازێن جیاواز، ژ نڤیسینێن باشنڤیس دکتور فاخر حەسەن گولی.[٩]



## باشنڤیسیا نەسخ:

باشنڤیسێ ئافراندی ل دەستپێکا سەدێ مشەختی ب رێیا (ئیبن مۆقەللا و یان ئیبن موگەللایێ شیرازی) کو ل سەرەتا باشنڤیسیێ





ژی پایەیا باشنڤیسیا کۆفی هەبوو، نەسخ واتایا کوپیکرن یان بەرنڤیسین ددت، باشنڤیسێ نەسخ د ڕاستی دا ئێکەمین باشنڤیسی بوو کو ژ بۆ تەکۆزبوو کرنا کێماسی و ئالۆزیێن باشنڤیسێ کۆفی و زێدەکرنا ڕێزمانێ هاتە داهێنانکرن. ئەڤ باشنڤیسیە ژ دو نڤیسینێن قیبتی و سیریانی هاتییە وەرگرتن، هەر چەندە هندەك د وێ باوەریێ داینە کو باشنڤیسیا نەسخ بەری ئیبن موقەللا ژی هەبوو، لێ ئەو تشتا ڕاست و ڕاستەقینە ناڤبری ئەڤ باشنڤیسێ نەسخ گەهاندە بلندترین ئاست و جوانیێ. ب شێوەیەکێ گشتی باشنڤیسێ نەسخ ل داویا چەرخێ دوویێ مشەختی گەلەك بەربەلاڤ نەبوو، ئەڤ باشنڤیسیە گرنگیەکا تایبەت یا هەی[١٠]، ژ سەدەیا پێنجێ کۆچی هەتا نها ب پرانی ژ بۆ نڤیسینا قورئانا پیرۆز، پەرتووکێن جۆراجۆر، چاپەمەنییان و... دهات و دئێتە بکارئینان، هۆکارێ وێ ژی ژ بەر کو باشنڤیسێ نەسخ گەلەك سانەهی و ڕەوانە، چونکو ڕێکخستنەکا هووربینانەیەکا تایبەت یاهەی. باشنڤیسێ نەسخ وەکو گشت نڤیسینێن دیتر خۆدی گرنگییەکا تایبەت بوو و هەتا نها بەردەوامە و نڤیسینا نەسخ ل بەهدینان ژ لایێ باشنڤیسێن کەڤن بۆ نڤیسینا پەرتووکان و تایبەتی بۆ نڤێسینا قورئانا پیرۆز دهاتە بکاربرن، بکاربرنا ڤێ نڤیسینێ بۆ خواندنا وێ یا سانەهی دزڤرت، چونکە خواندنا وێ بۆ هەموو تەخ و چینێن جڤاکێ سانەهییە و لەورا ژ هەموو نڤیسێن دیتر پتر دهاتە بکاربرن. باراپتر باشنڤیسێن بەهدینان



پێنگاڤ د پێشڤەبرنا ڤێ نڤیسینێ دا ئاڤێتینە و وەك بسپۆر کارکرینە و کار دکن. ژ وان تابلۆیا باشنڤیس مەسعوود خالد ئیسماعیل یا لژێر ناڤێ (استغفرالله)و چەندی کارێن دیێن هۆنەری.

## باشنڤیسیا ثلث:

ئێك ژ جوانترین باشنڤیسیێن گرنگێن ئیسلامێ دئێتە هژمارتن، باشنڤیسیێ ناڤبری چ پەیوەندیێن ئێکسەر دگەل باشنڤیسیا کۆفی نینن، ژ ئافراندنێن باشنڤیسانە، ئافراندنا وێ ژ بۆ ئیبن موقلایێ شیرازی کو چەرخێ سیێ ژیایە دزڤرینن، باشنڤیسیێ ناڤهاتی بارا پتر دتەوزاندن وخەملاندنا پەرتووکان و... دهاتە و دئێتە بکاربرن. تەکۆزبوونا باشنڤیسیا (ثلث)ب ناڤونیشانێ باشنڤیسیێ تەوزاندی، ژ لایێ ئیبن موقەللای، ئیبن بەواب و یاقوت موستەعسمی هاتیە دانان. ئیبن بەواب جوانی و نازکی تێکلی باشنڤیسیێ ئاماژەپێکری کر[11]. ئەڤ باشنڤیسییە ژ بۆ ناڤ و نیشانێن سۆرەتێن قورئانا پیرۆز، پشتا کەڤل نڤیسینێ و ....، تایبەتی ل نڤیسینا سەر دیوارێن مزگەڤتان و جهێن دیتر دهاتە بکارئینان و هەتا نها بەردەوامە، ئەڤ نڤیسینە ژ بەر جوانی و سەختیا نڤیسینا وێ ب دایکا نڤیسینێن عەرەبی هاتییە ناڤدارکرن، دەڤەرا بەهدینان د پێشڤەبرنا ڤێ نڤیسینێ دا کێماسی نەکرینە و پێنگاڤێن باش ئاڤێتینە و نمونە کارێن وان پڕن د پەرتووکخانەیێن زانایێن ئایینی و لدەڤ باشنڤیسێن بەهدینان ژ وان باشنڤیسێن کو ب شێوەیەکێ بەرچاڤ پێکولا نڤیسینا ڤێ نڤیسینێ دا کرین و بسپۆرانە ب لەڤەنێ خۆ نڤیسین توومارکرین هژمارا وان گەلەك بەرچاڤن. ئەڤ نموونەیا ل خوارێ پێکهاتییە ژ لێکدان و کۆمکرنا پیتێن ڕێنڤیسیا (ثلث)ە، ژ باشنڤیسیا باشنڤیسێ ناڤدار محمد دەروێش بەڕۆشکی کو بۆ سال (١٢٧٠ك- ١٨٥٤ز) دزڤرت، یا دووێ تابلۆیێ باشنڤیس سەلاح ئەحمەد مستەفا ب ناڤێ (یا الله یا حفیظ)، و چەندین نموونەیێن دیتر.

## باشنڤیسیا ڕەیحان:

ژ باشنڤیسێ نەسخ هاتیە جوداکرن، لێ مفا ژ باشنڤیسێ (ثلث) ژی وەرگرتییە، لێ ژ وێ نازکترە، باشنڤیسیا ناڤهاتی گەلەك نێزیکی باشنڤیسیا موحەققە، ئەڤ باشنڤیسیە ژ ئافراندنێن عەلیێ کوڕێ عوبەیدوللاهێ ڕەیحانی یە و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ب ناڤێ (ڕەیحانی) هاتییە ناڤکرن، هندەك ژی بۆ ئیبن بەوابی دزڤرینن، چونکو ژ بۆ ڤی باشنڤیسیێ هەوڵ و بزاڤێن هەژی پێ کرین، چەندەکێن دیتر باشنڤیسیا ڕەیحانی جوداکری ژ باشنڤیسیا موحەقق ل قەلەم ددەن، ئەڤ باشنڤیسییە باشی و تایبەتمەندیێن باشنڤیسیا موحەقق پێ هەین، لێ نازکتر ژ وێ دئێتە نڤیسین و ب نازکی و نەرماتیێ نایابە[12].د ڕاستی دا ل بەهدینان کەسانێن کو هەوڵ نڤیسینا ڤێ شێوازێ نڤیسینێ داین نەهاتینە ناسکرن و دیتن و ڕەنگە ژ بەر گرنگ نەبوونا ڤی شێوازی بیت کو نڤیسینێن دیتر هەبوون خۆدی گرنگیا زێدەتر بوون، لەوما

هاتییە پشت گوە هاڤێژتن و د ڕاستی دا ئەگەر کەسەکی ل بەهدینان نڤیسینا ناڤبری نڤیسیبت پێ دیار و ئاشکرا نینە. واتە گەلەك گرنگی پێ نەهاتییە دان.

## باشنڤیسێ موحەقق:

ئێکەمین باشنڤیسییە کو ل دەستپێکا خیلافەتا عەبباسییان ژ باشنڤیسێ کۆفی هاتی دەرئێخستن و نێزیکترین باشنڤیسییە بو وێ، هەروەسا ئێکەمین باشنڤیسییە کو ئیبن موقەللای تەوزاندی و ئەندازیاری کری، ئیبن بەوابی تەکۆزییا داویێ ب وێ بەخشی. باشنڤیسێ موحەقق د چەرخێ چوارێ مشەختی دا خۆشتڤیترین باشنڤیسی دنێڤبەرا باشنڤیسان ژ بۆ نڤیسینا قورئانا پیرۆز ل سەرانسەی جیهانا ئیسلامی ل ڕۆژهەلات بوو[13]. ئەڤ جۆرێ نڤیسینێ ژی وەکو نڤیسینا ڕەیحانی هیچ نموونەیە نە ژ باشنڤیسێن کەڤن و نە ژ یێن نوو نەهاتینە دیتن.

## باشنڤیسێ ڕوقعە یا (ڕوقاع):

د زمانی دا واتایا بەربەرێ بچووك ددەت. ئەڤ باشنڤیسییە ژ باشنڤیسێن نەسخ و (ثلث) هاتییە جوداکرن. باشنڤیسێ ڕوقعە د نامەنڤیسینێن تایبەتی و پەرتووکێن عورفی و کاغەزێن ل ئالییێن بچووك بەربەلاڤبوو. ڕۆقعە ژ باشنڤیسێن خۆشتڤیێن عوسمانیان بوو. ژ لایێ باشنڤیسێ ناڤدار شێخ حەمدوللا ئاماسی چاکسازیێن پێدڤی سەر وێ ئەنجامدان. ئەڤ باشنڤیسییە بەرە بەرە ژ ئالیێ باشنڤیسێن دیترڤە سادەتر لێهات و بۆ ئێك ژ بەربەلاڤترین باشنڤیسێن عەرەبی. ئەڤرۆ باشنڤیسێ ڕۆقعە ژ بەربەلاڤترین باشنڤیسییە کو ل سەرانسەری دونیا عەرەبان دئێتە بکاربرن. هۆکارێ بکارئینانا ڕۆقعەی ل نڤیسینان دا ئەوە کو ب لەز و کورت دئێتە نڤیسین[14]. ل بەهدینان نڤیسینا ناڤبری ل کەڤن دهاتە بکاربرن لێ ل چەرخێ بیستێ دا ب شێوەیەکێ گەلەك بەرچاڤ هاتییە و دئێتە بکاربرن و ئەو ژی ژ بۆ نڤیسینا سادەیا وی








دزڤرت و نها ل بەهدینان ئەڤ نڤیسینە د ڕێزبەندیا ئێكێ دا و پرانییا خەلكێ ئەڤێ نڤێسینێ بكار دبن، و گرنگییەكا تایبەت پێ دئێتەدان. بۆ نموونە ژ نڤیسینا باشنڤیس عادل حاجی، ئایەتا (٢٥) سورەتێ (الذاريات)(إذ دخلوا عليه فقالوا سلاما قال سلام قوم منكرون).یا دووێ فەرموودا پێغەمبەری(س) (رأس الحكمة مخافة الله).

## باشنڤیسیێ دیوانی:

ئێك ژ وان باشنڤیسیانە كو نها ل وەلاتێن عەرەبی بەربەلاڤە، ئافرەندێ ڤی شێوازی كەسەك بناڤێ حسامێ ڕۆمی بوو، باشنڤیسیا دیوانی ل تركیا عوسمانی گەلەك بەربەلاڤبوو و ل سەردەمێ سوڵتانێ عوسمانی سلێمانێ قانونی گەهشتە بلندترین ئاستێ خۆ، ئەگەر باشنڤیسیا دیوانی بێ (زخرفە) بت دبێژنێ (خەفی) و ئەگەر خۆدی (زخرفە) بت دبێژنێ (جەلی). نڤیسینا ڤی جۆرێ باشنڤیسیێ گەلەك دەمگرە[15]. ئەڤە نموونەیەك ژ باشنڤیسیا دیوانییا جەلی، ئایەتا (٣) سورەتێ (ال عمران) ژ قورئانا پیرۆز(اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا).ب نڤیسینا باشنڤیس عەبدولقادر ڕەمزی ئەحمەد گەرگەری.

## باشنڤیسیا فارسی- نەستەعلیق:

ئەڤ باشنڤیسیە ب (بووكا باشنڤیسیێن ئیرانێ) هاتییە ناڤكرن، كو جوانییا وی هەموو كەسەكێ سەرسوڕمان و بالكێش دكەت، باشنڤیسیێ ناڤهاتی ژ پێكهاتەیا (نەسخ) و (تەعلیق) ل چەرخێ حەفتێ و هەشتێ ژ لایێ میر عەلیێ تەبریزی ڤە هاتبوو ئافراندن، میر عەلیێ تەبرێزی، سولتان عەلیێ مەشهەدی، میر عەلیێ هەرەوی...هەر ئێك ژ ئالیێ خۆڤە ژ بۆ بەرزڕاگرتن و پێشڤەبرنا ڤێ باشنڤیسیێ هەوڵ و پێنگاڤێن باش ئاڤێتن. میر عیمادێ حوسەینی ل سەردەمێ سەفەویان ئەڤ باشنڤیسییە گەهاندە بلندترین ئاستی نازكی و جوانیێ[16]. ئەڤ جۆرێ نڤیسینێ ل بەهدینان ل كەڤن ب شێوازەكێ سادە دهاتە بكارینن، لێ ڤی سەردەمی هژمارەكا باشنڤیسان ل بەهدینان یێن هەین كو ب شێوەیەكێ ڕێكوپێك



نڤیسینا ناڤهاتی دنڤیسین، و باشنڤیسیا وان د ڤی بواری دا بۆ فێربوونا وان ل نك باشنڤیسێن ئیرانی دزڤرت.ئەڤ نموونەیا ل خواریّ بەریەریّ ئێكێ ژ دیوانا مەلایێ جزیری ب رێنڤیسا ئیسماعیل پاشایێ دوویّ كوریّ محەمەد تەیار میریّ میرنشینیا بەهدینان ب باشنڤیسیا فارسی - نەستەعلیق و ب (زەخرەفەیا سادە) هاتییە تەوزاندن[١٧].

## باشنڤیسێ شكەستە نەستەعلیق:

ل نیڤا چەرخێ یازدێ مشەختی بدەستێ مورتەزا قۆلیخان شاملۆ دەستەلاتداریّ هەرات ژ باشنڤیسێ نەستەعلیق هاتە ئافراندن، هۆكاریّ پەیدابوونا ویّ لەزنڤیسی و تەسەل نڤیسیا وێیە، باشنڤیسێ ئامازەپێكری ب دەستێ میرزا شەفیعایێ هەراتی تەكۆزتر لێهات، ژ لایەكێ دنڤە عەبدولحەمیدێ تالقانی رێزمان نوو داناند، ئەڤێ باشنڤیسێن پێشڤەچوونێن باش ب خۆڤە گرت[١٨]. باشنڤیسێ ناڤبری رۆژ ب رۆژ بەرەف جوانییەكا دیتر چووە و هەتا نها پێشكەڤتنا ویّ بەردەوامە. لێ یا فەرە بێتە دیاركرن باشنڤیسێ شكەستە تنێ گرێدایە ب باشنڤیسێن ئیرانیانڤە، هەر چەندە باشنڤیسێن دیترێن جیهانا ئیسلامێ هەوڵ نڤیسینا وی ددان و ددن لێ ژ بەر زەحمەت و ئالۆزیا ویّ نە گەهشتینە چ قۆناغان، ل دەڤە را بەهدینان ب شێوەیەكێ كێم هەوڵ نڤیسینا شكەستە داینە و ددن لێ ل ڤێ داویێ تایبەتی پشتی زڤرینا پەنابەرێن كورد ژ ئیرانێ كەسانێن بسپور د ڤێ نڤیسینێ دا یێن هەین و ب شێوەكێ گەلەك جوان دنڤیسن ئەوژی بۆ ویّ چەندێ ڤەدگرت وان ل ئیرانێ مەشق راهێنان ژ مامۆستایێن ئیرانی وەرگرتینە و بووینە بسپور د ڤی شێوازی دا.

## پەرتالێن نڤیسین و باشنڤیسیێ

ئالاڤێن سەرەكیێن نڤیسین و باشنڤیسیێ چەند پەرتالان ب خۆڤە دگرن، كو هەر ئێك ژ وان ب مەبەستا كارەكێ پێدڤی دئێنە بكاربرن لێ ئەگەر بنێرینە دیرۆكێ هەر چەرخەكی ئالاڤێن ناڤبری ب شێوازێن جۆراجۆر دهاتنە دروستكرن و یان هەر دەڤەرەكێ ب شێوازەكێ تایبەت ب خۆڤە ئالاڤ ئامادە دكرن، دشێن بێژین كو ئەڤ چەندە ب زەوقێ باشنڤیسی ڤە گرێدایە، هەر ژ كەڤندا هەتا نها ئالاڤێن سەرەكیێن باشنڤیسیێ گۆرانكاری ب سەردا نە هاتینەكرن، چونكو كاغەز، حوبر، گیزان، لەڤەن و (لیقە – پەمبی) ئالاڤێن سەركینە و د گشت دەماندا دهاتنە و دئێنە بكاربرن. د بەردەوامیا ڤی بابەتی دا ب كورتی پێداچوونەك د ئالاڤێن نڤیسین و باشنڤیسیێ دا هاتییە كرن و ب شێوازێن خوارێ هاتینە رێكخستن:

لەڤەن (قەلەم- پێنڤیس): هۆنەرێ نڤیسینێ ئێك ژ گرنگترین هۆكارێن پێشكەڤتنا شارستانییەتێ دئێتە هژمارتن. نڤیسین مرۆڤی ب شیان دكت، كو هزروبیر، بیروبۆچوون و كارێن خۆ توومار بكت، لێ

بەری پەیدابوونا پێنڤیسی ب شێوەیەكێ دروست، گەلەك ئالاڤێن نڤیسینێ هەبوون.

بۆ نموونە مرۆڤێن دەستپێكێ، بەرێ چەقماقێ سەرك تیژ ژ بۆ نیگاركێشانا سەر دیوارێن شكەڤتنان بكار دبرن، هندەك جاران ژی تلا خۆ دكرنە ناڤ شیرێ گیایان و یان خوونا ئاژلان، ئەو ل شوونا پێنڤیسی ب كاردبر، پاشان (كلوخ) و گێچ هاتە بكاربرن، چینییان پیتێن خۆ ب پێنڤیسێ ژ هریا نەرما حێشترێ نیگاركێشان دكرن. رەنگە پێنڤیسێن دەستپێكێ ژ لایێ مسرییان ڤە هاتبت دروستكرن، ئەوان پارچەكا سفری كو وەك سەرێ پێنڤیسێ (فولادی) نهایە. ل یونانێ و پاشان ل چەرخێن ناڤین و پێشكەتیتر ل چەرخێ هەژدێ و نوزدێ كەتە د قۆناغا باش دا[19]. پێنڤیس ل چەرخێ بیستێ پێشڤەچوونێن باش ب خۆڤە گرتێ و سالێ ب سالێ باشترین و جوانترین پێنڤیس كەتن بازاری دا، كو هەتا نها ژی چەرخێ بیست و ئێكێ گۆرانكارییێن گەلەك باش ب سەر دروستكرنا پێنڤیسان دا هاتییە كرن.

لێ پێنڤیسێ باشنڤیسیێ دگەل پێنڤیسێن دیترێن نۆرمال جیاوازیەكا مەزن یا هەی، چونكو هەر كەسەك شیانێن نڤیسینێ ب وان ئالاڤان نینە، تنێ ئەو نەبن ئەوێن شەهرەزایی د هۆنەرێ باشنڤیسیێ دا هەی، باشنڤیس ب دەستێن خۆ ئالاڤێن نڤیسینێ دروست دكرن و دكن، گرنگترین ئالاڤ و یان پێنڤیس ژ بۆ بكاربرن د كارێن نڤیسینا باشنڤیسیێ دا، لەڤەنە، ئەو گیایە ئەوێ بەر لێڤێن ئاڤان تایبەتی جوویێن ئاڤێ شوون دبت، هەر ژ دەستپێكا هاتنا ئیسلامێ و پەیدابوونا هەموو جۆرێن باشنڤیسیێ وەك كۆفی و هەموو جۆرێن وێ، نەسخ، ثلث، دیوانی و.... لەڤەن وەك سەرەكیترین ئالاڤێ نڤیسینێ دهاتە و دئێتە هژمارتن، لێ ڤان سالێن داویی هندەك ئالاڤێن دیتر ژ بۆ نڤیسینا باشنڤیسیێ هاتینە بازاری لێ هەر نە كاریە جهێ لەڤەنی بگرن، لەڤەن ئالاڤێ سەركیێ نڤیسینێ یە، تایبەتمەندیا لەڤەنی د وێ چەندی دایە كو بەرۆڤاژی ئالاڤێن دیتر دەمێ بكاربرنێ گەلەك حوبرێ نامینتە پێڤە و ل دەمێ نڤیسینێ كاغەزێ دگرت و باشنڤیس ب تەسەلی دشێت پێنڤیسی ددەستێن خۆدا بزڤڕینت و بكاربت و ب باشترین و جوانترین شێوە بنڤیست. لێ نەڤیا بێتە ژبیركرن، تەڤایا جۆرێن لەڤەنان ژ بۆ باشنڤیسیێ نائینە بكارئینان، ل ڤێرێ تنێ باشنڤیسی شیانێن هلبژارتنا جۆرێن باشترە.

ل كوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی باشترین جۆرێن لەڤەنان بدەستڤە دئێن، بەر لێڤا هەموو جوو و كانیێن ئاڤێ لەڤەنێن ناياب و باش بدەستڤە دئێن، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ د كەڤندا و دووڤ وان لێكۆلینێن د دەستنڤیسێن زانانیێن بەهدینان دا بدەستڤە هاتین ئەوان ژ بۆ نڤیسین و ڕوونڤیسیا پەرتووكا لەڤەن وەك ئالاڤێ نڤیسینێ بكاربرینە، لێ پشتی پەیدابوونا پێنڤیسی دەست ژ لەڤەنان هاتییە بەردان و تنێ باشنڤیسان لەڤن وەك ئالاڤێ نڤیسینێ بكاربرینە و دبن.

**كاغەز:** لدەستپێكێ پەرتالێ نڤیسینێ كەڤلێ ئاژەلان دهاتەبكاربرن، لێ دڤێت نەهێتە ژ بیركرن كارەكی گەلەك ب زەحمەت بوو، لێ لدەمێ كاغەز پەیدابووی كارێ نڤیسنێ بەرەڤ ئاقارەكێ دیتر چوو، پێشەسازیا كاغەزێ ژ پێشەسازیێن گەلەك كەڤن دئێتە هژمارتن، ژ پێدڤیێن سەرەكیێن زانستێ یە، كاغەز هەر ژ دەستپێكا پەیدابوونا خۆ، ژ هەژیترین و پشتراسترین پەرتالە ژ بۆ ڕاگرتن و ڤەگوهازتنا زانست و هزروبیرێن مرۆڤایەتیێ.

چێكرنا ئێكەمێن كاغەزا كو وەكو كاغەزێن ئەڤرۆیە، بۆ كەسەكێ چینی بناڤێ (تسای لوا) دزڤرت كو ل سال (١٠٥ز.) هاتییە دروستكرن. كاغەزسازی بەرە بەرە بەرەڤ ڕۆژئاڤا بەربەلاڤبوو، ل دەستپێكێ بۆ ژاپون و پاشان بۆ سەمەرقەند، پاشی ژ سەمەرقەند گەهشت وەلاتێن ئیسلامی، ب ڤێ چەندێ كاغەز ل سەرانسەری جیهانا بەلاڤبوو[20].

یا دیار ب كاربرنا كاغەزێ ل كوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی بۆ سەدان سالێ دزڤرت، لێ ئەو ژی ب شێوەی هێدی هێدی، ئەو دەستنڤیسێن مە ل دەڤەرا بەهدینان مێزكرین و لێكۆلین ل سەر

کرین، پرانییا وان ب رەنگێ زەرێ تاری، کێمەك ب رەنگێ خەنایێ هاتینە ب کاربرن، لێ یا دیار رەنگە کاغەز ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە گەهشتبت کوردستانێ و دەڤەرا بەهدینان، وەك کاغەزا سەمەرقەندی، بەغدادی، خۆراسانی، هندی و...هاتبتە بکاربرن، چونکە ئەو کاغەزا ل کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی وەکهەڤییەکا هەی.

لێ ئەو کاغەزێن ژ بۆ کارێن جوانڤیسیێ دهاتنە بکارئینان جیاوازیەکا زێدە دگەل کاغەزێن دیتر هەبوون و یێن هەین، چونکە کاغەزا باشنڤیسیێ تایبەتمەندیێن خۆ هەبوون و یێن هەین، پرانییا کاغەزێن باشنڤیسیێ یان ژ ئیرانی و یان ژ ترکیا دگەهشتنە کوردستانێ، چونکە هەر دو وەلاتێن ئاماژەپێکری ب باشنڤیسی ناڤدار بوون، لێ ب بیروباوەریەکا زێدە پتریا کاغەزێن باشنڤیسیی ژ وەلاتێ ئیرانێ گەهشتبن بەهدینان، ئەڤە ژ بۆ چەندی دزڤرت، ئیران هەر کەڤندا ناڤەندا هۆنەر و هۆنەرمەندان بوو، و ژ حکوومەتێن بەریا سەفەویان و هەتا نها هزاران باشنڤیس لێ پەیدابووینە و دبن.

گرنگیا کاغەزا تایبەتا باشنڤیسیێ د وێ چەندێ دایە کو جوانییەکا گەلەك باش ددتە باشنڤیسیێ و پتر دئێختە قالبێ هۆنەری دا و بهایێ هۆنەریێ وێ چەند بەرامبەر دکت. جهی داخێ یە مە چ نموونەیێن کەڤن ژ وان کاغەزێن تایبەت بۆ تابلۆیێن باشنڤیسیی ل بەهدینان بدەستخۆڤە نەئینان کو پتر لێکۆلینێ سەر بکین و بگەهینە ئەنجامە داویێ.

**حوبر،** حوبر ئێك ژ ئالاڤێن سەرەکیێن نڤیسی و جوانڤیسیێ دئێتە هژمارتن، حوبرێ جوانڤیسیێ حوبرەکێ تایبەتە، تیرترە ژ حوبرێ نۆرمال، چونکو ب ڤێ چەندێ دێ پتر مینت ب لەڤەنێ و کاغەزێ ڤە، حوبر چەندین رەنگان ب خۆڤە دگرت ژ وان رەنگێ رەش وەك رەنگی سەرەکی کو ژ بۆ ناڤەرۆکا دەستنڤیسان دهاتە بکارئینان، ژ لایەکی دیترڤە رەنگێ قەهوای و سۆر و رەنگێن دیتر کێمتر هاتینە و دئێتە بکاربرن.

رەنگە ل دەڤەرا بەهدینان حوبر ل وەلاتێن رۆژهەلاتا ناڤین دهاتنە ئامادەکرن و چ گرۆڤ سەر وێ چەندێ نینە کو بێتە سەلماندن حوبر ل دەڤەرا بەهدینان دهاتە چێکرن و بکاربرن ژ لایێ نڤیسەر و رووتڤیسان ڤە، لێ چێدبیت هندەك حوبرێ سادە ل کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ژ گول و گیایان تایبەتی بۆ رەنگێ رەش ژ پوستێ گویزان، هاتبت درۆستکرن، بەس ژجۆری نەباش دهاتە هژمارتن، ئەو دەستنڤیسێن ل دەڤەرا بەهدینان هاتین مێزکرن پرانییا وان، وەك ناڤەرۆك حوبرێ رەشە و پەراوێز و سەرێ بابەتان و .. ب رەنگێ سوور و کەسەك وەك تەڤایا جهێن دیتر دهاتنە بکاربرن. لێ نها هەموو جۆرە حوبر و رەنگێن جۆراجۆر یێن هەین، کو باشنڤیس و ب کاربرێن حوبری ژ گشت لایەکیڤە یێن بێ نیازکرین.

**حوبردانك،** ئالاڤەکێ دیترێ نڤیسینێ یە، کو تایبەتە ب کارێن باشنڤیسیێڤە، حوبردانك ئەو ئالاڤە ئەوێ (لیقێ) پەمبی دکنە تێدا و حوبری ب ئەندازە دکنە سەر و بکار دبرن و دبن، ئەڤ ئالاڤە دکەڤندا ژ داری دهاتە چێکرن و ژ ئاسن و پلاستیکی ژی دئێتە بکارئینان، ژ بەر هشك نەبوونا حوبری پێدڤیە حوبردانك ب قەپاخ بت، لێ نها ب شێوەکی جوان و تەوزاندی دئێنە چێکرن و بکاربرن.

**لیقە(پەمبی)،** ئێك ژ ئالاڤێن دیترێن کارێ نڤیسین ب گشتی و جوانڤیسیێ ب تایبەتی لیقەیە، لیقە پەمبیێ تایبەتێ نڤیسینێیە، دکەڤن و نها دا باراپتر ئاڤرمووش هاتییە بکاربرن، ئەڤ ئالاڤە دکرنە ناڤ حوبردانکێدا و پاشان حوبر ب ئەندازە دکرنە سەر، تایبەتمەندییا ئاڤرمووشی د وێ چەندێ دایە کو حوبرێ زێدە نامینت ب لەڤەنێ ڤە و ئەندازا پێدڤی حوبر دمینت ب لەڤەنی ڤە، بێ گۆمان ل دەڤەرا بەهدینان ئاڤرموویش دهاتە بکاربرن چونکو دەڤەرا بەهدینان ب زێدەهی ئاڤرمووش بەرهەم دئینان و هەتا بازرگانی پێ دکرن، لێ بەرە بەرە بەرهەم ئینانا وێ بەرەڤ نەمانێ چوو.

**گیزان و یان چەقوك،** ئالاڤێن وەك گیزان و یان چەقوك ژ بۆ برینا لەڤەنان ئێك ژ پێدڤیێن سەرەکیێن نڤیسین و باشنڤیسیی یە، گیزان ژ بۆ برینا لەڤەنان



پیدڤی ب ئالاڤەکێ تیژە، داکو سەرکێ پێنڤیسێ ب باشی و جارەکێ بێتە برین، پاشان ژ بۆ کارێن نڤیسینێ بێنە بکارئینان.

**پێنڤیسدانك**، سەبەتەکا بچووکە، د کەڤن و نها دا ژی پرانییا وان ژ داری و کەڤلی ئاژالان دهاتە و دئێتە چێکرن، هەموو ئەو تشتێن گرێدای ب نڤیسی و باشنڤیسییێڤە وەك لەڤن، گێزان و... دهاتە بکارئینان و هەتا نها دئێتە بکاربرن، ب ڤێ چەندێ ژ هندابوون و ژناڤچوونێ دهاتنە و دئێنە پاراستن. پێنڤیسدانکی گرنگیەکا مەزن د هۆنەرێ باشنڤیسی دابوو و یێ هەی، چونکوە ب هەبوونا وی رێکوپێکیا جوانڤیسیێ دئێتە بەرچاڤ. تەڤایا پەرتالێن گرێدای ب باشنڤیسیێ ڤە د وێنەیێ لخوارێ دا هاتینە کۆمکرن و ب شێوەیەکێ رێکوپێك هاتینە رێکخستن.(٢١)

## شێوازێ بکاربرنا نڤیسینێ:

قورئانا پیروز: نڤیسینا قورئانا پیرۆز ئێك ژ وان بابەتێن گەرم و گرنگێن دیرۆکا ئیسلام و مووسلمانانە، ئەڤ چەندە ب مەبەستا پاراستن و راگرتنا پەرتووکا پیرۆزا ئەسمانییا مووسلمانان دئێتە هژمارتن،هەر ژ دەستپێکا چەرخێن دیرۆکا ئیسلامێ و هەتا پەیدابوونا دەزگەهێ چاپێ بەردەوام قورئانا پیرۆز ب شێوەیێن جۆراجۆر دهاتە نڤیسین و گرنگییەکا زێدە پێ دهاتەدان، لێ بەرە بەرە نڤیسینا قورئانێ بەرەڤ کێمیێ چوو و قورئانا چاپێ جهێ قورئانا بدەستنڤیسیێ گرت، لێ نەڤیا بێتە ژبیرکرن نڤیسینا قورئانێ بدەستی هەتا نها بەردەوامە، پرانییا وان ب مەبەستا جوانی و بۆهادان ب قورئانێ ب ڤێ کاری رادبن، دکەڤندا ل کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی سەدان قورئان ب شێوازێن



سورة النبأ
بسم الله الرحمن الرحيم
عم يتساءلون ۝ عن النبإ العظيم ۝
الذي هم فيه مختلفون ۝ كلا
سيعلمون ۝ ثم كلا سيعلمون ۝
ألم نجعل الأرض مهادا ۝ والجبال أوتادا ۝
وخلقناكم أزواجا ۝ وجعلنا نومكم سباتا ۝
وجعلنا الليل لباسا ۝ وجعلنا النهار معاشا ۝
وبنينا فوقكم سبعا شدادا ۝ وجعلنا
سراجا وهاجا ۝ وأنزلنا من المعصرات ماء
ثجاجا ۝ لنخرج به حبا ونباتا ۝ وجنات
ألفافا ۝ إن يوم الفصل كان ميقاتا ۝
يوم ينفخ في الصور فتأتون أفواجا ۝
وفتحت السماء فكانت أبوابا ۝ وسيرت الجبال

فكانت سرابا ۝ إن جهنم كانت
مرصادا ۝ للطاغين مآبا ۝ لابثين
فيها أحقابا ۝ لا يذوقون فيها بردا
ولا شرابا ۝ إلا حميما وغساقا ۝ جزاء
وفاقا ۝ إنهم كانوا لا يرجون حسابا ۝
وكذبوا بآياتنا كذابا ۝ وكل شيء أحصيناه
كتابا ۝ فذوقوا فلن نزيدكم إلا عذابا ۝
إن للمتقين مفازا ۝ حدائق
وأعنابا ۝ وكواعب أترابا ۝ وكأسا
دهاقا ۝ لا يسمعون فيها لغوا ولا كذابا ۝
جزاء من ربك عطاء حسابا ۝

رب السماوات والأرض وما بينهما الرحمن
لا يملكون منه خطابا ۝ يوم يقوم
الروح والملائكة صفا لا يتكلمون
إلا من أذن له الرحمن وقال صوابا ۝
ذلك اليوم الحق فمن شاء اتخذ إلى ربه
مآبا ۝ إنا أنذرناكم عذابا قريبا ۝ يوم
ينظر المرء ما قدمت يداه ويقول
الكافر يا ليتني كنت ترابا ۝
سورة النازعات
بسم الله الرحمن الرحيم
والنازعات غرقا ۝ والناشطات نشطا ۝

جیاواز ب دەستی هاتینە نڤیسین، لێ جهێ داخێ یە گەلەك ژ وان نڤیسینان هندابووینە.

قورئانا پیرۆز ل بەهدینان ب چ شێوازی دهاتە نڤیسین، ژ وان دەستنڤیسێن بدەستڤە هاتین پرانییا وان ب باشنڤیسییا نەسخ و کێمەك ب باشنڤیسییا ڕوقعەی هاتینە نڤیسین، ئەو قورئانێن دەست مەڤە هاتین و ددەستێن مەدا پرانییا وان نە تامامن و تنێ هندەك پشکێن قورئانێ ماینە، ئەو قورئانێن نها ژ باشنڤیسێن دەڤەرا بەهدینان لبەر دەستێ مە پتریا وان ب باشنڤیسییا نەسخن، ژ وان نڤیسینا زانا و دیرۆکنڤیس و هۆزانڤانێ ناڤدار محەممەد سەعید کوڕێ عەبدولڕەحمان کوڕێ مەلا یەحیایێ مزیری، مەلا نەجمەددینێ کوڕێ مەلا ئەحمەد سەددیقیێ بامەڕنی / مامیسیێ ڕێکانی، تەها مەلا یونسێ ئامێدی، مەلا ئەبوزەید کوڕێ یوسف کوڕێ یاسینێ کێستەی، مەلا تاهر کوڕێ محەممەد تاهرێ شوشی، محەممەد حەسەن کوڕێ مەلا نەجمەددینێ کوڕێ مەلا ئەحمەد سەددیقیێ بامەڕنی/ مامیسیێ ڕێکانی، و چەندین نموونەیێن دیتر، مخابن گەلەك جۆرێن قورئانان یێن هەین، لێ بێ ناڤونیشانن و کەسەك نەشێت نڤیسەرێ وێ پەیدا بناسیت، لەورا تنێ مە ناڤێن ئەوێن دیار ئینانە خوارێ. ئەڤ نموونەیا ل بەربەرێ چووی ژ نڤیسینا محەممەدحەسەن کوڕێ مەلا نەجمەددینێ کوڕێ مەلا ئەحمەد ئەلصەددیقیێ بامەڕنی، سورەتێ (النبا).[٢٢]

**دەستنڤیس(دەستخەت)،** ئێك ژ ژێدەرێن سەرەکی و گرنگ ژ بۆ لێکۆلینا زانستێن مرۆڤایەتی، ب تایبەتی دیرۆك، ئەدەبیات، زانستێن ئایینی، فەلسەفە، ستێرناسی و بیرکاری (الحساب) و زانستێن دیتر دهێنەهژمارتن، دەستنڤیس بۆ وان جۆرە پەرتووکان تێتە بکارئینان و گۆتن ئەوێن ب دەست کو ب هەر شێوەیەکی بت هاتبتە نڤیسین، ل ڕۆژهەلاتا ناڤەڕاست دەستنڤیس خۆدی دیرۆکەکا دێرینە، ل ڕۆژگارێن کەڤندا، پادشاهان و دەستەلاتداران ل سەرایێن خۆ کەسەك وەك نڤیسەر، ڕوودانێن گرنگ و تایبەتی ئەوێن باندۆرا خۆ سەر دەستەلاتێ هەبین سەر کەڤل و کاغەزان توومار دکرن، ژ لایەکێ دیترڤە زانایێن ئایینێ ژ بەر نەبوونا دەزگەهێن چاپێ ژبلی نڤیسینا بەرهەمێن خۆ و ژ بەر پێدڤییا زێدە ب هندەك پەرتووکێن گرنگ ب ڕوونڤیسی کرنا پەرتووکان د هەموو بواران دا ڕادبوون. ژ لایەکی دیترڤە هەر ژ دەستپێکا هاتنا ئیسلامی هەتا نها نڤیسەران، زانایان، ڕەوشەنبیران بزاڤ و هەوڵدایینە بەرهەمێن لێکۆلینێن خۆ ب شێوەکێ نڤیسی و توومارکری، بێخنە بەردەستێن هەموویان و ژ بۆ دووندەها پشتی خۆ بجهـ بهێلن و ببنە جهی بکاربرنا ڤەکۆلەران، بەرهەمێن ڤان ڤەکۆلەران د جیهانا ئیسلامێ گەهشتە وێ ڕادێ کو ژ سنوورێ خۆ دربازبوون و پەرتووکخانەیێن مەزنێن گشتی و تایبەتی ل هەموو جیهانێ ژ ڤان بەرهەمان پڕ کرینە، گرنگییا هەر دەستنڤیسەکێ د وی چەندێ دایە کو کا هەر ئێك ژ وان ب چ شێوە، خەت، کەڤل، تەوزاندن هاتینە نڤیسین.

زانایێن دەڤەرا بەهدینان وەك تەڤایا زانایێن دەڤەرێن دیێن کوردستانێ، ژ بەر پێدڤیا ڕۆژانەیێن خۆ نەچار



دبوون ب رِوونڤیسیا پەرتووکێن شرۆڤەکرنا قورئانا پیروز، شەریعەتی، فەرموودێن پێغەمبەری (سلاڤێن خودێ لێ بن)، دوعا، ئەدبیات، ستێرناسی، بیرکاری و چەندین تەوەرێن دی رابىن، پرانیيا ئەو دەسنڤیسێن ل دەڤەرێن بەهدینان هاتین دیتن ب زمانێ عەرەبی و کێمەکا وان ب هەر دو زمانێن تورکی عوسمانی و فارسی نە، ب شێوەکێ رێکوپێك هاتینە نڤیسین، ب ڤێ چەندێ جهێ ڤالەیێ چاپێ تا رادەکێ پرکربوون، ئەو دەستنڤیسێن کەتینە بەر دەستێ کەسانێن کارزان و حەژێکەرێن زانستی، گەلەك ژ دەستنڤیسان ژ لایێ زانایێن ناڤدارێن کوردێن دەڤەرا بەهدینان هاتینە رِوونڤیسکرن و کێمەکا وان ژ ئالیێ شاگرد و فەقەهێن وانڤە دهاتنەنڤیسین، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ پێداچوون و لێکۆلین د دەستنڤیسیاندا بێتەکرن، ژ ئێك پەرتووکێ چەندین دەستنڤیس بدەستڤە دئێن، لێ نەڤیا بێتە ژبیرکرن گشت پەرتووك نە وەك هەڤن، ئەو پەرتووکێن پتر داخــوازی ل سەر هژمارا وان پرن، ل دەڤەرێن جوداجودایێن بەهدینان چەندین دەستنڤیسێن یێن هەین ژ وان دەستنڤیسێن مالباتا موفتی ل ئاکرێ، دەستنڤیسێن مەسعوودێ کتانی، دەستنڤیسێن مەلا حەمدی و.... و چەندین نموونەیێن دیتر.بەرپەرەك ژپەرتووکا (تحفە ابن حجر) ژرێنڤیسا (مەلا حەسەن کورێ حسێنێ چاربووتیێ- زێباری) کو ب هەر سێ باشنڤیسیێن نەسخ و فارسی(نەستەعلیق) و ثلث هاتییە ئامادەکرن.[23]

## دەستویرنامەیا زانستی یان باوەرناما زانستی (ئیجازا عیلمی):

دەستویرنامەیا زانستی یا ب زاراڤێ نها باوەرنامەیا زانستی، دکەڤندا وەکو خویندگەهێن



نها نەبوو و پرانییا حەژێکەرێن زانستی وەك فەقی ل حوجرێن مزگەفتان تایبەتی وانەیێن ئاینی دخواندن، ئەو ژی ل دەڤ زانایێن زیرەك و باوەرپێکری و پشتی بداوی هاتنا خواندنێ باوەرنامەیا زانستی ب وی را دهاتە بەخشین و ب تەسەلی ل جهەکێ گرنگ دەست ب وانە گۆتنێ و رێڤەبەرنا مزگەفت و جهێن زانستی دکر، ئەو باوەرنامەیێن زانستی ئەوێن ل بەهدینان هاتین مێزکرن و دیتن باراپتر ب زمانێ عەرەبی و کێمەکا وان ب هەر دو زمانێن فارسی و ترکیا عوسمانی بوون، پرانییا وان ب باشنڤیسیەکا جوان و رێکوپێك ب باشنڤیسیا نەسخ دهاتنە نڤیسیاندن ئەڤ دەستووردانە ب شێوەیەکی گەلەك درێژ و هەتا هندەك ژ وان پتری سیهـ بەرپەرانن و کو باسێ مامۆستایێ دەستوورێ ددت و مامۆستایێن وی و هەتا دگەهت دووماهیك مامۆستا و هەروەسا ناڤێن وان بابەتێن ماوەی فەقایەتیێ هاتین خواندن. گەلەك دەستوور نامەیێن هەین ناڤێن مامۆستا و پەرتووکان ب باشنڤیسیێن جیاواز نڤیسینە و ل داوییا دەستوورنامەیا زانستی دیرۆك و مۆهر و ئیمزا مامۆستایێ دەستوور دای هاتیە دانان و ئەڤ چەندە راستی و دروستیا وێ ل قەلەم ددت، چەند بەرپەرەك ژ دەستوورنامەیا (مەلا نەجمەددین کورێ مەلا ئەحمەد ئەلسەددیقیێ بامەرنی) ب باشنڤیسیا نەسخ کو باراپتر ژ لایێ مەلایێ ناڤهاتیڤە هاتیە نڤیسی، ژ ئالیێ مامۆستایێ ویڤە (عەبدولوهاب کورێ حاج حەسەن جەوادیێ حەنەفیێ موصلی) هاتی بەخشین، ئەڤە ژی سێ بەرپەر ژ وێ دەستوورنامەیا زانستی[٢٤].



## تەزهیب و زەخرەفە:

بۆ چەرخێن گەلەك کەڤن دزڤرت، لێ چەرخ ب چەرخ و سال ب سال پێشڤەچوونێن مەزن ب خۆڤە گرتن، د بیاڤێ باشنڤیسیێ دا جۆرێن گەلەك رێکوپێك یێن هەین، زەخرفە جوانییەکا بەرچاڤ ددت باشنڤیسیێ تایبەتی کەڤلێ پەرتووکان، دەستپێکا هەر بابەتەکێ پەرتووکان و... باراپتر ژ وان زەخرەفەیان ل سەر دەستنڤیسان و کێلیێن گۆران و دیوارێن دەوروبەرێن گۆران و یان سەر دەرگەهێن مەزن وەك دەرگەهێ مووسلێ ل ئامێدیێ هاتینە نەخشاندن.

## دیوار و بەر نڤیسی:

ئێك ژ جۆر و شێوازێن باشنڤیسیێ یە کو د تەوزاندنێن ئاڤاهییان نەمازە د چەرخێن ئیسلامی دا بەرلاڤبووی، هەلبەت نەڤیا بێتە ژبیرکرن د دیرۆکا بەری هاتنا ئیسلامێ ب بزماری دهاتە نڤیسین و نڤیسینا بزمارییا خەنەس وەك نموونە، باراپتر نڤیسینا سەر دیوار و بەران، باشنڤیسیێ (ثلث)ێ عەرەبی هاتییە بکاربرن، ل ڤێرێ جهێ پرسیارێیە کو بۆچی باشنڤیسیێ (ثلث) بۆ ڤی کاری هاتییە بکاربرن، ژ گرۆڤێن ڤێ چەندێ ئەوە کو پیتێن عەرەبی ب هەڤرا دئێنە گرێدان و ئەڤ گرێدانە دگەل باشنڤیسیێن ستوونکیێ ئاڤاهییان جوانیەکێ بەرچاڤ دکت و هەڤسەنگیێ دئێختە باشنڤیسیێن ئاسۆیی دا. شێوازێ نڤیسینا سەر دیوارێن مزگەفتان هەتا نها بەردەوامە، لێ شێوازێ نها ژ بەر هەبوونا پەرتالێن جۆراجۆر جوانیەکا تایبەت یا هەی، ژ وان نڤیسینێن سەر دیوارێن مزگەفتا حەجی مستەفا ل دهوکێ، کو بۆ سال (١٣٣٠ ك-١٩١١ز) دزڤرت و رێنڤیسیا (ثلث) و ب شێوەیەکێ جوان هاتییە نڤیسین، لێ نەهاتییە زانین کێژ باشنڤیسی نڤیسییە[٢٥].

## دویندەهنامە - دارا ڤنێتێ/ رەڤێشتێ (شەجەرنامە):

فەهرەستەکا رێکخستی یە کو پەیوەندیا خزماتییا کەسان دگەل هەڤدوو نیشان ددت، بەربەلاڤترینێ پەیوەندیێن خزماتیی، یا باب و کوری یە، ب ڤی چەندێ

دووندەهنامە ل مالباتەکێ ناڤێ بابان و کورێن وان ب رێکوپێکی دووڤ هەڤدوو دئێنە نڤیسین و دانان، پاراستنا شەجەرنامەیێ واتە پاراستنا مالباتەکێ کا ژ کیژ دووندەهێ نە، پاراستنا ناڤێن باب و کالان ل دەڤ عەرەبان گەلەك بەربەلاڤبوو، هەر سەر ڤێ مژارێ پشتی پرانییا مللەتێ کورد ئاینێ ئیسلامێ وەرگرتی، کێمەك ژ وان مینا عەرەبان شەجەرنامەیێن خۆ پاراستن تایبەتی ئەو سەیدێن هاتین ناڤ مللەتێ کورد دا و بووینە کورد و شەجەرنامێن خۆ پاراستن و پشتا و پشت گرنگی دانە ڤێ کاری و پرانییا سەیدێن دەڤەرا بەهدینان خۆدی شەجەرنامەنە، یان شەجەرنامەیێن میران وەك شەجەرنامەیا ناڤدارا زێوکی، تەڤایا ڤان شەجەرنامەیان ب بۆرینا دیرۆکێ ب گەلەك جۆرێن نڤیسینێ ناڤ هاتینە توومارکرن و ژ وان خەتێ نەسخ و پلپ و رۆقعە، لێ بەهرا پتر ب باشنڤیسێ رۆقعە هاتینە نڤیسین، نڤیسینێن هندەك ژ وان شەجەرنامەیێن هاتین تیکڤەدان ب شێوەیەکی گەلەك جوان ناڤ هاتینە توومارکرن. سەربارێ هەموو تشتەکی بوهایێ دیرۆکی ژی یێ هەی. دشێن مفایێ دیرۆکی ژی وەرگرت، ل بەهدینان ژی وەکی شەجەرەیا زێوکیە ۱۲۱۰مش - ۱۷۹۵ز ، و شەجەرەیا بنەمالا زانایێن شێخێن بریفکا یا (شێخ نورەددین بریفکانی)، و یا شێخێن نەقشەبەندی یێن بامەرنێ یا (شێخ تاهر کورێ حاجی یێ بەنستانی یێ رێکانی ، و یا بنەمالا زانایێ ناڤدار (مەلا عەبدوللاهێ کورێ مەلا ئەحمەدێ مامیسیێ رێکانی) و چەندین نموونەیێن دیتر. ئەڤ نموونەیا ل خوارێ بەربەرەکە ژ شەجەرنامەیا زێوکیە.[٢٦]

## نامە (پەیام):

بۆ هەر کاغەزەکا ژ جهەکی بۆ جهەکێ دیتر بێتە رەوانەکرن تێتە بکارئینان، نامەنڤیسی یان داخوازنامەنڤیسی پێکهاتییە ژ هنارتنا نڤیسینەکێ ژ بۆ کەسەکی یان کەسانێن دیتر سەبارەت هەر مژارەکێ ب مەبەستا گرێدانا پەیوەندییان، کو د کەڤندا باراپتر کەڤلێن ئاژەلێن دهاتنە بکارئینان و هەتا کاغەزێ جهێ وێ گرتی و شێوازێ نامەنڤیسینێ پێشڤەچوون ب خۆڤەگرت و کارێن نامەنڤیسنێ سانەهیتر لێهات، ئەو نامەیێن ل دەڤەرا بەهدینان





هاتین دیتن ب هەر سێ زمانێن عەرەبی و فارسی و ترکیا عوسمانی نە، پرانییا وان ب باشنڤیسییا نەسخ و ثلث و رۆقعە هاتینە نڤیسین. گەلەك ژ وان ب شێوازێن جۆراجۆر و رێکوپێك هاتینە تەوزاندن کو ئەڤێ چەندێ بۆهایێ نامێ چەند بەرامبەر لێکریە و جوانییەکا تایبەت دایە نامێ و گەلەك ژ وان نامەیان چەندین جۆرێن نڤیسنێ د ئێك نامەیێ دا هاتینە بکاربرن. ژ وان نامەیا ب شێوەیێ داخوازنامە کو ژ لایێ میر، ئاغا، بەگ، شێخ و موفتیێن دەڤەرا بەهدینان ب زمانێ فارسی بۆ سولتانێ عوسمانی(مەحموودێ دووێ)، ل سال (١٨٣٣ز) ب مەرەما ڤێ چەندێ پشتی دەرئێخستنا (میر محەمەدێ رەواندوزی) میر میرنشینیا سۆران، جارەکا دیتر (ئیسماعیل پاشا) بتە میر بەهدینان و ل داویێ داخوازکەران ناڤ و مۆهرێن خۆ ل نامەیێ داینە.[٢٧]

## ڕاسپێرنامە (وەسیەتنامە):



بەلگەنامەیەکا یاسایە، دووڤ وێ (ڕاسپێر= وسیەتکەر) کەسەك یان چەند کەسان دکەتە بەرپرسێ دارایی خۆ پشتی مرنێ، وەك وسیەتناما بابێ بۆ کەسوکارێن خۆ و یان پادشاهی بۆ کوڕێ خۆیێ هلبژارتی بۆ دەستەلاتداریێ. ل دەڤەرا بەهدینان گەلەك وەسیەتنامەیێن زێدە بدەستڤە هاتینە و پرانییا وان ب باشنڤیسێ نەسخ و رۆقعەنە. ژ وان ڕاسپێرنامەیا مەلا محەمەد کوڕێ مەلا یاسین کوڕێ مەلا محەمەدێ بەنستانییێ ڕێکانی، بۆ کوڕێ وی مەلا یاسین ڕێکانی، کو ل (٢٦ زولحیجە ١٣٤٩ بەرامبەر ١٣-٥-١٩٣٢) هاتبوو نڤیسین، ناڤەرۆکا وێ سەبارەت دەستنیشانکرنا ملکداریا گوندی کا هەر پارچە ئەردەك یێ کێژ مالباتێیە.[٢٨] ب ڕێنڤیسا رۆقعە یێ سادە هاتییە نڤیسین.

## دراڤ:

بۆ وی پەرتالێ دئێتەگۆتن ئەوێ کرین و فرۆتن پێ دئێتەکرن، د چەرخێن کەڤندا دراڤێ زێڕ و زیڤی دهاتنە بکاربرن، هەر وەلاتەکێ ب شێوەیەکی تایبەت ب خۆڤە دراڤ درۆست دکرن، هەتا ئەگەر هەر پادشاهەکی و یان میرەکی دراڤێ گرێدای ب خۆڤە درۆستدکرن و دئێخستنە بازاری، لێ بەرە بەرە دراڤێ کاغەزێ جهێ دراڤێ زێڕێ و زیڤێ گرت، ل دەڤەرێن کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی دەستەلاتدارێن جیاواز دراڤ چاپکرینە و کەتبوونە بازاری، شوینوارناسان گەلەك جۆرێن دراڤی د قۆناغێن جوداجودا دا دەستڤە ئینانە، ل مۆزخانەیێن بەغدا و دهوکێ هاتینە پاراستن ژ وان دراڤێ سەردەمێ ڕومانی



ساسانی و... لێ گرنگی د وان دراڤان دا هەیە ئەوێن پشتی هاتنا ئیسلامێ هاتین بدەستڤەئینان وەك دراڤێن سەردەمێ ئەمەویان، عەبباسیین، ئەیوبییان هەتا دگەهت سەردەمێ عوسمانییان، ئەو دراڤێ هەتا نها بدەستڤەهاتی ب باشنڤیسیا جۆراجۆرن لێ پرانییا وان ب جۆرێن جیاوازێن باشنڤیسیا کۆفی و لێ سەردەمێ عوسمانییان و دەستەلاتدارێن دیتر ب باشنڤیسێ نەسخ و ثلث و رۆقعە ژی هاتینە بدەستڤەئینان، ژوان دراڤێ دوازدەیێ زاینی یێ سەردەمێ خیلافەتا عەبباسیان ل سەر پشتا وێ نڤیسییە (الامام المستنصر بالله امیرالمؤمنین الاعظم) و ل سەر بەرێ وێ نڤیسییە (لولو محمد رسول الله........) ل شوینوارێن کێلیا شەدا هاتینە بدەستڤەئینان[٢٩]. هەژی گۆتنییە ئەڤ دارڤە ب نڤیسینا کوفیێ کەڤن و سادە هاتییە نڤیسین. چەندین جۆرێن دیێن سەردەمێن جیاواز ل دەڤەرا بەهدینان هاتینە دیتن.

## گوستیرك:

کو ژ فلزی دئێنە چێکرن ل ژێر ناڤونیشانێ ئالاڤێ جوانی و تەوزاندنێ ل دوور تلێن دەستی دئێتەدانان. گەلەك جۆرێن گوستیرکان یێن هەین، لێ ل ڤێرێ مەبەستا مە تنێ ئەو گۆستیرکن ئەوێن زانایێن



ئاینی و کەسایەتیێن ناڤدار ژبونا خۆ دروستدکرن و ناڤ و ناسناڤا خۆ ل سەر دنڤیسان، هندەکان تایبەتی زانایێن ئاینی گوستیرك وەك سۆنەتا پێغەمبەری چێدکرن و ئایەتێن قورئانا پیرۆز ل سەر نەقشاندن نەمازە (لا الە الا اللە محمد رسول اللە)، یان ئێك ژ نوت و نەهـ ناڤێن خودێ مەزن وەك (الواحد القهار)... ل کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی گوستیرك ل دەڤ زانایێن ئاینی وەك سۆنەت و مۆهر و ل دەڤ کاسایەتیێن هۆزان وەك جوانی و مۆهر دهاتنە بکار برن، لێ جهێ داخێ یە مە نەشیا نموونەیەك ژ وان گوستیرکان بدەستڤە بینین و بابەتێ خۆ پتر رۆهنتر لێ بکین.

## مۆهر:

ئالاڤەکە ژ فلزی، بەری یان ژ تشتەکێ دیتر دهاتە و دئێتە چێکرن، ناڤ و یان ئیمزا و یان تەڤایا پێزانین خۆدیێ مۆهرێ و ب بەرژەنگیا دیتر سەر وێ دئێتە چێکرن، ل شوونا ئیمزایێ دهاتە و دئێتە بکاربرن، مۆهر هەر د کەڤن بەربەلاڤبوو و دهاتە بکاربرن، ب درێژیا دیرۆکێ مۆهر چەندین گۆرانکاری سەردا هاتینە، مۆهر واتایا تمامی و تەڤایێ ددت، لێ هەر سەردەمەکی ب شێوەیەکی بوو، بۆ نموونە د چەرخێن بەرێ زاینی و چەند سەدان پشتی زاینی مۆهر سەر بەران دهاتنە چێکرن لێ بەرە بەرە فلزی جهێ بەری گرت، د کەڤندا چ پادشاهان و چ کەسانێن گرێدای ب زانستێ ڤە ل ژێریا هەر نامەیەکێ مۆهرا خۆ ل سەر ددان، مۆهر واتە جهێ باوەریێ یە. کوردستان ب گشتی و بەهدینان ب تایبەتی ژ ڤێ چەندێ زێبەهر نەبووینە، هەر د کەڤندا ل دەڤەرا بەهدینان مۆهر هاتینە دیتن و گەلەك ژ میر و کەسایەتیێن ئاینی و ماقۆل و کەنکەنێن خێل و هۆزان خۆدی مۆهر بوون و وەکو بۆ مە دیار هەبوونا مۆهر واتە هەبوونا شەرعییەتا وی کەسی نیشاددت و ئەو نامەیێن ژ ئالیێ خودانێ نامەیێ دهاتنە وەشاندن راستی و دروستیا نامەیێ نیشاندا، ل دەڤەرا بەهدینان چەندین مۆهر ژ مۆهرێن میر و زانایێن ئاینی و ئاغا و بەگێن دەڤەرێڤە هاتینە

مێزەكرن و پرانییا وان یا ل سەر گۆستیركێ و یان ب شێوەیێن دیترن، ب باشنڤیسێن روقعە و نەسخ و ثلث بوون هاتینە تەوزاندن و ل ژێربیا گەلەك ئەو نامە و بەلگەنامەیێن بدەستڤە هاتین تەڤایا وان مۆهر كرینە و جهێ باوەرپێكرنێ نە. ژ وان مۆهران، مۆهرا سوڵتان حسێن كورێ میر حەسەنئەلوەلی، میرێ میرنشینیا بەهدینان، كو لسال (١٥٧٣ز) مالئاڤیی كر[٣٠].

**ئیمزا:** ناڤێ (مستعار)ە كو هەر كەسەك ژ بۆ خۆ هەلدبژێریت، ب مەرەما پاسابوونا وێ بەلگەنامەیێ و یان نامەیێ یە، هەر د كەڤندا ئیمزا دهاتە بكارین، لێ هەر كەسەك ب شێوازەكی گرێدای ب خۆڤە ئیمزا چێدكر و دروست دكت، ل دەڤەرا بەهدینان گەلەك جۆرێن ئیمزا ژ وان ئیمزایێن میران و كەسایەتیێن دەڤەرێ وەك زانایێن ئایینی و سەرۆكێن هۆزان هاتینە مێزەكرن.

## كێلی و یان بەرێن گۆری:

ئەو بەرە ئەوێ پشتی ڤەشارتنا مری سەر جهێ بن ئاخكرنا وی دانان، ئەڤ كێلیە وەك نیشان ژ بۆ پەیداكرنا جهێ ڤەشارتنێ گرنگیا تایبەتا هەیە. د سەردەمێ بۆری دا، دانانا بەر یا كێلیەك سەر جهێ ڤەشارتنێ وەك نیشانەك بوو، لێ ب بۆرینا دەمی




سەر كێلیا گۆرێ، ناڤێ مری و باب و ناسناڤ دهاتە قەوارتن. كێم كێم ژبلی ناڤی سێ ڤۆلێن مری و ناسناڤێ، ئایەتەكا قورئانا پیرۆز تایبەتی ئایەتەك ژ قورئانا پیرۆز و یان مالكەكا هەلبەستێ كو هەتا نها دئێنە نڤیسین لدووڤ ژێدەرێن دیرۆكی دكەڤندا ب باشنڤیسیا كۆفی و پاشان باشنڤیسیا نەسخ و ثلث جهێ وێ گرت، و هەروەسا رۆژا ژ دایكبوون و مرنێ دهاتە قەوارتن.

لێ تشێ هەری گرنگ د كێلی و بەرێن گۆران دا تایبەتی ئەو نڤیسینێن دیرۆكیێن سەر گۆرێن پادشاهان، وەزیران، سەركردێن لەشكەری و سیاسی، زانایێن ئاینی و...دهاتنە قەوراتن. چونكو گەلەك جاران ب پەیدابوونا وان نڤیسینان پرسێن دیرۆكی تایبەتی سال ژ دایكبوون و مالئاڤیا كەسانێن ناڤدار دێ رۆهن و ئاشكرا و چارەسەر بن.

ل دەڤەرا بەهدینان هژمارەكا زێدە یا گۆڕا (قەبر) یێن هەین كو خۆدی دیرۆكەكا كەڤنارن، تایبەتی كۆرێن پشتی هاتنا ئیسلامێ، لێ پرانییا گۆرێن دەڤەرا بەهدینان بۆ سەردەمێ میرنشینیا بەهدینان دزڤرن، ژ وان گۆرێن میرێن بەهدینان، وەكو مە بەری ڤێ ئاماژەپێكری نڤیسینێن سەر كێلی و بەرێن گۆرێن كەسانێن ناڤدار خۆدێ بۆهایێ دیرۆكینە، ژ وان كێلیا گورێ رەوشەنخان كچا میرێ بەهدینان ئیسماعیل پاشا كورێ بەهرام پاشا، نڤیسینا سەر كێلیان ب باشنڤیسیا گەلەك جوان ب ڤی شێوەیە هاتییە نڤیسین (یا ارحم الراحمین هذا قبر المرحومة المبرورة المغفور لها روشن بنت اسماعیل باشا توفیت في شهر رجب سنة ١٢٠٢)، هەژی گۆتنێنە كێلی ب جوانی ب زەخرەڤا ئیسلامی هاتییە تەوزاندن و ب ڤی شێوەیێ ل خوارێ یە[٣١]. و چەندین نموونەیێن دیتر.

## كورتە دیرۆكەك ل سەر باشنڤیسێن بەهدینان

باشنڤیسی دناڤ كوردان دا وەك تەڤایا مللەتێن دینێ موسلمانێن جیهانێ هەر ژ كەڤندا گرنگی



و پووتە ددان باشنڤیسی و هەوڵ و بزاڤێن زێدە د پێشڤەبرنا گشت جۆرێن باشنڤیسیێ ددان و ددن، باشنڤیسی و نڤیسین دناڤ تەخ و چینێن کوردان تایبەتی دناڤ زانایێن ئاینی دا ب شێوەیەکێ بەرچاڤ بەربەلاڤبوو، ئەو ژی بۆ وێ چەندێ دزڤرت کو زانایێن ئاینی حەزەکا زێدە د ڕوونڤیسیکرنا پەرتووکێن کو نیازێن وان دابین دکرن تایبەتی پەرتووکێن کو ل حوجرێن مزگەڤتان ب فەقەهان دهاتنە وانەدان و ب ڤێ چەندێ بەرە بەرە زانایێن کورد بەرەڤ پێشڤەبرنا جۆرێن باشنڤیسیێ برن و هەر کەسێ ب باشی و ڕوهنی چاڤ ل پەرتووکێن زانایێن کورد بکت ئەڤ چەندە دێ بۆ وی ئاشکرا بت و زەحمەت و شوون تلێن وان زانایان دێ دیاربت، ئارمانجا سەرەکیا باشترکرنا باشنڤیسیێ دو مەبەست هەبوون یا ئێکێ دارایی و یا دیتر وورەیی بوویە، کەسانێن کو ئارمانجا دارایی بوویە ب ڤێ ڕێکێ ژیارا خۆ ب کارێن باشنڤیسیێ دابین دکرن، یا دووێ کەسانێن کو ئارمانجا وان تنێ وورەیی بوویە ب ڤێ مەرەمێ خێر و بەرەکت و ژ هەمووو تشتەکی بلندتر دنرخواندن، لێ لڤێرێ ژ هەر دو ئالیان دیروکێ مفا ژ زەحمەت و وەستانا وان وەرگرت و دشێن بێژین ب کارێن خۆیێن هۆنەری ناڤێن خۆ د دیرۆکێ دا توومارکرن، د ناڤ مللەتێ کوردان ب درێژیا دیرۆکی سەدان بەلکو هزاران باشنڤیسێن باش و ب ناڤ و دەنگ پەیدا بووینە و ناڤێن وان د بەرپەرێن دیرۆکا هۆنەریدا هاتینە توومارکرن ژ وان خەلیل خوداد، ئیسماعیل ئیبراهیم سەنەوی کوردی، ئەسەعەد کوڕێ ئیبراهیم کوردی، عیمادئەلددین کوڕێ عەفیفێ کوردی، عەلی کوڕێ عیسایێ کوردی، حامد ئامەدی، عەلی رزا کەلهور، محەمەد تاهرێ کوردی، نەجمەددین ئەفەندی کوردی، عومەر کوڕێ ئەیوبێ کوردی، ئەحمەد کوڕێ ئیبراهیمێ کوردی، یاسین کوردی، ئیبراهیم کوڕێ عوسمانێ کوردی، ئیلیاس کوڕێ ئیبراهمی کوردی، عەلی کوڕێ عیسایێ کوردی، کەبیر کوڕێ ئەویسی کوڕێ لەتیفیێ کوردی، سەید محەمەدێ تاهر کوڕێ عەبدولقادرێ کوردیێ مەککی، ئەحمەد کوڕێ کوردی، ئەسەدوللاهێ کیرمانی(کیرمانشاه)، ئەسعەد کوڕێ ئیبراهیمی کوڕێ نیسابێ کوردی، میرزا محەمەد رزایێ کەلهور، مۆرتەزا قولیخانێ کورد، ئایەتولا نجومی، حامد ئامەدی، ئەبولفەزلێ دینەوەری، ماه شەرەف خانما کوردستانی و سەدان باشنڤیسێن دیتر، دشێن بێژین کو باشنڤیسێن کورد ل سەر دەستێ هژمارەکا زێدە ژ باشنڤیسێن بیانی و خۆیانی فێرێ هەموو جۆرێن باشنڤیسیێ بوونە و دەستوورنامەیێن باشنڤیسیێ بەخشینە شاگردێن خۆ، باشنڤیسێن کورد پێشڤەبرنەکا زێدە ئێخستە باشنڤیسیێن عەرەبی و ب ڤێ کاری خزمەتەکا زێدە پێشکێشی هۆنەرێ باشنڤیسیێ کرن.

چونکو ئەڤ تەوەرە تایبەتە ب باشنڤیسێن دەڤەرا بەهدینانڤە دێ هەوڵ دەین ب کورتی چەند ڕێزەکان ل سەر مەزنە باشنڤیسێن بەهدینان بنڤیسین. ل ڤێرێ پێدڤییە ئاماژە ب وێ چەندێ بێتەکرن کو هەر ژ کەڤندا حەزا باشنڤیسیێ لدەڤ زانا و نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان هەبوویە و هەتا نها یا بەردەوامە. باشنڤیسێن دەڤەرا بەهدینان چەندین جاران هەوڵ

دامەزراندنا كۆمەڵ باشنڤیسان داینە لێ بێ ئەنجام بوو، خۆشبەختانە هیڤی و ئۆمیدێن وان ل سالا (٢٠٠٧) بجە هاتن، هەر ل رۆژا (٧-١٠-٢٠٠٧) دووڤ بریارا ژمارە (١٣٠٧٠) ژ وەزارەتا هەرێمێ بۆ كاروبارێن ناڤخۆیی كۆمەڵە هاتە دامەزراندن، لێ بارەگایی كۆمەلێ ب شێوەیێ فەرمی ل رێكەڤتی (٤-٨-٢٠٠٨) ل باژێرێ دهوكێ هاتە ڤەكرن. ئەندامێن دامەزرێنەر ژ شازدە باشنڤیسان پێكهاتیبوون ژ باشنڤیسێن ل خوارێ:

ئیسماعیل عیسا محەمەد(١٩٥٥)، رەئوف مستەفا عەلی(١٩٥٦)، ئیحسان مەجید عەبدولرەحمان(١٩٥٩)، حسێن حەجی محەمەد(١٩٦٤)، شێرزاد مستەفا ئەحمەد(١٩٦٤)، داوود فەتاح داوەتی(١٩٦٧)، فارس محمود حەسەن(١٩٦٧)، ئیسماعیل عبدالقادر سەبری-زیرەك(١٩٥٢ز)، عادل حاجی عەبدولعەزیز(١٩٧٠)، یونس عومەر عەبدوللا(١٩٧٠)، دلوڤان عەبدولرەحمان عەبدوللا (١٩٧٢)، ئەنەس عەبدوللا ئەحمەد(١٩٧٣)، بەرەڤان عەبدولعزیز شەعبان(١٩٧٤)، نەوزاد ناجی نوری(١٩٧٦)، رێبەر خورشید ئەبو زید(١٩٧٨)، حكمت ئەسعەد مەحموود(١٩٧٩)[٣٢].

پشتی دامەزراندنا كۆمەلێ، ئێكسەر هلبژارتن هاتن ئەنجام دان، و دەستەكا هەلبژارتی یا كۆمەلێ ژ ئەڤێن ل خوارێ پێكهاتیبوون:

١. عادل حاجی عەبدولعەزیز/ سەرۆك،

٢. رەئوف مستەفا عەلی/ بەرپرسێ پشكا كارگێری و دارایی،

٣. فارس مەحموود حەسەن/ بەرپرسێ پشكا راگەهاندنێ،

٤. ئیحسان مەجید عەبدولرەحمان/ بەرپرسێ پشكا رەوشەنبیری،

٥. یوونس عومەر عەبدوللا/ بەرپرسێ پشكا پەیوەندییان، حیكمەت ئەسعەد مەحموود/ یەدەك، رێبەرخورشید ئەبو زەید/ یەدەك.

دەستەكا هلبژارتی بۆ شیرەتكاریا كۆمەلێ پێكهاتیبوون ژ ئیسماعیل عیسا محەمەد، ئیسماعیل عەبدولقادر سەبری(زیرەك)، یووسف یوخنا ئیشو[٣٣].

پشتی كۆمەلێ باشنڤیسان ل دهوكێ هاتییەڤەكرن و دەست ب كار و چالاكیان د گشت بوارێن باشنڤیسیێ و تشتێن گرێدای ب باشنڤیسیێڤە كرن، شیان پرانییا باشنڤیسێن دەڤەرا بەهدینان كۆم بكەت و هایداری رۆشا وان و پشتەڤانیێ ل مافێن وان بكەت، ل دەڤەرا بەهدینان هژمارەكا گەلەك یا باشنڤیسیان هەبووینە و یێن هەین و كەڤنە ناڤدارێن وان ب شێوەیەكێ دیرۆكی پێكهاتینە ژ ئەڤێن ل خوارێ نە:

**مەلا عەبدوللایێ مامیسیێ رێكانی،** زانایێ ناڤدارێ دەڤەرا بەهدینان بوو، ل باژێرێ (زاخۆ) ئاكنجیبوو دەمەمان دەمدا ل وێرێ بوویە موفتیێ دەڤەرێ ژی، زمانێن عەرەبی و فارسی و توركی یا عوسمانی ب باشی دزانین، ل سال (١٢١٠مش - ١٧٩٥ز) یێ چوویە بەردلۆڤانیا خودێ مەزن[٣٤].ناڤهاتی خۆدێ باشنڤیسیەكا باش بوو و گەلەك دەستنڤیس ب رێنڤیسا خۆ ل پشت هێلاینە.

**محەممەد سەعیدە (میهری) كورێ مەلا عەبدولرەحمان كورێ مەلا یەحیایێ مزیری،** نێزیكی سال (١٨١٠ز) ژدایكبوویە، سالا (١٨٥٣ز) ب فەرمی بوویە موفتیێ قەزا ئاكرێ، وەك ئێكەم موفتیێ قەزا ئاكرێ دئێتە ل قەلەمدان، سەرەرای زانستێن ئاینی ب هۆزان ڤەهادنێ ژی رابوویە، و ب باشی زمانێن عەرەبی و فارسی دزانین[٣٥]. ناڤبری ب جوانی باشنڤیسی دنڤیساند و چەندین دەستنڤیسێن هەژی ب دەستێ وی هاتینە نڤیسین.

**ئیسماعیل پاشایێ دووێ كورێ محەممەد تەیار نەڤیێ ئیسماعیل پاشایێ دووی،** دووماهیك میرێ میرنشنییا بەهدینان، سالا (١٨٠٨ز) هاتییە سەر دونیایێ، ناڤهاتی ژلی كارێن گرێدای ب میرنشینیێ ڤە، گرنگی و پووتە ب رێنڤیسا پەرتووكان ژی ددا، ژ وان پەرتووكێن وی رێنڤیس كرین: دیوانا مەلایێ جزیری، غەزەل و ئاخڤتنێن گەلەك هۆزانڤێن فارس و كورد و تورك ب فارسی، دیوانا هەلبەستڤانێ ناڤدار

(فضولی) یە. نافهاتی سالا (١٨٧٢ز) مال ئاڤیی كریە[٣٦].

**مەلا حەسەن كورێ حەسەن چارپۆتیێ زیباری**، كەسایەتیێ ناڤدار دەڤەرا زیباریان دئێتە هژمارتن، خۆدی باشنڤیسیەكا جوان بوو، تایبەتی باشنڤیسیا نەسخ و پلپو فارسی- نەستەعلیق، گەلەك دەستنڤیس ب رێنڤیسا خۆ ل پشت خۆ هێلاینە ژ وان پەرتووكا (تحفه ابن حجر) كو سالا (١٢٦١مش- ١٨٤٥ز) رینڤیس كربوو[٣٧].

**محەمەد دەرویش محەمەد بەرۆشكی(دۆسكی)**، پاشناڤێ (الموصلی) ژی ل سەر ناڤێ وی زێدەكریە چونكو ئەو ل مووسل دژیا، سەبارەت ژیاننامەیا وی واتە ژدایكبوون و مرنا وی نەیا دیارە، ئەڤە لێ لدووڤ تابلۆیێ وی یێ ناڤدار ب باشنڤیسیا (ثلث)كو ل ژێریا دیرۆكا تابلۆی سال (١٢٧٠ك-١٨٥٤ز) نڤیسییە، رەنگە ل سالێن دەستپێكا چەرخێ نوزدێ هاتبتە سەر دونیایێ.

**مەهدی ئەفندی ئامێدی**، وەك ئێكەم مامۆستا ل قۆناغێن سەرەتایی ل ئامێدیێ هاتییە ل قەلەم دان[٣٨]. د بوارێ باشنڤیسیێ دا خۆدی باشنڤیسییەكا گەلەك باش بوو و د پرانیا باشنڤیسیان دا رۆلەكێ باش دگێراند، تایبەتی باشنڤیسیا نەسخ ورثلث و رۆقعە و ژ نڤیسینێن وی ل سەر پەرتووكا (منطق الطیر)یا (عطار نیشابۆری)كوبۆ سال (١٨٦٢ز) ڤەدگەرت،ب باشنڤیسیەكا گەلەگ جوان نڤیسییە.

**مەلا یونس شێخیێ ئامێدی**، زانا و ناڤدارێ دەڤەرا بەهدینان[٣٩]. ناڤبری شەهرەزایی د باشنڤیسییێ دا تایبەتی باشنڤیسیا نەسخ و ثلث و فارسی- نەستەعلیق هەبوو، گرنگترین كارێ وی یێ هۆنەری نڤیسینا قورئانا پیرۆز ب باشنڤیسیا نەسخ لسال (١٢٨٤ك- ١٨٦٧ز) دا. دووڤ دیرۆكا نڤیسینا قورئانێ هەتا سالا (١٨٦٧ز) هێشتا یێ ساخ بوو.

**مەلا ئەبو زەیدێ كێستەیی**، زانا و جوانڤیسێ ناڤدار ناڤێ وی (مەلا ئەبو زەید كورێ یوسف كورێ یاسین كورێ ئیسماعیل كورێ مەلا ئیبراهیم كورێ مەلا محەمەد كورێ ئەحمەد كورێ مەلا ئیبراهیم)ێ كێستەیی یە.ل سال (١٢٧٤مش - ١٨٥٧ز)هاتییە سەردنیایێ، ل نیڤا ئێكێ ژ چەرخێ بیستێ (١٩٢٥)ێ چوویە بەردلۆڤانیا خودێ[٤٠].

**مەلا عەبدولرەحمانێ بامەرنی كورێ زانا مەلا ئەحمەدێ بابك**، برایێ زانا مەلا نەجمەددین ئەلصدیقی یە، د ئەدەبیاتێن عەربی و فارسی دا یێ شەهرەزا بوو، و هۆزان ب عەرەبی و فارسی ڤەهاندبوون، ب ( مەلا عەبدولرەحمان شەوقی) یێ بەرنیاس بوو، هۆزانێن فارسی یێن (محەمەد سەعیدێ میهری) بناڤێ (گلیزار) ب دەستنڤیسێ خۆ نڤیسی بوون، ل سال (١٩٣٢ز) چوویە بەر دلوڤانیا خودێ[٤١]. ناڤبری ب شێوەیەكێ جوان باشنڤیسیا (فارسی- نەستەعلیق) دنڤیسا.

**سەید عەلی كورێ سەید عەبدولحەمیدێ شیلانیێ گولی**، زانایێ ناڤدارێ دەڤەرا گولیان، سالا (١٩٠٢) هاتییە سەر دونیایێ و (١٩٤٧)ێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ مەزن[٤٢]. ناڤهاتی ب شارەزایی باشنڤیسیا نەسخ و رۆقعە و (ثلث) دنڤیساند، چەندی دەسنڤیس ب دەستێ وی هاتینە نڤیسین.

**مەلا نەجمەددین ئەلصدیقی بامەرنی(مامیسیێ رێكانی)**، ئێك ژ زانایێن مەزن بوویە، ژمالباتەكا دیندار و زانا بوویە، مامۆستایێ تەكیا نەقشەبەندی بوو ل بامەرنێ، ل سالا ١٨٥٨ێ هاتییە دونیایێ، ب باشی زمانێن عەرەبی و فارسی دزانین، و خودان دەستنڤیسەكێ جوان بوو ئانكو باشنڤیس بوو، ل سال (١٩٤٩ز)ێ، چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ[٤٣].

**مەلا حسێن ئەحمەد حسێن مەلا یەحیا مزوری**، ژدایكبوویێ سالا (١٩٠٢ز)یە، كەسایەتییەكێ ئاینیێ دەڤەرێ بوو، خۆدێ باشنڤیسییەكا باش بوو و گەلەك كار ب دەستێن خۆ بەرهەڤ كربوون، ناڤهاتی سالا (١٩٦٤ز) چوویە بەر دلۆڤانیا یەزدانێ مەزن[٤٤].

**مەلا عەبدوللا هروریێ بەرواری**، زانایێ بەرنیاس، سالا (١٩٥٧ز) چوویە بەردلوڤانیا یەزدانێ مەزن[٤٥]. ناڤبری ب جوانی باشنڤیسیا (فارسی- نەستەعلیق) دنڤیسیا و شین تبلێن وی د دەستنڤیسان دا

بەرچاڤە.

**شێخ تاهر کورێ مەلا محەمەد شۆشی،** سالا (١٩١٧ز)، ل گوندێ شۆشێ ل دەڤەرا ئاکرێ هاتبوو سەر دونیایێ، ناڤهاتی هندەك ژ نموونەیێن خۆبێن باشنڤیسێ بۆ باشنڤیسێ ناڤدار (محەمەد تاهر کوردی) فرێکربوونە مەککەهێ، وی ژی دەستوورنامەیا باشنڤیسێ ب وی بەخشی و فرێکربوو. سالا ١٩٦٢ چوو بەر دلۆڤانیا خودایێ مەزن[٤٦]. ناڤبری د هەموو جۆرێن باشنڤیسێ یێ شەهرەزا بوو و گەلەك کارێن هۆنەرێ شنڤیسێ ل پشت خۆ هێلاینە.

**محەمەدحەسەن مەلا نەجمەددین کورێ مەلا ئەحمەد سەددیقێ بامەڕنی (مامیسێ رێکانی)،** سالا (١٩٢٤) ژدایکبوویە، کەسەك خودان شیان د بوارێ باشنڤیسێ دا، چەندین کارێن هۆنەرێ باشنڤیسێ ل پشت خۆ هێلاینە ژ وان نڤیسینا: سورەتێ یاسین، ناڤێن خودێ، دەفتەرا دووعا، دووعا داوییێنانا قورئانا پیرۆز و چەندین کارێن دیتر، سالا (١٩٩٨ز) چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ مەزن[٤٧].

**جەعفەر عەبدولڕەحمان ئەحمەد کەمەکی،** ل سالا (١٩٤٥ز) ژدایکبوویە، دەرچوویێ پەیمانگەها مامۆستایان ل مووسڵ، ناڤهاتی پشکداری د چەندین پێشانگەهان دا کریە، کارێن چێکرنا تابلۆیێن و هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێ باشنڤیسێ دا.

**زوهیر محەمەد مەلا ئەحمەد نەقشەبەندی بامەڕنی،** ل سالا(١٩٤٥ز) هاتیە دونیایێ، دەرچوویێ ئامادەیە، ناڤهاتی چەندین کارێن هۆنەری ئەنجام داینە و هەتا نها یێ بەردەوامە.

**نزار محەمەد ئەحمەد بەزاز،** ل سالا (١٩٥٠) هاتیە دونیایێ، ئاکنجیێ باژێرێ دهوکێیە، شوون تبلێن وی یێن باشنڤیسێ ل گەلەك جهێن دهوکێ هەنە، پشکداری د چەندین پێشانگەهان دا کریە، ناڤهاتی هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن هۆنەری دا.

**وەلید مەولوود هاجانی،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥٠) یە، دەرچوویێ قۆناغا ناڤنجی یە، دەستپێکرنا خۆیا باشنڤیسێ ل بەغدا دەستپێکریە، سەرەڕای باشنڤیسێ کارێن نیگارکێشانێ ژی دکت، ناڤهاتی هەتا نها ل باژێرێ زاخۆ بەردەوامە د کارێن خۆیێن باشنڤیسێ دا.

**سەددیق حامد خالد نزارکی،** ل سالا (١٩٥٠) هاتیە سەر دونیایێ، دەرچوویێ پەیمانگەها مامۆستایانە ل هەولێرێ، پشکداری د چەندین پێشانگەهان ل بەغدا و مووسڵ و دهوکێ کریە، چەندین خولێن باشنڤیسێ ل دهوکێ ڤەکرینە، ناڤهاتی هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن هۆنەری دا.

**خالد محەمەد یونس دۆسکی،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥١ز)، دەرچوویێ ئەکادیمیا هۆنەرێن جوان ل بەغدایە، ناڤهاتی خۆدی چەندین کارێن هۆنەری بوویە، باشنڤیسیا وی د ئاستەکێ باش دابوو، سالا (١٩٩٨ز) چوویە بەر دلۆڤانیا خودایێ مەزن.

**ئیسماعیل عەبدولقادر سەبری دۆسکی(زیرەك)،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥٢ز)، ئێکە ژ ئەندامێ دامەزرێنەر و ئەندامێ دەستەکا شیرەتکاریا کۆمەڵ باشنڤیسێن کوردستانێ - تایێ دهوکێ، پشکداری د چەندین پیشانگەهان دا کریە، هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێ باشنڤیسێ دا.

**یووسف یوخنا ئیشو(یوسف بەرواری)،** سالا (١٩٥٤ز) هاتیە دونیایێ، دەرچوویێ ئامادەیی، ئێکە ژ ئەندامێ دامەزرێنەرێ کۆمەڵ باشنڤیسێن کوردستانێ، تایێ دهوکێ، ناڤبری پشکداری د چەندین پێشانگەهان ل بەغدا و مووسڵ و وەلاتێ سوریێ دا کربوو، سالا (٢٠٠٩ز) چوویە بەردلۆڤانیا خودێ مەزن.

**محەمەد سەلیم شوکری،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥٤ز) دەرچوویێ پەیمانگەها مامۆستایان، پشکداری د چەندین پێشانگەهان و ڤیستەڤالان دا کریە، هەروەسا پشکداری د دو خولێن سەرانسەری یا ئێکێ ل مووسڵ دگەل باشنڤیسێ ناڤدار یووسف زنوون و یا دووێ ل بەغدا خولێن باشنڤیسی و زەخرەڤەیدا کریە، دیسان ب نڤیسینا ناڤونیشانێن چەندین پەرتووکا و دیزاینکرنا وان ڕابوویە، ناڤهاتی هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێ باشنڤیسێ دا.

**ستراك میساك كیورك،** سالا (١٩٥٥ز) ل زاخۆ هاتییە سەر دونیایێ، دەرچوویێ زانینەگەهێ یە، پشکداری د چەندین کارێن باشنڤیسی و هۆنەریدا کریە، ژ وان پێشانگەها تایبەت سالا (١٩٨٨ز) ل بەغدا، و هەروەسا پشکداری د پێشانگەهێن کۆمەڵ باشنڤیسێن عیراقێ ل بەغدا کرییە، هەتا نها بەردەوامە سەر کارێن خۆیێ باشنڤیسیێ دا.

**ئیسماعیل عیسا محەمەد،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥٥ز)یە، دەرچوویێ قۆناغا ئامادەیێ یە، ئێکە ژ ئەندامێ دامەزرینەرێ کۆمەڵ باشنڤیسێن کوردستانێ، تایێ دهوکێ، و ئەندامێ دەستەکا شیرەتکار دئێتە هژمارتن، شوون تبلێن هۆنەریێن ناڤهاتی د گەلەك جهان دا هەنە، ناڤبری هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن هۆنەری دا.

**نەبیم حەنا منسۆر،** ل سالا (١٩٥٦ز) هاتییە سەر دونیایێ، دەرچوویێ قۆناغا ئامادەییە، ناڤبری گەلەك پێنگاڤ د بوارێ هۆنەری باشنڤیسیێ دا ئاڤێتینە، هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێ باشنڤیسیێدا.

**یوبرت ئودیشو ئەسی،** ژدایکبوویێ سالا (١٩٥٦ز) یە، پشکداری د چەندین کارێن هۆنەرێ باشنڤیسیێ دا ئاڤێتینە، ناڤهاتی هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن باشنڤیسیێ دا.

**فەتحی شوکری ئەحمەد،** سالا (١٩٥٧ز)ێ هاتییە سەردنیایێ، دەرچوویێ قۆناغا ئامادەییە، ی پشکداری د چەندین پێشانگەهاندا کریە، ژ وان پێشانگەهێن ل مووسڵ و بەغدا و کووت و دیالا و بەسرا دا هاتین ڤەکرن، ناڤهاتی هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن باشنڤیسیێ دا.

**ناجی محەمەد رەشید،** سالا (١٩٥٨ز) ژدایکبوویە، دەرچوویێ ئامادەییە، پشکداری د چەندین کارێن هۆنەریدا کریە و هەتا نها یێ بەردەوامە د کارێن خۆیین باشنڤیسیێ دا.

**کەمال نەعمان سەیفەددین،** ژدایکبوویێ سال (١٩٥٨ز)ێ یە، خۆدی باوەرنامەیا دکتورایێ یە، چەندین بەرهەمێن باشنڤیسی یێن هەین، پێنگاڤێن باش د ڤی بواری دا ئاڤێتینە، هەژی گۆتنییە هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێ هۆنەری دا.

**فەرید بنیامێن جەبۆ،** سالا (١٩٥٨ز)ێ هاتییە دونیایێ، دەرچوویێ ناڤنجییە، هەوڵ بزاڤێن باش د بوارێ باشنڤیسیێ دا ئاڤێتینە، ناڤهاتی هەتا بەردەوامە د پێشڤەبرنا هۆنەرێ باشنڤیسیێ دا.

**ئیحسان مەجید عەبدولڕەحمان،** سالا (١٩٥٩ز) هاتییە دونیایێ، دەرچوویێ زانینگەهێ یە، هەولێن باش د بیاڤێ باشنڤیسیێ و نیگارکێشانێ دا ئاڤێتینە، ناڤبری هەتا نها بەردەوامە د کارێن خۆیێن هۆنەری دا.

تەڤایا باشنڤیسێن دیتر ب شێوەیەکێ پوختە و تنێ نڤیسیان ناڤ و سالا ژدایکبوونا وان پێکهاتینە ژ ئەڤێن ل خوارێ:

عەبدولجەبار ئەحمەد محەمەد(١٩٦٢)، بەهجەت محەمەد محەمەد عەلی(١٩٦٢)، حسێن حەجی محەمەد(١٩٦٤)، شێرزاد مستەفا ئەحمەد(١٩٦٤)، فاڕوق ساڵح حەسەن(١٩٦٥)، فەخری حەمید عەبدەلڕحمان کیکانی (١٩٦٥)، جەمشید سەعددین محەمەد سەعید (١٩٦٧)، خالد ئیسماعیل حەسەن (١٩٦٧)، داوود فەتاح داوەتی (١٩٦٧)، سەلاحەددین ئەحمەد محەمەد(١٩٦٧)، عەممار حسێن محەمەدسعید (١٩٦٧)، فارس محمود حەسەن(١٩٦٧)، خەلیل عەبدولقادر سەبری(١٩٦٨)، سامی ئەحمەد سلیمان (١٩٦٨)، سەدقی سەددیق سەعدوللا(١٩٦٨)،محەمەدئەحمەدعەبدوللا(١٩٦٨)، ئەبوبەکر عەبدولحەمید یووسف(١٩٦٩) دلشێر یوونس یەعقووب (١٩٦٩)، محەمەد عەلی محەمەد یەزدین(١٩٦٩)، دلۆڤان حسێن محەمەد أمین(١٩٦٩)، عەبدولسەلام عەلائەددین زیائەددین(١٩٧٠)، سابر حەسەن یووسف (١٩٧٠)، عادل حاجی عەبدولعەزیز (١٩٧٠)، مەجید ئەمین یاسین(١٩٧٠)، یونس عۆمەر عەبدولا (١٩٧٠)، عەبدوللا مەعروف عەزیز (١٩٧١)، شێروان عەبدولقادر سەبری (١٩٧١)، محەمەد ساڵح رەمەزان (١٩٧١)، وەلید خالد محەمەد (١٩٧١)، دلوڤان عەبدولڕەحمان عەبدوللا (١٩٧٢)، شێرزاد نایف عەلی (١٩٧٢)، ئەنەس عەبدوللا ئەحمەد (١٩٧٣)، عەبدولڕەحمان ئیسماعیل حاجی(١٩٧٣)، نیزامەددین عادل تەها(١٩٧٣)، بەرەڤان عەبدولعزیز شەعبان(١٩٧٤)، سەلاح ئەحمەد مستەفا(١٩٧٤)،

عەبدولقادر ڕەمزی ئەحمەد(١٩٧٤)، نزار عەبدولوەحید ئەبابەکر(١٩٧٤)، عەلی شەعبان ئەحمەد(١٩٧٥)، فەقە خەلیل فەقە(١٩٧٥)، مەسعوود خالد ئیسماعیل(١٩٧٥)، ئەیاد سالح عەبدوللا (١٩٧٦)، سامی محەمەد ئەحمەد یاسین(١٩٧٦)، فاخرحەسەن یووسف(١٩٧٦)، نەوزاد ناجی نوری(١٩٧٦)، زەینەل جەعفەر عەلی(١٩٧٧)، سالم سەعید قەهار(١٩٧٧)، شەعبان حسێن محەمەد(١٩٧٧)، زیائەددین سەددیق عەبدوللا( ١٩٧٨)، ڕێبەر خورشید ئەبو زید(١٩٧٨)، بسپور محەمەد سەلیم(١٩٧٩)، حکمت ئەسعەد مەحمود(١٩٧٩)، دەلیل محەمەد جاسم(١٩٧٩)، جوبەیر سەعید عوسمان(١٩٨٠)، ڕێبەر تەیب عەبدوللا (١٩٨٠)، هندرین شاکر ئەمین(١٩٨٠)، محسن گورگو سیتو(١٩٨١)، بیلال سەددیق حامد(١٩٨٢)، بەهزاد حەسەن محەمەد ئەمین(١٩٨٣)، میرخان قرو سمو(١٩٨٣)، سیپان عەبدولعەزیز شەعبان(١٩٨٩)، سەعدەدین محەمەد سەعید(وەغەرکریە)، بەدیع ئیسماعیل شێخو(وەغەرکریە)، کمال ملکی، غازی.

داوی ئاخفتن ئەوە کو ڕەوشەنبیر و حەژێکەرێن زانستێ ل دەڤەرا بەهدینان گرنگییەکا زێدە ب هۆنەرێ باشنڤیسی ب هەموو جۆرێن وێڤە دایە و ددن، سەرەرای وێ چەندێ هەولەکا باش ژ بۆ پێشڤەبرنا باشنڤیسێ ئاڤێتینە و هەتا نها ب شێوەیەکی پێشکەفتیر دئاڤێژن. ڕەنگە گەلەك باشنڤیس ژ لایێ مەڤە نەهاتبنە نڤیسین، لێ هۆکارێ نەنڤیسینا وان نەبۆ خەمساریا مە دژڤرت لێ ئەم نەشیاین بەرهەمێن وان بدەستڤە بینین و لێکۆلینی سەر بکین. ل ڤێرێ بابەتێ خۆ دێ ب تابلۆیێ کۆمەلا باشنڤیسێن کوردستانێ – دهوك، ب زمانێ عەرەبی ب باشنڤیسیا کوفی ب نڤیسینا باشنڤیس مەسعوود خالد ئیسماعیل (جمعیة خطاطي کوردستان- دهوك) داوئینین.

## ژێدەر و پەراوێز


١. اندر رابینسون، تاریخچە پیدایش خط ونوشتار، ترجمە یلدا بلارک، انتشارات سبزان، (تهران: ١٣٩٠ش)، ص ص ٢٠-٢١.

٢. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە:کریستوفر واکر، تاریخ خط میخی، ترجمە: نادر میرسعیدی، انتشارات ققنوس، (تهران: ١٣٨٨ش)، صص ١٠- ٩٥.

٣. بۆ زانیاریێن پتر سەبارەت شوینەوارێن خەنەس بنێرە: دکتور حسن احمد قاسم بەرواری، شوینوارێن خەنەس، چاپخانا هاوار، (دهوك: ٢٠١٣ز) ، ب ٨-٥٠.

٤. وەرگرتی ژ مۆزەخانەیا دهوك، ژمارەیا (٤٥٠م.د).

٥. هەمان، ژمارە.

٦. هەمان، ژمارەیا (٢٠٧م. د).

٧. کامل سلمان الجبوری، موسوعة الخط العربي(الخط الکوفي)، دار و مکتبة الهلال، (بیروت: ١٩٩٩ز) ، ص ص ٥٥-٥٧.

٨. ئەڤ نموویە ژ ئەرشیفێ باشنڤیسێ ناڤدار (سەدیق حامد نزارکی) هاتییە وەرگرتن..

٩. دکتور فاخرحسن گولی، (جمالیة لفظ الجلالة)، غیر منشور، ص ص ١٢-١٦.

١٠. حبیب افندي بیدابیش، الخط و الخطاطون، ترجمة و تقدیم: سامیة محمد جلال، مراجعة: الصفصافي احمدالقطوري، المرکز القومي للترجمة، (القاهرة:٢٠١٠)، ص ٥٦.

١١. حبیب افندي بیدابیش، المصدر نفسه، ص ٥٧.

١٢. حبیب افندي بیدابیش، المصدر السابق، ص ٦٦.

١٣. باسم ذنون: من افاق الخط العربي، دار للثقافة العامة، (بغداد: ١٩٩٠ز) ، ص ٩٣.

١٤. عفیف البهسیني: معجم المصطلحات الخط العربی و الخطاطین، مکتبه لبنان ناشرون، (بیروت: ١٩٩٥)، ص ٦٤.

١٥. عفیف البهسیني، المصدر السابق، ص ٦٤.

# بنگەهێ هۆنەرێ شێوەکاری
# ل پارێزگەها دهۆکێ

**فەهمی بالایی**

هۆنەرێ شێوەکاری، پەیوەندییەکا ب هێز ب هەبوونا مرۆڤی ڤە هەبوویە. ژ دەستپێکا ژیانێ بوویە شاهدێ بۆیەرێن دیرۆکی و سەرۆکانییا چاڤکانی و زانینا رووپەلێن دیرۆکێ، مرۆڤ دروستکەرێ وێنەیە. ژ وێنەیێن سەر دیوارێن شکەفتان د دەما بەردین دا، ئەڤ هەموو ژ بۆ مە ژێدەرێن گرنگن کۆ حەتا رۆژا ئیرۆ بەردەوام بوویە. د سەر وێ ئێکێ را پێکهاتنێن هۆنەری ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی د جودا بوون. لێ ئەڤە هەموو شاهدێن وێ ئێکێ نە کۆ مرۆڤی پێویستیێن خۆ ژ بۆ ڤەگوهاستن و ئەزمونا ژیانێ پێکئینان و بەشەك ژ وی هۆنەری د بەرهنگاری و هەڤرکییەك بەردەوام یا بێی داوی دا بوو. ژ بۆ پاراستنا مرۆڤ و ڤەژاندنا قەهرەمانی و پالەوانیێ، د جڤاك و خۆداوەندێن وان دا. کۆمکرنا د ناڤبەرا رەمزێن وێنەیی و ئاڤاکرنا میماری یێن کو مرۆڤان دروست کرین، ژ بۆ رۆژا ئیرۆ وەك خزینەکێیە. رۆهنکرن و ئاشکراکرنا ڤەشارتی و نهێنییێن ژیانێ، گەلەك ژ ڤان راستیێن هۆنەری شاهدێن وێ دەمی نە. هەروەسا ژ بۆ زانین و خۆشیێ، ژ بۆ زانین و دیرۆکا وی دەمی ژێدەرەکە. مرۆڤ دکاریت بێژیت: هۆنەر نە تەنێ د چارچۆڤەیا بەرپرسیارییا خۆدیکا ژیانێ دا بتەنێ مایە. هەر چڤاس ژ دەمین کەڤن بن ژی، لێ رۆژا ئیرۆ ئەم تێدا دژین ئەو ژ بۆ جوانی و هەستێن جوانیێ و حەزکرنا رێیەك هۆنەری تێ حەزکرن. گەر ئەم بپرسین دیاردا هۆنەری د ژیانێ دا چاوایە؟ و مرۆڤ چاوا گەهشتە وێ باوەریێ کۆ هەست ب خۆشییا هۆنەری یا پەیوەندیدار بکەت، ژیانا ب زەحمەت یا سرۆشتی؟ و چاوا هەر ل رۆژا مرۆڤ تەنێ وەك گیانەوەرەکی بیۆلۆژیك هەبوونا خۆ پێکدئینیت؟ کو بەشەکە ژ سرۆشتی، ژیان و تێکلیا دگەل سرۆشتی و تێگەهشتن، زالبوون ل سەر سرۆشتی و ژێ جودابوون و پێکهاتنا جڤاکان.

چەندین نێرینێن مرۆڤی یێن دیرۆکی و فکری ژ بۆ ژیانێ و تێگەهشتنا نهێنییێن ژیانێ و سرۆشتی ژ گوهارتنێن جڤاکی ب سەر مرۆڤی دا تێن و بەرفرەهـ دبوون. پشتی پێکهاتنا وێنەیەکێ هۆنەری یێ گشتی ئەڤە هەموو پالدەرێن گوهارتن و پێشدابرنێ و دەستئینانا کارێ زانستی بوون، ژ بۆ گوهارتنا بەردەوام ژ پەیوەندییێن هەڤرك و دانوستاندنێن د ناڤبەرا هشیاری و رەیالیتەیێ دا[1]. دەما ئەم ب تایبەتی قالا هۆنەر ب ئاوایەکی گشتی و هۆنەرێ شێوەکاری ب ئاوایەکی تایبەتی دکەین، ئەڤەژی ل هەر قۆناغەك و د ناڤا هەر جڤاکەکێ دا د رەوشەکا تایبەت دا دژیت دەما ئەم بەراوردیەکێ د ناڤبەرا جڤاکێن رۆژهەلات و رۆژاڤا دا بکەین، هەرچەند ئەڤ شێوەیێن هۆنەر و شارستانی ل ڤان هەرێمان کەڤنترین ژی، لێ ژ هند سەدەمان مە نکارییە ڤێ پێشداچوونێ د هۆنەری دا

پێك بینین و د ناڤا جڤاكا خۆ دا بدەین پەژراندن. گەر ئەم ب شێوەیەكێ گشتی و زانستی ل دیرۆكا كوردستانێ و بشێوەیەكی تایبەتی ل دیرۆكا چاند و هۆنەرێ كوردی بنێرن؛ دێ ژ بۆ مە ئاشكەرا بیت كۆ كوردستان خۆدی چاند و هۆنەرەكە دەولەمەندە. هەرێما بەهدینان پشكەكا گرنگ یا ڤی دیرۆكێ دناڤا خۆدا هەمبێز دكەت. لێ مخابن د ڤێ هێلێ دا لێكۆلینێن زانستی پێكنەهاتنە. گەر چەند میناك ل سەر ڤێ ئیكێ كەتبن بەر دەستێن مە، ئەو ژی پرانی ژ ئالیێ بیانییان ڤە هاتنە نڤیساندن و گەلەك راستی ژ دیرۆكا هۆنەرێ كوردی وەندا بوونە. پرانی ژی د ناڤا گەلێن هەرێمێ و وەلاتێن داگیركەرێن كوردستانێ دا هاتنە وەنداكرن. دیرۆكا چاند و هۆنەرێ كوردی، هەر ژ شارستانییا مەزۆپۆتامیا یا كەڤن حەتا ئیرۆ.

گەر ئەم دیاردێن جیهانێ ژ دیرۆكا هۆنەری بدەین بەرچاڤێن خۆ، د جیهانا هۆنەرێ هەر گەلەكی دا دیرۆكەك و بنگەهەك ژێ را هاتییەدانین. هەروەها چەندین سومبۆلێن نەتەوە و فۆلكلۆر، نەخش، نیگار، نڤیس و ژیانا جڤاكی ژێ را بوونە سومبۆلێن هۆنەری و هۆنەرەكی رەسەن ل سەر بنگەهێ نەتەوی هاتییەدانان.

گەر ل سەر دیرۆكا كوردستان و فۆلكلۆر، رەنگ و پەیوەندییا گەلێ مە ب ژیانا جڤاكی، كارێن رۆژانە رەوشا جڤاكێ، دیمەنێن جوان یێن سرۆشتێ كوردستانێ، وەك چیا، دار و بەر، ئاڤ، رەنگێن تەیران و دیمەنێن جوان یێن كاركەر و جۆتكارێن كوردستانێ د هۆنەرێ خۆ دا بكاربینین. ئەڤە هەموو و كوردستان، د ناڤا دلێ شارستانییا مەزۆپۆتامیا دایە، كۆ بنگەهێ هەری كەڤن یێ شارستانییا جیهانێ یە و ژیانێ ل ڤێرەدەستپێكرییە و شارستانییا سومەر، ئەكەد، بابل، ئاشور میدی و...هتد ل سەر ڤی خاكی بوویە. نها ژی گەلەك شوینەوارێن كەڤن هەنە ب شێوەیەكی هۆنەری ل سەر گەلەك كەڤر، شكەفت، شورهە و كەلایێن كوردستانێ مانە. مینا شكەفتا هەلامەتا، شكەفتا چارستوون و مالتا ژێرێ ل بازارێ دهۆكێ.و...هتد[٢]. ژبلی كارێن دەستی كو ل سەر نەخش و ژیانا رۆژانەبوون بدەستێن ژن و مێرین ڤێ هەرێمی هاتینەچێكرن. پارێزگەها دهۆكێ و خەلكێ كوچەرات و گوندێن ڤێ دەڤەرێ دڤی واری دا گەلەك دەولەمەند بوون. د دیرۆكا هەر ملەتەكی دا بەرگری و بەرەڤانی ژ هۆنەر و چاند و شارستانییا وان هاتییە كرن و دیرۆكا خۆ پاراستیە، مرۆڤ دكاریت ببێژیت: دڤێ هەرێمێ دا پەیوەندییەكا بازرگانی هەبوو ئەڤەژی پالدەرەك بوو ژ بۆ تێكەلكرنا هند ئالیێن هەڤپشك د هۆنەر و زانینێ دا. كوردستان ژی بەشەكی گرنگێ ڤێ دیرۆكێ بخۆڤە دگریت گەر ب هند ناڤێن دی ژی بیت، لێ راستییا وێ هێشتا لبەر لێكۆلینێن زانستییە، ئەڤەژی گرێدای قۆناغێن ژیانا ب هەڤرا گرێدایە.

دگەل بۆرینا ژیانا وی دەمی و گرێدانا جڤاكێ وی دەمی ب هند پێویستییێن ژیانێ نەخش و نیگارێن كوردی ژی ل گەلەك دەڤەران بەلاڤ ببوون. لێ هەر وەك هاتە ئاشكراكرن هند جوداهی د ناڤ بەرا وان دا هەبوون ژ هێلا بكارئانینا شێوەیێ هۆنەری یێ وی دەمی ژ دەڤەرەكێ بۆ یا دی.

ل ڤێرە ئاشكەرا دبیت كۆ گەلێ كورد ژی دخواست مینا نەتەوەیێن دی د سەدەیێ ناڤین دا گرنگییێ بدەت رەسم، نەخش و نیگاران. تایبەت ئەو نەخش و نیگارێن گرێدایی ژیانا كوردان یا وی دەمی، وەك نەخشێن ل سەر دەرگەهـ و پەنجەران، دیوار و ئالەتێن شەر، وەك شێوەیێ میناتور ب كار دئانین.

## دەستپێكا هۆنەرێ شێوەكاری ل پارێزگەها دهۆكێ

پشتی شەرێ جیهانی یێ دویێ، هۆنەرمەندێن عیراقی ب شێوەیەكی گشتی و هۆنەرمەندێن كورد ب شێوەیەكی تایبەتی د چارچوڤەیەك تەنگ دا هۆنەرێ خۆ پێكئینان. ئەڤ پێكهاتە؛ گرێدانا هۆنەرمەندی ب ناڤەرۆكێ ڤە، یان گرنگی نەدانا

روخساری د تابلۆی دا بوو. ئەڤەژی دبیت ئەگەرا وێ ئێکێ کو پرانییا تابلۆیان شێوەیێن ئاشکرا و بابەتێن کو زوی بێنە فامکرن هاتن بکارئینان. ئەڤەبوو ئەگەرا وێ کو شێوەیێن پۆستەر یان سەرهاتییان بۆ مە ڤەگێرن هند ئالییێن هونەری، ژ دەست دابوون. سەدەمین ڤێ ئێکێ ژی مرۆڤ دکاریت ل سەر چەند خالان دەست نیشان بکەت:

**ئێك،** ژ بەر نەبوونا بنگەهەکی خورت یێ دیرۆکا هۆنەرێ شێوەکاری و نەبوونا هند خواندنگەهـ و ریبازێن تایبەت کو هۆنەرمەند بکاریت ژ بۆ خۆبکەت بنگەهـ و بشێوەیەکی زانستی هۆنەرێ خۆ پێك بینیت.

**دو،** گرێدانا هۆنەرمەندی ب ناڤەرۆکێ ڤە پێتر ب روخساری یان شکلی ژ بەر بوویەرێن رۆژانە دقەومین. هۆنەرمەند پال ددا وێ کو بینەری یان ژی گەل ب بابەتێن تابلۆیێن خۆ رازی بکەت. ئەڤەژی د بوو سەدەما وێ ئێکێ کو هۆنەرمەند نکاریت ژ بوو خۆستیلەك تایبەت هەلبژێریت. ڤێ ئێکێ ژی دو دلی ل نك هۆنەرمەندی پەیدا دکر و ژ روویێ دەرڤە یێ تابلۆیی هاتبوو دوورکەتن.

**سێ،** نەبوونا جەماوەرێ هۆنەرێ شێوەکاری ب شێوەیەکی گشتی و نەبوونا رەخنە و لێکۆلینێن هۆنەری ل سەر خەباتێن هۆنەرمەندان. هەروەها نەبوونا تێکەلییا هۆنەرمەندێن مە د گەل هۆنەرمەندێن جیهانی، بتایبەتی یێن ئەوروپی. نەبوونا مەتەریالێن پێویست ژ بۆ کار و خەباتێن هۆنەری.

ل هەرێما بەهدینان: گەلەك دیاردێن پێشدابرنا هۆنەری دەرکەتن. لێ ژ بەر کارتێکرنێن ئۆلا مووسلمانیێ و پاشڤەمانا جڤاکا کوردی یا وێ دەمی، نەکارین بەردەوامی ب خەباتا خۆ یا هۆنەری بدەن. وەك هەلبەستڤانێ کلاسیکێ کورد:

## بەکر بەگێ ئەرزی (١٧٦٩ز)

ئەڤ هۆنەرمەند و شاعیرە ل سالا ١٧٦٩ان ز. ل گوندێ ئەرز کو دکەڤیتەسەر چیایێ مەتینی رۆژئاڤایێ بامەرنێ ژ دایکبوویە. ژ بنەمالەکا ناڤدارە. دیمەنێن جوان یێن کو چیایێ مەتینی خەملاندی و دەور و بەرێن گوندێ وی ژ دیمەنێن گول، نێرگز، سولاڤ، کانی، دار و بەرێن ڤی چیای ئەڤ شاعیرە پال دا وێ ئێکێ کو ئافراندنێ ژ جوانییا ڤان دیمەنان بکەت[٣]. ئەڤ شاعیرە زێدەی ئەبقەریەتا شیعری هۆنەرمەندەکی مەزن بوو. وەك پەیکەرتاش دهات ناسکرن و نیگارمەندەکی خۆدی شیان بوو. لێ مخابن ژ ئەگەرا کارتێکرنا ئۆلا مووسلمانتیێ دەست ژ کارێ خۆ یێ هۆنەری بەردا. وەسا تێ گۆتن کو ئەگەر بیر و باوەرێن وی یێن ئۆلی نەبانا رێگرێن پێشدابرنا هۆنەرێ وی، کو مووسلمانان رەسم حەرام کر بوو دروست کرنا خودان رحان، دبوو ئێك ژ رەسامێن ناڤدارێن ڤێ هەرێمێ. ڤی هۆنەرمەندی رەسمێ غەزالەکێ ژ داری چێکربوو و دیاریێ ئیسمایل پاشایێ میرێ ئامێدیێ کر بوو. دەما مرۆڤی چاڤ پێدکەتن مینا غەزالەکا ب روح دهاتە بەرچاڤێن مرۆڤی. هەروەسا دبێژن جارەکێ دگەل کورێ خۆ دچیتە چیایی و دخوازیت کەرەکی ژ داری چێکەت. دەما دچن دارەکێ دەست نیشان دکەت و دبێژیتە کورێ خۆ:(بڤرێ خۆ ل ڤی جهێ دارێ بدە). دەما کورێ وی بڤرێ خۆ ل دارێ دخیت یەك بووهوست ل ژۆر دکەڤیت، ئەو دبێژیتەکورێ خۆ :(کەرێ مە گوهەکی وی کێمە). کورێ وی دبێژیت: هێشتا تە دەست پێ نەکریە چاوان تو دزانی؟ داویێ دارا خۆ پارچە پارچە دکەن و ل داویێ کەرەکی خۆشك ژێ چێدبیت، لێ گوهەکی وی کێمە. پاشی تری داتنیتە سەر پشتا کەری و ژ ئیسمایل پاشایێ ئامێدیێ را دیاری دکەت. دەما نێزیك دبیت پاشا نزانیت کو کەرێ دارییە و وی چێکریە. ئەو دەمی دیاری وی دکەت. پر کەیفا پاشای ب وی خەلاتێ مەزن دهێت. لێ مخابن جڤاکا کوردی د وی دەمی دا ب چاڤەکی نزم لێ دنێری. داویێ نەچار دمینە کو دەست ژ هۆنەرێ خۆ بەردا و ب تنێ شیعر نڤێسی. نها ژی د دیرۆکا ئەدەبیاتا کوردی دا وەك شاعرەکی مەزن تێ ناسین[٤].



## قەدری حەیران

۱۹۳٤/۷/۱ ل باژێرێ زاخۆ هاتییە سەر دونیایێ. دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوانە ل بەغدا، گەلەك زمان دزانین وەك.(كوردی، عەرەبی، ئنگلیزی و هندەك روسی)

هۆنەرمەند قەدری ئێكە ژ سەركێشێن بزاڤا شێوەكاری ل دەڤەرا بەهدینان و پارێزگەها دهۆكێ. هەرچەندە ئەو بخۆ خەلكێ باژێرێ زاخۆیە لێ ژ بەر سەختی و ئاستەنگیێن ژیانێ گەلەك جارا بوو باشوور، ناڤەراست و كوردستانێ هاتییە ڤەگوهاستن. قـەدری خـودان شیانێن هۆنەرێ پەیكەرتاشی و نیگاركێشیێ بوویە، ئاشقێ بەفرا سپی بوو دناڤا سەرمایا كوردستانێ دا دلێ خۆ ب پەیكەرێن بەفرا سپی یا وەك پورا وی گەرم دكر. ژ ڤیانا بەفرێ بەر ب ڤیانا خاكێ كوردستانێ چوو، لەوما وی دەستێن خۆیێن هۆنەریدا بدەستێن خۆ تەڤن كرە ژیانا خۆیا هوندرین و پەیكەر و بۆیەرێن جڤاك و ناڤدارێن كوردستانێ پێ ئافراند. نە ژ دوركەتنا وەلات و نەژی ژ گەفێن رژێمێ و نەژی ژ زیندانێن تاری خۆ دوورنەكر. هەردەم هێزا خۆ ژ ڤیان و موراڵێ هۆنەری دگرت و ب چەكێ هۆنەری بەرسڤا هەر ڤۆناغەكێ ددا. ژ بەر وێژی ئیرۆ بەرهەمێن كو ل پاش خۆ هێلاین سەرهاتیبا ژیانا هۆنەرمەندەكێ نەناسكری ڤەدگێرن. دبیت هاتبیتە ژبیركرن و دبیت نەهاتبیتە ناسكرن، لێ بەرهەمێن وی هەردەم وەك بەرسڤەكا دەمی و ژیندارییا قەدری بمە ددەن ناسكرن و مالباتا وی و گەلێ وی پێ سەربلندە. ئەگەر ئەم هندەك خۆ بەردەینە ناڤا خەبات و بەرهەم و ژیانا ڤی هۆنەرمەندی دێ لبا هەرئێكی ژمە گەلەك پرسێن بێ بەرسڤ پەیدا بن. ژ بەر ڤێژی دڤێت هەر ئێك ژمە هندەك ژ دلسوزییا ل هەمبەر هۆنەری و هۆنەرمەندان وەربگریت. دا دیرۆكا مە ژڤان كەسان بێ پار نەمینیت. دەمی من پەیوەندی برێكا هۆنەرمەند فارس ب مالباتا قەدری حەیران كری ئەو گەلەك هێرس بوون خانما وی دگۆت كەس مە ناسناكەت قەدری كەسەكێ و چەندایە ژ بەر وێژی بلا هەر وەندا بمینیت و بەرهەم و ژیانا وی بلا دناڤا چار دیوارێن مالێدا بمینیت. ئەم ناخوازین ل سەر روپەلێن رۆژنامە و كۆڤاران ژیان و وێنێن وی هەبن و كەسەك دەرێ مە نەڤوتیت. لێ پشتی هندەك دگەل كەتیم سوحبەتێ و بوو دیاركری كو ئەم و هوون ب هۆنەر و بەرهەمێن قەدری سەربلندین و ئەڤە ملكێ ملەتەكی یە وان رێ دا كو ڤان دوكۆمێنتان ژێ وەربگرم و ب خواندەڤانی بدەم ناسكرن.

## دەستپێکا هۆنەری پەیکەری:

ژ بەر خۆزایا هەرێما ئەو لێ دژیا کو باژێرێ زاخۆ و دەردورا وێ بوو زڤستانێ گەلەك بەفر لێ دباری وی هەول ددا ژ بەفرێ پەیکەران دروست بکەت، ئەڤە وەك دەستپێکەك بوو ژ بۆ هۆنەری پەیکەرتاشینێ لبا قەدری پاشی هێدی هێدی خۆ فێری دروستکرنا پەیکەرێن تەقنێ کر. هەرچەندە دەستپێکەك بوو لێ ژ لایێ خەلکی ڤە گەلەك دهاتەحەزکرن و وەك هۆنەرمەندەك دهاتە ناسکرن. سالا ١٩٥٦ وەك مامۆستا ل خواندنگەها سەرەتای هاتە دامەزراندن پاشی هاتە ڤەگوهاستن بوو باشوورێ مووسل « حوت و بعاج» پاشی وەك مامۆستا ل خواندنگەها زاخۆ هاتە دامەزراندن سالا ١٩٥٩ پاشی سالا ١٩٦٣ بوو گوندێ بێتاسێ هاتە ڤەگوهاستن، پاشی ژ بەر ئەگەرێن سیاسی سالا ١٩٥٩ هاتە گرتن بۆ زیندانا نگرەت سلمان. هەروەکی دڤێ دوکۆمێنتێ دا دیارە کو بشێوەکێ فەرمی بریارا گرتنا وی دگەل چەند هەڤالێن وی هاتییە دەرخستن.

سالا ١٩٥٩ ژ بۆ جارا ئێکێ وی چاڤ ب بارزانی کەتن دەمی ژ روسیا ڤەگەریایە بەغدا سالا ١٩٥٨، ژ بەر پەیوەندیێن خزماتی ل مالا کورێ بارزانی عوبەیدوللای دما دوی دەمی دا قەدری دخواست وێنێ بارزانی بکەتە پەیکەر وی بشێوەیێ خەیالی ئەڤ وێنە چێکر پاشی هاتە گرتن ب تاوانا دژی حکۆمەتێ هاتە گونەهبارکرن لگوری کیتابا متسەرفێ کەرکوکێ و لیوا سلێمانیێ بریارا گرتنا وی و گەلەکێن دی هاتە دان گەلەك ژوان کەساتیێن سیاسی، رەوشەنبیر و سەرۆك هۆز بوون گەلەك ژوان هاتنە سێدارەدان وی دزیندانێ دا، هەولدا گەلەك کەسان ژوان رەسم بکەت یێن هاتینە سێدارەدان. وی ژنەك بناڤێ فریال دیت دەما د زیندانێ دا دهاتن سەرەدانا کەس و کارێن خۆ ژ ئەشقا وێ کچا ل روسیا دڤیا فریال هەلبژارت ژ بەرکو گەلەك شتی وێ بوو. ٤٠ سالا دگەلدا ما و دهەموو قوناغێن ژیانێ دا هەڤژین و پشتەڤانا قەدری بوو، پشتی سەربەست هاتییە بەردان برە خانەقینێ، پاشی ئەتروش و پاشی مووسل و زاخۆ و دووڤرا دهۆك

**دڤێ دوکومێنتێ دا کو بشێوەکێ فەرمی بریارا گرتنا وی دگەل چەند هەڤالێن وی هاتییە دەرخستن**

التعصبات الكوردية. للتحقيق معهم باعتبار بقائهم مطلقي السراح سيؤثر على سلامة القوات المسلحة والقوة الموالين للحكومة. وقوائم الاسماء المذكورة ادناه هي خاصة الى حد ما بالمعتقلين من منطقة بادينان.

الوثيقة رقم (١)
الجمهورية العراقية
(سري)

هيئة التحقيق الخاصة
في موقع بغداد
الرقم/٤/١٩٠٠
التاريخ ٢٣/٦/٩٦٢

الى متصرفية لواء الموصل
الموضوع/ طلب معلومات

طلب سيادة الحاكم العسكري العام بكتابه ٣٣/٩٦/١٠ في ٢٦/٥/٦٢ اجراء التحقيق مع المتهمين المرحلة اسمائهم طياً عما ينسب اليهم بخصوص اشتراكهم او علاقتهم بحركة التمرد والعصيان في شمال الوطن او ان لهم اي نشاط او فعالية يخشى منها على سلامة وامن الجمهورية الامر الذي يجعل بقائهم مطلقي السراح مؤثر على سلامة القوات المسلحة والموالية للحكومة وخطر يهدد المصلحة العامة.

لقد باشرت هيئتنا باجراء التحقيق مع المتهمين المذكورين والغرض [illegible] عندهم يرجى تزويدنا بالمعلومات المتوفرة لديكم عنهم وارسال من له شهادة [illegible] وان تعذر ارسالهم فيرجى تدوين شهاداتهم من قبل الهيئات التحقيقية الخاصة او اي مصدر قضائي اخر وارسالها الينا بصورة مستعجلة نظراً لان التحقيق مع المتهمين واكمال قضاياهم متوقف على ما يرد من اجوبتكم عنهم على ضوء كتابنا اعلاه توطئة لرفع قضاياهم لسيادة الحاكم العسكري العام.

المرفقات
١ - قائمة

الزعيم
حمودي مهدي
رئيس الهيئة التحقيقية الخاصة
(موقع بغداد)

متصرفية لواء كركوك
متصرفية لواء السليمانية
متصرفية لواء اربيل/ لعين الغرض رجاء

اسماء المتهمين

١- احمد طه زبير / عقره محلة طافي / معلم مدرسة عقره الثانية الابتدائية
٢- قادر احمد جبو / عقره قرية زنكان العشائر السبعة / فلاح
٣- ابراهيم اسماعيل ابراهيم / عقره قرية باكرمان / فلاح
٤- قدوري جبران / زاخو محلة المسيحية / معلم مدرسة زاخو للاحداث
٥- علي جبلي / زاخو محلة المسيحية / معلم مدرسة زاخو الاحداث
٦- عبدالمسيح كوربه / زاخو محلة النصارى / معلم مدرسة زاخو الاولى
٧- ملا طه محمد رشيد / زاخو بوصل / معلم مدرسة بوصل المسومة لدرسة زاخو الاولى
٨- محمود الحاج احمد (محمد عزو) / زاخو محلة كندك / فلاح
٩- حاجي حسين عمر / زاخو محلة كندك / فلاح
١٠- سعيد الحاج قادر / زاخو محلة الاحرار / مقصد مسحي
١١- حاجي عبدي يوسف / زاخو محلة كندك / محافي
١٢- خليل ابو خليل / زاخو محلة دركار / فلاح
١٣- سيد حسن سيد قادر / زاخو محلة كندك / عامل
١٤- حسن حسين خياط / زاخو محلة النصارى / خياط
١٥- شوماز بابك يوسف / زاخو قرية باطك / فراش مستوصف باطك
١٦- حميد سعيد عيسى / زاخو محلة الزرون / بائع شاري
١٧- قاسم سعدون احمد / موصل جامع جمشيد / معلم مدرسة شوش عقره
١٨- سليمان سليم محمد / عقرة قرية شوش / بائع شاري
١٩- حسين سليمان حاجي / دهوك زاويته / بقال
٢٠- سليمان حسن محمد / دهوك زاويته / بقال
٢١- ابراهيم حاج اسعد / تلعفر ناحية ربارة قرية جباهيف / فلاح
٢٢- [illegible]
٢٣- احمد رشيد احمد / زاويته / فلاح

سالا ١٩٧٠، پاشی ڤەگوهاستە ناسریێ دو سالا ل وێرێ ما، ل وێرێ پەیكەرێ دارا زەیتونێ چێكر بدرێژیا ٤ مێتران و گەلەك رەسمێن دی چێكرن و پەروەردا رەسمی نیشا زارۆیان ددا، پاشی ڤەگوهاستە هەولێر. وی داخواز كر بوو دەمی ئەز مرم من ل گورستانا شەهیدێن كوردستانێ ل زاخۆ ڤەشێرن ژ بەركو وی هەردەم خۆ ب شەهیدێ كوردستانێ ددیت.

## خەباتا هۆنەری

هۆنەرمەند قەدری هەر ژ زارۆكینیا خۆ ڤیانا سرۆشتێ كوردستانێ ددلێ ویدا هەبوو، لەوما نەبتنێ پەیكەر بەلكو رەسم ژی چێدكر، ژ بەر كو ل گەلەك پارێزگەهێن عێراقێ دهاتە ڤەگوهاستن ژیانا وی یا گەروك باندۆرەك خورت ل سەر هەستێن وی ودیتنا وی بوو ژیانەكا هەمەرەنگ بەر ب تابلوێن شێوەكاری دچو. هەروەسا سەرەدانا گەلەك وەلاتێن ئەوروپی و عەرەبی ژی كریە و بوویە خودان ئەزموونەكا مەزن د هۆنەری شێوەكاری دا وەكی وەلاتێن( روسیا، یونان، تركیا، مسر و...هتد)وی گەلەك حەز ژ زاخۆ و پرا دەلال دكر.

پەیكەرێ شەهید عزت عەبدولعەزیز ئامێدی و بارزانی



## كارێن وی یێن پەیكەری

وی نێزیكی ٢٠ پەیكەر ل سەرانسەر پارێزگەهێن عێراقێ چێكرینە. وەك ڤان پەیكەرێن ژێری:

١. پەیكەرێ مامۆستا عمر مامۆستایێ وەرزشی ل خانەقین
٢. پەیكەرێ بارزانیێ نەمر لسالا ١٩٧٠ لزاخۆ و وێنەكێ بارزانی دگەل دایكا شەهیدی پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ ل زاخۆ.
٣. پەیكەرێ هەلبەستڤانێ كورد ئەحمەدێ خانی بدرێژیا ٣ م لبەرامبەر ئاڤاهیێ باژێرڤانیا زاخۆ سالا ١٩٧٠.
٤. پەیكەرەكێ دی یێ ئەحمەدێ خانی ل باژێرێ دهۆكێ.
٥. پەیكەرێ تایێ زەیتونێ ددەستێ كچەكێ دا بدرێژیا ٤ م ل باژێرێ ناسریە.
٦. هەروەسا وی گەلەك كارێن سیرامیكێ دروستكرینە.
٧. پەیكەرێ بارزانی لباژێرێ زاخۆ بدرێژیا ٣ م.
٨. پەیكەرێ خانی ل زاخۆ.

تابلوێ كچا كوردستانێ



پەیکەرێ خەنسایێ



٩. وێنە و پەیکەر ل دەورا بارزان ١٩٧٤

١٠. پەیکەرێ کچا کوردستانا ئازاد ب دو فیگوران هەرئێك بدرێژیا ٣ م ل زاخۆ.

١١. مەزنترین پەیکەر بۆ بارزانی ل دهۆکێ.

١٢. دوو پەیکەر ل زاخۆ و پەیکەرێ خەنساء ل زاخۆ.

## کارێن وی ل باژێرێ هەولێرێ

١.پەیکەرێ ١١ ئادارا ١٩٧٠ بدرێژیا ٣ م

٢.پەیکەرێ مافێ ئوتونومی بدرێژیا ٣ م

٣.وێنەکێ دیواری ل سەر پارکەها هەولێرێ کو ژ جوتیار و کارکەرار و وەرزشڤان و کچێن کوردستانێ و بارزانیێن ل قوشتوپە دەربرینێ ژ زولم و زورداریا رژێما بەعس دکەن و دایکێن شەهیدان وەك ژن بتەنێ ماینە د خیڤەتکەهێ دا پێك دهێت.

٤.پەیکەرێ گەنجان ژکو ٣ م.

٥.پەیکەرێ پێنجوین ل سولەیمانیێ و کچا کورد نێرگز دەدەستدایە کو ژ ٣ م پێکدهێت.

دەمامرۆڤ ل بەرهەمێن ڤی هۆنەرمەندی دنێریت ، ژ لایەکی ڤە پەیکەرێن وی یێن بلند باژێرێن کوردستانێ دخەملینن و ژ لایێ دیڤە رەنگ و تابلوێێن وی هێزا شێوەکارەکی نیشا مە ددەن.

هۆنەرمەند قەدری حەیران هەردەم هەڤرکیا هۆنەری و بەرخودانێ دگەل ژیانێ کریە کو ناما خۆیا پیروز بکەهینیت. لەوما د بەردەوامیا ژیانا هۆنەری دا ئەو ئاشقێ وەلات و خەلکێ کوردستانێ بوو، ژ بەر ڤێژی گەلەك جارا بدەستێ رژێما بەعس هاتییە گرتن و ئەشکەنجەدان و ژ جهەکی بوو یێ دی هاتییە ڤەگوهاستن. لێ دیسان هۆنەرمەندی پتر گرنگی دایە هەلوێست و خەباتا خۆیا هۆنەری. حەتا ژیانا وی بداوی هاتی ئەو ئەڤینداری هۆنەری و مرۆڤاتیێ و کوردستانێ بوو.

پەیکەرێ گەنجا ل هەولێرێ سالا ١٩٨٠



پەیکەرێ دارا زەیتونێ ل ناسریێ



پەیکەرێ کچا کورد ل زاخۆ



قەدری دگەل مالباتا خۆ ل زاخۆ



# هۆنەرمەند ئەنوەر تۆڤی



ب درێژیا پێنجی سالێن بەراهیێ ژ ژیێ حکۆمەتا عیراقێ، ناڤبەرا سالێن ١٩٢١ هەتا دەسپێکا سالێن هەفتییان گەلەك کەسایەتیێن رەوشەنبیر، نڤیسکار، هۆنەرمەند، زانا د وارێن جوداجودا دا ل دەڤەرا بەهدینان (پارێزگەها دهۆکێ یا نها) هەلکەتینە و د چەندین واراندا شیانێن خۆ دیارکرینە و خزمەتا گەلێ خۆ کرینە، بەلێ مخابن ئەڤ کەسایەتییە هەرزوو و هێژ د قۆناغا زارۆکینیێ یان خویندکارییێدا ژ دەڤەرێ ڤەقەتیایینە و ل جهێن دوورتر ژ دەڤەرێن خۆ هاتینەنیاسین و شیانێن وان دەرکەتینە.

هۆنەرمەندێ شێوەکار و شانۆکار ئەنوەر تۆڤی یەك ژ وان کەسایەتییانە یێن دوور ژ وارێ خۆ د چەند وارەکێن هۆنەریدا بەردەوامی ب چالاکیێن خۆ دای

کەڤالێ ئەنوەر تۆڤی

**وێنەیێ شانۆگەریا مەم و زین**



و بوویە جهێ پەسن و رازیبوونا دەورووبەرێن خۆ و هۆنەرمەندێن دگەلدا کار کری. هۆنەرمەند ل سالا ١٩٢٥ێ ل گوندێ بامەرنێ یێ قەزا ئامێدیێ هاتییە سەردنیایێ، خواندنا سەرەتایی ل بامەرنێ و ناڤنجی ل مووسلێ خواندینە، خواندنگەها مامۆستایێن گوندان ل روستەمیێ یا بەغدا خواندییە، سالا ١٩٤٥ وەك مامۆستا ل گوندێ بیارەیێ دەڤەرا هەورامان هاتییەدامەزراندن، ل بیارە، پێنجوین، بەکرەجۆ مامۆستایەتی کریە هەتا ل باژێری سلێمانیێ بنەجهبووی ل خواندنگەهێن وێ یێن سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەیی وانەیا وێنە و هۆنەری دایە قوتابییان و پاشتر بوویە بەرپرسێ چالاکیێن هۆنەری و دووڤرا ژی پشکێنەر (سەرپەرشت)ێ هۆنەری ل پەروەردا سلێمانیێ.

هێژ قوتابی ل قۆناغا دەسپێکی شیانێن وی یێن هۆنەری دیاربووینە، دەمێ گەهشتییە بەغدا و خواندنگەها مامۆستایان شیانێن وی د وارێ شێوەکاریدا پتر دیاربووینە و کەڤالێن وی بووینە جهێ رازیبوونا مامۆستایێن وی یێن هۆنەری و شێوەکارێن بەغدا ل وی دەمی، دەمێ وەك مامۆستا گەهشتییە سلێمانیی خۆدی ئەزموونەکا هۆنەری بوو و سرۆشتێ جوان و سەرنجراکێشێ جهێ زارۆکینییا وی ل بامەرنێ و سالێن بەراهیێ یێن مامۆستاییێ ل هەورامان باندۆرەکا بهێزتر ل سەر شیانێن وی یێن هۆنەری هەبوو، لەوما بلەز و د دەمەکێ کورتدا نە تنێ وەك شێوەکارەك بەلکی وەك کاریکاتورێست و شانۆکار و دیکۆریستێ شانۆیێ ژی جهێ خۆ د ناڤەندێن هۆنەریێن سلێمانیێ دا کر، پشکداری د چەندین پێشانگەهێن هۆنەریدا ل سلێمانیێ و هەولێرێ و بەغدا و جهێ دیدا کر، بەرگێ چەندین پەرتووك و کۆڤارێن ناڤبەرا سالێن پێنجییان هەتا سالێن هەشتییان ب خامەیێ وی هاتینەخەملاندن،

شەمال صائیب، قادر دیلان، ئەنوەر تۆڤی، عومەر هەلمەت



د هەمان دەمدا ب خۆرتی کار د هۆنەرێ شانۆییدا کریە، چ وەك دەرهێنەر چ وەك دیکۆریست، بۆ یەکەمین جار د مێژوویدا چیرۆکا (مەم و زین)ا ئەحمەدێ خانی و د شانۆگەریەکێدا ل ٢٣ سباتا ١٩٥٨ێ بۆ دەمێ ١٠ رۆژان ل سەر شانۆیا دوا ناڤنجیا سلێمانیێ پێشکەشی خەلکی کریە، ئەڤ شانۆگەریە ژ بەرهەڤکرنا ئەمینی میرزا کەریم و دەرهێنانا ئەنوەر تۆڤی و نواندنا قوتابیێن دواناڤنجیا ئێڤاریان ل سلێمانیێ بوو. زێدەباری (مەم و زین)ێ چەندین شانۆگەریێن دیتر دەرئینانە ژ وانا:

- عوتەیل ١٩٥٦ێ
- ئافرەت و نوشتە ١٩٥٦ێ
- تاوان و کۆمەل ١٩٥٧ێ
- بلیمەت ١٩٧٠ێ
- بازرگانی ڤینیسیا ١٩٧١ێ

هەروەسان کارێ دیکوری بۆ چەندین شانۆگەریان ئەنجامدایە.

سال ل دووڤ سالێ شیانێن وی یێن هۆنەری بەرفرەهدبوون و د دەلیڤێن جودا دا خزمەتا هۆنەرێ کوردی دکر، د وارێ کاریکاتۆریدا جهێ تبلێن وی د چەند کۆڤار و رۆژنامەیێن وی سەردەمیدا دیارە، سالا ١٩٧٣ چیرۆکا زارۆکان ب ناڤێ (شێری ساختە) د چەند کارکاتورەکاندا بەرهەڤکریە و هەلبەستڤان کاکەی فەلاح ئەو کاریکاتورە کرینە هەلبەست و ل سلێمانیی چاپکریە.

د هەمان دەمدا بەرەف کارێ دەرئینانێ بۆ کەنالی کوردیێ تەلەفزیونا کەرکووکێ چوویە و چەند بەرهەم د ڤی واریدا هەنە ژ وانا دەرهێنانا کلیپێن سترانێن هۆنەرمەند شەمال سائیبی. ل دەسپێکا سالێن حەفتیان ب شیانێن خۆیێن هۆنەری پەیکەرێ چیایەکی و سویلاڤەکی ل نیڤا یانەیا فەرمانبەرا یا سلێمانیێ چێکریە و ئەو چیایە بوویە جهێ سەرنجا مێهڤانێن خۆیی و بیانیی یێن یانەیێ و چەند یانەیێن بەغدا و جهێن دیتر داخوازا چێکرنا

مینا وی چیای ل نك وان ژی كریە بەلی دەلیڤە بۆ هەلنەكەتیە.

د وارێ سیاسی و نەتەوەییدا هێژ هۆنەرمەند قوتابی ل ناڤنجی و خواندنگەها مامۆستایان پەیوەندی دگەل رێكخستنێن كۆمەلا (هیوا) هەبوونە، ژ دەسپێكا سالێن پێنجییانڤە گەهشتییە رێزێن پارتی دیموكراتی كوردستان و وەك كادرەكێ پێشكەتیێ پارتی و كادرەكێ یەكێتییا مامۆستایێن كوردستانێ كاركریە و د ئەنجامێ ڤان چالاكییاندا ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا ١٩٦١ێ هاتییەنەفیكرن بۆ باژێرێ كوت و ل وێرێ ل ژێر زێرەڤانییەكا بەردەوام سازیێن ئەمنیێن دەولەتێدا بوو، سەرەرای ڤی سەروبەری ل نەفیێ ژی دەست ژ خەباتا خۆیا پارتایەتی نەبەردایە و بەرپرسییا ئێكەتییا مامۆستایێن كوردستانێ ل ژێری و ناڤەراستێ عیراقێ گرتییە دەست، پشتی چەند سالێن ڤەمانا ب كوتەكی ل كوت زڤریەڤە مالا خۆ ل سلێمانیێ و پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ بەرپرسییا پشكا راگەهاندنێ ل لقێ چوارێ پارتی گرتییە دەست.

دناڤبەرا سالێن ١٩٧٠- ١٩٧٤ێدا د چەندین وارێن سیاسی و هۆنەری دا چالاكانە رۆلێ خۆ گێرایە و سالا ١٩٧٣ێ د چوارچووڤێ شاندێ پارتی و یەكێتییا لاوێن كوردستانێدا پشكداری د ڤیستیڤالا جیهانییا لاوان ل بەرلینێ كریە، هەژییە بێژین ل سالا ١٩٥٩ێ ژی هۆنەرمەندی پشكداری د هەمان ڤیستیڤالێدا ل ڤیەنا كریوو.

پشتی دەسپێكرنەڤا شەری ل ئادارا ١٩٧٤ێ د ناڤبەرا شۆرشا كوردستانێ و حكۆمەتا عیراقێدا ئەو ژی دگەل سەدان هۆنەرمەند و رەوشەنبیرێن

ژ چیرۆكا (شێری ساختە)



سلێمانیێ گەهشتییە شۆرشێ و ل ئەمانەتا گشتییا رەوشەنبیری و راگەهاندن و لاوان دەست ب کارێ هۆنەری کرییە و د وێ سالێدا دگەل هژمارەکا دی یا هۆنەرمەندان مژویلی بەرهەڤکرنا فلیمەکێ دیکیومەنتکاری بوون ل سەر شۆرشێ و خەباتا گەلی کورد و تراژیدیێن ب سەرێ خەلکێ کوردستانێ هاتین، بەلێ نسکویا ئادارا ١٩٧٥ێ ب سەردا هات و فلمی رۆناهی نەدیت.

پشتی شکەستنا شۆرشێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ دزڤریتەڤە سلێمانیێ لێ دەمەك ب سەرڤە نەچوو دهێتەنەفیکرن بۆ باژێرێ سەماوە ل ژێریا عیراقێ و پشتی چەند سالەکان ل وێرێ دهێتەخانەنشینکرن، بەلێ ل سەر دهێتەسەپاندن کو دڤێت بمینەتە ئاکنجی ل ژێریێ عیراقی ئەو ژ دمینەتە ل باژێرێ دیوانیێ، ل ڤی باژێری هەتا ئاستەکی بنەجهـ دبیت و دەست ب چالاکیێن خۆییێن هۆنەری ب تایبەت د وارێ شێوەکاریدا دکەت و ل سەر ئاستێ هەموو عیراقی پشکداریێ د چەند پێشانگەهەکێن شێوەکاریدا دکەت و چەند خەلاتێن ئێکێ وەردگریت. ل دووڤ ئاگاداریا مە دوا پێشانگەها پشکداری تێدا کری پێشانگەها هۆنەرمەندێن کورد بوو ل هەولێرێ سالا ١٩٨٦ێ کو ب سێ کەڤالان پشکداری تێدا کربوو.

پشتی ژیەکێ درێژ د خزمەتا هۆنەر و دۆزا رەوایا گەلێ کورددا هۆنەرمەند ئەنوەر تۆڤی ل ٢٥ چریا دووێ ١٩٩٤ێ ل نەخوشخانەکا بەغدا دچیتە بەر دلوڤانییا خودی و پشتی دو رۆژان د کاودانەکێ سەخت و دژواردا سندریکا وی دگەهیتە سلێمانیێ و ل گۆرستانا شێخ محیەدین ل سلێمانیی د هێتەڤەشارتن.

ژ چیرۆکا (شێری ساختە)



# سەعدەدین باتەیی



هۆنەرمەند سەعدەدین ئێكانەیێ مەیدانا خۆیا تایبەت بوو. دناڤا بێدەنگی بێ هوشی و خەیالاندا دژیا. ڤی هۆنەرمەندی د تابلۆیێن خۆ دا پێتر شێوەیەكی تایبەت ب كار دئینا، وەك ستیلەك هۆنەری. لێ هند دیاردێن هۆنەری و رەنگێن سرۆشتی و بابەتێن گرێدایێ ژیانا گیانەوەر، مرۆڤ، تەیر و هەر تشتێ هەست بلڤینێ بكەت. دیسا د تابلۆیێن وی دا هند بابەتێن تایبەتی د ژیانا هۆنەرمەندی دا ئاشكەرانە. وەسا تێ خۆیاكرن كۆ هۆنەرمەند د ژینەكا ئێكانە دا دژیا و جیهانا خۆ یا هوندری كۆ جیهانا ڤەشارتییە د تابلۆی دا دئافرینیت و خەمێن خۆ ب رەنگان ڤەدرەڤاندن. كارێن وی یێن ڤێ داویێ پێتر نێزیكی ئابستراكتێ بوون. ئەڤ هۆنەرمەندە كەتە بن ژیانەكە گران یا جڤاكی. د داویێ دا ژیانا خۆ ژ دەست دا.

# ئەنوەر جزیری



یەکێ بوو ژ هۆنەرمەندێن کۆ پێتر ل خواندنگەهێن پەروەردێ کار دکر. لێ چەندین بەرهەمێن وی یێن وەك پەیکەر ل سەر دیواران مانە ل باژارێ دهۆك و زاخۆ. پەیکەرێن وی رەنگڤەدانەکا ریالیتێ بوو پرانیژی گرێدای کەسایەتی و ژیانا جڤاکا کوردەواری بوو. پشتی چەندین سالان هۆنەرمەند جزیری ل کوچبەریێ وەلاتێ هولەندا ژیای هەر ل وێرێ ژیانای وی داویهات و بوو ئێك ژ ناڤێن نەمرێن هۆنەری شێوەکاری یێ دەڤەرا زاخۆ و کوردستانێ.

دیسان هۆنەرمەندەکی مەسیحی ب ناڤێ کەمال مەلکی ل دهۆکێ هەر ژ سالێن شێستان و ڤر ڤە وەك مامۆستایەکی هۆنەرێ شێوەکاری رۆلا خۆ لیست.

هێدی هێدی هۆنەرێ شێوەکاری د ناڤا جڤاکا کوردی دا جیهـ گرت و ژ ئەگەرا پەیدابوونا شۆرش و سەرهلدانێن کورد و زولم و ئەشکەنجە و زۆریا ل سەر گەلێ کورد، هۆنەرمەند پال دانە وێ یەکێ کۆ بابەتێن تابلۆیێن خۆ ل سەر ڤان بۆیەران دروست بکەن و ڤیانا خەلکێ کوردستانێ پێتر بۆ هۆنەری رابکێشن. ئەڤ یەك بوو سەدەما پەیدابوونا گەلەك نڤیسکارێن قەلەم خورت. مل ب ملێ هۆنەرمەندان شیان هن چارچوڤەیان تێك بدەن و ژ ناڤ ببەن. دگەل ڤێ یەکێ تایبەت پشتی پێکهاتنا ۱۱ ئادارا سالا ۱۹۷۰ و بەردەوامیا شۆرشا کوردی ل باشوور باندۆرەکە خۆ ل سەر رژێما عیراقێ کر و رژێمێ رێ دا چەندین سازی، کۆڤار و رۆژنامەیێن کوردی دەرکەڤن. دیسا زمانێ کوردی و پەروەردەیا کوردی ل خواندنگەها ب شێوەیەکی فەرمی ب کاردهات. دگەل پێشدا چونا شۆرشێ، پشتی شکەستنا ۱۹۷۵ێ و پەیدابوونا شۆرشا پارتیزانی یا ل سالا ۱۹۷٦ێ، گەلەك هۆنەرمەند ژ بـاژاران دەرکەتن چوونە ناڤ شۆرشێ. پاشی چوونە وەلاتێن ئەورۆپا و یێن دن. ل ور شیان مفا ژ خواندنگەهـ و رێبازێن هۆنەرێ جیهانی وەربگرن. هەروەها گەلەك ژ ڤان هۆنەرمەندان شیان پێشانگەهێن خۆ ل ڤان وەلاتان ڤەکن و رەوشا کوردستان و زۆریا ل سەر گەلێ کورد د تابلۆیێن خۆ دا وەك زمانەکی هۆنەری بدن خۆیاکرن.

بتایبەتی، د بۆیەرێن ئەنفال و کۆمکوژیا حەلەبچە و کۆچبەرکرنا کوردان بۆ باشوورێ عیراقێ، هۆنەرمەند و نڤیسکارێ کورد هەلوێستەکی نەتەوی هەمبەر ڤان بۆیەران وەرگرت. د بەرهەمێن خۆدا ئەڤ بۆیەرنە بکارئانین چ ل کوردستان و عیراقێ ب شێوەیێ سۆمبۆلیك و چ ژی ل دەرڤەی وەلات ب زمانێ هۆنەری ئەڤ بۆیەرنە نیشانی جیهانێ دان.

د سەر ڤان قۆناغێن دژوارێن هۆنەرمەندێ کورد توشبووی، بەردەوامی ب خەباتێن خۆیێن هۆنەری دان. ژ بەر کۆ ڤیانا وان بۆ هۆنەر و ئافراندنێ رێ ل بەر هەمموو ئاستەنگیان گرت، هەروەها سەختی و سنوورێن رژێمێ ناسنەکرن. چەندین هۆنەرمەندێن خـۆدی شیان ژی بۆنە قوربانێن ڤێ راستیێ و هۆنەرمەند راستگۆ بوو و گرێدایێ رەیالیتەیا گەلێ خۆ بوو. هەرچەند دوور بیت ژی. ئاشکەرایە کۆ هەر هۆنەرەك گرێدایی هزرکرنێیە د ژیانێ دا. گرێدایی ئیدیۆلۆژیا دەما خۆیە و دەما وی ژ دایکدبیت. ئەڤەژی شێوەك کۆ هۆنەری ب خۆڤە دگریت. دبیت ژی ببیت بەشەکی ژیانا راستەقینە یا جڤاکێ ژ بۆ هەست و هشیاربوونێ. ب دامەزراندنا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل سلێمانیێ (۱۹۷۹ -۱۹۸۰)، ب دلەکی گەرم هۆنەرمەندێن کورد پێشوازی لێکر و ژ هەمموو باژارێن

کوردستانێ ل سەر شێوەیەکێ ئاکادەمیك و زانستی هۆنەرمەند چوون ژ بۆ خواندنا هۆنەری. وێ دەمی سالا ١٩٨٠ یان ژ دهۆکێ چەندین هۆنەرمەند ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل نەینەوا دخواندن. وەك: فەهمی بالایی، ئیسمایل ئەزام و فازل یوسف. لێ دەستپێکا هۆنەری ئەکادیمی ل پارێزگەها دهۆکێ هۆنەرمەند ئەبدورەحمان وەحید کەلحو بوو وی دەمی ل بەغدا ئەکادیمیا هۆنەری دخواند.

## ئەنوەر مستەفا بەرواری



سالا ١٩٤٨ن ژ دایك بوویە) زانینگەها زانیاری بەشا جیۆلۆگی ل بەغدایێ ب داویکریە. رۆلەکی مەزن د وارێ هۆنەری دا لیستیە و گەلەك پێشانگەهـ ل بەغدایێ ڤەکرینە. گەلەك رۆژنامە و کۆڤارێن عەرەبی و کوردی ل سەر هۆنەرێ وی نڤیساندنە. بابەتێن ڤی هۆنەرمەندی ل سەر سرۆشتا کوردستانن. مینا ژیانا جڤاکا کوردی، کار و بارێن رۆژانە ب رەنگێن گرێدایێ فۆلکلۆر، جڤاك و سرۆشتێ کوردستانێ. ئەڤ هۆنەرمەندە حەتا نها ژی کار و خەباتێن خۆ یێن هۆنەری بەردەوام دکە و نها ل باشوورێ کوردستانێ دژی.

هەروها چەندین هۆنەرمەندێن دن یێن نە گرێداییێ پەیمانگەهـ و خواندنێن هۆنەری بوون و ل بەشێن دن دخواندن، لێ رۆلەکی مەزن د وارێ هۆنەری دا دیتن و بەردەوامی ب خەباتا هۆنەری دان و چەندین پێشانگەهـ ل کوردستانێ و دەرڤەیێ کوردستانێ ڤەکرنە. هەر یەك ل سەر رێبازا خۆ یا تایبەتە. وەك: هۆنەرمەند ستار عەلی، سلێمان عەلی، عیماد عەلی، ئو..تد..



# ئەبدولرەحمان وەحید كەلحۆ



سالا ١٩٥٤ن ل دهۆكێ باشوورێ كوردستانێ ژ دایكبوویە. خواندنا خۆ یا ئاكادەمیك سالا ١٩٨٠ ل ئەكادیمیا بەغدا داویكریە. ئەو ژ بۆ خواندنا هۆنەری بەری هەموویان ژ دهۆكێ چوو بوو بەغدایێ. پاشی وەك مامۆستا ل باژارێ دهۆكێ وانەیێن هۆنەری ل سەر ئاستەكی زانستی خوێندەكار پەروەردە دكرن. حەتا وێ دەمی هن گرنگی ب وانەیا رەسمی نەدهاتە داین. د جیهانا وی یا تایبەتی دا تایبەتمەندیەكە تابلۆیێن كەلحو هەیە. تابلۆ د بۆشایەكە رێكخستیدا رەنگ، ئەستەتیك و روویەكێ نوو پێكتینە. ئەڤ ژی دگەل روویێ ژدەرڤە یێ ژیانێ ژ ئافراندن و هەستێن هۆنەرمەندی تێ. هەر هۆنەرمەندەك ڤێ یەكێ ب ئاوایەكی دبینە، ژ بەر كۆ هۆنەرمەند دخوازە ب بەرهەمێن خۆیێن هۆنەری هن روویێن هێشتا تیرۆژكێن رۆژێ، خەملا ژیانێ و هەستێن مرۆڤان نەناسكرین بدە ژیاندن. ئەڤ ژی دبە فەلسەفەیا دەمی و هەر یەك بنێرینەكێ تەڤلی دبە. تابلۆ؛ رویێ هەری خەملاندیە، ل بەرچاڤان پر تشتان بخۆڤە دگرە. هۆنەرمەند ب هوستایەكە پر شارەزا خۆ دناڤا ڤی كاری دا دبینە. ژ بەر كۆ هەست ب بەرپرسیاری دكە. كەلحۆ؛ بوویە بەشەك ژ تابلۆیی. جارنان دگەل خۆ دكەڤە هەڤركیێ، د ئەگەرێدا كەسایەتییەكە دن یا هۆنەری دئافرینە. هن جاران ژی ئەو بخۆ هەست ب ڤێ یەكێ ناكە. جارنان ژی مرۆڤ د ناڤا تابلۆی دا كەسایەتیا وی دبینە و ب ئاشكەرایی تێ خویاكرن. هن جاران ژی د ناڤا رەنگان دا خۆ ڤەدشێرە و ناخوازە مرۆڤ ب ئاسانی وی ببینە. مرۆڤ دكارە د ناڤا تابلۆیاندا خۆشی و هەستێن جوانیێ ببینە. وەك نەخشەیێن مافۆران د خەملا سرۆشتی دا، دیمەكی خەملی ژ تلێن نازك یێن حوریان و خانمێن دل نەرم، ڤی تەڤنێ ب ئەشقەكە خوزایی د ڤەهینە و دبە هێڤێنێ تابلۆیی. هۆنەرمەند د جیهانا خۆ دا هەستێن نەدیار پێشچاڤ دكە. پەیوەندیێن جیهانا هۆنەرمەندی ب خەملا ژیانێڤە گرێددە. رەسەناتییا نەتەوەیی د مۆتیڤ، رەنگ و بابەتاندا نیشان ددە. ژن ل با هۆنەرمەند، روویێ گەشێ ژیانێ یە، د تابلۆیاندا بابەتێ سەرەكەیە. پەیوەندییێن ژنێ ب ژیانێڤە د ناڤا سرۆشتەكی بێدەنگ دا مرۆڤی دبە دارستانێن دەردۆرا پاریسێ ژ بۆ هۆنەرمەندێن مینا سێزان، رەنۆار و مانێ تینە بیرا مە. وەك زێرەڤانێن داڤێن رۆژێ دگەل هەلاتنا رۆژێ هەموو دەمان د رەنگینە. د هن تابلۆیان دا، ب شەڤێ رۆژێ دبینە و ل هەموو كێشوەرێن جیهانێ خۆ ب داڤێن رۆژێڤە گرێددە، د خەیالا خۆدا دوور دچە تاكو دگەهە ئارمانجا خۆ. تینا وەلاتەكی نوو ژ رەنگێن تابلۆیێن وی تێ. ئەو دخوازە ژ خوینرێتنێ ژ كوشتنێ و ژ بن پێكرنا مرۆڤاتیێ دور بكەڤە، د هەستێن نازك دا، د جوانیێ دا وەلاتەكی ئاڤا بكە. ژن هن جاران مژوولی سرۆشتیە، جاران ژی چاڤەرێیە مینا هۆنەرمەندی دخوازن بگەهن ئارمانجا خۆ. لی هێشتا د قۆناغێن ناڤیندانە. چەند قۆناغان دبرن ئارمانج خۆ دوور دكە، هۆنەرمەند خۆ د چاڤێن چاڤەرێیان دا دبینە، دخوازە تیرێن وان چاڤان ڤان قۆناغان ببرن و ئارمانج نێزیك ببە. هۆنەرمەند؛ پێتر خۆ د ناڤا رەنگێن سار دا دبینە، جارنان د گەرماهیا دلێ خۆ دا رووبەرێ تابلۆیی ژی گەرم دكە. لێ د هن تابلۆیاندا هەڤركییەك هەیە، رەنگ هەڤدو دگرن و ژ هەڤدو دقەتن، ژ بەر كۆ فیگورەك خۆ دناڤبەرێ دا دبینە و بالا مرۆڤ دكشینە. دلۆڤانیا هۆنەرمەندی ل هەمبەر مرۆڤاتیێ و نەخشەیێ ژیانێ دڤێ جیهانێدا دورگەهەكی بخەمل د ناڤا دەریایێ دا رەسم دكە،

تیرۆژکێن رۆژێ و پێلێن ئاڤێ باخەکی رەنگینە، دەنگێ ئاڤێ و ئاوازێن تەیران د خەملا سرۆشتی دا دیمێ کەچان دگرنژینن. د هەموو تابلۆیان دا ئەڤ دیمێ گرنژی هەیە وەك میهڤان و وەك حوریێن ئەفسانەیی خۆ وەندا دکن. مرۆڤ ڤان هەموویان د ناڤا سەرهاتیێن دیرۆکی دا دبینە. ل ڤر ئەڤینداراا هۆنەرمەندی وەندا دبە و ب لێدانێن فرشەیێ و هەستێن خۆ لێکەرینێن خۆ داتێلا دەریایێن کویر و ل دارستانێن تاری. نێرینا وی ل سەر هۆنەری ل دۆرگەهێ ژیانێ ب دوربینێ لێ دنێرە، ب رەنگا دخەملینە، هەموو کراسێن نەخشاندی ل بەژنا وێ دکە. د ناڤا گولستانان دا، د ناڤا دارستانان دا، د هزران دا، جارنان ژی د خەیالان دا پێکتینە. هۆنەرمەند؛ ژن مینا وەلات دایك و ئەڤیندار بکارئانییە. گەلەك جاران ژی شرۆڤە و راستیا ژیانێ د کەسایەتیا ژنێ دا بکار ئانییە. ژنێ دکە خانما تەختێ ژیانێ، ژ بەر کۆ ئەو دخوازە د وەلاتەکی نوودا ژن جیهانەکە نوو بئافرینە، داکو ژیان جارەکە دن ڤەگەرە سەر راستیا خۆیا دیرۆکی. ب شێوەیەکی زانستی قۆناغێن ژیانێ ب دیرۆکێڤە گرێبدە و هەرتشت نوو ببە. سیستەم نوو ببە، خۆزا نوو ببە، مرۆڤەکی نوو ژ دایك ببە و جڤاکەکە نوو ژی پەیدا ببە. ب ڤی ئاوایی هەموو ب هەڤرا د جیهانا راستیێ دا جوانی و دلۆڤانیێ د تابلۆی دا پێکبینن. د هەڤرکیا ژیانێ دا هۆنەرمەند خەیالا خۆ سەربەست دکە، ژیان و جوانیێ پێشکەشی مرۆڤایەتیێ دکە.

پشتی ڤەکرنا پەیمانگەها هۆنەری ل سلێمانیێ، ژ سالێن ١٩٨١ن و شون دا گەلەك هۆنەرمەند ژ بۆ خواندنا هۆنەری چوونە سلێمانیێ، نەینەوایێ و بەغدایێ. ژ وان: عەدنان شینۆ، گوهدار بەزاز، شەهید سەلمان، رەشید عەلی، حەمید شەریف، ل پەیمانگەها سلێمانیێ بوون. چەندین هۆنەرمەندێن دن، ل ئەکادیمیا بەغدایێ خواندنا هۆنەری ب داویکرن. وەك؛ جەمال سەلیم، رێبەر عۆمەر، هودی ئەحمەد



صەبری.

هۆنەرمەندێن وەك حکمەت حەسۆ، محەمەد ئیبراهیم بەرواری، ژ زاخۆ سەلام، مووسلم ئو...هتد لپەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا مووسل دخواند.

# فەهمی بالایی



• ١٩٦٣ ل دهۆکێ ژ دایکبوویە ، ١٩٨٥- ١٩٨٦ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل مووسل خواندیە ، ١٩٩٢-١٩٩٥ مامۆستایێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان بوو و ژ دامەزرێنەرێن وێ بوو ل دهۆکێ ، ١٩٩٣-١٩٩٥ سەرۆکێ یەکێتیا هۆنەرمەندێن کوردستانێ لقێ دهۆکێ بوو ، ١٩٨٠-٢٠٠٩ بەردەوامە ل سەر خەباتێن هۆنەرێ شێوەکاری و نڤێسکاریێ ، ١٩٩٥ هاتییە ئەلمانیا ل بەرلین دژیت، ٢٠٠٠- ٢٠٠٤ سەرۆکێ ناڤەندا چاند و هۆنەریا کوردی بوویە ل بەرلین، ٢٠٠٥- ٢٠٠٩ سەرۆکێ ئنستیتووتا کوردی ژ بۆ زانست و لێکۆلینێ یە ل ئەلمانیا ، ٢٠١٢د ناما خواندنا ماستەرێ ل( زانکویا ئازاد ل هولەندا) ل سەر (هارمونیا دەقێ شیعری دگەل تابلویێ شێوەکاری ب پلەیا گەلەك باش وەرگرتیە.

چەندین پەرتووك ل سەر هۆنەری شیوەکاری نڤیساینەوەك: (دیرۆکا هۆنەری شێوەکاری ل کوردستانێ بتیپێن لاتینی و ئارامی(عەرەبی)، جیهانا رەنگان، هێنری ماتیس) و دەهان سەمینار و گۆتارێن هۆنەری و رەخنەیی نڤێساندینە. دەهان پیشانگەهـ ل وەلاتێن ئەوروپی و کوردستانێ ڤەکرینە، چەندین پروژێن هۆنەری وەك مونومێنت ئامادەکرینە. هۆنەری وی دناڤبەرا رەنگێن دەربرینی مرۆڤ، خۆزا و ژیانێ پێکڤەگرێددەت و شۆرەشا رەنگان وەك ئابستراکت خۆ د ناڤا تابلوێن وی دا دبینیت.



## هودا ئەحمەد



هـۆنـەرمـەنـد هـودا

سالا ١٩٦٦ ل بازێرێ دهۆکێ ژ دایکبوویە. ئێکەژ ژنێن دەستپێکێ یێن هۆنەری شیوەکاری لپاریزگەها دهۆکێ، هەر ژ سالێن هەشتییان وێ حەزا هۆنەری هەبوویەو دگەل گرۆپێن هۆنەرمەندا پشکێن شانو، شێوەکاری و کارێن دی گەلەك چالاك بوویە. سالێن هەشتییان بەر ب ئەکادیمیا هۆنەرێن شێوەکاری ل بەغدا چوو پشکا شێوەکاری خواند، وەك دێزانەرەك دگەلەك کوڤار و رۆژناماندا کار کریە. پشتی سەرهلدانێ وەك هۆنەرمەند و مامۆستایا پەیمانگەهێن هۆنەرێن جوان بوو گەلەك پێشانگەهـ ل کوردستانێ و دەرڤە ڤەکرینە نها ژی مامۆستایەل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ و بەردەوامەل سەر کارێن هۆنەری.

# شەهید سەلمان



سالا ١٩٦٧ ژدایکبوویە، د خۆرتانییا خۆ دا ببوو خۆدی هێزەك هۆنەری، د ئافراندن و رەنگ و پێکهاتا تابلۆیەکی هۆنەری دا. خۆدی هەستێن نازك بوو گرنگی ددا روخساری تابلۆیی ل سەر بنگەهەکێ هۆنەری و زانستا رەنگان، لێدانێن فرچەی ل با سەلمانی هەستێن مرۆڤی دلڤاندن. هند جاران د رەنگێن ئاڤی دا، شەفافیەت ددا تابلۆی رۆناهی و سیبەر د تابلۆیدا برەنگان هاوسەنگ دکر، تیرۆژکێن رۆژێ شەرێ تاریێ دکر و بالا مرۆڤی دکشاند. رەنگێن خوزایا کوردستانێ زارۆکاتییا شەهید سەلمان نیشا ددا بیرەوەریێن گوندا و کۆلانێن بازێرێ وی زاخۆیا دەلال ل سەر لێڤا روبارێ خابوور دگەل پێلێن ئاڤێ دمەشیا، د رەنگێن وی دا ئاڤ و ئاوازێن تەیران دگەهانە گوهێن مە، ژ ئالیێ ناڤەرۆکێ ڤە دخواست ڤیانا خۆ یا نەتەوەیی ب زمانێ رەنگ و جوانیێ نیشانی جیهانێ بدەت. بۆیەرێن ددەما وی دا د قەومین د چارچوڤەیا هێرشێن بەردەوام ل سەر وەلاتێ وی ببوونە بابەتێن تابلۆیێن وی، وی دخواست د ڤێ جیهانا هۆنەری دا ڤان بیرەوەریان بکە دیرۆك د تابلۆیان دا. لێ هەڤرکییا وی یا ژیانێ و ئەشقا کوردستانێ ئەو پالدا کۆ د مەیدانا خەباتێن نهێنی دا دناڤا جەرگێ دۆژمنی دا نامەیا خۆ بگەهینیت. سالێن هەشتییان ١٩٨٤ ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا سلێمانیێ دخواند.

بیرا من تێ ل سالا ١٩٨٦ ێ ئەم بهەڤرە بووبین. ل سەر ناڤێ هۆنەرمەندێن دهۆکێ مە پێشانگەهەك ل هەولێر، سلێمانی و دهۆکێ ڤەکر، ددەما ئەم د رونشتین یان د پێشانگەهێ دا پرسەك ژێ د پرسی وی ب دلەك گەرم و رویەکی بکەن گۆتن دبەرسڤاندن. پشتی ڤەگەرا مە بۆ دهۆکێ ئەو چو زاخۆ پرۆژێن مەبێن هۆنەری هێشتا دبەردەوام بوون، لێ د دەمەك کێم دا ژ ئالیێ چەکدارێن رژێما بەعس ڤە هاتە زیندانیکرن و د دەمەکی کێمدا، هێشتا هیڤیێن وی د سنگدابوون، فرچا رەنگین ددەست دا، پالێتا رەنگ تەڤلهەڤ ل بەرسنگی بوو تابلۆیەکی نیڤتەمام ب جهـ هێشت و دگەل کاروانێ شەهیدا برێکەت. شەهید سەلمان دگەل چەند هەڤالێن وی ل گورەپانا لەشکەری ل فەیبیدیێ نێزیکی بازارێ دهۆکێ ١٩٨٧/١٢/١٠ گولەباران کر. ژ بەر ڤێ یەکێ مە ژ هەژی دیت کۆ کاروانێ وی یێ هۆنەری بەردەوام ببە د هەستێن هەموو هۆنەرمەند و هەڤالێن وی دا، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ یا پیرۆز، مە گەلەریەك بناڤێ (گەلەریا شەهید سەلمان) ل بازارێ دهۆکێ



ڤەكر و پێشانگەها یەكەم ژ بۆ وی هاتە ڤەكرن. نها ژی رۆژانە هەڤالێن وی و گەلێ وی ل دیدارا وینە و بهەڤرە بەرهەمێ خوینا وی تێ ل بیرئانین.

## سیروان شاكر:



سالا ١٩٦٨ل ئاكرێ ژ دایكبوویە، خواندنا سەرەتای و ناڤنجی ل ئاكرێ خواندییە، سالا ١٩٩٤ ئەكادیمیا هۆنەرێن جوان ل بەغدا بداوی كریە. نها بەرپرسێ پشكا شێوەكاریەل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆكێ.

یەك ژ هۆنەرمەندێن كۆ گرێدایێ ستیلەكە تایبەتە و رەنگێن وی ژ سرۆشتێ كوردستانێ و جڤاكا كوردی نە. دناڤا گرۆپا هۆنەرمەندێن كورد دا تێ ناسكرن خودانێ رێبازەك تایبەتە بتایبەتی بكارئینانا رەنگێن زەیتی، كاغەز و كارتونێ رەنگێن خۆبشێوەیێ پێل ل سەر رووبەرێ تابلوی بەلاڤ دكەت پلەیێن رەنگان ئێك دگرن وەك پارچەكا دیمەنەكێ ئینسائی یا بێ بووشایی چەند جاران تیروژكێن رۆژێ بۆشاهیێ پارڤەدكەن و ب هێلەكا نەرم یا ستوونی ئاسمان و ئەردی پێكڤەگرێددەن



## ستار عەلی

دەما مرۆڤ بەرێ خۆددەتەتابلوییێن هۆنەرمەندێ شێوەکار ستار عەلی، لڤینەك د هەستێن مرۆڤی دا پەیدا دبت و ب شێوەکی روحی و هەستێن دیتنێ خۆبەرددەتەدناڤا رەنگان دا، ژ بەر کو ڤیانا هۆنەرمەندی ژ سەروچاڤێن مرۆڤێ کورد دەستپێکر و هێدی هێدی خۆبەردا دناڤا کاڤلێن گوندو دەردورا چیان دا بوو نێچیرڤانێ رەنگێن خۆزایا کوردستانێ و هزرا خۆبەردا بەر ب جیهانەکا فرەهتردا کو خەیالێن خۆئازاد کرن و بوو زێرەڤانێ دیمەنێن جوان یێن خۆزایێ و چاڤێن وی بوونەکامیرەو دوربینا نێزیکرنا رووبەرەکێ بەرفرەه ژ پێکهاتا رەنگان. رەنگ دسەرئەڤرازی و نشیڤیاندایەژ روحیەتا رەنگێ سرۆشتی و ریالیتەیا ژیانێ، ژ کویراتیا دەرونێ هۆنەرمەندی، ژ دەربرین و هەلچوونێ دووری ڤیگورێن راستەوخۆ بەر ب ئابستراکتا رەنگان سەمفونیەکا رەنگان دئافرینیت. وەکچەێ بێچەندانا هەر مرۆڤەکی سور بینەری دلڤینیت و د بزاڤەکا بەردەوامدایە، رەنگێن سار و گەرم رووبەرێ سپی دادپوشن برێکا رەنگان نەئارامی، هەلچوون و دوودلیا د هوندرێ هۆنەرمەندی دا ئاشکرا دکەت. دگەل ڤان پێشداچونان فرچێ خۆئازاد کر و دوو دلی یا دکەساتییا هۆنەرمەندی دا بیەك لای خۆد رووبەرێ تابلوی دا دیت، لێ دیتنەکا ڤەشارتی ژ هارمونی و راگرتنا بەلانسا رەنگان، ژ سەرەدەریکرن دگەل خەت، ڤیگور و بووشاهیا دتابلویدا و ئافراندنا دیاردەکا نوو کو هۆنەرمەند وەك ملکێ خۆو ناسناما خۆیا هۆنەری دبینیت. ئەڤەهەمی رەنگڤەدانا ژیانا کەسەکێ کورد و هۆنەرمەندەکی کو دخوازیت ژیانا خۆیا زارۆکینی و سنێلەیەکا وندابووی ل سەر رووبەرێ جیهانەکا داخستی جارەك دی بەێزا رەنگێن تابلویەکێ ئازاد ڤەژینیت. ئەو دخوازیت هەڤالینیەکا دلسوز دناڤبەرا خۆو تابلوی دا پەیدا بکەت لێ چەند جارا ژیان رێ لێ دگریت و رەوشا دەردورا وی یا جڤاکی، سیاسی و جیهانی وی حێبەتی دهێلیت و بارێ وی گران دبیت ژ کۆمبوونا سەرێك یا ڤێ جیهانێ هوندورێ خۆبرندار دکەت دا بشێت تشتەکی بئافرینیت و دجیهانا دەرڤەدا بدەتەخۆیاکرن. ئەو بخۆزوی بزوی ناکەنیت دەمی مرۆڤ ل دیدارا وی دروینیت یان دگەل دئاخڤیت روی بروی بەرێ خو نادەتەمرۆڤی هزر و خەیالێن خۆسەربەست دکەت و ناخوازیت ددیدارەك درێژدا دانوستاندنێ بکەت. ناخوازیت دژیانەکا فۆرم یا رێکخستی دا بژیت، لێ د هوندرێ خۆدا خۆرێکخستیەو نەپەنیان دگەل خۆڤەدشێریت دیاردا رەنگان ل با هۆنەرمەندی مرۆڤی فێری چەند راستیێت ژیانا وی یا کەسایەتی دکەت.

ژ هاڤيبوونێ، ژنەباوەريێ و ژ بێ سيستەميا ژيانێ خوئيكانەدبينيت كێم هەڤال هەنەلێ هەڤالێ وي يێ هەري نێزيك و دگەل وي دژيت كو هەلگرێ بەشەكێ گرنگ يێ نەپەنيێن ژيانا وي يەئەوژي تابلو بخۆيە، لەوما ناخوازيت زوي سەرهاتيا ژيانا هۆنەرمەندەكي بدەتەخۆياكرن تابلويێن وي پرسەكا بێ بەرسڤن يێ بەرامبەر زوي بزوي تێ ناگەهيت دڤێت بينەر يێ ئامادەبيت ژ بوو بشێت رەوشەنبيريا خۆو هەستێن ديتنێ ب نازكي بەردەتەسەر رووبەرێ تابلوي ژ بەر كو هێشتا تابلو دكەساتيا هۆنەرمەندي دا يێ بريندارە. خوشيا هەڤپەيڤينێ دگەل تابلويێن ستار عەلي گريداي رەوشەنبيريەكا فرەهەو هەر لێدانەكا فرچەي واتەيەكا هوندرين ددەت، هەر پێكهاتەك بيرەوەريەكەو هەر بووشاهييەك ئازادكرنا خەيالێ يە. رەنگێ سپي وەكي دەمي دناڤبەرا داويا زڤستانێ و دەستپێكا بهارێ يە، وەكي كەڤيان دحەليێت و خۆبەرددەتەسەر ديمێ بهارەكا خەملي ژ رەنگێن جودا و دلێ بينەري پێ ئارام دكەت. ژ ڤێ سەربوورا درێژ يا ستاري دگەل رەنگان و جيهانا خەيال و رەنگێن جوان، دگەل رووبەرێن پان و ڤيگوران ژ جيهانا رياليتەيا هۆنەري ژ رەنگێن سرۆشتي و سەروچاڤێن مرۆڤان ژ وەستيانا گرێكێن ناڤچاڤێن ناڤدار و پيران ژ ديمێ جوانێ كچان هێدي هێدي بەر ب سەرابا رەنگێن خۆسەر چوو. چەند فرچێ وي يێ ئازاد بوو وەسا دڤيا هزرا خۆو ديتنێن خۆ ژي ئازاد بكەت دا بشێت بەر ب جيهانەكا هێشتا ڤەشارتي تر بچيت و هەموو نەپەنيێن ژيانێ دناڤا رەنگاندا ڤەشێريت و رەنگ ببيتەڤۆرما سەرەكەدا بەرێ بينەري بدەتەرەوشەنبيريەكا بەرفرهەتر و ل رەنگان بگەريێت دا راستيا ڤێ ژيانا نازك و هەموو رودانێن مرۆڤاتيێ بزانن، لەوما خۆبەردا دناڤا هۆنەري ئابستراكت (تجريد)ێ دا، وي بزانەبوون هەڤالينيا ڤان رەنگان كر ژ رەنگێن تاري بەر ب ڤەبوونێ، ژ رەنگێن گەرم و سورێ لڤوك و نەئاراميا شيني بەر ب تێكەليا هەردوو گرۆپان و دناڤا واندا روناهييەكا ژێدەرێ وێ نەهێتەخۆياكرن جار جار خۆبەرددەت دناڤا هارمونيا رەنگاندا هاوكێشەيا رووبەرێ تابلوي ژ تاريێ، ژ ڤەبوونێ، ژ گەرماتيێ و ژ ساربوونێ بەر ب چاڤێن بينەري دبەت. رۆناهيا كو هۆنەرمەندێ هولەندي رامبرانت بەرددا سەر بەشەكي ژ سەروچاڤان ڤێ رۆناهيێ د رەنگێن ڤيگور و ئابستراكت دا ژي رەنگڤەدايەو بوويەستايلەك د رەنگێن ستار عەلي دا. گازندا ستار عەلي نەبوونا بينەرەكێ راست يێ هۆنەري يە، نەبوونا رەخنەگر و رەوشەنبيريا هۆنەري يە، نەبوونا موزەو دەزگەهێن هۆنەري يەحەتا هەلبەستڤانێ كورد و نڤێسەر نەشيايەدانوستاندنەكا زانستي دگەل تابلوي بكەت هەروەكي دوو هۆنەرێن هاڤالن و بدرێژيا ژيانێ پەيوەندي دگەلێك هەبەهەر ژ گۆتنا (سيموندس ئەكويني ) گۆتي؛ « هەلبەست وينەكێ بدەنگە، تابلو هەلبەستەكا بێ دەنگە». لێ مخابن ديرۆكا كوردان ژ لايێ هەلبەست و سترانێ گەلەك دەولەمەندەلێ ژ لايێ شێوەكاري ڤەهەژارە، لەوما دڤێت نڤێسكار و هەلبەستڤانێ كورد خۆبەردەتەدناڤا وێنەو پێكهاتێن تابلوي دا دا بشێت پتر ببيتەپالدەرێ ڤێ مەيدانێ و رەوشەنبيريا گەل و جڤاكێ. هەروەكي پەيوەنديێن دناڤبەرا شاعر و شێوەكارێن جيهاني دا وەك؛ بوودلێر، هيگو، ئاپولنێر، هوراس، ئەدونيس و...هتد دەما ئەم ل ديرۆكا ڤي هۆنەري دنێرين بدەهان پەرتووك و گۆتارێن رەخنەيي ژ لايێ شاعران ڤەدەربارەي شێوەكاران هاتينەنڤێسين، ئەم وێژي ژ شاعرێن خۆناخوازين بتەنێ دەما بەرامبەر تابلويەكي رادوەستن هەست ب وێنەكێ شيعري بكەن و جارەكێ بێ ترس دەستێ خۆباڤێژن قەلەمي و چەند دێرا ل سەر رۆپەلان رێز بكەن. ژ ڤالاتيا ڤێ مەيدانێ هۆنەرمەنديێ شێوەكار نەچار دمنيت كو ئەو بخۆبەرێ خۆبدەن رەخنا هۆنەري ژ بەر وێژي من حەزا ڤێ يەكێ هەبوو هيڤيدارم شيا بم چەند خالان د خواندنەكا سەرپێ دا د هۆنەري شێوەكاريێ ستار عەلي دا ديار بكەم و بانگ ل شاعرێ كورد (بەكر بەگێ ئەرزي) بكەم كو بانگا خۆ دوبارەبكەت بوو شاعرێن مەهندەك بەر ب جيهانا هۆنەري بچن و ڤێ جيهانا نازك ب گەلێ كورد و جڤاكا كوردي بدەن ناسكرن.



## سلێمان عەلی

ژ راستیا رەنگێن سرۆشتی و تێكدانا جوانیا خۆزایەكا ل سەر وارگەهێ هۆنەرمەندی و هەستێن دیتنێ كرینە زێرەڤانێ پاشمایێ شەواتەكا بێ رەحم و رەنگێن ژیانەكا نوو ژێ ئافراندین. ژ راستیا كو د هوندرێ هۆنەرمەندیدا وەك ڤولكانەكێ دكەلیت و ژ روحیەتا گرێدای ڤێ جوانیێ هیڤیێن ژیانەكا بەرفرەهـ د رووبەرێ تابلویەكێ ئابستراك (تجرید) دا بكارئینایە. هۆنەرمەند سلێمان شیایە ژ جهی دەستپێبكەت و بۆیەرێن هەرچاردەمێن سالێ وەك سومبوولێن سرۆشتی و گولان دەمیدا بكاربینیت. دخوازیت بڤێ تەكنیكا نوو و تایبەتمەندیا خۆ ژ پاشمایێن شەواتەكا بێ رەحم كو هەموو تشت دناڤا خۆدا حەلاندین، ژ بیرهاتنێن زارۆكینیێ، ژ خانیكێن گوندا یێن سەرهاتیێن گەلەری ل شەڤێن زڤستانێ لبەر گەرماتیا سوپا داران دهاتن گۆتن و ژ جوانیا بهار و هەمی دەمسالان هۆنەرمەندی خۆ ب ڤی جهیڤە گرێدایە و دخوازیت جارەك دی ژیان ل سەر بنكەهەكێ نوو بێتە ئاڤاكرن. ژ پێكهاتێن ئەندازەیی دیوارێن خانیكێن هەرفتی وەك كوتلەكا ئێككرتی دناڤا بووشاهیا دەردوردا وێنەكریە و دخوازیت برەنگێن خۆلیكی یێن ژ بەرمایێ سوتنێ مای داپوشیت و هەڤركیا سور و رەشی د ناڤەراستێ دا بكەتە بنكەهێ تابلوی. چەند جارا شەڤا تاری دگەل رەشاتیا شەواتا سرۆشتی ب پەنجەرێن ڤەكری دیار دكەت و چەندجاران ژی ژ هەلاتنا رۆژێ و دیاردا تیروژكێن رۆژێ دناڤا تیكێن دیوارێن هەرفتەدا و دناڤا تایێن دارادا رۆناهیا خۆ بەرددەتە سەر رووبەرێ گشتی، لێ چاڤێن مە بەر ب گەرماتیا سورێ تاری و بەر ب پرتەڤالی دبەت، ژگەرماتیا دلێ خۆ دخوازیت ڤولكانا رەنگێ سور بكەتە شۆرشەك ل هەمبەر هەڤركیا ژیانێ. ژ دیمەنێ گوندەكێ پالدایە چیایێن خۆرستێ كوردستانێ كو بدەستێ زولمێ و بێ دلوڤانی هاتین سوتن، ژ كۆچبەریا ل سەر ڤی خاكی و فرینا بالندان بێدەنگیا كو ڤێ شەواتێ

هەرتشت دوربێچکری. هۆنەرمەندی ب تەکنیکەك نوو و ب ستیلەك نوو رەنگ ژ راستییا خۆ دحەلینن و وەك شەمالکا بەر ب ژێر تێن و وەك سەرما زڤستانەکا چیایی ل سەر دیوار و سیڤاندان ئاڤ دقەرسیت و دگەل رەنگێن هاتینە تێکەلکرن شوردبیت. دناڤبەرا گەرماتییا ئاگری و سەرما زڤستانێ دا هۆنەرمەندی شوربوون و حەلیان وەك سومبوول درەنگاندا بکارئینایە. چەند جارا رەنگێن مرنێ و رەشاتییا خەمگینیێ بەشەکێ تابلوی داپوشیە رەنگێ سپی و چەندجارا سورێ ڤەبووی خۆ دناڤدا دبینیت، چەند جارا ژی کوتلە ژێکڤەبوویە و هەر پارچەك جودا دیار دبیت لێ گرێدانا هەمیێ پێکڤە رووبەرێ تابلوی داپوشیت. دشێوەیێ دیێ تابلویان دا هۆنەرمەندی چارینەیێن پێکڤە گرێدای ژ گولان وێنە کریە و دناڤا پاشمایێ شەواتا رەش و خۆلیکی دا هێدی هێدی گول گەش دبن و هەمی دەمسال بخۆڤە گرتینە. بهار ژ نووڤە گولا گەش دکەت دناڤا داوییا سەرما زڤستانەکا ساردا و هاڤین د هەمبێزا گەرماتییا رۆژێ دا هێزێ ددەتە سرۆشتی و گول سەرێ خۆ لهەمبەر رادکەن، پایزا بەر ب خەمگینیێ دچیت ژ زەراتی و هەمەرەنگییا سرۆشتی کو خاترا خۆ ژ جهێ بۆیەرێ دخوازیت هۆنەرمەندی ب سەرهلدانا گولێن پایزێ هیڤییەك پەیداکریە و ناخوازیت ل سەر ڤێ ئاخێ توڤێ ژیانێ بمریت ب هێزا هیڤیێن خۆیێن هوندرین دخوازیت هەمی دلا پێ گەرم بکەت. بەر ب زڤستانەکا سار یا کوردستانێ دچیت و ژ نەخشێ چیایێن بلند و کۆمتێن ژ بەفرێ سپی بووی ب گەرماتییا دلێ خۆ حەلیانەکا نازك و ب دلوڤانی بئاڤەکا سپی زەلال یا ژ کەڤییا دزێت و گولا پێ ئاڤددەت. چەند جاران خواندنا چاڤان بەر ب خەمگینێ دتابلویاندا دچیت گول برەنگێن خۆ ناهێن دیتن و سرۆشت درەنگەکی دا هاتییە دووربێچکرن هەڤرکییا دناڤبەرا رەش و سوری دا بەردەوامە و ژ شوینەوارێن وێرانکرنێ هۆنەرمەند دخوازیت ژ دارێن هشك کاتێن نوو شین ببن و ژ کەڤر و ئاخا ژ سوتنێ رەش بووی بجوانییا رەنگا بشوت و ئەو هیڤیێن د هوندردا بکەتە هێز بۆ ڤەژینا خۆزایێ. ژ نەپەنیێن تابلوی هۆنەرمەندی خاستییە چاڤ و هەستێن بینەری پالدەت دا بشارەزای و بزانەبوونەکا هۆنەری خۆ بەردەنا دناڤا کویراتییا تابلوی دا و هەست ب جوانییەکە ژدایك نەبووی بکەن. هێزا روحی یا هۆنەرمەندی د تابلویاندا بکارئینای چەند دیمەنێن ڤەشارتی ئافراندینە هەستکرن بچاوانییا کارکرن دگەل رەنگا، ژ ترسا تێکدانا هەر لێدانەکا فرچەی و نەبوونا بەلەنسا راگرتنا کوتلێ د ناڤەراستا تابلوی دا بوویە زەنگلا مەترسیێ ل دەف هۆنەرمەندی، ژ بەر وێژی تەکنیکا بکارئینانێ گوهارتییە و بوویە بەشەك ژ نەپەنیێن کەساتییا هۆنەرمەندی چەند جارا مرۆڤ هەست بلڤینا لێدانێن فرچەی دکەت بتایبەتی دیاردا رۆناهیێ ل سەر سیبەرێ یان ل سەر تاریاتیێ. بڤی شێوەی هۆنەرمەند سلێمان شیایە هزرا بینەری تەڤلهەڤ بکەت و نەچار دکەت ل نەپەنیێن پێکهاتا تابلوی بنێریت و ژ حەلیانا سرۆشتی ژیانەکا نوو و رەنگێن نوو پەیدا بکەت. ئەڤەژی ژ شیان و زانستا هۆنەری یە ل با هۆنەرمەندی کو موهرا خۆ ل ستیلەکا تایبەت دایە و بوویە ناڤونیشانێن هۆنەرمەندی. ئەڤرۆژی ئەم پێدڤی هۆنەرەکێ بڤی رەنگی نە دا بشێین راستییا هۆنەری دژیانێ دا بدەینە ناسکرن و هەست ب ڤێ جوانیێ بکەین.

## لوقمان سەلام



هۆنەرمەند لوقمان ئێکەژوان هۆنەرمەندێن دیار د مەیدانا شێوەکاری دا پارێزگەها دهۆکێ. ل سەر بنگەهەکێ زانستی و ئەکادیمی هۆنەر خواندییە،مامۆستایێ هۆنەری یەل پەیمانگەها



هۆنەرێن جوان- دهۆكێ. تایبەتمەندیا هۆنەرێ وی دابەشكرن و راگرتنا بەلانسا تابلویەژ بەلاڤكرنا رەنگێن یەكسان و راگرتنا هاوكێشێ د شێوەیێ ئابستراكت دا، گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەكرینەنهاژی بەردەوامەل سەر كارێ خۆیێ هۆنەری.

## عەدنان شینو



سالا ١٩٦٣ دەڤەرا ئامێدیێ ژدایكبوویە. سالێن هەشتیبان دەست ب هۆنەری شێوەكاری كریەو



بتایبەتی ل دهۆكێ دەمی ناڤنجی یا مەمێ ئالان كو مامۆستا ئەبدورەحمان وەحید كەلحو مامۆستایێ هۆنەری شێوەكاری بوو. پەیمانگەها هۆنەرێن جوان سالا ١٩٨٦ ل بەغدا خواندییە. پشتی سەرهلدانێ دگەل گەلەك مامۆستایێن هۆنەری پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆكێ وانەیێن رەسمی داینە، سالا ١٩٩٥ دگەل گرۆپەكا هەڤالێن خۆیێن هۆنەرمەند چوویە ئەلمانیا و ل بەرلین دژیت. گەلەك پێشانگەهـ ل گەلەك وەلاتێن ئەوروپی و كوردستانێ ڤەكرینە. كارێ داویێ (پانوراما ئازادی) ل بازێرێ دهۆكێ دروستكریە. تایبەتمەندیا هۆنەرمەند شینو درەنگ و فۆرمێن پێكهاتا تابلوی دایە. ئەو بەر ب بیرەوەری و ڤیانا زارۆكینیا خۆ چوویە، سەروكانیا رەنگان ژ نەخش و كارێن دەستی یێن كوردەواری گرتیەو بیرهاتنێن دەستێن خانمێن كورد ل سەر بالیفك و نەخشێن د ناڤا مالێ دا دگەل باندۆرا جوانییا سرۆشتێ كوردستانێ. وی هۆنەری خۆ ژ سەرهاتی و نەخشێن گەلەری بەر ب ئابستراكتا رەنگا بریە و دخوازیت ڤێ سەرهاتییا زارۆكینییا وی ژ گەلەك نرخێن ژیانێ بێ باهر د تابلویاندا دوبارەبكەت. نها ل دهۆكێ دژیت و بەردەوامەل سەر كارێن هۆنەری.

## وەلید ستی

سالا ١٩٥٤ ل دهۆكێ ژ دایكبوویە، سالا ١٩٧٦ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل بەغدا خواندییەو پشتی سالێن حەفتیان چوویەدەرڤەی وەلات سالا



١٩٨٢/١٩٧٧ ل یوگوسلوڤینیا ئەکادیمیا هۆنەری خواندیە. پاشی چوویەلەندەن بەردەوامی بخواندن و کارێ هۆنەری دایە. وەلید ئێکەژ ناڤدارێن هۆنەرمەندێن کورد. دەستپێکێ ژ حەزا قەلەمی و وێنەکرنێ بەرب کارێ کوپی یان گرافیکێ چو پاشی کارێن زەیتی و هێدی هێدی ئەزمونا وی یا هۆنەری و تێکەلیا دگەل جیهانا رۆژئاڤا ئەو بەر ب مەتریالێن نووڤە بر، وەك « بەر، ئاسن، بچەندك، و...هتد بابەتێن سەرەکە ئەو دخوازیت کەڤری بکەتەسەنتەرێ تابلوی، ژ بەرکەبەر بوویەهەڤال و دوستێ مەوەك سومبوولەکا پیروز دبینیت، هەروەسا سەنتەرێ جڤاکبوونیا مالباتی و وەك بازنەکێ دەردورا خۆپێکڤەگرێددەت و سەنتەری دکەتە بنکەە ژ بۆ هەموو گرێدانا. نها ل لەندەن دژیت و بەردەوامە ل سەر کارێن خۆیێن هۆنەری.

## عەونی سامی

هۆنەرمەند دبێژیت؛ « ئەز دناڤا مالباتەکا قەرەبالغ و تاخەکێ تژی مرۆڤ ژدایکبوویمە و ژیانا خۆیا زارۆتیێ ل وێرێ بوورانديە. د ناڤا کۆلانێین تەندا ژوورێن تاری و ل هنداڤی رووبارەکێ ب پێل کو لمەها بهاررێ هەموو کەس ژێ دترسان دناڤا خۆدا دوریێج بکەت. چەند کەس ژێ ل ژڤانێ دمان کو ئەڤ رووبارە هندەك تشتا دگەل خو بینیت و بدەتەدورێن خۆئەو بکاربینن. دناڤا مالێ دا دناڤا کۆلان و دەوروبەران دا تشتەك زێدە نەدبوو هەموو تشت دهاتن بکارئینان. لاشێ مرۆڤی خۆدناڤا



ڤێ قەرەبالغێ دا ددیت. ژ هەر تشتی و ژ هەبوونا خۆ من تابلو ئافراند. ژ دەربرینا سەروچاڤێن مرۆڤان، ژ پێکهاتا خۆزایی و ژ هەستێن وی یێن ڤەشارتی تابلو ژ دایکبوو. پشتی خواندن و نێزیکبوونا دگەل هۆنەری و بتایبەتی چونا وی یا ئەوروپا وەلاتێ ڤانکوخ و رامبرانتی ئەو پتر بەر ب ئەشقا تابلوی بر. لێ ڤێجارێ هەموو مرۆڤ دناڤا خۆدا هەمبێزکرن. بەر ب نووەدەمیا گرافیکێ چو، خەت و پێکهاتا تابلوی بوویە بنکەهێ هۆنەری لبا هۆنەرمەندی. وەك هۆنەرمەندەکێ ناڤدارێ باژێرێ زاخۆ دهێتەحەزکرن و بەردەوامە سەر کارێ خۆیێ هۆنەری.

## گوهدار سەلاحەدین

هۆنەرمەند گوهدار ئێکەژ وان هۆنەرمەندا یێ د زارۆکینیا خۆدا حەزا هۆنەری شێوەکاری ل با پەیدا بووی. دخواندنێن ناڤنجیا مەمێ ئالاندا بەرێ خۆ دایەزانستا هۆنەری و بەردەوامی ب هۆنەری دایە. دەستپێکا سالێن هەشتییان چوویە پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا سلێمانیێ و پاشی ل بەغدا پشکا گرافیکێ ب داوی ئینایە. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ل کوردستانێ و ئەوروپا ڤەکرینە. دێزاین و لوگۆیێن گەلەك دەزگەهـ و کۆڤار و پەرتووکان چێکرینە. ئێك بوو ژ مامۆستایێن دامەزرێنەرێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆکێ. سالا ١٩٩٥ چوویە ئەلمانیا و بەردەوام بوویەسەر کارێن هۆنەری. گەلەك پرۆژێن هۆنەری ئامادەکرینە. نهاژی بەردەوامەسەر کارێن هۆنەری.

## جەمال سەلیم

هۆنەرمەند جەمال سەلیم ئێکە ژ وان هۆنەرمەندێن دهۆکێ یێ رولێ خۆد مەیدانا هۆنەری دا دیتی. د سالێن هەشتییان دا چوویەئەکادیمیا هۆنەرێن جوان ل بەغدا و بەردەوامی ب کارێ خۆدایە. پشتی سەرهلدانێ ئێك بوو ژ دامەزرێنەرێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەکرینە. هۆنەرمەند خودانێ تایبەتمەندیا ڤیگوری بوو دگەل دوریێچکرنا رەنگان. هۆنەرمەند جەمال سەلیم تا نها بەردەوامەد وارێ هۆنەری دا.

## عیماد عەلی

دەستپێکا سالێن هەشتییان دگەل بزاڤا شێوەکاریا پارێزگەها دهۆکێ هۆنەرمەند عیماد عەلی دەست دایە هۆنەری شێوەکاری، ژ کلاسیکێن ئەوروپی تابلویێن روبنز، لوتریك، رامبرانت، گویا و دێلاکرویا تاکو دگەهیتەنوودەمیا هۆنەری د ناڤا بزاڤا خۆیا شیوەکاری دا بکارئینایە. هەردەم بەردەوامی دایە لایەنێ هۆنەری و زانستا پێکهاتا تابلوی. گوندێن کوردستانێ بەر ب ئابستراکتێ بریەو دخوازیت ئەزمونا خۆ بدەتەدیارکرن کو چاوا رەنگێن سرۆشتی تێکەلی ژیانا کوردەواری دبن و ژهەردویان تابلویەکێ شێوەکاری ژ دایکدبیت. هۆنەرمەند عیماد خودان تایبەتمەندیا خۆیەد پێکئینانا تابلوی دا. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەکرینەو نها ژی بەردەوامە.

## مووسلم ئەحمەد

هۆنەرمەند مووسلم ئێکە ژ وان هۆنەرمەندێن پارێزگەها دهۆکێ، یێ د سالێن هەشتییاندا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا مووسل خواندی. بەردەوامە ل سەر کارێن خۆیێن هۆنەری. بتایبەتی تایبەتمەندیێن بازێرێ زاخۆ، جڤاك و کەڤنەشوپیا کوردستانێ دگەل جوانییا سرۆشتی و رووداێن ریالیتێ کرینە هێڤێنێ تابلۆی. پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە وەك هۆنەرمەندەکێ بازێرێ زاخۆ دهێتەناسکرن.

## رەشید عەلی

سالا ١٩٦٦ ل دهۆکێ ژدایکبوویە، ١٩٨٦/١٩٨٧ پەیمەنگەها هۆنەرێن جوان بەشێ شێوەکاری(پەیکەر) ل سلێمانیێ داویکریە، ١٩٩٢ تا ٢٠٠٤ مامۆستایێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆکێ بوو. نها (سالا ٢٠١٤) رێڤەبەرێ شێوەکارییە ل دهۆکێ. پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپان ل کوردستانێ و دەرڤەکریە سالا ٢٠١٢ دگەل شاندێ گەلەریا دهۆکێ بۆ چەند چالاکیێن هۆنەری چوویە ئەلمانیا و ل بەرلینێ چەند چالاکی ئەنجامدایینە. نها ئاکنجیێ دهۆکێ یە و بەردەوامە د خەباتێن هۆنەری و شوین تلێن وی ل گەلەك پەیکەرێن ناڤدارێن بازێری دیارن.

د دیرۆکا هۆنەری شێوەکاری دا، هۆنەرمەندێن ژ خیچکێشانێ بەر ب رەنگ و ڤیگوران چووین بووینە هۆنەرمەندێن پەیکەرتاش و شوینتلێن وان ددیرۆکا هۆنەری دا د دیارن. هەر ژ دەمێ رێنایسانسێ تاکو دیاردا خواندنگەهێن هۆنەری هەمدەم ژ مایکل ئەنجلوی، دوناتلو، رافائێل تاکو دگەهیتە رودان و هەڤالێن وی یێن قوناغێن سەدسالێن نوو. ئەڤ میناکە د هۆنەری رۆژهەلاتی ژی دا دبەرچاڤن، هەر ژ جەواد سەلیم و مەحەمەد غەنی تاکو دگەهیتە ئەیاد قەرەغولی و هەیسەم حەسەن . هەروەسا ژ هۆنەرمەندێن کورد ئەنوەر جزیری و دارا حەمەسەعید تاکو رەشید عەلی و پەیکەرتاشێن نوو. پرانییا ڤان هۆنەرمەندان پەیوەندییا دناڤبەرا پەیکەری و تابلویێ زەیتی، ئاڤی و خیچکێشانێ دا هەبوویە. هۆنەرمەند رەشید عەلی ژ لایێ هەستێن هۆنەری هەڤرکییا دناڤبەرا ژیانا تاکەکەسی، جڤاکی و هۆنەری دا وەك دو کەساتی خۆد هۆنەری دا دبینیت. کەسێ ئێکێ کو هۆنەرمەند پێ دهێتەناسکرن پەیکەرتاشی یە، ژ ڤیانا هۆنەری پەیکەرتاشیێ چەند رەنگڤەدان د قوناغێن ژیانا وی دا پەیدا بوون، ژ بەردەوامیا خواندنا ئەکادیمی ، ژ بەردەوامی کارکرن ل سەر موتیڤ، مودێل وشێوەیێن بچویك، بەر ب کوچبەری، ژیانا پێشمەرگاتی و تێکەلیا دگەل جوانییا سرۆشتێ

كوردستانێ و بەرەنگارییا ئاستەنگێن ژیانێ ئەڤە هەموو پالدەر بوون كو هۆنەرمەند بەرێ خۆ بدەتە رەنگا و هیڤی و ئارمانجێن خۆ، هەست و دیتنێن خۆو حەزا هۆنەری د رووبەرێ تابلویەكی دا بكاربینیت. ژ تەكنیكا رەنگێن ئاڤی ئەكواریل ل سەر كارتونێ دیاردا هارمونیا رەنگا و مێتنا رووبەرەكێ سپی و بەلاڤبوون و تێكەلبوونا رەنگان وەكی كوتلەكا هەڤدوگرتی ژێر رووبەرەكێ سپی و دووراتییا چاڤ دبینن وێنەدكەت. چەند جارا ژی ب رەنگێن پاستیل وەك هۆنەرمەند دێگاس رۆناهییەكا رەنگێن ڤەبووی سەر رووبەرەكێ تاری گرۆپەكا هەڤگرتی وێنەدكەت. پەیكەر دناڤبەرا ریالیتە و پەیكەرێ ئەكادیمی وەكی پرانییا پەیكەرتاشێن رۆژهەلاتی ئامادەدكەت. ژ وەرگەرەكا ئاشكرا، ژ موتیڤێن ناسكری و ژ كارێن هۆنەرێن بچویك وەك بازنەكێ دەردورا وی گرتییە، ئەڤەژی گرێدای رەوشا وی یا جڤاكییە یا هۆنەرمەند تێدا دژیت، نەبوونا موزەخانێن نێڤنەتەوی و نیشادانا پەیكەرێ هەمدەم، نەبوونا كاتەلوگ و مەتریالێ پێدڤی سەر پەیكەری و نەبوونا رەوشەنبیرییا جڤاكی بەرامبەر هۆنەری پەیكەری هەموو بوونە ئاستەنگیێن بەر سنگێ هۆنەرمەندێ پەیكەراش. ژ باندۆرا ئولی و قەدەغەكرنا پەیكەری د دیرۆكا گەلێن بووسلماندا باندۆرەكا نەرێنی ل سەر پێشڤەچوونا ڤی لایێ هۆنەری كر و هێشتا بەردەوامە. شاعر و پەیكەرتاشێ كورد بەكر بەگێ ئەرزی خودان شیانێن بەرز یێن هۆنەری پەیكەرتاشیێ بوو لێ وی ژی د ناڤبەرا جوانییا سرۆشتێ چیایێن كوردستانێ و خۆزایا چیایێ مەتینی و باندۆرا ئول و جڤاكێ بەرێ وی ژ پەیكەرتاشیێ بەر ب هەلبەستێ بر. ئەڤە دەردێ گەلەك هۆنەرمەندێن ئافرێنەرێن كورد بوو. لێ هۆنەرمەند رەشید شیا گەلەك ئاستەنگیێن ژیانێ پاش خۆبهێلیت و بەردەوامیێ ب خەباتا پەیكەرتاشیێ بدەت. ژ پەیكەرێن بچویك بەر ب پرۆژێن مەزن یێن پەیكەرتاشیێ چوو، ژیانا وی یا ڤێ داوییێ و هەبوونا وی یا خۆجهیێ و رێڤەبەرییا گەلەرییا دهۆكێ بوویە پالدەرەك كو دگەل بەربسیارییا ژیانێ رۆژانە دناڤا مەیدانا هۆنەری دا بیت و چەندین هۆنەرمەندان ببینیت و دانوستاندن ل سەر مژارێن هۆنەری بێنەكرن. ژ رووگەشی و بێدەنگی و دلوڤانییا وی شیایە حەزا پترین مرۆڤ ل خۆ كۆمبكەت و سەرەدەریێ دگەل هۆنەرمەندان بكەت، ڤیانا وی ژ بۆ نەتەوە، جڤاك و هۆنەری وی ئەو ب ناسناما هۆنەری دایەناسكرن. دخوازیت ڤیانا خۆد هەستێن دەستلێدانا وی ژ تەقنەكا خۆمالی یا كوردستانێ و ئافراندنا پەیكەرەكێ نوو، ژ دابرینا مادێ سیێ دناڤبەرا وی و كارێ پەیكەری دا هەست و روحیەتەكا خودان شیانێن مەزن ل با هۆنەرمەندی پەیدا دكەت. دەمێ فرچەی یان قەلەمی ددەستێ خۆدا دگریت كو تابلویەكێ رەنگین ب ئافرینیت دخوازیت تلێن خۆ یەكسەر بێخیتە شوینا فرچەی و وەكی شیوێ پەیكەرتاشیێ كار بكەت ژ بەر كو ئەو ناخوازیت تشتەك ببیتە ئالیكار دناڤبەرا وی و كارێ هۆنەری دا، ژ گوندەكی بەر ب باژێرێن مەزن و ژ باژێران بەر ب كشوەرێن دی ئارمانج و دیتنێن هۆنەرمەندی نە، دا ئەو رووبەرەكێ مەزن یێن جیهانەكا نەدیتی د خەیالێن خۆدا وێنەبكەت و ژ هەر دیمەنەكی بەشەكی بگریت و بكەتەپەیكەر و تابلو دا كەساتییا خۆد ڤێ پارچێ دا ببینیت و بەرێ چاڤ و هەستێن حەزكرێن هۆنەری بەردەتە سەر ڤی بەرهەمی. دەربازكرنا سنوورێن جڤاكی، ئولی و سیاسی بەر ب ئازادییا فرچەكێ رەنگین و تەقنەكا ژ خاكا كەڤنترین شارستانیەت و بنگەهێ هۆنەری مەزوپوتامیا، ژ پەیكەرێ سومەری و بابلی بەر ب شوینەوارێن چیایێن دەردورا باژێرێ وی دهۆكێ و شوینەوارێن هێشتا ل گوندێ و یێ بەرزە لێكولین ل سەر تێنەكرن دچیت. دبیتەگەرۆكێ خەیالێن دوور و لێگەرێ تشتێ هێشتا نەدیتی دا بشێت ڤەشارتنێن د هوندرێ خۆدا بكەتە بەرهەمەكێ هۆنەری و موهرا خۆ ل دیرۆكا هۆنەری كوردی بدەت و پەیكەرێن وی ببن شوینەوارێن سەر كەڤر و موزەخانە و مەیدانێن باژێرێ وی. هوسا هۆنەرمەند رەشید عەلی دبیتە مرۆڤەكێ ئافرێنەر و دیار لێ د مەدیا كوردی دا بەرزەیە و هێشتا ل پشت پەردایە ژ بەركو ئەو نەشێت روویێ خۆیێ

بکەنی ب ماسکێن دەستکرد داپوشیت ئەو دخوازیت وەکی بەرهەمێن خوییێن هۆنەری خزمەتا نەتەوە و مرۆڤاتیێ بکەت و راستیا خۆگرێدای راستیا هۆنەری بکەت دا هەر کەس بەر ب وێ راستیێ بچیت و دیرۆکەکا هۆنەری پێ بێتەخەملاندن.

## هیڤی



هیڤی پێل وەك شێوەکارەکا ژن ل پەیمانگەها هۆنەری یا دهۆکێ سالا ٢٠٠٨ خواندنا خۆ ب پلەیا یەکێ پشکا پەیکەرتاشیێ داویئینایە، یەك بوو ژ خوێندکارێن سەرەکە کو خوشتڤیا مامۆستا و هەڤالێن خۆ بوو، هەروەها ژ بەر چالاکی و شیانێن وێ یێن هۆنەری باوەرناما رێزگرتنێ ل سەر پەیکەرتاشیێ وەرگرتیە و ب درێژیا ژیانا خۆیا هۆنەری بەشداری گەلەك چالاکیێن هۆنەری بوویە وەك. سالا ٢٠٠٤ پێشانگەها دهۆکێ، ٢٠٠٧ پەیکەرێن بەفرین ل دهۆکێ،٢٠٠٧ فەستیڤالا هەرێمی یا شێوەکاری ل سلێمانیێ ٢٠٠٧، پێشانگەها گروپ ل گەلەریا شەهید سەلمان ل دهۆکێ،٢٠١٠ پێشانگەها هۆنەرمەندێن دهۆکێ ل هەولێرێ گەلەریا میدیا، ٢٠١٠ پێشانگەها هۆنەرمەندێن دهۆکێ گەرا ٩ێ ل گەلەریا دهۆك، ٢٠١١ گەرا ١٠ێ یا هۆنەرمەندان ل گەلەریا دهۆکێ. هەروەسا بەشداری پرۆژێ پانۆراما ئازادی بوویە و پرۆژێ سۆزەکا بێ سنوور ل ئینستیتووتا هۆنەری یا دهۆکێ، نها ژی بەردەوامە ل سەر کار و خەباتێن هۆنەری ل گەلەریا دهۆکێ و ئێکە ژ هۆنەرمەندێن ئاکتیف ل دهۆکێ. هیڤی پێل شیایە جیهانەکێ هەلبژێریت کو ببیتەزمانێ هەمی جیهانێ و هەر مرۆڤەك ب هەستێن خوییێن دیتنێ بەرهەمێن وێ ناسبکەت. پەیکەر جیهانەکا تایبەتە کو ژیانا مرۆڤێ دەستپێکێ دگەل بوورین و پەیدابوونا هەموو بویەران قوناغێن ژیانێ توومارکرینە، هیڤی خان ژی بزاڤێ دکەت بەشەکی ژ دیرۆکا کوردستانێ د چارچوڤا پەیکەرێن خۆدا توومار بکەت ئەڤەژی خەباتەکا هەری گرنگە، جیهانەکا پاقژە، هەستێن نازکن و نامەکە پێشکێشی گشت مرۆڤاتیێ دکەت.

## یونس ئەحمەد

هۆنەرمەند یونس ئێکە ژ هۆنەرمەندێن پەیکەرتاشێن پشتی سەرهلدانێ دەستدایە کارێ هۆنەری. تایبەتمەندیا خۆ د هۆنەری پەیکەری دا دبینیت. ڤیانا وی بوو ئاخ، دار و بەرێن کوردستانێ ئەو پالدایە ئەڤ مەتریالە ببیتەچافکانیا ئافراندنا بەرهەمێن وی یێن پەیکەری. گەلەك پێشانگەهێن گروپ و تایبەت ڤەکرینە. نها ژی بەردەوامە ل سەر کارێ خوییێ هۆنەری.

## حەمید عەجیل

دەستپێکا سالێن هەشتیان ل مووسلێ حەمید عەجیل وەك خەتنڤیسەکێ سەرکەفتی د هاتەناسکرن. د بەردەوامیا کارێ وی یێ فوتوگرافی ئەو پالدا هۆنەری شێوەکاری تایبەتی هۆنەری پەیکەری. ژ کەڤنەشوییێن هەرێمی ژ کەساتیێن دیرۆکی وی پەیکەر ئافراند. بەردەوامیا وی دکارێ هۆنەری دا خۆ گەهاندا ئەکادیمیا هۆنەری شێوەکاری ل بەغدا، پشتی خواندنا خۆ داویئینای هاتە دهۆکێ و بەردەوامی دا کارێ خۆ، نها ژی مامۆستایە ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان. پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گروپدا کریە.

## حەمید شەریف

وەکی پرانییا هۆنەرمەندێن دهۆکێ حەمید شەریف ژی دەرچوییێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا سلێمانییێ یە. هەروەسا د سالێن هەشتێیاندا دەست ب هۆنەری کریە. پشتی سەرهلدانێ وەك مامۆستا ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆکێ مامۆستا بوویە. پتر بەرێ خۆدا یا مەتریالێ ناڤخویی یێ کوردستانێ ژ دار و خۆزایا کوردستانێ پەیکەر ئافراندیە، ئەڤە ژی دیارەکا بالکێشە و گەلەك زەحمەتە، ژ بەرکو ئالەتێن دروستکرنا ڤی جۆرێ هۆنەری گەلەك زەحمەتن، هەروەسا بەرگرییا وی مادێ کو دار وەك خو بمینیت. دیارە هۆنەرمەندی چافکانییا ڤی هۆنەری ژ حەزا گوند و دارو بارێن کوردستانێ گرتیە، سالێن نوتان بەرەف ئەوروپا چوو، چەند سالا ل وەلاتێ سویسرا ژیا پاشی ڤەگەرا کوردستانێ. سالا ٢٠١٢ دگەل گرۆپا هۆنەرمەندێن گەلەریا دهۆکێ سەرەدانەك بۆ باژێرێ بەرلین کر و چەندین جهێن هۆنەری و پەیوەندی و چالاکی پێکئینان. ئەوژی وەك بەکر بەگێ ئەرزی پەیکەرێ خو ژ داری دەستپێدکەت. نها ژی ل گەلەرییا دهۆك بەردەوامە سەر کار و خەباتێن هۆنەری.

## هۆنەری شیوەکاری ل پارێزگەها دهۆکێ پشتی سەرهلدانا ١٩٩١

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ پارێزگەها دهۆکێ ژی وەکی پارێزگەهێن دی یێن باشوورێ کوردستانێ د قۆناغەکا گەلەك دژوار را دبووری. لێ دیسان د وەختەکێ نێزیکدا هۆنەرمەندێن کوردستانێ بشێوەکێ گشتی و یێن پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی شیان. گەلەك ساز و بنکەهێن هۆنەری دامەزرینن و ژ ئەگەرا ڤێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان سالا ١٩٩٢ سەر دەستێ چەندین هۆنەرمەندێن ڤێ دەڤەرێ هاتەدامەزراندن. ئەڤە وەك مزگینییەك دلخوشکەر بوو بۆ هۆنەرمەند و کەسێن حەزا هۆنەری هەی ل ڤێ دەڤەرێ. بەردەوام ڤێ پەیمانگەهێ خەباتێن خۆیێن هۆنەری بەردەوامکرن و گەلەك هۆنەرمەند ئافراندن. ل سەر بنکەهەکێ ئەکادیمی و زانستی گەلەك لایەنێن هۆنەری ئاشکرا بوون و هەموو بەشێن هۆنەری هاتن ڤەکرن. پشتی ئالوزیێن شەرێن ناڤخوی گەلەك ژوان هۆنەرمەند و مامۆستایێن پەیمانگەهێ مشەختبوونە وەلاتێن رۆژئاڤا. لێ دگەل چوونا وان هندەك ژوان هۆنەرمەندا بەردەوامی دا خەباتێن هۆنەری و ژێر باندۆرا هۆنەری رۆژئاڤا گەلەك تشتێن نوو بخۆڤەئینان و بوونە پشتەڤانێن بزاڤا شێوەکاری ل پارێزگەها دهۆکێ. ژوان هۆنەرمەندان کەسێن وەك وەلید ستی، فهمی بالایی، عەدنان شینو، گوهدار سەلاحەدین و...هتد

پشتی نەمانا رژێما بەعس سالا ٢٠٠٣ ئێکجاری کوردستان ئازاد بوو، بزاڤ هاتەکرن کو هندەك بنکەهێن هۆنەری و رەوشەنبیری سەر ب وەزارەتا رەوشەنبیری یا حکۆمەتا هەرێمێ گەلەك هاریکار بن ژ بۆ هۆنەرمەندان. ژ لایێ پشتەڤانییا مادی، هەبوونا مەتریالێن هۆنەری و پەیوەندی دگەل وەلاتێن هەرێمی و جیهانی. هەروەسا ناردنا شاندێن هۆنەرمەندان بۆ وەلاتێن بیانی بوونە ئەگەرێ پالدانا هۆنەرمەندا کو پتر ئەشقا هۆنەری دەف پەیدا ببیت و رەوشا ژیانێ بەرەف باشی چوو.

حەتا گەهەشتیە قۆناغا دامەزراندنا ئەکادیمیا هۆنەری ل دهۆکێ. هەلبەت سالا ٢٠١٢ وەك مزگینیا هەموو هۆنەرمەندا بوو کو ئەڤ ئەکادیمیە ببیتە بنکەهەکێ زانستی و پالپشتێ هۆنەرمەندێن پارێزگەها دهۆکێ. هەروەسا هەبوونا گەلەرییا دهۆکێ، هۆلا شەهید سەلمان و پانوراما ئازادی ئەڤە هەموو بنکەهێن نیشادانا بەرهەمێن هۆنەرمەندێن ڤێ دەڤەرێ بوون.

## سەردار کێستەیی

سالا ١٩٧٣ ل دهۆکێ هاتیە سەر دنیایێ، پشتی سەرهلدانێ بەر ب هۆنەری شیوەکاری چوو. دهەر قۆناغەکێ دا خودان ئەزموون و تایبەتمەندییەکا هۆنەری بوو، ژ کاریکاتورێ بەر ب دەربرینا سەروچاڤان، ژ سرۆشتێ کوردستانێ بەر ب رەنگێن جلو بەرگێن



ژن و کچێن کوردان چو ، هەروەسا نەخش و نیگارێن ناڤمالێ و رەنگێن گەلەری یێن کوردەواری و هێدی هێدی بەر ب شەفافیەتا رەنگێن ئاڤی چوو. لڤان سالێن داویێ خۆبەردا سەر ئابستراکت د لاشێ مرۆڤیێ دا. گەلەك بەرهەمێن شێوەکاری ل گەلەریا دهۆکێ ئەنجامداینە و بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری.

## دلێر کەمال

هۆنەرمەند دلێر ئێك بوو ژ خویندکارێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆکێ، پشکا شێوەکاری. بەردەوامیا خواندنا هۆنەری شێوەکاری دا گەلەك حەزژێکەرێ کارێ خۆ بۆ پشتی پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ب داوئینای دیسان بەردەوامی دا کارێ خۆ پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کر. نها ژی بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری، نەبەس تنێ تابلویێن زەیتی دروستکرینە بەلکو گەلەك پەیکەر و شێوەیێن جودا یێن هۆنەری ئافراندینە و دیسان بەردەوامە.

## دلشاد ئسمائیل

ژ هۆنەرمەندێن گەنجە یێن پشتی سەرهلدانێ و گەلەك گرنگی دایە کارێ خۆیێ هۆنەری. پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە، دناڤبەرا ریالیتە و ئابستراکتا رەنگاندا وی تابلۆ ئافراندیە. د پێکهاتا گشتی دا خەت بوویە سەنتەرێ تابلۆی. نها ژی بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری.




## دلوڤان مەحەمەد ئەمین

ئێکە ژ هۆنەرمەندێن پشتی سەرهلدانێ دەست ب کارێ خۆ کری. تایبەت پشتی پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ خواندی وەك کەسێن پێشکەفتی یێن هۆنەرمەندێن گرۆپ و خۆ دهێتە هەژمارتن. پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن هۆنەری دا کریە و هێژ بەردەوامە. تابلویێن وی بەر ب ستایلێ تایبەت و رەنگێن بالکێش یێن سرۆشتێ کوردستانێ ژ رەنگێن گولان و بەر ب ئابستراکتا رەنگا دچیت.

## هۆنەر ئەمین

هۆنەرمەندێ گەنج هۆنەر ئەمین ئێکە ژ وان هۆنەرمەندان یێ شیای د مەیدانا هۆنەری شێوەکاری دا خۆ پێشدا ببەت. هەروەسا سەر بنگەهەکێ تیورا هۆنەری فێری ئەستەتیك، رەخنە و جوانییا تابلوی بوویە. فۆرم تشتەکێ سەرەکەیە و بەر ب مودێرنیزما تابلوی دچیت، گاڤا ئێکێ خۆ دناڤا ئابستراکتێ دا دبیتە. هارمونیا رەنگ و پێکهاتا تابلوی ل سەر

بنگەهەکێ زانستی دارێتیە و شیایە وەك گەنجەك خۆد مەیدانا هۆنەرێ شیوەکاریا پارێزگەها دهۆکێ دا ببینیت. نها ژی بەردەوامە ل سەر خواندنا ئەکادیمی و کارێ هۆنەری.

## دلێر زاهر

ژ نڤشێن پشتی سەرهلدانێ ئێك ژ وان دلێرە، کو شیای بەردەوامیێ بدەتەخەباتا هۆنەری شێوەکاری و پشکداریێ دگەلەك پێشانگەهاندا بکەت. یاری و رووداتێن گەلەری یێن کوردەواری د چارچوڤا تابلۆیێ شێوەکاری دا ل سەر شێوەیێ سوریالیزمەکا ریالیتانە بکاردئینیت. سەر ڤێ خەباتێ بەردەوامە و گەلەك بەرهەمێن هۆنەری ئافراندینە.

## ئەبدولموتەلب

هۆنەرمەند ئەبدولموتەلب، دبەردەوامیا کارێ هۆنەری دا شیایە خۆ بگەهینیتە زانستا تابلۆی و ژ کەڤنەشوپیا کوردستانێ بەر ب ئابستراکتێ بچیت. نەخش و نیگارێن کوردەواری دگەل گول و جوانیا سرۆشتی هێڤێنی تابلۆیێ وی یە. پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری

## دلشاد نایف

سالا ١٩٧٨ێ ل دهۆکێ ژدایکبوویە، پشتی سەرهلدانێ چوویە پەیمانگەها هۆنەرێن جوان، سالا ١٩٩٧- ١٩٩٨ پشکا شێوەکاری داوییێنایە. ئەندامی سەندیکا هۆنەرمەندێن کوردستانێ یە، بەرپرسێ ناڤەندا شیوەکاریە ل سەندیکا دهۆکێ. ئەندامی ئێکەتیا شێوەکارێن کوردستانێ یە، ئەندامێ گرۆپا شەش کەسییە. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپی ل کوردستان ڤەکرینە هۆنەرمەندەکێ خودان شیان دەهێتەناسکرن.

## هاشم شاجی

سالا ١٩٨٢ ژدایك بوویە، دەرچوییێ پەیمانگەها



هۆنەرێن جوانە، د بەردەوامیا خەباتا خۆیا هۆنەری دا گەلەك شێوە د چارچوڤا رەنگێن سرۆشتێ کوردستانێ دا پێکئینایە. دناڤا چیا و ئاڤێن کوردستانێ دا باندۆرا رەنگێن سار ل سەر دیارە، بتایبەتی خۆبەردایە دناڤا گرۆپا رەنگێ شێن دا، ژ ئاسمانێ زەلالێ کوردستانێ کویراتیا ئاڤا شین و دووراتیا ئەو تێدا دژیت ب سومبوولا رەنگێ شێن نیشا مەددەت. بەلەنسەك راگرتی د بەلاڤکرنا رەنگی دا تاپلو داپوشییە. چەند جارا رەنگێن سار خۆ دور رەنگەکێ گەرمێ وەك سوری دورپێچدکەن. لێدانا فرچا ژ هەستێن هۆنەرمەندی دیار دبیت، گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپی ڤەکرینە. مژارێن سەرەکە سرۆشت، مرۆڤ، ئاڤابوون و هەلاتن د ژیانا جڤاکا خۆدا کریە هێڤێنی تابلویێ شێوەکاری. نها ژی بەردەوامە سەر کارێ خۆیێ هۆنەری.

## سەربەست ئەحمەد

سەربەست ئێکە ژ هۆنەرمەندێن سەرکەفتی یێن پشتی سەرهلدانێ رولێ خۆد مەیدانا هۆنەری شێوەکاری دا دیتی. پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ خواندییە و پاشی بەر ب بریتانیا چوویە بۆ خواندنا ناما ماستەرێ. گەلەك شێوەیێن جودا د قۆناغین کارکرنێ دا چێکرینە، ژ پورترێتا، سرۆشت، ریالیتە و نەخش و پێکهاتێن ئەندازەیی د کولتورێ

كوردی دا. هێدی هێدی بەر ب ئەبستراكتێ دچیت. ئەو دخوازیت تایبەتمەندیا خۆ د چارچوڤێ تابلویەكێ شێوەكاری دا نیشا بدەت. دا موهرا خۆ ل رویەلێن هۆنەری شێوەكاری بدەت. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەكرینە.

## سەلاح رێكانی

هۆنەرمەند سەلاح رێكانی دەرچوویی پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا مووسلێ پشكا شانۆیێ یە. د بەردەوامیا خواندنا خۆیا پەیمانگەهێ دا حەزا هەموو رەنگێن هۆنەری هەبوو، لێ پتر خۆبەردا دناڤا هۆنەری شێوەكاری دا. تایبەت پشتی ژ مووسل هاتی دهۆكێ و پشتی سەرهلدانێ بوو ئێك ژ هۆنەرمەندێن شێوەكارێن پارێزگەها دهۆكێ. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەكرینە. مژارێن تابلوێن وی گرێدای رێبازێ سوریالیزمێ یە، خەیالێن خۆ سەربەست دكەت ژ میسولوژیان، باوەرییێن دینی، چیروكێن ئەفسانەی و چەند جاران ریالیتێ بەر ب خەیالان دبەت.

## گەلاڤێژ ئەبدورەحمان

پشتی سەرهلدانێ و ڤەكرنا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆكێ گەلەك هۆنەرمەندێن كچ دناڤا خۆدا هەمبێزكرن. باندۆرا گرۆپان و یا پەیمانگەهێ و ڤەكرنا گەلەری و پێشانگەهان بوو بنگەهەك كو كچا كورد خۆ د ناڤدا ببینیت. گەلاڤێژ ئەبدلروحمان



ژێر باندۆرا هۆنەرمەند ئەبدولرەحمان كەلحوی خۆ د مەیدانا هۆنەری دا دیت. سەر بنگەهەكێ زانستی هێدی هێدی هۆنەر بوو پیشە و ڤیانا هەستێن هۆنەرمەندێ. ژ ریالیتێ و خۆزایە بەر ب ئابستراكتا رەنگا چوو. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەكرینە.

## ئەحلام ئەكرەم

هۆنەرمەند ئەحلام ئێكە ژ دەرچوییێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆكێ. د هەموو ڤەستیڤالێن پەیمانگەهێ دا پشكداری كریە و هەروەسا پشكداری دگەلەك پێشانگەهاندا كریە. دناڤا ڤیگورەكێ ڤەشارتی دا دخوازیت سرۆشتی و مرۆڤت پێكڤەگرێبدەت، ژ بێدەنگیا سرۆشتی گەرماتییا رۆژێ بەرددەتە سەر و تابلو بروح دكەڤیت. وەك هەموو كچێن پارێزگەها دهۆكێ وێ ژی بەردەوامی دایەكارێ هۆنەری.

## هێبا یونس

پشتی سەرهلدانێ و بتایبەتی پشتی ئازادكرنا عێراقێ گەلەك هۆنەرمەند ژ باژێرێن عێراقێ هاتن كوردستان و ئارامی و ئاسایشا كوردستانێ پالپشتێن خۆجهیبا هەموو چینێن جڤاكی بوو. هیبا ئێك بوو ژ هۆنەرمەندێن كچ یێن كو گەلەك جارا ب ناڤێ گرۆپ كاردكر و پێكڤە خەباتا خۆیا هۆنەری بەردەوام دكر. ژ هەستكرنەكا جوان یا لێكدانا رەنگا بەر ب ئابستراكتێ چو. دابەشكرنا رەنگا ل سەر ریتمەكا لێكدای هەڤركییا گرۆپا رەنگێن سار و گەرم نیشا مەدا. گەلەك پێشانگەهێن گرۆپی ڤەكرینە و هێژ بەردەوامە ل سەر كارێ خۆیێ هۆنەری.

## سوزان شوكری

وەك هۆنەرمەندەكا ژن لپارێزگەها دهۆكێ بەردەوامی دایەكارێ خۆیێ هۆنەری. دگەل گرۆپێن لچان گەلەك پێشانگهە ڤەكرینەو بەردەوامەل سەر كارێ خۆ.

## حەنان مەحەمەد

هۆنەرمەند حەنان ئێکە ژ هۆنەرمەندێن کچ یێن پارێزگەها دهۆکێ یا بەردەوامی دایەکارێ هۆنەری شێوەکاری. هەروەسا پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و بەردەوامە ل سەر کارێ هۆنەری.

## چیمەن سەدیق

چیمەن ژی وەکی هەڤالێن خوێن کچ شیایە پشتی سەرهلدانێ خۆ د مەیدانا هۆنەری شێوەکاری دا ببینیت. دەرچوویا پەیمانگەها هۆنەرێن جوانە ل دهۆکێ. پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە. ژ سرۆشتێ کوردستانێ رەنگێن جڤاك و جوانیێ د تابلوێن خۆدا بکاردئینیت. گەلەك جاران سەر شێوەیێ کێرێ کارکریە و شەفافیەتا رەنگا سەر تابلۆی دابەشکریە. هێژ بەردەوامە سەر کارێ خۆیێ هۆنەری.

## شەرمین بەهجەت

شەرمین ئێك بوو ژ خویندکارێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان پشکا شێوەکاری ل دهۆکێ. بەردەوامی دا هۆنەری خۆ و ڤیانا هۆنەری ئەو پالدا کو پەیمانگەهێ داوی بینیت. ژ ئەنجامێ کار و خەباتا وێ یا هۆنەری گەلەك پێشانگەهێن شێوەکاری ل پەیمانگەهێ و پشتی خواندنێ ڤەکرن.

## مهاباد سالح

پشتی سەرهلدانێ و بتایبەتی سالێن داویێ بزاڤا شێوەکاریا کچان ل دهۆکێ بەر ب پێش چوو. ڤێ ئێکێ کچ پالدان کو پێشانگەهێن بگرۆپ ڤەکەن، مهاباد ژی ئێك ژڤان کچایە یا بەردەوامی دایە خەباتا هۆنەری و پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کری و بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری.

## روشا مەحەمەد

هەروەکی هەموو کچێن پارێزگەهێ رشا وەك هۆنەرمەندەکا شێوەکاری یا کچ دهێتەناسکرن. وێ پشکداری د گەلەك پێشانگەهان دا کریە و خودان شیانە د هۆنەری شێوەکاری دا. ژ پیروزیان و کەڤنە شوپیا کوردەواری چافکانیا مژارا تابلویێ وێ یە. دگەل جوانیا رەنگ و پێکهاتا تابلوی.

## حەنان ئەمین زاوی



دەرچوویا پەیمانگەها هۆنەرێن جوانەل دهۆکێ سالا ٢٠٠٨-٢٠٠٩ێ پشکداری د هەموو فەستیڤالێن پەیمانگەهێ دا کریە. هەروەسا پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن هۆنەرمەندێن دهۆکێ دا کریە و بەردەوامە ل سەر کارێ خۆیێ هۆنەری.

## ئالا سالح شنگالی



هۆنەرمەند ئالان
دەرچوویا پەیمانگەها هۆنەرێن جوانەل دهۆکێ سالا ٢٠٠٩-٢٠١٠ پشکداری دهەموو فەستیڤالێن

پەیمانگەهێ دا کریە. هەروەسا پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن هۆنەرمەندێن دهۆکێ دا کریە و بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری.

## فارس تەمەر

هۆنەرمەند فارس خودان تایبەتمەندیەك هۆنەرییە. ل بازێرێ زاخۆ ژ ئەڤینا خابووری و کەڤنە شوپیا ڤێ هەرێمێ رەنگێن گەلەری و جوانیا کوردستانێ کرنە بنگەهێ تابلۆی. نەخشێن کوردەواری شوینپێن دیرۆکێ و جوانیا رەنگێن گەرم تابلوێن فارسی بێ داپوشی، سەر بنگەهەکێ ئەکادیمی ژ سرۆشتێ بێ دەنگ بزاڤا رەنگا بووشاهیا تابلۆی پر کر. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەکرینە و پشکداری دگەلەك چالاکیێن هۆنەری دا کریە و دکەت.

## مەروان شوکری

هۆنەرمەند مەروان شوکری ئێکە ژ هۆنەرمەندێن دەرچوییێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ. د بەردەوامیا کارێ خۆدا گەلەك چالاکیێن هۆنەری پێکئینانە، پشتی دەرچوونا پەیمانگەهێ بەردەوامی دا کارێ هۆنەری. د ناڤبەرا کولاژ و تابلوێن رەنگین دا خۆ دناڤا ئێك رەنگیێ دا دیت. مەتریالێن بالکێش و گەلەك نەهاتین بکارئینان کرنەبنگەهێ تابلوی.

## دیار ئەبدورەحمان

ژ نفشێن پشتی سەرهلدانێ گەلەك هۆنەرمەند دیار بوون و پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا دهۆکێ پالپشت بوو ژ بوو ڤێ بزاڤا شێوەکاری ل پارێزگەها دهۆکێ. دیار وەك گەنجەك شیایە دناڤبەرا جوانیا رەنگێن سرۆشتێ کوردستانێ دا ژێر تیرۆژکێن گەرماتیا رۆژێ، جوانیا دار و خۆزایێ بکەتەتابلویەکێ شێوەکاری. وی پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و دکەت.

## مەکی بەرواری

ژ نفشێن نوو یێن هۆنەرمەندێن پارێزگەها دهۆکێ. مەکی بەرواری ژ وان هۆنەرمەندانە یێن شیای دناڤبەرا هۆنەری گرافیك و بەر ب ئابستراکتێ بچیت. وی ڤیگور بکارنەئینا دخواست ژ پێکهاتەکا ئەندازەیی بووشاهیا تابلوی پر بکەت. بەر ب نوویاتیا هۆنەری. گەلەك پێشانگەهـ ڤەکرینە و بەردەوامە سەر کارێ هۆنەری.

## بەیار مەحەمەد



دپێکهات و بکارئینانا رەنگاندا بەیار شیایە ببیتەخودان ئەزموون و تابلویەکێ نوو بئافرینیت. هەروەسا شارەزایێ مەیدانا رەنگایە وی تابلو ژ رەنگا و بەلەنسا گشتی کریە سەنتەرێ چاڤێ بینەری. ژ تاریاتیێ بەر ب رۆناهیێ و دچەند بەشاندا شێوەیێن دوربێچکری یێن لاکێشە و چوارگوشە بکارئینانە. پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و دکەت.

## ئاراس بالەتەیی

هۆنەرمەند ئاراس دناڤبەرا ڤیگورێ کوردی و خۆزایا کوردستانێ دا تابلوی دئافرینیت. جوانیا رەنگا بزاڤا ژنا کورد گەرماتیا رۆژێ و خەیالێن دبنە ئەفسانە و دیرۆکا کوردستانێ د رێبازێن سوریالیزمێ دا بکار ئینایە. وی

گەلەك گرنگی دایە سرۆشت و جڤاکێ کوردستانێ. گەلەك پێشانگەهێن تایبەت و گرۆپ ڤەکرینە، نهاژی بەردەوامەل سەر کارێ هۆنەری.

هەروەسا گەلەك هۆنەرمەندێن دی یێن گەنج دبەردەوامن ل سەر کارێ خۆیێ هۆنەری بتایبەتی چەند پەیکەرتاش دەرکەتن و بەردەوامی دا هۆنەری پەیکەرتاشیێ. وەك ڤان هۆنەرمەندێن ژێری:

## سیار مەحەمەد

هۆنەرمەند سیار د پشکا شێوەکاریا پەیکەری دا کارێن خۆبەردەوام دکەت. ئێکە ژ هۆنەرمەندێن پەیکەری ب شێوەکێ مودێرنیزم دئافرینیت. دمەتریالێن جودا یێن خومالی دا. پشکداری دگەلەك پێشانگەهێن گرۆپ دا کریە و نهاژی بەردەوامە ل سەر کارێ هۆنەری.

## ئەرشەد خەلەف

هۆنەرمەند ئەرشەد بەر ب هۆنەری پەیکەرتاشیی دچیت و گەلەك بەرهەمێن هۆنەری ئافراندینە. دگەل هەڤالێن خۆیێن هۆنەرمەند پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە. ژ مەتریالێن پێکهاتا پەیکەری ژ خومالیا خاکا کوردستانێ وەرگرتیە و بەردەوامەل سەر کارێ خۆ.

## شیراز ئەزیز

- ئێکە ژ کرۆپا پەیکەرتاشان و گرنگی دایە مەتریالێ خۆمالی، ژ دار و بەر و ئاخێ.
- مرۆڤ و پێکهاتا پەیکەری ل سەر بنکەهێ راوەستیای و هێزێ ئاڤاکریبە.
- پشکداری گەلەك پیشانگەهان بوویە، و یێ بەردەوامە ل سەر کارێ هونەری.

## ڤەمان ئیسماعیل

دیاردا هۆنەری و بەردەوامیا کاری، مرۆڤی پالددەت چەند تشتێن هێشتا ژ دایکنەبووی. لێکدانا دناڤا پەیکەرێن ڤەمان ئیسماعیل دا درەنگڤەدانا باوەریێن کەڤن یێن ڤێ هەرێمێ نیشا ددەت، ژ بازنە، مرۆڤ و شێوەیێن پیرامیدا. هەر تشت ب تەسەوفا خودای ڤەگرێدایە. وی مفا ژ ڤان پێکهاتا وەرگرتیە و پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و بەردەوامە.

## نەسیم سەباح

وەکی هەموو هۆنەرمەندێن گەنج نەسیم شیایە ببیتەخودان تایبەتمەندی د هۆنەری پەیکەرتاشی دا. مژارێن مرۆڤی دناڤا شەڤ و ژێر تاڤەهەیڤی. ژ پێکئینانا مەتریالێن مینا قوماش، ئاخ و دار و بەر بووینەهێڤێنی تابلویێن وی. بەردەوامی دایەکارێ هۆنەری و پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و دکەت.



گەلەك هۆنەرمەندێن دی یێن وەك فازل کێستەیی، ریبەر عمر، محمد، سلام موسی و... هتد بەرهەم و ژیانا وان نەکەتە بەردەستی مە و گەلەك هۆنەرمەندێن گەنج هاتینە مەیدانا هۆنەری شێوەکاری یێن وەك هۆنەر ئەمین و گەلەکێن دی. ئەگەر هندەك ناڤ یان بەرهەمێن وان نەکەتبن بەردەستێ من داخوازا لێبوورینێ ژوان هۆنەرمەندان دخوازم.

## وەلات نەجیب

هۆنەری پەیکەرتاشی دناڤا گەنجێن پارێزگەها دهۆکێ دا بوویە دیاردەکا گەلەك باش، ژ بەرکو مەتریال و پێکهاتا پەیکەری ژ دار، بەر و ئاخا

کوردستانێ دەێتەئافراندن. وەلاتێ مەزوپوتامیا جهێ کەڤنترین دیرۆکا پەیکەر و شارستانیەتێ. وەلات ئێکە ژڤان هۆنەرمەندان یێ بەرێخودایە ڤی جۆرێ هۆنەری و پشکداری دگەلەك پێشانگەهاندا کریە و نهاژی بەردەوامەل سەر کارێ هۆنەری.

## خەیری ئادەم

- ل دهۆکێ ژ دایکبوویە

- سالا ٢٠٠١ێ باوەرنامەیا دبلۆم ل پەیمانگەها هونەرین جوان- دهۆك، و سالا ٢٠٠٨ێ باوەرنامەیا بکالوریۆس ب هونەرێن شێوەکاری ل زانکۆیا سەلاحەددین، و سالا ٢٠١٥ێ باوەرنامەیا ماستەرێ ل زانکۆیا ئەکادیمیا سان فرانسیسکو وەرگرتینە.

- پشکداری پێشانگەهێن تایبەت و کۆم بوویە.

## دلگەش بەرواری

- ل ١٩٨٦/١١/٢٥ێ ژ دایکبوویە.

- سالا ٢٠١٠- ٢٠١١ێ باوەرنامەیا دبلۆم ل پەیمانگەها هونەرین جوان، و سالا ٢٠١٥- ٢٠١٦ێ باوەرنامەیا بکالوریۆس وەرگرتینە.

- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا هونەرمەندێن کوردستانێ- دهۆك، ناڤەندا شێوەکاری.

- پشکداری فیستەفالێن پەیمانگەها هونەرێن جوان، و فیستەفالێن زانکۆیا دهۆك- پشکا شێوەکاری کریە. ژ بلی پشکداریکرن د پیشانگەهێن هەڤپشك دا.

- ل سالا ٢٠٠٧ێ باوەرنامەیا رێزلێنانێ ل پەیمانگەها هونەرێن جوان وەرگرتییە.

- پشکداری چەند خۆلان بوویە.

- نها مامۆستایە ل زانکۆیا دهۆك- بەشێ شێوەکاری، و مامۆستایە ل زانکۆیا جیهان- بەشێ شێوەکاری، و بەرپرسێ گەلەری و نیگارکێشیێ (مرسم حر) یە ل هەمان زانکو.

## ئامینە عەبدولقادر جەلال



- سالا ١٩٩٠ێ ل باژێرێ دهۆکێ ژ دایکبوویە.
- سالا ٢٠١٢ێ پەیمانگەها هونەرێن جوان ب داوی هینایە.
- پتر ژ حەفت پیشانگەهان ڤەکرینە، و پشکداری فیستەفالێن پەیمانگەهێ بوویە.

- تا نها بەردەوامە ل سەر کارێ خۆ یێ هونەری.



# جەمیل محەمەد سەبری



- سالا ١٩٧٧ێ ژ دایكبوویە.
- سالا ١٩٩٨- ١٩٩٩ پەیمانگەها هونەرێن جوان- دهۆك ب داوی هینایە.
- سالا ١٩٩٤ێ بۆ یەكەم جار بەرهەمێن وی دناڤ كۆڤارا «گازی» دا بەلاڤكرینە.
- چوار پیشانگەهێن كاریكاتوری یێن تایبەت ڤەكرینە، و پشكداری د پتر ژ هەژدە یێن هەڤپشك دا كرییە.
- بەرهەمێن كاریكاتوری و مونتیڤ د چەندین رۆژنامە و كۆڤاران دا بەلاڤبووینە.
- سالا ١٩٩٨ێ بوویە ئەندامێ سەندیكا رۆژنامەنڤیسێن كوردستانێ دا، هەر وەسان بوویە ئەندامێ سەندیكا هونەرمەندان ل دهۆكێ.
- ل كەنالێ كوردستان یێ ئەسمانی كاركرییە و بەردەوامە ل سەر كارێ خۆ یێ هونەری و رۆژنامەنڤیسی.

# تانیا مەحموود فەتاح



- سالا ١٩٩٠ێ ژ دایكبوویە.
- سالا ٢٠١٢ێ پەیمانگەها هونەرێن جوان ب داوی هینایە.
- سالا ٢٠١٦- ٢٠١٧ێ كولیژا هونەرێن جوان تەمام كرییە.
- چوار پیشانگەهێن تایبەت ل دهۆك و دەوروبەران ڤەكرییە، و پشكداری د پتر ژ پازدە یێن هەڤپشك دا كرییە.

ژ بلی پشكداری كرن د فیستەفالێن پەیمانگەهێ دا.



# دیرۆکا شانۆیێ ل پارێزگەها دهۆکێ

رفعەت رجەب

شانۆ ل دەڤەرا دهۆکێ ب شێوەیەکێ گشتی پشکەکە ژ شانۆیا کوردی، لێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو شانۆیا عیراقێ کارتێکرنا خۆ ل سەر شانۆیا کوردی و یا دەڤەرا دهۆکێ ب تایبەت هەبوویە، نە خاسمە ل سالێن (١٩٥٠)ێ و هێرڤە، پشتی هاتنا هندەك گرۆپێن شانۆیێ بۆ دەڤەرێ و پێشکێشکرنا هەژمارەکا کارێن شانۆیێ، هەر وەسا ڤەگوهاستنا هندەك دەقێن (عەرەبی) بۆ سەر زمانێ کوردی یان هەر ب زمانێ (عەرەبی) و ب رێکا خویندکار و مامۆستایان هاتینە دەڤەرێ و پێشکێشکرین، مینا شانۆگەریێن (رأس الشليلة - الخمار السود - تأمر بيگ - تاجر البندقية و .... هتد)، هەر وەسا پشتی چوونا خویندکارێن دەڤەرێ بو خواندنێ ل بەشێن هۆنەرێ موزیکێ و شێوەکاری و شانۆیێ ل بەغدا و هەلبەت کارتێکرن زالتر بوو تا نها پەیوەندییەکا د ناڤبەرا شانۆیا عیراقی و شانۆیا کوردی دا هەی.

هەر چەوا بیت شانۆیا کوردی ساخلەتێن خۆ هەنە، وەك ئارمانج و زمان و ناڤەرۆکا بابەتێن شانۆگەریا و رێکێن گەهاندنێ و هزر و بیر و بۆچوون و سەبارەت دیرۆکا دەسپێکرنێ ب دیتنا من گەلەك د نێزیکێ ئێکن.

سەبارەت دیارکرنا دیرۆکا شانۆیێ ل دەڤەرا دهۆکێ، ل دەسپێکێ فەرە دیار بکەین کو بەری پەیدابوونا شانۆیێ ب شێوەیێ نها بەربەلاڤ- ل دەڤەرا دهۆکێ، د کەلتوورێ دەڤەرێ دا هندەك رێو رەسم د هەلکەفت و بیرەوەری و خۆشیاندا ب شێوەی زارڤەکرن دهاتنە گێران. ئەڤ چەندە ژی ب رێکا چیرۆك و نڤیسینا و کەسانێن دانعەمر گەهشتییە مە، کەڤنترین زارڤەکرن کو تا نها ماینە و ل دەف خەلکێ دەڤەرێ د بەلاڤەنە وەك چیرۆك و ناڤەرۆك زارڤەکرنێت:

(کاوەی ئاسنگەر - تەرازی یا بچویکا - ژن خواستن - دز و خودانێ مالێ و گولك - یاریا میری)[1]

کاوەی ئاسنگەر وەك چیرۆك و ناڤەرۆك و کەسانێن ڤێ داستانێ ل دەف هەر کەسەکی ل دەڤەرێ یا بەرنیاس و بەلاڤە و ژ باب و کالا گەهشتی یە مە، ل دەسپێکا وێ رێو رسمێن بیرئینانەڤێ وەك هەلکەفتا سالانە یە و ئەڤ داستانە ب زارڤەکرن ڤە هاتییەکرن و ڤەگێران و گەهشتییە مە، و ب گەلەك رەنگ و جۆرا هاتییە نڤیسین، وەك شێواز و دیالۆك و کەسانێن وێ و تا رۆژا نها ل دەڤەرێ بۆ زارڤەکرنێ یا بەردەوامە و شانۆیێ د هەڤرکییا مللەتێ کورد ب قارەمانییا - کاوەی ئاسنگەر و زولم و زۆرداریا ئەژدەهاکی - زەحاك - بەرچاڤدکەن.

دیسان (تەرازیبا بچویكا ) ئەوا ژ هزرا هزرمەند و زانایێ كورد ( عیسێ دەلا) هاتییە ڤەهاندن و دروستكرن و ل كۆچكا میرێ ئامیدیێ سالا (١١٨٢) ێ مشەختی/ (١٧٦٨)ێ زایینی مینا شانۆگەرییەكێ هاتییە زارڤەكرن كو میرێ ئامێدیێ و عیسێ دەلا دگەل چەندین خزمەتكار و نۆبەدار بووینە ئەكتەرێن ڤێ زارڤەكرنێ و وەزیر و مەزن و ماقویلێن دەڤەرێ و میهڤانێن كۆچكا میری بووینە بینەرێن ڤێ زارڤەكرنێ، هەتا نها ژی ئەڤ زارڤەكرنە ب چیرۆكا خۆ ڤە تێتە گۆتن و ڤەگێران و وەكی شانوگەری دهێتە كرن ژی، كورتییا چیروكێ ژی ب ڤی رەنگی یە:

(كوچكا میرێ ئامێدیێ یا تژی مەزن و ماقویلێن دەڤەرێ بوون- سوحبەت یا خۆش و گەرم بوو- میرێ ئامیدیێ د ئاخڤتنا خۆ دا دیار كر كو چ تشت ل بەر وی ئاسێ نابیت و دشێت هەمی تشتا برێڤە ببەت و راست و دروست بكەت و گۆتە چڤاتێ وە یە یان نە؟. هەمی ئامادەبوویا ب بەلێ بەرسڤدان، ب تنێ عیسێ دەلا نەبیت كو بەرسڤا وی ب ڤی رەنگی بوو:

میرم من باوەری هەیە لێ ب تنێ بچویك نەبن كو كەس نەشێت تەرازیبا وان راست بكەت. هوسا زارڤەكرنێ دەست پێكر ب داخازا عیسێ ژ میری هنارەكێ و پاشی شكاندنا هنارێ و وەكی خۆ لێكرنەڤێ و نەشیانا میری و سەركەفتنا ئاخفتنا عیسێ دەلا، دەمێ میر دبێژیت - هلۆڤە عیسێ تە بر راستە كەس نەشێت تەرازیبا بچویكا راست بكەت[٢]، هوسا میرێ ئامیدیێ و عیسێ و ئامادەبوویا شەڤێن خۆ ب سوحبەت و سەرهاتییا دبووراندن و عیسێ دەلا زارڤەكرنێن خۆ ل كۆچكێ دگێران و ژوانا:

(ژن خواستن - دز و خودانێ مالێ و گۆلك)

كو ئەوان ژی چیرۆك و ناڤەرۆكێن خۆ یێن ب بها هەنە. سەبارەت زارڤەكرنا - یاریا میری - ئەوا كو تێتە هەژمارتن ژ كارێن تایبەت یێن گرێدای ب رێ و رسمێن دەهوات و شاهیاناڤە و ناڤدارترین یاری و زارڤەكرنە ل دەڤەرا دهۆكێ كو هەتا سالێن (١٩٨٠) ێ ژی ب شێوەیەكێ بەرفرەهـ و بەردەوام ل گوند یێن دەڤەرێ دهاتە كرن و گێران - لێ هێدی هێدی بەرەڤ نەمانێ ڤە چوو و هاتە ژبیركرن و چیرۆكا ڤێ یاریێ ب شێوەیەكێ (هێمایی) هاتییە بۆ رەنگەكێ حوكمێ نە راست و زولم و زۆرداریێ ل سەر خەلكەكی ب شێوەی یاریێ و هەر شەڤ- ل مالەكێ یان ل جهەكی ل گوندی د هاتە گێران و كورتییا ڤێ زارڤەكرنێ ب ڤی شێوەی بوو:

پشتی دەست نیشانكرن جهی (مالێ) بو یاریێ... (دا كەسانەك ژ لایێ گوندییانڤە، یان وان كەسێن داخوازكری بۆ دەهواتێ هێتە دەست نیشانكرن ب مەرج كو كەسانەكێ شەهرەزا و پەهلەوان و ب دەڤ- و ئەزمان با كو ب رولێ (میری- حاكمیێ) رابیا- و هەر وەسا دا دو وەزیران ژی بۆ دەست نیشان كەن وەك هاریكار و هندەك نۆبەردار و بەردەستك و خولام ژی بو كاری و سێ كەسەكا ژی بۆ كارێ (رەشە- جەردە) كو كارێ وان ب بریارا میری ئینانا هەر كەسەكی یە بۆ دادگەهكرنێ و پشتی ب داوئینانا دانانا گرۆپێ كاری دا هندەك پێدڤی و كەل و پەلێن كاری ژی ئامادەكەن وەك (وەریس بۆ هەلاویستنا گونەهبارا- گۆپال بۆ میری - فەلەقە - جل و بەرگ - عەبا - دار - یان تڤەنگ) و وەك تەماشەڤان دا هەژمارەكا زەلاما ل كۆچكێ روینە خارێ - و هندەك جارا ژی حاكمی نە د هێلا كەس ل كوچكێ بانە - و یاری ب كۆمبوونا گرۆپی ب ڤی رەنگی دەست پێ دكر:

میر دا فەرمانا گرتنا كەسانەكی دەرئێخیت و رەشەكێن خو ب ئامادەكرنا وی كەسی ئاگەهدار كەت، رەشەك دا ل ناڤ گوندی گەرێن و وی كەسی ب خورتی كێشنە دادگەهێ ومیر و وەزیر دا گونەهەكێ بۆ وی كەسی دروست كەن و ب وێ گونەهێ دا دادگەه كەن و پشتی گەف - و قوتان و شەر و گەنگەشێ و ئینانا شاهدا دا ئەو كەس هێتە جزاكرن ب (چەند هێكا یان مریشكەكێ - یان دیكلەكی - یان هندەك متابێن خوارنێ وەك - گویز - مێویژ - باهیڤ - و ئەگەر حالێ وی كەسی یێ خۆش با دا ب كاڤرەكی یا ن ب بزنەكی هێتە جزاكرن) و هوسا ئەڤ یارییە هەر د وێ شەڤێ دا

چەند جارەکا دا دوبارە بیتە ڤە، تا ڤویتەکێ باش ژ تشتێن خوارنێ کۆم کربانە و پاشی دا هەمی زەلام و دەهواتی ئامادەبن ژ بۆ خوارنا وان تشتان کو د گۆتنێ (پاشیڤ)[٣].

ئەگەر ئەم بچاڤەکێ هویر بەرێ خو بدەینە ڤان هەر سێ یاریا دێ بینین کو ناڤەرۆکێن وان ل سەر شەنگستەیەکێ دو لا یانە هاتیبە دروستکرن و دانان، یان کو دوبەرەکی - هەڤدژی - و دان و ستاندن - گەنگەشە - ول داویێ ئەنجام.

ب راستی ئەڤە ژ ساخلەتێن کارێن رێك و پێك یێن زارڤەکرنێ نە، دڤێت ژ بیر نەکەین کو گۆرەپانا سیاسی گرێدانەکا موکم یا ب دەپێ شانۆیێ ڤە هەی. ب ڤێ ئێکێ و دگەل هەمی ئاستەنگا، شانۆیێ ل دەڤەرێ رێکا خۆ یا راست و دروست و ب شێوەیەکێ رێك و پێك بڕیبە و ل چەندین قۆناغێن سەخت و دژوار ژ ئەگەرێن کارتێکرنێن سیاسی و رەوشا دەڤەرێ و نە ئارامیێ و هەبوونا شەر و سەرهەلدان و شورشێن کوردی و هێرشێن سەربازی یێن حکۆمەتا عیراقێ بۆ سەر دەڤەرێ دەرباز بوویە .

لەو ما ژی دێ بینین کو هەر قۆناغەکێ رەوش و بزاڤا خۆ یا تایبەت هەبوو یە، کو گرێدای سەر و بەرێ دەڤەرێ یێ سیاسی و کۆمەلایەتی و رەوشەنبیری و.........هتد ڤە بوویە.

ژ بۆ دیارکرنا رەوش و بزاڤا شانۆیێ ل دەڤەرا دهۆکێ و ل دووڤ بەلگەنامەیێن باوەر پێکری، دێ ل خوارێ ب کورتی ل سەر وان قۆناغێن شانۆیا دەڤەرێ کو تێرا دەرباز بووین و تا نها بەردەوامی پێ دهێتە دان دیارکەین:

## قۆناغا سالێن (١٩٣٠ تا ١٩٤٠ )ێ:

ل دووڤ بەلگەنامێن باوەر پێکرێێن کو ل بەر دەست، دیار دبیت کو دیرۆکا شانۆیێ ل دەڤەرا بەهدینان دزڤریتە ڤە سالێن (١٩٣٠)ێ، کو ئێکەم شانۆگەری بناڤێ (کاوەی ئاسنگەر) ل باژێرێ ئامیدیێ و ل (کۆرا سێریجێ) ل ئێڤارا رۆژا (١٩٣٠/٣/٢١)ێ، ب بەشداربوونا (ئەنوەر شێخ محەمدێ تاهرێ مائی و ئەحمەد عەلی ئامێدی و رەشید ئامێدی و د گەل هەژمارەکا فەقییان) هاتەپێشکێشکرن[٤]، هەر وەسا ل باژێرێ ئاکرێ ژی و ل (کەلا ئاکرێ) ل رۆژا (٢١)ێ نەوروزێ شانۆگەریا (کاوەی ئاسنگەر) ب بەشداربوونا (خەمو و دەروێش خەمو و حەجی عەزو و مەحمیدێ گورەڤای و صالحێ چوستەی و هورمزێ فەلە) هاتەپێشکێشکرن[٥] و پشتی ڤێ شانۆگەریێ و بۆ ماوەیەکێ کورت و ژ ئەگەرێن نە ئارامی ل باژێرێ ئاکرێ هەڤالێن (دەروێش خەموی) دەست ژ کاری بەردا و ب تنێ ل ئاهەنگێن تایبەت ئامادەدبوون و شانۆگەریێن کورت و سڤك پێشکێشدکرن مینا - شانۆگەریێن (خازگینی- رەزێ تری- میرێ ئاکرێ) کو ل پشتی سالا (١٩٣٥)ێ ژ لایێ وان هەڤالانڤە هاتینە پێشکێشکرن. ل باژێرکێ بامەرنێ سالا (١٩٣٤)ێ و ل (خواندنگەها بامەرنێ) و ب هەلکەفتا بیرەوەریێن نەوروزێ تەمسیلیا (قاسم تەمبۆری) ب بەشداریا (حەیدەر یوسف - ئەحمەد عومەر- توفیق ئەمین- دگەل کۆمەکا خویندکاران هاتە پێشکێشکرن)[٦]، دیسان سالا (١٩٣٥)ێ، هەر ل باژێرکێ بامەرنێ و ب بەشداربوونا ئەڤان مامۆستایان (مەلا صالح مەلا عارف - محەمەد عەلی ئەفەندی - ئەحمەد عومەر )، تەمسیلیا (تەرازیا بچویکا) ل سەر دەستێ مامۆستایێن خواندنگەها بامەرنێ یا سەرەتایی هاتیبە پێشکێشکرن[٧].

سالا (١٩٣٨)ێ و ل باژێرێ ئامێدیێ و ب بەشداریا (ئەحمەد عەلی ئامێدی) و هەژمارەکا خەلکێ ئامێدیێ شانۆگەرییەك ل مالا (عەلی شەعبان ئاغای) هاتە پێشکێشکرن[٨]، هەر وەسا شانۆگەرییەکا دی هەر د وێ سالێ دا ب ناڤێ (الملك و أقرباؤە) ژی ب زمانێ (عەرەبی) ژ لایێ (حەجی مەکی ئەفەندی) د گەل هەژمارەکا خویندکارێن باژێرێ ئامێدیێ هاتە پێشکێشکرن[٩] و سالا (١٩٣٩)ێ شانۆگەریا (قەهرەمان) کو ژ نڤیسین و زارڤەکرنا (مەحمەد ئەمین ئوسمان) و دەرهێنان و زارڤەکرنا (شەوکەت عەبدولسەمەد) ل باژێرێ دهۆکێ هاتە پێشکێشکرن[١٠] و ب دیتنا

من ئەڤ دەسپێكە نابیتە مێژوویا دەسپێكا شانۆیێ ل دەڤەرێ، بەلكو بەری ڤێ مێژوویێ ب چەند سالەكا ژی و پشتی دانانا حكۆمەتا عیراقێ و دامەزراندنا خواندنگەهان سالا (١٩٢٢)ێ ل باژێرێن (دهۆك- ئاكرێ- ئامێدیێ- زاخۆ)، شانۆگەری هاتینە پێشكێشكرن، نەخاسمە ئەو شانوگەری و زارڤەكرنێن ل گۆرەپان و ژوورێن خواندنگەهاڤە كو ژ لایێ خویندكاران ڤە دهاتنە پێشكێشكرن و بابەتێن وان هەر ژ بابەتێن پەرتووكێن خواندنێ بوون، وەك چیروكێن زارڤەكرنێ. سەبارەت بابەت و ناڤەرۆكێن شانۆگەریێن دی، هەر ژ چیرۆكێن كۆمەلایەتی و كەلتووری و سەرهاتییان بووینە، هەلبەت ل ڤێرێ دیار دبیت كو دەق و ناڤەرۆك د خۆمالی بووینە و كەل و پەل و پێدڤیێن شانوگەریا ژی هاتینە بكار ئینان وەك: (جل و بەرگ و ئێكسسوار و میكیاژ)، مینا ب كارئینانا (جل و بەرگێن پاشایا و خۆ خەملاندن ب كەڤل و عەبایا و پێن بێ سەر و بەر و هەلگرتنا شیر و تیر و رم و مەتال و خەنجەرا و گوهورین و رەنگكرنا سەر و چاڤا ب تەنیێ و ئاخا سۆر و سپی و تەقنێ)، هەژییە بێژین كو دڤێ قۆناغێ دا بینەر ب رەنگەكێ بەرچاڤ و بەردەوام یێ ئامادەبوو و هەر ئەڤ- چەندە ژی ببوو ئەگەرێ ڤێ بەردەوامیبوونا شانۆیا دەڤەرێ.

لێ دڤێت ژ بیر نەكەین كو ئەگەرێن چڤاكی و ئایینی بووینە ئاستەنگ د رێكا پێشڤەچوونا شانۆیێ ل دەڤەرێ دا نەخاسمە كو تویژەكا خەلكێ دەڤەرێ ب چاڤەكێ كێم بەرێ خود ددانە ڤان جۆرە كاران و ئەوكەسانێن د ڤی بیاڤی دا كاردكرن، ئەڤە ژی د زڤریتەڤە ئاستێ لاوازێ رەوشەنبیریێ ل وی دەمی. هەروەسان سەروبەرێ سیاسیێ وی سەردەمی هەر ژ سەرهلدانا بارزان یا ١٩٣١- ١٩٣٢ و هێرشێن سوپایێ عیراقێ بۆ سەر دەڤەرێ و روودانا شەرێ جیهانییێ دووێ كو كەفتە د ڤێ قۆناغێ دا، كارتێكرنێن خۆ هەبوون، د ئەنجامدا لاوازی كەفتە د بزاڤا شانۆیێ دا، ب تایبەت ل باژێرێن ئاكرێ و زاخۆ.

سەبارەت جهێن پێشكێشكرنا كارێن شانۆیێ ژی، هەر ل جهێن تایبەت یێن سەیران و خرڤەبوون و گۆرەپان و ئاڤاهیێن خواندنگەها ڤە بوون، كو باشترین جهێن كار و نیشاندانا شانۆگەریان بوون - و دڤێ قۆناغێ دا چ تیپ و گرۆپێن شانۆیێ یێن ب ناڤ- و نیشان و تایبەت و فەرمی نە بوون، هەر وەسا كەسانێن بسپۆر ژی دوارێ شانۆیێ دا نە بوون، ب تنێ ئەوێن كاردكرن خودان ئارەزوو و حەزژێكەرێن ڤی رەنگێ هۆنەری بوون.

## قۆناغا سالێن (١٩٤٠ تا ١٩٥٠)ێ:

هەر ل دەسپێكا ڤێ قۆناغێ، سەروبەرێ سیاسی یێ دەڤەرێ و ژ بەر شۆرشا رەشید عالی گیلانی یێ ئالوز بوو، و كارتێكرن ل سەر دەڤەرێ هەبوون و هەر ئەڤە بۆ ئەگەرێ لاوازی و كێم كارێن شانۆیێ ل سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێ، لێ د ڤێ قۆناغێ دا شانۆ ل دەور و بەرێن دهۆكێ مینا (ئاكرێ- ئامێدیێ- زاخۆ) پتر یا ب بزاڤ بوو و شانۆ بۆ رێبازەكا دی یا بەلاڤەكرنێ و هزر و بیرێن كۆم و گرۆپان سەر دەستێ مامۆستا و رەوشەنبیران هاتە پێش و بەردەوامی پێ هاتە دان وەك تەمام كەر بۆ قۆناغا چوویی. سالا (١٩٤٠)ێ ل باژێرێ ئاكرێ شانۆگەریا (كاوە) ل سەرێ گرێ ب هەلكەفتا جەژنا نەوروزێ هاتە پێشكێشكرن و هەر وەسا ل هاڤینا سالا (١٩٤١)ێ ژی شانۆگەریا (صوریكە) ل بەر دەرگەهێ قشلێ هاتە پێشكێش كرن[11].

سالا (١٩٤١)ێ شانۆگەریا (خازگینی) ل ریبارێ ئامێدیێ و ل باژێرێ ئامێدیێ هاتە پێشكێشكرن، سالا (١٩٤٣)ێ ل كۆرا سێریچێ شانۆگەریا (چەكوچێ كاوەی) هاتە پێشكێشكرن و سالا (١٩٤٥)ێ شانۆگەریا (عیسێ دەلا و میرێ ئامێدیێ) ل بەرێ سیلێ هاتە پێشكێشكرن.

دیسان ل باژێرێ ئاكرێ و سالا (١٩٤٥)ێ، پشتی دانانا سەندیكا پالا ل باژێرێ ئاكرێ و ب سەرپەرشتیا هێژا (مونیر مەحەمەد شەریف) شانۆگەریا (ئازادیا پالا) هاتە پێشكێشكرن، سالا (١٩٤٦)ێ، ب بەشداریا هێژایان (دەروێش خەمو و رەمەزان عەلی و مەحمەد شەریف ئاكرەیی و

ئەکرەم رەشید) شانۆگەریا (خەلا و دزیکەر) هاتە پێشکێشکرن[12]. سەبارەت دەسپێکا شانۆیێ ل بازێرێ زاخۆ پێزانین گەلەك د کێمن، لێ دهێتە زانین کو ل دەسپێکێن سالێن (١٩٤٠)ان و هێرڤە شانۆ ل بازێرێ زاخۆ هەبوویە و هەژمارەکا شانۆگەریان ل (چایخانا فەرمانێ چایچی) هاتینە پێشکێشکرن، مینا شانۆگەریێن (خازگینی- ئەڤینی- قەلسی- نەزانین- فێلبازی- دزیکەر- دادگـــەهـــ)[13] کو د کۆمیدی و چڤاکی بووینە، بەشدارێن وان هەر خەلکێ زاخۆ بووینە، لێ ئێکەم شانۆگەری ب بینەر و جهـ و ب رێك و پێکی ڤە سالا (١٩٤٦)ێ د حەوشا قەسرا (حازم بەگی) ڤە، ل بازێرێ زاخۆ هاتییە پێشکێشکرن[14]. دڤێت ژ بیر نەکەین کو ل دێرێن بازێرێ زاخۆ، ب تایبەت دهەلکەفت و بیرەوەریێن (جەژنێن سەرێ سالێ و قیامەتێ و خاچێ و شانە دێرا) دا و ب سەر پەرشتییا مامۆستایێن ئایینی و خویندکارێن دێرێ ڤە ژی شانۆگەریێن گرێدای ئایینی ڤە ب زمانێ سریانی هاتینە پێشکێش کرن. سالا (١٩٤٩)ێ ژی ئاهەنگەك ل بەر دەرگەهێ قشلێ ل بازێرێ زاخۆ هاتە گێران و شانوگەرییەك بناڤێ (هەژارێ نەزان) هاتە پێشکێشکرن[15].

د نیڤا دووێ دا ل ڤێ قۆناغێ، هەژمارەکا شانۆگەریێن هەژی وب شێوەیەکێ رێك و پێك هاتنە نیشاندان، مینا شانۆگەریا (رازیبوونا خەلکی کەس ناگەهیتێ)، ل مەها نیسانا سالا (١٩٤٧)ێ ل بازێرکێ بامەرنێ، کو ژ نڤیسین و دەرهێنانا (عەبدولرەزاق ئەلنەقشەبەندی) بوو و ب بەشداریا ( ئەحمد جمعە شاهین و عەبدولقادر محەمەد ئەمین - محەمەد حەسەن شانە - حەمدی ئیبراهیم خالد). ل سالا (١٩٤٨)ێ دو شانۆگەری ل بامەرنێ ب ناڤێن (دەهواتا ئیبراهیم سەلمان)، (دادگەه) ل (شیڤا هرچا)، (سەرو کانیا بامەرنێ) هاتنە پێشکێشکرن، یا ئێکێ ژ نڤیسین و دەرهێنانا کۆما کاری و ب بەشداربوونا (ئەحمەد جمعە شاهین- عەبدولقادر مەحەمەد ئەمین - قاسم حەفزوللا- مستەفا عوسمان) بوو یا دووێ ژ نڤیسین و دەرهێنانا کۆما کاری و ب بەشداربوونا ( ئەحمەد جمعە شاهین- شێخ خالد فەزلەدین- عەلی حەجی نەجیب- حەمویێ عەبدولجەلیلی)[16].

سالا (١٩٤٨)ێ، بۆ جارا ئێکێ ل بازێرێ دهۆکێ (تیپا شانۆیا خانەیا مامۆستایان یا گوندا) ل سەر دەستێ مامۆستایان (جەودەت تەیمور و عیزەدین عەلی جەراح ) هاتە دامەزراندن. هەلبەت ئەڤ تیپە نە یا فەرمی بوو، لێ شیبیا هژمارەکا کارێن شانوویی پێشکێشبکەت، ب شانۆگەریا (سەرتراشخانا جابی) دەستپێکر، کو ژ نڤیسین و دەرهێنانا (عیزەدین عەلی ئەلجەراح) بوو. ل پاییزا سالا (١٩٤٩)ێ ل ئاهەنگا دەسپێکا سەرێ سالا خواندنا (١٩٤٩ - ١٩٥٠)ێ هاتە پێشکێشکرن، ئەڤ شانوگەرییە ژ زارڤەکرنا (عیزەدین عەلی ئەلجەراح- مهدی مروان- جەودەت تیمور- دارا رەئوف قەزاز- رەزا مستەفا) بوو[17].

دەڤێن شانۆگەریا دڤێ قۆناغێ دا خۆمالیبوون و پتریا وان ب زمانێ کوردی بوون، لێ یێن ل بازێرێ دهۆکێ هاتینە پێشکێشکرن ب زمانێ عەرەبی (فصحی و عامی) بوون و ژ بۆ دیتنا شانۆگەریا بینەرەکێ باش ژ خویندکار و خەلکێ بازێری ئامادەدبوون و چ پالپشتی و هاریکاری ژ چ لایەن و جهانڤە نە بوو، ب تنێ ئەو هاریکاری نەبیت کو خەلکی و کارگێریا خواندنگەهـا پێشکێشدکرن و یا دی هەمی ل سەر ملێن مامۆستا و خویندکار و خەلکی بوو. سەبارەت بسپۆریا ڤی رەنگێ هۆنەری ل دەڤ کەسێ نە بوویە، ب تنێ هەمی ئەو کەسێن ئەو کار دکرن، خودان ئارەزوو و حەزژێکەرێن زارڤەکرنێ و شانۆیێ بووینە. سەبارەت رۆلێ ئافرەتێ د ڤان هەردو قۆناغێن ناڤبری دا ناڤێن چ ئافرەتان بەرچاڤ نەکەتینە کو دڤی بواری دا کار کرین و وەسان دیارە کو هەر زەلام یان کوڕ یێ ب رۆلێ ئافرەتێ رابووی.

ل دووماهیێکێ مرۆڤ دشێت بێژیت کو شانۆ دڤێ قۆناغێ دا ب شێوەیەکێ گشتی ل دەڤەرێ د سەر هەمی ئەگەر و ئاستەنگارا بەرەڤ پێشڤەچوویە و پێنگاڤێن باش هەڤبەرکرن د گەل قۆناغا بووری دا هاتینە هاڤێتن.

## قۆناغا سالێن (١٩٥٠ تا ١٩٦٠)ێ:

د ڤێ قوناغێ دا ل بازێرێ دهۆکێ کۆمێن تایبەت هاتنە دناڤ کارێ شانۆیێ دا. هەروەسان خواندنگەهـ و تیپا شانۆیا خانەیا مامۆستایان ل دهۆکێ ژی بەردەوامی دانە کارێن خۆ و هژمارەکا کاران پێشکێشکرن، مینا شانۆگەرێێن:

(حاکمێ داد پەروەر) سالا (١٩٥٠)ێ، (دختورێ رەوشت باش) ل سالا (١٩٥٠)ێ، (مامۆستایێ گوندا) سالا (١٩٥١)ێ، (المعلم گندوز) سالا (١٩٥٢)ێ و (گولی خوینا وی) سالا (١٩٥٣)ێ. ئەڤ شانۆگەرییە ژ نڤیسینا (عزەلدین عەلی ئەلجەراح و توفیق ئەلحەکیم و هۆزانڤانێ کورد (گوران)ی بوون و ژ دەرهێنانا (عزەلدین عەلی ئەلجەراح و شاذل طاقة دارا رەئووف) بوون و ب زمانێن (کوردی و عەرەبی) هاتبوونە پێشکێشکرن[18]. سالا (١٩٥٣)ێ، تیپا شانۆیا (دوا ناڤنجییا دهـۆك) هاتە دامەزراندن و هژمارەکا باش ژ شانۆگەریا ژ لایێ وانڤە هاتنە پێشکێشکرن، مینا شانۆگەرێێن:

(عنتر و عەبلە) سالا (١٩٥٢)ێ ژ نڤیسین و دەرهێنانا - سالم ئەلدەباغ، (المدمن) سالا (١٩٥٣)ێ، ژ ئامادەکرن و دەرهێنانا- کەمال ملکی کەماله، (تاجر البندقیة) ل سالا (١٩٥٤)ێ ژ ئامادەکرن و دەرهێنانا- عەبدولواحد لوئلوئی، (رأس الشليلة) سالا (١٩٥٤) ێ ژ ئامادەکرن و دەرهێنانا کمال ملکی کماله، (تأمر بێگ) ل سالا (١٩٥٤)ێ ژ نڤیسینا- یوسف ئەلعانی و دەرهێنا نا - کەمال ملکی کەماله، (الخمار الاسود) ل سالا (١٩٥٥)ێ ژ ئامادەکرن و دەرهێنانا - کەمال ملکی کەماله، (الضعف بعد القوة) سالا (١٩٥٥) ێ ژ نڤیسین و دەرهێنانا - ئیبراهیم دهۆکی[19]، (دەنگ و باس) سالا (١٩٥٦) ێ و (مامۆستا) سالا (١٩٥٦) ێ ژنڤیسین و دەرهێنانا- عثمان رەشید ئامێدی و ئەڤ شانۆگەرییە ب زمانێ (کوردی و عەرەبی) بوون[20]. دڤێت ژبیر نەکەین کو ڤان کارا رولێ خۆ ل هەلکەفت و بیرەوەریا دا هەبوو و ببوونە جهێ سەرنج راکێشانا خەلکێ دهۆکێ و دەق و ناڤەرۆکێن شانۆگەریا ژ خۆمالیێ دەردکەفتن، هەر وەسا چیرۆك و بابەتێن جیهانی و نڤیسەرێن بیانی ژی جهێ خۆ دناڤ ڤان کاراندا ددیت. و بینەرەکێ زۆر ل دهۆك و سێمێل و زاخۆ. بۆ دیتنا ڤان شانۆگەرییا ئامادە دبوون. و پالپشتی و هاریکاری ژ لایێ کارگێرییا خانەیا مامۆستایان و دووا ناڤنجییا دهۆك ڤە دهاتنە کرن، لێ دیسان ئافرەتێ چ رول د شانۆیێ دا نە ددیت و خویندکارێن کور رازی دبوون وێ ڤالاتیێ پر بکەن و ب رولێ ئافرەتێ رابن، ژ وانا د گەل رێزگرتن هێژا (مەحەمد سالح عەلی مبارك ) بوو[21].

دڤێ قۆناغێ دا ل بازێرێ ئامێدیێ ژی بزاڤەکا خورت کەفتە شانۆیێ، ب تایبەت ل بیرەوەرێێن نەوروزێ و ل ئاهەنگێن سەر سالێن خواندنێ و بێهنڤەدانێن نیڤا سالێ و ل هەلکەفتێن تایبەت و سەیرانێن رویباری و چەژن و دەهواتان. ل خواندنگەهێن ئامێدیێ و بامەرنێ هەژمارەکا باش ژ کارێن شانۆیێ هاتنە پێشکێشکرن مینا شانۆگەرێێن: (شەرێ گەلێ مزیرکا) ل نەوروزا سالا (١٩٥٢)ێ، (خویندەڤان) سالا (١٩٥٤)ێ ل هۆلا خواندنگەها قوباد و (ئاگرێ نەوروزێ) سالا (١٩٥٥)ێ ل کۆرا سێریچێ و (سەیرانا میرێ ئامێدیێ) سالا (١٩٥٨)ێ ل بەرێ سیلێ و (شویکرنا ب خورتی) سالا (١٩٥٩)ێ ل گۆرەپانا خواندنگەها قباد. وب پشکداریا (تەحسین تاها - حەجی ناصر - نسرەت مەحەمەد - حسێن مستەفا) و هەژمارەکا خویندکار و خەلکێ ئامێدیێ[22]، پشتی کو ل مەها شەشێ سالا (١٩٥٠) ێ هێژا (شاکر فەتاح)ی پۆستێ قائمەقامییا بازێرێ ئاکرێ وەرگرتی و سەیرانگەهێن (سیپە- کانی زەرکێ- سەرێ گری- بەهەشتا زارۆکان- یانا فەرمانبەران) هاتینە دامەزراندن، هەر وەسا دروستکرنا شانۆیەکا هەژی ل یانا فەرمانبەران و ل سالێن پێنجییاندا بزاڤەکا خورت و هەژی و ب رێك و پێك یا رەوشەنبیری و هونەری ل بازێرێ ئاکرێ سەرهەلدا[23] و ل گێرانا ئاهەنگا ب هەلکەفت و بیرەوەرییا هەژمارەکا شانۆگەرییان ژ لایێ خویندکار و لاوێن ئاکرێ ڤە ب سەرپەرشتییا (یاسین خەلیل، دەرویش رەجەب حەمو، تارق کامل ئاکرەی، دەرویش خەموی) هاتنە پێشکێشکرن[24]،

ئەڤ بزاڤە بۆ دەمێ پێنج سالان و ب شێوەیەکێ بەردەوام و بەرچاڤ ڤەکێشا، و ئەو جهێن شانۆگەری ل ڤان جهان: (یانا فەرمانبەران- بەردەرگەهێ قشلێ- خواندنگەها ئاکرێ یا ئێکێ و ئامادەیێ و ئاکرێ یا دووێ) دهاتنەپێشکێشکرن، هەروەسان ئاهەنگ و بیرەوەری ژی لێ دهاتنە گێران و شانۆگەریا ژی بەهرەکا باش تێدا هەبوو، مینا شانۆگەرییێن: مەلا نصرالدین سالا (١٩٥٢)ێ، مەم و زین، سالا (١٩٥٤)ێ، قوتابیێ زیرەك، سالا (١٩٥٤)، هاریکاری، سالا (١٩٥٦)ێ[٢٥]. ئەڤ ماوەیێ کورتێ بزاڤا شانۆیێ ل ئاکرێ ل جەم هۆنەرمەند و رەوشەنبیرێن دەڤەرا ئاکرێ ب قۆناغەکا زێرین هاتیبە ل قەلەمدان، هەر وەسا ل تیرمەها سالا (١٩٥٨)ێ، ب هەلکەفتا شۆرشا (١٤) ێ تیرمەهێ شانۆگەریا (بمریت برس و ترس) ل بەردەرگەهێ قشلێ و ب سەرپەرشتیا (زەکی ێکامل) هاتە پێشکێشکرن[٢٦]، ئەڤە ژبلی ئەو شانۆگەرییێن ژ لایێ خویندکار و مامۆستایێن هەردو خواندنگەهێن ئاکرێ یا ئێکێ و ئاکرێ یا دووێ ڤە هاتینە پێشکێشکرن.

ل باژێرێ زاخۆ ژی و ب تایبەت ل خواندنگەها و ب هاریکاری و پشتەڤانیا مامۆستایا هەر بەردەوامی ب شانۆیێ هاتە دان. ل بهارا سالا (١٩٥٤)ێ، ل گێرانا ڤیستەڤالا وەرزەشی ل گۆرەپانێ و ب پشکداریا (نافع سموعی- سالم حسێن- عەبدلئەحەد- عەلی حەسەن- ئەحمەد مەحەمەد ئیسماعیل- غازی قادر )[٢٧] زارڤەکرنەك هاتە پێشکێشکرن. و سالانە ئەڤ رەنگ و جۆرە کارێن شانویی د هاتنە گێران. ل بهارا سالا (١٩٥٨)ێ ژی و ب هەلکەفتا بیرەوەرییێن نەوروزێ شانۆگەریا (کاوەی ئاسنگەر) ل ڤاما دی یا (پرا دەلال) ژ لایێ کۆمەکا گەنجێن باژێرێ زاخۆ ڤە و ژ وانا (حەمید مەحەمەد- شەمس لدین- عەڤدی سلێمان- عەبدلقادر خەلیل سەعید) هاتە پێشکێشکرن[٢٨]. ب شێوەکێ گشتی شانۆ ل دەڤەرێ دڤێ قۆناغێ دا ژ لایێ کارکرنێ ڤە گەشە کر، و دیارە رەواجەکا باش ب خۆڤە گرت لەوما ژی وەکی ژ ناڤان دیار، کو هندەك کەسێن دی هاتنە دمەیدانا شانۆیێ دا، و چیرۆك و ناڤەرۆکێن شانۆگەریا و شێوازێ کارکرنێ ژی د ئاستەکێ باشتر دا بوویە ژ قۆناغێن بێشتر، لێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو خالێن لاوازی و سستی ژی ب خۆڤە گرتینە، مینا کێم بەرهەمان و نەبوونا ئافرەتێ و بسپۆریا هۆنەرێ شانۆیێ و تیپ و گرۆپێن دەستویردای و فەرمی.

## قۆناغا سالێن (١٩٦٠ تا ١٩٧٠)ێ:

د ڤێ قۆناغێ دا و ژ ئەگەرێ ئالۆزیا سەر و بەرێ سیاسیێ عیراقێ و دەسپێکرنا شۆرشا کوردی و دەستدرێژیێن حکۆمەتێ ل سەر دەڤەرێ، شانۆ ل باژێرێ دهۆکێ وەك پێدڤی بەردەوامی پێ نەهاتەدان. ب ڤێ ئێکێ گشت کار و چالاکیێن شانۆیێ یێن قوتابیان ل بەر چاڤێن رژێمێ بوون، و دووڤ چوونەکا مەزن ل دووڤ ڤان قوتابیان و رێکخستێن وان هەبوون، ب تایبەت رێکخستێن پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبا شیوعی ل دهۆکێ و دەور و بەرا، تا وێ رادێ کو هەژمارەکا قوتابیێن د کارێ شانۆیێ دا کاردکرن هاتنە گرتن، و هندەك ژ خواندنێ و ژ کارێ فەرمانبەریێ ژی ژ دهۆکێ هاتنە دویر ئێخستن.

ب شێوەیەکێ گشتی شانۆ ل باژێرێ دهۆکێ دڤێ قۆناغێ دا یا سست و لاواز و شەپرزەبوو، ب دووڤ چوونا ڤی بابەتی بۆ مرۆڤی دیار دبیت کو کێم کار هاتینە پێشکێشکرن، لێ دگەل ڤێ هەمیێ و ب سەر پەرشتیا مامۆستایان و پشکداریا خویندکار و هۆنەرمەندێن مللی و خۆدان شیان و (تیپا شانویا دووا ناوەندیا دهۆکی) هندە شانۆ د هەلکەفت و بیرەوەریان دا ل خواندنگەها هاتینە پێشکێشکرن، مینا هەردو و شانۆگەرییێن (الجزار )، (نەبو نەخویندەواریێ)[٢٩].

ل باژێرێن دی وەك ئامێدیێ و ئاکرێ و زاخۆ دیسان کاودانێن سیاسی یێن سەخت ل وی دەمی کارتێکرنێن خۆ ژ هەمی لایەکی ڤە هەبوویە، ب تایبەت ل سەر شانۆیێ، دگەل ڤێ چەندێ ژی بزاڤا شانۆیێ ل دەڤەرا ئامێدیێ بەردەوامی پێ هاتە دان و هندەك کارێن باش هاتنە پێشکێشکرن مینا:

دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ نەبو نەخویندەواری ل سالا ۱۹۷۸ێ ل دهۆك



شانۆگەرییێن (نەوروز) سالا (۱۹٦۱)ێ ل ئامێدیێ و ل كۆرا سێریچێ و (شۆرش) سالا (۱۹٦٤)ێ ل هۆلا خواندنگەها سەرتاییا ئامێدیێ و (رۆناهی) ل مەها هەشت سالا (۱۹٦٦) ێ ل كۆرا سێریچێ و (مزگینی) سالا (۱۹٦۸)ێ.

ئەڤ كارێن دیاركری ل سەر دەستێ (ئەحمەد عەلی قەنتار و ئوسمان رەشید ئامێدی و جەمیل عەبدوللا و سەلیم یاسین) ی بوون[۳۰] و هەژمارەكا گەنجێن باژێرێ ئامێدیێ تێدا بەشدار بوون. ژ وان ئەگەرێن دیار كری بزاڤا شانۆیێ دڤێ قۆناغێ دا لاواز و كز بووو.

دیسان ل باژێرێ ئاكرێ ژی شانۆ مابوو ل سەرملێن مامۆستا و قوتابییان و ب سەر پەرشتی یا (تارق كامل- رشدی عوبەیدوللا- نەبیل عەبدولرەحمان و رەمەزان عەلی و شەهاب جومعە شاهین) و كێم كار هاتبوونە پێشكێشكرن، مینا شانۆگەرییێن (رۆژەكا پیرۆز) سالا (۱۹٦۲)، (مێهڤانێ خوارنێ) سالا (۱۹٦٤)، (مەولیدا پێغەمبەری) سالا (۱۹٦٥) ێ، (گرارۆشك) سالا (۱۹٦۷)[۳۱] ێ و (عمر بن الخطاب) سالا (۱۹٦۸)ێ، ب پشكداریيا (شاكر مەحەمەد ئەمین- مەحمود یاسین- تارق شەعبان – بابك عەبدولغەفار- ئەحمەد عوبەیدوللا- شاكر عەبد لكەریم- جەمال عەبدوللا- زهێر مەحەمەد ئەمین- جەمال رەمەزان- كەمال رەمەزان) و ئەڤ شانۆگەرییە ل (كانی زەركێ- سیپەی قەشوری- خواندنگەهێن ئاكرێ یا ئێكێ و ئاكرێ یا دویێ)[۳۲].

د ڤێ قۆناغێ دا لاوازی و كێم كاری ژ باژێرێ زاخۆ ژی گرت و بەهرا پتر ئەڤ كارە هەر مال سەر ملێن مامۆستا و قوتابییان ڤە، و ڤێ تەخێ بەردەوامی ب هەژمارەكا كێم ژ وان شانۆگەریان دا، مینا شانوگەرییێن (مەردینی) سالا (۱۹٦۲)ێ، كو ل بەر پرا دەلال ب هەلكەفتا جەژنا نەوروزێ و (ئاگرێ نەوروزێ) سالا (۱۹٦۲)ێ ب و پشكداریيا خویندكار و گەنجێن باژێرێ زاخۆ (عەبدللا تاهر- مەحەمەد ئەمین عەبدو لكەریم- عەلی حەسەن- نافع سموعی) هاتە پێشكێشكرن[۳۳]. و (چایخانا بابێ عەڤدو) ی سالا (۱۹٦۷) ێ[۳٤]، (دایك) و ب پشكداریيا (عەبد لحەكیم رەجەب- عەبدللا تاهر ئیبراهیم- عەبد لعەزیز سلێمان- عەبدللا جاسم-

رەئوف سەعید- نوری رەمەزان د گەل كۆمەكا زارۆكان سالا (١٩٦٨)ێ[٣٥].

ب دیتنا من بزاڤا شانۆیێ ل هەر قۆناغەكێ گرێدای كارتێكرنێن سیاسی و چڤاكی و رەوشەنبیری و سەر و بەرێ ئابووری ڤە هەبوویە، كو ژ هەمی لایەكی ڤە كارتێكرنێن خۆ ل سەر وەرارا شانۆیێ كرییە، چونكی چارە نڤیسێ شانۆیێ و دەقێن شانۆیێ گرێدای وان ئەگەرا بووینە.

## قۆناغا سالێن ( ١٩٧٠ تا ١٩٨٠ )ێ:

ئەڤ قۆناغە دهێتە هەژمارتن ژ قۆناغێن زێرینێن بزاڤا شانۆیێ ل دەڤەرا دهۆكێ، هەر وەسا ل دەڤەرێن ئاكرێ و ئامێدیێ و زاخۆ ژی، ب تایبەت د نیڤا ئێكێ ژ ڤێ قۆناغێ. ئەڤەژی بەهرا پتر دزڤریتەڤە وێ ئارامیێ و ئازادیا سالا (١٩٧٠ تا ١٩٧٤)ێ ل ئیمزاكرنا رێكەفتنا (١١) ئادارێ بەر بەلاڤەبووی.

د ڤێ قۆناغێ دا ل باژێرێ دهۆكێ تیپ و گرۆپین هۆنەری هاتنە دامەزراندن و بەردەوامی ب شانۆیێ هاتە دان وەك:

(تیپا زارڤەكرنێ یا سەندیكا مامۆستایێن كوردستانێ)، كو شانۆگەریا (حەجی ئەحمەد ئاغا- والی بغداد) سالا (١٩٧٠)ێ ل دهۆكێ و ل هۆلا ئامادەییا كاوە و ژ ئامادەكرن و دەرهێنانا - فەرهاد شەریف بۆ و ب پشكداریا (مەحەمەد سالح عەلی مبارەك - ئەحمەد جومعە شاهین - كامیران مەحەمەد ئەمین - ئەمین ماركوس - خەلیل ئیبراهیم خالد - كەمال ملكی كەمالە - بەكر عەبد لكەریم ) پێشكێشكری[٣٦] و (تیپا شانۆیا ئێكەتیيا سەندیكا كرێكاران لقێ دهۆك) كو شانۆگەریێن (كەڤالا مللەتی) ل (١٩٧٠)ێ، (خەبات) سالا (١٩٧١) ێ، (گولبهار) سالا (١٩٧٢) ێ، (هەردو لێبوك)، (لاندك) سالا (١٩٧٣) ێ ل باژێرێن (دهۆك و مووسل و زاخۆ و ئامێدیێ و شنگال و شێخان و بەردەرەش)، و ب پشكداریا (مەئمون بریفكانی - تەقیەلدین مەحەمەد ئەمین - نەجم عەبدوللا- حكمت حەسەن - مەجید عومەر - شەهاب ئەحمد - هاشم عەبدوللا - سابر عەبدوللا - مەحەمەد سەعید ئەتروشی - مەحەمەد سەعید عەبدولمەناف - سەعید بریفكانی - فەریق دۆسكی -

شانوویا كەڤالەك ژ ملەتی



شانوویا بو دکەیە گری



عەبد لکەریم ملك - سەعید عەبدوللا - ئیسماعیل یاسین) پێشکێشکرین[٣٧]، و (تیپا شانۆیا ئێکەتیبا خویندکار و لاوێن دیموکراتی کوردستان)، کو هەژمارەکا کارێن شانۆیێ پێشکێشکرین مینا - (هەمی ژ صەمونێ) سالا (١٩٧٠)ێ، (ئێکگرتن) سالا (١٩٧١)[٣٨]ێ، (کاوەی ئاسنگەر) سالا (١٩٧١)ێ، و (الاعیب شاب) سالا (١٩٧٣)[٣٩]ێ و دیسان هەردو تیپێن شانویێ ل رێڤەبەریا چالاکیێن خواندنگەها - یا قوتابیان و مامۆستایان کو هەژمارەکا شانۆگەریان پێشکێشکرین مینا (بۆ دکەیە گری) سالا (١٩٧٣)ێ، (سەربلندی) سالا (١٩٧٤)[٤٠]ێ، (یەکبوونا نیشتمانی) سالا (١٩٧٥)ێ، (التصفیة) سالا (١٩٧٦)ێ، (گوفان الصمت)

شانوویا التصفیة



شانوویا (عندما یتکلم الجراح)



سالا (١٩٧٦)ێ، (عندما یتکلم الجراح) سالا (١٩٧٧)ێ، (نافذة التأریخ) سالا (١٩٧٧)ێ، (الصلب) سالا (١٩٧٨)ێ، و (المعلم الجدید) سالا (١٩٧٩)[٤١]ێ، و (تیپا (١١) ێ ئادار یاهۆنەری یا کو ل سەر دەستێ ئیسماعیل عەبدولقادر زیرەك - جەمیل زکری - مەجید خەلیل حەسەن - حەمید تاها - حسێن ئەحمەد ئورەماری - موشی پولص - ئەدیب سالح -

شانوویا کاوەیێ ئاسنگەر



(دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ ئێتیم و ژیان ۱۹۷۷ێ دهوك



ئەلبرت فرنسو - سالم ئیسحاق کەمالە - شموئێل شمعون - عەمانوئێل - نزار بەزاز - ئەحمد مەعروف سەبری نەجار - ئەحمد مەحەمەد رەشید - جەمیل برهان هاتییە دامەزراندن و چەند کارێن شانۆیێ یێن رێك و پێك پێشکێشکرین مینا ، شانۆگەرییێن (ستەمکار)، (ئێکەتی)، (ئوتێلا سحرکری) سالا (۱۹۷۱)ێ، و (فلسطین الثائر)، (خەباتا قوتابییا)، (زانین رۆناهییە)، (وینەگر)، (سەرتراش) سالا (۱۹۷۲)ێ، و (الزبون المزعج)، (کاوەی ئاسنگەر)، (پەیکەر)، (شورش و ژیان) سالا (۱۹۷۳)ێ، و (دوو شاهی) سالا (۱۹۷٤)ێ پێشکێشکرین[٤٢]، و (تیپا خانەیا مامۆستایان ل دهۆکێ)، کو شانۆگەرییێن (باش ژنئینان) سالا (۱۹۷٤)، (الشقاء) سالا (۱۹۷٥) ێ پێشکێشکرین[٤٣]، و (تیپا شانویا بنگەهێ لاوان) کو ب هژمارەکا کارێن هەژی بزاڤا شانۆیێ ل دهۆکێ خورتتر کر و چەند شانۆگەری، مینا شانوگەرییێن (شەهید) سالا (۱۹۷٥) ێ، (ئێتیم و ژیان) سالا (۱۹۷۷) ێ، (ئەو زەلامێ گۆتی نەو)، (فیلێ تە ئەی مەلیکێ زەمانی)، (نە بو نە خویندەوارییێ) سالا (۱۹۷۸)ێ، و (رەنی) سالا (۱۹۸۳) ێ هاتینە پێشکێشکرن[٤٤]. و (تیپا سەندیکا خودان پیشەیێن ساخلەمیێ ل

دهۆکێ) کو شانۆگەریا (عیادە الدکتور حتحت) سالا (۱۹۷٦)ێ پێشکێش کر[٤٥]. و (تیپا شانۆیا گوندا) یا سەر ب رێڤەبەریا رەوشەنبیریا جۆتیارا ڤە ل دهۆکێ، کو تیپەکا فەرمی بوو و شانۆگەریا (غریب بالسلف) ب زمانێ عەرەبی سالا (۱۹۷٦) ێ پێشکێشکر[٤٦]. هەژیە بێژین دڤێ قۆناغێ دا و ب تایبەت ل باژێرێ دهۆکێ شانۆیا خواندنگەها رۆلەکێ گرنگ د بزاڤا شانۆیێ دا هەبوویە و خویندکار و مامۆستایێن گشت قۆناغێن خواندنێ ل دهۆکێ ب ئەرکەکێ جوان و هەژی خۆ ل شانۆیێ کرە خودان و شیان کۆمەکا شانۆگەریان ل ڤان خواندنگەهان پێشکێشبکەن:

(ناڤنجیا گارە-خواندنگەها مهاباد-ئامادەییا پیشەسازی-خواندنگەها صلاح الدین یا سەرەتای[٤٧].

ل ئاکرێ ل نیڤا ئێکێ یا ڤێ قۆناغێ (تیپا شانۆیا ئاکرێ) و (ئێکەتییا خویندکار و لاوێن کوردستانێ) و ب هاریکاریا هێژایان (عەبد لحەمید عەبدوللا ئاکرەی و نورەدین ئەحمەد محەمەد و تەقیەدین مەحەمەد ئەمین و رشدی عوبەیدللاو سەید نوری و عادل عەبدو لقادر و بەحەشتی و بشار فارس شانۆگەرییێن (نالبەند) سالا (۱۹۷۱) ێ، (بەرەف ئازادیێ) سالا (۱۹۷۲)ێ، (نەوروز) سالا (۱۹۷۲)ێ، (هەڤرکی یا ئازاد) سالا (۱۹۷۳)ێ، (بەرەف ئازادیێ) سالا (۱۹۷۳)ێ، و (سەنگەر) سالا (۱۹۷٤) ێ پێشکێشکرن.

د نیڤا دووێ ژ ڤێ قۆناغێ شانۆ ل باژێرێ ئاکرێ، و ژ بەر گڤاشتنا رژێمی و دل شکەستنا خەلکی ژ تێکچوونا شۆرشێ ل بهارا (۱۹۷٥) ێ ب لاوازی و کێم کاری ل قەلەم هاتەدان، لێ ب خەمخوری ب بەشدابوونا (ئەسعەد عەبدوللا - جەهوەر عەلی - شەوکەت ئەحمد - ئەکرەم یوسف - دیدار رەمەزان - رەمەزان مەجید - سەعید شەریف - کامیران قادر - سبحی عەبدال - شەعبان ئەحمد - رەمەزان خورشید )[٤٨] ل دوماهیا ڤێ قۆناغێ جارەکا دی بەردەوامی پێ هاتە دان ڤە، و دگەلدا ژی ب سەرپەشتییا مامۆستایان بەردەوامی ب شانۆیا خواندنگەها هاتەدان لێ نە د ئاستێ پێدڤی دا بوو.

هەر وەكی مە دیاركری كو ل ئامێدیێ و سەرسنك و بامەرنێ ژی بزاڤا شانۆیێ د نیڤا ئێكێ د ڤێ قۆناغێ دا هەر ژ بەر وان ئەگەران ب پلەكا باش هاتەپێش و مرۆڤ دشێت بێژیت كو دڤێ قۆناغێ دا مێشك و چاڤێن خەلكی ب ئازادانە ڤەبوون و ئاستێ رەوشەنبیریێ ب پلەكا بلندتر ژ قۆناغا بووری ل دەڤەرێ بەلاڤە بوو، ب تایبەت ل بازێرێ ئامێدیێ كو تێهنیێن وێ ئازادیێ بوون، هەلبەت شانۆیێ ژی بەهرەكا مەزن تێدا هەبوو و تیپا شانۆیا ئامێدیێ رۆلەكێ هەژی دگێرا، و ب هاریكاری و بەشداریا (ئەحمەد عەلی قەنتار و ئەحمەد رەشید ئەلنەجار و مەحەمەد تاهر ئەحمەد و بەدیع مەحمود و ئەحمەد و حازم مستەفا و شاهین سەلیم و سدقی ئیسماعیل و سەعید مەحەمەد كنجێ و نزار مەحەمەد عەبداللا و سەلاح سەعید - شەعبان ئەحمەد و عیمان رەشید ئامێدی و مەلا عەلی رێكانی و تاهر عوبەید - جەمیل عەبدللا مەحەمەد و ئیسماعیل ئیبراهیم فەتاح - حەسەن حسێن یاسین - غازی زینەلدین - كەمال عارف فەتاح - كەمال حەسەن ناصر)[٤٩] لێ پشتی بوورینا چوار سالا و دەست پێكرنا شۆرشا كوردی ل بهارا سالا (١٩٧٤)ێ، دەڤەر ب گشتی و بۆ دەمێ سالەكێ كەفتە د سەنگەرێ شەری دا، تا بهارا سالا (١٩٧٥)ێ و ب ئیمزاكرنا رێكەفتنا جەزائیرێ و تێكچوونا شورشێ، ئەڤ ناڤ و نیشانێن ل خوارێ دیاركری ژ كارێن باشێن بزاڤا شانۆیێ ل دەڤەرا ئامێدیێ نە وەكی نموونە:

(خویندكار سەرێ رمینە)، (سەرتراش)، (كاوەی ئاسنگەر)، (چوار ئەفسەرێن شەهید)، (پاشایێ ریت)، (خێزان)، (عەزیز)، (مام دەرویش)، (پلانا حاجی عمران)، (بزاڤێن نهێنی)، (كادر و شۆرش)، (قوتابیێن شۆرشگێر)، (چەتێن هاریكار و دلسۆز)، (شۆرشگێر). ئەڤ شانوگەریە د ناڤبەرا سالێن (١٩٧١ تا ١٩٧٤)یدا هاتینە پێشكێشكرن[٥٠].

ل نیڤا دووێ ژ ڤێ قۆناغێ مرۆڤ دشێت بێژیت شانۆ هاتە قەدەغەكرن و ژ بەر دیڤچونا رژێمێ بۆ كەسانێن ب كارێ شانۆیێ رادبوون دەست ژ كارێ شانۆیێ بەردان، یان بۆ دەمەكێ كورت ژ ڤی كاری دویركەفتن.

سەبارەت بازێرێ زاخۆ ژی، هەر وەكی ژ ئەرشیفێ ل بەردەست دیار، كو بزاڤا شانۆیێ د ڤێ قۆناغێ دا ل بازێرێ زاخۆ گەشە پێ هاتە دان و بەلگە ئەوە كو هەژمارەكا كارێن شانۆیێ یێن رێك و پێك و ب بەشداربوونا كۆمێن گەنج و خویندكارێن ڤی بازێری هاتنە پێشكێشكرن. هەر وەسا بۆ جارا ئێكێ د ڤێ قۆناغێ دا شانۆڤانێن بازێرێ زاخۆ كارێن خو یێن شانۆیێ ب ناڤێ تیپا و گرۆپا پێشكێشكرن، و ئەڤ تیپ و گرۆپە ژ لایێ وان گەنجا ڤە هاتنە پێكئینان و ناڤ- بۆ دانان. ئەگەر ئەم دیتنەكێ ل وان كارا بكەین دێ هندەك ناڤ هێنە پێش وەكی:

(تیپا شانۆ یا زاخۆ - تیپا شانۆیا نەورۆز یا هۆنەری - تیپا شانۆیا ئێكەتییا قوتابیێن كوردستانێ - تیپا شانۆیا بنگەهێ لاوان ل زاخۆ). لێ دڤێت ژ بیر نەكەین كو چ ژ ڤان تیپ و گرۆپا دەستوریيا فەرمی ژ بۆ كاركرنێ ژ لایێ دەزگەهێن حكۆمی ڤە نە بوویە ، لەوما ژی هەر تیپەكێ ئێك دو كار پێشكێشكرن و دهاتنە هەلوەشاندن، و پشتی چەند سالەكێن دی، ئەڤ تیپە یان گرۆپە، دا جارەكادی دەست بكارێ خۆ هەر لبن وی ناڤی یا ن ناڤەكێ دی كەنەڤە، لێ یا دلخۆشكەر دڤێ قۆناغێ دا ئەوە كو ئامادەبوون و حەزا بینەری گەلەكا باش بوو، و گەلەك جاران شانۆگەری ل رۆژێن تایبەت بۆ خێزانان ژی د هاتنە پێشكێشكرن و ئەڤ شانۆگەریێن ل خواری دیار كری كو ل ژ لایێ هێژایان (عەبدلعەزیز سلێمان و رەمەزان حەجی قادر و سالم تاهر و مەردان قاسم و عەبد لرحمان موسا و عیسا مەحەمەد و مەحەمەد ئەمین ئەحمەد عەبو و نوری رەمەزان و مەحەمەد ئەمین عەبد لكەریم و هەمزە مەحەمەد و عومەر مەحەمەد و سبحی سەلیم و هاشم رەمەزان حەسەن مەجید و هاشم موسا عەبدللا ئیسماعیل هوری موئەیەد مەحەمەد عەبد لقادر و عەبدللا تاهر و سبحی عەلی عیسا ئەحمەد و خەلات رەمەزان ئەلەنجار و سامی عەبدلكەریم حسێن سەلیم) ڤە هاتینە

پێشكێشكرن نموونەیێن باشن ژ بزاڤا شانۆیێ ل باژێرێ زاخۆ ئەوژی شانۆگەرییێن: (ڤالڤەكەر)، (دەیكا شەهیدی)، (پاسەوانێ دزیكەر) سالا (١٩٧٠) ێ، (المشوه) سالا (١٩٧٢) ێ، (خەبات)، (الیعیش بالحیله یموت بالفقر)، (چایخانە) سالا (١٩٧٦) ێ و (شڤان و بێری) و (مجانیة التعلیم مكسب ثوري ) سالا (١٩٧٧) ێ، (نە بۆ نەخویندەواریێ)، (سەرتراش)، (جوتیار) سالا (١٩٧٨) ێ، (دەرەبەگی) و(بابێ ناڤوی)، (یێ ژ بەروكێت شەری زڤری) سالا (١٩٧٩)[٥١] ێ .

خواندنا مە بۆ بزاڤا شانۆیێ ل دڤەرێ و ب تایبەت د نیڤا ئێكێ ژ ڤێ قۆناغێ دا دیاردبیت كو ناڤەرۆك و بابەتێن شانۆگەریان ئازادانە و بێ گڤاشتن و قەدەغەكرن و ب زمانێ كوردی د هاتنە پێشكێشكرن، و بابەتێن وان - داستانی بوون مینا كاوەی ئاسنگەر و د كۆمیدی بوون و پرانییا وان ل دۆر برایەتییا كورد و عەرەبا بوون، هەروەسان خەباتا پێشمەرگەهی و قوتابییا و ڤیانا مللەت و وەلاتی و بابەتێن گرێدای چڤاكی و ئاریشێن رۆژانە و باشیێ و خرابیێ بوون، كو بەرو ڤاژی نیڤا دووێ بوو. ل ڤێرە ئەم پێدڤی راوەستیانەكێینە، كو ب راستی شانۆ دڤێ قۆناغێ دا ل دەڤەرێ ب ئەركێ خو رابوویە، ژ لایەكی شیایە ئارمانج و مەبەستا سەرەكی ژ بابەتا بگەهینیتە خەلكی، و رۆلەكێ گرنگ و هەژی بگێریت و ژ لایەكێ دی ڤە ئافرەتێ د ڤێ قۆناغێ دا پشكداری تێداكر و رۆلێ خۆ د گەل زەلاما دناڤ دا دیت و شیان وێ ڤالاتییا هەی پر بكەنە ڤە. ژ وان ئافرەتان (قسمەت جەمیل عەبد لقادر - سعاد عەبدوللا- چنار شاكر - ڤكتوریا یوسف - سهام تاهر مراد - نەوال سلێمان ئەحمد - سەمیرە رەشید - وەلیدە صبو - فائیزا رەشید - سەمیرە تاهر - باسمە رەشید - كاترینا حەبیب سەنعان - زمرود تاهر - سەناء سەعید - نیران ئیبراهیم سلو - ئیخلاس جەمیل - نەوال عەبدولفەتاح - نەجاە مەحەمەد سەدیق - راویە مەحەمەد - نیزال غەربی - سهێلە ئەحمەد عەباس - ئیمان حەمید یەلدا - عەقیلە ئەحمد - هەلات یاسین - شەرمین ئەحمد - فاتمە عەبداللا - فاتمە سەباح - مەها سەبری)[٥٢] و ژ لایێ هۆنەری ڤە شانۆیێ ل دەڤەرێ باشترین پێنگاڤ هاڤێتن و پشتەڤانی و هاریكاری ل دووڤ شیانا بو شانۆیێ و شانۆگەرییا هاتە كرن، ب تایبەت ژ لایێ رێكخراو دەزگەهێن حزبی ڤە دناڤبەرا سالێن (١٩٧٠ تا ١٩٧٤) ێ ، مینا ئێكەتییا خویندكار و لاوان و لیژنێن پارتی دیموكراتی كوردستان، هەر وەسا ژ لایێ دزگەهێن حكۆمی ڤە مینا (رێڤەبەرییا چالاكیێن خواندنگەها و بنگەهێ لاوان و خانەیا مامۆستایان ل دهۆكێ و تیپا شانویا گوندا)[٥٣]، لێ دیسان چ تیپ و گرۆپ ب شێوەیەكێ فەرمی نە هاتنە دامەزراندن، ب تنێ ل بنگەهێ چالاكیێن خواندنگەها و تیپا شانویا گوندا نەبیت.

## قۆناغا سالێن (١٩٨٠ تا ١٩٩٠) ێ

ئەگەر ئەم قۆناغا پێش ڤێ قۆناغێ وەك دەسپێكێن باش د نیڤا ئێكێ دا ب قۆناغا زێرینا شانۆیێ ل دەڤەرێ ب دانین، ئەڤ قۆناغە دهێتە هەژمارتن ژ قۆناغێن گرنگێن شانۆیا دهۆكێ، تێدا شانوویێ گەشەكر و پێشڤەچوون و سەرهلدانەكا باش بخۆڤە دیت و تیپێن شانۆیێ هاتنە دامەزراندن و لڤلڤین و خەمخۆری و كار و بەرهەم و داهێنان كەتە د ناڤدا، لەوما ژی دێ بینین كو شانۆڤانێن ل ڤێ قۆناغێ كاركرین، دەمێ بیرهاتنێن خۆ سەبارەت بزاڤا شانۆیا دەڤەرێ ل ڤێ قۆناغێ ڤەدگێرن، ب نموونا شانۆیا دهۆكێ ل قەلەم دەدن. ل ڤێ قۆناغێ گشت تیپ و گرۆپێن مە ئاماژە پێدای بەردەوامی یا دایە بزاڤا خۆ یا شانۆیێ، وەكی تیپێن شانۆیێ یێن خویندكار و مامۆستایان ل رێڤەبەرییا چالاكیێن خواندنگەها و بنگەهێ لاوان ل دهۆكێ و تیپا سەندیكا خودان پیشەیێن ساخلەمیێ ل دهۆكێ، زێدەباری دامەزراندنا هندەك تیپێن دی وەك - تیپا شانۆیا (بزاڤ) یا كو ل دووماهیێكا سالا (١٩٧٩) ێ ل سەر دەستێ (ئازاد عەبدوللا سادق - بائیز عومەر ئەحمەد - رفعەت رەجەب جەمال - وەلید مەحمود - عەبدوللائیسماعیل هرۆری) هاتییە

دامــەزرانــدن[٥٤] و ڕولەکێ باش د بزاڤا شـانۆیێ ل دهۆکێ دا هەبوویە و (تیپا شێخو - تیپا ڕباد یا هۆنەری) یاکو سالا (١٩٨٣) ێ ب شێوەکێ فەرمی ل سەر دەستێ (میقداد ئەحمەد مەسیحا و نسرەت هادی حاجی عەلی و نایف عەبد لجەبار و ئیبراهیم ئێمینکی و قاسم ڕەمەزان) هاتییە دامەزراندن[٥٥] و تیپا شانۆیا شۆرشڤان کو ئەوژی سالا (١٩٨٣) ێ ب شێوەکێ فەرمی ل سەر دەستێ (فەهمی سەلمان و عادل حەسەن و ئەحمەد سالح مەحەمەد و مەحەمەد عەلی مەحەمەد و ڕەمەزان عەلی و عەبد لمەجید شکری و عەبد لعەزیز حەجی وەهبی و عبدلستار عەبدالل‌ا کامل و جەمال سەدیق) هاتییە دامەزراندن[٥٦]. تیپا شانۆیا ئەڤرۆ کو سالا (١٩٨٧) ێ ب شێوەکێ فەرمی ژ لایێ کۆمەکا خویندکار و گەنجێن دهۆکی هاتییە دامەزراندن[٥٧]. و تیپا شانۆیا بەهدینان کو ل دووماهییێکا نیڤا دووێ ژ ڤێ قۆناغێ سالا (١٩٨٨) ێ ب شێوەکێ فەرمی ل سەر دەستێ (کەریم جەمیل بیانی و ئەحمەد جمعە شاهین و بائیز عومەر ئەحمەد و حکمەت ئەیوب ئادەم و

(دیمەنەك ژ شانوگەریا - ڕنکا ڕوناهیێ ١٩٨٠ێ دهوك)



حسێن حاجی عومەر و ڕێبەر عومەر ئەحمەد و فەرهاد ئەحمەد جمعە) هاتییە دامەزراندن[٥٨]. دگەل دانانا سەندیکا هۆنەرمەندێن عیراقێ لقێ دهۆك و ڤەکرنا بارەگایێ سەندیکایێ ب شێوەکێ فەرمی سالا (١٩٨٣)ێ[٥٩]. هەژییە بێژین کو ب دامەزراندن

دیمەنەك ژ شانوگەریا - کاوەی ئاسنگەر - ١٩٨١ - بامەرنێ



و کارکرنا ڤان تیپ و گرۆپان ڕولەکێ بەرچاف د رێکخستن و پالپشتیکرنا هۆنەر و هۆنەرمەندان هەبوو، کو بشێن هەژمارەکا شانۆگەرییێن ب پلێن باش ل دهۆکێ پێشکێشبکەن. دڤێت ژ بیر نەکەین کو بەهرا پتر ژ ڤێ قۆناغێ کەفتە د سەردەمێ جەنگێ (عیراق و ئیرانێ) دا، راستە رژێم یا زال و توند و تیژ بوو لێ هزر و بیرێن ڕەوشەنبیر و هۆنەرمەند و خەلکی ژ بۆ خەبات وهشیارکرنێ و ئێك بوونا مللەتی هەستەکێ جوان و نازك و ب ئەرك دهاتە دانان، لەوما ژی ژ لایێ ڕەوشەنبیرکرنێ و هشیارکرنێ، شانۆیێ ل دهۆکێ رولەکێ باش دگێرا. سەبارت رولێ ئافرەتێ د ڤێ قۆناغێ دا پشکدارییەکا باش هەبوو و هاریکاری و پالپشتی بو شانۆیێ هەبوو، ب دیتنا من کارێن هۆنەری یێن شانۆگەریا وەك (دیکور - جلك و بەرگ - روناهی - میکیاژ - موزیکە ب رویێ پێدڤی و د ئاستێ پێڤی دا دهاتنە بکار ئینان و ئەڤ شانۆگەرییێن ل خوارێ دیار کری نموونەیێن باشن ژ بزاڤا شانۆیێ کو ژ لایێ وان تیپ و گرۆپێن مە ل سەری دیارکرین ل دهۆکێ هاتینە پێش کێش کرن - شانۆگەرییێن (رێکا ڕوناهیێ - بزاڤ) سالا (١٩٨٠) ێ، (گەنجێت مهابادێ - کاوەی ئاسنگەر ) سالا (١٩٨١) ێ و (شاهێ ب کولاڤ) سالا (١٩٨٢)ێ و (ڕەنی - کش ئەمریکا - گازی ژ کاوەی) سالا (١٩٨٣) ێ، (ئەلند) سالا (١٩٨٤)ێ، (ئەم هێلینێ ناهێلین - خوین و ئەڤین - دەنگێ دایکێ) سالا (١٩٨٥) ێ، (یاری - پەشیمان) سالا (١٩٨٦)ێ، (ڕاوەستیانەك

(دیمەنەك ژ شانوگەریا - ئەلند ١٩٨٤ێ دهوك)



(دیمەنەك ژ شانوگەریا - بیرەوەریت دینەکی ١٩٨٩ێ دهوك)



- وەلاتێ من - ساخێ مری - فایلا - ٦٧ - یاری) سالا (١٩٨٧)ێ، (ڤەژین - خوراگرتن - ئەمیکلا - زەلامێ خو مشکانەکری - ژ نیڤ شەڤ پێدا - ژیان) سالا (١٩٨٨)ێ و (تەناهی و شۆرشا بەرا - سیزیف و مرن - بۆچی؟- پالەوان ونڤیسەر- خەلك و بەرد - بیرەوەریێت دینەکی - دیتن - بوون) سالا (١٩٨٩) ێ[١٠]. دیسان دڤێت ژ بیر نەکەین کو د هەمان دەم دا شانۆیا خواندنگەهـا ب هاریکاری و ب پشتەڤانیا مامۆستا و کارگێرێن خواندنگەهـان، خویندکار شیان بزاڤا شانۆیێ ل خواندنگەهـا ب شێوەیەکێ باش و هەژی بیننە پێش، ب تایبەت ل ڤان خواندنگەهـا (ناڤنجیا گارە - ئامادەییا پیشەسازی - صلاح الدین یا سەرەتای - ئامادەییا بازرگانییا تێکەل - ناڤنجیا مەمێ ئالان - ئامادەییا برایەتی - ئامادەییا هاوکاری - ئامادەییا خواندنێت ئیسلامی - ناڤنجیا نصر یا ئێڤارا - ناڤنجیا بەکر - ئامادەییا کاوە - پەیمانگەها مامۆستایان )[١١].

ئەگەر ئەم بەریەرێن بزاڤا شانۆیێ ڤەدەین بۆ مە دیار دبیت کو گەلەك ژ هۆنەرمەندێن تا ئەڤرۆ ژی کار دکەن وەك (زارڤەکەر - دەرهێنەر - نڤیسەر و مامۆستا و خودان باوەرنامێن بسپۆر د واری شانۆیێ) دا، دەسپێکا وان ل خواندنگەهـا بوویە ل هەر قۆناغەکا خواندنێ بیت. ب ڤێ ئێکێ دیاردبیت کو شانۆیا خواندنگەهـا رولەکێ گرنگ د ئاڤاکرنا

(دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ ڤوتابیێ شیم (١٩٨٤)ێ دهۆك)



زارڤەکرنا خویندکار دا هەبوو یە و ئەڤ شانۆگەرێن ل خوارێ دیارکری نموونەیێن باشن ژ بزاڤا شانۆیا خواندنگەهان ل دهۆکێ:

(کورێ من بازێرڤانە - کاوەی ئاسنگەر- ئاغایێ بێ وژدان - ئەگەر رۆژ هەلات دێ ئاڤابیت)، سالا (١٩٨٢)ێ و (دختورێ دل رەق - ئاغا و مللەت - کاوەی ئاسنگەر - نەوروز - نەوروز چ یە؟ - رەزڤان - الشماعیە) سالا (١٩٨٣)ێ و (باوەریەکا موکم چیا د هەژینیت - چەکوچێ کاوەی - خەون - السیگارە - رۆژەك دێ ئێت و نەوروزە - مامۆستا و خویندکار - ناما سەربازەکی - ڤوتابیێ شیم - سوننەتچی) سالا (١٩٨٤) ێ، و (خومەینی - فروتنا گنجیان - ئازادی) سالا (١٩٨٥) ێ، (نەورۆز د ناڤبەرا دوهی و ئەڤرۆ - کورێ کاوەی - دختور - خوین) سالا (١٩٨٦)ێ، (بوچی؟ ژ بەر چی؟) سالا (١٩٨٧)، (مرن خۆشترە ژ ژینێ سالا (١٩٨٨) ێ و (شەهیانا شەهیدی - شاگردێ جەنگاوەر - فلوس الدواو) سالا (١٩٨٩)ێ[١٢].

سەبارەت بازێرێ ئامێدیێ و دەور و بەرا، شانۆ دڤێ ڤۆناغێ دا ب لاواز و کێم کار هاتییە پێش، ئەو

(دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ کورێ کاوەی (١٩٨٦)ێ دهۆك)



ژی ژ ئەگەرێ کارتێکرنا جەنگا عیراقێ و گڤاشتنا رژێمێ ل سەر دەڤەرێ و قەدەغەکرنا ڤان جۆرە چالاکییا و دووڤچوونەکا مەزن دهاتە کرن، ژ بەر کو پشتی دەسپێکا جەنگێ عیراقێ و ئیرانێ چالاکیێن پێشمەرگەی و رێکخستییێن پارتی ل دەڤەرا ئامێدیێ ب هێز بوونەڤە، لێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو شانۆ ل خواندنگەهـا ب ئەرکێ خو رابوو یە ب تایبەت ل هەلکەفت و بیرەوەریا دا و شیاینە هەژمارەکا کارێن باش ل ئامێدیێ و سەرسنگی و بامەرنێ ب ناڤێ تیپا (زێرەڤان) ل سەرسنگی و خویندکارێن ئامادەییا بامەرنێ پێشکێشبکەن، ئەڤ شانۆگەرییە نموونەیێن باشن کو هاتینە پێشکێشکرن مینا: شانۆگەریێن (کاوەی ئاسنگەر) سالا (١٩٨١) ێ و (دیوارێ ل سەر بەفرێ) سالا (١٩٨٤)ێ ل بازێرکێ بامەرنێ و (راستی) سالا (١٩٨٦) ێ، (شەهیدێ وەلاتی) سالا (١٩٨٧) ێ ل بازێرکێ سەرسنگی[١٣].

ئەگەر ئەم نێرینەکێ بدەینە بزاڤا شانۆیێ ل بازێرێ ئاکرێ د ڤێ ڤۆناغێ دا، دێ بینین ژ لایێ کارێن شانۆیێ ڤە بەرەڤ کز بوونێ ڤە دچوو، لێ ژ لایێ هزری و رەوشەنبیری یا شانۆیێ ڤە پێشڤەچوونەکا باش بوو، و ب هاریکاری و ب پشتەڤانییا مامۆستا و رەوشەنبیرا، شانۆ ل ئاکرێ هەر ب وی رەنگی رێکا خۆ گرت بوو و ل گشت خواندنگەهێن ئاکرێ و دەور و بەرا شانۆگەری ل هەلکەفت و بیرەوەریا هاتینە پێشکێشکرن، لێ نە وەك پێدڤی، هەژییە بێژین کو

دڤێ قۆناغێ دا و بۆ جارا ئێكێ ل ڤی بازێرێ تیپەكا شانۆیێ ب شێوەیەكێ رێك و پێك ل سەر دەستێ (موەفەق نعمەت - سەعید مەحەمەد شەریف - رزگار رەشید ئاكرەیی - رەجەب میرخان - رەقیب فارس - شاكر عەبدللا - جەرجیس مەجید - ئادەم ئیسماعیل - زبێر مەحەمەد زبێر - نەزیر سەلیم - لقمان خەلیل) ب ناڤێ (تیپا شانۆیا ئاكرێ) هاتە دامەزراندن[14]، و ئەڤ كارێن ل خوارێ دیاركری، نموونەیێن باشێن بزاڤا وێ قۆناغێ نە:

(بزاڤ) سالا (١٩٨٥)ێ، (قوتابیێ بێ رەوشت) سالا (١٩٨٦)ێ، و (كۆڤانا دوشاف فرۆشێ هەژار) سالا (١٩٨٨)ی، و (یاری) سالا (١٩٨٩)ێ هاتینەپێشكێشكرن[15].

هەر وەسا شانۆ ل بازێرێ زاخۆ د ڤێ قۆناغێ دا بەرەف كزبوونێ ڤە دچوو، لێ د سەر هەمی ئاستەنگ و ئالۆزیا شانۆڤانێن زاخۆ ل خواندنگەها و بنگەهێ لاوان و ئێكەتیا قوتابیان و رەوشەنبیریا جەماوەی بەردەوامی دا شانۆیێ و شیان هەژمارەكا شانۆگەریێن ب بابەتێن جڤاكی و ب شێوەی كۆمێدی پێشكێشبكەن وەكی شانۆگەریێن:

(قضیة ثائر) و (مولاكمێ نەسەركەفتی) سالا (١٩٨٠)ێ، (تلفزیون الفكاهە)، (ئەڤین و ئەڤیندار) سالا (١٩٨١)ێ، (مامۆستایێ سەركەفتی)، (دەست رەش)، (طریق تحریر فلسطین) سالا (١٩٨٢)ێ و (دەڤێ گورگی) سالا (١٩٨٦)ێ[16]. و هەر وەكی مە دیار كری كو ئەڤ قۆناغە یا گرنگ بوو، لێ هندەك یا سست و لاواز بوو، ب تایبەت ل ئاكرێ و ئامێدیێ و زاخۆ، ئەڤ لاوازییە د زڤریتە ڤە بۆ جەنگا عیراق و ئیرانێ، كو كارتێكرنا خۆ هەبوویە ل سەر گشت لایەنێن هۆنەری و رەوشەنبیری و جڤاكی و سیاسی و .....هتد

## قۆناغا سالێن (١٩٩٠ - ٢٠٠٠) ێ

ئەڤ قۆناغە ژی ژ قۆناغێن گرنگ و گوهورینانەیە ل شانۆیا دهۆكێ و دەور و بەرا (ئاكرێ - ئامێدیێ - زاخۆ)، چونكی شانۆ ب شێوەیەكێ بەرفرهتر ژ ئەگەرێ سەرهەلدانا مللەتێ كورد ل بهارا سالا (١٩٩١)ێ و رزگار بوون و ئازادیێ یا كو دڤێ قۆناغێ دا بەر بەلاڤەبووی كەفتە د وارێ خواندنێ و زانستیێ دا.

هەر وەسا دامەزراندنا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆكێ ل سالا (١٩٩٢)ێ[17] كو ب راستی گرنگی و رولێ خۆ یێ بەرچاڤ د پێشڤەبرنا ئاستێ هۆنەری و بەرهەڤكرنا مامۆستایێن هۆنەری و خودان شیان د وارێ هۆنەری دا ب شێوەكێ زانستی هەبوویە، ب تایبەت یێن شانۆیێ ئەڤە ژ لایەكی ڤە و ژ لایەكێ دی ڤە بلندبوونا ئاستێ هۆنەری ل پارێزگەها دهۆكێ كو كارتێكرنا خو هەبوویە ل سەر گشت دەڤەرێ و ئەڤە هیڤی و ئومێد و خەونێن هۆنەرمەند و رەوشەنبیران بوویە. ب دیتنا من باشترین قۆناغا شانۆیێ ئەڤە یە كو هۆنەر ل دهۆكێ وەك خواندن و ب شێوەكێ زانستی بگەهیتە پلێن بلند لەوما دێ بینین دڤێ قۆناغێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆكێ و ب هاریكاریا مامۆستایان و ب پشكداریا قوتابیێن شانۆیێ، شیان هەژمارەكا باش ژ كارێن شانۆیێ پێشكێشبكەن و رولەكێ بەرچاڤ و هەژی د بزاڤا شانۆیێ دا ل دهۆكێ بكەت، ئەڤە زێدەباری بەردەوامیا كارێن تیپ و گرۆپێن هۆنەری دگەل بەشداربوونا هندەك دام و دەزگەهێن هۆنەری ل دهۆكێ، كو كارێن شانۆیێ پێشكێشكرین وەك - (رێڤەبەریا چالاكیێت ڤۆتابخانا، رێكخراوا پاراستنا زارۆكان)، هەر وەسا دامەزراندنا هندەك تیپێن دی یێن هۆنەری وەك (تیپا كوردستان یاهۆنەری)، كو سالا (١٩٩٢) ێ ل دهۆكێ هاتییە دامەزراندن و (تیپا هەلەبجە یا هۆنەری)، كو بەردەوامی دایە كارێن خۆ و سالا (١٩٨٨) ێ ل كەمپا مێردینی هاتییە دامەزراندن و (رێڤەبەریا رەوشەنبیری و هۆنەری - دهۆك)، (تیپا شانۆیا برایەتی) یا سەر ئێكەتیا پیشەنگ یا خویندكارێن كوردستانێ - كۆمیتا دهۆك ڤە و (كۆمەلا هۆنەرمەندێن كوردستانێ - لقێ دهۆكێ)، (تیپا شانۆیا ئێكەتیا لاوێن دیموكراتی كوردستان - دهۆك) و بەردەوامبوونا ( كۆما شۆرشڤان) و تیپێن (رباد)، (بەهدینان) و (تێلەفزیونا كوردستان

- پشکا زارۆکا)، (تیپا شاریا یاهونەری) کو سالا (١٩٩٢) ێ هاتییە دامەزراندن، و (دەزگەهێ چاڤدیریا کۆمەلایەتیێ ل دهۆکێ) و (شانا هونەری)، کو سالا (١٩٩٤)ێ هاتییە دامەزراندن و (بنکەهێ هونەری ل کولیژا ئادابێ ل زانکۆیا دهۆک) و (تیپا برا ڤالا یا هونەری) ل دهۆکێ کو سالا (١٩٩٧)ێ هاتییە دامەزراندن و (تیپا نوهەدرا یا زارڤەکرنێ) ل دهۆکێ. ئەڤ شانۆگەریێن ل خوارێ دیارکری نموونەیێن باشن ژ کار و بەرهەمێن ڤێ قوناغێ ل باژێرێ دهۆکێ:

(سیارەك ژ ویڤە تێت)، (بانگ بکەن بژیت وەلات) سالا (١٩٩٠)ێ، (رسول الامم) سالا (١٩٩٣) ێ و (شارەزایێ زیندانێ)، (ابن الضال)، (طبیب المجانین) سالا (١٩٩٤) ێ، (قرال)، (شەڤا کوژەکا) سالا (١٩٩٥)ێ، (دەنگێ سەرا)، (سەمفونیا چاخێ بیستێ) و (سترانا خاتر خاستنێ) و (ساخێ مری)، (الغربة من أجل المال) سالا (١٩٩٦)ێ، (بازنا ڤالا)، (خۆ کەزاختن)، (هاملێت)، (پسیار) و (چیایێ شکاندی)، (رێگر)، (مژ و سەرما)، (کچا بێ وەغەر)، (هرچ)، (طريق الحق)، (الولد المشاكس) سالا (١٩٩٧)ێ، (دیاریا مێژوویێ)، (نەورەس)، (پاپۆرا رویدانا)، (دەرگەهـ)، (یاریکرن ب دەمی)، (شەڤا ب ژڤان)، (کلیلك)، (هەنگ و ستەنگ)، (خەنجەرا رەق وتەق) سالا (١٩٩٨)ێ، (گازی یا بلبلی)، (نوینەرێ گەل)، (سێتافکا خەونێ) سالا (١٩٩٩)ێ[٦٨]. بۆ زانین گشت شانۆگەریێن د ڤێ قوناغێ دا هاتینە پێشکێشکرن ب زمانێ کوردی بوون، هەر وەسا بۆ جارا ئێکێ د دیرۆکا شانۆیا دهۆکێ دا کچەکا کورد بناڤێ (بێریڤان اسماعیل) سالا (١٩٩٧) ێ بکارێ دەرهێنانا شانۆگەریەکێ ل پەیمانگەها هونەرێن جوان ل دهۆکێ ب ناڤێ (چیایێ شکاندی) رادبیت و تێتە هەژمارتن ژ پێنگاڤێن سەرکەفتی و جهێ رێزگرتنێ[٦٩].

شانۆ ل باژێرێ ئامێدیێ و دەور و بەرا ژی دڤێ قوناغێ دا، ب قوناغەکا باش هاتییە ل قەلەم دان پشتی کو شانۆگەری ئازادانە ل گشت خواندنگەهێن باژێرێ ئامێدیێ و سەرسنگ و شێلادزێ و دیرالۆك و بامەرنێ ل هەلکەفت و بیرەوەریا ب ناڤێ تیپ و گروپ و دام و دەزگەهێن حزبی و حکومی وەك (تیپا بزاڤ- یا شانۆیێ ل ئامێدیێ - تیپا ئامێدیێ یا شانۆیێ - کۆمەلا هونەرمەندێن کوردستانێ لیژنا ئامێدیێ - تیپا

(دیمەنەك ژ شانوگەریا - کچا بێ وەغەر - ١٩٩٧ - دهوك )



بزاڤا هونەری ل ئامێدیێ) هاتینە پێشکێشکرن[٧٠]. ئەڤکارێن ل خوارێ دیارکری نموونەیێن باشن ژ بزاڤا ڤێ قوناغێ ل ئامێدیێ:

(هەڤرکی) سالا (١٩٩٢)ێ، (شەهید)، (راستی) سالا (١٩٩٣)ێ، (کاوەی ئاسنگەر) سالا (١٩٩٤)ێ، (رێ یا راست) سالا (١٩٩٦)ێ و (سەرهەلدان) سالا (١٩٩٨) ێ هاتینە پێشکێشکرن[٧١].

ل باژێرێ ئاکرێ ژی د ڤێ قوناغێ دا گرنگییەکا باش ب شانۆیێ هاتە دان ژ بەر کو شانۆ د چارچوڤێ بن دەستیێ و ترسێ دا ئازاد بوو وەکی خەلکێ باژێرێ خۆ و شانۆڤان و رەوشەنبیر و قوتابییان رولەکێ باش و هەژی د ڤێ بزاڤێ دا هەبوویە و دانانا (کۆمەلا هونەرمەندێن کوردستانێ - لیژنا ئاکرێ)، پالپشتییەکا زۆر بۆ هۆنەری هەبوو. ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ شانۆگەریێن ل خوارێ دیارکری نموونەیێن باشن ژ بزاڤا ڤێ قوناغێ:

(سەرهەلدان)، (بەفر و خوین)، (دکتورێ هەلە) سالا (١٩٩٢)ێ، (نەبێ دینم)، (کێ کر و کێ خار)، (بیك و زاڤا) سالا (١٩٩٣) ێ، (مدیر بلا ادارە) سالا (١٩٩٤) ێ، (خامە و تەرازی)، (پارچە دراڤ) سالا (١٩٩٦) ێ، (دونیا ؟؟مرنێ) سالا (١٩٩٨)ێ[٧٢].

شانۆیێ ل باژێرێ زاخۆ دڤێ قوناغێ دا گەشە پێ هاتە دان و بزاڤەکا خورت و چەلەنگ هاتە گێران و کارێن هەژی و جوان و رێك و پێك هاتنە ئەنجامدان، ژ لایێ بابەت و ناڤەرۆکا ڤە و هەروەسا ژ لایێ کارێن هونەری ڤە و کارێن شانۆیێ ب ناڤێ تیپ و گروپان د هاتنە پێشکێشکرن، لی دیسان چ ژ ڤان گروپان دەستویر دانێن فەرمی ژ لایێ دەزگەهێن حکومی نەبوون تا سالا (١٩٩٨)ێ، کو بۆ جارا ئێکێ (تیپا زاخۆ یا شانۆیێ) ب شێوەکێ فەرمی هاتە دامەزراندن و دەستویردانا کاری ژ لایێ وەزارەتا رەوشەنبیری یا حکومەتا هەرێما کوردستانێ هاتە وەرگرتن و تا نها ل پێشکێشکرنا کارێن خۆ یا بەردەوامە. دڤێت ژ بیر نەکەین کو دانانا (کۆمەلا هونەرمەندێن کوردستانێ - لیژنا زاخۆ)، پالپشتییەکا زۆر بۆ هونەری ب شێوەیەکێ گشتی ل باژێرێ زاخۆ هەبوو و ئەڤ شانۆگەریێن ل خوارێ دیارکری نموونەیێن باشێن قوناغا ناڤبەرا (١٩٩٠- ١٩٩٨)ینە:

(بزڤرە برا بزڤرە)، (پەشمان)، (کەنز)، (ئەیاسێ خوشەڤی)، (نەخۆشیێن هەلەبچە)، (دەیکا نیشتمان)، (عیادەت دختور کلش کنجر)، (خەونێت هشیار)، (نیرەگدیورسن)، (هەیبەت)، (ڤەکۆلین)، (دختور خەفەر)، (گازیا کاوەی)، (دایکا نیشتمان)، (شۆرشا بارزانی)، (گولبهار هات)، (دزیا ب مروەت)،

دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ گازیا کاوەی ـ ١٩٩٦ ـ زاخۆ



(کورێ من و خواندنگەهێ چ گۆتە ئێك)، (من نینە نەخت زێرینە بەخت و حوکمێ قەرەقوشی)[٧٣].

## قۆناغا سالێن (٢٠٠٠- تا دووماهیێکا نیڤا دویێ ژ سالا ٢٠١٣) ێ

ئەڤ قۆناغە دهێتەهەژمارتن ژ قۆناغا گەشەیا شانۆیێ ل دەڤەرێ ژ هەمی لایەکی ڤە ژ بەر کو د ڤێ قۆناغێ دا گشت تیپ و گرۆپێن قۆناغا چوویی بەردەوامی دا پێشکێشکرنا کارێن شانۆیێ، زێدەباری سەندیکا هۆنەرمەندێن کوردستانێ - لقێ دهۆك کو سالا (٢٠٠٠) ێ هاتییە دامەزراندن و ڕولەکێ هەژی و بەرچاڤ- د بزاڤا هۆنەری ل پاژێرێ دهۆکێ دا هەبوو و ئێکەتیا ئافرەتێن کوردستانێ - لقێ دهۆك و کولیژا ئادابێ بەشێ زمانێ ئینگلیزی- زانکۆیا دهۆك و سەنتەرێ ڕەوشەن ل دهۆکێ و ڕێکخراوا دیاکونیا یا سویدی ل دهۆکێ و سەنتەرێ رزگاری یێ ڕەوشەنبیری و ل دووماهیێکا نیڤا دووێ ژ ڤێ قۆناغێ و بۆ جارا ئێکێ ل باژێرێ دهۆکێ پشکا شانۆیێ ل کولیژا ئادابێ ل زانکویا دهۆك هاتەڤەکرن و سالا خواندنێ (٢٠٠٨- ٢٠٠٩) ێ دەست پێکر[٧٤]، هەژیە بێژین کو ڤەکرنا ڤێ پشکێ بۆ پارێزگەها دهۆکێ پێنگاڤەکا مەزن و هەژی بوو، پشتی چەند سالا ژ دامەزراندنا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان - دهۆك و تا نها ئەڤ پشکە یا بەردەوام و چالاکە د کار و چالاکیێن خۆدا و شیایە د ڤی دەمێ کورت دا و ب هاریکاری و ب پشتەڤانیا مامۆستایان هەژمارەکا شانۆگەریێن ب ڕێك و پێك پێشکێشبکەت، هەر وەسا دانانا ڕێڤەبەریا هۆنەرێ شانۆیێ ل دهۆکێ کو ب سەر ڕێڤەبەریا گشتیا ڕەوشەنبیری و هۆنەری و وەرزش و لاوانە - دهۆکێ سالا (٢٠١٠) ێ کو ڕێڤەبەریەکا ڕێخۆشکەرە بۆ ئەنجامدانا کارێن شانۆیێ و تیپا سوریا و ئاوارێن کوردێن سوریا و ڕێڤەبەریا پەروەردا قەزا سێمێلێ - پشکا چالاکێن خواندنگەها ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤا و تیپا مەمێ ئالا یا شانۆیێ و ناڤەندا بالا دهۆك یا ئێکەتیا لاوێن دیموکراتا کوردستانێ و سەنتەرێ سێمێلێ یێ ڕەوشەنبیری و تیپا سێمیلێ یا هۆنەری و تیپا یەلماز یا شانۆیێ و ڕێکخراوا ئەلند بۆ دیموکراسیکرنا گەنجان و ڕێکخراوا دیاکونیا و ڕێکخراوا نۆژین یا دیموکراسیکرنا خێزانێ و ڕێڤەبەریا گشتیا کار و بارێن شەهید و ئەنفالکریا ل دهۆکێ و تیپا نەورۆز یا شانۆیێ و کۆما دهۆك یا شانۆیا زارۆکان و تیپا دیالۆك یا شانۆیێ ل دهۆکێ - کو ڕولەکێ بەچاڤ-- د شانۆیا دهۆکێ دا و ژ هەمی لایەکی ڤە و ب هاریکاری و ب پالپشتیا وەزارەتا ڕەوشەنبیری یا حکومەتا هەرێما کوردستانێ و ب پشداریا شانۆڤان و دەرچوییێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و پشکا شانۆیێ ل کولیژا ئادابێ ل زانکویا دهۆکێ گێڕایە[٧٥] و نموونەیێن باش یێن دڤێ قۆناغێ دا هاتینە پێشکێشکرن ئەڤ شانۆگەری یە بوون:

**دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ کورتیەك ژ جەنگێ (٢٠٠٠) ێ دهوك**



(بازنا ب کوتەکی)، (کورتیەك ژ جەنگێ)، (ئارمانج)، (ژمارێت بێ نیشان)، (ئێکەتیبا دەیندارێت کوردستانێ)، (دوژمنێ گەل)، (ل دەڤەرێ)، (لیکەریان)، (گوھـ دریژ و هەڤالێن وی)، (لەشەکێ بەرزە)، (الابن الضال)، (طریق المسیحیة)، (کاوەی ئاسنگەر) سالا (٢٠٠٠) ێ، (الملیونێرە و الفقیر) و (قەرەچ)، (قەچاخ)، (ئوتێللو)، (برەهیم زەبۆك)، (شمس الدین و پێنج دین)، (هاریکاری ) سالا (٢٠٠١)ێ، (ئامینا و سەرهاتیبا دەڤێ)، (یاری یا میری و وەزیری)، (ماکبیث)، (زمانێ لەشی)، (دزێ شەڤێ)، (طرطوف)، (میهڤانێت بەرینی)، (زیندانیێ ئازاد)، (مرن دەرگەهێت خو بو مە ڤەدکەت) و (من هو حبیبی)، (سارە و بهنام) سالا (٢٠٠٢) ێ، (هاملێت)، (داستانا دیروکێ)، (ل خوگەریان)، (عجائب یا زمن) سالا (٢٠٠٣) ێ، (ماکبیث)، (نامەیەك بو هەوە)، (ئادارا مەمێ)، (چەرخێ دینا)، (مەلیونیرێن ئەڤرۆ)، (ئازادیبا بێ دەنگ)، (زێمار)، (بست و ئێك)، (سەبدلا)، (کفن)، (سندباد بەری

دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ بەرزەبوون ـ ٢٠٠٥ ـ دهوك



سەفەرێ) سالا ( ٢٠٠٤ )ێ، (تاجر البندقیة)، (دیکلێ بێ وەفا) و (شەڤا شواتێ)، (ئەمین زاروکێن خانی)، (پێشکەفتنا قەرەچا)، (گیفکێ هێژا)، (لافیتە)، (زمان و مرن)، (جنەرال)، (بێهنا سێڤا)، (ئەکتەرێ یاخێبووی)، (بەرزەبوون)، (روندك بەفرێ د حەلینن)، (شەڤەکا شواتێ)، (هەڤالێن وەفادار)، (ئەنجامێ خوونێ)، (سومفونیا چاخێ بیستێ)، (پاقژی سونبلا سەرفەرازی)، (دادوەری)، (خواندنگەهە)، (رۆژ هەلاتا ئازادی) سالا (٢٠٠٥)ێ، (یولیوس قیصر)، (دوزەخانا

دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ کفن (٢٠٠٤)ێ دهوك



دیمەنەک ژ شانوگەریا ـ روندك بەفرێ دحەلینن ـ ٢٠٠٥ ـ دهوك



سنێلی)، (بڤر)، (شەهید)، (نانە)، (چەکچەکیلە)، (زارۆکێ گونەهبار)، (دەرگەهێن گرتی)، (رومیو و جولێت)، (کەرنەڤالا هەلامەتا) (ئەز بەهلولم کی بەر پرسیارە؟)، (پرا دەلال)، (رۆژا رەش)، (نان و ئازادی)، (هاوریەتی)، ( شەهیدی)، (ئەز و بابێ من) سالا (٢٠٠٦)ێ (قابیل)، (تێلەفون)، (خاتین و خزمەتکار)، (شەهیانا بخوین)، (ناما سەرکەفتی)، (قەسپ و هژیر و خەریبی)، (سەیدا)، (قورچەك ژ ئەڤیانوسەکێ)، (دینو)، (پێلانا دزیێ)، (لافیتە)، (مەم عەباسی)، (زارۆك و کار)، (کاوەی ئاسنگەر)، (جەلاد) و (پویشمانی) و (مافێ خویندکار)، (دەولەتا تەیارا) سالا (٢٠٠٧)ێ (زنجیێن سپی)، (مژا ل هزر و هەستا)، (نەخشێ قوپۆی)، (مرن و کچینی)، (هەمی گاڤا و هەتا هەتایێ)، (ئەو زەلامێ خو مشکانەکری)، (چیروکا باپیری)، (رۆژانێت مریەکی)، (سێ گونەهبارێن سیاسی)، (حەمکو د نیڤێدا) و (ژ مافێ مە)، (خواندنگەها رویڤی)، (باب و دایك)، (د قولاچکێن بێزاریێ دا)، (مەولیدەك ل سەر دەمێ تاعونێ) و (کار)، (لالش و خەریبی)، (خێزان د چڤاکی دا)، (تاوانبار)، (زبانا میکروبی)، (شیرەت) سالا (٢٠٠٨)ێ، و (نورا)، (رێیا مەزن)، (باروك)، (ژیان دێ سبەهی دەسپێکەت)، (لێبوك و خودیك)، (لپشت هێلا سۆر)، (چەمێ پاراستی)، (فەنتازیا پێشمەرگەکێ نەدیار)، (بالندە و رویڤی)، (زەنگینێ هێژا) و (دختۆرا سەر دفنا خۆ)، (دەنگێ چیا)، (هاریکاری)، (مارش)، (گوهدانا هەڤالێت خراب)، (شنگال پارچەیەکە ژ کوردستانێ) و (خواندنگەهـە)، (شەمالك) و (فیلێن رویڤی) سالا (٢٠٠٩)ێ (سید)، (الوهم)، (لێبوکێ هاڤی)، (پایز دێ چیت)، (٢٥٠)، (دیوار)، (یاسا گیانەوەرا)، (نهێنیێن گەندەلەکی)، (سندرێلا و بالندێن دارستانێ)، (هەلامەت)، (سێ هەڤال)، (پرانییا ڤالا) و (خاك پارێز) و (لەیلا بویکا کوردا)، (پانوراما ئەنفالا)، (دارستانا گیانەوەرا)، (خواندنگەها ژنا)، (هرچۆك)، (نامەیەك کەسك)، (مێشا هنگڤینی و مرۆڤ)، ( بێ بۆرین) سالا (٢٠١٠)ێ و (مەم و زینا ئەحمەدێ خانێ و ئەم)، (دوایا یاریێ)، (وەغەر د ساتەکێ دا)، (سین و صاد)، (خەونێت کەرێ تەمبەل)، (بەخیل)، (رومیو و چولێت)، (پیرەمێرێ سنێلە)، (بێدەنگیا رەش)، (سندباد و هەڤالێت وی)، (د پەراویزێن بازێری دە)،

(چار وەرز)، (خەونەك)، (خەونا زاروكەكی)، (هەڤالێ سەقایێ)، (دارا خەونا)، (گەشتەك بۆ هەیڤێ)، (سەلكا فێقی و كەسكاتی)، (خەونا سەیدایێ هێژا) سالا (٢٠١١)ێ، (رِك)، (شەڤا كوژەك)، (مەرگەساتا دكتور فاوست)، (رەهنكرنا خانما -س -)، (دادگەه)، (سموم)، (مارس)، (عەشتار)، (قابیل و هابیل)، (خەونێن بێ هیڤی)، (چیایێ پیساتیێ)، (مرن بۆ وەلات)، (شەڤا كوژەك)، (هەژار و بازرگانێ قەلس)، (ریا مەزن)، (ئەڤ چەرخە)، (نامەیەك بۆ بابێ من)، (دەمێ ڤالا)، (لێبوك هەتا هەتایێ) و (هەڤالێ هەڤالینیێ) سالا (٢٠١٢)ێ، (كۆمارا مەلكا)، (جەنەرالێ لەشكەرێ مری)، (دیالۆكا بێ دەنگ)، (دیوار)، (بۆچی مر؟)، (هرچ)، (ژوورا ژمارە شەش)، (شەڤ و سەرژێكەر)، (مێهڤانێ بەری)، (مالا بەرنادا ئەلبایێ)، (پێنوس و ژێبركی)، (دوماهیا ریڤیێ فێلباز)، (دزیكەران)، (ئەو زەلامێ بوویە سە)، (زێرەڤانێ كورسیكا شكەستی)، (دلەكێ بەرزە)، (دادوەرێ بەردانێ)، (دارستانا چویچك)، (پاراستن چێترە ژ چارەسەریێ) سالا (٢٠١٣) ێ[٧٦].

ئەگەر ئەم بەرێ خۆبدەینە ڤێ بزاڤا خورت و وان كارێن د ڤێ قوناغێ دا هاتینە پێشكێشكرن، دێ بۆ مە دیار بیت كو گشت لایەنا هاریكاری و پشتەڤانی ژ بۆ پێشڤەبرنا شانۆیێ كریە و ئەڤە ژی د زڤریتەڤە بارێ سیاسییێ خۆش و ئارام ل دەڤەرێ و نەبوونا چ سانسور و كڤاشتنا ل سەر دەق و ناڤەرۆك و تیپ و گرۆپ ونڤیسەر و دەرهێنەران، یان كو هەمی لایەنا ئازادانە كارێ خو ئەنجامددان.

سەبارەت بسپۆریا شانۆیێ دڤێ قوناغێ دا، دێ بینین كو بەهرا پتر ژ كارێن هاتینە ئەنجام دان، ژ لایێ بسپۆرێن شانۆیێ ڤە بووینە، كو دەرچوویێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و پشكا شانۆیێ ل كولیژا ئادابێ بووینە، دڤێت ژ بیر نەكەین كو دڤێ قوناغێ ئافرەتێ پتر ژ هەمی قوناغێن دی رۆلێ خۆ د شانۆیێ دا وەك ئەكتەر و نڤیسەر و دەرهێنەر دیتییە.

ژ لایێ دابینكرنا هۆلێن شانۆیێ ڤە، ب من وەرە گەلەك بۆ نەهاتییە كرن و گەلەك كێم و كاسی و كێم خەمی ل دهۆكێ هەبوویە، لێ ل بازێرێن ئاكرێ و ئامێدیێ و زاخۆ پێنگاڤێن باش ژ لایێ نووژەنكرن و ئاڤاكرنا هۆلا هاتینە هاڤێتن و یا ژ هەمییا باشتر د ڤێ قوناغێ دا ژی ئەوە كو كارێن هۆنەری یێن شانۆگەریا د ئاستەكێ باش دا بوویە، وەك ب كارئینان (دیكور - جل و بەرگ - رۆناهی - میكیاژ - ئێكسسوار - دەنگ و موزیكە و....هتد ). ب ڤێ چەندێ گەلەك ئەو كارێن هاتینە ئەنجام دان د ئاستەكێ باش دا بوون و مرۆڤ دشێت بێژیت كو ساخلەتێن داهێنانێ ژ لایێ - نڤیسین - دەرهێنان ژ گەلەكا د گرت - لێ دێ زڤرم و بێژم ژ ئالێ رەخنەیا شانۆیێ ڤە ل دهۆكێ چ پێنگاڤێن باش نەهاتینە هاڤێتن و ئەڤە دەرحەقی شانۆیێ د بیتە لاوازییەك و ئەوا هاتییە كرن و نڤیسین، نابینم كو كەتبیتە د ئاستێ رەخنێ دا، چونكی هەمی ب تنێ بۆچوونن و د میزاجی نە و ل سەر چ بنەمایێن زانستی نینن، تا وێ رادێ كو دڤێ خانێ دا رەخنە بوویە هەڤركییەك دوو قولی - ڤیان و نەڤیان و ب تەرازیەكا نە راست و دروست رەخنە دهێنە كرن و پەیوەندی و هەڤالینیێ كارتێكرنا خۆ ل سەر رەخنێ ل دهۆكێ هەبوویە، لەوما ژی دێ بینین كو نڤیسینێن رەخنەیی د كۆڤار و رۆژنامەیان دا د كێمن و ئەو كتا هەی ژی د لەنگ و لاوازن.

بینەر ل ڤێ قوناغێ ژی نە د ئاستێ پێدڤی دا بوو، ژ بەر بەهرا پتر شانۆگەری ب تنێ ئێك یان دو رۆژا هاتینە پێشكێشكرن.

ل بازێرێن ئاكرێ و ئامێدیێ و زاخۆ، بزاڤا شانۆیێ یا بەردەوامە و ب مەرەما خورتكرنا بزاڤا شانۆیێ ل دەڤەرێ ل هەر بازێرەكی گرۆپەكێ شانۆییێ یێ دەستویردای ب شێوەكێ فەرمی ژ لایێ رێڤەبەریا گشتیا رەوشەنبیری و هۆنەری - دهۆك هاتینە دامەزراندن. و دانانا رێڤەبەرێن رەوشەنبیری و هۆنەری ل (ئاكرێ و ئامێدیێ و زاخۆ و شێخان و بەردەرەش و سێمێلێ) رۆلەكێ بەر چاڤ- هەبوویە.

دڤێت ژ بیر نەكەین كو پشتی دەرچوێێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان - پشكا شانۆیێ ل

**دیمەنەك ژ شانوگەریا ـ گوندەك و گوندورەك ـ ٢٠٠٢ ـ ئاكرێ**



دهۆكێ وەك مامۆستا ل خواندنگەهان هاتینە دامەزراندن، رۆلەكێ باش و بەرچاڤ ل دهۆكێ دیتینە، ب تایبەت ل رێڤەبەریێن پەروەردێن قەزایا - پشكێن چالاكیێن خواندنگەهەیا. و تا نها و ب هاریكاریا ڤان مامۆستایان شیاینە بەردەوامیێ ب شانۆیێ بدەن - و ئەڤ شانۆگەریێن ل خوارێ دیاركری نموونەیێن باشن ژ كارێن ل باژێرێ ئاكرێ دڤێ قوناغێ دا هاتینە پێشكێشكرن:

(گوندەك و گوندۆرەك) سالا (٢٠٠٢)ێ، (میرێ كەلێ)، (رۆژا زارۆكان)، (ئالا) سالا (٢٠٠٥)ێ، (ئاگر)، (هاڤیبوون) سالا (٢٠٠٦) ێ، (هۆڤێ چەرخی)، (هاریكاری)، (تاوان)، (گاڤا یاریا) سالا (٢٠٠٧)ێ، (گورگ و ئاڤ)، (پیلان) سالا (٢٠٠٨)ێ، (كەچەلۆك)، (دەرگەهـ)، (ئیمزا كەسك) سالا (٢٠٠٩)ێ، (مێشكێ ڤالا) و (رێڤینێ پاشا) سالا (٢٠١٠)ێ، (وانا هونەری) سالا (٢٠١٢)ێ، (ئاگر) سالا (٢٠١٣)ێ[٧٧].

ل باژێرێ ئامێدیێ ژی د ڤێ قوناغێ دا بزاڤا شانۆیێ ب بەشداریا رێڤەبەریا پەروەردا ئامێدیێ - پشكا چالاكیێن خواندنگەها و تیپا سەرسنگ یا هونەری و رێكخراوا زێرین یا هشیاركرنا جڤاكی خورت بوو و نموونەیێن وان كارێن باشن یێن كو هاتینە پێشكێشكرن شانۆگەریێن: (مالەك هەمە رەنگ) سالا (٢٠٠٥) ێ، (دەم) سالا (٢٠٠٦)ێ، (راستیەك ژ خەونێ)، (دەرگەهێن گرتی)، (بار و برا) سالا (٢٠٠٧)ێ، (شەڤ چەندا تاری بیت نەشێت روناهی یا شەمالكەكێ ڤەشێریت)، (ئەڤینا لال) سالا (٢٠٠٨)ێ، (دابچینە ژیانێ)، (زەنگ و بەنگ)، (بریار) سالا (٢٠٠٩)ێ و (دارستانا هیڤیا)، (دێ پێكڤە كار كەین بۆ پاشە رۆژێ) سالا (٢٠١٠) ێ، (فیلویێ تەمبەل) سالا (٢٠١١)ێ، (دارا من) سالا (٢٠١٢)ێ، و (پەرلەمانێ زارویان) سالا (٢٠١٣)ێ[٧٨].

هەر وەسا باژێرێ زاخۆ ژی بزاڤا شانۆیێ د ڤێ قوناغێ دا ژ هەمی قوناغێن دی تر باشتر و ب رەوش و پێشكەفتی تر بوو و ب پلەكا بلند تر هاتە پێش و هاریكاری و پشتەڤانییەكا باش ژ لایێ رێڤەبەریا هونەرێ شانۆیێ ل دهۆكێ ژ بۆ ئەنجامدانا كارێن شانۆیێ دهاتەكرن و ئەڤێن ل خوارێ دیاركری نموونەیێن باشن ژ وان شانۆگەریا:

(دختورێ رۆژێ) سالا (٢٠٠١) ێ، (خێزانا بێ سەری) سالا (٢٠٠٢)ێ، (شەمالك فرۆش)، (پرا دەلال) سالا (٢٠٠٥)ێ و (خویندكار زانایە)، (هونەر و ژیان) سالا (٢٠٠٦)ێ، (پەشیمان) سالا (٢٠٠٧) ێ، (ئەم كوردستانی نە) و (زیندومان) سالا (٢٠٠٨)ێ و (جیهانا مریا)، (زانست د سەر هەمی ئاستەنگا رایە)، (تاجر البندقیە)، (زڤرینا زەلامێ غەوارە نەبووی) سالا (٢٠٠٩)ێ، (دەرەو و پەشیمان)، (دەمێن ئازاری) سالا (٢٠١٠)ێ و (پاپۆرا رێزگار بوونێ)، (خواندنگەها مامێ رویڤی)، (ئاڤا بوونا ستێرا مزگینیا هەلاتنا رۆژێ یە) سالا (٢٠١١) ێ، (پەرلەمانێ كوردستانێ) سالا (٢٠١٢) ێ، (دووماهیێكا هەر سەرداچوویەكی) سالا (٢٠١٣) ێ[٧٩]، ب شێوەكێ گشتی مرۆڤ دشێت بێژیت كو شانۆگەریێن دڤێ قوناغێ دا هاتینە پێشكێشكرن د گەل هەبوونا هندەك كێماسییا د رێك و پێك و د ئاستێ پێدڤی دا بووینە. ب كورتی ناڤێن گەلەك نڤیسەر و دەرهێنەرو بەشداربوویێن وان و شانۆگەریا دیار نەكرینە*.

سەبارەت دەڤەرێن ڤەقەتیای ئەوێن د كەڤنە سەر توخیبێ كوردستانێ دگەل توخیبێ عیراقێ و د نەخشەیێن كوردستانێ دا د دیارن، ئەڤ دەڤەرە هاتینە ڤەقەتاندن و دابرین ژ كوردستانێ وەك یەكەیێن ئیداری

و ب هندەك پارێزگەهێن دی ڤە هاتینە گرێدان وەك سیستەمێ ئیداری و هەول و بزاڤ هاتینە كرن ژ لایێ رژێما بەعس ڤە كو خەلكێ ڤان دەڤەرا دەربدەر بكەن و خەلكەكێ دی بینتە جهێ وان و دەڤەرێن هاتینە ڤەقەتاندن ژ پارێزگەها دهۆكێ (شنگال - شێخان - تلكێف) دگەل سنوورێن دەور و بەرێن وان[80].

ب راستی پێزانین دەربارەی مێژوویا شانۆیێ ل ڤان دەڤەرا ل بەر دەستێ مە گەلەك د كێمن، مێژوویا شانۆیێ ئەوا ل بەر دەست ل ڤان دەڤەرا ئەڤا ل بەر دەست هندەكە ژ وێ بزاڤێ یا كو ئەم شیاین كۆم بكەین:

ئەڤە و ئەو كارێن هاتینە ئەنجام دان ل دەڤەرێن كوردستانیێن دەرڤەی هەرێمێ كو پشتی سالا (٢٠٠٣) ێ دەستێ پشتەڤانیا هەرێما كوردستانێ گەهشتییە وان جهان و رێڤەبەریێن پەروەردێ و پشكێن چالاكیێن خواندنگەهان لێ هاتینەڤەكرن دێ هندەك ژ چالاكیێن وان د ڤی وارێدا بەرچاڤكەین وەك شانۆگەریێن:

(كاوەی ئاسنگەر) سالا (٢٠٠٠)ێ، (خواندنگەهە) ێ سالا (٢٠٠٥)ێ، (هاوریەتی) سالا (٢٠٠٦)ێ، (پویشمانی) سالا (٢٠٠٧) ێ، (كار)، (لالش و غەریبی)، (خێزان د چڤاكی دا) سالا (٢٠٠٨)ێ و (گوهدانا هەڤالێن خراب)، (شنگال پارچەیەكە ژ كوردستانێ) سالا (٢٠٠٩)ێ، (هرچوك) سالا (٢٠١٠)ێ، (هەڤالێ سەقابێ) سالا (٢٠١١) ێ و (ژین و ژینگەهـ) سالا (٢٠١٢)ێ، (هەڤالێن فێقی و زەرزەواتی) سالا (٢٠١٣)ێ ئەڤە ل شێخان و ل بەردەرەش شانۆگەریێن - (تاوان) سالا (٢٠٠٨)ێ، (خواندنگەهە) سالا (٢٠٠٩)ێ، (نامەیەكا كەسك) سالا (٢٠١٠)ێ، (دارا خەونا) سالا (٢٠١١)ێ، (مشكێ هەژار)، (جەستەی زامدار و ناخی نارەزایی)، (عەیشو) سالا (٢٠١٢)ێ، (كێڤریشكا ژێر)، (یادا هەلەبچە شەهید) سالا (٢٠١٣)ێ ل تلكێفێ ژی ئەڤ شانۆگەری یە هاتنە پێشكێش كرن (شەهیدی) سالا (٢٠٠٦)ێ، (مافێ خویندكار) سالا (٢٠٠٧)ێ، (زیانا میكروبی) سالا (٢٠٠٨)ێ و (شەمالك) سالا (٢٠٠٩)ێ، (مێشا هنگڤینی و مرۆڤ) سالا (٢٠١٠)ێ، (گەشتەك بو هەیڤێ) سالا (٢٠١١)ێ، (دژبانێ دا هیڤی دمینیت) سالا (٢٠١٢)ێ، (وەرن دا رۆژەكێ ل ناف كۆمپیوتەری ببەین) سالا (٢٠١٣)ێ، ئەڤە هندەك نمونێن باش ژ شانۆگەرێن ل شنگالێ هاتینە پێشكێشكرن (رۆژهەلاتا ئازادی) سالا (٢٠٠٥)ێ، (ئەز و بابێ من) سالا (٢٠٠٦)ێ، (دەولەتا تەیارا) سالا (٢٠٠٧)ێ، (شیرەت) سالا (٢٠٠٨) ێ، (فیلێن رویڤی) سالا (٢٠٠٩)ێ، (لێ بۆرین) سالا (٢٠١٠)ێ، (سەلكا فێقی و كەسكاتی) سالا (٢٠١١)ێ، (دابر) سالا (٢٠١٢)ێ، (شڤانێ ژێر) سالا (٢٠١٣)ێ[81].

هەر وەكی دیار بووی كو پێزانین دەربارەی شانۆیێ ل ڤان دەڤەرا گەلەك د كێمن چونكی ئەڤ دەڤەرە لژێر دەست هەلاتا رژێمێ ڤە بوون و گڤاشتنەكا زێدە و بێ قام ل سەر هەمی وان جۆرە چالاكیا هەبوون و هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ لاواز بوونا شانۆیێ و كێم كاران .

ل دووماهیێكا ڤێ خواندنا كورت بۆ مە دیاردبیت كو شانۆ ل دهۆكێ و دەور و بەرا قۆناغ بۆ قۆناغێ ب شێوەیەكێ سرۆشتی بەردەوامی پێ هاتییەدان، ل هەر قۆناغەكێ بزاڤا شانۆیێ ب شێوەیەكی هاتییە پێش و هەر قۆناغەكێ جیاوازی دگەل قۆناغا دی هەبوویە، ژ لایێ خورت بوونێ و لەنگ ولاوازیێ و هاریكاریێ و پالپشتیێ ڤە و ل دووڤ سەر و بەرێ دەڤەرێ. هەژییە ئاماژەی پێ بدەین كو شانۆیا دهۆكێ ل سەر ئاستێ عیراقێ و دەڤەرا ئوتۆنۆمی (بەری سەرهلدانا ١٩٩١ێ) و هەرێما كوردستانێ خەلاتێن باش و هەژی ل ڤیستەڤال و بەریكانەیێن شانۆیێ ب دەست خو ڤە ئینانینە و ئەوا ئەڤرۆ ئەم ل دهۆكێ و دەور و بەرا دبینین و هەبوونا تیپ و گرۆپێن شانویێ و هۆنەری و پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و پشكا شانۆیێ ل كولیژا ئادابێ ل زانكۆیا دهۆك و رێڤەبەریا هۆنەرێ شانۆیێ ل دهۆكێ و خودان باوەرنامەیێن شانۆیێ و دەرهێنەر و نڤیسەر و شەهرەزایێن شانویێ و شێوە و شێوازێن كاركرنێ و پشتەڤانیێ و هاریكاریێ ژ هەبوون و بەردەوامییا قۆناغ و خەبات و دەسپێكێ بوویە و ل دووڤ خواندنێ و پێشڤەچوونا مللەتی و د گەل گوهورینا جیهانی دا بوویە.

# مێژووا هۆنەرێ مۆزیکێ ل پارێزگەها دهۆکێ

خەتاب محەمەد ئیسلام ئەرتووشی

## بەراهی

- مۆزیك خۆدیکا مللەتانە و هەر مللەتەکێ موزیك تێدا نە بیت گەلەك جارا ب مللەتێن مری دهێنە ل قەلەمدان، مۆزیك ئێش و ئازارێن مللەتان پێش چاڤ دکەت و هەستا نەتەوایەتی و مرۆڤایەتیێ ب هەردو لایاڤە(مەرگەسات، بەزمەسات) ڤە ل دەڤ مرۆڤی هشیار دکەت. مۆزیك مرۆڤی بەرەڤ راستیێ دبەت و راستگۆییێ دکەتە د دلێ مەدا، مۆزیکێ دیرۆکەکا کەڤن هەیە، دەسپێکا وێ دگەهیتە دەسپێکا ئاکنجیبوونا مرۆڤی و گەلەك جارا ڤەدگەریتە سەردەمێ پەیدابوونا مرۆڤی.
مللەتێ کورد ژوان مللەتێن ناڤدارە کو گیانەکێ مۆزیکێ ل دەڤ هەی و دیرۆك و فلکلۆرێ کوردی باشترین بەلگەیێ بوونا مۆزیکێیە ل دەڤ کەسێ کورد، لەورا مللەتێ کورد گرنکییەکا مەزن دایە خویندنا ڤی جۆرە هۆنەری وەکو زانست[1].

## هۆنەرێ مۆزیکێ ل باشوورێ کوردستانێ ب گشتی

کورد مللەتەکێ کەڤنە و هەر ب درێژیا دیرۆکا خۆ وەکی هەمی مللەتێن جیهانێ پیتە دایە بیاڤێن جڤاکی چ رەوشەنبیری چ هۆنەری بیت، هۆنەر ژی ئێك ژوان بیاڤێن گرنگ بوو کو کوردا پیتەکێ مەزن د دایێ ب تایبەتی سترانا کوردی نەخاسمە سترانێن کۆچك و دیوانا و سترانێن کارکرنێ( دورینێ، چلی برێ، مازی چنینێ، دستار هێرانێ، داوەتا......هتد).
چالاکیێن مۆزیکێ ژی ب رەنگەکێ گشتی ل کوردستانێ ل سالێن سیهادا دەسپێکریە دەمێ کەسانێن رەوشەنبیر خەلکەك هاندا کو بۆ گێرانا هندەك چالاکیێن هۆنەری ل مالان کۆمبن، ئەڤ کارە بەردەوام بوو هەتا سالێن چلا، ل سالا(١٩٤٧) ێ خۆلەکا مۆزیکێ ل سلێمانیێ هاتە ڤەکرن و مۆزیکزانێن وی سەردەمی ژ بەغدا هاتن و گەلەك رەوشەنبیرێن کورد ژی پشکداری تێدا کر، ژوانا:- قادر دیلان و شەمال سائیب، چالاکیێن مۆزیکێ دبەردەوام بوون هەتا سالێن پێنجیان و ژ بەر پێشڤەچوونا ڤی هۆنەری و گرنگی دانا خەلکی ئەو بوو تیپەکا مۆزیکێ ل بازێرێ سلێمانیێ ب ناڤێ تیپا (مەولەوی) ب رێبەریا هۆنەرمەند(قادر دیلان) هاتە دامەزراندن، ئەڤێ تیپێ رۆلەکێ باش دگێرا و گرنگی د دا مۆزیکێ و سالا(١٩٥٥)ێ ب رەنگەکی فەرمی هاتە دامەزراندن.
هەر چەندە تیپا(مەولەوی) دوی ئاستیدا نەبوو بەلێ بۆ وی سەردەمی تشتەکێ مەزن و مفادار بوو و شیا چاڤێ خەلکی ڤەکەت و خەلکەکی ل خۆ کۆم کەت[2].

پشتی ١٤ێ تیرمەها ساڵا(١٩٥٨)ێ جۆرەكێ ئازادییێ پەیدا بوو، و دڤێ قۆناغێدا رێكخوشكرنەك ل بەر رەوشەنبیری و هۆنەرێ كوردی ڤەبوو. د ئەنجامدا چالاكیێن مۆزیكێ ژی بەرەف پێش چوون ب تایبەتی چالاكیێن تیپا موزیكا (مەولەوی) كو تاكە تیپ بوو دوی سەردەمیدا ل كوردستانێ، هەر چەندە ژیێ ڤێ تیپێ یێ كورت بوو بەلێ شیا رۆلەكێ مەزن ب گێریت و خزمەتا هۆنەرێ مۆزیكێ بكەت[٣]. هەروەسا ل بازێرێ هەولێرێ ژی تیپەك بناڤێ (دەرسیم) هەبوو ئەڤێ تیپێ ل١٠/٩/١٩٥٩ێ ئاهەنگەك ل (شەقلاوە) گێرا ب سەرپەرشتیا (م.جەمال هیدایەت) كو ئێكەم كەس بوو ل هەولێرێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ب داوی ئینای پشتی كو ل ئەیلوولا ساڵا ١٩٦١ێ شۆرشا مەزنا كوردستانێ هەلبووی لاوازییەك كەتە گەلەك بیاڤێن رەوشەنبیری ژوان هۆنەرێ مۆزیكێ كو چالاكیێن وێ گەلەك كێم بوون و تنێ مانە سەر وان چالاكیان ئەوێن هندەك هۆنەرمەندا ل مالان دگێران[٤].

ل ساڵا (١٩٦٣)ێ ل قوتابخانا مامۆستایان ل سلێمانیێ كۆمەكا گەنجا خودا دگەل ئێك و ب سەرپەرشتیا(ولیەم یوحەنا) گرۆپەكا مۆزیكێ دروست كر بناڤێ(تیپا مۆزیكا سلێمانیێ).

پاشان پشتی ساڵا شێست و شەشێ هندەك هۆنەرمەندێن گەنج هاتنە پێش كو ئێك ژوان هۆنەرمەندێ بناڤ و دەنگ (ئەنوەر قەرەداغی) بوو و شیا ل ٢٣/٢/١٩٦٧ێ تیپەكا مۆزیكێ هەر بناڤێ (تیپا مۆزیكا سلێمانیێ) پێكبینین وناڤبری وەك سەرۆكێ لیژنەیا پێكئینانا ڤێ تیپێ بوو. ئەڤێ تیپێ دەست ب بزاڤ و چالاكیێن مۆزیكێ كر و گەلەك پێش كەفت و بەرهەمێن وێ ل رادیۆ و تێلەفزیۆنێ هاتنە بەلاڤكرن[٥].

ل ٢٣/٥/١٩٦٧ێ (تیپا مۆزیكا رەشید) ب سەرپەرشتیا (حەقی شوبلی) دەمێ سەرا سلێمانیێ دا و ئەڤان گەنجان دگەل وێ تیپێ هندەك كارێن مۆزیكێ پێشكێش كرن بناڤێ(تیپا مۆزیكا سلێمانیێ).

هەروەسان دساڵێن شێستا دا ل بازێرێ كەركووكێ تیپەكا مۆزیكێ بناڤێ(سۆلاڤ) هەبوو كو سەر ب یانەیا سۆلڤ یا وەرزشی بوو، ل بەراهیێ(شەوكەت رەشید) ی سەرپەرشتیا وێ دكر پاش(قادر مەردان) و (رەمەزان زامدار) و (محەمەد رەزا)[٦].

دیسان ل بازێرێ هەولێر و دهۆكێ ژی چەند كەسان خۆ دگەهاندە ئێك بۆ ئەنجامدانا چەند چالاكیێن مۆزیكێ گرۆپێن بچویك پێك دئینان، ئارمانجا هەمیان ژی خزمەتا هۆنەرێ كوردی بوو بەرامبەر رژێما وی سەردەمی كو دڤیا كوردا بنبركەت بەلێ وان گەنجا ب هۆنەرێ خویێ سادە و سڤك شیان بسەلمینن كو كورد هەر دزیندینە و چ جارا ژناڤ ناچن[٧].

پاش ل ساڵا(١٩٦٩)ێ تیپەكا مۆزیكا (كۆمەڵ هۆنەرێن جوان) ل سلێمانیێ پەیدابووی، ئەڤ تیپە ب سەرپەرشتیا(نامدار قەرەداغی) و (شەوكەت رەشید) بوو. هەر دناڤ ڤێ كۆمەلێدا تیپەكا نوی یا (مۆزیكا مەولەوی) هاتە پێكئینان[٨].

ل وی سەردەمی رەوشەنبیریا عەرەبی ل سەر كوردا یا زاڵ بوو، ژ بەرهندێ كارێن وان گرۆپێن مۆزیكا تامەكا مۆزیكا عەرەبی د دا، بەلێ ژناڤەرۆكێڤە تامەكا كوردی تێدا بوو، هەر چەندە دوی ئاستیدا نەبوون بەلێ بۆ وی سەردەمی گەلەك بوو و مفا ژ فۆلكلۆرێ كوردی وەردگرت. گەلەك جارا دگەل سترانبێژا دا كەسەكێ وەسا نەبوو كو بشێت مۆزیكێ دانیت، ئەڤجا پەنا دبرە پێشەكیا مۆزیكا سترانێن(ئۆم كەلسوم)ێ كو دگەل سترانبێژا مەقاما بێژن ئێك ژوان خودێ ژێ رازی(محەمەد سالح دیلان) بوو. پشتی هینگی بزاڤ هاتنەكرن كو ئاوازێن ب ساناهی بێنە دانان و هۆنەرمەندان (قادر دیلان و ولیەم یوحەنا و نەجاتی عەبدە) كار بۆ وێ چەندێ كر[٩].

هەر دساڵێن شێستاندا چەند كەسەك ل بازێرێ دهۆكێ هەبوون وەك بەهرەمەندی بۆ دلێ خو ئامیرێن مۆزیكێ دژەنین ژوان(عەزیز عزره) ڤایۆلین ژەن بوو، (سەعدە ددین) عود ژەن بوو، هەكە هندەك كەسێن دی هەبان هەر بۆ خۆشی و دلێ خو مۆزیك دژەنین، بەلێ ل وی سەردەمی چ گرۆپێن مۆزیكێ نەبوون ئاماژە پێ بدەین[١٠].

پشتی پێكهاتنا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠ێ ب مەرەما ئەنجامدانا چەند چالاكیێن مۆزیكێ هندەك گرۆپێن مۆزیكێ یێن بچویك دناف رێكخراوێن دیموكراتیدا وەك ئێكەتییا قوتابیان و ئێكەتییا ئافرەتان ل بازێرێ سلێمانیێ هاتنە پێكئینان و تیپا مۆزیكا سلێمانیێ سەرپەرشتییا كارێن وان دكر. هەروەسا ل بازێرێ هەولێرێ ژی(تیپا هۆنەریا هەولێر) ل (١٩٧١/٢/١)ێ هاتە دامەزراندن[١١].

ئەڤ تیپە ل سالێن پێنجیباندا بناڤێ(تیپا دەرسیم) دهاتە نیاسین. ناڤێ (تیپا دەرسیم) بۆ (تیپا هۆنەریا هەولێر)ێ هاتە گوهارتن دا مۆلەتا فەرمی وەرگریت و بۆ ئێكەم جار(م. سەردار ئەحمەد عەبدوللا) كو ل وی دەمی ناڤدار بوو ب(سەرداری باب سەردار) سەرپەرشتییا ڤێ تیپێ دكر، پشتی(م. سەردار) بۆ بازێركێ كۆیە هاتییە ڤەگوهاستن، (م. جەمال هیدایەت) و (مونعیم مەزهەر) ژەنیارێ ڤایۆلینێ سەرپەرشتییا ڤێ تیپێ كر[١٢].

دووڤدا و ل سالا(١٩٧٥- ١٩٨٤)ێ (م. وریا ئەحمەد) سەرپەرشتییا ڤێ تیپێ كر و پێشڤەبر و دەولەمەند كر، هەر ل وی دەمی و ل سالا(١٩٧٦)ێ تیپەكا زارۆكا پێكئینا بۆ هندێ دا زارۆكێن كورد فێری مۆزیكێ بكەت و ئێش و ئازارێن مللەتێ كورد ل وی دەمی برەڤینیت، (م. وریا ئەحمەد) ئەڤ كارە ب خەم وەرگرت و وەك قوتابخانەكا مۆزیكێ لێ كر، بۆ وێ چەندێ چەند مامۆستایەك داخوازكرن دا زارۆكان فێری ژەنینا ئامیرێن مۆزیكێ بكەن، ب هەلكەفتنا رۆژا موزیكا جیهانی(١/١٠) ئاهەنگەك گێرا. ئەڤ خواندنگەهە گەلەك پێشكەفت و بۆ جهێ پۆیتە دانەكا مەزن هەتا وەلێهاتی كو مینا پەیمانگەهەكا مۆزیكێ بیت و وانە یێن مۆزیكێ لێ دهاتنە خواندن وەك:- (سۆلفێج و پراكتیكی و تیۆری......هتد) بۆ دەمێ سالەكێ زارۆك ل ڤێ خواندنگەهێ فێری هۆنەرێ مۆزیكێ بوون. ل سالا(١٩٧٧- ١٩٨٠)ێ ئەڤ تیپە یا ئێكێ بوو ل سەر ئاستێ عیراقێ[١٣].

ل سالا(١٩٧٢)ێ ل بازێركێ(كۆیە) (تیپا مۆزیكا باوەجی) هاتە پێكئینان و تیپەكا چالاك بوو ل بەراهیێ (م. باكۆری) سەرپەرشتییا وێ دكر، پاشی لدووڤدا(م. زاهر محەمەد مەردان) و (م. سەردار ئەحمەد) و (م. وریا ئەحمەد) و (م. مەلا ئەنوەر تاهر) سەرپەرشتییا وێ دكر. پاشی(م. وریا ئەحمەد) هزرا پێكئینانا تیپەكا مۆزیكێ كر، بۆ وێ چەندێ هژمارەكا مۆزیكژەنا ل هەولێرێ و دەوروبەرێن وێ كۆمكرن و تیپەك ژێ پێكئینا، كارێن ڤێ تیپێ د جوان و بەرچاڤ بوون[١٤].

ل سالا(١٩٧٠)ێ تیپەكا مۆزیكێ بناڤێ ١١ێ ئادارێ ل بازێرێ دهۆكێ هاتە پێك ئینان و ئەندامێن وێ ژڤان مۆزیكژەنا (م. شێرزاد محەمەد سەعید، م. دلشاد محەمەد سەعید، م. یاقو شەمعون زەیە،م. ئیسماعیل عەبدولقادر سەبری((زیرەك))،م. جەمیل ئیبراهیم عیسا،م. هەڤال هاشم عەقراوی،.....هتد) پێكدهات[١٥].

دیسان ل سالا(١٩٧٣)ێ تیپەكا مۆزیكێ بناڤێ تیپا(دلمان) هاتەدانان هۆنەرمەند (محەمەد تەیب تاهر) سەرپەرشتییا وێ دكر و ژ مۆزیكژەنا (م. عەبدولعەزیز سلێمان، م. وەلید خالد، م. سەباح زاخۆیی، تەحلو محەمەد خۆشان، ئەحمەد سالح، عەبدوللا حاجی، عزەددین تەمو.....هتد) پێكدهات ئەڤ تیپە یا بەردەوام بوو هەتا سالا(١٩٧٩)ێ، ڤان هەردو تیپان گەلەك چالاكیێن هۆنەری ل دەڤەرا دهۆكێ گێران و خزمەتەكا باش بۆ ستران و فلكلۆرێ كوردی كر ل وی دەمی[١٦].

ل زاخۆ ژی سالا(١٩٧٠)ێ تیپەكا مۆزیكێ بناڤێ(نەورۆز) هاتە پێكئینان و ژ مۆزیكژەن (م. عەبدولعەزیز سلێمان، م. سەمیر زاخۆیی، سەباح زاخۆیی، غایب عەبدولهادی، حەمید عەبدولهادی، موسەدەق ئیسماعیل، موشێ پۆلس.....هتد) پێكهاتبوو، ئەڤێ تیپێ كارەكێ هۆنەری یێ بەرچاڤ پێشكێشی خەلكێ دەڤەرا زاخۆ ب تایبەتی و دهۆكێ ب گشتی كر و رۆلەكێ باش بۆ پێشڤەبرنا هۆنەر و مۆزیكا كوردی گێرا[١٧].

ل سالا(١٩٧٧)ێ بۆ جارا ئێكێ و ژ هزر و بیرێن مۆزیكڤان(م. وەلید خالد) خۆلەكا مۆزیكێ بۆ

هژمارەکا گەنجان هاتەڤەکرن و تێدا هەر(م. وەلید خالد) وانەیێن مۆزیکێ دگۆتن[18].

ل ســالا(١٩٧٣)ێ (تیپا مۆزیکا سلێمانیێ) برەنگەکێ فەرمی هاتە دامەزراندن و ل سالا(١٩٧٤) ێ ئێکەمین ڤیستەڤالا هونەرێ کوردی هاتە گێران و پتریا هونەرمەندێن کوردستانێ ژ سترانبێژ و مۆزیکژەن و مۆزیکڤان پشکداری تێدا کر و (تیپا مۆزیکا سلێمانیێ) پلەیا (نایاب) دەستخوڤە ئینا[19].

دگەل دەسپێکرنەڤا شەری ل ئادارا ١٩٧٤ێ د ناڤبەرا حکومەتا عیراقێ و شۆرشا کوردستانێ پتریا هونەرمەندێن کوردستانێ گەهشتنە شۆرشا کوردستانێ و د ناڤ شۆرشێدا ئەو هونەرمەند شیان تیپەکا مۆزیکێ بناڤێ(تیپا مۆزیکا شۆرش) پێکبینن و دناڤ شۆرشێدا چەندین چالاکیێن هونەری ب بزاڤ و خەباتا مللەتێ کورد پێشکێشکرن و ئەڤ چالاکییە هەتا نسکویا شۆرشێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ بەردەوامبوون، پشتی نسکویێ ئەڤ تیپە هاتنە هەلوەشاندن و ئەندامێن وان بەلاڤەبوون[20].

ل سالا(١٩٨٠)ێ پەیمانگەها هونەرێن جوان ل باژێرێ سلێمانیێ هاتە دامەزراندن ئەڤێ پەیمانگەهێ رۆلەکێ مەزن گێرا دخزمەتکرنا مۆزیکا کوردی و شیا وان هونەرێن جوان ئەوێن کوردستانێ هەین همبێز بکەت[21].

هەر دوێ سالێدا(م. وریا ئەحمەد) تیپەکا مۆزیکێ بناڤێ(خانزادا کچان) پێکئینا، ئەڤ تیپە یا بەردەوام بوو هەتا(١٩٨٤)ێ دڤێ تیپێدا بتنێ کچان ئامیرێن مۆزیکێ دژەنین و ستران گۆتن[22].

ل سالا(١٩٧٩)ێ تیپا (کۆراڵ و مۆزیکێ) ل باژێرێ دهۆکێ هاتە دامەزراندن، ئەڤ تیپە سەر ب چالاکیێن قوتابخانا یا بسەر رێڤەبەریا گشتیا پەروەردا دهۆکێ ڤە بوو، ئەڤ تیپە ژ گەنجێن(کور و کچ) پێکهاتبوو، ل سالا(١٩٨٠)ێ پشکداری دڤیستەڤالا هەولێرێ دا کر و پلا ئێکێ دەستخوڤە ئینا و ئەڤ تیپە هەتا رۆژا ئەڤرۆ یا بەردەوامە، بەلێ سال بۆ سالێ هندەك بەهرەمەند و گەنجێن خوین گەرم دهێنە ناڤ رێزێن ڤێ تیپێ و جهێ ئەندامێن بەرێ دگرن. (م. دلشاد محەمەد سەعید) سەرپەرشتییا ڤێ تیپا (کۆراڵ و مۆزیکی) دکر[23].

ل (١٩٧٩/٥/٣١)ێ (تیپا دهۆك) یا مۆزیکێ ب رەنگەکێ فەرمی هاتە دامەزراندن. ب سەرپەرشتییا (م. دلشاد محەمەد سەعید) هژمارەکا ئەندامێن تیپا(کۆراڵ و مۆزیکی) خۆ دا دگەل ڤێ تیپێ و بەردەوامی ب کارێن خۆدا هەتا سالا(١٩٨٤)ێ[24].

ل (١٩٨٣/١١/١٥)ێ ژی تیپا (رباد) یا مۆزیکێ ل باژێرێ دهۆکێ هاتە دامەزراندن[25].

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ و ئەو سەربەستی و ئازادیا بۆ مللەتێ کورد پەیدابووی گەلەك گرۆپ و تیپێن مۆزیکێ هاتنەپێکئینان، بەلێ تشتەکێ وەسا تێدا نەبوو کا چەوا سەرەدەریێ دگەل مۆزیکا کوردی بکەن، هندەك بەرەڤ مۆزیکا(فارسی) دچوون، هندەك بەرەڤ مۆزیکا(ترکی)، هندەك بەرەڤ مۆزیکا(عەرەبی)، ئانکو تامەکا (فارسی یان ترکی یان عەرەبی یان ئۆرۆپی) ددایێ، ئەڤ رەنگە هەتا نها یێ بەردەوامە[26].

ل ســالا(١٩٩١)ێ (م. وریا ئەحمەد) تیپەکا مۆزیکێ بناڤێ(زیروبەم) پێکئینا و ل سالا(١٩٩٢)ێ ئەڤێ تیپێ دەستویریا فەرمی ژ حوکمەتا هەرێما کوردستانێ وەرگرتن، ئەڤە ئێکەمین تیپ بوو کو دەستویریێ ژ حکومەتا هەرێما کوردستانێ وەردگریت. بزاڤ و چالاکیێن ڤێ تیپێ دبەرچاڤ بوون و پشکداری دچەند ڤیستەڤالا دا کر بوو و دڤیستەڤالەکێدا یا ئێکێ دەرچوو. ناڤێ ڤێ تیپێ ژ هزرا ( م. وریا ئەحمەد) بوو و مەبەستا وی ئەو بوو ناڤەکێ مۆزیکێ دانیتە سەر تیپێ، ئەڤجا ئەڤ ناڤە هەلبژارد کو ناڤەکێ مۆزیکییە و رامانا وێ ئەوە کو ل دەمێ (زریابی) ئامیرێ(عودێ) دوو (ژێ) هەبوون ژێیا سەری و ژێیا بنی ئانکو (زیر) رامانا ژێیا خوارێ ددەت و (بەم) رامانا ژێیا سەری ددەتە ئانکو دەنگێ(ستویر). ئەڤ تیپە هەتا سالا(١٩٩٧)ێ یا بەردەوام بوو[27].

هەر دڤێ سالێدا تیپەکا مۆزیکێ یا زانستی و ئەکادیمی بناڤێ (ئۆرکێسترا کوردستان)ێ ل هەولێرێ هاتە دامەزراندن. بەراهیێ(م. جەمال هیدایەت)

رێڤەبەرییا وێ کر و (م. سیروان سیرینی) مایسترۆ بوو، پاشی سالا (٢٠٠٠- ٢٠٠٦)ێ (م. شێرزاد محەمەد حوسێن) بوو رێڤەبەرێ ڤێ تیپێ و (م. چەتۆ سالح نەوروز) مایسترۆ بوو، دووڤدا سالا (٢٠٠٦-٢٠١٤)ێ (م. بەکر خالد) بۆ رێڤەبەرێ تیپێ و هەر(م. چەتۆ سالح نەوروز) مایسترۆ بوو[٢٨].

## رۆلێ چالکیێن قۆتابخانا ل باشوورێ کوردستانێ

- چالاکیێن قۆتابخانا ب سەر رێڤەبەریێن پەروەردێ د سالێن پێنجییاندا دەست ب کارێن خۆ کرن و هەتا نها بەردەوامە و رۆلەکێ هەرە مەزن هەبوویە دخزمەتکرن و پێشڤەبرنا هۆنەری ب رەنگەکێ گشتی و هۆنەرێ مۆزیکێ ب رەنگەکێ تایبەتی و ببوونە بنگەهەکێ گرنگ بۆ ئەنجامدانا کار و چالاکیێن مۆزیکێ ل سەرانسەری هەرێما کوردستانێ، دکارێن خودا شیان خزمەتا مللەتێ خۆ بکەن ب رێیا هۆنەری، کو ل وی سەردەمی مللەتێ کورد لژێر دەستێ دوژمناندا بوو، ب هۆنەری رەوشەنبیر و مۆزیکژەن و گەنجێن کوردا و زارۆکان پشتەڤانییا شۆرشا کوردی دکر، ئەو ژی ب چەندین سروود و سترانێن کوردی و فۆلکلۆریێن هەمەرەنگ. چالاکیێن قۆتابخانا هەڤرکییەکا مەزن پەیدا کر دناڤبەرا هەمی چالاکیێن قۆتابخانا ل هەرێما کوردستانێ ژ بۆ پێشڤەبرنا هۆنەری و پێشکێش کرنا بەرهەمێن مۆزیکێ یێن جوان و ژێهاتی و پتر خزمەتکرنا هۆنەرێ مۆزیکێ و بلند کرنا ئاستێ وێ ل پارێزگەهێن کوردستانێ[٢٩].

باشترین پێنگاڤ بۆ پێش ئێخستنا مۆزیکێ ئەوا چالاکیێن قوتابخانا هاڤێتی، ڤەکرنا خولێن مۆزیکێ بوو، بۆ هندێ دا زارۆکێ کورد فێری هۆنەرێ مۆزیکێ بیت و مۆزیك بکەفتە دمەژیێ ویدا، چنکو مۆزیك ژی بیاڤەکە ژ بیاڤێن خزمەتا مللەتی، هەروەسا بەرهەڤکرن و ئامادەکرنا کادرەکێ خودان شیان، کو د پاشەرۆژێدا بەردەوامیێ بکارێ خۆ بدەت و ل بنگەهێن بلندتر بێت هۆنەری بخوینیت و ب رەنگەکێ زانستییانە فێری هەمی جۆرێن هۆنەرێ مۆزیکێ بیت.

مەرەم ژڤان خۆلا ئەو بوو کو زارۆکێ کورد فێری ژەنینا ئامیرێن مۆزیکێ بیت و چەوانییا دەرئێخستانا دەنگی ب رەنگەکێ راست و دروست و هەروەسا فێری بنەما و زمانێ مۆزیکێ(نۆتە) بیت. چالاکیێن قوتابخانا چەندین ئاهەنگ و ڤیستەڤالێن هۆنەری ل پارێزگەهێن کوردستانێ گێران، هەروەسا پشکداری دچەندین ڤیستەڤالندا کر ل سەر ئاستێ عیراقێ و ئەنجامێن باش دەستخۆڤە ئینان و گەلەك ڤیستەڤالاندا پلەیا ئێکێ بوون. ئەڤە ژی وێ دگەهینیت کو هۆنەرێ مۆزیکێ ل کوردستانێ یێ بەرەڤ پێش دچیت و کورد ژی وەکی هەمی مللەتان پیتەکی د دەنە هۆنەری و مۆزیکێ[٣٠].

## رۆلێ پەیمانگەهێن هۆنەرێن جوان ل باشوورێ کوردستانێ

بۆ پتر پیتەدان ب هۆنەرێ مۆزیکێ و ئامادەکرنا کادرەکێ خودان شیان د بیاڤێ هەمی جۆرێن هۆنەری نەخاسمە هۆنەرێ مۆزیکێ، بۆ ڤێ مەرەمێ پەیمانگەهێن هۆنەرێن جوان ل پارێزگەهێن کوردستانێ هاتنەڤەکرن دا قوتابیێن بەهرەمەند و خودان شیان هەمبێز بکەن و رەنگەکێ زانستیانە فێری چەندین جۆرێن هۆنەری بن و ئەڤ پەیمانگەهە ببنە بنگەهەکێ هۆنەری بۆ پێشڤەبرن و خزمەتا هۆنەری ل کوردستانێ و رۆلێ خۆ دناڤ جڤاکێ کوردیدا بگێریت و دەرچوویێن ڤان پەیمانگەها بکەڤنە دخزمەتا هۆنەرێ کوردی چ (مۆزیکە) یان(شانۆ) یان (شێوەکاری) بیت. پشکا موزیکێ ژی ل ڤان پەیمانگەها هەر ل دەسپێکێ شیا رۆلێ خۆ ببینیت و ببیتە پشکەکا هەرە گرنگ بۆ بەرهەڤکرنا مامۆستایەکێ شارەزا دبیاڤێ مۆزیکێدا. کو بشێت ب رەنگەکێ زانستیانە وانە یێن مۆزیکێ بێژیت، زێدەباری ئامادەکرنا هۆنەرمەندێن پاشەرۆژێ و پەروەردەکرنا قوتابیان ل سەر هۆنەرێ مۆزیکێ[٣١]. بەرهەمێ ڤان پەیمانگەها ژ مۆزیکڤان و مۆزیکژەن و ئاوازدانەر و سترانبێژا ئەڤرۆ دبەرچاڤن و کەتینە دخزمەتا هۆنەرێ مۆزیکێدا، هەروەسا پەیمانگەهێن

هۆنەرێن جوان سالێ بۆ سالێ هژمارەکا مامۆستایێن هۆنەری یێن زیرەك و خودان شیان پالدەتە قوتابخانا. هەر ئەڤرۆ دبینین کو دەرچوویێن ڤان پەیمانگەها ژ پشکا مۆزیکێ بوینە مۆزیکژەن و کۆرسێن باش و زیرەك دناڤ تیپێن هۆنەری دا.

وان تیپا مفا ژێ دیتن بۆ پێشڤەبرنا هۆنەرێ مۆزیکێ ب رەنگەکێ ئەکادیمی و جهێ تبلێن وان یێ دیار و بەرچاڤە. ئەڤ پەیمانگەهە ئەڤێن پشکا مۆزیکێ لێ هەین ل ڤان سالاندا هاتنە دامەزراندن[32]:-

١- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرێ سلێمانیێ سالا(١٩٨٠)ێ[33].

٢- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرێ هەولێرێ سالا(١٩٩٢)ێ[34].

٣- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرێ دهۆکێ سالا(١٩٩٢)ێ[35].

٤- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ رانیا سالا(٢٠٠٠)ێ[36].

٥- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا (شەهید جەعفەر) کۆیە ل سالا(٢٠٠٢)ێ[37].

٦- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرێ کەرکووکێ ل سالا(٢٠٠٤)ێ[38].

٧- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ حەلەبچە سالا(٢٠٠٣- ٢٠٠٤)ێ[39].

٨- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ کفری سالا(٢٠٠١- ٢٠٠٢)ێ[40].

٩- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ خانەقین سالا(٢٠٠٤- ٢٠٠٥)ێ[41].

١٠- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ چەمچەماڵ سالا(٢٠٠٧- ٢٠٠٨)ێ[42].

١١- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل باژێرکێ رەواندز سالا(٢٠١٠- ٢٠١١)ێ[43].

١٢- پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل ئاکرێ.

## رۆلێ کۆلیژێن هۆنەرێن جوان ل باشوورێ کوردستانێ

خەونا پتریا هۆنەرمەند و دەرچوویێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ئەو بوو بنکەهەکێ بلندتر ل کوردستانێ هەبیت دا پیتەی بدەتە هۆنەری و بەردەوامیێ ب خواندنا خۆ بدەن، دا پتر فێری هۆنەری و دیرۆکا وی ب تایبەتی هۆنەرێ مۆزیکێ ببن، سالا(١٩٩٨- ١٩٩٩)ێ و بۆ جارا ئێکێ کۆلیژا هۆنەرێن جوان ل سلێمانیێ هاتە دامەزراندن، بەلێ تنێ پشکا شێوەکاری لێ هەبوو. هەر چەندە ئەڤە پێنگاڤەکا باش بوو دا ببتە دەسپێکەك بۆ ڤەکرنا پشکێن دی، ل دووڤدا سالا ( ٢٠١١ - ٢٠١٢) پشکا مۆزیکێ لێ هاتەڤەکرن و ئەڤەژی دەستکەفتەکێ مەزن بوو بۆ هۆنەرێ مۆزیکێ ل باشوورێ کوردستانێ[44].

دووڤدا ل سالا(٢٠٠٤- ٢٠٠٥)ێ کۆلیژا هۆنەرێن جوان ل زانکۆیا سەلاحەددین ل باژێرێ هەولێرێ هاتە دامەزراندن، ئەڤەژی پێنگاڤەکا گەلەکا مەزن بوو چنکو هەمی بەش ب خوڤە دگرتن ژوانا (پشکا مۆزیکێ)، هەر چەندە هژمارا کادرێ ڤێ پشکێ و ئامیرێن مۆزیکێ لێ دکێمن، بەلێ ل دووڤ شیان و ئامیرێن بەردەست شیایە رۆلێ خۆ بگێریت، ڤەکرنا پشکێن مۆزیکێ ل زانکۆیا سلێمانیێ و زانکۆیا سەلاحەددین دێ ببتە بنیاتەکێ ئەکادیمی ژ بۆ وەرار و پێشڤەبرنا ئاستێ زانستیێ هۆنەرمەندێن مۆزیکڤان ل سەرانسەری پاشوورێ کوردستانێ، وەهەروەسان دەستکەفتەکێ مەزنە کو ئەڤرۆکە مە هژمارەکا زۆرا قوتابیان ژێ دەرچووینە و بووینە خودان باوەرناما بەکالۆریۆسێ د بیاڤێ مۆزیکێدا، نەخاسمە ل ڤان سالێن داویێدا ل پشکا مۆزیکێ ل زانکۆیا سەلاحەددین ل هەولێرێ خواندنا بلند هاتییە ڤەکرن و هژمارەکا مامۆستایێن مۆزیکڤان ژێ دەرچوونە و شیاینە باوەرنامەیا ماستەرێ دهۆنەرێ مۆزیکێ دا دەستڤە بینن .

# تیپێن هۆنەری ل باشووری کوردستانێ

ئەو تیپ و گرۆپێن هونەری مۆزیکێ کو ل سالێن پێنجییا و هەتا نها ل باشووری کوردستانێ هاتینە دامەزراندن ئەڤێن خواری بوون[45].

## ١- بازێری سلێمانیێ

- تیپا مۆزیکا(مەولەوی).
- تیپا مۆزیکا(سلێمانی).
- ئۆرکێسترا ژێداری کورد.
- ئۆرکێسترا سلێمانی.
- تیپا کۆمەڵ هۆنەرێن جوان.
- تیپا سەهەند.
- تیپا گەریان.
- تیپا شنێروی.
- تیپا کۆرالێ تەوار.
- گرۆپێ تایبەت(ب زارۆکان).
- گرۆپێ تایبەت(ب گەنجان).
- گرۆپێ تایبەت (ب کچان) ئەوژی دوو پشکن
- گرۆپێ(دەنگی) یا کچان.
- گرۆپێ(دەنگ و مۆزیکێ) یا کچان.
- گرۆپێ(مەولەوی).
- گرۆپێ(جاز)[46].

## ٢- بازێرکێ کۆیە

- تیپا مۆزیکا(باوەجی).
- تیپا مۆزیکا(سێوە).
- تیپا مۆزیکا(سەنتەرێ گەنجان).
- تیپا مۆزیکا(مندالێ سێوە)[47].

## ٣- بازێرکێ رانیا

- تیپا(کچانی رانیا).
- گرۆپێ مۆزیکا(پارسان).
- گرۆپێ مۆزیکا(نەوا)[48].

## ٤- بازێرێ کەرکووک

- تیپا سۆلاڤ.
- تیپا سەندیکا هۆنەرمەندێن کەرکووکێ.
- تیپا تێلەفزیونا کەرکووکێ.
- تیپا شەفەق.
- تیپا باسەرە.
- تیپا کەرکووك.
- گرۆپێ عەلی مەردان[49].

## ٥- بازێرێ هەولێرێ

- تیپا(هۆنەرێ هەولێر).
- تیپا(دەرسیم).
- تیپا(خانزاد) یا کچان.
- تیپا(زیروبەم).
- تیپا(هۆنەرێن مللی).
- تیپا رێڤەبەریا هۆنەرێ مۆزیکێ.
- تیپا زارۆکان ب سەر چالاکیێن قوتابخانا ڤە.
- تیپا(پەپولەیێن کوردستانێ) یا زارۆکان.
- تیپا(ئۆرکێسترا کوردستانێ).
- گرۆپێ(مریەم خان).
- گرۆپێ(نالی)[50].

## ٦- بازێرکێ رەواندوز

- تیپا پاشای گەورە.
- تیپا مندالێن[51].

## ٧- بازێرێ دهۆکێ

- تیپا(١١)ی ئاداری.
- تیپا(دلمان) یا هۆنەری.
- تیپا کۆراڵ و مۆزیکێ.
- تیپا(دهۆك) یا مۆزیکێ.
- تیپا(رباد) یا هۆنەری.
- تیپا زارۆکان ب سەر چالاکیێن قوتابخانا ڤە.
- تیپا (بادینا) یا هۆنەری.
- تیپا (مۆزیکێ) یا زاروکان.
- تیپا (ئامێدیێ) یا مۆزیکێ.ل بازێرکێ ئامێدیێ[52].

## ٨- بازێركێ زاخۆ.

- تیپا(نەورۆز).
- تیپا(زارۆكان) ب سەر چالاكیێن قوتابخانا ڤە.
- تیپا (هۆنەر) یا زاخۆ.
- تیپا (رۆژ) یا مۆزیكێ[٥٣].

ڤان تیپان رۆلەكێ گرنگ هەبوو ژ بۆ هندێ هۆنەرێ مۆزیكێ ل كوردستانێ پێشكەڤیت و كارتێكرنا خۆ ل سەر خەلكی هەبوو و گوهەكێ مۆزیكێ ل دەڤ وان پەیداكر و رەوشەنبیریا وان بەرفرەهتر لێكر.

بەری نها ستران بێی مۆزیك گۆتن، بەلێ دەمێ مۆزیك پەیدا بووی گوهێ خەلكی بەرەڤ پێشڤە دچوو، تایبەت پشتی پەیدابوونا چەند تیپەكا. دگەل پەیدابوونا ڤان تیپان هەڤركییەك دناڤبەرا واندا دروست بوو، بوو ئەگەرێ هندێ ئاستێ هۆنەری بەرەڤ پێشڤە بچیت ئەڤە ژی دبەرژەوەندیا هۆنەرێ كوردی دایە و دێ هۆنەرێ كوردی ب هێزكەڤیت، ل وی سەردەمی كارێن ڤان تیپان كوردی بوون و لێژنەیێن هەلسەنگاندنێ ژی هەبوون هەر كەسەكێ ئاوازەك دانابا و ئەو ئاواز بەرەڤ (عەرەبی) یان (تركی) یان (فارسی) چووبا. لێژنێ ئەو كار وەرنەدگرت و دا داخوازێ ژێكەن وی جهی بگهۆرە چنكو نە كوردییە، ژ بەر هندێ ڤان تیپا بزاڤ دكرن كو تشتێ كوردی(١٠٠٪) ئامادەبكەن[٥٤].

# هۆنەرێ مۆزیكێ ل پارێزگەها دهۆكێ

## - بزاڤ و چالاكیێن هۆنەرێ مۆزیكێ ل دهۆكێ:-

دكەڤندا ئانكو ل سالێن بووری هەتا سالێن حەفتییا چ بزاڤ و چالاكیێن هۆنەری چ مۆزیكە یان ستران گۆتن دبەرچاڤ نەبوون كو ئاماژەیێ بكەین ب تنێ ئەو نەبیت كو هندەك سترانبێژێن مللی هەبوون و ل مالان سترانێن فلكلۆری دگۆتن، ئەڤ ستران گۆتنە ب تنێ ب دەنگی بوو بێی مۆزیكە، چنكو كەسەكێ وەسا نەبوو ئانكو مۆزیكڤانەك نەبوو مۆزیكێ لێبدەت دسالێن شێستاندا، هندەك كەس هەبوون وەك(عەزیز عـزرە)، ئەڤی كەسی ئامیرێ ڤایۆلینێ دژەنی و (سەعدەددین) ئەڤی ژی ئامیرێ عودێ دژەنی، ئەڤان هەردو كەسان و چەندێن دی هەبوون و ئامیرێن مۆزیكێ بۆ دلێ خۆ دژەنین[٥٥].

پشتی پێكهاتنا ١١ ئـادارا(١٩٧٠)ێ بزاڤەكا بەرچاڤ كەتە مۆزیكا كوردی ئەوژی ژ بەر وێ ئازادیا مللەتێ كورد تێدا دژیایی ب ڤێ چەندێ تیپا(١١) ی ئادارێ دڤێ سالێدا هاتە پێكئینان، وەكی مە ئاماژە پێدای ئەندامێن ڤێ تیپێ ژڤان كەسان (م. شێرزاد محەمەد سەعید، م. یاقو شەمعون زەیە، م. دلشاد محەمەد سەعید، م. ئیسماعیل عەبدولقادر سەبری(زیرەك)، م. جەمیل ئیبراهیم عیسا و هەڤال هاشم ئاكرەیی....هتد) پێكهاتبوون[٥٦].

هەژی ئاماژە پێكرنێیە كو(م. جەمیل عەبدوللا محەمەد ئامێدی) ئێكەم كەس بوو ل بازێرێ دهۆكێ كو پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل بەغدا پشكا مۆزیكێ بدووماهیێك ئینای و باوەرناما دبلۆمێ ب مۆزیكێ وەرگرتی ل سالا(١٩٦٧- ١٩٦٨)ێ و ژەنیارێ ئامیرێ عودێ بوو[٥٧].

تیپا (١١)ی ئادارێ ئێكەمین تیپا مۆزیكێ بوو ل بازێرێ دهۆكێ دهێتە پێكئینان و خەلكی ب مۆزیكێ د دەتە نیاسین، ل وی دەمی ڤێ تیپێ گەلەك كارێن هۆنەری پێشكێشی خەلكێ دەڤەرێ كرن.

ل دووڤـدا سـالا(١٩٧٣)ێ تیپا (دلـمـان) ب سەرپەرشتیا هۆنەرمەند(محەمەد تەیب تاهر) هاتە پێكئینان و ئەندامێن ڤێ تیپێ هۆنەرمەندان:- (م. عەبدولعەزیز سلێمان – م. وەلید خالد - م. سەباح زاخویی- تەحلۆ محەمەد خۆشان- عەبدوللا حاجی- عیزە ددین تەمۆ- ئەحمەد سالح) بوون.

دوان سالاندا ڤان هەردو تیپان پێشكەفتنەك ب چالاكیێن خۆ ئێخستە بزاڤا مۆزیكا كوردی و بەرێ خەلكی ژگوهدانا سترانێن دیوانكی یا بێ مۆزیكە وەرگێرا سەر سترانا ب مۆزیكە. تیپا(دلمان) بەردەوامی بكارێ خۆدا هەتا سالا(١٩٧٩)ێ[٥٨].

هەروەسا ل زاخۆ ژی تیپەكا مۆزیكێ بناڤێ(نەورۆز)

هاتە پێکئینان، سالا(١٩٧٠)ێ هۆنەرمەند (م. عەبدولعەزیز سلێمان- م. سەمیر زاخویی- م. سەباح زاخویی- غایب عەبدولهادی- حەمید عەبدولهادی- موسەدەق ئیسماعیل- موشێ پۆلس.....هتد) ئەندامێن ڤێ تیپێ بوو. کارێن ڤێ تیپێ ل زاخۆ بەرچاڤ بوون و خزمەتەکا باش د وارێ مۆزیکێ و سترانێدا پێشکێشی خەلکێ دەڤەرێ کرن. ئەڤە ژی بەردەوامی دانەك بوو ب پێشڤەبرنا مۆزیکێ ل بازێرێ دهۆکێ[٥٩].

ژ ئەگەرێ پێکئینانا ڤان تیپان ل پارێزگەها دهۆکێ و بەردەوامیدان بکارێن مۆزیکێ کو ببتە رووبارەکێ هۆنەریێ بێ راوەستیان ل دەڤەرا دهۆکێ، ژبزاڤێن بەردەوام یێن ئەندامێ ڤان تیپان ژ بۆ پێشکێشکرنا هزرەکا نوی دبیاڤێ مۆزیکێدا ئەو بوو ل سالا(١٩٧٧)ێ خۆلەکا فێرکرنا مۆزیکێ بۆ هژمارەکا گەنجێن دهۆکێ هاتە ڤەکرن. ئەڤە ئێکەمین خۆلا فێرکرنا مۆزیکێ بوو ل دهۆکێ هاتییەڤەکرن و هزرا هۆنەرمەندێ مۆزیکڤان (م. وەلید خالد مەحەمەد) بوو، کو وی ب خۆ وانە تێدا دگۆتن، د وی دەمیدا ڤێ هزرێ جهێ خۆ گرت و هژمارەکا گەنجان هاتنە پەروەردە و فێرکرن دبیاڤێ مۆزیکێدا، دابنە هێڤێنەك بۆ گەشکرنا مۆزیکێ و مشەکرنا مۆزیکژەنا، رۆلێ ڤی مامۆستای یێ مەزن بوو کو هژمارەکا گەنجا بەرهەڤ بکەت و ئاستێ وان بلند بکەت و ببنە خودان شیانێن باشێن ژەنینا ئامیرێن مۆزیکێ[٦٠].

پشتی(م. دلشاد محەمەد سەعید) پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل بەغدا ب داوینای و ڤەگەریا دهۆکێ و گوهـ ل ڤەکرنا ڤێ خۆلێ بووی و چاڤ ب قوتابیێن خۆلێ کەفتی و ئاستێ وان یێ هۆنەری زانی، زۆر یێ خۆشحال بوو و دەستخۆشی ل (م. وەلید خالد) کرن ل سەر ڤی کارێ جوان و ژێهاتی ئەڤجا دگەل (م. وەلید خالد) کارکر و پێکڤە کەسێن باش ژکچ و کوران دەسنیشانکرن ، هەروەسا گەنجێن باش ژ کچ و کوران ژقوتابخانێن ناڤەندا دهۆکێ دیارکرن بۆ خۆ ئامادەکرنێ بۆ ڤیستەڤالا عیراقێ ل پارێزگەها (موسەننا)، هژمارا ڤان کوڕ و کچان بوونە(٨٤) کەس و تیپا (کۆراڵ و مۆزیکێ) ژێ پێکئینا کو سەر ب چالاکیێن قوتابخانا ڤە بوو. ئەڤێ تیپێ ل ١٩٧٩/٤/٢٢ێ پشکداری د ڤیستەڤالا سالانە یا عیراقێدا ل پارێزگەها(موسەننا) کر و پلەیا ئێکێ دەستخۆڤە ئینا ب سەرپەرشتییا هۆنەرمەند (م. دلشاد محەمەد سەعید) کو رۆلەکێ زۆر گرنگ د راهێنانێن ڤێ تیپێ گێرابوو. ئەڤ تیپە ببوو دەسپێکەك بۆ گوهارتنا ژیانا مۆزیکێ ل دهۆکێ[٦١].

هەروەسا ل سالا ێ١٩٨٠ ئەڤێ تیپێ پشکداری د ڤیستەڤاڵ هەولێرێ دا کر و تێدا رۆلەکێ بەرچاڤ و مەزن گێرا، ئەڤ چەندە ببوو حێبەتیەك بۆ خەلکێ ئامادەبووی کو تشتەکێ هۆنەری ب ڤی رەنگی ببینن چ ژ جل و بەرگێن کوردی و راوەستیانا ئەندامێن تیپێ و بشێوەیێ چیایەکێ د پێشکێشکرنا برگەیێن جوان ب شێوازەکێ نوی، ب ڤێ چەندێ پلەیا ئێکێ دەستخۆڤە ئینا، دووڤدا سالانە هزر بۆ ڤێ تیپێ دهاتەکرن کو تیپەکە ل سەر ئاستەکێ بلند و خودان شیانە. ئەڤ تیپە هەتا سالا(١٩٨٠)ێ یا بەردەوام بوو پشتی(تیپا دهۆك) هاتییە دامەزراندن گەلەك ژ ئەندامێن ڤێ تیپێ چوونە دگەل(تیپا دهۆك)، تیپا چالاکیێن قوتابخانا هەتا نها یا بەردەوامە و سال بۆ سالێ ئەندامێن وێ دهاتنە گوهارتن[٦٢].

ئەو بوو ل (١٩٧٩/٥/٣١)ێ تیپا دهۆکێ یا مۆزیکێ ب رەنگەکێ فەرمی هاتەدامەزراندن و ب سەرپەرشتییا (م. دلشاد محەمەد سەعید) و ب ئەندامەتییا ڤان مۆزیکڤانا[٦٣]:-

١- بەدرخان تاها محەمەد.

٢- سەلاحەددین سالح محەمەد.

٣- وەلید خالد محەمەد

٤- سەمیر عەونی.

٥- دیموقرات تاها محەمەد.

٦- ئیسماعیل عەبدولقادر(زیرەك).

٧- نابلیۆن یاقو مەرقۆز.

٨- جەمیل ئیبراهیم عیسا.

٩- دلشاد مستەفا محەمەد.

١٠- ئاری عەبدوللا عەبدولقادر.

١١- ئیحسان سەبری عەلی.

١٢- عەمار حەسەن ئەحمەد.

١٣- رەمەزان محەمەد ئەمین.

١٤- عیسا ئەحمەد.

ئەڤ تیپە یا بەردەوام بوو هەتا سالا(١٩٨٤)ێ و پشتی(م. دلشاد محەمەد سەعید) هەر دوێ سالێدا چوویە دەرڤەی وەلاتێ ئەڤێ تیپێ ب سەرپەرشتییا ( م. جەمیل ئیبراهیم عیسا) نێزیکی سالەکێ بەردەوامی ب کارێ خودا. ئەڤێ تیپێ ب کار و چەلەنگیێن خۆ ناڤێ خۆ گەهاندە سەرانسەری عێراقێ و دەوروبەرێن وێ و هەتا نها ناڤ و دەنگێن وێ مایینە. پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ڤێ تیپێ ب سەر پەرشتیا ( م. جەمال محەمەد ئەدیب) سەر ژ نوی دەست ب چالاکیێن خو کرەڤە[٦٤].

ل ١٩٨٣/١١/١٥ێ تیپا (رساد) هاتەدامەزراندن ب رەنگەکێ فەرمی و دەستەکا کارگێریا تیپێ پێکهاتبوو ژ: (قاسم رەمەزان- مقداد ئەحمەد- ئیبراهیم ئیمینکی- نائیف عەبدولجەبار- نسرەت حەسەن- حاجی عەلی) و هەتا نها بەردەوامی ب کارێ خۆ دایە و چالاکیێن باش پێشکێشکرینە [٦٥].

د دامەزراندنا وێدا ل سالا(١٩٧٠)ێ چالاکیێن قوتابخانا رۆلەکێ هەرە گرنگ هەبوویە ژبۆ پێشڤەبرنا هۆنەرێ مۆزیکێ و بلندکرنا ئاستێ وێ ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ و شیایە چەندین خولێن مۆزیکێ بۆ زارۆکان ڤەکەت و چەندەها زارۆکان فێری ژەنینا ئامیرێن مۆزیکێ بکەت، دابنە بنیاتەك بۆ هۆنەرێ مۆزیکێ و شیایە چەند زارۆکێن باش ئامادەبکەت و ئاستێ وان بگەهتە هندێ کۆ بشێن ل جهێن بلندتر بخوینن وەك(پەیمانگەها هۆنەرێن جوان). هەروەسا چالاکیێن قوتابخانا دوان سالاندا و هەتا نها گەلەك ئاهەنگ و چالاکیێن هۆنەری گێراینە و ل سەر ئاستێ عێراقێ پشکداری دچەندین ڤیستەڤالێن هۆنەریدا و شیایە ئەنجامێن باش دەستخۆڤە بینیت و چەند سالا ژی پلەیا ئێکێ وەرگرتیە[٦٦].

## پەیمانگەها هۆنەرێن جوان/دهۆك

هەر ژ ٢٧ گولانا ١٩٦٩ێ رۆژا دهۆك بوویە پارێزگەهـ تا سەرهلدانا پیرۆز سالا(١٩٩١)ێ یا بێ بەهر بوویە ژ بنگەهەکێ گرنگ و پێدڤیێ زانستیێ هۆنەری ئەو ژی(پەیمانگەها هۆنەرێن جوان) بوو، هەلبەت هەبوونا دەزگەهەکێ هۆ ل دهۆکێ، دێ گرنگییا خۆ هەبیت د وارێ پێشڤەبرنا ئاستێ هۆنەری ب شێوەیەکێ زانستی و پەیدابوونا هۆنەرمەندێن رەوشەنبیر و خودان شیان ئەڤە ژ لایەکی ڤە، ژلایەکێ دی ڤە دێ ئاستێ هۆنەری ل پارێزگەهێ بەرف بلندبوونێ ڤە چیت کو هیڤی و ئومێدێن گشت هۆنەرمەند و هۆنەردوستانە، لەوما دانانا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ ژ لایێ حوکمەتا هەرێما کوردستانێ ڤە ب خەم و پالپشتییەکا زۆر هاتە بەرچاڤ وەرگرتن[٦٧].

گومان تێدا نینە دامەزراندنا (پەیمانگەها هۆنەرێن جوان) ل دهۆکێ دەسکەفتەکێ مەزنە و رۆلێ خۆ هەبوویە دپێشڤەبرنا بزاڤا هۆنەریدا ل پارێزگەهێ و روویەکێ زانستی دایە لێنێرینا هۆنەری و چەوانییا بەرهەڤکرن و ئامادەکرنا کارێن هۆنەری ب شێوەکێ ئەکادیمی. ئەڤە و زێدەباری بەرهەڤکرنا مامۆستایێن بسپور د وارێ هۆنەریدا. پەیمانگەها هۆنەرێن جوان بنگەهێ گوهرین و پێشڤەچوونێ یە و دەزگەهەکێ گرنگ و فەرە، لەوما پێدڤییە پیتەکێ باشتر پێ بێتەدان ژ بۆ دەولەمەندکرنا ڤێ پەیمانگەهێ ژ ئالێ خواندنێ ڤە. چنکو سالانە هژمارەکا زۆر ژ قوتابییان ژڤێ پەیمانگەهێ دەردچن و خودان شیانن و بەردەوامییا وان دخواندنێدا ل ئەکادیمییەکا هۆسا کادرەکێ بسپۆر دکەڤیتە مەیدانا هۆنەری و باشترین قۆناغ ئەوە کو هۆنەر ل کوردستانێ وەك خواندن بگەهیتە پلێن بلند.

دەمێ سالا (١٩٩٢- ١٩٩٣)ێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهۆکێ هاتییەدامەزراندن، تنێ ئەڤ پشکە ب خۆڤە گرتبوون:-

١- پشکا مۆزیکێ

٢- پشکا شێوەکاری

٣- پشکا شانۆیێ.

ئەڤێ پەیمانگەهێ هەر ژ سالا خواندنێ(١٩٩٢-١٩٩٣)ێ هەتا سالا خواندنێ(٢٠١٣- ٢٠١٤)ێ.(٢١) فیستەڤالێن هۆنەرێن پەیمانگەهێ گێراینە، ل هەر فیستەڤالەکێ چەندین چالاکیێن هۆنەری هاتینە پێشکێشکرینە وەك: ئاهەنگێن مۆزیکێ، پێشانگەهێن شێوەکاری، کارێن دەستی، پەیکەر و سیرامیك، شانۆگەری وەك(پرۆژێن) دەرچوونا قوتابیان و کۆر و سمینارێن تایبەت ب هۆنەریڤە. ئەڤە و تا نهۆ (١٨) خولێن دەرچوونا قوتابیان ل ڤێ پەیمانگەهێ ب باوەرناما دبلۆمێ ب مۆزیکێ و شانۆیێ و هۆنەرێ شێوەکاری دەرچووینە[٦٨].

## بەشێ مۆزیکێ ل ڤێ پەیمانگەهێ:

ل دەسپێکا دانانا پەیمانگەهێ چەند هۆنەرمەندەکان هزر ل هندێ دکر کا چ پشك لێ بێنە ڤەکرن و پشکا مۆزیکێ ژێ ئێك ژوان هزرێن هەرە گرنگ بوو، ببوو جهێ گەنگەشە و دانوستاندنێ دناڤبەرا ڤان مۆزیکڤانا(م. ئیسماعیل عەبدولقادر(زیرەك)- م. وەلید خالد محەمەد- م. سەباح محەمەد ئەمین- م. نیهاد خالد حەسەن) د دانوستاندنێن خودا داخواز ژ (م. نیهاد)ی دکرن کو ئەو ب ڤێ چەندێ رابیت و ب ستویێ خۆڤە بگریت، چنکو تنێ ژوان مامۆستایان ئەو دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان بوو. ئەو بوو پشکا مۆزیکێ ژێ هاتە دامەزراندن. ل دەسپێکێ مامۆستایان(نیهاد خالد، ولید خالد، سەباح محەمەد ئەمین) بوونە لیژنە بۆ وەرگرتنا قوتابیان و تنێ (م.نیهاد خالد) بۆ مامۆستایێ ڤێ پشکێ و سەرۆکاتییا پشکێ ژێ وەرگرت و هەردو مامۆستایێن دی نەمانە ل پەیمانگەهێ، چنکو مامۆستابوون ل چالاکیێن قوتابخانا ل دهۆکێ. هندەك مامۆستایێن دی بوونە مامۆستایێن ڤێ پشکێ[٦٩].

١- نیهاد خالد حەسەن دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- بەغدا ژ سالا (١٩٩٢-١٩٩٣) ڤە.

٢- بەدرخان تاها محەمەد دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- بەغدا ژسالا (١٩٩٢-١٩٩٣) ڤە.

٣- نعمەت محەمەد عەبان دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- میسل ژ سالا(١٩٩٢-١٩٩٣) ڤە.

٤- موئەیەد روشدی عەبدولقادر دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- میسل سالا (١٩٩٣-١٩٩٤)- (٢٠٠٠).

٥- رەمەزان حوسێن دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- میسل سالا(١٩٩٢-١٩٩٣) - (١٩٩٣-١٩٩٤).

٦- محەمەد عومەر دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- سلێمانیێ سالا(١٩٩٢-١٩٩٣) - (٢٠٠٠-٢٠٠١)[٧٠].

هەروەسا :

١- جەمیل عەبدوللا محەمەد دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- بەغدا. ژ سالا (١٩٩٥- ١٩٩٦) هەتا هاتییە خانەنیشکرن.

٢- زەمەند نوری عەلی دەرچوویێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان- سلێمانیێ سالا (١٩٩٦)- (١٩٩٨).

وەك مامۆستا بووینە ل پشکا مۆزیکێ بەری دەرچوونا خۆلا ئێکێ[٧١].

ژ دەرچووێن خۆلا ئێکێ ل سالا(١٩٩٦- ١٩٩٧) چەند قوتابیەکێن خودان شیان وەك مامۆستا ل ڤێ پشکێ هاتنە هەلبژارتن ئەوژی:-

١- شڤان مستەفا عەلی. ژ سالا (١٩٩٧- ١٩٩٨) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٢- ئەڤین حوسێن حەسەن. ژ سالا (١٩٩٧- ١٩٩٨) وهەتا نها یا بەردەوامە.

٣- هیبە یاسین حەسەن. ژ سالا (١٩٩٧- ١٩٩٨) - (٢٠٠٠- ٢٠٠١).

٤- بلند ئیبراهیم ناسر. ژ سالا (١٩٩٧- ١٩٩٨) - (٢٠٠٧- ٢٠٠٨).

٥- عەبدولرەحمان ئەحمەد. ژ سالا (١٩٩٧-١٩٩٨) - (١٩٩٩-٢٠٠٠)[٧٢].

ل دووڤدا هندەك مامۆستا بوونە وانە بێژ ل پشکا

مۆزیکێ ئەوژی ئەڤە بوون:-

١- خەلیل ئیسماعیل حەقی. ژ سالا (١٩٩٧) - (٢٠٠٠).

٢- باسم محەمەد ئەحمەد. ژ سالا (١٩٩٧) - (٢٠٠٠).

٣- م. حەسەن بالەتەیی ژ نیارێ ئامیرێ گیتارێ بوو. ژسالا (١٩٩٨) - (١٩٩٩).

٤- م. فەخری کیکانی. ژ سالا (٢٠٠١)-(٢٠٠٣)[٧٣].

پشتی ڤان مامۆستایان هندەك قوتابی ژ دەرچوویێن ئێکێ و ئەو قوتابیێن خودان شیان ژ دەرچوویا وەك مامۆستا بۆ پشکا مۆزیکێ هاتنە وەرگرتن.

ئەو قوتابیێن دەرچوویێن ئێکێ و بووینە مامۆستا ل پشکا مۆزیکێ ئەڤە بوون:-

١- ڤینۆس یاقۆ شابا. ژ سالا (٢٠٠٢-٢٠٠٣) - (٢٠٠٤).

٢- خەتاب محەمەد ئیسلام. ژ سالا (٢٠٠٤- ٢٠٠٥) - (٢٠٠٩).

٣- هێژا یاسین حەسەن ژ سالا (٢٠٠٥-٢٠٠٦) و هەتا نها یا بەردەوامە.

٤- بێوار محەمەد عامر سالح ژ سالا (٢٠٠٦-٢٠٠٧) و هەتا نها یێ بەردەوامە[٧٤].

ئەو قوتابیێن دەرچووی و خودان شیان و بووینە مامۆستا ل پشکا مۆزیکێ ئەڤە بوون:-

١- محەمەد زەکی عەبدولقادر. ژ سالا (٢٠٠٢-٢٠٠٣) و هەتا (٢٠١٢-٢٠١٣).

٢- ئیحسان میکائیل تاهر. ژ سالا (٢٠٠٤- ٢٠٠٥) و هەتا نها یێ بەردەوامە.

٣- عەبدولقادر زەکی عەبدولقادر- وانە بێژ بوو. ژسالا (٢٠٠٦-٢٠٠٧) هەتا (٢٠٠٧-٢٠٠٨).

٤- م. کاوە محمد ناصر. ژ سالا (٢٠٠٨- ٢٠٠٩) و هەتا نها یێ بەردەوامە.

٤- م. ژنگر سەمیر محمد- وانە بێژ بوو ژسالا (٢٠٠٩-٢٠١٠) - (٢٠١٠-٢٠١١).

٥- م. ئەکرەم ئەفرام فەزیل- وانە بێژ بوو. ژسالا (٢٠١٣) هەتا نها یێ بەردەوامە.

٦- م. وەلات شوکری خۆزر) ژ سالا (٢٠١٤) هەتا نها یێ بەردەوامە[٧٥].

دووڤدا هندەك مامۆستا بوونە وانە بێژ ل پشکا مۆزیکێ، بەلێ نەژ دەرچوویێن پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهوکێ بوون، ئەڤێن ل خوارێ بوون:-

١- ئیلی چەینگ. ژسالا (٢٠٠٦-٢٠٠٧) و هەتا (٢٠٠٩-٢٠١٠).

٢- وسام یوحەنا شەمعون. ژ سالا (٢٠٠٦-٢٠٠٧) و هەتا نها یێ بەردەوامە بەلێ نها هاتییە دامەزراندن.

٣- یاقۆ شەمعون زەیە. ژ سالا (٢٠٠٧-٢٠٠٨ ) و هەتا (٢٠١٠).

٤- شیان ئەنتۆنی ئەنتۆنیس. ژ سالا (٢٠٠٩) و هەتا نها یا بەردەوامە[٧٦].

ل دووڤدا بو ئێکەم جار هندەك مامۆستایێن مۆزیکێ ژ پارێزگەها دهۆکێ باوەرناما بەکەلۆریۆس ب زانستێن مۆزیکێ ل کۆلێژا هۆنەرێن جوان – پشکا مۆزیکێ زانکۆیا سەلاحەددین دەست خوڤە ئینان و بوونە مامۆستا ل پشکا مۆزیکێ ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان ل دهوکێ، ژوان ژی ئەڤێن ل خوارێ بوون:-

١- خەتاب محەمەد ئیسلام. ژ سالا (٢٠٠٨-٢٠٠٩) - (٢٠٠٩-٢٠١٠).

٢- ئاری کاوە سوبغەتوللا. ژ سالا (٢٠٠٩) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٣- سەگڤان حەسەن عەلۆ. ژ سالا (٢٠١٠) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٤- نیوار سلێمان عبدالرحمن. ژ سالا (٢٠١١) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٥- باوەر حاجی عبدالعزیز. ژ سالا (٢٠١١) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٦- م. بێوار محمد عامر صالح. ژ سالا (٢٠١١) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٧- م. کارکەر عابد سلێمان. ژ سالا (٢٠١٢) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

٨- م. سەمەدار محمد تاها. ژ سالا (٢٠١٢)- (٢٠١٣)ێ.

٩- م. بزاڤ کیڤی فەرەج. وانەبێژبوو. ژ سالا (٢٠١٣) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

١٠- م. بێکەس عبدالقادر عبدال.وانەبێژبوو. ژسالا (٢٠١٣) وهەتا نها یێ بەردەوامە.

١١- م. هوگر بەهجەت نەعمان. ژ سالا (٢٠١٤) وهەتا نها یێ بەردەوامە[٧٧].

- ل پشکا مۆزیکێ وانەیێن تیۆری و کریاری دهێنە گۆتن، وانەیێن تیۆری ژ ئەڤان وانەیا پێك دهات:-

١- بیردۆزێن مۆزیکا گشتی.

٢- بیردۆزێن مۆزیکا رۆژهەلاتی.

٣- هارمۆنی.

٤- دیرۆکا مۆزیکا کوردی.

٥- دیرۆکا مۆزیکا رۆژئاڤایی.

٦- فلکلۆرێ کوردی.

٧- چالاکیێن قوتابخانا[٧٨].

- وانەیێن کریاری ژڤان وانەیان پێك دهات:-

١- کریاری ( ئامیری ).

٢- هەڤژەنین.

٣- سۆلفێجا رۆژئاڤایی.

٤- سۆلفێجا رۆژهەلٚتی.

٥- کۆراڵ.

٦- سروود و ستران.

٧- دیتن وگوهدانا موزیکێ.

٨- چێژا مۆزیکێ[٧٩].

ئەو ئامیرێن مۆزیکێ ئەوێن خواندن ل سەر دهێتەکرن ل پشکا مۆزیکێ ئامیرێ:-

١- ڤایۆلین.

٢-ڤیۆلا.

٣- چەلۆ.

٤- عود.

٥- قانوون.

٦- فلوت.

٧- کلارنێت.

٨- ترامپێت.

٩- ئۆکۆردیۆن.

١٠- پیانۆ.

١١- گیتار.

١٢- ریتم[٨٠].

هەر ل دەسپێکێ پشکا مۆزیکێ خزمەتەکا باش بۆ هۆنەرێ مۆزیکێ کر و رۆلەکێ بەرچاڤ و ژ هەژی گێرا، ژ سالا (١٩٩٢-٢٠١٤) پشکداری د(٢١) فیستەڤالێن هۆنەری یێن پەیمانگەهێدا کریە، چەندین سروود و سترانێن فلکلۆریێن کوردی و پارچە مۆزیکێن رۆژهەلاتی و رۆژ ئاڤایی، زێدەباری چەندین بابەتێن هەمەجوور دبیاڤێن مۆزیکێدا پێشکێشکرینە، هەروەسا سالانە قوتابیێن ڤێ پشکێ پرۆژێن خۆ یێن دەرچوونێ پێشکێشدکەن کو ژ چەند پارچەیێن مۆزیکا رۆژئاڤایی و رۆژهەلٚتی پێکهاتینە و سالانە نێزیکی(١٥- ٢٠) قوتابی ژڤێ پشکێ دەرچووینە و بووینە مامۆستا یێن هۆنەری ل قوتابخانا و نها یێ رۆلەکێ مەزن ل قوتابخانێن خۆ دگێرن ژ بۆ پێش ئێخستنا هۆنەرێ مۆزیکێ.

پشکا مۆزیکێ دڤی ژیێ کورتدا شیایە چەندین هۆنەرمەندێن باش و زیرەك دهۆنەرێ مۆزیکێدا دروست بکەت وەك(مۆزیکژەن و سترانبێژ و مامۆستایێن هۆنەری.....هتد). ل ڤێ چەندێ بوومە دیاریت کو هۆنەرێ مۆزیکێ ل پارێزگەها دهۆکێ پیچ پیچە بەرەف وەرارێ دچیت ئەو ژی ب ئەگەرێ پویتەدانا هۆنەرمەندێن دەڤەرێ و گرۆپ و تیپێن هۆنەریێن هاتینە پێکئینان و خۆلێن مۆزیکێ و رۆلێ گرنگێ چالاکیێن قوتابخانان کو بنگەهەکێ گرنگێ خرڤەبوونا هۆنەرمەندان بوو وی سەردەمی، هەر ئەو رۆلێ هەرەگرنگ یێ پەیمانگەها هۆنەرێن جوان گێرای کو بلندترین بنگەهێ هۆنەری و ئەکادیمی بوو ل دەڤەرێ .

ئەڤێ چەندێ وەکر کو گەلەك هۆنەرمەند

ژ سترانبێژ و مۆزیکژەنا بێنە پێش و کاری بۆ پێشڤەبرنا هۆنەرێ مۆزیکێ بکەن و دکارێ خودا پێش بکەڤن پێخەمەتی خزمەتا هۆنەرێ مۆزیکێ و پویتەدان ب فلکلۆرێ کوردی و بلند کرنا ئاستێ هۆنەری ل پارێزگەها دهۆکێ. دڤێ جیهانا هۆنەریدا ستێرەکا گەش و گەنجەکێ خوین گەرم پەیدا بووی، خودانێ تبلێن زێرین، خودانێ هەست و ئاوازێن نازك، خودانێ کۆرال و مۆزیکا دهۆکێ، نویخواز و نویژەنکەرێ مۆزیکا فلکلورێ کوردی، ئاواز دانەر و مۆزیکژەنێ ژێهاتی، بلیمەتێ مۆزیکا کوردی، خەبات کەرێ شۆرشا مۆزیکێ ئەوێ ب ئامیرێ خۆیێ مۆزیکێ مللەتێ کورد و فلکلۆرێ وی ب جیهانێ دایە نیاسین، هۆنەرمەند و مۆزیکڤانێ ناڤدارێ مللەتێ کورد و دەڤەرا بەهدینان(م. دلشاد محەمەد سەعید)[٨٢].

## ئۆرکێسترا دهۆك

- رێڤەبەریا گشتی یا رەوشەنبیری و هونەر و وەرزش و لاوان و رێڤەبەریا هۆنەرێ مۆزیکێ ل دهۆکێ ل سەر هزرا مۆزیکڤان (م. خەتاب محەمەد ئیسلام ئەرتووشی) رەزامەندی دا ل سەر دامەزراندنا ئۆرکێسترا دهۆك دا و ناڤبری هاتە دەستنیشانکرن وەك رێڤەبەرێ ڤێ ئۆرکێسترایێ ئەوا هاتیە دامەزراندن ل رێکەفتی ٢٩ / ٠١ / ٢٠١٣ کو رۆژ و هەیڤ گرێدانە ب ساڵڤەگەرا هەردو مۆزیکڤانێن وەغەرکری یێن بازێرێ دهۆکێ (دلشاد عەلی رەشید و عەبدولقادر زەکی عەبدولقادر) ڤە ئەوێن ب روودانەکا ترافیکی ل رێیا دهۆك و هەولێر ب مەرەما خواندنا زانکۆیێ دبوارێ مۆزیکێدا گیانێ خۆ ژدەستدایێن، و ب پشتەڤانیەکا زۆر ژ لایێ رێڤەبەرێ هۆنەرێ مۆزیکێ یێ بەری نها دهۆکێ بەرێز (م.ئەمیر سەدیق عبدالله ) ل ئۆرکیسترا دهۆك دهاتەکرن ودەستەکا دامەزرێنەرێن ئۆرکێسترا دهۆك ژڤان مۆزیکڤانان پێك دهات:

- (ئەمیر سەدیق عبدالله، خەتاب محمد اسلام، ئیلی کوانفۆ چەینگ، دلدار حەجی جەعفەر، سەمەدار محەمەد تاها ، محەمەد زەکی عبدالقادر، رەشید مەجید حەسەن، نیوار سلێمان عبدالرحمن، بێوار محەمەد عامر صالح، باوەر حاجی عبدالعزیز، سەگڤان حەسەن عەلو ، کاوە محەمەد ناصر، کارکەر عابد سلێمان، بزاڤ کیڤی فەرەج، ئەکرەم ئەفرام فەیسەل ، ئارام کاوە صبغەالله )[٨٣].

پشتی مۆلەت ب فەرمی هاتیە وەرگرتن لدووڤدا ل نیسانا سالا (٢٠١٣) تاقیکرن ب مۆزیکڤانێن دهۆکێ ئەوێن پێشکێش کرین هاتەکرن ژ لایێ لیژنەیەکا بالاڤە کو کەسانێن بسپۆر بوون دهۆنەرێ مۆزیکێدا و خودان باوەرنامێن بلندبوون، ئەو بوو نێزیکێ (٦٠) ئەندام هاتنە وەرگرتن وەك ژەنیار و کۆرالیست واتا دەنگبێژ و ژوان ئەندامان هەیکەلێ کارگێری هاتە پێکئینان و دگەل چەند لیژنەیەکان ژ بۆ ب رێڤەبرنا کار و بارێن ئۆرکێسترایێ و هەروەسان بارەگایێ ئۆرکێسترا دهۆك و جهێ وێ ل پانۆراما ئازادی هاتەدانان، لدووڤدا ل هەیڤا (٦) ل سالا (٢٠١٣)ێ ئۆرکێسترا دهۆك ب فەرمی هاتەڤەکرن ب نیشاندان و ژەنینا چەند پارچەیێن مۆزیکا بارۆکی و کلاسیکی و رۆمانتیکی و فۆلکلۆرێ کوردی ب شێوەیێ تاکی و ب کۆم و ب ئامیرێن جۆراوجۆر ژ لایێ ئەندامێن ئۆرکێسترایێ ڤە هاتنە پێشکێشکرن ب ئامادەبوونا جەماوەرەکێ زۆر ل پانۆراما ئازادی- دهۆکێ و ئەڤە ئێکەم جار بوو د دیرۆکا دهۆکێدا گرۆپەکێ ئەکادیمی و زانستی دهێتە پێکئینان ب ڤی شێوەیی و شیا سرنجا خەلکی رابکێشیت ب گێرانا وێ کونسێرتا دەسپێکی ئەڤا هاتیە ئەنجامدان[٨٤].

ئۆرکێسترا دهۆك دەسپێکەکا نوی بوو و جهێ دەست خۆشی و شانازیێ بوو بۆ خەلکێ پارێزگەهێ و هۆنەرمەندێن مۆزیکڤان و دا شێت ل پاشەرۆژێ خزمەتەکا زۆر باش بۆ مۆزیکا کوردی ب شێوەیێ زانستی و ئەکادیمی پێشکەش بکەن ، بەلێ مخابن ژیێ ڤی گرۆپێ مۆزیکێ یێ زۆر گرنگ یێ کورت بوو، تنێ (٩) هەیڤان ژیا و ژ بەر چەند ئەگەرەکان هاتە هەلوەشاندن هەتا نها ئەڤ پرۆژەبە یێ راوەستیایە و بەردەوامی پێ نەهاتیە دان[٨٥].

# دیرۆکا رۆژنامەڤانیێ ل پارێزگەها دهۆکێ

**موسەدەق تۆڤی**

رۆژنامەڤانی د دەمێ نهادا یەك ژ سێ پشکێن سەرەکیێن راگەهاندنێ یان سازیێن میدیایە ل جیهانێ، ئەو سێ پشکە ژی:

**خواندی،** رۆژنامە و کۆڤار و بەلاڤۆکن.

**بهیستی،** ئێزگە (رادیو) .

**دیتی،** تێلەفزیون و ددەمێ نهادا ئەنتەرنێت و هەموو پەیوەندیێن ئەلکترونیێن پەیوەندی ب ئەنتەرنێتێڤە هەی ب خۆڤە دگرن. پشکا خواندی ئانکو رۆژنامە و کۆڤار پشکا هەرەکەڤنا راگەهاندنێیە، هەتا نهاژی کاریگەریا خۆ د ناڤ جڤاکیدا بەرامبەر هەردو پشکێن دی پاراستییە و کاریگەریا وێ ل ئاستەکییە ژ مێژوەرە ب دەستەلاتێ چواری هاتییەناڤکرن و چەندین زانا و هزرڤان و سیاسەتمەداران هەرئێکی ب رەنگەکێ پەسنا وێ کریە و ئاماژە ب گرنگی و پێدڤیاتی و کاریگەریا وێ د ژیانا مرۆڤایەتییێدا کریە، ل ڤێرێ دەلیڤا ئاماژە کرنێ ب وان پەسنان نینە لێ تنێ دێ ئێك ژ وان پەسنان هەلبژێرین و تێدا چینە دناڤ بابەتێ خۆدا، ئەو ژی گۆتنەکا زانایێ ناڤدار ڤۆلتێر* ی یە دەمێ دبێژیت: (رۆژنامەڤانی سازیەکە کەس نکاریت وێ بشکێنیت، لێ ئەو جیهانێ دهەرفینیت دا کو جیهانەکا نوو دامەزرینیت)[1]. ئەگەر ئەڤ پەسنە د دەمێ نهادا ژ هەموو سازیێن راگەهاندنێ بگریت، لێ بەری نها ب چەند سەد سالەکان تنێ ژ رۆژنامەڤانیێ دگریت، ژ بەرکو رۆژنامەڤانی د وارێ راگەهاندنێدا خۆدی دیرۆکەکا هەرە کەڤنە، ب دەهان بەلکی ب سەدان سالان ل پێشیا هەردو سازیێن دی یێن راگەهاندنێ سەرهلدایە و کەتیە د خزمەتا مرۆڤایەتیێدا، لەوما ژی پێدڤیە بەری بچینە د ناڤ بابەتێ خۆدا تشتەکی ژ دیرۆکا رۆژنامەڤانی بزانین، و بەری خۆ نێزیکی ڤێ دیرۆکێ بکەین پێدڤیە هەردو ستوونێن سەرەکیێن رۆژنامەڤانیێ رۆژنامە و کۆڤار بدەینە نیاسین، ل دووڤ پێناسا ئینسکلۆپیدیا بریتانی رۆژنامە بەلاڤۆکەکا خولی (دەوری) بێ بەرگە د دەمێن رێك و پێکدا دهێتەبەلاڤکرن، دەنگوباسان بەلاڤدکەت، رۆژانە یان هەفتیانە دهێتەبەلاڤکرن، هندیکە کۆڤارە ئەوا دناڤ دو بەرگاندا دەردکەڤیت دبێژنێ کۆڤار[2].

ل ڤێرێ دێ گەهینە مژارا خۆ و پرسیار کەین گەلۆ کەنگی رۆژنامەڤانی پەیدابوویە...؟ و د بەرسڤێدا دێ بێژم دگەل پەیدابوونا جڤاکێن مرۆڤایەتی و پەیدابوونا پەیوەندی و تێکەلیێن جڤاکی گومان تێدا

نینە ئەو جڤاكە پێدڤی ب رەنگەكێ راگەهاندنێ بووینە كو ئاگاداری سەروبەر و چالاكی و پێدڤیاتیێن هەڤدو بن، ئەڤ رەنگێ راگەهاندنێ ژی ل دووڤ سەردەم و جهێن خۆ وەراركریە، ڤی سەروبەری پشتی پەیدابوونا نڤیسینێ هێژ وەراركریە، ژێدەر ئاماژە پێ دكەن: چەند هزار سالان بەریا نها حوكمدارێن كەڤنێن میسرێ كاروبارێن وەلاتی و شەرێن لەشكەری و هندەك بابەتێن دی ب رەنگەكێ خەملاندی ل سەر تەحتەبەرا نكراندیە و دگەل خۆ برینە د گۆریدا یان ژی بۆ نڤشێن پشتی خۆ هێلاینە، زێدەباری ڤێ چەندێ پرانیا نووچەیێن خۆ ل سەر دیوارێن بتخانەیان نكراندینە دا كو خەلكەك ببینیت، د هەمان دەمدا هەر بۆیەرەكا گرنگ رووداوا ل سەر تەحتەبەرێن نوو دنكراند و د هەلاویست[٣].

ئەڤ رەنگە نموونە ل گەلەك وەلاتێن دی هەنە، هەمان نموونە د دیرۆكا وەلاتێ مە ژی دا هەنە، پەیكەرێ برۆنزیێ باستكێ نموونەكا ژ ڤان نموونەیان، ل سەر بنواشەكێ لاكێش (مستطیل) ب قەبارەیێ (٣٤×١٣)سم هاتییەچێكرن، ل سەر ڤی بنواشەی سێ گەرێن نڤیسینا بزماركی هەنە، وەك شوینوارناس دبێژن پەیكەر یێ شاهێ ئەكەدی نرام سین(٢٢٩١- ٢٢٥٨ پ.ز)یە د وێ نڤیسینێدا سەركەتنێن نرام سینی ل سەر نەهـ مللەتێن دەڤەرێ یێن دوژمنێن وی هاتینە توومارکرن[٤]، هەر ب ڤی رەنگی تەحتە بەرێ (ملا مەرگێ)، هەروەسان تێكستێن بزماركی یێن خەنەس كو ل سەردەمێ شاهێ ئاشووری تجلات بلەسرێ ئێكێ ل دەوروبەرێن ١١٠٠ پ.ز هاتینەنڤیسین، نەخشەبەرێن گوندكی[٥] نموونێن ڤێ چەندێنە كو شاهێن وی سەردەمی نووچەیێن شەر و سەركەتنێن خۆ تێدا نڤیسینە و نها ئەو نڤیسینە بووینە ژێدەرێن دیرۆكی. پشتی كو میسریێن كەڤن شیاین كاغەزێ ژ گیایێ (بەردی) چێكەن، حوكمدارێن وان كەتنە بەلاڤكرنا ئەو نووچە و تشتێن وان مەرەم پێ هەی ل سەر وێ كاغەزێ، نها ل مۆزەخانەیا لۆڤەر ل پاریس ئێك ژ وان پارچە كاغەزان هەیە كو دزڤریتەڤە بۆ دەوروبەرێ ٣٧٥٠- ٤٠٠٠ سالان بەری نها و گۆتارەكا وەزیرەكێ وی سەردەمی تێدایە كو ئاماژە ب كاروبارێن دەولەتێ دكەت[٦]. ئەڤ رەنگە رۆژنامەیێن دەسپێكی د بەردەوامبووینە گەهشتینە وەلاتێن رۆژهەلاتێ ئاسیا و ئەوروپا و چەندین نموونە د ڤی واریدا هەنە ژ وانا ژێدەر ئاماژە ب رۆژنامەكێ ب ناڤێ (كین بان) دكەن كو ل سالا ٩١١پ. ز ل چینێ دهاتەبەلاڤكرن و رۆژناما فەرمیا حكومەتێ بوو[٧]، گومان تێدا نینە ئەڤ رۆژنامەیە كو هندەك ژێدەران ب یەكەمین رۆژنامە ل جیهانێ دایەنیاسین ژ وان رۆژنامەیان بوویە یێن ب دەستی دهاتەنڤیسین و ل سەر دیواری دهاتەهەلاویستن. یۆلیۆس قەیسەری ل رۆما بەلاڤوكەكا رۆژانە ل ژێر ناڤێ (Acta diurnal Urbis) روودانێن رۆژانە بەلاڤدكر و گەلەك پەسنێن رۆژنامەیێن نها تێدا هەبوونە و هەموو نووچە و بریارێن دەولەتێ و دادگەهان هەمبێزكرینە، ئەڤ بەلاڤوكە ژ ئالیێ نڤیسكارێن تایبەتڤە دهاتەنڤیسین و ل جهێن گشتی دهاتەهەلاویستن و ل سەرانسەری باژێر و دەڤەرێن وی وەلاتی دهاتەبەلاڤكرن، ئەڤ بەلاڤوكا یۆلیۆس قەیسەری نێزیكی پێنج سەدساڵیان ژ سەدسالیا ئێكێ بەری زایینی هەتا سەدسالیا چواری زایینی ژیایە[٨].

ل سەدسالیێن ناڤیندا بەلاڤوكەك ب ناڤێ (پامفلێت) مینا پەرتووكەكا بچووك ل گەلەك جهێن ئەوروپا رۆژئاڤا دهاتەبەلاڤكرن و مژارێن جۆراوجۆر هەمبێزدكرن، ڤان پامفلێتان د وی سەردەمیدا هەتا ئاستەكێ باش مینا رۆژنامێن ڤوناغێن پاشتر رۆلێ خۆدگێرا[٩].

ئەڤ شێوازێ دەسپێكێ رۆژنامەڤانیێ یێ بەردەوام بوو سال ل دووڤ سالێ ل دووڤ ئاستێ رەوشەنبیری و ئابووری و تەكنیكی و مەزنبوونا باژێران وەرادكر، ل سەدسالیا شازدێ ل باژێرێ ڤینیسیا سازیەكا تایبەت ب كۆمكرنا نووچەیان هاتەدامەزراندن، پیشەیەكێ تایبەت ب ناڤێ (نڤیسكارێن دەنگوباسان) هاتەمەیدانێ، ڤان نڤیسكاران ب تایبەت ل باژێرێن مەزن خۆ بۆ ڤێ

چەندێ تەرخواندکر نووچەیێن حوکمداران، روودانێن بازێران و سەروبەرێ بازرگانی و تشتێن دی کۆمدکرن و سەروبەردکرن و پاشتر د بەلاڤوکەکێدا بەلاڤدکرن، ئەڤ بەلاڤوکە ب (غەزەتە Gazzetta یەکی) دراڤێ زیڤیێ وی سەردەمیێ ڤینیسیا د فروشتن، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ بوو ب دەهان سالان پشتی پەیدابوونا رۆژنامەیێن رێکوپێك و چاپکری پەیڤا غەزەتە ل شوونا رۆژنامە دهاتەبکارئینان، و ئەڤ پەیڤە د رێکا زمانێ ترکیرا گەهشتبوو ناڤ زمانێ کوردی و کوردان ژی پەیڤە غەزەتە ل شوونا رۆژنامە بکارئینایە[١٠].

ب داهینانا ئامێرێ چاپێ ل دەوروبەرێ سالا ١٤٤٥ ژ ئالیێ یۆحەنا گۆتینبۆرگی (١٤٠٠- ١٤٦٨) و بەرفرەهبوونا کارێ کاغەزێ سەروبەرێ چاپکرنێ ب رەنگەکێ بەرچاڤ بەرفرەهبوو، شیانێن بەلاڤکرنا پەرتووکان ب تیراژەکا دەهجارکی و پتر بەرفرەهبوون، ئەو پەرتووکا د سەردەمەکیدا چەند دانەیەك ب دەستی ژێ دهاتنەبەلاڤکرن پشتی پەیدابوونا ئامێرێن چاپێ د قۆناغا نوودا ب سەدان و ب هزاران ژێ دهاتنەبەلاڤکرن، د دەمێ نیڤ سەدسالیەکێدا ئانکو هەتا سالا ١٥٠٠ نێزیکی ٣٠٠٠٠ سیهـ هزار کتێبێن چاپکری هەرئێك ب تیراژا ٣٠٠ دانەیان و پتر کەتنە د بازاریدا[١١]. ڤێ پێشکەتنێ رێك ل بەر دەرچوونا رۆژنامێن چاپکری و ب تیراژەکا بەرفرەهتر خوشکر، هێژ سەدسالیا پازدێ ب داوی نەهاتی هندەك ژ وان پامفلێتێن ئامازەپێکری چاپکری کەتنە بەردەستێن خەلکێ، پشتی وێ ب دەمەکی ل هندەك وەلاتێن ئەوروپا دەست ب چاپکرنا رۆژنامەیان هاتەکرن[١٢]. یەکەمین کارێ رۆژنامەڤانیێ بەرچاڤ ل رۆژا ١ گولانا (مایس)ا ١٦٣١دیار بوو دەمێ رۆژنامەیەك ب ناڤێ گازێت (Gazetta) ژ ئالیێ تیۆدو فرانست رینۆدۆ (١٥٨٦- ١٦٥٣) هاتییەبەلاڤکرن[١٣]. بەلاڤکرنا رۆژنامەیان ژ ڤێ قۆناغێڤە ل پێشڤەچوونێ و وەرارێدا چەندین رۆژنامە هاتنەبەلاڤکرن، لێ شیانێن دەرکەتنا رۆژنامەکا رۆژانە نەهاتنەپێش هەتا ل سالا ١٦٦١ێ یەکەمین رۆژنامەیا رۆژانە ل بازێرێ لایبزکێ ئەلمانیا ب ناڤێ (Leipziger Zeingtu) هاتییەبەلاڤکرن[١٤]. ب ڤێ چەندێ ژی ئەلمانیا پێش وەلاتێن جیهانێ کەت د بەلاڤکرنا رۆژنامەکا رۆژانەدا و پشتی وێ نێزیکی چل سالان بریتانیا یەکەمین رۆژنامەیا خۆ یا رۆژانە ب ناڤێ دیلی کوران ل سالا ١٧٠٢ێ بەلاڤکر[١٥].

سەدسالیا هەژدێ ب دەسپێکا گەشبوون و پێشڤەچوون و بەلاڤەبوونا بلەزا رۆژنامەڤانیێ دهێتەهژمارتن، ل سالا ١٧٨٥ رۆژناما ب ناڤودەنگا بریتانی تایمس (The Times) هاتەبەلاڤکرن، هەتا سالا ١٨١٥ تنێ پێنج هزار دانە لێ دهاتنەبەلاڤکرن، ل نیڤا سەدسالیا نوزدێ ئەڤ هژمارە گەهشتە ٥٢ هزاران ل داویا سەدسالیێ گەهشتە ٨٠ هزاران. هەر دڤێ قۆناغێدا سنوورێن کارێ رۆژنامەڤانیێ بەلاڤەبوون و گەهشتنە کیشوەرێ ئاسیا و ل سالا ١٧٨٤ێ ئینگلیزان رۆژناما غەزەتا کەلکەتا (Calcutta Gazetta) ل هندستانێ بەلاڤکر. پشتی هێرشا فرەنسا بۆ سەر میسرێ ل سالا ١٧٩٨ فرەنسیيان بۆ یەکەمین جار چاپخانە ئینا میسرێ و دو رۆژنامە یەك ب فرەنسی و یەك ب عەرەبی ب ناڤێ (التنبیه) بەلاڤکرن، د ناڤ سنوورێن دەولەتا ئوسمانیدا ل سالا ١٨٢٥ ل بازێرێ ئزمیر یەکەمین رۆژنامە ب زمانێ فرەنسی و ل سالا ١٨٣٢ ل ستەنبۆلێ یەکەمین رۆژنامە ب زمانێ ترکیا ئوسمانی ب ناڤێ (تقویم وقائع) بەلاڤکرن، پشتی دەرکەتنا فرەنسیيان ژ میسرێ رۆژنامەیێن وان ژی راوەستیان هەتا ل سالا ١٨٢٨ محەمەد عەلی پاشای دووەمین رۆژناما عەرەبی ل میسرێ ب ناڤێ (الوقائع المصریه) بەلاڤکری، بەلاڤبوونا رۆژنامان ژ پایتەختێ دەولەتا ئوسمانێ بەرەڤ پایتەختێن ویلایەتان کەتە رێ و ل سالا ١٨٦٩ یەکەمین رۆژنامەیا (عیراقێ) ل بەغدا ب ناڤێ (الزوراء) هاتەبەلاڤکرن، یەکەمین رۆژنامە ل مووسلێ ب ناڤێ (الموصل) ل ٢٥حزیرانا ١٨٨٥ی هاتییەبەلاڤکرن[١٦]، هندی پەیوەندی ب گەل و وەلاتێن دیترێن دەڤەرا رۆژهەلاتێ ناڤینڤە هەی یەکەمین رۆژنامەیا ئیرانێ ل سالا ١٨٥١ێ

هاتییەبەلاڤکرن، هندی پەیوەندی ب ئەرمەنانڤە هەی ل سالا ١٧٩٤ یەکەمین کۆڤارا ئەرمەنی ل باژێرێ مەدراس- هندستانێ بەلاڤکریە و هەتا سالا ١٧٩٦ بەردەوامبوویە و ب ڤێ چەندێ ئەرمەن دبنە دهەمین مللەت ل جیهانێ بووینە خودانی رۆژنامەڤانییا خۆ ل پێشیا مللەتێن وەك ترك و فارس و عەرەبان بوون[١٧].

هەروەك هاتییەگۆتن رۆژنامەڤانی دهێتەهژمارتن ئێك ژ گرنگترین ستوونێن شارستانییا هەڤچەرخ، هۆنەرەکە ب هۆکارێن بازێرڤانییێڤە هاتییەگرێدان، و پتر ل بازێران بەلاڤەدبیت[١٨]. ژ ڤێ گۆتنێ و پێداچوونا چوویی دیاردبیت کو رۆژنامەڤانی بەرهەمێ شارستانیێ و بازێرانە، ل بازێران ژی بەرهەمێ حوکمدارییا سەربەخۆ ئانکو دەولەتێ و شیانێن ئابووری و تەکنیکییە، ب درێژییا دیرۆکێ و ب تایبەت ژ چەرخێن ناڤین بەرەف ژوور کو رۆژنامەڤانی پەیدابوویە و کێم کێمە وەرارکریە کوردان نە بازێر نە دەولەت و نەژی شیانێن ئابووری هەبوونە، چەند میرگەهەکان د قۆناغێن جودادا حوکمداری ل هندەك دەڤەرێن کوردستانێ کرینە ل سەر بنیاتەك دەرەبەگایەتی هاتینەدامەزراندن و د پرانییا دەماندا سەر ب دەولەتێن مەزنێن دەڤەرێ بوون، نە بازێرێن مەزن هەبوونە کو ببنە سەنتەرێن بازرگانی و شیانێن ئابووری و تەکنیکی لێ هەبن و رێخوشکەر بن بەرامبەر ئەفراندن و پێشکەتنێن نوو مینا چاپخانە و رۆژنامەڤانیێ، د هەمان دەمدا ئەگەر هندەك كوردێن خودان شیان ل بازێرێن مەزنێن دەوروبەر هەبن چ وەك زانایێن ئایینی یان خویندکارێن زانستێن ئایینی یان بازرگان و کاسبکار پتر د خەما خۆ و خزمەتا زانستێن ئایینی یان دەستەلاتدارێن وان دەولەتاندا بوونە، نە ژ وان کەسان بوونە خۆدی هشیارییەك نەتەوەیی بن و هزرێ ل کارەکێ مینا رۆژنامەڤانیێ بکەن، زێدەباری نەبوونا ئازادیێ، ژ بەر ڤان ئەگەران دێ بینین پەیدابوونا رۆژنامەڤانییا کوردی بچاڤ پرانییا مللەتێن دەڤەرێڤە درەنگتر پەیدابوویە، ل ئاستەکی ئەم دکارێن بێژین کورد دوا مللەتێ مەزنێ رۆژهەلاتا ناڤینبوون بووینە خۆدی رۆژنامەڤانی.


كردستان

ب هەررەنگەکێ هەبیت ل داوییا سەدسالییا هەژدێ هژمارەکا کەسایەتی و مەزنە مالباتێن کورد ژ بەر چەندین ئەگەران ل پایتەختێ دەولەتا ئوسمانی کۆمڤەبوون، ڤان کەسان د ئێکدەمدا شیانێن ئابووری و رەوشەنبیری هەبوون و خۆدی هەستەکا نەتەوەیی بوون، گەنجێن ڤان مالباتان هزر ل خزمەتا گەلێ خۆ و پێشڤەبرنا بزاڤا نەتەوەیی و رەوشەنبیرییا کوردی و بەری هەموویان ژی هزر ل بەلاڤکرنا رۆژنامەڤانی و چاپکرنێن کوردی دکر، لێ هەرچەندە د وی سەردەمیدا وانا شیانێن ئابووری هەبوون و رێخۆشکەرێن تەکنیکی ژی مینا چاپخانەیان ل ستەنبۆلێ هەبوون لێ ئەو ئازادییە نەبوو ڤی کاری ئەنجامبدەن، لەوما ژی هەردو میرێن بەدرخانی ژ ستەنبۆلێ هاتنە قاهیرە پایتەختێ وەلاتێ میسرێ و ل وێرێ دەسپێکا دیرۆکا رۆژنامەڤانییا کوردی دانا

و یەكەمین رۆژناما كوردی (كوردستان)* ل رۆژا ٢٢ نیسانا ١٨٩٨ێ ل وێ بازێری بەلاڤكر[١٩].

ل ٢٢ نیسانا ١٨٩٨ێ ل قاهیره بەرێ بنیاتێ رۆژنامەڤانیا كوردی هاتەدانان، دەمەكێ درێژ ب سەر ڤەنەچوو گورانكارییێن دەسپێكا سەدسالیا نوزدێ هاتنەپێش ل تیرمەها ١٩٠٨ شۆرشا دەستووری ل پایتەختێ دەولەتا ئوسمانی روودا، ب ڤێ شۆرشێ بهارەكا كورت د ژیانا كورداندا دەسپێكر پشتی وێ شۆرشێ كۆمەلە و رێكخراوێن رەوشەنبیری و سیاسییێن كوردی هاتنە دامەزراندن، رۆژناما (كورد تعاون و ترقی غزتەسی)ژ ئالیێ كورد (تعاون و ترقی جمعیتی) ڤە هاتەبەلاڤكرن[٢٠]، ب ڤێ چەندێ بەرۆكا رۆژنامەڤانیا كوردی ژ دەرڤەی سنوورێن دەولەتا ئوسمانی گەهشتە پایتەختێ دەولەتا ئوسمانی و د ناڤبەرا ١٩٠٨- ١٩٢٠ێ رۆژناما كوردستان خولا دووێ، كۆڤارا رۆژی كورد ل سالا ١٩١٣، كۆڤارا هەتاوی كورد، پشتی شەرێ جیهانیێ ئێكی كۆڤارا ژین ل سالا ١٩٢٠ و رۆژناما كوردستان خولا سیێ ١٩٢٠ل ستەنبۆلێ هاتنە بەلاڤكرن، ب ڤێ چەندێ ژی نەراوەستا بەرەف پایتەختێن ویلایەتێن ئوسمانی چوو و ل سالا ١٩٠٩ رۆژناما پەیمان ل دیاربەكرێ و كۆڤارا بانگی كورد سالا ١٩١٤ێ ل بەغدا هاتنەبەلاڤكرن، ل رۆژهەلاتێ كوردستانێ (كوردستانا وی سەردەمی ژێر دەستەلاتێ ئیرانێ) ژی كار بۆ بەلاڤكرنا رۆژنامەیێن كوردی هاتەكرن [٢١].

پشتی روودانا شەرێ جیهانی و سەروبەرێ پشتی شەری هاتییەپێش ب سەرژنوو دابەشكرنا دەڤەرێ و دابەشكرنا كوردستانا ل ژێر دەستەلاتێ ئوسمانی ل سەر سێ دەولەتێن (تركیا، عیراق، سوریا) یێن نوو دامەزراندی ل سەر بنیاتەك نەتەوەیی و پشتی كو ئەفسەری ترك مستەفا كەمالی ل سالا ١٩٢٢ێ دەستەلاتێ ستەنبۆلێ گرتییە دەست و دەولەتا كۆماریا تركیا ل ١٩٢٣ێ راگەهاندی[٢٢]، كورد ل باكوورێ كوردستانێ و تركیا ب یەكجاری ژ هەموو مافێن خۆ هاتنە بێ باهركرن، رۆژنامەڤانی و چاپكرنا كوردی نەتنێ هاتەقەدەغەكرن، بەلكی رۆژنامە

و چاپکرینێن پێشتر ژی هاتنەکۆمکرن و سوتن، ل سوریا و ئیرانێ ژی ب هەمان شێوە، تنێ ل باشوورێ کوردستانێ و عیراقێ و ژ ئەنجامێ ئەو پێکهاتنێن ناڤبەرا حکۆمەتا مەلکیا عیراقێ و حکۆمەتا بریتانیا وەك داگیرکەر و پاشتر ژی وەك ئینتیداب ل عیراقێ و پێکهاتنێن ناڤبەرا وان و کۆمەلا مللەتان و ل ژێر باندۆرا بزاڤا نەتەوەییا کوردی ل باشوورێ کوردستانێ ب تایبەت شۆرشێن شێخ مەحموودێ نەمر د ناڤبەرا ١٩١٩- ١٩٢٤ هەتا ئاستەکی رێ ل بەر هندەك مافێن نەتەوەیی و رەوشەنبیری بۆ کوردێن عیراقێ هاتەڤەکرن، د وارێ رەوشەنبیری و پەروەردەییدا رێ ل بەر خواندنا کوردی ل قۆناغا سەرتایی ل پارێزگەهێن هەولێرێ و سلێمانیێ و هندەك جهێن کەرکووکێ هاتەڤەکرن[٢٣]، د هەمان دەمدا رێ هاتەدان بۆ چاپکرن و بەلاڤکرنا رۆژنامە و کۆڤار و هندەك پەرتووکێن کوردی، هەژیە بێژین هەروەك ئاماژە پێ هاتییەدان بەری شەرێ جیهانیێ ئێکێ ب چەند هەیڤەکان یەکەمین کۆڤارا کوردی ل بەغدا ب ناڤێ (بانگی کورد) ل ١٩١٤ێ هاتەبەلاڤکرن، و دسالێن شەریدا و دەمێ لەشکەرێ بریتانیا گەهشتیە بەغدا د ناڤبەرا ئێکێ کانوونا دووێ ١٩١٨- ٢٧ کانوونا دووێ ١٩١٩ رۆژنامەك ب زمانێ کوردی ب ناڤێ (تێگەیشتنی راستی)ل بەغدا بەلاڤکر[٢٤] کو ب یەکەمین رۆژناما کوردی ل عیراقێ دهێتە نیاسین.

ب داویهاتنا شەرێ جیهانی ل چریا دووێ ١٩١٨ یەکەمین حوکمداریا شێخ مەحموودێ نەمر ب پشتەڤانیا لەشکەرێ بریتانیا ل سلێمانیێ هاتەراگەهاندن، لێ ڤێ حوکمداریێ گەلەك نەڤەکێشا و ل مەها حزیرانا ١٩١٩ێ شەرێ د ناڤبەرا هێزێن شێخ مەحموودی و لەشکەرێ بریتانیا ل دەربەندی بازیان رووددا، د ئەنجامدا بەرخودانا هێزێن کوردان شکەست و شێخ مەحموود هاتەگرتن و دادگەهکرن و پاشتر سرگۆنکرن بۆ گزیرتا ئەندامان ل هندستانێ[٢٥] و لەشکەرێ بریتانیا ب فەرماندەیا ئەفسەرێ ئینگلیزێ کوردیزان و رەوشەنبیر میجەرسون هاتنە د سلێمانییێدا، ئەفسەرێ ناڤبری شارەزییەکا تەواو د سەروبەرێ کوردستانێ و دەڤەرێدا هەبوو، سالێن بەری شەرێ جیهانی ل ئیرانێ ژیابوو و زمانێ فارسی باش دزانی و شارەزیی د رەوشەنبیریا رۆژهەلاتیدا هەبوو، د جلوبەرگێن بازرگانەکێ ئیرانیدا ب ناڤێ میرزاغولامێ شیرازی سەرەدانا حەلەبجە و هندەك دەڤەرێن دی یێن سلێمانیێ کربوو، وەك هاتییەگۆتن ژ کوردەکی باشتر کوردی دزانی و هەر وی ژی رۆلەك سەرەکی دبەلاڤکرنا رۆژناما (تێگەیشتنی راستی)دا هەبوو، پشتی کو ب سەرکردایەتیا لەشکەرەکێ ئینگلیزی چوویە د بازێرێ سلێمانیێ دا، بەری هەر تشتەکی هزر ل وێ چەندێ کر د وارێ رەوشەنبیریدا خزمەتا بازێری بکەت، ل بەراهیێ ژی زمانێ کوردی کرە زمانێ خواندنێ ل خواندنگەهێن بازێری و و چاپخانەك ئینا بازێری ل ٢٩ نیسانا ١٩٢٠ێ دەست ب بەلاڤکرنا رۆژنامەکێ ب ناڤێ (پێشکەوتن) کر


پیشکوتن

روژ پنجشنبه ١١ شعبان ١٣٣٨ ٢٩ ابریل ١٩٢٠

هەتا ٢٧ تیرمەها (جولای) ١٩٢٢ێ (١١٨) هژمار ب رەنگێ هەفتییانە ژ ڤێ رۆژنامێ هاتنەبەلاڤکرن[٢٦]. دەستەلاتداریا راستەوخۆیا لەشکەرێ بریتانی ل سلێمانیێ ژ حزیرانا ١٩١٩- ئیلونا ١٩٢٢ێ ڤەکێشا، هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن خواندنا کوردی ل خواندنگەهـان، ئینانا یەکەمین چاپخانە و بەلاڤکرنا رۆژناما (پێشکەوتن) کو یەکەمین رۆژنامەیا باشووریێ کوردستانێ یە بەرهەمێن هەرەدیار و بەرچاڤێن ڤێ قۆناغێ بوون، ل داوییا ڤێ قۆناغێ سەروبەر هاریکار بوو بۆ هندەك چالاکیێن رەوشەنبیریێ خەلکێ باژێری ب خۆ، ئەوبوو ل ٢١ تیرمەها ١٩٢١ێ کۆمەلا کوردستان (جەمعیەتی کوردستان) ب سەرۆکاتییا مستەفا پاشا یاملکی وەك یەکەمین کۆمەلەیا کوردی ل سلێمانیێ هاتەدامەزراندن، ڤێ کۆمەلێ ل رۆژا ٢ تەباخا ١٩٢٢ێ رۆژنامەك ئازاد و سەربەخۆ و مللی ب ناڤێ (بانگی کوردستان) بەلاڤکر و ل هەمان چاپخانەیا میجەرسونی ئینایە سلێمانیێ چاپکر[٢٧]. پشتی ڤێ گورانکاریێ ب دەمەکێ کورت ل رۆژا ٣٠ ئیلونا ١٩٢٢ شێخ مەحموود دزڤریتەڤە سلێمانیێ و دووەمین قۆناغا حوکمداریا شێخ مەحموودیێ دەست پێ دکەت د ڤێ قۆناغێدا کو هەتا ٣ ئادارا ١٩٢٣ێ ڤەکێشای و قۆناغا سیێ یا حوکمداریێ یا ١٧ حزیرانا ١٩٢٣ هەتا گولانا ١٩٢٤ ڤەکێشای سێ رۆژنامێن دی یەك ل دووڤ یەك (رۆژی کوردستان)، (بانگی حەق) و (ئومێدی ئیستقلال) هاتنە بەلاڤکرن، هەرسێ ژی ل هەمان چاپخانەیێ هاتنەچاپکرن[٢٨]. پشتی نەمانا حوکمداریێن شێخ مەحموودی و ل دووڤ سەروبەرێ سیاسییێ عیراقێ و باشووریێ کوردستانێ ئەڤ چالاکیێن رۆژنامەڤانی د بەردەوامبوون و هەمان چالاکی ژ سلێمانیێ بەرەف بەغدا و پاشتر ژی بەرەف رەواندز و هەولێر و کەرکووکێ چوون، سەرژ نوو رۆژناما (بانگی کوردستان) ب هژمار ١٤ ل بەغدا دەست ب بەلاڤکرنێ کر و هژمارا وێ یا داویێ هژمار ١٧ ل نیسانا ١٩٢٦ ل بەغدا هاتەبەلاڤکرن[٢٩]. د ڤێ قۆناغێدا ١١ ئادارا ١٩٢٥ێ کۆڤارا (دیاری کوردستان) ل بەغدا هاتەبەلاڤکرن[٣٠]. ب ڤی رەنگی کاروانێ رۆژنامەڤانییا کوردی ل بەغدا ژی مینا سلێمانیێ هەتا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ ل عیراقێ بێ بەردەوام بوو، هندی پەیوەندی ب سنووریێ نهایێ پارێزگەها هەولێرێ ڤە هەی، یەکەمین کارێ رۆژنامەڤانی ل رەواندزێ ل سەر دەستێ حسێن حوزنی موکریانی ب بەلاڤکرنا کۆڤارا (زارکرمانجی) ل ٢٥ گولانا ١٩٢٦دەسپێکریە و هەتا ٢٣ تیرمەها ١٩٣٢ێ ٢٤ هژمار ژێ هاتینەبەلاڤکرن[٣١]. ئەڤ کۆڤارە ب دەسپێکا رۆژنامەڤانییا کوردی ل سنووریێ نها یێ پارێزگەها هەولێرێ د هێتەهژمارتن، پشتی وێ د ناڤبەرا ٢٤ چریا یەکەم ١٩٣٥- ١٦ گولانا ١٩٣٦ێ یەکەمین کۆڤار ل باژێرێ هەولێرێ ب ناڤێ (رۆناکی) هاتییەبەلاڤکرن[٣٢].


رۆژنامەی ژین لە سلێمانی

ووتە ئاشکراکەی ستالین

هندی پەیوەندی ب پارێزگەها کەرکووکێ ڤە

هەی، ئەڤ پارێزگەهە ژ ئالیێ رۆژنامەڤانیڤە ژ پارێزگەهێن دیترێن باشووری کوردستانێ کەڤنترە، لێ درەنگتر ژ هەولێرێ و سلێمانیێ رۆژنامەڤانییا کوردی لێ پەیدابوویە، یەکەمین رۆژنامە ب ناڤێ (الحوادث) ل ٢٤ شباتا ١٩١١ ل ڤێ بازێری ب زمانێ ترکیا ئوسمانی هاتییەبەلاڤکرن و هەتا سالا ١٩١٨ بەردەوام بوویە، پشتی وێ د هەمان سالدا رۆژنامەك دیتر ب ناڤێ (اژانس) ب هەمان زمان هاتییەبەلاڤکرن، ئەو ژی هەتا ١٤ گولانا ١٩١٨ بەردەوامبوویە، پشتی وان ژی ژ ٢٤ نیسان - ٢٠چریا دووێ ١٩١٣ کوڤارەك هۆنەری ئەدەبی ب ناڤێ (معارف) ب هەمان زمان هاتییە بەلاڤکرن[٣٣]. پشتی داویهاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ و داگیرکرنا کەرکووکێ ژ ئالیێ لەشکەرێ بریتانیا ڤە دەستەلاتێ داگیرکەر ل ١٥ کانوونا ئێکێ ١٩١٨رۆژناما (نجمه) ب زمانێ عەرەبی ل ڤی بازێری بەلاڤکر و پاشتر ژی بوویە زمانێ ترکی و هەتا سالا ١٩٢٦ێ بەردەوام بوویە و ٥٠٥ هژمار ژێ بەلاڤبووینە، پاشتر ناڤێ وێ هاتییەگۆهارتن و ب (کرکوك) هاتییە ناڤکرن و یەکەمین هژمارا (کرکوك) ل ١٢ چریا ئێکێ ١٩٢٦ێ هاتییەبەلاڤکرن، ل بەراهیێ رۆژنامەك ترکیزمان بوویە، ل سالا ١٩٣١ دو بەرپەرێن کوردی لێ هاتینەزێدەکرن، ئانکو بوویە رۆژنامەك ترکی کوردی، ل سالا ١٩٥٢ێ پشکا عەرەبی ژی لێ هاتییە زێدەکرن و ژ سالا ١٩٥٨یڤە ناڤێ وێ بۆ (گاوریاغی) هاتییەگوهارتن و زمانێ وێ ژی بوویە عەرەبی هندەك بەرپەرێن کوردی و ترکمانی تێدا هەبوون، ل سالا ١٩٦٠ جارەکادی ناڤێ وێ بوویە (کرکوك) و تنێ ب عەرەبی دهاتەبەلاڤکرن و هەتا ٢ تەباخا ١٩٧٢بەردەوام بوو[٣٤]،. ب ڤێ چەندێ و ب دو بەرپەرێن رۆژناما (کرکوك) سالا ١٩٣٠ دبیتە دەسپێکا پەیدابوونا رۆژنامەڤانییا کوردی ل بازێرێ کەرکووکێ.

## رۆژنامەڤانی ل دەڤەرا بەهدینان

دێ هێینە سەر مژارا سەرەکیا خۆ رۆژنامەڤانی ل دەڤەرا بەهدینان ئانکو پارێزگەها دهۆکێ یا نها، چ گومانەك تێدا نینە پشتی هەموو پارێزگەهێن دی یێن باشووری کوردستانێ و گەلەك پارێزگەهێن عیراقێ رۆژنامەڤانی گەهشتیە پارێزگەها دهۆکێ، یەکەمین رۆژنامە (الزوراء) ل عیراقێ ل ٥ حزیرانا ١٨٦٩ێ هاتییەبەلاڤکرن، نێزیکترین پارێزگەها عیراقێ بۆ دهۆکێ مووسلە کو هەتا سالا ١٩٦٩ێ دهۆك ب خۆ پشکەك بوو ژ ڤێ پارێزگەهێ یەکەمین رۆژنامە ل مووسلێ ب ناڤێ (موصل) ل ٢٥ حزیرانا ١٨٨٥ێ ئانکو ١٦ سالان پشتی دەرچوونا یەکەمین رۆژناما عیراقێ هاتییەبەلاڤکرن و یا بەردەوام بوویە هەتا سالا ١٩١٨ێ و پاشتر بوویە ئورگانێ دەستەلاتداریا ئینگلیزی ل عیراقێ[٣٥].



نێزیکترین پارێزگەها باشووری کوردستانێ بۆ دهۆکێ هەولێرە یەکەمین کوڤار هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ل سنووری پارێزگەها هەولێرێ دەرکەتی

کۆڤارا ((زارکرمانجی)) ئەوا ل ١٩٢٦ێ دەرکەتی.

ل ڤێرێ ئەگەر ئاماژە ب ئەگەرێن گیروبوونا رۆژنامەڤانییێ ل ڤێ پارێزگەهێ بکەین، ئەم دکارین د چەند خالەکاندا بەرچاڤبکەین، لێ هەرهەموو ئەو خالە د خالەکا سەرەکیدا هەڤدگرن ئەو ژی سەروبەرێ شارستانی و بازێریی یە، وەك د بەرپەرێن چوویدا ئاماژە پێ هاتیەکرن رۆژنامەڤانی بەرهەمێ شارستانیەتێ و بازێرانە، د قۆناغا پەیدابوونا رۆژنامەڤانییێدا ل سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ نە شارستانیەت هەبوویە و نەژی بازێر هەبوونە، ئەگەر ل هەرجهەکی ئەڤ دویە هەبوون، ئەڤە ئەو جهێ خواندنگەهـ و خواندنا بلندە و تەخا رەوشەنبیر و هزرڤان خۆدی شیانە، د هەمان دەمدا شیانێن ئابووری و تەکنیکی لێ هەنە، ب بوونا خالێن چوویی دێ پێدڤی ب دەستەلاتەکێ خۆیی و ئازادیێ بیت، هەموو ئەڤە رێخوشکەرن بەرامبەری پەیدابوونا رۆژنامەڤانیێ و هەموو ئەڤێن چوویی ژی هەتا دەسپێکا سالێن هەفتیان ژ سەدسالیا بیستێ ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ یا نها نەبوون، بازێر ب رامانا دروستا بازێران نەبوون، بازێرێن مەیێن نها گوندێن مەزن بوون، سالا ١٩٢٣ هژمارا خەلکێ دهۆکێ تنێ ٢٧٠٠کەس بوو، سالا ١٩٤٧ێ تنێ ٥٦٢١کەس بوو، ل سالا ١٩٦٥ێ ٨٦٠٣ کەس بوو ئانکو هێشتا گوندەکێ مەزن بوو و ل سالا ١٩٧٧ێ ئەڤ هژمارە گەهشتیە ٣٦٥١٢کەسان ئانکو د ڤێ سالێدا دهۆك بازێرەکێ بچووك بوویە[٣٦]. ئەز دبینم سەروبەرێ بازێرێن دی یێن دەڤەرێ ژ یێ دهۆکێ باشتر نەبوویە. گومان ژی تێدا نینە د سەروبەرەکێ هوساندا نە ژێرخانەکا ئابووری و نە ژی شیانێن تەکنیکی ل ڤان بازێران هەبوونە، ژ ئالیێ رەوشەنبیریڤە هەتا سالا ١٩٥١- ١٩٥٢ تنێ خواندنگەهەکا سەرەتایی ل بازێرێ دهۆکێ و هەتا سالا ١٩٥٠ێ ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ یا نها نێزیکی(٣٥) خواندنگەهێن سەرتایی هەبوون، ل سالا ١٩٤٥- ١٩٤٦ یەکەمین خواندنگەها ناڤنجی ل ڤێ دەڤەرێ ل دهۆکێ هاتییەڤەکرن و ل سالا ١٩٤٨- ١٩٤٩ ئەڤ خواندنگەهە بوویە دواناڤنجی[٣٧]. د ڤی سەروبەریدا چ گومان تێدا نینە کو تەخا رەوشەنبیر و هزرڤانان ل دەڤەرێ یا کێم بوویە و ئەو کتا کێم ژی نەشیاینە ل دهۆکێ یان جهێن دی یێن دەڤەرێ کارەکێ رۆژنامەڤانی ئەنجامبدەن، لەوما ژی دێ بینین کەسانێن خواندەڤا و رەوشەنبیرێن دەڤەرێ بەرێ وان کەتیە جهێن دیترێن عیراقێ و شیانێن وان ل وان جهان دیاربوونە وەك دێ پاشتر دیارکەین.


رۆژی پنجشنبه ٧ تشرین ثانی ١٣٣٤
عدد ١
ژین
هفته‌لق غزته‌در
آلتی آیلغی ١٢٠ غروشدر
نیف ساله ١٢٠
درج اولونمیان مقاله‌لر اعاده ایدلمز
دین، ادبیات، اجتماعیات و اقتصادیاتدن بحث ایدر ... کوردجه مجموعه‌در
مندرجات
حیدری زاده ابراهیم ..... بر حسبحال
بر کورد ..... کوردلر اویقوده دکل
کوردی ..... ضحاك افسانه‌سی
ع. رحمی ..... بانك
ع. رحمی ..... خو آمه

هەروەك مە گۆتی رۆژنامەڤانی گەلەك ب درەنگی گەهشتیە بەهدینان، لێ دێ پرسیارەکێ کەین، گەلۆ ژ چ دەمڤە خەلکێ بەهدینان تێکەلی دگەل رۆژنامەڤانیێ هەبوونە...؟ یان ژ کەنگی وەرە بەهدینی ب رۆژنامەڤانیێ ئاشنا بووینە...؟ د بەرسڤێدا ئەم دکارین بێژین هەمان فاکتەرێن بووینە ئەگەرێ گیروبوونا رۆژنامەڤانیێ ل بەهدینان، ئەگەر هندێ بوونە ب درەنگی خەلکێ ڤێ دەڤەرێ دگەل رۆژنامەڤانیێ ئاشنابن. ل دووڤ

ژێدەرێن بەردەست د سەردەمێ دەرچوونا رۆژناما (موصل)یا ئاماژە پێکریدا ئەو رۆژنامەیە گەهشتیە دەڤەرێ، هەروەك د هژمارا وێ یا رۆژا (۱۹۰۳/۸/۱۳)ێدا کو ئابوونەیێن رۆژنامەیا (موصل) یێن ل نك قەزا دهۆك کو یێن پار و ئەڤ سالەنە و (۸۵۵) قرشن هاتینە وەرگرتن و بۆ رۆژنامەیێ هاتینە هنارتن، رۆژنامەیێ سوپاسیا (مستەفا شەوقی ئەفندی) بریکارێ قائیمقامێ قەزا دهۆکێ کریە ژ بەر هاریکاریا وی د ڤی بیاڤیدا، هەروەسا د هژمارا وێ یا (۱۹۰۳/۹/۱۷) ێدا ئاماژە کریە ئابوونەیا رۆژنامەیێ ل هەردو قەزایێن شنگال و ئامێدیێ و گۆتییە کو گوژمێ (۱۰۳۰) قرشان ژ شنگال و پتر ژ (۱۰۰۰) قرشان وەك ئابوونەیێن ڤێ سالێ گەهشتینێ، ئەڤە ژی ب هاریکاریا (عزەت بەگ ئەفندی) قائیمقامێ شنگال و (عەبدوللا ئەفندی) قائیمقامێ ئامێدیێ.

هەر ب ڤی رەنگی د هژمارا رۆژا (۱۹۰۵/۳/۲۳) ێدا ئاماژە ب گەهشتنا گوژمێ (۱۰۸۰) قرشان کریە وەك ئابوونەیا رۆژنامەیا (موصل) ژ ئامێدیێ ئەڤە ژی ب هاریکاریا (ئەحمەد بەگ ئەفندی)یێ قائیمقام و (ئەسعەد ئەفندی)یێ رێڤەبەرێ وێ یێ دارایی[٣٨] هەرچەندە هزر بۆ هندێ دچیت کو ئەڤ رۆژنامەیە گەهشتیە دەست بەرپرسێن کارگێرییێن دەڤەرێ کو پرانییا وان ترك و بیانی بوون لێ ئەم دکارین بێژین هندەکان ژ خەلکێ دەڤەرێ ژی ئەڤ رۆژنامەیە دیتینە و خواندینە[٣٩]. پشتی ڤێ رۆژنامەیێ د هژمارا ۹ رۆژا ۳۰ کانوونا دووێ ۱۹۰۹ێ یا رۆژناما (کرد تعاون و ترقی غزتسی) کەسەکی ب ناڤێ (رکانی زادە: سید محمد عصمت اه) بابەتەك دەربارەی گرنگیا زانست و فێربوونی و سەروبەرێ خواندنگەهێن کوردستانێ بەلاڤکریە و د بابەتیدا دیارە کو د دەمێ نڤیسینا بابەتیدا ئەو ل دەرڤەی کوردستانێ بوویە لێ سەردەمەکی ژی ل خواندنگەهێن کوردستانێ بوویە. هندی پەیوەندی ب مژارا مە ڤە هەی هزر بۆ هندێ دچیت ئەڤ (رکانی زادە)یە ژ عەشیرەتا رێکانی بیت و بابەتێن دی د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێدا هەنە پشتەڤانیا ڤێ بۆچوونی دکەن[٤٠]. هندی بابەتێ دیترە کو چ گومان تێدا نینە خەلکێ بەهدینانە کەسەکی ب ناڤێ (زاخۆیی) نڤیسینەك ل ژێر ناڤێ (ژ بازاربیانرا) د هژمار ۱۹ رۆژا ۹ حزیرانا ۱۹۱۹ کۆڤارا ژین) ستەنبۆلێ دا بەلاڤکریە[٤١].

پشتی شەرێ جیهانیێ ئێکێ و جارەکادی دابەشبوونا کوردستانێ، دەڤەرا بەهدینان ژی وەك پشکەك ژ ویلایەتا مووسلێ (باشوورێ کوردستانێ) کەتە د ناڤ سنوورێ لیوا (پارێزگەها) مووسلێ ژ دەولەتا نوو دامەزراندیا عیراقێ، د وی سەردەمیدا هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن چ هۆکارێن هاریکار مینا بوونا بازێران، سەروبەرێ ئابووری و تەکنیکی و ئاستێ رەوشەنبیری ل دەڤەرێ نەبوونە کو رێخوشکەرێن رۆژنامەڤانی ل دەڤەرێ پەیدا ببیت، ئەگەر کەسەکی ئاستەکێ رەوشنبیریێ وەسان هەبیت کو ڤی کاری بکەت دڤیا ل جهەکێ وەك مووسلێ یان بەغدا بکەت، ژ بەرکو مووسل هەتا ئاستەکێ ببوو سەنتەرێ رەوشەنبیری ئابووریێ دەڤەرا بەهدینان و بەغدا ژی مینا پایتەختێ عیراقێ سەنتەرێ هەموو چالاکیێن عیراقێ بوو. د ڤێ سەروبەریدا هەتا داوییا سالێن سیهان ژ سەدسالیا بیستێ چ رەنگە چالاکییەك رەوشەنبیری یان رۆژنامەڤانی ل ڤێ دەڤەرێ نەهاتییەکرن و نە ژی خەلکێ ڤێ دەڤەرێ ل جهێن دیترێن عیراقێ ئەنجامدایە.

ل داوییا سالێن سیهان و دەسپێکا چلان هژمارەك ژ دەرچوویێن خواندنگەهێن سەرەتایێن دەڤەرا بەهدینان ب مەرەما بەردەوامیدانێ ب خواندنا ل قۆناغێن ناڤنجی و دواناڤنجی و خواندنگەهێن مامۆستایان و پاشتر ژ خواندنێن بلندتر مەدەنی و لەشکەری قەستا مووسلێ و بەغدا کرن، د ڤێ قۆناغێدا بەری وێ ژی ب چەند سالەکان ل سالا ۱۹۲۷ کۆمەلا خۆیبوون ل لبنانێ وەك رێکخستنەك نەتەوەیی کوردی هاتبوو دامەزراندن ب چالاکی ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ و سوریێ چالاکی دکرن[٤٢] و ل دەسپێکا سالێن سیهان ژی مالباتا بەدرخانییان ل شامێ ب بەلاڤکرنا یەکەمین هژمارا کۆڤارا (هاوار) ل ١٥ گولانا ۱۹۳۲ێ دەست ب بزاڤەك رەوشەنبیریا

بەرەفرەهـ کرن[٤٣]. هەر د ڤێ قۆناغێدا کۆمەلا (هیوا) ل سالا ١٩٣٩ێ وەك رێکخستنەك نەتەوەیی کوردی هاتبوو دامەزراندن، د هەمان دەمدا ژی هندەك چالاکیێن رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانیا کوردی ل بەغدا وەك بەلاڤکرنا کۆڤارا (گەلاویژ) ١٩٣٩- ١٩٤٩و بەلاڤبوونا رۆژناما (ژیان)[٤٤] ل سلێمانیێ و یێن دهاتنەکرن، ڤان هەموو بزاڤێن رەوشەنبیری و سیاسی باندۆرا خۆ ل سەر خویندکارێن دەڤەرا بەهدینان ل مووسلێ و بەغدا هەبوون کو ب رێکا رێکخستنێن خۆیبوون و (هیوا) ل ڤان کۆڤار و رۆژنامەیێن کوردی نێزیك ببن و بەلکی ب چەند نڤیسینەکان پشکداریێ د بەرپەرێن کۆڤار و رۆژنامەیێن ناڤبریدا بکەن، بۆ پشتراستکرنا بۆچوونا خۆ دێ چەند نموونەکان بەرچاڤکەین سادق بەهائەدین (١٩١٨- ١٦ حزیران ١٩٨٢) خویندکارێ دواناڤنجی بوو ل مووسلێ، سالا ١٩٣٦ێ ب رێکا شەهید عیزەت عەبدولعەزیز (١٩- ١٩٤٧) هژمارەکا رۆژناما (ژیان) گەهشتیە وی دەمێ خواندی و خواندی و خواندیەڤە یەکسەر نامە بۆ سەرنڤیسەرێ وی هنارت و ژێ خواست وەك ئابونە رۆژنامێ بۆ بهنێرنە مووسلێ و ئەو ژی ل دووڤ داخوازا وی هاتن[٤٥]. ئەڤە یەکەمین تێکەلیا سادق بەهائەدینی بوو دگەل رۆژنامەڤانیا کوردی، پاشتر کۆڤارا (هاوار) و (گەلاویژ) دگەهنێ و دەرۆکێن شارەزاییێ دگەل رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانیا کوردی ل بەر ڤەدبن. کەسایەتیێ دهۆکی محەمەد سەعید مفتی د دیدارەکێدا ڤەدگێریت: ل سالا ١٩٣٧ بۆ خواندنا ناڤنجی ئەم چووینە مووسلێ، ل سالا ١٩٣٩ێ مە دگەل سەیدا سالح یوسفی کو ل دادگەها مووسلێ کار دکر هەڤدونیاسی، سەیدای داخواز ژ مە کر ئەم بچینە د رێزێن حزبا (هیوا) دا ب ڤی رەنگی یەکەمین شانا حزبا (هیوا) ل دهۆکێ هاتەدامەزراندن، د بەردەوامیا ڤەگێرانێن خۆدا ناڤبری دبێژیت:... بەلاڤۆك و کۆڤار بۆ مە ژ سوریێ دهاتن، هەرچەند رۆژەکان جارەکێ کەسەك ب ناڤێ مستەفا بۆتانی ژ سوریێ دهات بۆ مە کۆڤارێن کوردی یێن لاتینی دئینان هەر وی ژی ئەم فێری لاتینی دکرین، پتر کۆمبوونێن خۆ و وەرگرتنا






دەرسێن لاتینی مە ل گەلێ دهۆکێ هندەك جاران ژی ل مالان دکرن[٤٦]. هەژیە بێژین رێکخستنێن (هیوا) بزاڤەك بەرفرەهـ بۆ فێربوونا خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی ل دەڤەرا بەهدینان دکرن[٤٧]. ڤێ چەندێ نەتنێ رێخوشکرن لبەر ئاشنا بوونا خەلکێ بەهدینان دگەل رۆژنامەڤانیا کوردی بەلکێ ئەڤە دەسپێکا پشکداریا خەلکێ ڤێ دەڤەرێ بوو د ناڤ بەرپەرێن کۆڤارێن کوردیدا و د ڤی واریدا سالح یوسفی پێشەنگبوو یەکەمین کەس بوو ب هەلبەستەکێ ب ناڤێ (هیڤیا مە) پشکداری د هژمار ٣٩ رۆژا ١٥ شباتا ١٩٤٢یدا بەلاڤکر، پشتی وی ژی گەنجێن وی سەردەمی وەك شێخ مەمدوح بریفکانی، مەلا ئەنوەر (مایی)، سالح روشدی، دلـکـولـێ دۆسـکـی، ئـەلـهـویـێ بـێـدوهـی، ئەرمەغانی، ژاندار میرزەنگ بەرهەمێن خۆ د کۆڤارا (HAWAR) و پاشتر ژ کۆڤارا (RONAHÎ) یێن شامێدا بەلاڤکرن[٤٨]. هەر د ڤێ قۆناغێدا هژمارەك ژ رەوشەنبیر و خویندکارێن دەڤەرا بەهدینان ئەنوەر مایی، سالح یوسفی، تاهر روشدی و لاوێ بەهدینی ب نڤیسینێن خۆ پشکداری د بەرپەرێن کۆڤارا (گەلاوێژ)ا بەغدا داکرن[٤٩]. کار ب ڤێ چەندی رانەوەستا کۆڤارێن ئاماژەپێکری ب بەرفرەهی ل مووسلێ و دەڤەرا بەهدینان بەلاڤدبوون، ب رادەکی وەك ژێدەر ئاماژەپێدکەت ٩٩کەسان ژ لیوا مووسلێ و قەزایێن سنوورێ وێ ناڤێن وان د لیستا پشکدارێن (ئابوونەیێن) هاوارێدا هەبوون، زێدەباری خەلکێ دەڤەرێ یێن ئاکنجی ل جهێن دی یێن عیراقێ[٥٠]. هەر دڤێ قۆناغێدا کۆڤارا (گەلاوێژ)ا بەغدا گەهشتیە دەڤەرێ، نموونەرێن فروشتنا وێ ل هندەك قەزایێن بەهدینان هەبوون[٥١]. ئەڤ رەنگە چالاکییە هەتا داوییا نیڤا ئێکی ژ سالێن چلان دبەردەوامبوون، لێ د نیڤا دوویدا چ رەنگەك ژ ڤان چالاکیێن خەلکێ دەڤەرێ د رۆژنامەڤانیا کوردیدا بەرچاڤ ناکەڤیت، ئەز ڤێ چەندێ ژی دزڤرینمەڤە بۆ ئەو سەربەرێ ژ سالا ١٩٤٥یڤە ب سەردەڤەرێدا هاتی وەك شکەستنا شۆرشا بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥، هەلوەشیان یان ژی لاوازبوونا رێکخستنێن خۆیبوون و (هیوا) و نەمانا رۆژنامەڤانیا بەردخانییان ل شامێ و بیروتێ.




ئەڤا چوویی دیاردبیت کو هەتا ئاستەکی ژ داوییا سالێن سیهان و دەسپێکا چلانڤە رۆژنامەڤانیا کوردی گەهشتیە دەڤەرێ و هندەك ژ کورێن دەڤەرێ ژی وەك نڤیسکار پشکداری د بەرپەرێن واندا کریە، هندی پەیوەندی ب رۆژنامەڤانیا عەرەبیا عیراقێڤە هەی گومان تێدا نینە ئەڤ رۆژنامەڤانییە درێکا مووسلێ را گەهشتیە دەڤەرێ، ب تایبەت تەخا خواندەڤایا دەڤەرێ ژ بەرکو ب عەرەبی خواندبوو پتر شارەزایی د عەرەبیدا هەبوو و ب عەرەبی دخواندن، لێ چ ژێدەر بەردەستێ مەنینن پتر پشتەڤانیا مە بکەت بۆ ڤێ چەندێ. تنێ یا دهێتە زانین کو ئەنوەر مایی د سالێن پێنجیاندا ب بەرهەمێن خۆ پشکداری د رۆژناما (صدى الروافد) یا مووسلی دا کریە و پشتی

شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ پشكداری د چەند كۆڤار و رۆژنامێن وەك (الثقافة الجدیدة، الزمان، البلاد، الرای العام، فتی العراق- الموصلیة، نصیر الحق- الموصلیة، الرایة- الموصلیة)دا كریە[٥٢]. هەژیە ل ڤێرێ بێژین د سالێن پێنجیاندا و بەری رووداناشۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ گەلەك ب كێمی بەرهەمەكێ خەلكێ بەهدینا د كۆڤار و رۆژنامەیێن كوردیدا دهێتە دیتن، تنێ د ڤێ ناڤبەرێدا كتەكا نڤیسینێن ئەنوەر مایی د كۆڤارا (هەتاو)ا هەولێرێ دا دهێنەدیتن[٥٣].

ل ڤێرێ پیدڤیە پرسیارەكێ بكەین ئەرێ د سالێن چلاندا كەسەكی ژ خەلكێ دەڤەرێ بزاڤەك بۆ بەلاڤكرنا كۆڤارەكێ یان رۆژنامەكێ نەكریە، د بەرسڤێدا دبێژین: تنێ ئەوا دهێتەڤەگێران ئەوە كو دەمێ ئەنوەر مایی د ناڤبەرا ١٩٤٠- ١٩٤١یدا ل بەغدا هزر ل بەلاڤكرنا رۆژنامەكا هەیڤانە یان وەرزی ب ناڤێ (المیزان- تەرازی) و ب هەردو زمانێن كوردی و عەرەبی كریە و ئیمتیازا وێ ژی وەرگرتیە، لێ ژ بەر سەروبەرێ وی یێ دارایی و كەسەكی ژی پشتەڤانییا دارایی بۆ نەكریە، ئەڤ هزرە نەهاتیە بجهئینان[٥٤].

دووەمین بزاڤا كەسەكی ژ خەلكێ بەهدینان بۆ بەلاڤكرنا رۆژنامە یان كۆڤارەكی كریبت، بزاڤا محەمەد بریفكانی یە، ڤی كورێ پارێزگەها دهۆكێ ل ٣١ ئیلونا ١٩٤٨ رۆژنامەك ل بەغدا ب زمانێ عەرەبی ب ناڤێ (الجبل) بەلاڤكریە، ئەو ب خۆ خودان ئیمتیازێ وێ و محەمەد عەلی سعید رێڤەبەرێ بەرپرسێ وێ بوو، رۆژنامەك سیاسی رۆژانە بوو و بەردەوام بوو هەتا ل ١٧ كانوونا دووێ ١٩٥٤ ئیمتیازا وێ هاتییەهەلوەشاندن. بزاڤێن ڤی كەسایەتیێ پارێزگەها دهۆكێ د وارێ رۆژنامەڤانیدا د بەردەوامبوون، ل ٧ شباتا ١٩٥٤ێ رۆژنامەكا دی یا سیاسییا رۆژانە ب ناڤێ (الایام)ب عەرەبی ل بەغدا بەلاڤكریە و ئەو خودان ئیمتیاز و شەهابەدین شێخلی رێڤەبەرێ بەرپرسێ وێ بوو، پاشتر ل ٢٧ چریا دووێ ١٩٥٧ ئیمتیازا رۆژنامەكا دی یا هەفتیانە ب ناڤێ (التقدم- (پێشكەوتن)) وەرگرتیە و ئەو خودان ئیمتیاز و یونس ئیبراهیم و پاشتر سەبیح عەبدولغەنی سەرنڤیسەرێن وێ بوون، بەلێ گیروو بوویە هەتا ل سالا ١٩٥٩ێ هاتییەبەلاڤكرن، ل داوییا هەمان سالێ بوویە رۆژنامە و ب كوردی و عەرەبی دهاتەبەلاڤكرن ل ٨ شباتا ١٩٦٣ هاتییەراوەستاندن[٥٥]. هەژیە بێژین ل شباتا ١٩٥٨ هەرڤی كەسایەتی كۆڤارەكا هەفتیانە ب ناڤێ (التقدم- (پێشكەوتن)) ب كوردی و عەرەبی بەلاڤكریە و ژ هژمار ٦٥ ڤە بوویە رۆژنامەك رۆژانە هەتا ل ٨ شباتا ١٩٦٣ هاتییەراوەستاندن[٥٦]. هەژیە بێژین ژ خەلكێ بەهدینان سەعید بامەرنی و محەمەد عەلی یونس و ئەنوەر مایی پشكداری د بەرپەرێن ڤێ كۆڤارێدا كریە و هندەك هەلبەستێن ئەحمەد موخلیس (نالبەند) تێدا هاتینەبەلاڤكرن، هەروەسان ل دووڤ پێداچوونا مە د هژمارێن ڤێ كۆڤارێدا ئەم د وێ باوەرێدانە بەروڤاژی دگەل ژێدەرێ ئاماژەپێكری، ئەڤە د بنیاتدا ل بەراهیێ كۆڤار بوویە و پشتی هژمارا ٦٥ بوویە رۆژنامە و هەتا هاتییەگرتن[٥٧]. سەرەرای كاودانێن دژوارێن سالێن شێستان بزاڤێن محەمەد بریفكانی د وارێ رۆژنامەڤانیدا د بەردەوامبوون ل ٣ حزیرانا ١٩٦٤ ئیمتیازا رۆژنامەكا دی یا هەفتیانە ب ناڤێ (اخبار الیوم) وەرگرتیە، لێ ئەڤ رۆژنامەیە گەلەك نەژیایە، هەروەسان ل ٨ كانوونا ئێكێ ١٩٦٥ێ ئیمتیازا رۆژنامەكا دی ب ناڤێ (الاخبار- دەنگ و باس) وەرگرتیە و كامل ئەلمەشهەدانی و سەبیح عەبدولغەنی سەرنڤیسەرییا وێ كریە، ئەڤ رۆژنامەیە ب عەرەبی بوو و بەرپەرەكێ وێ ب كوردی دهاتەبەلاڤكرن، ل ٣٠ كانوونا دووێ ١٩٦٦ێ دەستە ب بەلاڤكرنا وێ هاتییەكرن و ل ١٧ چریا ئێكێ ١٩٦٧ هاتییەراوەستاندن[٥٨]. دبیت بێتە گۆتن ئەڤ هەمموو بزاڤە ب رۆژنامەڤانییا دەڤەرا بەهدینان ناهێتە هژمارتن، لێ ئەز دبێژم ئەگەر ب رۆژنامەڤانییا دەڤەرا بەهدینان ژی نەهێنە هژمارتن ب رۆلێ خەلكێ بەهدینان د رۆژنامەڤانیێ و دەسپێكا كارێ وان د رۆژنامەڤانییێدا دهێنەهژمارتن و ئەز د وێ باوەرێدا مە ئەگەر د وی سەردەمیدا هۆكارێن بەری نها مە ئامەژەپێكرین بۆ سەرهلدان و وەرارا رۆژنامەڤانییێ ل دەڤەرا بەهدینان هەبانە، ئەڤ رۆژنامەیە یان هندەك

ژ وان دا ل دەڤەرێ بەلاڤەبن.

پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ هندەك دەلیڤێن پتر هاریکار بۆ خەلکێ دەڤەرێ هاتنەپێش کو رۆلێ خۆ د رۆژنامەڤانیێدا بگێرن و ب تایبەت ژی رۆژنامەڤانیا کوردی، ب پێداچوونەکا بلەز ب رۆژنامە و کۆڤارێن ناڤبەرا سالێن ١٩٥٨- ١٩٦١ێ دێ بینین هژمارەکا پتر ژ خەلکێ دەڤەرێ جهێ خۆ د بەرپەرێن واندا کریە، لێ یەکەمین بزاڤا د ڤێ قۆناغێدا خەلکێ دەڤەرێ رۆلەك گرنگ بۆ بەلاڤکرنا رۆژنامەك یان کۆڤارەکێ تێدا گێرابیت بەلاڤکرنا رۆژناما (الحقیقە- راستی) بوو ژ ئالیێ جەرجیس فەتحوللا و ب هاریکاریا ئەنوەر مایی. یەکەمین هژمارا ڤێ رۆژنامی ل ٧ گولانا ١٩٥٩ و دوا هژمارا وێ هژمار ٢٤ ل ٣ نیسانا ١٩٦٠ێ هاتینەبەلاڤکرن، ل ٦ تەباخا هەمان سالێ ئیمتیازا وێ هاتییەهەلوەشاندن، ئەگەرێ راوەستاندنا وێ دژایەتیا دەستەلاتێ وی سەردەمێ عیراقێ بوو بۆ خودان ئیمتیاز و سەرنڤیسەرێ وێ جەرجیس فەتحوللای، دژایەتیا ڤێ رۆژنامێ ل ئاستەکی بوو هەر ٢٤ هژمارێن وی ژ سالا ١٩٦٣- ێڤە ل پەرتووکخانەیان هاتینەبەرزەرکرن و دەست کەسەکی نەکەتینە هەتا ل سالا ١٩٩٨ێ هندەك هژمارێن وێ ل پەرتووکخانەکا بەغدا هاتینە دیتن[٥٩]. هندی پەیوەندی ب بابەتێ مەڤە هەی، ئەگەر ئەم نەبێژین ئەڤە ژ پێنگاڤێن بەراهیێ یە بۆ رۆژنامەڤانیا دەڤەرا بەهدینان، لێ ئەم دکارین بێی هیچ گومانەك بێژین ئەڤە رەنگە رێخۆشکرنەکە بۆ سەرهلدانا رۆژنامەڤانیا ڤێ دەڤەرێ، سەرنڤیسەر و خودان ئیمتیازێ رۆژنامێ جەرجیس فەتحوللا کەسایەتیەکێ مەسیحیێ خەلکێ مووسلێ بوو لێ هەردەم یێ نێزیکی بزاڤا نەتەوەییا کوردی بوو، رۆژنامە ل مووسل دهاتەچاپکرن کو نێزیکترین باژێرە بۆ دەڤەرا بەهدینان و ژ بەرکو وی سەردەمی بەهدینان د سنوورێ چەند قەزایەکاندا سەر ب لیوا مووسلێ ڤە بوو، ئەم دکارین هەتا ئاستەکی بێژین مووسل رەنگە سەنتەرەکێ رەوشنبیری ئابووریێ خەلکێ بەهدینان بوو، د هەمان دەمدا کەسایەتییەکێ رەوشەنبیری جڤاکیێ دەڤەرا بەهدینان ئەنوەر مایی رۆلەك گرنگ د یەرهەڤیان بۆ بەلاڤکرنا رۆژنامێدا و د نڤیسکاری و ئامادەکرنا بەرپەرێن وی یێن عەرەبیدا هەبوو و سەرپەرشتییا تاکە بەرپەرێ وێ یێ کوردی دکر و پتریا بابەتێن وی بەرپەری ژی ژ نڤیسینا وی بوون، هەژیە بێژین ئەڤە یەکەمین رۆژنامەیا عیراقێ بوو بەرپەرەکێ خۆ بۆ کوردی دیالێکتا کرمانجیا ژووری دیالێکتا خەلکێ بەهدینان تەرخانکری، د هەمان دەمدا رۆژنامێ گرنگییەکا تایبەت ددا دەنگ و باس و ئاریشە یێن دەڤەرێ و پتر ژ نیڤا دانەیێن وێ ژی ل گوند و باژێرکێن دەڤەرا بەهدینان و باژێرێن دی یێن کوردستانێ بەلاڤدبوون[٦٠].

بزاڤا پشتی (الحقیقة- راستی)هاتییەکرن و پتر سەروسیمایێن خەلکێ دەڤەرێ تێدا دیار و ب دیالێکتا خۆجهیا بەهدینان هاتییەبەلاڤکرن و ب یەکەمین کۆڤارا دیالێکتا کرمانجیا ژووری ل عیراقێ د هێتەهژمارتن بەلاڤکرنا کۆڤارا رۆناهی بوو، یەکەم هژمارا رۆناهی ل مەها چریا ئێکێ ١٩٦٠ێ دوا هژمارا وێ هژمار ٣ سالا ٢ د مەها تەباخا ١٩٦٢ێدا هاتییەبەلاڤکرن، د ڤی ژیێ کورتدا ١١ هژمار د ٩ بەرگاندا هاتینەبەلاڤکرن، خودان ئیمتیاز و سەر نڤیسەرێ وێ حافز مستەفا قازی و کۆڤار ژی ژ کیستێ خۆ چاپ و بەلاڤدکر[٦١].

ئەم دکارین بێژین رۆناهی بەرێ بنیاتیێ هەرە موکمێ رۆژنامەڤانیا دەڤەرا بەهدینانە و د هەمان دەمدا دەسپێکا رۆژنامەڤانیا دیالێکتا کرمانجیا باکوورە ل باشوورێ کوردستانێ و هەمان فاکتەرێن وەك هوکارێن پەیدابوونا و وەرارا رۆژنامەڤانیێ بەری نها مە بەرچاڤکرین هوکارێن هندێ بوونە ئەڤ کۆڤارە ل دەرڤەی سنوورێ جوگرافیێ پارێزگەهێ لێ ب هەمان گۆڤەر و دیالێکتا دەڤەرا دهۆکێ یا نها دەرکەڤیت، خودان و سەرنڤیسکارێ وی خەلکێ دهۆکێ، پرانیا نڤیسکارێن وی د هژمارێن بەراهیێدا گەنجێن نووپێگەهشتیێن بەهدینان بوون گۆڤەر و دیالێکتا وێ، هەژیە بێژین بەری بەلاڤکرنا رۆناهی خودان و سەرنڤیسەرێ وی حافز قازی رێڤەبەرێ




بەرپرسێ کۆڤار (هیوا)* بوو و دەست ژ ڤێ کۆڤارێ بەردایە سەخمەرەت بەلاڤکرنا کۆڤارا رۆناهی و هەروەك ئەو ب خۆ ڤەدگێریت پتر ژ ١٢ هەیڤان مایە ل هیڤیا وەرگرتنا ئیمتیازا کۆڤارا رۆناهی[٦٢]. سالا دووێ ژ ژیێ رۆناهی هەڤدەم بوو دگەل دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ، د ڤێ قوناغێدا نەتنێ خەلکێ کوردستانێ کەتەبەر هێرشێن لەشکەرێن عیراقێ بەلکێ رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانیا کوردی ژی کەتە بەر هێرش و دژایەتیا سازیێن دەولەتا عیراقێ و دەست ب گرتنا رۆژنامە و کۆڤارێن کوردی هاتەکرن، پشتی رووادنا کودەتا بەعسیان ل شباتا ١٩٦٣ێ ئەو کتا کێما مای ژ کۆڤار و رۆژنامێن کوردی وەك رۆناهی و (هیوا) و ژین ب رەسمی فەرمانا گرتنا وان هاتەدان[٦٣].

ل دووڤ پێداچوونا چوویی ئەم دکارین بێژین، سەرەرای هندێ کو هەتا دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ دەڤەرا بەهدینان سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ نە جهـ و نە خەلکەکێ بەرهەڤبوویە بۆ پەیدابوون و وەرارا رۆژنامەڤانیێ، لێ خەلکێ دەڤەرێ چ وەك پشکداری د بەرپەرێن کۆڤار و رۆژنامەیاندا چ ژی وەك بەلاڤکرنا کۆڤار و رۆژنامەیان یان کارکرن د نڤیسکاری و بەلاڤکرنا واندا ل دەرڤەی دەڤەرا خۆ هەتا ئاستەکێ بلا ب کێمی و لاواز ژی بیت جهێ خۆکریە. ل ڤێرێ دێ پرسیارکەین ئەرێ سەرەرای نەبەرهەڤیا جهـ و خەلکێ دەڤەرێ بۆ پەیدابوون و وەرارا رۆژنامەڤانیێ چ بزاڤ د ڤێ واریدا نەهاتینەکرن...؟ د بەرسڤێدا و د ئەنجامێ دووڤچوونێ دێ بێژین کتەکا بزاڤان د ڤی واریدا هاتییەکرن، لێ هەرئێك ژ وان پێدڤی ل سەر راوەستانەکێیە بۆ نموونە:

- **بەلاڤۆکا ئاکرێ**: بەلاڤۆکەك هەفتیانە بوو، ژ ئالیێ قایمەقامێ ئاکرێ شاکر فەتاح (١٩١٤- ١٩٨٨) ڤە ب دەستی دهاتەنڤیسین پاشان ل سەر دەپەکێ داری ل یانا فەرمانبەرێن ئاکرێ دهاتە هەلاویستن، ژمارا ئێکی ل ١٥ تیرمەها ١٩٥٠ ب عەرەبی و پشتی چەند هژمارەکا ب کوردی هاتییەبەلاڤکرن، ١٠ هژمار ژێ دەرکەتینە و دوا هژمارا وێ ل ١٥ ئەیلوولا ١٩٥٠ێ دەرکەتیە[٦٤]. ب هزرا من ئەڤە تنێ بەلاڤۆکەکا یەك دانەیا دەستنڤیس بوو ژ دیوارێ یانا فەرمانبەران زێدەتر دەربازنەبوویە، کەسەکێ نە خەلکێ دەڤەرێ لێ دلسۆز بۆ دەڤەرێ بەلاڤکریە و دبیت هندەك بەلاڤۆکێن دیترێن خواندنگەهان بەری وێ ژی هەبن، لێ تنێ خودانی ل سالا ١٩٨٤ێ ئەڤ دەستنڤیسێن خۆ د پەرتووکەکێدا ب ناڤێ (رۆژنامەی ئاکرێ) چاپکریە لەوما ژی کەتیە ناڤ ناڤان بەلێ نابیتە بنیات بۆ دیرۆکا رۆژنامەڤانیا دەڤەرێ.

- **بەلاڤۆکا سکرین**، کۆڤارەکا وەرزی عەرەبی زمان بوو ژ ئالیێ هێزا یەدەك (لیواء الاحتیاط)ا لەشکەرێ عیراقێ ل سەربازگەها سکرینێ دەردچوو و تنێ ل سەر ئەفسەر و سەربازان دهاتەبەلاڤکرن، ٣ هژمار ل بهار و هاڤین و پاییزا ١٩٥٣ێ ژێ هاتینەبەلاڤکرن و د ١٠٦ بەرپەراندا ل چاپخانا (العانی) ل بەغدا دهاتەچاپکرن[٦٥]، بۆ ئەڤێ ئەم دبێژین ئەڤ بەلاڤۆکە

تنێ ل سەر ئاخا پارێزگەها دهۆکێ دەرکەتیە و چ پەیوەندی ب دهۆکێ و رۆژنامەڤانییا وێ ڤە نینە.

- **الغد:** بەلاڤۆکەکا رەوشەنبیری گشتی بوو هژمارا ئێکێ ل زڤستانا ١٩٥٨ و هژمارا دووێ و داویێ ل بهارا ١٩٥٨ێ ژ ئالیێ دواناڤنجیا دهۆکێ ڤە هاتینە بەلاڤکرن[٦٦]. هەتا نها من ئەڤ کۆڤارە نەدیتیە، لێ ئەز دکارم بێژم ئەڤ کۆڤارە دەسپێکا سادەیا رۆژنامەڤانیێ یە ل پارێزگەها دهۆکێ، دیارە د وی دەمیدا دەنگڤەدانەك هەبوویە و خەلکێ پێشوازی لێکریە و ب هیڤیبوونە ببیتە کۆڤارەك کوردی و دەسپێکەك بۆ رۆژنامەڤانییا کوردی ل بەهدینان، کۆڤارا (هیوا) د وێ سالێدا پێشوازی ل کۆڤارا (الغد) کریە و گۆتییە:

**الغد، کۆڤارێکی ئەدەبییە لە لایەن قوتابیانی قوتابخانەی سانەوی دهۆك بە زمانی عەرەبی ...الدەرئەچێت، (هیوا)مان وایە لە ژمارە دووەوە بەزمانی کوردی شێوەی بەهدینانی خۆیان دەری کەن**[٦٧].

بەری ڤێ بەلاڤۆکەك نهێنی دەستنڤیس تنێ ب ٦ دانەیان ب ناڤێ (الصرخە) ژ ئالیێ قوتابیێن حزبا شیوعیا عیراقێ ل سالا ١٩٥٦ێ ل دواناڤنجیا دهۆکێ هاتییەبەلاڤکرن[٦٨]، لێ ب هزرا من ئەڤە ژی چ جهەکێ د دیرۆکا رۆژنامەڤانییا دەڤەرێدا ناگریت.

ل ڤێرێ قۆناغا پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ ل عیراقێ دەست پێ دکەت، د ڤێ قۆناغێدا ژی ئەو فاکتەرێن هاریکار بۆ دروستبوونا رۆژنامەڤانیێ ل دەڤەرێ نەهاتنە پێش، لەوما ژی وەك مە ئاماژە پێکری بزاڤێن خەلکێ دەڤەرێ د وارێ رۆژنامەڤانیدا هەر ل دەرڤەی سنوورێ بەهدینان بوون وەك: بەلاڤکرنا رۆژناما (الحقیقە- راستی) ل مووسلێ و بەلاڤکرنا کۆڤارا (رۆناهی) ل بەغدا. هەر د ڤێ قۆناغێدا ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ شۆرشا کوردستانێ دەسپێدکەت، هەروەك ئاماژە پێهاتییەکرن د ڤی سەردەمیدا بەرێن رۆژنامەڤانییا کوردی ل سەرانسەرێ عیراقێ بەرتەنگکرن و تەڤایی رێکێن بەلاڤبوونێ ل بەر گرتن، د ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٧٠ێ ل سەرانسەری دەڤەرا بەهدینان ئاماژە ب بەلاڤۆکا (الثقافة) دهێتەکرن کو هژمارا وێ یا ئێکێ ل بهارا ١٩٦٣ی و هژمارا ٤ و داویێ ل بهارا ١٩٦٤ژ ئالیێ خواندنگەها ئاکرێ یا دووێ هاتینەبەلاڤکرن و ل چاپخانا (الجمهورية) ل مووسلێ د ٢٨ بەرپەراندا دهاتەچاپکرن[٦٩].

ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ شۆرشێ ژی ل زڤستانا ١٩٦٧ێ بەلاڤۆکەك ب ناڤێ (صوت کردستان - دەنگێ کوردستان) ب زمانێ کوردی و عەرەبی ژ ئالیێ لقێ ئێکێ پارتی دیموکراتی کوردستان ڤە هاتییەبەلاڤکرن و هەتا هژمارا ١٤ ل بهارا ١٩٦٩بەردەوام بوویە، ب ئامێرێ چاپا دەستی دهاتەتایپکرن و ب رونیویێ ١٥٠ دانە ژێ دهاتنەراکێشان[٧٠].

سالێن ١٩٧٠- ١٩٨٠ قۆناغەك نوو بوو د دیرۆکا دەڤەرا بەهدیناندا، د ڤێ قۆناغێدا پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ب سەردا هات، نوینەر و کادرێن شۆرشێ و خەلکەکێ کورد پەروەر ل پارێزگەهێ دەستەلات گرتەدەست، بەری پێکهاتنێ ژی ب چەند هەیڤەکا ل ٢٧ گولانا ١٩٦٩ دهۆك ببوو پارێزگەهـ، د ئەنجامێ هەردو بۆیەراندا خەلکەکێ دلسۆز و وەلاتپارێز ل دەڤەرا بەهدینان بوونە خودان دەستەلات و چەندین دەلیڤێن هاریکار بۆ پێشڤەچوونا رەوشەنبیری ل دەڤەرێ هاتنەپێش، لێ سەرەرای ڤان دەلیڤێن هاریکار هێژ هندەك فاکتەر ل بەر سنگێ بەلاڤبوون و وەرارا رۆژنامەڤانییا کوردی ل بەهدینان هەبوون، بۆ نموونە: هێژ ئاستێ خواندن و نڤیسینا کوردی ل دەڤەرێ یێ لاواز بوو و کتەکا کێما خەلکێ بەرهەمێن کوردی دخواندن، د هەمان دەمدا هژمارا خەلکەکێ ب کوردی بەرهەمێن رەوشەنبیری بنڤیسیت هێژ یا کێمتر بوو و ئەو کتا هەی ژی ل دەرڤەی سنوورێ پارێزگەهێ بوون ب تایبەت ل بەغدا، هەر ب ڤی رەنگی ژی رەنگە مەرکەزیەتەك هەبوو کو هەموو چالاکیێن رەوشەنبیری یێن سەر ب حکۆمەتێ و یێن سەر ب شۆرشا کوردستانێڤە ژ سنوورێ بەغدا نە دەردکەتن و ئاستەنگا هێژ کاریگەر تر نەبوونا چاپخانەکێ بوو ل پارێزگەها دهۆکێ. بەلێ سەرەرای ڤان ئاستەنگان د سالا بەراهیێ یا پێکهاتنا ١١ ئادارێدا بزاڤێن دەسپێکی بۆ کارێ رۆژنامەڤانی ل

دەڤەرێ هاتنە هاڤێتن، بزاڤا هەرە سەرەكی و یا هەرە پێدڤی بۆ رۆژنامەڤانیێ ئینانا چاپخانەكێ بوو بۆ دهۆكێ، ئەو بوو ل ١٨ گولانا ١٩٧٠ رەزامەندی ژ وەزارەتا رەوشەنبیریا عیراقێ هاتەوەرگرتن بۆ دانانا چاپخانەكێ ل دهۆكێ، پشتی كارێن پێدڤی بۆ دابینكرنا ئامیر و ئامرازێن دی یێن چاپێ هاتینەكرن هەر د وێ سالێدا هەرچەندە چاپخانەكا دەسپێكی و ئامیرێن وێ سادە بوون چاپخانە هاتەدانان و دەست ب كارێ چاپكرنێ كرن(٧١). هەر د ڤێ هەیامێدا رەوشەنبیر و رۆژنامەڤانێن بەهدینان ل بەغدا و جهێن دیتر ب هژمارا خۆیا كێمڤە بزاڤێن پێشڤەبرنا رۆژنامەڤانیا كوردی- دیالێكتا كرمانجیا ژووری دكرن، ژ ئەنجامێ وان بزاڤان رۆژناما (هاوكاری) یا بەغدا و كۆڤارا (برایەتی)* یا سەر ب رۆژناما (التآخي) ڤە پشكەك تایبەت ژ بەرپەرێن خۆ بۆ نڤیسینێن ب دیالێكتا كرمانجییا ژووری تەرخانكرن، كۆڤار و رۆژنامێن دی ژی كتەكا بابەتێن كرمانجی ب تایبەت بابەتێن ئەدەبی بەلاڤدكرن، لێ دیارە ژ بەرچەند ئەگەرەكان ڤان بەرپەرێن كێم تێرا پێدڤیاتییا خەلكێ دەڤەرێ ژ رۆژنامەڤانیێ نەدكر، لەوما ژی هزر ل وێ چەندێ كرن ئەو ب خۆ خۆدییێن رۆژنامەڤانیا خۆ بن، هەرچەندە بۆ ڤێ چەندێ پێدڤی ب شیانێن دارایی بوون و ئەو شیانە ژی د وی سەردەمیدا دكێمبوون، یەكەمین بزاڤ د ڤی واریدا هاتییەكرن بزاڤا بەدرخان سندی بوو دەمێ یەكەمین هژمارا كۆڤارا (چیا) ل چریا دووێ سالا ١٩٧٠ێ هاتییەبەلاڤكرن، سەرنڤیسڤان و رێبەرێ وێ بەدرخان سندی بوو، ل هەولێرێ هاتبووبەرهەڤكرن و ل چاپخانا شارەوانی ل كەركووكێ د (٢٨) بەرپەراندا هاتبووچاپكرن و گشت بابەتێن وێ ب كرمانجیا ژووری بوون، لێ هژمارا دووێ كو ئەو ژی هەر ل هەولێرێ بەرهەڤكربوو ل چاپخانا دهۆكێ د (٧٨)بەرپەراندا هاتبوو چاپكرن و بابەتێن





وێ ب هەردو دیالێکتان هاتبوونە بەلاڤکرن[٧٢]. ب ڤێ چەندێ ئەم دکارین بێژین هژمارا دو ژ کۆڤارا (چیا) یەکەمین کۆڤارا کوردیە ل دهۆکێ هاتییەچاپکرن، بەلێ ئەز دبینم نە یەکەمین کۆڤار یان رۆژنامەیا دەڤەرا بەهدینان نە، ب ڤێ چەندێ پارێزگەها دهۆکێ کەتە د وارێ رۆژنامەڤانیا کوردیدا و ب رامانەك دیتر ئەم دکارین بێژین: رۆژنامەڤانیا کوردی ل پارێزگەها دهۆکێ ژی جهێ خۆ دیت، لێ هێز دەم و کاودان د هاریکار نەبوون.

ل ڤێرێ پێدڤیە ئاماژە ب خالەکا گرنگا ڤێ قۆناغێ بکەین، کو ئەڤ قۆناغە ل سەر دو قۆناغێن بچووکتر دابەشکەین کو هەرئێکێ تایبەتمەندیا خۆ هەیە: قۆناغا ناڤبەرا ئادارا ١٩٧٠- ئادارا ١٩٧٤ و قۆناغا ناڤبەرا ئادارا ١٩٧٤- ١٩٨٠، د چوار سالێن قۆناغا بەراهیێدا پارێزگەها دهۆکێ ژ ئەنجامێ پێکهاتنا ١١ێ ئادارێ ل ژێر دەستەلاتدارییەکا کوردی و رەنگ ئازاد دژیا و دەسپێکا قۆناغا ب پارێزگەهبوونا دهۆکێ بوو و بزاڤ دهاتنەکرن دەڤەر ژ هەموو ئالییانڤە پێشڤەبچیت، رەوشەنبیری ژی ئالییەك گرنگ بوو پویتەك پێ دهاتەدان، بەری هەر تشتی خواندنا کوردی ل سەرانسەری پارێزگەهێ و گەلەك دەڤەرێن هێژ سەر ب پارێزگەها مووسلێ ژی ب بەرفرەهی هاتەبجهئینان و گەهشتە قۆناغا ناڤنجی و بەرەڤ ژوور دچوو، هەر د ڤێ قۆناغێدا پارتی دیموکراتی کوردستان و رێکخراوێن جەماوەرییێن سەر ب وێڤە وەك مامۆستایان و لاوان و قوتابیان گرنگییەك دا ئالیێ رەوشەنبیری و دهەمان ڤێ قۆناغێدا ل لقێ دهۆکێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کوردی هاتەدامەزراندن کو کارێ وێ بێ هەرە پێشین گرنگیدان بوو ب پێشڤەبرنا ئەدەبیات و رەوشەنبیریا کوردی، ئەڤ فاکتەرە هەموو د هاریکاربوون بۆ لڤاندن و پێشڤەبرنا رۆژنامەڤانیا کوردی ل پارێزگەهێ، لێ دهەمان دەمدا هندەك فاکتەرێن بەریا نها مە ئاماژەپێکری ئاستەنگ بوو د بەرامبەر لڤاندن و پێشڤەبرنا رۆژنامەڤانیا کوردی ل دەڤەرێ. د ڤێ قۆناغێدا زندەباری کۆڤارا (چیا) یا ئاماژەپێکری:

- تاکە یەك ژمارە ژ کۆڤارا رەوشەن ژ ئالیێ رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ ب کوردی و عەرەبی ل ئادارا ١٩٧٢ێ هاتییەبەلاڤکرن، ئەڤە یەکەمین کۆڤارە ل دهۆکێ هاتبیتەبەرهەڤکرن و هەر ل دهۆکێ هاتبیتەچاپکرن و پرانیا نڤیسکارێن وێ ژی ژ دهۆکێ بوون و ب تیراژا ٢٠٠٠ دانەیان هاتبوو بەلاڤکرن، ئەڤە ژی بۆ وێ دەمی هژمارەکا زێدە و جهێ سەرنجراکێشانێ یە[٧٣].

- ژبلی رەوشەن د ناڤبەرا ١٩٧٠- ١٩٧٤یدا چ بزاڤێن دی د وارێ رۆژنامەڤانیدا ب تایبەت رۆژنامەڤانیا چاپکریدا نەهاتینە کرن، لێ د ڤێ ناڤبەرێدا لقێ ئێکێ پارتی دیموکراتی کوردستان د ناڤبەرا ١٩٧١/١/١٥- ١٩٧١/١٠/١٥یدا ١٧ هژمار ژ بەلاڤۆکەکا ناڤخۆی حزبێ ب ناڤێ (التقدم- پێشکەتن) ب زمانێ عەرەبی بەلاڤکریە، ٣٠٠دانە ب ئامیرێ رونیۆیێ ژێ هاتینەراکێشان[٧٤].

هەروەسان لقێ دهۆکێ یێ ئێکەتیا مامۆستایێن کوردستانێ د ناڤبەرا گولان و چریا دووێ ١٩٧٣ێ ٧ هژمارێن بەلاڤۆکەکا هەیڤانە ب زمانێ کوردی و عەرەبی ب ناڤێ هیڤی بەلاڤکرینە، ئەڤ بەلاڤۆکە د ناڤبەرا ١٦- ١٨ بەرپەراندا دهاتەبەلاڤکرن، بابەتێن کوردی ب دەستی ژ ئالیێ ئەحمەد عەبدوللا زەرۆی ڤە دهاتنەنڤیسین و یێن عەرەبی ژی ب ئامیرێ چاپا دەستی د هاتنەتایپکرن ب رونیویا رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهاتەچاپکرن و ب دەستان دهاتەکلیبسکرن و پاشتر بەلاڤکرن ل سەر خواندنگەهان و جهێن دیتر[٧٥]. ب پێداچوونەکا ڤێ بەلاڤۆکێ کو ل سەر هاتییەنڤیسین بەلاڤۆکەکا رەوشەنبیری گشتی یە، ئەم دکارین بێژین سەرەرای دیزاین و چاپا وێ یا سادە بۆ سەردەمێ خۆ کۆڤارەکا باش بوویە و هژمارەکا زۆرا نڤیسکار و رەوشەنبیر و پەروەردەکارێن دەڤەرێ هەمبێزکرینە و مینا بەرەکێ بنیاتیێ رۆژنامەڤانیا کوردی ل دەڤەرێ جهێ خۆ گرتیە.

هەر د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٠- ١٩٧٤ل ئادارا ١٩٧٣ێ بەلاڤۆکەك دیتر ب ناڤێ (چرایێ گەش- المشعل الوضاء) ب کوردی و عەرەبی ژ ئالیێ ئێکەتیا

قوتابیێن کوردستانێ- لقێ دهۆکێ هاتییەبەلاڤکرن و هژمارا دووێ و داویێ ژێ پشتی دەسپێکرنەڤا شەری ل هاڤینا ١٩٧٤ ل سەرسنکێ هاتییەبەلاڤکرن، ئەڤ بەلاڤۆکە ژی مینا یێن دی ب ئامیرێ چاپا دەستی هاتییەبەرهەڤکرن و ب رونیویێ ٣٠٠ دانە ژێ هاتینە بەلاڤکرن(٧٦).

د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٤-١٩٨٠ێ سەروبەر ل کوردستانێ ب گشتی و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی هاتەگۆهارتن، ل ئادارا ١٩٧٤ێ شەری د ناڤبەرا لەشکەرێ عیراقێ و شۆرشا کوردستانێ دەسپێکرڤە، د ڤێ سالێدا پرانییا خاکێ پارێزگەها دهۆکێ ل ژێر دەستەلاتێ شۆرشا کوردستانێ بوو و ژ ئەنجامێ سەروبەری لەشکەری ئابووریێ دەڤەرێ نە ل دەڤەرێن رزگارکری و نە ژی ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتێ چ رەنگە چالاکیێن رەوشەنبیری نەبوون(٧٧). ل ئادارا ١٩٧٥ێ ئەڤ سالە ب شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ب داویهات، سەروبەر ب دروستی ل پارێزگەها دهۆکێ هاتەگۆهارتن، دەستەلات کەتەدەست کەسانێن دژی بزاڤا نەتەوەییا کوردی، ب هەموو شیانێن خۆڤە دژایەتییا هەر چالاکییەکێ دهاتەکرن کرن بێهنا نەتەوەییا کوردی ژێ بهێت، بەری هەموو تشتان ژی دەست ب گۆهارتنا خواندنا کوردی بۆ عەرەبی هاتەکرن و ئەڤ پلانە د چەند سالەکاندا ل سەرانسەری دهۆکێ هاتەبجهئینان(٧٨). هیچ دەلیڤەیەك ل بەر نڤیسکار و رەوشەنبیرێن دەڤەرێ نەمان چالاکییەك رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانی ئەنجام بدەن، ئەگەر ئێکی ژ وان چالاکییەك هەبوایە ژی ل دەرڤەی پارێزگەهێ ب تایبەت ل بەغدا ئەنجامددا. هندیکە سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ یە د ڤێ ناڤبەرێدا و د وارێ رۆژنامەڤانیدا چ چالاکییەك بەرچاڤ نەهاتییەئەنجامدان، ژبلی بەلاڤکرنا چەند بەلاڤۆکەکان وەك:

- **لاوان- الشباب**: بەلاڤۆکەکا هەیڤانە بوو ب کوردی و عەرەبی ژ ئالیێ لیژنا رەوشەنبیریا رێڤەبەریا لاوان ل پارێزگەها دهۆکێ دهاتەبەلاڤکرن، هژمارا ئێکێ ل نیسانا ١٩٧٥ و هژمارا ١٧ و داویێ ل ١٩٧٧ێ هاتینەبەلاڤکرن، ب ئامیرێ چاپێ و رونیو و ستێنسلی دهاتەراکێشان و بەلاڤکرن

- **الشموع**، کۆڤارەك پەروەردەیی رەوشەنبیری بوو، ل سالا ١٩٧٧ێ تنێ ئێك هژمار ب زمانێ عەرەبی ژ ئالیێ خواندنگەهـا مامۆستاییێن سەرەتایی یا دهۆکێ هاتییەبەلاڤکرن.

- **الغد المشرق**، بەلاڤۆکەکا دەوری بوو ژ ئالیێ لیژنا راگەهاندنێ یا هەوا نەهێلانا نەخویندەوارێ ل پارێزگەها دهۆکێ دهاتەبەلاڤکرن، د ناڤبەرا پاییزا ١٩٧٨- پاییزا ١٩٧٩یدا ٩ هژمار ژێ هاتینەبەلاڤکرن(٧٩).

ئەگەر هەلسەنگاندنەکا قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٠-١٩٨٠بکەین، ئەم د کارین بێژین د هەردو سەردەمێن وێ دا پەیدابوون و وەرارا رۆژنامەڤانییا کوردی ل پارێزگەها دهۆکێ هێژ د قۆناغا دەسپێکەکا سادەدا بوو، هەمان فاکتەرێن پێشتر مە ئاماژە پێکرین یان هندەك ژ وان ئاستەنگ بوونە د رێکا وێ دا، ئەو بزاڤێن هاتینەکرن و مە ئاماژە پێکرین پتر بزاڤێن کەسی بوونە و هندەك کەسێن دلسۆژ مفا ژ شیانێن خۆ و جهێ کارێ خۆ وەرگرتیە و هندەك پێنگاڤ د ڤی واریدا هاڤێتینە.

## قۆناغا ناڤبەرا ١٩٨٠- ١٩٩٠ێ

ڤێ قۆناغێ چەند تایبەتمەندییێن خۆ هەنە وەك:

- د ڤێ قۆناغێدا کۆمەکا مەزنا دەرچوویێن خواندنا کوردی یا دەسپێکا سالێن هەفتییان گەهشتنە قۆناغا ئامادەیی و بەرەڤ ژوور چوون، هەموو حەژێکەرێن ئەدەبیات و رەوشەنبیریا کوردی و هژمارەکا باش ژێ دەست ب نڤیسینێ بۆ کۆڤار و رۆژنامەیێن کوردی ئانکو د ڤێ قۆناغێدا تەخەکا کوردیزان و کوردیخوین و کوردینڤیسان یا گەلەك پتر ژ تەخا دەسپێکا سالێن هەفتییان هاتنە د مەیدانێدا.

- د ڤێ قۆناغێدا بزاڤا نەتەوەییا کوردی ئەوا ژ چوار سالێن داویێ یێن سالێن هەفتییان دەسپێکریەڤە د گەشبوونەکا بەرچاڤدا بوو، ڤێ بزاڤێ و کادر و ئالیگرێن وێ کو پتریا وان ژ وان گەنجان بوون یێن د خالا چوویدا مە ئاماژە پێکرین چ ل دەڤەرێن

ژێردەستەلاتێ شۆرشێ و چ ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ حکومەتێ ناڤتێدانەکا بەرچاڤا رەوشەنبیری و بزاڤا رۆژنامەڤانییا کوردی دکرن.

- هەر د ڤێ قوناغێدا چ ژ ئەنجامێ شەرێ عیراقێ ئیرانێ ١٩٨٠- ١٩٨٨ێ بیت، چ ژ ئەنجامێ بهێزبوون و وەرارا بزاڤا نەتەوەییا کوردی بیتن ئەو فشارا ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەفتییان ل سەر رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانییا کوردی سڤکتر لێکر، د ئەنجامدا هژمارەکا پترا رۆژنامە و کوڤارێن کوردی ل بەغدا و باژێرێن دیتر دەرکەتن.

- دامەزراندنەڤا ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد ل داویا ١٩٧٨ێ و ب تایبەت ڤەکرنا لقێ دهۆکێ ل کو هژمارەکا نڤیسکارێن دەڤەرێ و هژمارەکا زۆرا گەنجێن د خالا ئێکێدا ئاماژە پێ هاتییەکرن رێخوشکرنەکا دیتر بوو ل بەر دەسپێکرنەڤە یان ڤەژاندنا بزاڤا رۆژنامەڤانییا کوردی ل پارێزگەهێ.

ل بەر رۆناهیا خالێن چوویی ئەم دکارین ڤێ قوناغا رۆژنامەڤانییا کوردی ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ ل سەر دو رەنگان پولینبکەین:

- رۆژنامەڤانییا دەڤەرێن رزگار کری: هندیکە ئەڤ رەنگێ رۆژنامەڤانیێ یە کۆمەکا بەلاڤۆکانە ب چاپ و دیزاینەکا زۆر سادە هندەك جاران ب دەستی و کوپیکرنێ ب کاربونی و ب تیراژەکێ کێم هندەك جاران ٦- ١٥ دانەیان ژ ئالیێ حزبێن سیاسیێن کوردستانێ یێن پشکدار د شۆرشێدا ل دەڤەرێن رزگارکری و د ناڤ پەنابەرێن کورد ل دەرڤەی کوردستانێ و هندەك جاران ژی ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ حکومەتێ و ناڤ جەرگێ باژێران د هاتنەبەلاڤکرن. بەرچاڤترینا ڤان بەلاڤۆکان بەلاڤۆکا (مەتین) بوو، کو ل بەراهیێ ب ٦ بەرپەران دهاتەچاپ و بەلاڤکرن، پاشتر هژمارا بەرپەرێن وێ ل زێدەهیێ دا هەتا ل بهارا ١٩٨٨ێ گەهشتیە ٢٠ بەرپەران و تیراژا وێ ژ ٢٠٠دانەیان دناڤبەرا ١٩٨٥- ١٩٨٨ێ گەهشتە ١٤٠٠ دانەیان، ڤێ بەلاڤۆکێ هند ب بەرفرەهی جهێ خۆ کر، پشتی سەرهلدانێ بەری هەر تشتەکی هزر ل بەلاڤکرنا وێ وەك کوڤارەك هاتەکرن و دوا هژمارا وێ ٢١٣ بوو ل مەها کانوونا ئێکێ ل ٢٠١٥ هاتییە بەلاڤکرن و بوویە ئێك ژ سیمایێن دهۆکێ:

## ب کورتی دێ ڤان بەلاڤۆکان دەینە نیاسین:

| ژ | ناڤ و زمان | ئالیێ بەلاڤکری | دەم و هژمار | تێبینیێن گشتی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | فجر النصیر- عەرەبی | حزبا شیوعیا عیراقی- بنگەهێ هەرکی | هژ١،ك٢/١٩٨١- هژ ٣١، ١٩٨٦ | |
| ٢ | ئەلندا پێشمەرگەی- کوردی | هەمان حزب | ٣/ ١٩٨١- ١٩٨٤ | پاشکویێ فجر النصیر |
| ٣ | (مەتین) کوردی و عەرەبی | لقێ١ پارتی دیموکراتی کوردستان | هژ١ نیسانا ١٩٨١- هژ ٧٢ نیسانا ١٩٨٨ | هەیڤانە و وەرزی ل بەراهیێ ل کۆماتە و ژ سالا ١٩٨٣یڤە ل زێوەشکان |
| ٤ | هەرور کوردی و عەرەبی | کەرتێ بەهدینان حزبا شیوعیا عیراقی | هژ١ ك١/١٩٨١- هژ ١٧ و داویێ هاڤینا ١٩٨٣. | |

| ٥ | (رێیا سەركەتنێ – گریق النصر) كوردی و عەرەبی | لیژنا راگەهاندنا هەڤپشكا بەرەیێ نیشتمانی دیموكراتی عیرق (جود) | هژ ١ شباتا/ ١٩٨٣- هژ ٥/ ١٩٨٧ | كۆماتە، زێوەشكان دهاتەبەلاڤكرن |
|---|---|---|---|---|
| ٦ | گازیا خویندكار و لاوان، كوردی | نڤیسینگەها پیشەییا پ. د. ك و ئێكەتییا قوتابی و لاوێن كوردستانێ لقێ دهۆك | هژ ١، ئادارا ١٩٨٣- هژ ٤٣ و داویێ بهارا ١٩٨٨ | كۆماتە و زێوەشكان، هژ ١-١٠ بناڤێ گازیا خویندكاران و پاشتر گازیا خویندكار و لاوان هاتییەبەلاڤكرن. |
| ٧ | بەهدینان | لقێ دهۆكێ پارتیا سوشیالیستا كوردستان | هژ١، حزیرانا ١٩٨٤- هژ ١٠ پاییزا ١٩٨٥ | گوندێ، دەڤەرا بەرێ گارەی، د٤ بەرپەراندا |
| ٨ | رافد زێوە، عەرەبی | كەرتێ بەهدینان- حزبا شیوعیا عیراقی | هژ١، ك١/١٩٨٤- ١٩٨٦ | زێوەشكان- دەڤەرا نێروە |
| ٩ | الانتفاضة- ١، كوردی و عەرەبی | فەوجا سێ- حزبا شیوعیا عیراقی | هژ١، بهارا ١٩٨٢- هژ ١٨ ١٩٨٥ | |






| ١٠ | الانتفاضە ٢، كوردی و عەرەبی | فەوجا چوار- حزبا شیوعیا عیراقی | هژا، تیرمەها ١٩٨٤- هژ٧ بهارا ١٩٨٨ | گوندێ مەرانێ- بەرواری ژێری |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | دەنگڤەدانا لاوان، كوردی | ئێكەتیا لاوێن دیموكراتێن كوردستانێ | هژا، ئادارا ١٩٨٤- هژ٨ هاڤینا ١٩٨٦ | گوندێ حەفتەنینێ- دەڤەرا سندی |
| ١٢ | خابۆر، كوردی و عەرەبی | راگەهاندنا فەوجا ٣- حزبا شیوعیا عیراقی | هژا، ك٢ ١٩٨٥- ١٩٨٦ | |
| ١٣ | الرافد، عەرەبی | كەرتێ بەهدینان- حزبا شیوعیا عیراقی | هژا، هاڤینا ١٩٨٦- هژ ١٢ بهارا ١٩٨٨ | زێوەشكان- دەڤەرا نێروە[٨٠] |

## رۆژنامەڤانییا ناڤ بازێران

وەك پێشتر ئاماژە پێ هاتییەكرن ل داویا سالێن هەفتییان و دەسپێكا هەشتییان چەند فاكتەرەكێن هاریكار بۆ گەشبوونا رۆژنامەڤانیێ ل پارێزگەها دهۆكێ هاتنەپێش، بەلێ د هەمان دەمدا ژی هندەك فاكتەرێن دی بوونە ئاستەنگ د رێكا رۆژنامەڤانییێدا ل دەڤەرێ و ئاستەنگێن هەرە سەرەكی ژی سەروبەرێ سیاسی و شیانێن ئابووری بوون، ئەگەر شیانێن ئابووری هەبوانە ژی بێ گومان ئاستەنگێن سیاسی نە دهێلا ئەڤ كارە سەربگریت، بەلێ سەرەرای ڤی سەروبەری خەلكەكی ب تایبەت تەخا نڤیسكار و رەوشەنبیرێن دەڤەرێ هزر ل ڤێ چەندێ دكر و خەم ژێ دخوار و پێنگاڤ بۆ دهاڤێتن پێنگاڤا بەراهیێ كۆڤارا پەیڤ بوو:

- **پەیڤ:** پشتی كونگرێ پێنجێ یێ ئێكەتیا نڤیسەرێن كورد د ناڤبەرا ١٠- ١٤ ئەیلوولا ١٩٧٨ێ ل هەولێرێ هاتییەگرێدان، ل ٦ چریا دووێ ١٩٧٨ دەستەكا نوو بۆ لقێ دهۆكێ یێ ئێكەتیێ هاتەهەلبژارتن، ڤێ دەستەكێ هزر ل بەلاڤكرنا كۆڤارەكێ كر كو ببیتە ئۆرگانێ لقێ دهۆكێ و بەرهەمێن نڤیسەرێن پارێزگەهێ هەمبێز بكەت، ئاستەنگا سەرەكی د وی دەمیدا مولەتا بەلاڤكرنا كۆڤارێ نە دهاتەدان بۆ لقێ دهۆكێ، ژ ناچاری دەستەكا كارگێرییا لقێ دهۆكێ د كۆمبوونەكێدا بریار دا كۆڤار ب رەنگێ كۆمەلە بەرهەمەكان و ژ بەرهەڤكرنا ئەحمەد عەبدوللا زەرۆی كو وی دەمێ سەرۆكێ لقێ دهۆكێ بوو بێتەبەلاڤكرن و ل سەر بێتەنڤیسین ب هاریكاریا ئێكەتییا نڤیسەرێن كورد لقێ دهۆكێ هاتییەچاپكرن. ئەو بوو بەرهەم هاتنەكۆمكرن و مولەتا چاپێ هاتەوەرگرتن و دراڤێ پێویست بۆ چاپكرنێ و كەسێ شارەزا بۆ سەرپەرشتیا چاپێ ل بەغدا (ژ بەركو هێژ چ چاپخانە ل دهۆكێ نەبوون) هاتنەدابینكرن و ل رۆژا ٩ شباتا ١٩٨٠ێ سێ هزار دانەیێن كۆڤارا پەیڤ ژ چاپخانا (الحوادث)ا بەغدا ب چاپەكا جوان و دیزاینەكا هەژی هاتنەبەلاڤكرن و پێشوازیا خەلكێ پارێزگەهێ ل (پەیڤێ) ل ئاستەكی بوو د دو هەفتیێن بەراهیێدا ل دو پەرتووكخانێن دهۆكێ یێن وی سەردەمی ٧٥٠دانە ژێ هاتنە فروشتن. پشتی بەلاڤبوونا (پەیڤ)ێ ب دەمەكێ كورت بەرهەڤی بۆ هژمارا دووێ هاتنەكرن، بەرهەم هاتنە كۆمكرن و نڤیسین د ئێك دەفتەرێدا و هاتنەهنارتن بۆ رێڤەبەریا چاپەمەنیان ل بەغدا ژ بۆ وەرگرتنا مولەتێ بەلێ نەهاتنا رەزامەندیێ ل سەر چاپكرنا وێ بۆ دەمەكێ درێژ و دەسپێكرنا شەرێ عیراقێ و ئیرانێ و ژێك دووركەتنا ئەندامێن ئێكەتیا نڤیسەران و پتر دژوار بوونا كاودانێن سیاسی ل كوردستانێ و چەند ئەگەرێن دی بوونە ئەگەر ئەڤ (پەیڤ)ە ئێكانە بمینیت هەتا پشتی سەرهلدانێ (پەیڤ)ا نوو ل دهۆكێ ژ هژمار ئێك ڤە دەسپێكرەڤە[٨١].

- **دەنگێ مە:** دووەمین بزاڤا د ڤی واریدا ل دهۆكێ هاتییەئەنجامدان بەلاڤكرنا كۆڤارا (دەنگێ مە) بوو، دەنگێ مە كۆڤارەك رەوشەنبیری وەرزی بوو ژ ئالیێ كۆمەكا نڤیسەر و ئەدیبێن گەنج ئەو ژی مینا (پەیڤ)ێ

دهاتەئامادەکرن و بەلاڤکرن، وان ب خۆ مەزاختیێ چاپکرنێ دابیندکر، تنێ هژمارا ٤ ب هاریکاریا ئەمانەتا گشتیا رەوشەنبیری لاوان ل دەڤەرا ئوتونومی هاتیبەچاپکرن، کۆڤارەکا دەولەمەندە ب ناڤەرۆکێ خۆ، هژمارا ئێکێ ل هاڤینا ١٩٨٥، دووێ ل پاییزا ١٩٨٥، سیێ ل سالا ١٩٨٧ و چوارێ و داویێ ل سالا ١٩٨٩ێ هاتینەبەلاڤکرن[٨٢].

- **اثرا الوطن**، د ڤێ قۆناغێدا بزاڤەکا دیتر د وارێ رۆژنامەڤانیدا ل دهۆکێ هاتەهاڤێتن ئەو ژی بەلاڤکرنا کۆڤارەکا رەوشەنبیری وەرزی بوو ب ناڤێ (اثرا- الوطن) ژ ئالیێ یانەیا نوهەدرا یا جڤاکی ل دهۆکێ ب هەردو زمانێن عەرەبی و سریانی، یەکەم هژمارا وێ ل تەباخا ١٩٨٦ێ هاتیبەبەلاڤکرن، تایبەتمەندیا ڤێ کۆڤارێ د وێ چەندێدایە یەکەمین کۆڤارە ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ ب زمانێ سریانی دهێتەبەلاڤکرن، د هەمان دەمدا یەکەمیێن کۆڤارە مولەتدای ژ ئالیێ یانەیەکا جڤاکیڤە بێتە بەلاڤکرن و هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ بەردەوام بوویە ل سەر دەرکەتنێ[٨٣].

دەملدەست پشتی سەرهلدانا بهارا ١٩٩١ێ شۆرشەکا رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانی سەرانسەرێ دەڤەرێن ئازادێن باشوورێ کوردستانێ ڤەگرت، ڤێ شۆرشێ ب هێز و شیانەکا مەزنڤە سنوورێن پارێزگەها دهۆکێ ڤەگرت، ئەو هێز و شیانێن سەردەمێ رژێمێ دەلیڤا خۆ نە دیت بێنە مەیدانا رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانی دگەل ئەو هێز و شیانێن د ناڤ شۆرشا کوردستانێدا لێ ژ ئەنجامێ چەندین ئاستەنگان نە دکارین رۆلێ خۆ د مەیدانا رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانیدا بگێرن گەهشتنە هەڤ و ب هەڤرا دەست ب سەرهلدانەکا رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانی کرن، د هەمان دەمدا ژی ئەو فاکتەرێن بەریا نها مە ئاماژەپێکری کو دبوونە ئاستەنگ د رێکا کارێ رۆژنامەڤانیدا ل پارێزگەها دهۆکێ ژناڤچوون، تنێ ئاستەنگا مەزن ما ل بەر سنگێ ڤی کاری ئەو ژی نەبوونا چاپخانەیان بوو ل دهۆکێ، ئەڤ ئاستەنگە ل نیڤا دووێ ژ سالێن نوتانڤە بەرەڤ چارەسەرکرنێ چوو، لێ بەریا ڤێ چارەسەریێ ئەڤ ئاستەنگە ب دو رێکان هاتەلادان، ئەو ژی هندەك ژ وان رۆژنامە و کۆڤاران یێن د وی سەردەمیدا دەرکەتن وەك بەلاڤۆکان ب ئامیرێ چاپا دەستی و پاشتر ژی ب کۆمپیوتەری دهاتنەچاپکرن و ب رێکا رونیو و ستێنسل و فوتوستێنسلێ دهاتنەچاپکرن، هندەك ژی پشتی ل دهۆکێ دهاتنەدیزاینکرن گەنجێن خوینگەرم و دلسۆز رێکا هەولێرێ دگرتەبەر و گەلەك جاران ئەڤ رێکە پتر ژ دەهـ دەمژمێران بوو و دەمێ دگەهشتن یەکسەر بەرەڤ چاپخانەیێ دکەتنە رێ کۆڤار یان رۆژنامەیا خۆ چاپدکر و بەرەڤ دهۆکێ د زڤرینەڤە[٨٤].

قۆناغا سەرهلدانێ کو یەکەمین سەردەم بوو د دیرۆکا کوردستانێدا رۆژنامەڤانیا کوردی ب ئازادی و دوور ژ سانسۆرێ و گەفێن دەولەتێ و بێ ترس دەردکەت چەندین تایبەتمەندیێن خۆ هەنە، ژ وانا:

- رەوشەنبیر، نڤیسکار و رۆژنامەڤانێن کورد یەکەمین جار بوو ڤێ ئازادیێ ب خۆڤە دبینن، ئەڤ سەقایێ ئازاد هاندەر بوو کو ئەو ژی هەموو شیانێن خۆ د ڤی واریدا دیاربکەن و پرانیا پرانیا وان ژی ب تایبەت د دو سالێن بەراهیێدا ب گیانەکێ پێشمەگایەتی و خۆبەخش کاردکر.
- ئەڤ سەقایێ ئازاد دگەل بوونا هەڤرکیا حزبیا هندەك جاران نەرەوا ژی بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ هەموو حزبێن کوردستانیێن سەر مەیدانا پارێزگەها دهۆکێ و گەلەك جاران رێکخراو و کۆمەلەیێن سەر ب وانڤە رۆژنامە یان کۆڤار چ نەبیت بەلاڤۆکا خۆ ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ هەبیت.
- ئەڤ سەقایە هاریکار بوو گەلەك ژ رێڤەبەری و فەرمانگەهێن دەولەتێ ژی دەست ب بەلاڤکرنا کۆڤارێن تایبەت ب خۆ بدەن.
- یا گرنگ د ڤی سەربۆریدا گەشبوون و پێشڤەچوونا رۆژنامەڤانیا کوردی- دیالێکتا کرمانجیا ژووری بوو، کو یەکەمین جار بوو د دیرۆکێدا ئەڤ دیالێکتە ڤێ دەلیڤا هاریکار بۆ پێشڤەچوونا خۆ ببینیت، ب دروستی ژی ببیتە زمانێ رۆژنامەڤانی و سازیێن دیترێن راگەهاندنێ.

ئاماژەکرنەکا بەرفرەهـ ب ڤان هەموو کۆڤار و رۆژنامان د ڤێ ڤەکۆلینیدا دێ جهەکێ زۆر ڤەگریت، لەوما د خشتەیێ ژێریدا دێ ب کورتی ئاماژە ب هەریەك ژ وان کەین: ئەو ژ د دو قۆناغاندا:

# قۆناغا سەرهلدانا ١٩٩١- شەرێ ئازادكرنا عیراقێ ل نیسانا ٢٠٠٣

| ز | ناڤ و زمان* | ئالیێ بەلاڤكری | دەم و هژمار** | تێبینیێن گشتی*** |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الاتحاد، بەلاڤۆك، عەرەبی | ئێكەتیيا نیشتمانیا كوردستانێ- بەهدینان | هژ سفر، نیسانا ١٩٩١- هژ ١٠ | دهۆك |
| ٢ | بۆتان، رۆژنامە، كورد، پاشبەندێ عەرەبی | پارتی گەلی دیموكراتێ كوردستان- لقێ دهۆك | هژ سفر ١٩٩١/٦/٢٥- هژ ١٠- ١٩٩٢ | دهۆك- چاپخانە هەولێر |
| ٣ | خابۆر، كۆڤار، كوردی | نڤیسكارێن گەنجێن زاخۆ | هژ١، تیرمەها ١٩٩١- هژ ٤ | زاخۆ، كوپی |
| ٤ | تیرۆژ، كۆڤار، كوردی | ي. نڤیسەرێن كورد- كۆمیتا سێمێلێ | هژ١ تەباخا ١٩٩١- هژ ١٢ تیرمەها ١٩٩١ | سێمێلێ- كوپی، هژ ١٢ چاپخانە هەولێر |
| ٥ | پێلا سەربەست، كۆڤار، كوردی | ئێكەتیيا پێشەنگ یا خویندكار و لاوێن پارتی گەل | هژ ١، ١٩٩١/٨/٣١- (٤-٥) ك٢/ ١٩٩١ | دهۆك- كوپی |
| ٦ | چەلەنگ، بەلاڤۆك،كوردی، لاتینی | فرات ئارام و گوهدار ئیسماعیل | یەك هژمار، ئادار ١٩٩٢ | كوپی |
| ٧ | الانصات، بەلاڤۆكا نووچەیان، كوردی، عەرەبی و فارسی | راگەهاندنا لقێ ئێكێ پارتی دیموكراتی كوردستان | هژ ١، ئەیلوولا ١٩٩١- | دهۆك- كوپی |
| ٨ | دەنگڤەدانا خویندكار و لاوان، بەلاڤۆك | لیژنا زاخۆ، ئێكەتیيا قوتابی و لاوێن كوردستانێ | هژ٩، ئەیلوولا ١٩٩١ | زاخۆ- كوپی |

BEHDINAN
بەهدینان

پێكڤە ژیۆ نەهێلانا نەخوشی یا نەنفلوەنزا بالندەیان ل كوردستانێ

| ٩ | سەرهلدان، كوردى، رۆژنامە | مەلبەندێ ٤ێ یەكێتی نیشتمانی كوردستان | هژا ئەیلوولا ١٩٩١- هژ ٨ | دهۆك- |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | (مەتین)، كۆڤار، كوردى و عەربى | راگەهاندنا لقێ ئێكێ پارتى دیموكراتى كوردستان | هژ ١، چریا دووێ ١٩٩١- دواهژمار٢١٣ل مەها ١٢ ٢٠١٥ دەركەتیە | دهۆك- چاپخانە، هەولێر، دهۆك |
| ١١ | خالخالوك، كۆڤارا زارۆكان، كوردى | پاشبەندێ رۆژناما بۆتان | هژ ١و داوى هاڤینا ١٩٩٢ | دهۆك |
| ١٢ | پێرس، كۆڤار، كوردى | بزاڤا رەوشەنبیرى ل ئاكرێ | هژ ١، هاڤینا ١٩٩١- هژ ٤ | ئاكرێ- كوپى |
| ١٣ | نوخازى، كۆڤار، كوردى | ئەدیبێن نووخازێن پارێزگەها دهۆكێ | هژ ١ پاییزا ١٩٩١- هژ ٣داوییا ١٩٩٢ | دهۆك- كوپى |
| ١٤ | الانصات، بەلاڤۆك، كوردى و عەرەبى | ل ن ئاكرێ پارتى | ١٩٩١/١٢/٢٥- ١٩٩٤ | ئاكرێ- كوپى |
| ١٥ | نەورۆز، رۆژنامە، كوردى و عەرەبى | پاسوك- لژنا دهۆك | هژ ١ پاییزا ١٩٩١- ٦ تیرمەها ١٩٩٢ | دهۆك، كوپى |
| ١٦ | ئاكرى، نامیلكە، كوردى و عەرەبى | بزاڤا رۆشنبیرى- ئاكرێ | هژ ١ چریا دووێ ١٩٩٢- هژ ٨ داوییا ١٩٩٣ | ئاكرى، كوپى |
| ١٧ | ڤولكان، رۆژنامە، كوردى | كۆمەلا خویندكار و لاوێت كوردستانێ ئامێدیی | هژ سفركانوونا دووێ ١٩٩٢- ١٩٩٢- هژ٤ نیسانا ١٩٩٢ | ئامێدیی- كوپى |
| ١٨ | میدیا، كۆڤار، كوردى | كۆمەلا خویندكار و لاوێت كوردستانێ- دهۆك نەینەوا | هژ ١ كانوونا دووێ ١٩٩٢- هژ ٤ | دهۆك- كوپى |
| ١٩ | نجم بین النهرین، كۆڤار، عەرەبى سریانى | بنگەهێ رەوشەنبیرێ ئاشوورى ل دهۆكێ | هژ ١ ك٢ ١٩٩٢- هژ ٤٧ داوییا ٢٠٠٥؟؟؟ | دهۆك |
| ٢٠ | نوهەدرا، بەلاڤۆك، | ئێكەتییا قوتابى و لاوێن كلد و ئاشوورى | هژ ١ شباتا ١٩٩٢- هژ ٩ | دهۆك |
| ٢١ | میزلتا (المسیره)، رۆژنامە | رۆژناما ئێكەتییا قوتابى و لاوێن كلد و ئاشوورى | هژ ١ پاییزا ١٩٩٢، | دهۆك،، هاڤینا ٢٠٠٣ |
| ٢٢ | ئادار، بەلاڤۆك، كوردى | خواندنگەها سەرەتایا راپەرین- سێمێلێ | هژ ١ ئادارا ١٩٩٢- هژ ٢ هاڤینا ١٩٩٢ | سێمێل، كوپى |
| ٢٣ | راستەرێ، كۆڤار، كوردى و عەرەبى | ئێكەتییا زانایێن ئایینى- لقێ دهۆك- نەینەوا | هژ ١ ئادارا ١٩٩٢- هژ ١٦ | دهۆك، كوپى |
| ٢٤ | بەردەرەشى نوێ، بەلاڤۆك، كوردى و عەرەبى | ئێكەتییا پێشەنگ یا خویندكار و لاوێن كوردستانێ- ل بەردەرەش | هژ١حزیرانا ١٩٩٢ تنێ ١ هژمار | بەردەرەش- كوپى |
| ٢٥ | بزاڤا ئیسلامى، كۆڤار، كوردى | مەلبەندێ ٥ێ بزاڤا ئیسلامى | هژ ١تەباخا ١٩٩٢- هژ ٨ | دهۆك- كوپى |
| ٢٦ | انصات، بەلاڤۆك، عەرەبى | لیژنا پارتیا یەكگرتن- ئامێدێ | هژ ١٩٩٢/١/١٩/١- هژ ١٩٩٢/١/٣٥،٢٦ | ئامێدێ- كوپى |
| ٢٧ | چەپەر، كۆڤار، كوردى | حزبا زەحمەتكێشێن كوردستانێ- دهۆك | هژ سفر تەباخا ١٩٩٢- هژ ٢داوییا ١٩٩٢ | دهۆك، كوپى |
| ٢٨ | مەهاباد، كۆڤار، كوردى | هەڤیانەیا سەربەخۆ | هژ ١ تیرمەها ١٩٩٣- هژ ٧نیسانا ١٩٩٤ | دهۆك، كوپى |

| ژ | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٩ | ئەلند، بەلاڤۆك، عەرەبی | ئێکەتیبا پێشەنگ یا خویندکار و لاوێن کوردستانێ_ ل. زاخۆ | هژ ١، هاڤینا ١٩٩٢- هژ ٣ | زاخۆ، کوپی |
| ٣٠ | سەرهلدان، کۆڤار، کوردی و عەرەبی | مەلبەندێ ٤ێ یەکێتی نیشتمانی کوردستان | هژ ١، شباتا ١٩٩٣- ١٦ حزیرانا ١٩٩٦ | دهۆك، چاپخانە،هەولێر |
| ٣١ | الحرکە، کۆڤار، عەرەبی | مەلبەندێ ٥ێ، بزاڤا ئیسلامیا کوردستانێ | هژ ١، ئادارا ١٩٩٢- هژ ٨ | دهۆك، کوپی |
| ٣٢ | New Dayکۆڤار، ئینگلیزی | پەیمانگەها مامۆستایێن کچ ل دهۆکێ | هژ ١ و داوی ئادارا ١٩٩١ | دهۆك، کوپی |
| ٣٣ | زاخوتا، کۆڤار، عەرەبی سریانی | بزاڤا ئاشووری، لقێ دهۆك | هژ ١، نیسانا ١٩٩٣- هژ ٩پاییزا ١٩٩٥ | دهۆك، کوپی |
| ٣٤ | پەیڤ، کۆڤار، کوردی | ئێکەتیبا نڤیسەرێن کورد- لقێ دهۆکێ | هژ ١هاڤینا ١٩٩١- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ٣٥ | ژین، کۆڤار، کوردی | ئێکەتیبا ئافرەتێن کوردستانێ- لقێ دهۆکێ | هژ ١، ئادارا ١٩٩١، ١ هژمار | دهۆك،کوپی |
| ٣٦ | لالش، کۆڤار، کوردی عەرەبی ئینگلیزی | بنگەهێ لالش | هژ ١ پاییزا ١٩٩٣ بەدەوامە | دهۆك، چاپخانە هەولێر- دهۆك |
| ٣٧ | پەیمان، رۆژنامە، کوردی | نڤیسینگەها رەوشەنبیری و راگەهاندنا لقێ ١ پ د ك | هژ ١، ١١ تیرمەها ١٩٩٤- هژمار ٤١٣، ١٦ نیسانا ٢٠٠٣ | دهۆك- چاپخانە هەولێر- دهۆك |
| ٣٨ | اوراق من الوطن، نامیلکە، عەرەبی سریانی | هندەك رەوشەنبیرێن ئاشووری | هژ ١، تیرمەها ١٩٩٤- هژ ٨ شباتا ١٩٩٦ | دهۆك، کوپی |
| ٣٩ | گازی، کۆڤار | دەزگەهێ گازی | هژ ١، چریا دووێ ١٩٩٤- هژ ٥٦، تەباخا ١٩٩١ | دهۆك- چاپخانە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٤٠ | صوت الكتاب المقدس، بەلاڤۆك، عەرەبی | دەزگەهێ (ملئ الحياه) | هژ ١، ١٩٩٥/٨/١٨- ٥٩ بهارا ٢٠٠٢ | دهۆك، كوپی |
| ٤١ | رەسەن، رۆژنامە، كوردی | مەلبەندێ٣ی یەكگرتوویا ئیسلامیا كوردستانێ | هژ ١، ١ ئەیلوولا ١٩٩٥- ؟؟؟ | دهۆك، چاپخانە |
| ٤٢ | ڤەژین، كۆڤار كوردی و عەرەبی | كۆڤارەكا سەربەخۆ | هژ ١، چریا دووێ ١٩٩٥- هژ ٢٩ پاییزا ٢٠٠٢ێ | دهۆك، چاپخانە |
| ٤٣ | مرشد زانست للكومپیوتر، بەلاڤۆك، عەرەبی | بەلاڤۆكەكا تایبەت ب كۆمپیوتەری | هژ ١ ئادارا ١٩٩٣- هژ ٢١ داوییا ٢٠٠٣ | دهۆك- كوپی |
| ٤٤ | ماف، كۆڤار، كوردی عەرەبی | لیژنا ئەوروپی یا مافێن مرۆڤی- كوردستان | هژ ١، ١٥ حزیرانا ١٩٩٦- هژ ٤٤ ئادارا ٢٠٠٣ | دهۆك، چاپخانە |
| ٤٥ | پێشمەرگە، كۆڤار، كوردی عەرەبی | سەركردایەتیا سوپایێ ئێك دهۆك | هژ ١، تەباخا ١٩٩٦- هژ ٢٧ شباتا ٢٠٠٠ێ | دهۆك، چاپخانە |
| ٤٦ | دەنگێ یەككەفتیا، بەلاڤۆك، كوردی | ك. یەككەفتینێن كوردستانێ- دهۆك | هژ ١، ئادارا ١٩٩٦- هژ ٤ | دهۆك، كوپی |
| ٤٧ | دوبان، بەلاڤۆك، كوردی | ل.ن پارتی دیموكراتی كوردستان- سێمێل | هژ ١، ئەیلوولا ١٩٩٦- هژ ٢، چریا ئێكێ ١٩٩٦ | سێمێلێ- كوپی |






| ٤٨ | نوهەدرا دعلما (نور العالم) بەلافۆك، سریانی | لجنه شبيبه كنيسه المشرق | هژ سفر، ك١ ١٩٩٦- هژ ٣، شباتا ١٩٩٨ | دهۆك، كوپی |
|---|---|---|---|---|
| ٤٩ | دهۆك، كۆڤار، كوردی عەرەبی | سەرۆكاتیا باژێرڤانییا دهۆكێ | هژ ١، ئەیلوولا ١٩٩٧- هژ ٣٤ ئادارا ٢٠٠٧ | دهۆك، چاپخانە |
| ٥٠ | دەنگێ كلدان، كۆڤار، عەرەبی كوردی سریانی | بنگەهێ كلدان یێ رەوشەنبیری هۆنەری | هژ ١ داوییا ١٩٩٧- هژ | دهۆك، چاپخانە |
| ٥١ | قویا من، رۆژنامە، عەرەبی سریانی | الحزب الوطني الاشوري | هژ سفر، تیرمەها ١٩٨٧- | |
| ٥٢ | سڤورە، كۆڤارا زارۆكان، كوردی | دەزگەهێ گازی، دەزگەهێ خانی | هژ ١، نیسانا ١٩٩٨- بەردەوامە | چاپخانە دهۆك |
| ٥٣ | دجلە، كۆڤار، كوردی- لاتینی | وەزارەتا رەوشەنبیری | هژ ١، شباتا ١٩٩٨- هژ ٤٢ ئەیلوولا ٢٠٠١ | دهۆك- چاپخانە |
| ٥٤ | نوویبوون،كۆڤار، كوردی،لاتینی | بەردەوامییا دیجلە، وەزترەتا رەوشەنبیری | هژمار٤٣- هژمار ١٢٧، زڤستانا ٢٠١٣ | دهۆك،چاپخانە |
| ٥٥ | هۆنەر، كۆڤار، كوردی | جڤاتا بلندا هۆنەری- دهۆك | هژ ١، تەباخا ١٩٩٨- بەردەوامە | دهۆك- چاپخانە |
| ٥٦ | بزاڤا پالا، كۆڤار، كوردی عەرەبی | ئێكەتیيا سەندیكایێن پالا ل پاریزگەها دهۆكێ | هژ ١، ئەیلوولا ١٩٩٨- هژ ٢ پاییزا ١٩٩٨ | دهۆك، چاپخانە |
| ٥٧ | كۆڤارا زانكۆیا دهۆك، كۆڤار، كوردی عەرەبی ئینگلیزی | سەرۆكاتیا زانكۆیا دهۆكێ | هژ ١، تەباخا ١٩٩٨ بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |












| ٥٨ | بیاف، كۆڤار، كوردی | بزاڤا رەوشەنبیری ل ئاكرێ | هژ ١، شباتا ١٩٩٩- هژ | ئاكرێ، چاپخانە دهۆك، هەولێر، |
|---|---|---|---|---|
| ٥٩ | رێبازا چاندنێ، كۆڤار، كوردی | رێڤەبەریا گشتیا چاندنێ ل دهۆكێ | هژ ١، ئادارا ١٩٩٩- هژ ٤، ك١ ١٩٩٩ | دهۆك، چاپخانە |
| ٦٠ | سەرەرم، كۆڤار، كوردی | ئێكەتیا قوتابیێن كوردستانێ، لقێ دهۆكێ- نەینەوا | هژ سفر، تیرمەها ١٩٩٩- هژ ٣، هاڤینا ٢٠٠٠ێ | دهۆك، |
| ٦١ | الاهالی، رۆژنامە عەرەبی | دەزگەهێ (دار الاهالی) | هژ ١، نیسانا ٢٠٠٢ بەردەوامە، پشتی ٢٠٠٣ هاتیە ڤەگوهاستن بۆ بەغدا | دهۆك- چاپخانە پاشتر بەغدا چاپخانە |
| ٦٢ | بشیش، كۆڤار، كوردی عەرەبی | ئەحمەد جەزراوی | هژ سفر، چریا دووێ ٢٠٠٢- هژ ٤ | دهۆك، چاپخانە |
| ٦٣ | زەنگ و بەنگ، كۆڤارا زارۆكان، كوردی | | هژ ١، ئەیلولا ٢٠٠١- بەردەوامە | دهۆك- چاپخانە |
| ٦٤ | خازر، كۆڤار، كوردی عەرەبی | بنگەهێ رەوشەنبیری بەردەرەش | هژ ١، چریا ئێكێ ٢٠٠٢- بەردەوامە | بەردەرەش، چاپخانە |
| ٦٥ | ئەڤرۆ، رۆژنامە، كوردی | دەزگەهێ خانی | هژ ١، ٣١ تیرمەها ٢٠٠٣- بەردەوامە | دهۆك- چاپخانە |
| ٦٦ | كەپر، كۆڤارا زارۆكان | دەزگەهێ سپیرێز | هژ ١، تیرمەها ٢٠٠٣- ٧٥، ئەیلوولا ٢٠٠٩ | دهۆك، چاپخانە |
| ٦٧ | خەون، رۆژنامە ئەلكترونی، كوردی لاتینی | محەمەد مەلا حەمدی | هژ ١، ١٥ ئادارا ٢٠٠٣- هژ ٤، ١٠ ك١ ٢٠٠٣ | دهۆك، ئەنتەرنێت |
| ٦٨ | زاخۆ، كۆڤار، كوردی | سەربەخۆ | هژ ١، حزیرانا ٢٠٠٤ | زاخۆ، چاپخانە |
| ٦٩ | هێلین، كۆڤار، كوردی | دەزگەهێ سپیرێز | هژ ١، داوییا ٢٠٠٤- هژ ٩، ٢٠٠٦ | دهۆك، چاپخانە |
| ٧٠ | دەنگی لالش، رۆژنامە، كوردی عەرەبی | بنگەهێ لالش | هژ ١، ٧ چریا ئێكێ ٢٠٠٣- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ٧١ | سایكلۆژیا، كۆڤار، كوردی | بنگەهێ چارەسەریا دەروونی- دهۆك | هژ ١، شباتا ٢٠٠٥- | دهۆك، چاپخانە |
| ٧٢ | هیڤی، نامیلكە، كوردی | هندەك قوتابیێن قوناغا ناڤنجی ل دهۆكێ | هژ ١، شواتا ٢٠٠٥- هژ ٥ | دهۆك، كوپی |
| ٧٣ | پاشەر رۆژ، كۆڤار، كوردی | سەنتەرێ گەنجان سێمێلی | هژ ١، ئادارا ٢٠٠٥- هژ ٧، ٢٠٠٨ | سێمێلێ |
| ٧٤ | نوژین، كۆڤار، كوردی | سەنتەرێ گەنجان ئامێدیێ | هژ ١، ئادارا ٢٠٠٥- ٢٠١١؟؟ | ئامێدیێ |
| ٧٥ | ڤینا نوو، كۆڤار، كوردی عەرەبی | سەنتەرێ گەنجان زاخۆ | هژ ١، ١١ نیسانا ٢٠٠٥- ٢٠٠٧ | زاخۆ |
| ٧٦ | بەلاتیك، كۆڤارا زارۆكان | پاشكویێ كۆڤارا زاخۆ | هژ ١، بهارا ٢٠٠٥- | زاخۆ |
| ٧٧ | شێخان، بەلاڤوك، كوردی عەرەبی | سەنتەرێ گەنجان شێخان | هژ ١، ٢٠ تیرمەها ٢٠٠٧- ٢٠٠٨؟؟ | شێخان |
| ٧٨ | چاڤدێر، رۆژنامە، ، كۆڤار،كوردی | رێكخراوێن دیموكراتی، مەلبەندێ ٤ێ ی ن ك | هژ ٣١ تیرمەها – دوا هژمار ١٣٥ ل گولانا ٢٠١٤ێ | دهۆك، چاپخانە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٩ | چریسك، بەلاڤۆك، كوردی عەرەبی | سەنتەرێ گەنجان شاریا | هژ ١، ك١ ٢٠٠٥- ٢٠٠٧ | شاریا، كوپی |
| ٨٠ | بەهدینان | راگەهاندنا ناوەندیا ی. ن. ك ل دهۆكێ | هژ ١، ٢٧/ك١/ ٢٠٠٥- ١٠٧ ل ٢٠١٠/٤/١٢ | دهۆك، چاپخانە |
| ٨١ | سنێلە، كۆڤار، كوردی، | ئینستیتویا دهۆك بۆ رەوشەنبیریا گشتی | هژ ١، ك١ ٢٠٠٦- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ٨٢ | سیلاف، كۆڤار، كوردی | لقێ ٨ پارتی دیمەكراتی كوردستان- ئامێدیێ | ه ١، شباتا ٢٠٠٦- بەردەوامە | ئامێدیێ، چاپخانە |
| ٨٣ | ڤەژەن، كۆڤار، كوردی | كوربەندا سەرەرم یا قوتابیان | هژ ١، نیسانا ٢٠٠٦- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ٨٤ | هیزل، كۆڤار، كوردی عەرەبی سریانی | دەزگەهێ هیزل- زاخۆ | هژ ١، گولانا ٢٠٠٦- بەردەوامە | زاخۆ، چاپخانە |
| ٨٥ | ئابوورا مە، كۆڤار، كوردی عەرەبی ئینگلیزی | ژوورا بازرگانی و پیشەسازی دهۆك | هژ ١، ك٢ ٢٠٠٧- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە، |
| ٨٦ | سیمپا، كۆڤار، سریانی كوردی عەرەبی | بنگەهێ (دار المشرق)یێ رەوشەنبیری- دهۆك | هژ ١ ئیلونا ٢٠٠٧- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ٨٧ | شەیدا، كۆڤار، كوردی | تایبەت ب قوتابی و لاوان | هژ١، ك١ ٢٠٠٧- بەردەوامە | دهۆك- چاپخانە |
| ٨٨ | كورد زووم، كۆڤار، كوردە | سەربەخۆ | هژ ١، تیرمەها ٢٠٠٧- بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |






| ٨٩ | دەلال، کۆڤار، کوردی | بەردەوامیا کۆڤارا زاخۆ | ژ ٢٠٠٨ێڤە بوویە دەلال | زاخۆ، چاپخانە |
|---|---|---|---|---|
| ٩٠ | دوبان، کۆڤار، کوردی | سەربەخۆ | هژ ١، چریا دووێ ٢٠٠٨ بەردەوامە | سێمێل، چاپخانە |
| ٩١ | موتا عمایا المجلس الشعبی، کۆڤار، سریانی عەرەبی | المجلس الشعبی الکلدنی السریانی الاشوری | هژ ١، ٢٠٠٨ بەردەوامە | دهۆک، چاپخانە |
| ٩٢ | نیڤین، کۆڤار، کوردی | ناڤەندا بالا دهۆک- ئێکەتییا لاوێن دیموکراتێن کوردستانێ | هژ ١، تەباخا ٢٠٠٨ | دهۆک، چاپخانە |
| ٩٣ | مازی، کۆڤار، کوردی عەرەبی | فروشگەها مازی | هژ ١، گولانا ٢٠٠٩ | دهۆک، چاپخانە |
| ٩٤ | سیپە، کۆڤار، کوردی | لقێ پارتی دیموکراتی کوردستان | هژ ١، تیرمەها ٢٠٠٩ | ئاکرێ، چاپخانە |
| ٩٥ | ستارت کوردستان، کۆڤار، کوردی | سەربەخۆ | هژ ١، چریا ئێکێ ٢٠٠٩ | دهۆک، چاپخانە |
| ٩٦ | هەباوی، کۆڤارا زارۆکان، سریانی | بنگەهێ المشرق | هژ ١، چریا دووێ ٢٠٠٩ | دهۆک، چاپخانە |
| ٩٧ | پیرۆ، piro، کۆڤار، کوردی عەرەبی | پیرۆ گرۆپ | هژ١ ، چریا دووێ ٢٠٠٩ | دهۆک، چاپخانە |






| ٩٨ | پەروەردا نوو، كۆڤار، كوردى | رێڤەبەريیا پەروەردا قەزا دهۆكێ | هژ ١، دەسپێكا ٢٠١٠- هژمار ٦ پاییزا ٢٠١٣ | دهۆك، چاپخانە |
|---|---|---|---|---|
| ٩٩ | نوهەدرا، كۆڤار، كوردى عەرەبى سريانى | يانا نوهەدرا يا رەوشەنبيرى جڤاكى | هژ ١، كانوونا دووێ ٢٠١٠ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٠ | مەحفەل، كۆڤار، كوردى عەرەبى | سەربخۆ | هژ ١، حزيرانا ٢٠١٠- هژ٩/ ٢٠١٣ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠١ | هەلبەست، كۆڤار، كوردى | كۆمەلا هەلبەستاڤێن گەنج | هژ ١، تيرمەها ٢٠١٠ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٢ | دكتور، كۆڤار، كوردى | سەربەخو | هژ١،حزيرانا ٢٠١٠/ هژ ١ ك١ ٢٠١٠ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٣ | ترايـنا الشعبى، كۆڤار، سريانى عەرەبى | دار المشرق | هژ ١، ٢٠١٠ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٤ | چاڤدێر، كۆڤار، كوردى | ناڤەندا رۆشنگەريا چاڤدێر | هژ ١، نيسانا ٢٠١١ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٥ | پێل، كۆڤار، كوردى | كۆمپانيا (SM) گروپ | هژ ١، حزيرانا ٢٠١١- هژ ٣٣ل ١٥ نيسانا ٢٠١٤ | دهۆك، چاپخانە |
| ١٠٦ | رووگەهـ، كۆڤار، كوردى عەرەبى ئينگليزى | زانكۆيا زاخۆ | هژ ١، هاڤينا ٢٠١٢- هژ ٥ | زاخۆ، چاپخانە |






| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٠٧ | ئەلكترا، كۆڤار، كوردی | تیپا ئەلماز یا شانۆیێ | هژ ١،چریا دووێ ٢٠١١ | سێمێل، چاپخانە |
| ١٠٨ | رووگەها زارۆكان، كۆڤارا زارۆكان | زانكۆیا زاخۆ | هژ ١، زڤستانا ٢٠١٢،هژ ٣ | زاخۆ، چاپخانە |
| ١٠٩ | رۆژا نوو، كۆڤار، كوردی عەرەبی ئینگلیزی | سەربەخۆ | هژ ١، نیسانا ٢٠١٢ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٠ | زینێ وار، كۆڤار، كوردی | كۆمپانیا پالۆ یا راگەهاندنێ | هژ ١، كانوونا ئێكێ ٢٠١٢بەردەوامە | دهۆك، چاپخانە |
| ١١١ | كاریز، كۆڤار، كوردی | سەربەخۆ | هژ ١، تیرمەها ٢٠١٢ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٢ | هەناس، كۆڤار، كوردی | سەربەخۆ | هژ ١، چریا ئێكێ ٢٠١٢ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٣ | ئارڤین، كۆڤار، كوردی ئینگلیزی | سەربەخۆ | هژ ١، ٢٠١٣/١/٢ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٤ | ئاڤاكرن، كۆڤار، كوردی عەرەبی | ئێكەتیبا بەلێندەرێن كوردستانێ، لقێ دهۆكێ | هژ ١، كانوونا دووێ ٢٠١٣ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٥ | دیرۆك، كۆڤار، كوردی | كۆمپانیا پالۆ یا راگەهاندنێ | هژ ١، هاڤینا ٢٠١٣ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٦ | نیژەن، كۆڤار، كوردی | سەربەخۆ | هژ ١، شبات ٢٠١٤ | شێلادزێ، چاپخانە |
| ١١٧ | مێو، بەلاڤۆكا سالانە | رێڤەبەریا گشتی یا رەوشەنبیری و هونەری دهۆك | هژ ١، ٢٠١٣ ،هژ٥ حزیران ٢٠١٧ | دهۆك، چاپخانە |
| ١١٨ | پێشەنگ، كۆڤار | زانكۆیا زاخۆ، | هژ ١ حزیرانا ٢٠١٧ | زاخۆ، چاپخانە |
| ١١٩ | كۆڤارێن سەر ب بنكەهێ لالش ڤە | لقێن بنكەهێ لالش ل جهێن جودا بەلاڤكرینە | ٢٠٠٣ و هەتا نها | دهۆك چاپخانە |
| ئـ | سلاڤكەها لالش | بنكەهێ باعەدرێ | ١٣ هژمار | |
| ب | گەلیێ لالش | بنكەهێ خانكێ | ١٠ هژمار | |
| پ | قەپاغ لالش | بنكەهێ شاریا | ٨ هژمار | |
| هـ | چرایێ لالش | بنكەهێ شێخان | ١٥ هژمار | |
| د | نور لالش | بنكەهێ بارزان | ٣٤ هژمار | |
| ج | باشیك لالش | بنكەهێ باشیكێ | ١١ هژمار | |
| ح | دیوان لالش | ب شنگال و سنوونێ | ١٢ هژمار | |
| خ | زمزم لالش | بنكەهێ خەتارێ | ١٤ هژمار | |
| ١٢٠ | رۆژا مە | زاخۆ سەربەخۆ | هژمار ١ ٢٠١٧/٣/٢١ | زاخۆ، چاپخانە، ئەنقەرە |

**تێبینی:**

هندەك ژ ڤان كۆڤار و رۆژنامێن مە ئاماژە ب بەردەوامیا وێ یان دوا هژمارا وێ نەكری ئەو بخو بنیات دا نەهاتینە راوەستاندن لێ ژ ئەگەرێن ئابووری بكریار هاتینە راوەستاندن و نها نا دەركەڤن.

# رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل دەڤەرا بەهدینان

سەلام بالایی

(چاڤدێریا زارۆیان، چاڤدێریا پاشەرۆژێ یە.. چاڤدێریا ژیانێ یە)

جوفینسال دبێژیت: مەزنترین رێز لێنان ئەوە چ پێدڤییە بۆ زارۆیان بهێتە کرن.

یا زانایە هەر تشت ل سەر بنیاتێ زارۆکینی دهێتە ئاڤاکرن، ئەگەر ئەم داخوازا جڤاکەك پێشکەفتی و ساخلەم دکەین، فەرە زۆر گرنگیێ بدەین پەروەردەکرنا زارۆیان. مللەتێ مە دگەلەك قۆناغێن سەخت و دژوار دا دەربازبوویە و زارۆیێ کورد ژ هەمی حەز و ڤیان و ئارەزوێن خو بێ بەهر بووینە، قۆناغا هەرە زێرین یا مللەتێ کورد ب تایبەت ژ لایێ دەرکەفتنا رۆژنامەڤانیێ ب گشتی و یا زارۆیان ب تایبەتی قۆناغا سەرهلدانا ١٩٩١ێ بوویە، چونکی ب دەها رۆژنامە و کۆڤارێن کوردی ژ حزب و لایەن و گرووپێن سیاسی دەرکەفتن، و گەلەك دەرگەهـ ل بەر زارۆکێن مە هاتنە ڤەکرن ئەڤجار فەرە هاریکاریا زارۆیان بکەن و ل باخچێن رەنگین و پری زانست و زانیاری بگێرینین چ ب رێکا کۆمپیوتەری و ئەنتەرنێتێ و چ ب رێکا CD و رادیو و تەلەفزیون و کۆڤار و رۆژنامان[1].

دگەل هەبوونا شۆرشا تەکنولوژی و پێزانینان هەمی تشت کەفتینە بەر دەستێن مرۆڤی، ئەڤجا فەرە ل دووڤ ئارەزویا زارۆیان بچین ل دووڤ شیانێن خۆ و ل دووڤ پێدڤییا ئەڤرۆ داخوازێن وان بۆ پەیدا بکەین و بەرسڤا پرسیارێن وان یێن هندە سالە بێ بەرسڤ مایین بدەین، ئەگەر هەتا دوهی مە هزرەت جلکەکێ جوان و چانتەکا جوان بوو، ئەڤرۆ کورێن مە زارۆیین مە هزرا وان ل سەر کۆمپیوتەر و رۆژنامە و کۆڤار و ئەنتەرنێتێ یە داکو گەشتەکا دلڤەکەر دا ل هەمی جیهانێ بکەریت و هەڤالێن نوی بنیاسیت و پتر خەیالا وی سنوورا دەرباز بکەت، هەرچەندە خەیالێ چ سنور نینن.

## پشکا ئێکێ
### پێناسە و تێگەها رۆژنامەڤانییا زارۆیان:

ئێکە ژ رێکێن پەیوەندیکرنێ دگەل زارۆیی، یان ئێکە ژ پێکهاتا زارۆکینی و ئامادەکرنێ بەرەف شیانێن ب هێز چ دەمێ ئەو تێدا و چ ژ بۆ پاشەرۆژێ، چونکی هۆنەرەکە پێك هاتییە ژ دیتن و پەیڤا چاپکری و وێنێن رەنگین.

پێداچوونەك مێژوویی بۆ رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل جیهانێ :

## أ- ئێکەم رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل جیهانێ:

دبێژن ئێکەم بەریەرێ زارۆیان ل سالا ١٧٤٧-١٧٩١ ل فرەنسا دەرکەفتییە، نڤیسەرەکێ بیێ ناڤێ خو یێ دروست دیاریکەت ناسناڤەك دانابۆ د نڤیسا هەڤالێ زارۆیان دەرخست و ب هەمان ناڤ رۆژنامەژی دەرئێخست، ئەڤی ئەدیبی د رۆژناما خودا شیا گەلەك چیرۆکان ژ زمانێن بیانی وەرگێریتە سەر زمانێ فرەنسی و د رۆژنامێدا بەلاڤبکەت، ب دەرکەفتنا رۆژنامێ گەلەك خزمەت بۆ زارۆیێ فرەنسی هاتەکرن و ڤالاتیەك دوی دەمیدا ل جەم زارۆیان پرکر، هندەك دی دبێژن کو ئێکەم رۆژناما زارۆیان ل جیهانێ ل سالا١٨٣٠ ل فرەنسا دەرکەفتییە، پشتی وێ بۆلتیزر پاشکویەك دگەل رۆژناماً خۆ یا ب ناڤێ جیهان (world) ل ئەمریکا ل سالا ١٨٩٦ دەرئێخست کو پێکهاتبوو ژ وێنێن پەهلەوانیا زارۆیەکی ل جادێن نیویورك بەری ڤان ژی چەند بەریەر ل ژێر سەریەرشتیا دەستەکێن زانستی و پەروەردەیی دەردکەفتن[2]. بەلێ ئەڤە پتر گرێدای رۆژنامەڤانیا خواندنگەها بوون، ئانکو پتر د ئارستەکری بوون .

## ب- ئێکەم رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل عیراقێ:

یەکەم رۆژناما گرێدای زارۆیان ل عیراقێ ب ناڤێ (التلميذ العراقي)ل سالا ١٩٢٢ ل بەغدا ژ لایێ سەعید فەهیم دەرکەفت، بەلێ ئەڤە ژی یا گرێدای خواندنگەهێ بوو (٣١) هژمار ژڤێ رۆژنامێ دەرکەفتن، کو داوی هژمار ل سالا ١٩٢٣ دەرکەفت و پشتی هینگێ[3]. ئەو ژی ژ بەر بارێ ئابووری و ژ بەر نەدانا ئابۆنێن پشکداران راوەستیا هەروەکی خودانێ پەرتووکخانا (العصرية) هەڤ چەرخێ محمود حلمی گۆتی: ئەگەرێ دوێ یێ راوەستیانا ڤێ رۆژنامێ دزڤریت بۆ رێڤەبەرێن خواندنگەها، هند گرنگی نەددا دەرکەفتنا وێ کو بلاڤ بیت، ئەڤ رۆژنامەیە د سالا دوویێدا جارەکا دی دەرکەفتەڤە و یەکەم هژمار ژێ ل ١٩٢٤/١٠/٢٥ دەرکەفت، هەر دیسان گەلەك کوڤار و رۆژنامێن دی ل عیراقێ[4]. گرێدای زارۆیان دەرکەفتن، بەلێ پترێن خواندنگەها بوون وەك (مدرسە) خواندنگەهـ ل سالا ١٩٢٦ ێ و (طلبة) خویندکار ل سالا ١٩٣٢ێ ، و (فتوە)ل سالا ١٩٣٤ (عالم الاطفال) جیهانا زارۆیان ل سالا ١٩٤٥ ێ و گەلەکێن دی[5].

## ج- ئێکەم رۆژنامە ڤانیا زارۆیان ل کوردستانێ:

یا خویایە کو مالباتا بەدرخانییان پێشەنگێن رۆژنامەڤانییا کوردینە و یەکەم رۆژنامە ب ناڤێ (کوردستان) ل سالا ١٨٩٨ ێ ل وەلاتێ مسرێ ل قاهیرە دەرئێخست، لێ چ نیشانێن رۆژنامەڤانییا زارۆکان تێدا نینن، پشتی بەلاڤبوونا کوڤارا هاوار دناڤبەرا ١٩٣٢-١٩٤٣ ل شامێ گەلەك گۆتارێن د (هاوار) ێدا میر جەلادەت بەدرخان ئاماژە کرییە زارۆیان داخوازی ژ دایك و بابان کریە کو خواندن و زانینێ نیشا زارۆکێن خۆ بدەن و دبێژیت کو ئەو نڤشێ پاشەرۆژا مللەتینە و د هژمار (٩) ژ (هاوار) ێ دا هاتییە: بۆ نڤشێ پاشەرۆژێ مەبەستا وی زارۆکن وەها دبێژیت:

(دڤێت زارۆیێن کوردستانێ بخەبتن و رۆژەکێ بەری ڤێ رۆژێ، مەبەستا وی رۆژا دناڤا ئالایێ کوردستانێ دایە، هلینن بەر ب ئاسمانێ کوردستانێ ڤە بلند بکن، ل ور ب بروسکێن وەلاتێ خۆ ل سەر ئاڤاهیێ خۆیێ پێشین ڤەگەرینن و دبن تاڤا وێرە سەربخو و ب کامرانی بژین).

ل ڤێرە ئەم دکارین بێژین مالباتا بەدرخانییان هزر ل دەرکەفتنا رۆژنامەڤانییا زارۆیان کرییە، لێ ئێکەم بزاڤ بۆ یەکەم جار و یەکەم کەس هزر ل رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل سەرانسەری کوردستانێ کرییت بنەمالا بەدرخانییان بوو ئەوژی ب دابینکرنا گۆشەکا تایبەت ژ کوڤارا هاوار بناڤێ (ستوونا زارۆیان). ئەڤە بۆ ئەگەرا هندێ کو چەندین نڤیسەرێن کورد ل بن ڤێ مانشێتێ و بۆ ڤێ مەرەمێ خامێن خو بێخنە کاری

ژ بۆ خزمەتا زارۆیان، و چەندین هۆزان و چیرۆکێن پەروەردەی بۆهاتنە نڤیسین[٦]:

١- ئەو هوزانڤانێن دڤی ماوەی دا د ژیان بەشداری دڤێ کۆڤارێ داکرن و شیبان هندەکێ ژ هۆزان و دیوانێن خۆ یێن هۆزانان بۆ خزمەتکاریا زارۆیان تەرخان بکەن، مینا (کامیران بەدرخان، دلێن کورێن من، جگەرخوین، شەفەق وچەندێن دیتر).

٢- بیر ل هندێ بێتە کرن کو پێدڤیە زارۆیان ژی رۆژناما خۆ هەبیت، ئەڤە بۆ یەکەم پێنگاڤا سەرەکی ل هەمی پارچە و ناوچێن دی یێن کوردستانێ، بۆ دابینکرنا رۆژنامەڤانییەکا تایبەت بۆ زارۆیان لێ ب هزرا من ئێکەم بزاڤ بۆ زارۆیان هاتبیتەکرن دزڤریت بۆ فەرهەنگا (نوبهارا بچوکان) یا شاعر و ئەدیبێ کوردێ مەزن (ئەحمەدێ خانی) کو ل بەری پتر ژ سێ سەد سالان دانای و ب دروستی ل سالا ١٦٨٣ ێ، هەر چەندە من د چ ژێدەران دا نەدیتیە کو ئاماژە بڤێ کریت، لێ ئەز وەها بۆ دچم، و د پێشەکییا ڤێ فەرهەنگێ دا ئەحمەدێ خانی دبێژیت:

( ئەڤە چەندکەلیمەنە ژ لوغاتان ڤێك ئێخستن ئەحمەدێ خانی، ناڤێ وێ نو بهارا بچوکان لێ ل سەر دانی نە ژ بۆ صاحب رەواجان، بەلکی ژ بۆ بچیکێن کورمانجان)[٧].

دبێژیت من ئەڤ فەرهەنگە بۆ زارۆکێن کرمانجا دانا دەمێ ژ خواندنێ خلاس دبن فێری زمانێ عەرەبی ببن، پشتی ڤێ و پشتی بزاڤا میرجەلادەت بەدرخان، بزاڤا فەرمی یان یاکو بەربەلاڤ د پەرتووك و رۆژناماندا کۆڤارا (گروگالی مندالانی کورد)، یاکو یەکەم هژمارا وێ ل سەردەمێ کۆمارا کوردستان ل سالا ١٩٤٦ ل مهاباد ژ لایێ سەریەرشتیارێ چاپخانا کوردستان مەلا قادر مودەرسی کوهینگێ رێڤەبەرێ چاپخانێ بوو دەرچوویی، تنێ ( ٣ هژمار ژڤێ کۆڤارێ دەرکەفتن، و دهێتە هەژمارتن ئێکەم رۆژنامەڤانییا زارۆیێن کورد[٨]. هژمارە (١) ل ٢١ نیسانا سالا ١٩٤٦ێ دەرکەت، و هژمارە (٣) ل ٢٢ حزیرانا سالا ١٩٤٦ ێ دەرکەت، و جارەکادی زارۆیێن کورد مانە بێ رۆژنامە و کۆڤار تا کو سالا ١٩٧٢ ێ دەمێ کۆڤارا (ئەستێرە) ل سلێمانیێ دەرکەتی، کو پاشکویێ کۆڤارا (رۆژی کوردستان) بوو، سەرنڤیسەرێ وێ مامۆستا (سالح یوسڤی) بوو. تنێ (٢) هژمار ژڤێ کۆڤارێ ژی دەرکەفتن[٩].

## جۆرێن رۆژنامەڤانییا زارۆیان:

گەلەك جۆرێن رۆژنامەڤانییێن زارۆیان هەنە وەك وێنە یان شکل کۆڤارو رۆژنامەنە، دەربارەی ناڤەروکێ گەلەك رەنگ و جۆر هەنە وەك (تێکەل، پێکەنین، دەنگ و باس، وەرزش، کاریکاتور) و گەلەکێن دی.

دگەل ژیێ زارۆی و هەر ڤۆناغەکێ رۆژنامە و کۆڤارێن خو هەنە هەر وەکی زانایێن دەرووناسێن زارۆیان بۆ چەند پشکا بەلاڤکرین، یان بۆ چەند ڤۆناغان:

تولستوی دبێژیت: (ل پێنج سالیێ تا پێنچی سالیێ ئێك پێنگاڤە، بەلێ ژ دایکبوێنێ تا پێنج سالی ماوەکێ زۆر بەرفرەهە)، مەبەستا وی ئەڤ پێنج سالێن ئێکێ زۆر گرنگە بۆ ئاڤاکرنا کەساتییا زارۆیی.

بۆ ژیێ (٣- ٦) سالیێ ڤۆناغا واقع و خەیالا دیار کری ب ژینگەها زارۆیی ڤە.

یا دووێ ژ (٦- ١٢) سالیێ یە کو خەیالا بەر فرەهـ و پەهلەوانیێ.

ڤۆناغا نموونەیی و رۆمانسی ژ (١٢) دەسپێدکەت تاکو زارۆکینی بداوی دهێت ئانکو تا کو (١٨) سالیێ . هەر دیسان کۆڤارێن تایبەت بۆ کچان ژی هەنە، بەلێ تا کو نها ل وەلاتێ مە ئەڤ کۆڤارە نینن،

بەلێ جۆرێ ژ هەمیا بەلاڤترو پتر زارۆك حەز ژێ دکەن ئەون یێن جۆراو جۆر، ئانکو تێکەل کو پێکهاتینە ژ بەلاڤکرنا چیرۆك و زنجیرە چیرۆك و پەهلەوانی و تشتێن سەیر و سەمەر و بەریکانە و پێزانینێن گشتی و دەنگ و باس و پێکەنین، وەکی وان کۆڤارێن نها ل دەف مە دەرکەفتین، و ئەڤ رەنگە کۆڤارە مەلەلێ بۆ زارۆیی چێناکەن، چونکی چ دڤێت دڤان رەنگە کۆڤارا دا هەیە،

## پشکا دووێ:

### رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل دەڤەرا بەهدینان:

ئەم دکارین بێژین ئێکەم بەرپەر یان رۆژنامە بۆ زارۆیـان ل دەڤـەرا بەهدینان دەرکەفتی پاشکویێ رۆژنـامـا (بـۆتـان) کـو زمانێ حالێ پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان لقێ دهوک ل سالا ١٩٩٢ ێ ب ناڤێ (خالخالوك) بوو، کو پێك دهات ژ (٨) بەرپەرێن رەنگین ژ قەبارەیێ مەزن ، لێ (خالخالوك) ژی تنێ فرەك ل خودا و جارەکا دی کەفت، ئانکو تنێ ئێك هژمارە ژێ دەرکەفت. دڤێ هژمارێ دا ئەڤ بابەتە هات بوونە بەلاڤ کرن :

(فێربۆنا تیپێن لاتینی، کاریکاتور، سیناریو، تابلوێن زارۆیان، چیرۆك، چەند پێزانین)،

پشتی **(خالخالوك)**ێ، ئانکو بزاڤا دووێ یا بۆ زارۆیان هاتیبە کرن دەرکەفتنا کوڤارا **(ئادار)** بوو، یاکو ژ خواندنگەهـا رابەرین یا سەرەتایی ل سێمێلێ ژ بەرهەڤکرنا مامۆستا (نایف عەلی ئیبۆ) بوو، ئەڤ کوڤارە ژی ل سالا ١٩٩٢ ێ دەرکەفت و ژ (٢٤) بەرپەرا




ژ قەبارەیێ بچویك پێكدهات، هژمارا ئێكێ ل ئادارا ١٩٩٢ ێ و هژمارا دووێ ل هاڤینا ١٩٩٢ێ ب شێوەکێ رەش وسپی دەردکەفت، لێ کوڤارەکا هەمەرەنگ بوو، یا پر بۆ ژبابەتێن جودا.. جودا. دسەر گۆتارا هژمار ئێك دا بەرهەڤكەری بەحسێ گرنگییا رۆژنامەڤانییا زارۆیان کرییە دبێژیت:

(هەر کەسێ ئەڤینا زارۆیـان د دلی دا نەبیت نەشێت ئەڤینا وەلاتی ژی ب حەبینیت)،

گازی هەمی خێرخواز و نڤیسەران کرییە، کو خو ل رۆژنامەڤانییا زارۆیان بکەن خودان .

بابەتێن کوڤارێ پێکهاتینە ژ (چیرۆك، بابەتێن هـۆنـەری، شوینوار، وەرزش، فلکلور، چاندن، فەرهەنگوك، بەریکانە، کاریکاتور، سیناریو، پێزانینێن گشتی)،

ڤێ کوڤارێ رۆلەکێ بەرچاڤ هەبوو، چونکی ل دەڤەرا سێمێلێ دەردکەفت کو دەڤەرەکا عەرەبکری بوو، خواندن و نڤێسین ب کوردی زۆر یا کێم بوو ئەڤ کوڤارە بۆ هاندەرەك کو زارۆیێن دەڤەرێ فێری زمانێ خۆ ببن و ب ئێکەم روپەلێن رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل سێمێلێ شاد ببن.

ژ سالا ١٩٩٢ ێ تا کو سالا ١٩٩٨ێ چ رۆژنامە و کوڤار بۆ زارۆیان نەدەرکەفتن، ژبلی کوڤارێن گشتی کو بەرپەرەك یان دو بۆ زارۆیان تەرخانکربوون، ئەڤ قۆناغە بەردەوام بوو، تا کو بیروەریا سەدسالییا رۆژنامەڤانییا کوردی ل ١٩٩٨/٤/٢٢ێ ئێکەم کوڤارا زارۆیان بناڤێ (سڤۆرە) دەردکەفت و هەر دوێ رۆژێدا ل سەر زارۆیان هاتە بەلاڤکرن، کو مزگینیەك بوو بۆ زارۆیێن دەڤەرێ، بەلکو بۆ مالباتا بەدرخانییان و بۆ تەڤایا زارۆیێن کوردستانێ.

## پشکا سیێ:

### قۆناغا وەرارا رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل بەهدینان:

کوڤارا (سڤورە) ئێکەم پێنگاڤا ژ هەژی بوو بۆ زارۆیان ل دەڤەرا بەهدینان هاتیبە هاڤێتن، ئەڤ




کۆڤارە ل پێشیێ سەر ب دەزگەهێ گازی ڤەبوو، لێ پشتی هزر هاتیەکرن و پشتی روینشتنا چەندین هەڤالان ژ ستافێ کۆڤارا (گازی)، پرۆژەك پێشکێشی نڤیسینگەها راگەهاندنا پارتی دیموکراتی کوردستان ل دهوکێ کر و وان ژی ب سینگەکێ بەرفرەهـ ئەو پرۆژە پەسەند کر و بەرهەمێ وێ دەرکەفتنا کۆڤارا (سڤۆرە) بوو.

- بۆچی بڤی ناڤی هاتە ناڤکرن؟
- چونکی گیانەوەرەکێ جوان و سڤکە و ل دەڤەرێن کوردستانێ زۆرە و ل سەر گویزا و داران دژیت ویێ سڤکە بۆ سەر داران و ب ساناهی دشێت خۆ ژ دوژمنان ب پارێزیت، دیسان ئەڤ گیانەوەرە هزر ل پاشەرۆژا خۆ دکەت و گویز و بەرویان و فستەق وبندەقان بۆ زڤستانێ کۆمدکەت.

سەرنڤیسەرێ کۆڤارێ (فەهمی سەلمان) بوو، کو رولەکێ کاریگەر ژ بۆ دەرکەفتنا (سڤورە) دیتییە[10].

- ئەڤ کۆڤارە د گەلەك قوناغا دا دەرباز بوویە:

١- ژ هژمار (١ تا ٢٨) خودانێ ئیمتیازێ کاروان ئاکرەیی، سەرنڤیسەر فەهمی سلمان.

٢- ژ هژمار (٢٨ تا ٥٥) خودانێ ئیمتیازێ حەبیب کەلەش، سەرنڤیسەر بەهجەت هروری.

٣- هژمار (٥٦) خودانێ ئیمتیازێ فەهیم عەبدولا، سەرنڤیسەر د. فازل عومەر.

٤- هژمار (٦٧) خودانێ ئیمتیازێ فەهیم عەبدولا، سەرنڤیسەر سەلام بالایی تا نهو.

٥- ژهژمار (٩٠) خودانێ ئیمتیازێ فازل عومەر سالح وسەرنڤێسەر هەر وەك خۆ مایە .

٦- ژهەژمار(١٦٤) ڤە دەزگەهێ خانی یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ بوویە خودانێ ئیمتیازێ، ئەڤ کۆڤارە نها ب (٣٢) بەریەرێن رەنگین دەردکەڤیت و تاکو نڤیسینا ڤی بابەتی (٢١٧) هژمار ژێ دەرکەفتینە و یا بەردەوامە.

* کارتێکرنا دەرکەفتنا سڤورە ل سەر زارۆیان:

کۆڤارا سڤورە کەفتە ددەستێن هەمی زارۆیێن دەڤەرێ دا چ ب رێکا بەلاڤکرن و نیشادانا وێ ل سەر ئەنتەرنێتێ چ ب رێکا بەلاڤکرنا وێ ل خواندنگەهـ و بازاران چ ب رێکا بەلاڤکرنا وێ ل تەلەفزیون و رادیوێن دەڤەرێ، پتریا بەرهەمێن بۆ کۆڤارێ هاتین هەر ژ زارۆیان بوو، ئانکو سڤورە بوو خواندنگەهـ ژبۆ پەروەردە کرنێ و پشتی هینگێ چەندین نڤیسەرێن زارۆك دەرکەتن کووان مفایەکێ باش ژکۆڤارا سڤورە وەرگرتین و بۆ ڤێ یەکێ وان بخۆ چەندین کۆڤار یان بێژین بەلاڤوك دروست کرن وەك:

**١- کۆڤارا (نیرۆژ)**، کوهەتا نها (٦) هژمار ژێ دەرکەفتیە و ب رێك و پێکی هەیڤا نە ل سەر زارۆیان دهێتە بەلاڤکرن، ئەڤ کۆڤارە سەرنڤیسەرێن وێ (نیرۆژ و صالح) و نیرۆژ عبدالعزیز بەرهەڤدکەت و صالح عبدالعزیز ب نیگار و دەرهینانا هۆنەری رادبیت، ئانکو کۆڤارەکە چەند زارۆك د مالەکێدا دەردئێخن بابەتێن ڤێ کۆڤارێ دهەمە رەنگن و ژ (١٦) بەریەران ژ قەبارەیێ بچویك پێکدهێت. لێ تنێ چەند هژمار ژێ چاپ دکرن و ل سەر هەڤالێن وان دهاتنە بەلاڤکرن.

**٢- کۆڤارا ئازادی**، کۆڤارەکە (بەلاڤوك) ژدەرهێنان

و دروستکرنا ژنگر یاسین تروانشی، ژ (١٢) بەرپەرا پێکدهات و بابەتێن هەمی جۆر تێدا دهێنە بەلاڤکرن، پتریا ڤێ کۆڤارێ ب دەست هاتینە نڤێسین هەتا نها (٢) هژمار ژی دەرکەفتینە.

**٣- کۆڤارا ستێر،** کۆڤارەکا زارۆیانە (بەلاڤۆك)، ژ بەرهەڤکرنا (هێژا وەیسی) بوو، کو بێژەر بوو ل تەلەفزیونا کوردستان - دهوك، ٦٠ دانە ژێ بەلاڤ بەرهەڤدکرن و هەموو وەك دیاری ل سەر خویندکاران بەلاڤدکرن، ژ ١٢ بەرپەران پێکدهات،بەرهەمێن هەمەرەنگ هەمبێز دکرن.

**٤- کۆڤارا چیا،** کۆڤارەکا هەیڤانەیە (بەلاڤۆك)، تایبەتە ب جیهانا زارۆیان ڤە ژ(١٢) بەرپەران پێکدهێت و تنێ (٣) هژمار ژێ دەرکەفتینە، سەرنڤێسەرێ وێ (زەڤەر ئیسماعیل) ە، کول قۆناغا ناڤنجی بوو ئانکو هێشتا زارۆك بوو و چەندین هەڤالێن دیژی هاریکاریا وی بۆ دەرکە فتنا ڤێ کۆڤارێ دکر ، کو ژ قەبارەیێ مەزنە و بابەتێن وێ هەمەرەنگە.

**٥- کۆڤارا کەو،** کۆڤارەکا (بەلاڤۆکەکا) هەیڤانەیە بۆ زارۆیان، سەرنڤیسەرێ ڤێ کۆڤارێ (مللەت عسمەت) ە و ئەڤ کۆڤارە ژی ژ خێزانەکێ دەردکەڤیت، کو چەند خووشك و برا ژ بۆ دەرکەفتنا ڤێ کۆڤارێ هاریکاریا ئێك دکەن و تا نها (٢) هژمارە ژێ دەرکەفتینە و بابەتێن وێ هەمەرەنگە.

**٦- کۆڤارا رۆژ،** کۆمەکا خویندکارێن ئالا یا نموونەیی دەردئێخستن.

ئەڤە زێدە باری گەلەك هەڤالێن دی کو بۆ کۆڤارێن زارۆیان مینا سڤورە بابەت د نڤیسان، نها ئەو بخو هەول و بزاڤا دکەن ژ بۆ دەرکەفتنا کۆڤاران د چارچوڤێ خواندنگەهێ دا و چەند زارۆك پێ رابوونە و ل سەر هەڤالێن خۆ بەلاڤ دکەن بێی بینن پەرتووکخانێن بازێری، و ئەڤ هەمی پێنگاڤە بۆ هندێ ئەڤ زارۆکە یان گەنجە د ئامادەبن کو ل هەر کۆڤارەکا زارۆیان کار بکەن و شیانە کەساتییەك ب هێز و خودان شیان بن، ئەڤە بۆ هندێ دزڤریت کو دەما دیتی رۆژنامەڤانیا زارۆیان کارتێکرنا خۆ هەیە وان ژی هزر د دەرکەفتنا کۆڤاراندا کر، ئەز باوەرم نە




ل دەمەکێ دویر دێ بازارێ پەرتووکخانا کوردی پربیت ژ رۆژنامەڤانیا زارۆیان.

هەلبەت ژبلی ڤان کۆڤاران چەند کۆڤارێن گشتی ژی چەند بەرپەرەك بۆ زارۆکان تەرخواندکر وەك نووبوون، دجلە یا بەرێ (کو ب تیپێن لاتینی دەردکەت)، زاخو و گەلەکێن دی..

ئەگەر ژ سالا ١٩٩٢تا ١٩٩٨ ێ مە چ رۆژنامە و کۆڤارێن زارۆیان نەبوون، ئەڤە ژ ڤێ مێژوویێ بەرف ژوور تنێ ل پارێزگەها دهوکێ نێزیکی (٩) کۆڤارێن زارۆیان دەردکەتینە مینا :

- **کۆڤارا زەنگ و بەنگ،** ئەڤ کۆڤارە هژمارا ئێکێ ل هەیڤا (٩) سالا ٢٠٠١ ێ ب (١٢) بەرپەرێن رەنگینڤە کەفتییە بازاری. ژ هژمارا ئێك تا (٥) سەرنڤێسەرێ کو ڤارێ (دێوالی حاجی) بوو و ژهژمار (٥) تا (٢٦) سەر نڤیسەر (عەجیب عەبدولا) بوو و ژ هژمار (٢٦)تا (٣٤) سەر نڤیسەر (ئیدریس غازی) یە وتا نوکە یابەردەوامە، لێ ئەو ژی شیایە زارۆیان بخو ڤە گرێدەت و بابەتێن هەمەرەنگ بەلاڤ بکەت




کو هەمی زارۆك مفای ژێ وەرگرن.

• **کۆڤارا کەپر:** یەکەم هژمارا وێ ل تیرمەها سالا ٢٠٠٣ێ دەرکەڤتییە، سەرنڤیسەرێ کۆڤارێ (موئەیەد تەیب)ە ، ئەڤ کۆڤارە ژ لایێ دەزگەهێ (سپیرێز) یێ چاپ و وەشانێ ب هاریکاریا رێکخراوا دیاکونیا یا سویدی دەردکەڤت، هەتا نها (٢٢) هژمار ژێ دەرکەڤتینە.. ژبلی ڤێ کۆڤارێ دەزگەهێ (سپیرێز) پرۆژەیەك هەیە ژ بۆ ئەدەبیاتا زارۆیان ب ناڤێ (هزار پەرتووك بۆ زارۆیان)، ژڤی پرۆژەی هەتا نها هژمارەکا باشا پەرتووکێن زارۆیان دەرکەڤتینە، کو د پێکهاتیبوون ژ چیرۆکێن فلکلورێ کوردی، وەرگێران ژ زمانێن ئینگلیزی و سویدی و فارسی و عەرەبی و روسی کو پتر یا وان چیرۆکن بۆ زارۆیان و ئەڤ پرۆژە دگەل دەرکەفتنا کەپرێ د بەردەوامن، ئەڤە ژی ئێك ژ وان پێنگاڤانە یێن ب رەنگەك ژ هەژی خزمەتا پەرتووکخانا کوردی د وارێ ئەدەب و رۆژنامەڤانییا زارۆیاندا کری.

• **کۆڤارا زریموك:** کۆڤارەکا وەرزیە هژمار (١) ل بۆهارا سالا ٢٠٠٤ێ دەرکەفتییە، ژ (٢٨) بەرپەران ژ قەبارەیێ مەزن پێکهاتییە. لێ زریموك چیە؟ :

زریموك : ناڤێ چیچکەکێ یە ل پتریا دەڤەرێن بەهدینان دبێژنێ (زەروێلە) لێ ل دەڤەرا بارزان دبێژنێ (زریموك)، کو چیچکەکا جوانا رەنگینە، رەنگێن وێ پێك هاتینە ژ (زەر، سور، سپی، کەسك، رەش) پتر ل بۆهاران دیارە. هەر دیسان (زریموك) ناڤێ کەڤنە گوندەکییە کو ژ شوینوارێن کەڤنارێن زەرەدەشتییان بوو، د کەڤیتە رۆژئاڤایێ بازێرێ بلێ ل دەڤەرا بارزان، ئەڤ کۆڤارە ژ لایێ سەنتەرێ رەوشنبیری یێ بلێ دەردکەڤیت، تاکو نها (٥) هژمار ژێ دەرکەفتینە و یا بەردەوامە، سەرنڤیسەرێ ڤێ کۆڤارێ (محەمەد ئەمین موسا محەمەد)ە، زمانێ ڤێ کۆڤارێ پتر گرێدای دەڤەرا بارزانە، ئانکو ب زاراڤێ ناڤخویێ دەڤەرێ دهێتە نڤیسین، نە وەك کۆڤارێن سڤورە و کەپر و زەنگ و بەنگ ب زاراڤێ گشتیێ دەڤەرێ دهێنە نڤیسان، کو گونجایە دگەل یێ خواندنگەهان.

• **کۆڤارا پەلاتینك:** ئەڤ کۆڤارە پاشبەندێ کۆڤارا زاخۆ بوو، ب (٨) بەرپەران ل زاخۆ دەردکەڤت، یەکەم هژمار ل مەها (٥) سالا ٢٠٠٥ێ دەرکەڤت، سەرنڤێسەرێ ڤێ کۆڤارێ (بەحری رەشید)بوو. داوی هژمارا وێ هژمار (١٨) بوو کو ل چریا دووێ سالا ٢٠٠٦ێ ب (١٦) بەرپەران دەرکەڤتییە و ژێ ڤێ کۆڤارێ ژی بداوی هات.

• **کۆڤارا تلوڤە:** یەکەم کۆڤارا زارۆیانە ل دەڤەرا ئاکرێ دەردکەڤیت، ئەڤ کۆڤارە ژ لایێ بزاڤا رەوشەنبیری یا ئاکرێ دەردکەڤێت، تاکو نها (٢) هژمار ژێ ب (٣٢) بەرپەرێن رەنگین دەرچووینە، هژمارا (٢) ل شواتا سالا ٢٠٠٨ێ دەرچوویە و سەرنڤێسەرێ ڤێ کۆڤارێ (شەمال ئیسماعیل)ە .

• **کۆڤارا رووگەها زارۆکان:** کۆڤارەکا زارۆکان بوو ل گەل کۆڤارا رۆگەهـ یا زانکۆیا زاخۆ دهاتە بەلاڤکەکرن، ژمارە ئێك ل زڤستانا ٢٠١٢ کو ژمارە سێ داوی ژمارە بوو ل هاڤینا ٢٠١٢ بوو.

*** پەرتووكێن سەر ب زارۆیانڤە ژ سالا ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٥ێ ل دهوكێ دەركەفتین:**

رێكخراوا مافێن مەدەنی ل كوردستانێ: ب ناڤێ (سنێلا ئەڤینێ ژ بۆ زارۆیان) ئەڤ پەرتووكێن ل خوارێ دەرخستینە:

١- سندریلا - چیرۆك
٢- بەچكە شێرێن دارستانێ - چیرۆك
٣- هەركول و ئەژدەها - چیرۆك
٤- تەرەزان شاهێ دارستانێ - چیرۆك
٥- دانیك - چیرۆك
٦- دندك هنار - چیرۆك
٧- زەنگ و بەنگ - چیرۆك
٨- فاتفاتوك - چیرۆك
٩- زەرافە و فیل - چیرۆك
١٠- كەر و دیكلك - چیرۆك
١١- دریك - چیرۆك
١٢- ئە لیس ل وارەكێ سەیر - چیرۆك
١٣- كوترك و كورێ پیرێ - چیرۆك

ئەڤ هەمی پەرتووكە ب سەرپەرشتییا د. عارف حیتو هاتینە چاپكرن.

ژ وەشانێن بنگەهێ چارەسەریا دەروونی ب هاریكاریا رێكخراوا دیاكونیا سویدی كۆمەكا پەرتووكان دەركەڤتینە ل ژێر ناڤێ (چیرۆك ژ بۆ زارۆیان) ئەڤێن ل خوارێ دەركەڤتینە:

١- كەرێ ژیر
٢- دندكا سحری
٣- حوریا دەریایێ
٤- رویڤی و مریشكا سور
٥- بەریكانێ

و ئەڤ پرۆژە یێ تایبەتە ژ بۆ چاپكرنا پەرتووكێن زارۆیان و ئەڤەژی ل ژێر سەرپەرشتییا د. عارف حیتو بوو. پرۆژێ (هزار پەرتووك بۆ زارۆیان) یێ دەزگەهێ (سپیریز) یێ چاپ وەشانێ ژی ئەڤ پەرتووكێن ل خوارێ دەرخستینە:

١ -سەردەمی دەینەسوران
٢- كێتك و بنەمالا وێ
٣- سەگ و بنەمالاوێ
٤- مروڤێ بەری دیروكێ
٥- نامەیەكا ئاشتیێ
٦- سترانێن كولیلكان
٧- كێز خاتوین
٨- كەچا ژ هەیڤێ هاتی
٩- كەچا میرێ مشكان
١٠- هانسل وگرتل
١١- سەربازێ خوراگر
١٢- مێشا شر
١٣- شەڤ باش میرو
١٤- میرو حەز ژ شەرا ناكەت
١٥- بالندەیێن گوشتخۆر
١٦- هەر تشتەك دەربارەی بارانێ *

و ئەڤ پرۆژە ژی یێ بەردەوامە، لێ یا دیار ئەڤ هەمی پەرتووكە وەرگێران و یێن فلكلورینە لێ داهینانێن نڤیسەرێن دەڤەرێ یان یێن كورد بۆ زارۆیان زۆر دكێمن چ هەلبەست یان چ پەرتووكێن زانستێ دەروونی كو گرێدای زارۆیان، لێ مروڤ دشێت بێژیت كو د دیرۆكا كوردستانێدا تاكو نها ئەڤە باشترین و زێرینترین قۆناغە بۆ زارۆیان، چونكی ئەڤرۆ پەرتووكخانا كوردی یا پرە ژ كوڤار و رۆژنامە و پەرتووكێن گرێدای زارۆیان ئەم باوەرین ددەمەكێ نە دویر دا دێ مە بەرهەمێن خومالی یێن نڤیسەرێن كورد ژ بۆ زارۆیان ژی هەبن.

دیسان نڤیسەرێ گەنج (نیهاد سعدالله) (٨) پەرتووكێن چیرۆكان دەرخستینە، لێ ئەڤ چیرۆكە پتر وەك ئاموژگاری بۆ زارۆیان دا ئاراستەكرینە و ژ داهێنانا هۆنەرێ چیرۆكێ دبێ بەهرن.

هەر دیسان كوڤارا سڤورە پرۆژەیەك هەبوو بناڤێ ژ وەشانێن كوڤارا سڤورە ئەڤی پرۆژەیی نێزیك (١١) پەرتووكێن زارۆیان یێن هەمەرەنگ دەرخستینە ئەوژی ئەڤەنە:

١- مێرگا ب كولیك، سیناریو، جاهیدا بیری
٢- رۆژانێن هیڤیێ، سیناریو، و: نازدار
٣- ئیكی یووسان چیرۆك، و: مسعود خالد
٤- چیرۆكێن رویڤی یا چیرۆك، و: محمد ملاحمدی

٥- بشکوژێن پاشەرۆژێ، هەلبەست سلاح محمد ئەمین
٦- پیتەر و خشخشوك، چیرۆك، و: مسعود خالد
٧- فەرهەنگا رەنگین، مژویلی، ئەحمەد بیری
٨- گەوهەر ناسی، زانست، مسعود خالد
٩- ئەدیسون، زانست، شێروان ئەحمەد تەیب
١٠- گەلێ هەیڤا شین، چیرۆك، و: عارف حیتو
١١- گولفرۆش، چیرۆك، فەهیما ئیبراهیم
١٢- گەنجینا چیروکان، چیروك، فازل ئومەر
١٣- برەکا بالندان، چیروك، عزت یوسف
١٤- دەولەتا دارستانێ، رومان، تەحسین ناڤشکی
١٥- پانتەلونێ شەیتانی، چیروك، تەنگەزار مارینی
١٦- تەیمەزێ شەهرەزا، چیروك، حجی جەعفەر
١٧- باخچێ ئاوازان، هەلبەست، بلند محمەد
١٨- تورنا مایتێکەر، چیروك، ئەمین قادر
١٩- کێلەستوین، چیروك، خالد سالح
٢٠- بالندەو ژیانەکا سەیر، پێزانین، ئەحمەد بیری ئەنجام:

- هەبوونا رۆژنامە گەریا زارۆیان ب رەنگەکێ باش و بەرفرەهـ، هەبوونا جڤاکەکێ پێشکەفتی و پاشەرۆژەکا گەشە.
- ب دەرکەفتنا کۆڤارا سڤورە، واتە ل سالا ١٩٩٨ێ، ئەو سال دهێتە هژمارتن یەکەم قۆناغا راستەقینەیا رۆژنامەڤانییا زارۆیان ل دەڤەرا بەهدینان.
- قۆناغا زێرین یا رۆژنامەڤانییا زارۆیان، ژ سالا ٢٠٠٠ ل دەڤەرێ دەستپێدکەت.
- سالا ١٩٩٢ ێ تا ١٩٩٨ ێ ئێك رۆژنامە و کۆڤارێن زارۆیان ل دەڤەرا بادینا نەدەرکەفتینە.
- گرنگیدان ب رۆژنامەڤانییا زارۆیان، گرنگیدانە ب پاشەرۆژا مللەتی.
- داهێنان و پەرتووکێن بەرهەمێن خومالی ژ بۆ زارۆیان دکێمن.
- نەبۆ ونا نڤێسەران بۆ زارۆیان دنڤێسن ڤالاتیەکێ پەیدا دکەت.

## ژێدەر:


١. د. ضیاء الدین ابو الحب: الطفل هذا الکائن العجیب/ الموسوعة الصغیرة
٢. هادي نعمان ألهیتي: أدب الاطفال فلسفته، فنونه، وسائطه،.
٣. هادی نعمان الهیتي: صحافة الاطفال من العراق نشأتها وتطورها/.
٤. کاظم سعدالدین: کیف تکتب للاطفال، جون ئیکن، وەرگێران بو عەرەبی وەرگیران بو کوردی: کەمال غەمبار.
٥. مدحت عبدالرزاق: سایکولوجیة في مرحلة الروضة/ الموسوعة الصغیرة (٤٤).
٦. وریا جاف: کاروانی رۆژنامەگەریا کوردی
٧. (نوبهارا بچووکان)، ئەحمەدێ خانی، تویژاندن و پێداچون: حمدی عبدالمجید السلفی، ١٩٩٠.
٨. . د. هیمداری حوسێن: کۆڤاری گروگاری مندالانی کورد و سەرەتای رۆژنامەنوسی پەروەردەیی:
٩. حەمە سالح فەرهادی: چەند لایەنێکی رۆژنامە نوسی کوردی.
١٠. کۆڤارا سڤوره

* هژمارا ڤان پەرتووکان هەتا نڤیسینا ڤێ نڤیسنێ یە ل سالا ٢٠١٥ێ.

# رادیۆ ... ل دەڤەرا بەهدینان
# ١٩٩١ - ٢٠١٧

وەصفی حەسەن

رادیۆ Radio پەیڤەکا لاتینی و جیهانی یە، ب عەرەبی دبێژنێ (اذاعـة) و ب زمانێ کوردی دبێژنێ ئێزگە. رادیۆ چقەکە ژ سێ چقێن دونیا راگەهاندنێ کو دبێژنێ راگەهاندنا بیستراو، ل سەرانسەری وەلاتێن جیهانێ رادیو ب دو پێلان پەخشێ دوەشینین: پێلا موجە AM و پێلا موجە FM .

ئامێرێ رادیۆیێ بۆ جارا یەکێ ل سالا ١٨٩٦ ێ ژ لایێ ئەندازیارێ ئیتالی [جو جیلیمو مارکونی] ڤەهاتییە دروست کرن[١]. پشتی ئیتالیا ، رادیو هێدی هێدی ل وەلاتێن دی یێن ئەوروپی وسەرانسەری دونیایێ بەلاڤە بوو و کەفتە کاری . بۆ نموونە :

ل سالا ١٩٠٤ێ رادیو ل فەرەنسا کەفتەکاری و ل سالا ١٩٢١ێ، ژمارا ئێزگەیان ل سەرانسەری ئەوروپا و ئەمریکا بوونە ٢١ ئێزگە[٢]. ل سالا ١٩٢٦ ێ رادیۆیا مصرێ کەفتە کاری کو ب ئێکەمین رادیۆیا عەرەبی دهێنە هژمارتن و ل ١ /١٩٣٦/٧ێ ل عیراقێ رادیو کەفتە کاری[٣].

کەڤنترین و ناڤدارترین و بەربەلاڤترین رادیۆ ل سەرانسەری دونیایێ (رادیویا B.B.C) یا لەندنە، سالا ١٩٢٢ێ کەڤتییە کاری و هەتا رۆژا ئەڤرۆ یابەردەوامە و ل هەمی پایتەختێن وەلاتێن دونیایێ پەیامنێر هەنە[٤].

## پەیدابوونا رادیۆ یا کوردی ب رەنگەکێ گشتی

گەر سەحکەینە دیرۆکا پەیدابوونا رادیۆیا کوردی، دێ بینین یەکەمین رادیو یا کوردی ل سەرانسەری جیهانێ کەفتیە کاری، [رادیویا کوردی یە ل بەغدا] کو ل ١٩٣٩/١١/١٩ ێ ل بەغدا دەست ب پەخشێ خۆ کری(٥).

ب شێوەکێ گشتی کەڤنترین (دەهـ) رادیوییێن کوردی چ ل سەر ئاخا کوردستانێ یان ژی دەرڤەی ئاخا کوردستانێ

ئەڤێن خارێ نە:

١- رادیۆیا کوردی ل بەغدا ... ل ١٩ /١٩٣٩/١١ێ کەفتییە کاری[٦] ...و ل نیسانا ٢٠٠٣ پەخشا وێ راوەستا.

٢- پشکا کوردی ل رادیۆ لبنان - بەیرۆت، ل ٥ /١٩٤١/٣ێ کەفتییە کاری[٧].. ژ کارمەندێن وی د.کامیران بەدرخان و د.نورەدین زازا.

٣- پشکا کوردی ل (رادیۆ یافا) ل فەلەستین، ل شوباتا سالا ١٩٤٢ ی کەفتییە کاری[٨]... و ئیلونا سالا ١٩٤٥ راوەستا یە.

٤- پشكا كوردی رادیۆیا تەبرێز ل ئیرانێ ، ل بوهارا سالا ١٩٤٦ ێ كەفتیيە كار[٩]... و ل ئیلونا سالا ١٩٧٩ راوەستا يە.

٥ـ رادیۆیا كوردی ل یێریڤان ل ئەرمینیا، ل ١٩٥٥/١٢/١٥ ێ كەفتیيە كاری[١٠]... و تا نها ژی بەردەوامە.

٦- پشكا كوردی رادیۆیا قاهرە، ل ١ /١٩٥٧/٦ێ كەفتیيە كاری[١١]... و ل سالا ١٩٦٨ پەخشێ وێ راوەستایە.

٧- پشكا كوردی رادیۆیا تەهران .... ل مەها چریا یەكێ سالا ١٩٥٨ێ كەفتیيە كاری[١٢]... تا نها پەخشێ وێ بەردەوامە ب دو شێوەزاران (سورانی - بادینی) بەرنامەیان پێشكێش دكەن

٨ـ بەشێ كوردی ل رادیۆ یا پەیكی ئیران، هاڤینا سالا ١٩٦٢ێ ل براگ- چیكوسلوڤاكیا جاران كەفتیيە كاری[١٣]، و ل ئیلونا سالا ١٩٧٠ راوەستا.

٩ ـ ئێزگێ دەنگێ كوردستانا عێراقێ، ل ٢٠ /١٩٦٣/٨ێ ل سەرەدەمێ شۆرشا ئیلولێ ل چیایی كەفتیيە كاری[١٤].

١٠ - بەشێ كوردی ل رادیویا دەنگێ گەلێ عێراقێ ل بولگاریا، ل پاییزا سالا ١٩٦٣ێ كەفتیيە كاری[١٥]... و ل دیماهیا سال ١٩٦٥ پەخشێ وێ راوەستا

## رادیۆ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٩١-٢٠١٧

پشتی ڤەكولینەكا مەیدانی یا هویر، بۆ مە خویابوو ئێزگە یان رادیۆ ل دەڤەرا بەهدینان پشتی سەرهەلدانا ئادارا سالا ١٩٩١ێ یا پەیدابووی، و یەكەمین رادیو پەخشێ خۆ ل دەڤەرێ وەشاندی رادیویا قوتابی ولاوان بوو كو ل ١٥/ ١٠/ ١٩٩١ێ

ل ناحیا سەرسنكێ[١٦] پەخشێ خو راگەهاندی، رادیویا ناڤبری ب رەنج و داهێنان و حنێرا تەكنیكار فەرهاد مەلا حمدی كەفتیيە كاری.

پەخشا ڤێ رابویێ هەمی سەرسنك و قەدش و بامەرنێ و ئەو دەردۆر ڤەدگرت.

- دوەمین رادیۆ ل دەڤەرا بەهدینان كەفتیيە كاری (رادیۆ یا ئامێدیێ) بوو، كو ل ١٩٩١/١٠/١٥ێ ل ئامێدیێ كەفتیيە كاری، پشتی كو رادیۆیا قوتابی و لاوێن سەرسنكێ هاتییە ڤە گوهاستن بۆ ئامێدیێ،

جهێ ئاماژێ یە ل سالا ٢٠٠٥ ێ ناڤێ ڤێ رادیۆیێ هاتە گوهارتن بۆ (رادیۆیا سیلاڤ)، كو سەر ب ناڤەندا سیلاڤ

یا رەوشەنبیری و راگەهاندنێ ڤەیە و تا نها پەخشێ وێ بەردەوامە .

- ژ سالا ١٩٩١-١٩٩٦هێژایان شەعبان سلێمان وەك رێڤەبەر، ئەكرەم ئیبراهیم، هوشیار ئەحمەد، ئیبراهیم ئیدریس، زۆزان رەسول، و نەوزاد زاهر وەك بێژەر و نڤیسكار و محەمەد مەلا حەمدی و كامیران عەلی سالح وەك تەكنیكار د ڤێ رادیوێدا كار كرینە ... پاشان چەندین هەڤالێن دیتر لێ كار كریە تاكو گەهشتیە ڤوناغا رادیو سیلاڤ.

- سێیەمین رادیو ل دەڤەرا بەهدینان كەفتیيەكاری (رادیو قوتابی و لاوێن دهۆكێ) بوو ، كو ل ١٩٩١/١٠/١٨ێ ل دهۆك كەفتیيە كاری ، و ل هاڤینا سالا ١٩٩٢ێ پەخشا وێ راوەستیایە[١٧].

- چوارەمین رادیو ل دهۆك كەفتیيە كاری (رادیو دهۆك) دەنگێ (یەكێتی نیشتمانی كوردستان)[١٨].

ل ١٩٩١/١٠/٢٨ ێ ل دهۆك كەفتیيە كاری و بهارا سالا ١٩٩٤ێ پەخشێ وێ راوەستیایە.

- پێنجەمین رادیۆ ل دهۆك كەفتیيە كاری (رادیویا پارتا گەل) بوو، كو ل ئادارا سالا١٩٩٢ێ ل دهۆك كەڤتە كاری[١٩] و ل چریا یەكێ سالا ١٩٩٣ ێ پەخشێ وێ راوەستیا.

- شەشەمین رادیۆ ل دەڤەرێ كەفتیيە كاری، (رادیو دهۆك) بوو كو سەر ب نڤیسینگەها رەوشەنبیری و راگەهاندنا لقێ ئێكێ (پارتی دیموكراتی كوردستان) دەزگەهێ خانی یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ یێ نها ڤەیە، ل ١٤ /١٩٩٢/١٠ ێ كەفتیيە كاری و تا نهایا بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ[٢٠].

- حەفتەمین رادیۆ ل دەڤەرێ كەفتیيە كاری

(رادیویا ئاکرێ) بو سەر ب لقێ ٩ یێ پارتی دیموکراتی کوردستان ڤەیە، ل ١٩٩٢/١/٢٥ێ رادیویا ناڤبری ل بازارێ ئاكرێ كەفتییە كاری [٢١]... تا نها بەردەوامە.

- هەشتەمین رادیۆ ل دەڤەرێ (رادیۆ یەکگرتن) بوو، ل روژا ١٩٩٣/١٠/١٤ ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٢٢] و ل ١٩٩٣/١/٢٧ پەخشێ وێ راوەستایە.

- نەهەمین رادیـۆ (رادیۆیا زاخـۆ) یە سەر ب دەزگەهێ دەلال یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ ڤەیە، ل ١٩٩٣/١١/٢٩ ل بازارێ زاخۆ كەفتییە كاری [٢٣] و تا نها بەردەوامە

- دەهەمین رادیـۆ ل دەڤـەرێ (رادیویا دەنگێ یەككگرتو) ، سەر ب مەلبەندێ سێ یێ ئێككگرتووی ئیسلامی بوو ..

ل ١٩٩٤/٣/١٤ێ ل دهۆك كەفتیە كاری [٢٤] و تا نها بەردەوامە.

ئێدی هەبوونا رادیۆیا ل دەڤەرا بە هدینان بەربەلاڤ بو و گەلەك رادیوێن دی دەركەتن مینا:

- رادیو ئاشوور ل دهۆك، ل ١٩٩٤/٦/١ ێ ل دهۆك كەفتییە كاری و ل ئیلونا سالا ٢٠٠٤ ێ پەخشێ وێ راوەستا [٢٥].

- رادیۆ ئازادی یا حزبا شیوعیا كوردستانێ، ل ٢٠ ١٩٩٥/٦/ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٢٦].

- رادیۆ دەنگێ پەرتووكا پیرۆز، ل نیسانا سالا ١٩٩٦ێ ل دهۆك كەفتییە كاری و ل نیسانا سالا ٢٠٠٣ ێ پەخشا وێ راوەستا [٢٧].

- رادیۆ یا ئاشوور ل زاخۆ، ل ١ /١٩٩٨/٤ ێ كەفتییە كاری و ل نیسانا سالا ٢٠٠٣ێ پەخشێ وێ راوەستا یە، ڤێ رادیو یێ پشكا كوردی هەبوو [٢٨].

- رادیۆ شرارا ــ (راستی) دەنگێ پارتا نیشتیمانی ئاشوری، ١٩٩٩/٧/٤ێ ل دهۆك كەفتییە كاری و ل ٢٠٠٤/٣/١٥ێ پەخشا وێ راوەستا [٢٩].

- رادیۆ هیزل سەر ب دەزگایێ هیزل یێ رەوشەنبیری و جڤاكی ڤەیە، ل ٢٦ /٢٠٠٥/٥ێ ل زاخۆ كەفتییە كاری و تا نها ژی بەردەوامە [٣٠].

- رادیویا بەهدینان ... سەر ب یەكێتی نیشتیمانی كوردستان ڤەیە ... ل ٢٠٠٤/٣/٢٠ ل دهۆك كەفتیە كاری و تا نها بەردەوامە

- رادیۆیا مەتین ... سەر ب یەككگرتووی ئیسلامی ل ئامێدیێ ل ٢٠٠٥/١٠/١ كەفتییە كاری [٣١].

- رادیۆ ئاشتی سەر ب (ی.ن.ك) ، ل ١٨ /٢٠٠٤/١٢ ێ ل زاخۆ كەفتییە كاری [٣٢].

- رادیـو كەلا ئامێدیێ ، سەر ب (ی.ن.ك) ل ٢٠٠٥/٧/١ێ كەفتیە كاری [٣٣] و ل دەستپێكا سالا ٢٠١٧ پەخشی وێ راوەستا .

- رادیۆ خابیر ... سەر ب یەككگرتو ئیسلامی ڤە ، ل ١٩ /٢٠٠٥/٢ ێ ل زاخۆ كەفتییە كاری [٣٤].

- رادیـو پەیام ل ئاكرێ ... سەر ب یەككگرتو ئیسلامی ڤە ، ل ٢٠٠٦/٨/٣١ێ ل ئاكرێ كەفتییە كاری [٣٥].

- رادیۆ داسنیا، ل ٢٠١٠/١١/١١ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٣٦].

- رادیۆ دوبان، ل ٢٠١٠/٤/٤ێ .. ل بازێرێ سێمێل كەفتییە كاری [٣٧].

- رادیۆ زانكۆ، رادیویەكا تایبەتە ب بیاڤێن زانكۆیێ ڤە سەر ب سەرۆكاتیا زانكۆیا دهۆك ڤەیە، ل ٢٠١٠/٤/١٦ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٣٨].

- رادیۆ ڤین، ل ٢٠١٠/٦/١ێ ل دهۆك كەفتییە كاری و پتر گرنگیێ ددەتە بیاڤێ موزیك و ستranan [٣٩].

- رادیـۆ ژیـن،سـەر ب دەزگـەهـێ گوڤەند یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ ڤەیە، ل١ /٤/ ٢٠١٠ێ ل زاخۆ كەفتییە كاری [٤٠].

- رادیۆ دەنگێ كۆمەل ... سەر ب كۆمەلا ئیسلامی كوردستان ڤەیە ل ٢٠١٢/١/١ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٤١].

- رادیو بەردەرەش... سەر ب یەككگرتو ئیسلامی ڤە یە... ل ٢٠١٢/٩/٢٦ێ ل بەردەرەش كەفتیە كاری [٤٢].

- رادیۆ جەماوەر، ل ٢٦ /١١/ ٢٠١٢ ێ ل دهۆك كەفتییە كاری ، سەر ب حزبا سوسیالیست دیموكراتی كوردستان ڤەیە [٤٣].

- رادیـۆ وار، سەر ب دەزگەهێ (وار) ڤەیە ، ل ٢٠١٢/١٢/١٢ێ ل دهۆك كەفتییە كاری [٤٤].

- رادیویا ترافیك: ڤێ رادیویێ ل ٢٠١٣/٦/١ ێ ل

دهۆك دەست ب پەخشێ خۆ ل دهۆك كریيە.

- رادیۆ ستێر . ل سالا ٢٠١٥ ل زاخو كەفتیە كاری .

- رادیۆ دلستان . ل دەسپێكا سالا ٢٠١٧ ل دهۆك كەفتیە كاری .

- رادیۆ شەدا بو قورئانا پیروز ... ل سالا ٢٠١٥ دهۆك كەفتیە كاری

## پەراوێز

١. د . ماجی الحلوانی حسین و د . محمد مهنی ... مقدمة في الفنون الاذاعة والسمعبصرية، القاهرة ١٩٩٩، ص ١٥ .

٢. هەمان ژێدەر ، بپ ١٩ .

٣. هونەرمەند باكوری، ئێزگە ... هەولێر ٢٠٠٩ ، بپ ٣٣ .

٤. د. محى الحلواني حسين و د . محمد مهنى ... مقدمة في الفنون الاذاعة والسمع بصرية، القاهرة ١٩٩٩، ص ١٩ .

٥. هونەرمەند باكوری ، ئێزگە، بپ ٤١، و وەصفی حسن ردێنی - رادیو و تەلەڤزیونێن كوردی - دهوك ٢٠١١

٦. هەمان ژێدەرێ بەرێ بپ ٤١ ، و وەصفی حسن ردێنی - رادیو و تەلەڤزیونێن كوردی - دهوك ٢٠١١

٧. وەصفی حسن ردێنی، رادیو تەلەڤزیونێن كوردی (١٩٣٩-٢٠٠٣)، دهۆك سالا ٢٠١١، بپ ٢٥ .

٨ . هەمان ژێدەر ، بپ ٢٦ .

٩ . هەمان ژێدەر ، بپ ٣٦ .

١٠. هەمان ژێدەر ، بپ ٢٧ .

١١. وەصفی حسن ردێنی، نامیلكا (پشكا كوردی ل رادیویا قاهیره ١٩٥٧-١٩٦٨) دهۆك ٢٠١٢ .

١٢. وەصفی حسن ردێنی، رادیو تەلەڤزیونێن كوردی، بپ ٣١ .

١٣. هەمان ژێدەر ، بپ ٣٥

١٤. هەمان ژێدەر ، بپ ٥٨-٧١ ... و بنێرە نامیلكا - وەصفی حسن ردێنی، نامیلكا (خەباتا بێژەرێن دەڤەرا بەهدینان دناڤ ئێزگێن پارتێن كوردستانێ دا ل قوناغا شۆرشێ دا ١٩٦٣- ١٩٩١)

ژ وەشانێن رێڤەبەریا راگەهاندنێ ل پارێزگەها دهوك ، ٢٠١٢

١٥. وەصفی حسن ردێنی - رادیو و تەلەڤزیونێن كوردی - دهوك ٢٠١٣ ، بپ ٢٥

١٦. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٠٢ .

١٧. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ٩١

١٨. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٩٢

١٩. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٩٤

٢٠. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٠٨

٢١. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١١٠

٢٢. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٩٦

٢٣. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١١٣

٢٤. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١١٤

٢٥. دیدارەك د گەل خاتو (حەنان اویسا) رێڤەبەرا داردیویا ئاشوو ل دهۆك ل سالێن ٢٠٠٢- ٢٠٠٤ .

٢٦. وەصفی حسن ردێنی - هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١١٧

٢٧. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١١٨

٢٨. هەمان ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٩٩

٢٩. دیدارەك د گەل هێژا (هنری سەركیس) بەرپرسێ راگەهاندنا پارتا نیشتمانی ئاشووری ل دهۆك .

# تەلەفزیون ل دەڤەرا بەهدینان

وەصفی حەسەن

هەلبەت ژبلی ئەو رادیوێن ل سەری ئاماژە پێ هاتینە دان، هەروەسا تەلەفزیونان ژی رۆلەك كاریگەر د ژیانا رۆژانەیا خەلكێ كوردستانێ ل پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ ێ دا گێرایە و ل باشووری كوردستانێ، ب دەهان تەلەفزیونێن لۆكال و سەتەلایت هاتینە مەیدانێ، و پتریا وان سەر ب پارتێن سیاسی ڤەبووینە. دەڤەرا بەهدینان ژی وەكی پارچەك ژ ڤێ رەوشێ هژمارەكا تەلەفزیونێن لوكال و سەتەلایت لێ هاتینە دانان.

ئەڤە ژی ئەو تەلەفزیونێن (لۆكال) ناڤخۆیی نە، كو پەخشێ هندەكان راوەستیایە، و هندەكاژی تا ئەڤرۆ ژی پەخشا وانا بەردەوامە :

## TV زاخۆ:

ئەڤە دهێتە هەژمارتن یەكەمین تەلەفزیونا كوردی ل دەڤەرا بەهدینان، ل رێكەفتی ١٩٩١/٦/١٨ێ ژ لایێ ئێكەتی نیشتمانی كوردستان ل زاخۆ كەفتییە كاری، بەرنامێن خۆ ب هەرسێ زمانێن كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی پێشكێش دكرن، ل پاییزا سالا ١٩٩٢ ێ پەخشێ وێ راوەرستیا[١].

## TV گەلی كوردستان- دهۆك :

تەلەفزیونا گەلێ كوردستان – كەنالێ دهۆك. یەكەمین تەلەفزیونە ل باژێرێ دهۆك، ل ١٩٩١/١٠/٢٨ ێ ژ لایێ ئێكەتی نیشتمانی كوردستان ڤە كەتیە كاری، و ل بهارا سالا ١٩٩٤ێ پەخشێ وێ راوەستیا، ڤێ تەلەفزیونێ دو دەزگەهێن پەخشی ل ئامێدیێ و ئاكرێ هەبوون[٢].

## TV پارتا گەل - دهۆك :

سەر ب پارتی گەلی دیموكراتی كوردستان ڤەبوو ل دهۆك، ل شواتا سالا ١٩٩٢ێ دەست ب پەخشێ خۆ كرییە، بەرنامێن خۆ ب هەرسێ زمانێن كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی د وەشاندن، ڤی كەنالی تا مەها چریا ئێكێ سالا ١٩٩٣ێ دۆمكریە[٣].

## K.TV دهۆك :

ئەڤ تەلەفزیونە سەرب نڤیسینگەها رەوشەنبیری و راگەهاندنل لقێ ئێكێ پارتی دیموكراتی كوردستان ڤە بوو، نها سەر ب دەزگایێ خانی یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ یێ پارتی دیموكراتی كوردستان ڤەیە،

ل ١٩٩٢/٥/٣ێ ب ناڤێ (خەباتTV ) دەست ب پەخشێ خۆ كریە ، و ل ١٩٩٤/١٢/١ ێ ناڤێ وێ هاتییە گوهارتن بۆ تەلەفزیونا كوردستان، ل خزیرانا ٢٠٠٨ ێ جارەكادی ناڤێ وێ هاتییە گوهارتن و بوویە (تەلەفزیونا دهۆك) و تا نها ژی هەر ب ڤی ناڤی دهێنە وەشاندن. ئەڤ تەلەفزیونە دهێتە هەژمارتن ب تەمەنترین تەلەفزیون ل دەڤەرا بەهدینان و نها ژی پەخشێ وێ یا بەردەوامە ، و پەخشێ وێ د گەهیتە تەڤایا سنوورێ دەڤەرا دهۆك و نەینەوا و هەولێر و دیانا و دەردوران[٤].

## TV یەكگرتن - دهۆك :

پشتی سێ پارتێن كوردی بوینە ئێك و راگەهاندنێن وان هەڤگرتین، ئەو بو تەلەفزیونا یەكگرتن جهێ تەلەفزیونا پارتا گەل ل دهۆكێ گرت و ل ١٤/١٠/١٩٩٣ ێ پەخشێ خۆ ب هەرسێ زمانێن كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی وەشاند.

و ل ١٩٩٣/١١/٢٧ ێ ژ ئەگەرێ چوونا پارتی یەكگرتن بۆ ناڤ رێزێن پارتی دیموكراتی كوردستان دا، پەخشێ وێ راوەستیا[٥].

## TV مافی مرۆڤ :

ئەڤ تەلەفزیونە سەر ب كەرتێ تایبەت ڤەبوو، پەخشێ خۆ ل ١٩٩٦/١/١٩ ێ ل باژێرێ دهۆك ب هەسێ زمانێن كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دهاتە وەشاند، و پشتی سالەكێ پەخشێ وێ راوەستیا[٦].

## TV ئاكرێ :

ئەڤ تەلەفزیونە سەر ب پارتی دیموكراتی كوردستان ڤەبو، ل ١٩٩٣/٥/١ێ دەست ب پەخشێ خۆ ل ئاكرێ كریە، ل سالا ٢٠٠٤ پەخشێ وێ راوەستایە[٧].

## TV ئازادی - دهۆك :

ئەڤ تەلەفزیونە سەر ب پارتا كومونیستا كوردستان ێ ڤەبو، ل ١٩٩٧/١٠/٦ێ ل باژێرێ دهۆك دەست ب پەخشێ خو كریە ، ل پاییزا سالا٢٠٠٢ ێ راوەستایە[٨].

## TV یەكگرتوو - دهۆك:

ئەڤ كەنالە سەر ب مەلبەندێ ٣ یێ پارتا یەكگرتووی ئیسلامی كوردستانڤەیە، ل رێكەفتی ٢٠٠٤/١/١ ل دهۆك دەست ب پەخشێ كریە ، و تا نها یا بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ[٩].

## TV دەلال- زاخۆ:

ئەڤ كەنالە سەر ب دەزگەهێ دەلال یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ ڤەیە، ل ٢٠٠٦/٤/١٠ ل زاخو دەست ب پەخشێ خۆ كریە و تا نها یا بەردەوامە[١٠].

## TV چوارچرا – زاخۆ:

ئەڤ كەنالەكێ كەرتێ تایبەتە، سەر ب دەزگایێ گۆڤەند یێ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ ل زاخۆ ڤەیە[١١].

ل رێكەفتی ٢٠١٠/١/١٢ ل زاخو دەست ب پەخشێ خۆ كریە ، و تا نها پەخشێ وێ یێ بەردەوامە[١٢] .

## TV خابیر- زاخۆ:

ئەڤ كەنالە سەر ب پارتا یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان ڤەیە، ل رێكەفتی ٢٠١٠/٧/١ ل زاخو ێ دەست ب پەخشێ خۆ كریە و تا نها یا بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ[١٣].

## TV زاخۆ – زاخۆ:

ئەڤ كەنالە ژی سەر ب كەرتێ تایبەتە، ل باژێرێ زاخۆ ل ٢٠١٢/٣/١٣ ێ دەست ب پەخشێ خۆ كریە و یا بەردەوامە ل سەر پەخشی[١٤].

## TV داسنیا دهۆك:

دیسان سەر ب كەرتێ تایبەتە، ل رێكەفتی ٢٠١٢/٣/١٤ ێ دەست ب پەخشێ خۆ ل باژێرێ دهۆك كریە و یا بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ[١٥]... و ل سالا ٢٠١٦ ناڤێ وێ هاتیە گوهارتن بو (فاملی TV ) ، گرنگیێ ددەتە بیاڤێ خێزانی و جڤاكی.

## - دوبان TV،

ل سالا ٢٠١٤ باژێرێ سێمێل كەفتی یە كاری ، پتر گرنگیێ ددەتە هۆنەر و ستران و موزیك و وەرزشێ.

- داسنیا سپورت TV:

ل سالا ٢٠١٦ ل دهۆك و زاخو كەفتی یە كاری.[١٦]

## - داسنیا میوزیك TV:

ل سالا ٢٠١٦ ل دهۆك كەفتیە كاری .[١٧]

## - حەدادTV:

ل سالا ٢٠١٦ ل شێلادزێ كەفتیە كاری. [١٨]

## - ئامەد TV:

ل سالا ٢٠١٧ ل دهۆك كەفتیە كاری.[١٩]

ژبلی وان چەند تەلەفزیونێن لوكال.. هەروەسا هژمارەكا سەتەلایتان ل دهۆك كەفتیە كاری..كو ئەوژی:

## سەتەلایت ڤین TV - دهۆك :

ئەڤ كەنالە سەر ب كەرتێ تایبەتە، ل ٢٠٠٧/٧/١٥ێ ل دهۆكێ دەست ب پەخشێ خۆ كریە

و یا بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ، پتر گرنگیێ ددەتە بیاڤێ ستران و موزیك و كلیپان[٢٠].

## سەتەلایت بەهدینان سات - دهۆك:

ئەڤ كەنالە سەر ب مەكتەبا راگەهاندنا ئێكەتی نشتیمانی كوردستان ڤەیە، ل ٢٠١٢/٢/١ ێ ل دهۆك دەست ب كارێ خۆ كریە ، و تا نها بەردەوامە ل سەر پەخشێ خۆ[٢١].

## - سەتەلایتا وار:

ئەڤ كەنالە ل ٢٠١٤/٣/٢١ ێ ل دهۆك دەست ب كارێ خۆ كریە و سەر ب كەرتێ تایبەت ڤەیە .

**سەتەلایت هەلهەلوك:**[٢٢] ل ٢٠١٦/٣/١٨ ل دهۆك كەفتیە كاری و یا تایبەتە ب جیهانا زاروكان ڤە.

## پەراوێز

١. بو زێدەتر ... بنێرە - وەصفی حسن - رادیۆ و تەلەفزیونێن كوردی١٩٣٩-٢٠٠٣.
٢. هەمان ژێدەر بپ ٩١.
٣. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٣.
٤. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٤.
٥. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٦.
٦. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٨ .
٧. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١١.
٨. هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢١.
٩. زانیارییێن من یێن كەسی.
١٠. زانیارییێن من یێن كەسی.
١١. زانیارییێن من یێن كەسی.
١٢. زانیارییێن من یێن كەسی.
١٣. زانیارییێن من یێن كەسی.
١٤. زانیارییێن من یێن كەسی.
١٥. زانیارییێن من یێن كەسی.
و سەبارەت برگێن (١٦-١٧-١٨-١٩-٢٠-٢١-٢٢) زانیارییێن من یێن كەسی.

ژێدەر /
- رادیۆ و تەلەفزیونێن كوردی ١٩٣٩- ٢٠٠٣- وصفی حسن ردینی/ ٢٠١١ .
ژ وەشانێن رێڤەبەریا راگەهاندنێ ل پارێزگەها دهۆك.
- پێزانینێن من وەك راگەهاندكار كو ئەڤە پتر (٢٩) سالە ئەز دبیاڤێ راگەهاندنێ دا كاردكەم.
- هەكار عەبدولكەریم فندی ـ دلیل المؤسسات الاعلامیة في محافظة دهوك ـ ٢٠١٣،
ژ وەشانێن رێڤەبەریا راگەهاندنێ ل پارێزگەها دهۆك.

# پەروەردە و فێرکرنا ئایینی ل پارێزگەها دهۆکێ

پ.هـ. د. نوری عەبدەلرەحمان ئیبراهیم
پ.هـ.د. محەمەد زەکی مەلا حسێن بەرواری
وەرگێران: موسەدەق توفی

## پێشەکی

ئەگەر پێداچوونەکێ ب دیرۆکا پەروەردە و فێرکرنێ بکەین، دێ گەهینە وێ ئەنجامی ڤێ دیرۆکێ ل پەرستگەهان دەسپێکرییە، پشتی پەیدابوونا ئیسلامێ ژی، هەر ل پەرستگەهێن مووسلمانان ئانکو مزگەفتێن وان یەکەمین وانە (دەرس) هاتینە گۆتن و یەکەمین زارۆك فێری تیپێن ئەلیفبێتکان بوویە. بەری هەر تشتەکی پێویستە بزانین بەرنامێن خواندنێ (یێن نە ئەکادیمی) ئەوێن ل مزگەفتێن کوردستانێ دهاتنە خواندن د چوارچووڤەکێ گشتیدا ئەو بوون ئەوێن د قورئانا پیرۆز دا هاتینە دانان دەمێ تێدا هاتی: [لَقَدْ مَنَّ اللهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ](ال عمران:١٦٤)، قورئان و فەرموودەیێن پێغەمبەری (س) و زانستێن دی یێن هاریکار بەرنامێن خواندنێ یێن ڤان خواندنگەهـ و بازنە یێن زانستی (الحلقات العلمية) یێن کوردستانێ بوون. ژ وێ رۆژێڤە کو کوردان باوەری ب ئیسلامێ ئینای و ڤی ئایینی جهێ خۆ د هزر و بیرا واندا کری، کوردان کەسایەتییا خۆ ل سەر بنەمایێن ئیسلامێ ئاڤاکرییە و حەز ژ زانست و زانینێ کرییە ئەو ژی ل دووڤ فەرمانا خودێ دەمێ فەرمان ب هەر مووسلمانەکی کری بخوینە (إقرأ).

بۆ ڤێ مەرەمێ و ژ دەسپێکا ڤێ دیرۆکێڤە کوردان خواندییە دا ب سەر راستییا خودێ ناسینێ هەلبن و پێگیر بن ب بەرنامەیێ قورئانێ، لەوما ل هەر جهەکێ ڤی وەلاتی بگەری و گوندەکی ببینی، چەندێ بچویك بیت، مزگەفتەك لێ هەیە، ئەو مزگەفتە ژی خواندنگەهـ بوویە و مەلایێ وێ سەیدا و وانەبێژ بوویە و زارۆك و مەزنێن وان فێری قورئانێ و بنەمایێن ئایینێ مووسلمانەتیێ دکرن، ژ ڤان خواندنگەهان هندەك ناڤدارتر دبوون و بازنەیێن زانستی تێڤە دهاتنەگرێدان، دەهان قوتابی و هندەکان ژی ب سەدان قوتابی هەمبێزدکرن، ڤێ ئارەزوویا کوردان بۆ خواندنێ وەل خواندنگەهێن مزگەفتێن کوردستانێ کربوو د وارێ زانست و تێکەهشتنا زانستاندا ملێ خۆ ل ملێ

زانکۆیێن ئیسلامیێن قاهیرە و مەغرب و ئەندلوسێ بدەن. ئەو زانستێن ل خواندنگەهێن مزگەفتێن کوردستانێ (کو دشیاندایە ب خواندنگەهێن ئەهلی ناڤبکەین) زانستێن رێزمان و بنەمایێن زمانێ عەرەبی و فیقە و بنەمایێن وی و فەرموودەیێن پێغەمبەری (س) زانستێن فەرموودەیان و تەفسیر و زانستێن تەفسیرێ و لوجیك و باوەری و زانستێن (الهیئة) و ماتماتیك و دیرۆکا ئیسلامی و ژیاننامەیا پێغەمبەری و زانستێن دیتر بوون (علوم الله و الفقة و أصولة و الحدیث و علومة و التفسیر و علومة و العقائد و المنطق و علم الهیئه و الریاضیات و التاریخ الإسلامی و السیره وغیرها).

زێدەباری خواندنگەهێن مزگەفتان کوردان خواندنگەهێن گەرۆك ئانکو خواندنگەهێن کۆچەراتیێ هەبوون و دگەل کۆچەران دەشت و زۆزان دکرن، سەیدا و قوتابییان ل دووڤ وەرزێ چەروانی کوین و پێدڤیێن خۆیێن خواندنێ باردکرن و دگەل مللەتێ خۆ بەرەڤ دەشتێ یان زۆزانێ دچوون و ل وێرێ بەردەوامی ب خواندنا خۆ ددا.

کوردان گرنگییەکا مەزن ب ئاڤاکرنا مزگەفتان و خواندنگەهێن مزگەفتان دایە، هەر جهەکێ گوندەك لێ هەی، دەشت بیت یان چیا چەندێ ئاسێ و دوورە دەست بیت مزگەفتەك لێ ئاڤاکرییە و ئەو مزگەفتە خواندنگەهـ ژی بوویە، سەرەرای ئەو کاودانێن سەخت و دژوارێن دوژمنان ب سەرێ کوردان ئینایێ، کوردان خۆ ژ زانستێن ئایینێ ئیسلامێ دوورنەکرییە و دگەل پاراستنا مللەتینییا خۆ باوەرا خۆیا ئایینی ژی پاراستییە.

بەری دەست ب ڤەکۆلینا خۆ بکەین هەژییە سوپاسییا هەرکەسەکی و بەری هەموویان ژی هێژا (شڤان عەلی ئادەم- تۆڤی) بکەین یێن بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ ڤەکۆلینێ هاریکاریا مە کری و خودێ خێرا هەموویان بنڤیسیت.

# پشکا ئێکێ

## بەرنامێن خواندنێ ل خواندنگەهێن مزگەفتان و بازنەیێن خواندنێ و خولێن زانستی

### خواندنگەها مزگەفتێ

دگەل پەیدابوونا مووسلمانەتیێ فێرکرن و خواندنا ئیسلامی ژی دەسپێکرییە، هێژ سەردەمێ پێغەمبەرێ (س) مووسلمانان هندەك ژ هەڤالێن وی (صەحابییان) ل مزگەفتا (قباء) خەلکەك فێری مووسلمانەتیێ دکر، ب ڤێ چەندێ ل یەکەمین چەرخێ مووسلمانەتیێ مزگەفت وەك خواندنگەهـ هاتییە بکارئینان، مزگەفتا (قباء) یەکەمین مزگەفتە د ئیسلامێدا هاتییە ئاڤاکرن و پشتی وێ مزگەفتا پێغەمبەری هاتییەئاڤاکرن[1]، مزگەفتا پێغەمبەری ل مەدینەیێ یەکەمین مەلبەندێ زانستییە د ئیسلامێدا ل بازێری هاتبیتە دامەزراندن، دیرۆکا مزگەفتا پێغەمبەری (س) ئالییەکێ هەرە مەزنێ دیرۆکا مووسلمانەتییێ بەرچاڤدکەت، پشتی وێ گەلەك مزگەفتێن خواندنگەهـ و مزگەفتێن مەزنتر ل سەردەمێ عەباسییان ناڤدار بووینە و بووینە رووگەها زانا و قوتابییان، ژ ڤان مزگەفتێن خواندنگەهـ (جامع المنصور) ل بەغدا، مزگەفتێن خواندنگەهـ ل کوفە و بەسرا، ل شامێ (الجامع الاموی) و ل میسری (جامع عمر بن العاص، جامع ابن طولون و جامع الازهر) ئەڤ مزگەفتە خواندنگەهە نە تنێ مژوولی خواندنێن ئایینی بوون بەلکی خواندنێن زانستێن وی چەرخی وەك گەردوونناسی و ماتماتیك و نوشداری ژی ب خۆڤە دگرتن[2].

رێبازا دەرسگۆتنێ ل ڤان خواندنگەهان ژی، قوتابیێن دەسپێکی د بەلاڤەبوون ل سەر قوتابیێن ژ خۆ کەڤنتر کو دگۆتنێ (المستعد) و ئەڤە وەك سەیدایێن وان بوون، د پرانییا جاراندا هەر موستەعیدەکی پتر ژ قوتابییەکی هەبوون، د دەمێ فێرکرنێدا دەست ب خواندنا برگەیەکێ بۆ وان دکر و شرۆڤە و رۆهندکر بۆ وان و نموونە بۆ بەرچاڤدکرن، پاشتر قوتابی د ما ب تنێ و دەرسا خۆ دخواند و ژ بەردکر. د پرانییا جاراندا ژ ڤان قوتابیێن دەسپێکی دهاتەخواستن وان دەق (المتون) و دەستەواژە (العبارات)ان ژ بەربکەن و سەیدایان ژی بەردەوام

دووڤچوونا وان دکر و رۆژانە ئەزموون ب وان دکرن بەری کو دەست ب دەرسەکا نوو بکەن، ب ڤی رەنگی دەمێ قوتابی ژ خواندنا پەرتووکەکا دیارکری تەواو دبوو ئەو پەرتووك ژ بەر دکر.

موستەعیدان هەرئێکی دەمەکێ دیارکری ل جەم سەیدایێ خۆ هەبوو، تنێ ئەو ئامادەدبوو، ژ موستەعیدی دهاتەخواستن بابەتی بخوینیت، پاشتر سەیدای (مەلای) شرۆڤەدکر، دبیت هندەك موستەعیدێن دیتر وەك گوهدار ئامادەببانە لێ مافێ پرسیارێ و دانوستاندنێ نەبوو، ئەڤە تنێ مافێ موستەعیدێ دیارکری بوو، وی ب هەموو رەنگان ئازادییا پرسیار و دانوستاندنێ ل سەر دەرسێ هەبوو و دەمێ دەرسێ ژی یێ دیارکری نەبوو و هندەك جاران دو دەمژمێران و پتر ڤەدکێشا، بیێ کو کاریگەریێ بکەتە سەر موستەعیدێن دیتر یێن ئێك دووڤ ئێکی دهاتنە دەرسێ، هەژییە بێژین موستەعیدی بەری دەمێ دیارکری دەرسا خۆ باش دخواند دا یێ بەرهەڤ بیت بۆ هەر پرسیار و دانوستاندنەکێ دەمێ ئامادەبوونا سەیدای[٣].

## قۆناغێن خواندنێ ل خواندنگەهێن مزگەفتان

ژ دەسپێکا هاتنا وەحیێ بۆ پێغەمبەری (س) و پەیدابوونا ئیسلامێ، ئیسلامێ سازیێن فێرکرنێ ب خۆڤە دیتینەن، مالا (ئەرقەم کورێ ئەرقەمی) یەکەمین سازیا فێرکرنێ بوویە د ئیسلامێدا، ئەڤ مالە خواندنگەها ئیسلامێ و یەکەمین سەیدایێ وێ ژی پێغەمبەرێ (س) خودێ بوویە، خواندنگەهێ د وارێ خودێ نیاسی و تەقوا و پەروەردە و بەلاڤکرنا بنەمایێن ئایینێ ئیسلامێ دا سەرکەتنا هەرە مەزن دەستڤەئینایە، هەتا نها ئەو سەرکەتن یا بەردەوامە و خودێ شاهدەیی ل سەر ڤێ سەرکەتنێ دایە، هەروەك د قورئانا پیروزدا فەرمووی:[ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ] (آل عمران: ١١٠).

هەژییە بەری دەست ب مژارا خۆیا سەرەکی کو خواندنا ئایینی یە ل دەڤەرا بەهدینان بکەین ب کورتی ئاماژە ب قۆناغێن خواندنی بکەین کو ل سەر قۆناغێن ژێری دابەشدبوو:

### ١- (الكتاب أو الكتاتيب):

ل هندەك دەڤەرێن کوردستانێ ب حوجرە دهاتنەناڤکرن و پەیڤا قوتابی یا د کوردی دا دهێتەبکارئینان هەر ژ پەیڤا (الكُتَّابي) هاتییەوەرگرتن، ئەڤ جهێن خواندنێ ژ سەردەمێ پێغەمبەری ڤە ل جیهانا ئیسلامی بەلاڤبوونە، جهێ سەرەکی بوون کو زارۆك تێدا فێری خواندنا قورئانا پیروز و بنەمایێن ئیسلامێ دکرن. هندەك فەرموودەیان ئاماژەپێکرییە کو د سەردەمێ پێغەمبەری (س) و خەلیفەیێن وی دا حوجرەیێن رێك و پێك بۆ فێرکرنا زارۆکێن مووسلمانان هەبوون و هندەکان فێرکرن کربوو پیشەیێ خۆ و ڤی پیشەی بنەما و بەرنامەیێ خۆ هەبوو، کەسێن خودان شیان و تایبەتمەند د رێکێن فێرکرنێ و پەروەردەکرنا رەوشتان و گرنگیدان ب مەزنکرنا زارۆکێن مووسلماناندا ب ڤی ئەرکی رادبوون[٤].

دگەل بەلاڤبوونا ئیسلامێ ئەڤ حوجرەیە ل هەر جهەکی بەلاڤبوون یێن ئیسلام گەهشتیێ، ل بەسرا و کوفە و فیستات (الفسطاط) و قیروان و باژێرێن دی بەلاڤەبوون هەتا سەدسالیا سێ و چوارێ مشەختی گەهشتینە قۆناغێن هەربلندێن بەلاڤەبوونی[٥].

هندی پەیوەندی ب کوردستانێ ڤە هەی، زارۆکێ کورد ل ژێێ شەش سالیێ هەروەك نها ل قۆناغا سەرەتایی دچوو بەر خواندنێ، ل بەراهیێ فێری ناڤێ تیپان و ب لێڤکرنا وان دبوو، پاشتر ب کۆمکرنا هەر بیست و هەشت تیپێن عەرەبی د چەند پەیڤەکاندا (أبجد، هوز، حطي، كلمن سعفص، قرشت، ثخذ، ضظ) ژ بەردکرن و بەرەڤ قۆناغا فێربوونا قورئانا پیروز دچوو، پێدڤی بوو ل سەر وی قورئانێ یان جزیکەکێ ئەو ژی جزیکا عەما (جزء عم) بوو دگەل

دەپ و هندەك كاغەزێ هەكە هەبووایە و قەلەمێن لەڤەنی دگەل خۆ ئینابانە و ب وان قەلەمان ل سەر دەپێ خۆ یان كاغەزان دنڤیسی[٦]. فێركرنێ ب سورەتا (الناس) دەسپێدكر ئەو ژی ب رێكا هیجا بوو كو كوردان دگۆتی (الحاجیاتی) و هەر پەیڤەك تیپ تیپ دخواند و مەرەم ژ ڤێ قۆناغێ كو ژ سێ سالان نە دبۆری خواندنا دروستا قورئانێ بوو و نڤیسین و خوشنڤیسی ژی رێك بوون بۆ ڤێ مەرەمێ، سەیدای ئایەتەك یان پەیڤەك دخواند و چەند جاركی زارۆكی دگەلدا ڤەدگێرا، جارنا ژی قوتابی ب تنێ دخواند و سەیدای بۆ راستڤەدكر تایبەت پەیڤێن گران و د كوردەواریدا دگۆتنە ڤێ رێكێ رەوانكرن[٧].

## ٢- قۆناغا سوختە ییێ[٨]:

قوتابیێ ڤێ قۆناغێ ئـەوە یێ گەهشتیە قۆناغەكا نە خراب، ب یا بەری خواندنا پەرتووكا مەلا جامی دهێتەناڤكرن[٩]، قۆناغەكا خواندنا مزگەفتانە قوتابی ب حەفت هەشت سالان ب داوی دئینیت، د ڤێ قۆناغێدا دەست ب خواندنەكا كوور و هوور د رێزمان و صەرفێ دا دكەت و پەرتووكێن وەك (عوامل الجرجاني و سعدالله الصغیر و شرح المغني) دخوینیت[١٠]، ئەڤ پەرتووكە مینا كلیلكا تێگەهشتنا زانستێن شەرعینە كو بنیاتن د زمانێ عەرەبیدا، ژ ئالیێ موستەعیدێن ژ وان كەڤنتر ب قوتابییان دهێنە خواندن، ئەڤ قۆناغە دەمەكێ درێژ و جار ژی دەمەكی كورت ڤەدكێشیت، دكەڤیتە سەر زیرەكییا قوتابی و ئاستێ تێگەهشتنا وی.

## ٣- قۆناغا موتەعەلیق (المتعلق) یان فەقی[١١]:

دەمێ ڤێ قۆناغێ یێ دیاركری نینە، گرێدایی ئاستێ بەرهەڤییا قوتابی و ئارەزوویا وی یە بۆ وەرگرتنا زانیارییان و بەرفرەهكرنا زانیارێن خۆ، زیرەكییا وی رۆلێ خۆدگێریت د پێشڤەچوون و پاشڤەمانا وی دا، هەروەسان ئارەزوویا وی د بەردەوامیدانێ بۆ وەرگرتنا زانستان رەگەزێ هەرە سەركییێ سەركەتنا وی یە[١٢].

## ٤- قۆناغا موستەعیدیێ (المستعد):

دەمێ خواندنێ د ڤێ قۆناغێدا پێنج سالن، و پەرتووكێن وەك: (الألفیة بشرح السیوطي، و شرح الشافیة[سید عبدالله - الصرف]مع عصام على الإستعارة، و المطول، و المختصر على تلخیص المعاني، شرح الشمسیة، و جمع الجوامع، و شرح العقائد النسفیة، و التهذیب للتفتازاني و شرحه، و الهیئة[الربع المجیب تشریح الأفلاك]) دخوینیت، كو زانستێن (النحو و الصرف و الاستعارة و أصول الفقه و العقائد، و التفسیر) ب خۆڤە دگرن. د ڤێ قۆناغێدا قوتابی بەرهەڤ دبیت بۆ وەرگرتنا باوەرناما مەلایەتیێ كو بۆ دەمێ نێزیكی ٢٠ سالان خواندیە و ژ ڤی جهی بۆ جهێ دی و ل جەم ڤی سەیدای (مەلای) بۆ جەم سەیدایێ دیتر چوویە و ل جەم هەرئێكی زانستەك یان پتر خواندیە، هەتا ل جەم دوا سەیدایێ خۆ باوەرناما مەلایەتییێ وەردگریت و بەرهەڤ دبیت ب كارێ سەیداییێ رابیت[١٣]. هەژییە د داویێ ڤێ پشكێدا ئاماژە ب وان بەرنامێن خواندنێ بكەین یێن ل مزگەفتێن سنووری دەڤەرا بەهدینان (پارێزگەها دهۆكێ یا نها) دهاتنە خواندن بكەین، ئەو ژی ئەڤێن ژێری بوون:[النحو، الصرف، علم البلاغة و الوضع، علم المنطق و الحكمة، اصول الفقه، علم الكلام، الفقه، علم الهندسة و الحساب و الفلك، التفسیر، الحدیث]. چ پێنەڤێت بێژیت بۆ هەر زانستەك ژ ڤانا پێدڤی بوو قوتابی چەندین پەرتووك ب دروستی خواندبانە و باش تێگەهشتبا و گەلەك ژێ ژبەركربا كو ل ڤێرێ دەلیڤا ناڤئینانا هەمووان پەرتووكان نینە، زێدەباری ڤانا قوتابی چەند زانستێن دیتر وەك[علم العروض و الطب و أشعار العرب و علم التاریخ] دخواندن[١٤].

## كورتییەكا دیرۆكی

كورتییەك دیرۆكی دەربارەی بزاڤا زانستی ل مزگەفتێن كوردستانێ و پەسنێن وان خواندنگەهێن ئایینی ل كوردستانێ رۆلەكێ گرنگ د ئالیێن جودایێن ژیانێدا گێرایە، ڤان خواندنگەهان گۆرانكارییەك

گرنگ د هزرا جڤاكێ كوردیدا ئەنجامدایە، ژ قۆناغا نەزانی و پاشڤەمانێ ب پەروەردەیەكا دەروونـی و هزریا پاقژ پەروەردەكرییە و گەهاندییە ئاستەكی هـەژی هەلگرتنا پەیاما ئیسلامێ بیت و ڤێ پەروەردەیێ مرۆڤێ كورد گەهاندییە ئاستەكی چەند زانا و هزرڤان و شاعر و نڤیسكار ژ كوردستانێ رابن و پەرتووكان د وارێن زانستێن ئایینی و ئەدەبی و دیرۆكی و نوشداری و یێن دیدا ل پاش خۆ بهێلن و كورد بیانی مفای ژ بەرهەمێن وان وەرگرن.

ب كورتی ئەم دكارێن رۆلێ وان خواندنگەهـان د وارێن ژێریدا بەرچاڤ بكەین:

۱. **وارێ خودێ پەرستیێ**
۲. **وارێ فێركرنێ**
۳. **وارێ ئابووری**
٤. **وارێ دادوەریێ**
٥. **وارێ جڤاكی**

## پەسنێن خواندنگەهێن ئایینی ل كوردستانێ:

۱- خواندن بێ بەرامبەرە و بۆ هەموو كەسان هەیە ل ڤان خواندنگەهـان بخوینن، خەلك مەزاختیێ ڤان خواندنگەهـان ب خۆڤە دگریت زێدەباری مولكێن وەقفكری بۆ مزگەفت و خواندنگەهـان.

۲- قوتابیێ ئازادە سەیدایێ خۆ و ئەو جهێ دڤێت لێ بخوینیت بۆ خۆ هەلبژێریت و ژ ڤێ خواندنگەهێ بچیتە خواندنگەهـا دیتر ل هەر جهەكێ هەبیت هەتا ل خواندنگەهـەكێ خۆجهـ دبیت.

۳- چاوان قوتابیێ ئـازادە ل هەلبژارتنا سەیدا و خواندنگەهـا خۆ هەر ب ڤی رەنگی ژی یێ ئازادە د هەلبژارتنا هەر پەرتووكەكا د وێ قۆناغا خواندنێدا وی دڤێت بخوینیت، ژبلی رێنمایی و پێشنیازان سەیدای مایێ خۆ د هەلبژارتنا وی دا نەدكر، ئەڤە ژی ئەنجامێ وێ چەندێ بوو كو خواندن نە گرێدایی ئەزموونان بوو و مەرەم ژ خواندنێ نە دەستڤەئینانا كارەكی بوو بەلكی سەخمەرات زانستێ بوو.

٤- بەردەوامییا خواندنێ د هەموو دەم و وەرزاندا ژبلی مەها رەمەزانێ و هەردو جەژنان و رۆژێن ئەینی و شەمبی.

٥- رەخنەیا ل ڤان خواندنگەهـان دهێتەگرتن كێمیا گرنگیدانا وان بوو ب تەفسیرێ و فەرموودەیان، یا تنێ دهاتەخواندن (تفسیر البیضاوي) بوو هندەك سورەت ژێ دخواندن، فەرموودەیێن پێغەمبەری هەكەر هاتبانە خواندن تنێ چەند دەرگەهەك ژ (صحیح البخاری) بۆ پیروزیێ دخواندن، دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ئەو بیت دەمێ قوتابی تێرا خۆ ژ زانستێن (عەقلی و نەقلی) وەردگریت دێ فێربوون و شارەزابوونا وی د هەردو زانستێن ئاماژە پێكریدا ب ساناهی كەڤیت[١٥].

مزگەفتە خواندنگەهێن ئەهلی ل كوردستانێ رۆلەك مەزن د پاراستنا كەلتوورێ ئیسلامی و بەلاڤكرنا رەوشەنبیریێ ل ڤی وەلاتی گێرایە، ل كوردستانێ گەلەك مالباتێن زانستیێن كەڤن هەبوون ژ بابوباپیرنڤە ناڤدار بوون خزمەتا ئایینی و رەوشەنبیریێدا، وان رێزگرتنەك تایبەت د ناڤ خەلكیدا هەبوو، ئەڤە نیشانا جهێ زانست و زانایەنە ل جەم خەلكێ كوردستانێ[١٦]. لەوما ل كوردستانێ گوندەكی نابینی مزگەفتەك لێ نەبیت، ئەو مزگەفتە ژی مزگەفت و خواندنگەهـا بوویە و خەلكێ گوندی مەزاختیێ مزگەفتێ و خواندنگەهێ و مەلایی ب خۆڤە دگرت، هندیكە بازێربوون ل هەر تاخەكی مزگەفتەك مەزن یان بچووك هەبوو و ب رەخ وێ ڤە خواندنگەهـەك هەبوو و قوتابییان لێ دخواند و جهێ ڤەمان و ژیارا وان بوو، مەزاختی و پێدڤیێن وان ژی وەك گوندان خەما خەلكێ ب خۆ بوو. ل ڤان خواندنگەهـان چ گوند بن یان بازێر زانستێن (نحو و صرف و بلاغة و منطق و علم كلام و فلسفة و فقه و اصول فقه و آداب بحث و مناظرة و تفسیر و حدیث و علم فلك و ریاضیات) دهاتنە خواندن[١٧]. هەتا نها ژی ئەڤ كریارا پەروەردەیی ب رەنگەكی و یێ دن بەردەوامە لێ نە ل دووڤ ئاستێ جاران ئەو ژی

ژ بەر چەند ئەگەرەکان.

ژنها بەرەف پاش دێ ب ناڤ کاکلکا مژارا خۆدا چین ئەو ژی بابەتێ خواندنگەهێن ئایینی نە ل پارێزگەها دهۆکی کو هەموو جۆرێن وان خواندنگەهان هەر ژ حوجرەیان هەتا خواندنگەهێن ناڤ مزگەفتان هەتا خواندنگەهێن مەزنتر یێن دەرڤەی مزگەفتان وەك خواندنگەها قوبا یا ئامێدیێ ب خۆڤە دگریت. بەلێ بەری ب ناڤ ڤێ مژارێدا بچین پێدڤییە ئەگەر ب کورتی ژی بیت ئاماژە ب رەنگەکێ دی یێ جهێن خواندنێ بکەینە ئەو ژی تەکیانە.

د ژێدەرێن ئیسلامی و عەرەبیدا ئاماژە ب چوار ئیدیۆمان (الخانقاه والرباط والزاوية والتكية) هاتییەکرن کو هەر چوار پەیڤێن وەك یەکن ب یەك رامان دهێنەبکارئینان بۆ وان جهان دهێنەگۆتن یێن بۆ مەرەمێن جودایێن گرێدای کاروبارێن ئایینی و فێرکرنی و دوور ژ سیاسەتێ و سیاسەتمەداران دهێنە بکارئینان، لێ ژ ڤان پەیڤان یێن بەربەلاڤ ل جەم مە خانەقا و تەکیانە.

هندیکە خانەقایە (الخانقاه - khanqah) بۆ وی جهێ دهێتەگۆتن یێ نڤێژکەر و خێرخواز و صوفی لێ نیشتەجێ دبن، ل دەوروبەرێ چوارسەدساڵییا مشەختی د ئیسلامێدا پەیدابوونە بۆ وان کەسێن صوفی هاتییەتەرخانکرن یێن ب مەرەما خودێ پەرستیێ خۆ ل وی جهی ڤەدەر کرین[18]. ئاڤاهییەکە ژ چەند پشکەکان پێکهاتییە وەك مزگەفتەکا د ئاڤاهیێ خۆدا سەربەخۆ، نە منارە هەیە نە ژی مینبەر نڤێژا ئەینیێ لێ ناهێتەکرن، جارنا چەند ژوورەك یان هۆلەك و ژوورەك تایبەت بۆ مەرقەدێن هندەك شێخ و میران دگەلدا هەنە، هەروەسان خواندنگەهە دناڤدا هەیە زانستێن ئایینی ل سەر هەر چوار مەزهەبان لێ دهێنە خواندن[19]. هەروەسان ئەو جهێ صوفییێن رۆمی لێ دژیان ب (الزاوية) ئانکو کوژی هاتییەناڤکرن کو خۆ ڤەدەردکر و بەرێن خۆ تەنگدکرن و خۆ ب چەند مەرجەکانڤە پێگیردکر[20]، هەروەسان وەك گەرۆك ئیبنولجوبەیر د گەشتا خۆیا سەدساڵییا شەشێ مشەختی (دوازدێ زایینی) ئاماژە پێکری ل وەلاتێ شامێ ب (الرباطات) دهاتەگۆتن خانەقا و جهێ صوفییان بوو... بەلێ ل عیراقێ (الرباط) پتر ژ خانەقا جهێ خۆ کریوو[21]. د سەردەمێ دەولەتا ئوسمانیدا پەیڤا خانەقا (الخانقاه)ب پەیڤا تەکیا (التكيه) هاتییە گۆهارتن[22]، هەروەسان کارێ وێ یێ سەرەکی یێ بۆ هاتییەدامەزراندن هاتییەگۆهارتن بوویە جهەك بۆ خەلکەکێ ب دەروێش هاتینەناڤکرن و هندەك بیدعە دگەلدا هاتینە کو بەری هنگی نە د بەربەلاڤبوون[23].

هندیکە کوردستانە یا ڤەدەر بوویە ژ ڤان هەرچوار جهێن ئاماژەپێکری، لێ یێن بەربەلاڤتر خانەقا و تەکیە بوون و ل سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکی تنێ تەکیا بوون، پەیدابوونا خانەقا و تەکیان بوونە ئەگەرێ گەشبوونا بلەزا صوفیاتییێ ل کوردستانێ، ئەگەرێ بەربەلاڤبوونا بلەزا ڤان خانەقا و تەکیا ئەو بوو کو یا ب زەحمەت بوو خەلکەك بچیتە خواندنگەهێن حکۆمەتێ چ یێن زانستی بن چ یێن ئایینی بن کو د پرانییا دەماندا زمانێ وانێ خواندنێ عەرەبی بوو، هەرچەندە هندەك رێبازێن صوفی ب کێمی ل کوردستانێ هەبوون، لێ ئەو چالاکییە نەبوون ئەوا هەردو رێبازێن قادری ئەوا ڤەدگەریتەڤە بۆ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی (١٠٧٧- ١١٦٦) و رێبازا نەقشەبەندی ئەوا ل سەر دەستێ مەولانا خالدێ نەقشەبەندی (ل ١٨٢٦ز مرییە) هاتییەدامەزراندن.

هندی پەیوەندی ب ڤەکۆلینا مە ڤە هەی ئەو تەکیانە یێن ل دەڤەرا بەهدینان هاتینەدامەزراندن و ب ئەرکێ پەروەردە و فێرکرنێ ل دەڤەرێ رابووین. پەیدابوونا صوفیاتییێ ل بەهدینان بۆ سەدساڵییا چوارێ مشەختی دزڤریتەڤە و (دبیت یەکەم کەسێ ل ڤێ دەڤەرێ رێبازا صوفیاتییێ گرتییە بەر (أبو الحسن مولانا شيخ الإسلام علي بن أحمد بن يوسف الهكاري) یێ ل دەڤەرێ ب شێخولئیسلام ناڤدار ل سەد ساڵییا چوارێ مشەختی رێبازا خۆ نڤیسییەڤە و کوژیێ (زاوية) خۆ ل گوندێ دیرەشێ - دەڤەرا ئامێدیێ خەلکەکێ زۆر ژ جهێن جودا جوداڤە رێبازا وی گرتییە بەر)[24].

ل دەڤەرا بەهدینان هژمارەکا زۆرا تەکییان هەبوون، هندەکا رۆلەکێ مەزن و دەستەلاتەکێ بەرفرەهـ هەبوویە، هندەك ژی نە ل وی ئاستێ بوون بمینن و زوو ژ ناڤچووینە و ب کێمی د بەرپەرێن دیرۆکێدا ئاماژە پێ هاتییە کرن، هندەك ژی هێژ د بەردەوامن لێ ئەو چالاکی و دەستەلاتێ جاران نەمایە. ژ تەکیێن بەهدینان:

**١. تەکیا دێرەشێ:** یەکەمین تەکیایە ل ڤێ دەڤەرێ هاتییەدامەزراندن، ل سەر دەستێ شێخولئیسلام ئەبو ئەلحەسەن عەلی کورێ ئەحمەد کورێ یوسفێ هەکاری (٤٠٩- ٤٨٦مش) ل سەد سالییا پێنجێ مشەختی هاتییەدامەزراندن. کەسەکێ خێرخوازێ خودێ پەرست بوو، پشتی ل دەڤەرێن جودا جودا گەریای و زانستێن عەقلی و نەقلی وەرگرتین، زڤرییەڤە وەلاتێ خۆ و بنەجهـ بوویە و خەلکەکی بەرێ خۆ دایە وی و باوەرییەکا باش پێ ئینایە و خەلیفە و قوتابیێن وی ل رۆژهەلات و رۆژئاڤا وەك کوردستانێ و ئەفغانستانێ و هندستانێ بەلاڤبوونە، هەژییە بێژین شیخولئیسلام سەیدایێ سەیدایێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی بوو[٢٥].

**٢. تەکیا شەنبەکی:** ژ ئالییێ شێخ محەمەد کورێ (طلحة)یێ شەنبەکی ل گوندێ شەنبەکێ باشوورێ کوردستانێ هاتییە دامەزراندن[٢٦].

**٣. تەکیا لالشێ:** ل سەر دەستێ شێخ ئادی کورێ موسافر کورێ ئیسماعیلی (٤٦٧- ٥٥٧مش) یێ ل وەلاتێ هەکاری ژیای هاتییە دامەزراندن، شێخ ئادی ب مەرەما فێربوون و خواندنێ ل گەلەك واران گەریایە و دگەل گەلەك شێخ و زانایان ژیایە، شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی هند رێز لێ گرتییە د پەسنا وی دا گۆتییە (لو كانت النبوة تنال بالمجاهدة لنالها عدي بن مسافر) ئانکو ئەگەر پێغەمبەرایەتی ب موجاهیدێ بوایە دا شێخ ئادی کورێ موسافری دەستڤەئینیت، پشتی ژیەکێ درێژێ گەریانێ ل دووڤ فێربوونێ ل لالشێ ئاکنجی بوویە و ل وێرێ دەست ب بەلاڤکرنا باوەرییا خۆ کرییە و خەلکەکی زۆر دووڤ وی کەتییە، ل سالا ٥٧٧مش وەغەرا داویێ کرییە و هەر ل وێرێ هاتییەڤەشارتن[٢٧].

**٤. تەکیا ئاکرێ:** دامەزرێنەرێ ڤێ تەکیایێ شێخ عەبدولعەزیزێ کورێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی (٥٣٢ - ٦٠٢مش)یە، مالباتا سەید تەهایێ نەهری خۆ بۆ شێخ عەبدولعەزیزی د زڤرینن‌ەڤە[٢٨].

**٥. تەکیا پیرێ حەلان:** دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێری و مەزارێ وی دکەڤیتە گوندێ (کانی مازێ)[٢٩].

**٦. تەکیا شێخ (ابو الوفاء النرجسي):** ئەڤ ئەبولوەفایە خەلیفێ شێخ محەمەدێ شەنبەکی بوو کوژیێ وی ل ئاکرێ بوو و خەلکەك سەرەدانا مەزارێ وی دکەن[٣٠].

**٧. تەکیا شێخ (علی ابن الهیتی):** ئەڤ شێخ عەلی یە هەڤچەرخێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی و خودان کەرامات بوو، ل سالا ٥٦٤ مش مرییە ئەڤ تەکیە دکەڤیتە ناڤبەرا زاخۆ و پێشیابورێ[٣١].

**٨. تەکیا (الشیخ حسن الجوسقی):** دکەڤیتە گوندێ جوسق ل باکوورێ چیایێ بێخێری، شێخ حەسەن د سەردەمێ خۆدا یەك ژ ناڤدارترین شێخ و زانا و سەیدایان بوو[٣٢].

**٩. تەکیا (الشیخ بقا بن بطو):** ئەڤ تەکیایە ل دەڤەرا زاخۆ بوو، شێخ بەقا د سەردەمێ خۆدا یەك ژ شێخێن ناڤدار بوو، ل سالا ٥٥٢ مش د ژیێ ٨٠ سالیدا وەغەرا داویێ کرییە[٣٣].

**١٠. تەکیا شێخ جانگیرێ بەهدینی:** ئەڤ تەکیایە ل دەوروبەرێن بازێرێ ئامێدیێ هاتییەدامەزراندن، شێخ جانگیر یەك ژ شێخێن زانا بوو ل سالا ٥٥٠ مش وەغەرا داویێ کرییە[٣٤].

**١١. تەکیا شێخ عەلیێ بەریانکی:** شێخێ ناڤبری ئەڤ تەکیایە ل گوندێ بەریانکێ یێ نها سەر ب ناحیا سەرسنکێ ڤە دامەزراندییە و ئەو ب خۆ خەلکێ ڤی گوندی بوو[٣٥].

**١٢. تەکیا سەید ئەحمەدێ بابلۆ:** سەید ئەحمەدی ئەڤ تەکیایە ل گوندێ بابلۆیێ مووسلمانان دامەزراندبوو، ئەڤ گوندە نێزیکی ناحیا زاویتەیە و پشتی شەرێ جیهانیێ یەکەم ئینگلیزی مەسیحی ل ڤی گوندی ئاکنجیکرینە[٣٦].

١٣. **تەكیا ئامێدیێ**: مەلك خەلیلی ئەڤ تەكیایە ل سالێن سیهان ژ سەدسالییا هەشتێ مشەختی دامەزراندییە، میرێ بەهدینان سولتان سیدی خان نوژەنكرییەڤە و ب ناڤێ وی هاتییەناڤكرن، شێخ تاهرێ كورێ مەلا صافی كو یەكەمین كەس بوو ل ئامێدیێ ل سەردەمێ میر موسا پاشای رێبازا نەقشەبەندی ژ مەولانا خالدی وەرگرتی شێخایەتییا ڤێ تەكیایێ كرییە، میر موسا پاشای ئەڤ تەكیایە بۆ شێخ عەبدولوەهابی كو یەك ژ خەلیفەیێن مەولانا خالدی بوو دامەزراندبوو، دەمێ شێخ عەبدولوەهاب هاتییە راسپاردن بۆ بەلاڤكرنا رێبازێ بچیتە خەربوتێ ل شوونا وی شێخ تاهر ب ئەركێ شێخایەتییا تەكیایێ هاتەراسپاردن، شێخ تاهری قەدر و رێزگرتنەكا مەزن ل جەم خەلكی پەیداكربوو و گەلەك ژ كوردان باوەری پێ ئینابوو، خێرخوازیا وی ل ئاستەكی بوو نموونێن وەك وێ نەبی[٣٧].

١٤. **تەكیا زێوكا یا قادری**: دامەزرێنەرێ ڤێ تەكیایێ شێخ پیر مەحموودێ زێوكی یە ل داوییا سەدسالییا دەهێ مشەختی هەروەكی د (المخطوطة الزیوكیة) دا هاتی، ب قادری هاتییەناڤكرن ژ بەركو سەر ب رێبازا قادری بوو[٣٨].

١٥. **تەكیا بریفكا یا قادری**: بنیاتدانەرێ ڤێ تەكیایێ شێخ (شەمسەدین قوتب)ە، ئەو كورێ سەید عەبدولكەریم كورێ سەید موسا یە، یەك ژ نەڤیێن سەید حسێنێ خەلاتی یە ئەوێ سالا (٨٠٨مش) ل میسرێ مری، شێخ شەمسەدین سالا (٨٩٧ مش) ل بازێركێ خەلاتێ یێ سەر ب بدلیسێ ڤە هاتییە سەر دنیایێ، هاتنوچوون دناڤبەرا هەكاری و بەهدیناندا دكر هەتا ل گوندێ بریفكا بنەجهبووی و تەكیا بریفكا دامەزراندی، ب خێرخوازیێ ناڤداربوو، ناڤداریا وی ل تەبایی دەڤەرێ بەلاڤەبوو، خەلكەكی رێكا وی گرتەبەر، بەراهیێ رێبازا وان خەلوەتی بوو، ل سەردەمێ شێخ نورەدینێ بریفكی رێبازا قادری ژی دا دگەلدا و پێ هاتنەنیاسین، شێخ نورەدین بۆ دەمێ نێزیكی چل سالان یێ بەردەوام بوو ل سەر بەلاڤكرنا رێبازێ ژ بریفكا ڤە هەتا ل سالا (١٢٦٨مش) وەغەرا داویێ كری و هەر ل بریفكا هاتییەڤەشارتن[٣٩].

١٦. **تەكیا گەلیێ رمانێ**: ل سەردەستێ شێخ ئەحمەدێ گەلی رمانی ل گوندێ گەلیێ رمانێ نێزیكی بریفكا هاتییەدامەزراندن، شێخ ئەحمەد نەڤیێ شێخ شەمسەدین قوتبی بوو، سالا (١١٥٠مش) وەغەرا داویێ كرییە، كەسەكێ خێرخوازێ هەلگرێ چاكیێ و تەقوایێ و خودێ پەرستیێ بوو، ل سەر رێكا پێشینێن خۆ ل دەڤەرێ و دەورو بەرێن وێ رێباز بەلاڤەكرییە[٤٠].

١٧. **تەكیا بجیلێ**: بجیل ناحیەكا سەر ب قەزا ئاكرێ ڤەیە، شێخ محەمەدێ كورێ شێخ ئەحمەدێ كەبیر بنیاتدانەرێ وێ بوو و شێخایەتییا وێ ژی دكر[٤١].

١٨. **تەكیا دهۆكێ**: بنیاتدانەرێ وێ شێخ محەمەد كورێ شێخ عەبدوللایێ برایێ شێخ نورەدینی بوو، شێخ و زانایەكی ناڤدار بوو، مژوولی بەلاڤكرنا رێبازێ و دەرسگۆتنێ بوو، ل (١٣٠٥مش/١٨٨٧ز) وەغەرا داویێ كرییە كورێ برایێ وی وی جهێ وی گرتییە، ل دهۆكێ هاتییەڤەشارتن[٤٢].

١٩. **تەكیا ئەتریشێ**: شێخ محەمەد عەلی كورێ شێخ عەبدولحەمیدێ ئەتریشی كو زانا و خودێ پەرستەكێ راستەقینە و زاهد و ژ خودێ ترس بوو، ئەڤ تەكیایە دامەزراندییە و هەر وی ب خۆ ژی شێخایەتی لێ كرییە، خەلكی ژ جهێ و وارێن جوداڤە قەستا ڤێ تەكیایێ كرییە و گوهداریا شیرەت و رێنماییێن وی كرییە، ل (١٣١٨مش/١٩٠٠ز) ل گوندێ سلێڤانا رۆژهەلاتێ كوردستانێ پارێزگەها ئورمیێ وەغەرا داویێ كرییە[٤٣].

٢٠. **تەكیا مەمانێ**: دامەزرێنەرێ وێ شێخ عەبدولقەهار كورێ شێخ عەبدولجەباری كورێ شێخ عەبدولقەهاری كورێ شێخ عەبدوللایێ برایێ شێخ نورەدینی یە، ل سالا (١٣٣٦مش/١٩١٧ز) وەغەرا داویێ كرییە، كورێ وی یێ مەزن شێخ محەمەدی شوونا وی گرتییە ئەو ژی ل سالا ١٩٨٣ وەغەرا داویێ كرییە، گەلەك ژ مورید و داخوازكەرێن رێبازێ ژ عەشیرەتا دۆسكی و سلێڤانەیی و سندی و گولی و گۆیان

سەرەدانا ڤێ تەكیایێ دكرن[٤٤].

**٢١. تەكیا رۆڤیا،** شێخ جونەید كورێ شێخ عەبدولعەزیزی ژ نەڤیێن شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی ئەڤ تەكیایە دامەزراندییە و هەر وی ب خۆ ژی ل سەر رێبازا قادری شێخایەتی لێ كرییە[٤٥].

**٢٢. تەكیا بامەرنێ،** ل نیڤا ئێكێ ژ سەدسالییا نوزدێ شێخ تاهر كورێ مەلا صافی یێ رێكانی ئەڤ تەكیایە ل سەر رێبازا نەقشەبەندی دامەزراندییە، شێخ تاهری رێبازا نەقشەبەندی ل ئامێدیێ ژ مەولانا خالدی (١١٩٣- ١٢٤٢مش) وەرگرتییە، پاشتر ڤەگوهاستییە بامەرنێ و ل وێرێ تەكیا ئاڤاكرییە كو ل تەبایی دەڤەرا بەهدینان یا ناڤدار بوو و مورید شێخێن وی لێ هەبوون، پشتی وی ژی كور و نەڤیێن وی شێخایەتی لێ كرییە و ڤێ تەكیایێ چەندین گوند وەك وەقف هەبوون، پشتی شێخ تاهری كورێ وی شێخ محەمەدی (١٨١٢- ١٨٩٠ز) و پشتی وی ژی شێخ بەهائەدینی (١٨٥٤- ١٩٥٢ز) شێخایەتی لێ كرییە[٤٦].

**٢٣. تەكیا بازێ،** ئەڤ تەكیایە ل گوندێ بازێ یێ دەڤەرا بەرۆژی یێ سەر ب دەڤەرا بارزانڤە ژ ئالیێ مەلا بەكر كورێ مەلا عوسمان كورێ مەلا تاهرێ بابێ شێخ عەبدوللایێ بارزانی یێ ناڤدار ب (تاجەدین) هاتییەدامەزراندن[٤٧].

**٢٤. تەكیا بارزان،** تەكیا ب ناڤێ بارزان گوندێ مەلبەندێ شێخایەتیێ هاتییەناڤكرن، شێخێن وێ ژ مالباتا میرێن ئامێدیێ نە، نێزیكی دو سەدسالییانە ڤێ مالباتێ لێڤەگەرا شێخایەتیێ و دەستەلاتێ سیاسی گرتییە دەســـت[٤٨]. باپیرێ ڤێ مالباتا شێخ عەبدوللایێ بارزانی یێ ب (تاجەدین) بەرنیاس كورێ مەلا بەكرێ كورێ مەلا عوسمانێ كورێ مەلا تاهری ل سالا ١٨٢٥ ل گوندێ بارزان بنەجهبوویە، دەمێ شێخ تەهایێ نەهری خەلیفێ مەولانا خالدێ نەقشەبەندی د گوندێ بارزان را بەرەف نەهری چووی شێخ عەبدوللایێ بارزانی رێبازا نەقشەبەندی ژێ وەرگرتییە، هەر ل سەردەمێ وی مرید و خەلیفەیێن وی ل دەڤەرێ بەلاڤبووینە و ب دروستی دەستەلاتێ دەڤەرێ گرتییەدەست و خەلكێ زۆر ل دورێن وی كۆمبووینە و رێباز ژێ وەرگرتییە، ب كەسەكێ زانا و خودان قەنجیێ و باشیێ هاتییەنیاسین، خودێ پەرستەكێ شارەزابوو د گەلەك زانستاندا، پشتی وی شێخ عەبدولسەلامێ ئێكێ جهێ وی گرتییە و ئەو ژی كێمتر نەبوویە ژ بابێ ب زانایی و خێرخوازیێ[٤٩].

**٢٥. تەكیا مایێ،** د پەرتووكا (مدرسە قبهان فی العمادیە) ئاماژە پێ هاتییەكرن كو (مزگەفت و تەكیا بوو ل دەڤەرا بەرواری ژووری، ئەو ب خۆ خواندنگەهەكا ئایینیا كەڤن بوو، زانا و سەیدایێن باش ژێ دەرچووینە و شێخێن نەقشەبەندی ژێ لێ پەیدابووینە...)[٥٠].

## خواندنگەهێن ئایینی ل پارێزگەها دهۆكێ

خواندنگەهێن ئایینی ل دەڤەرا بەهدینان (سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ یا نها) رۆلەكێ مەزن و بەرچاڤ د بەلاڤكرنا زانست و رەوشەنبیری و باوەریا ئیسلامیدا گێرایە، زێدەباری ڤێ چەندێ ب درێژیا دیرۆكا ئیسلامێ وەك كولیجەكا تایبەتمەند د زانستێن ئیسلامیدا رۆلێ خۆ گێرایە. هەژییە بێتەگۆتن خەلكی ب خۆ ئەڤ خواندنگەهە ئاڤاكرینە و خەرجیێ ئاڤاكرنا وان ب خۆڤە گرتییە و چ دناڤ مزگەفتێدا ئاڤاكرین و چ ژی ل دەرڤەی مزگەفتێ و دابنە دگەل مزگەفتێ، هەروەسان هەر وی خەلكی پاشتر خەرجیێ مزگەفتێ ب خواندنگەهەڤە ب خۆڤە گرتییە و ئەوێن پێشنڤێژی و ئیمامی و دەرسگۆتن ل ڤان خواندنگەهان دكر خۆدی باوەرنامێن زانستیێن وی سەردەمی بوون، بێی بەرامبەر ل مزگەفتێ دەرس دگۆتن، ئەگەر چ ژێدەرێن ژیانێ ژی نەبانە پشكەك ژ دەمێ خۆ بۆ كاركرنێ ل بیستانەكی یان چەمەكی تەرخواندكر و تێرا ژیارا خۆ داهات دابیندكر، ڤان سەیدایان رۆلەك گرنگ د هشیاركرن و رەوشەنبیركرنا خەلكیدا

دگێرا. د هەمان دەمدا دڤێت رۆلێ میرێن بەهدینان د ئاڤاكرن و دامەزراندنا مزگەفت و خواندنگەهان و هاندان و هاریكاریا زانا و زانستان و سەیدایاندا ژبیر نەكەین، ژ ئەنجامێ رۆلێ وان ئامێدیێ ببوو مەلبەندەكێ زانستی و رووگەها قوتابییان هەر كەسەكێ ل زانست و رەوشەنبیرێ دگەرها، لەوما ژی ل ئامێدیێ كۆمەكا خواندنگەهان لێ هەببوو، ب هەمان شێوە ل گوندێن مەزن و بچووك ژی مزگەفت و خواندنگەه لێ هەبوون هەروەك هاتییە گۆتن(تە گوندەكێ پێكهاتی ژ پێنج مالان نە ددیت مزگەفت و خواندنگەهەك لێ نەبیت)[*]. هەژییە ل ڤێرێ بێژین خواندنگەها هەر مزگەفتەكێ چەند قوتابییەك (فەقییەك) لێ هەبوون، هژمارا قوتابییان ژی گرێدایی مەزناتی و بچووكاتی و سەربەرێ ئابووریێ گوندی بوو، ژ بەركو خەلكێ گوندی ئەو قوتابی ب خواندكرن و خوارن و ڤەخوارن و خزمەتا قوتابییان ل سەر گوندییان بوو. ژ ئەنجامێ ڤی گرنگیدانا خەلكی كوردستانێ ب خواندنی و خواندنگەهان دێ بینین ب دەهان و پتر ژ گوندێن كوردستانێ ب ناڤێ وان زانایان ئەوێن ژ وی گوندی یان باژێری رابووین هاتینە نیاسین و ناڤێ گوندی بۆ خۆ كرییە پاشناڤ (لەقەب)، ئەڤە ژی ب ئاشكرا د دەهان ژێدەرێن عەربی و زمانێن دیتردا دیاردبیت یێن ل سەر زانست و زانایان ئاخفتین وەك(البرزنجي والعمادي والمجلي ... والقزلجي والبريفكاني والكازاوي والعمادي والبينجويني والنودهي والختي والروذبياني والمزوري والريتكي والقره داغي والزيباري والروستي)و یێن دی. ئەڤ زانایە ژ گوندەكی بۆ باژێرەكی یان گوندەكی و ژ باژێرەكی بۆ یێ دی دچوون سەخمەرەت ب دەستڤەئینانا زانستان و هەر قوتابییەكی ڤیابا بگەهیتە باوەرناما مەلایەتیێ ئانكو زانایییێ پێدڤی بوو ل سەر وی شارەزا بیت د ڤان ١٢ زانستاندا (١- النحو، ٢- الصرف، ٣- البيان، ٤- البديع، ٥- المعاني، ٦- الاداب، ٧- المنطق، ٨ - الكلام ( العقائد )، ٩- الهيئة، ١٠- أصول الفقة ، ١١- التفسير، ١٢- الحديث الشريف.) زێدەباری هندەك زانستێن دی هەبیت هەتا باوەرناما خۆ ل سەر دەستێ سەیدایەكی وەدگرت.

ژ دەسپێكا سەدساليیا بیستێڤە و ژ ئەنجامێ ئەو سەروبەرێن دژوارێن ب سەر كوردستانێدا هاتین و دابەشكرنا وێ ل سەر چوار دەولەتان د هەمان دەمدا ڤەكرنا خواندنگەهێن هەڤچەرخ هێدی هێدی خواندنگەهێن ئایینی ل كوردستانێ ل كێمییێ دا هەتا گەهشتییە ئاستەكی ئەم دكارین بێژین ب دەگمەن خواندنگەهێن ئایینی ل كوردستانێ مانە و ئەڤ سەروبەرە ل دەڤەرا بەهدینان ژی ب هەمان رەنگە، نها ب كورتی دێ ئاماژە خواندنگەهێن مزگەفتان یان خواندنگەهێن ئایینی كەین یێن ل دەڤەرا بەهدینان رۆلێ خۆ گێرای:

**١. خواندنگەها سیدی خان (خواندنگەها نوو- المدرسه الجدیده) ل ئامێدیێ،** ئەڤ خواندنگەهە دكەفتە دوورترین جهێ ئالیێ باكوورێ ئامێدیێ، ب خواندنگەها زاهدیێ (المدرسة الزاهدية) دهاتەناسكرن، ژ بەركو گوایە میرزادەیەكێ ب ناڤێ زاهیدا (الاميرة زاهدة - سالا ٧٩٢مش/ ١٣٢٨ز مریە) ئەو خواندنگەهە دامەزراندییە و عمبارەكا پەرتووكان بۆ تەرخانكرییە، هەر ئەڤ خواندنگەهە ب خواندنگەها نوو (الجديدة) ژی دهێتەناڤكرن ژ بەركو ل سەردەمێ ئیسماعیل پاشایێ ئێكێ ب بەران و گێچێ هاتییە نووژەنكرن، ل سەردەمێ میر سیدی خان ژی سالا (١٠٢٤مش/ ١٦١٥ز) هاتییە نووژەنكرن لەوما ب ناڤێ وی هاتییەناڤكرن، دسەردەمەكێ سەدساليیا نوزدێدا مەلا یەحیایێ مزووری یەك ژ سەیدایێن ناڤدارێن ڤێ خواندنگەهێ بوو لەوما ژ وی سەردەمیڤە ب خواندنگەها مەلا یەحیایێ مزووری هاتییەناڤكرن. هەتا سالا ١٩٢٠ێ پەرتووكخانا ڤێ خواندنگەهێ نێزیكی هزار پەرتووك ب خۆڤە دگرتن بەلێ د ڤێ سالێدا ب دەستێن (فەلێن تیاری) یێن چەتێن ئینگلیزی هاتەسۆتن، تنێ (٣٥) پەرتووك ژێ مان، ئەو ژی مالباتا مەلا یەحیای برن ژ بەركو مولكێ وی بوون نە وەقفا خواندنگەهێ. ب سەدان ژ قوتابییان ژ جهێن جوداڤە ب مەرما وەرگرتنا باوەرنامێ ژ دەستێن مەلا یەحیایێ مزرووی (سالا

١٢٥٠مش مریبە) قەستا ڤێ خواندنگەهێ دكرن، ئەڤ خواندنگەهە هەتا سالێن چلان ژ سەدسالیا چوویی یا بەردەوام بوو، بەلێ قوتابیێن وی ل كێمیێ دا هەتا ل داویێ گەهشتینە تنێ هەشت قوتابیان كو د سەدسالیێن پێشتر گەلەك پترتر بوون، ئەڤە ژی ئەنجامێ وێ چەندێ بوو كو ل سالا (١٨٩٨) خواندنگەها فەرمی ل ئامێدیێ هاتەڤەكرن و پشكەك ژ قوتابیێن خواندنگەها نوو (مەلا یەحیای) چوونە خواندنگەها فەرمییا دەولەتێ. گەلەك ژ پەرتووكێن بهاگران ل ڤێ خواندنگەهێ سەر ژ نوو هاتینەڤە نڤیسین وەك (الرسالة الحنفية) و (الرسالة الحاشية) هەر ل سەرڤێ پەرتووكێ كو دانانا عەبدوللەتیف كورێ ئەلیاسێ كورێ شێخ مەحموودی بوو و سالا (١٦٦٤) هاتییەڤەنڤیسین‌**، هەروەسان پەرتووكا (علم الكلام)یا عەبولغەنی ئەلنابلسی و محەمەد كورێ عمەر كورێ عەبدولجەلیلێ بەغدادی، كو ل سالا (١٨١١) ژ ئالیێ یوسف بەنستانیێ رێكانی هاتییەڤەنڤیسین[٥١].

**٢. خواندنگەها ئیمام قاسمی ل ئامێدیێ:** میر غیاسودین قاسم بەهائەدینی ل سالا (٧٨٤مش/١٣٨٢ز) ئەڤ خواندنگەهە دامەزراندییە و عومبارەكا پری پەرتووك ژ زانستێن جۆرا و جۆر بۆ دانایە، مخابن ئەڤ خواندنگەهە ژ ناڤ چوویە و پەرتووكێن وێ ژی بەرزەبووینە[٥٢].

**٣. خواندنگەها قوبان (قوبەهان):** ئەڤ خواندنگەهە هندی بێژی ناڤدارە، ژ ناڤدارترین خواندنگەهێن دەڤەرێ یە، دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ كەلا ئامێدیێ ل گەلیێ دبێژنێ رووبارێ ئامێدیێ ناڤبەرا سیلاڤێ و ئامێدیێ، ئانكو دەرڤەی سنوورێ بازێری[٥٣]. ب دروستی نەهاتییە زانین كەنگی هاتییەئاڤاكرن و كێ ئاڤاكرییە، لێ ل دووڤ ژێدەران بەری سەدسالیا هەشتێ مشەختی/چواردێ زایینی هەبوویە و ل سەر دەمێ میرێ ئامێدیێ سولتان حسێن وەلی هاتییەنووژەنكرن، ئەنوەر مایی دبێژیت: (گرنگترین و ناڤدارترین خواندنگەهـ خواندنگەها (قوبان- قوبەهان)ە، ب رەخ مەزارێ ئیمام محەمەد باقر كورێ ئیمام عەلی رەزا كورێ موسا كازم ژ مالباتا پێغەمبەری (س)ڤە ل سەدسالیا چوارێ مشەختی هاتییەئاڤاكرن، ل بەراهیێ جهەكی بەرتەنگ بوو، لێ بەردەوام بەرفرەهبوویە و هاتییەڤە سەخبێركرن، پاشتر ئاڤاهیێن پێكهاتی ژ پێنج پشكان لێ هاتینەزێدەكرن، هەر پشكەكێ ژوورێن قوتابیان دگەل ژوورەكێ یان دووان بۆ سەیدایان ب خۆڤەدگرتن، هەروەسان پشكەكا تایبەت ب لێنانگەهێ و سەرشووێ لێ هەبوون، ل سنگی ژی مزگەفتەكا خودانا پێنج قوبەهان هەبوو، ئاڤاهیێ خواندنگەهێ نموونا هۆنەرێ ئاڤاكرنێ بوو، ئەڤ ئاڤاهییە دگەل ئاڤاهیێ میرگەهێ یێ ناڤدار ل ئامێدیێ، ب فەرمانا سولتان حەسەن بەگی هاتینەئاڤاكرن)[٥٤]. ل سالا (١٢٧١مش) كو ئامێدیێ سەر ب ویلایەتا هەكاری بوو هژمارا قوتابیێن خواندنگەهێ ٢٥ قوتابی بوو، بەلێ پشتی تەنابوونا سەروبەرێ تەناهیێ هژمارا قوتابیێن خواندنگەهێ گەهشتییە نێزیكی (١٧٠)ان. گەلەك زانا ژ ڤێ خواندنگەهێ دەركەتینە و پەرتووكخانەكا دەولەمەند هەبوو، بەرمایێن ڤێ پەرتووكخانەیێ مابوونە ل جەم مالا مفتی یا ئامێدیێ و پشتی وان ژی كەتینە خانەیا بەغدا یا پاراستنا دەستنڤیسان، گەلەك ژ زانایان ل ڤێ خواندنگەهێ خواندییە و هەر وان ب خۆ ژی دەرس لێ داینە، ژ وانا: مەلا مەحموودێ بەهدینی، مەلا یەحیایێ مزووری، مەلا خەلیلێ سێرتی، شێخولئیسلامێ ناڤدار ئەبوئەلسعودێ ئامێدی (ابو السعود العمادي ٩٥١مش/ ١٥٤٤ز) و زانایێن مالا مفتی و دواكەسێ ژ ڤێ مالباتێ دەرس ل ڤێ خواندنگەهێ داین مفتیێ ئامێدیێ محەمەد شوكری ئەفەندی بوو. ئەڤ خواندنگەهە هەتا دەسپێكا سالێن بیستێ یا ئاڤابوو و ب هزاران بەرگێن پەرتووكان ژ زانستێن جودا تێدا هەبوون، هندەك ژێ هەتا نها ماینە، پرانییا پەرتووكێن پەرتووكخانەیا وێ وەقفا سولتان حسێن وەلی بوون و موورا وی ل سەر بوو، هندەك ژ وان ب زێری هاتبووونە تامدان، ژ وانا پەرتووكا (جمع الجوامع) یا (تاج الدين السبكي) كو ب دەستخەتێ وی ب خۆیە. ڤێ خواندنگەهێ

گوند هەبوون كو وەقفا وێ بوون بەلێ مخابن نها بێی هیچ حەقییەكێ بووینە مولكێ خەلكەكی، هەروەسان گەلەك پەرتووك ل ڤێ خواندنگەهێ هاتینەڤەنڤیسین وەك پەرتووكا (الحاشیة علی شرح الشمسیة للسید شریف) ل سالا (١٥٥٤ز) ژ ئالیێ حەسەن كورێ عەبدوللایێ جەلی ڤە هاتییەڤەنڤیسین و پەرتووكا (المفصل فی صناعه الاعراب) یا (جارالله الزمخشری) و پەرتووكا تفسیر سوره الفاتحه) یا مەلا مەحموودێ كوردیێ بەهدینی مفتیێ ئامێدیێ و هەردو دەستنڤیس یێن سەدسالییا هەژدێ نە، ڤێ خواندنگەهێ جهەكێ زانستیێ بەرچاڤ و هەژی هەبوو و پەیوەندی دگەل زانینگەها (الازهر) یا میسرێ هەبوون[٥٥].

**٤. خواندنگەها مراد خان بەگ ل ئامێدیێ:** جهێ وێ ل ناڤ ئامێدیێ ب خۆ بوو نێزیكی دەرگەهێ رۆژهەلاتی ئەوێ ب دەرگەهێ زێباریێ دهێتەناڤكرن، میر مراد خان بەگ كورێ حەسەن بەگی ل نیڤا سەدسالییا یازدێ مشەختی/ نیڤا سەدسالییا هەڤدی زایینی دامەزراندییە، خواندنگەهەكا ناڤدار بوو ب زۆرییا زانایێن خۆ، دوا كەسێ دەرس ل ڤێ خواندنگەهێ گۆتین شوكری ئەفەندی یێ مفتیێ ئامێدیێ بوو، ل زڤستانێ قوتابییان ل ڤێ خواندنگەهێ دخواند و هاڤینان بەردەوامی د دا خواندنا خۆ ل خواندنگەها قوبەهان، ڤێ خواندنگەهێ ژی مولكێن خۆ هەبوون و داهاتا وان ل وێ مزگەفتێ دهاتەمەزاختن، هەتا دەوروبەرێن سالا ١٩٣٢ێ خواندنگەها ئاڤا بوو و قوتابییان لێ دخواند، وێ ژی پەرتووكخانەكا دەولەمەند هەبوو و ل سەر هندەكان هاتبوو نڤیسین (الواثق بالله المنان عبده مراد خان)، ب بۆرینا دەمی پەرتووكێن وێ ژی بەلاڤە و ژناڤچووینە، ل ڤێرێ ژی چەندین پەرتووك سەر ژ نوو هاتینەڤەنڤیسین، وەك پەرتووكا (النكاح فی شرح المنهاج) یا ب (تحفة المحتاج) ژی دهێتەناڤكرن و نڤیسینا (ابن حجر المكي الهیتمي)یە و مەلا عەبدولرەحمانی بۆ سەیدایێ خۆ فەقی حەجی كورێ مەلا محەمەدێ كورێ مەلا ئەحمەدێ بەنستانیێ رێكانی بابێ شێخ تاهرێ نەقشەبەندی نڤیسیەڤە[٥٦].

**٥. خواندنگەها مەیدانێ:** پتر ژ سەد و پێنجی سالانە ژ ناڤچوویە و هەرفتییە، ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن ژ بەركو دكەفتە تاخێ مەیدانێ ژێرێ ئامێدیێ[٥٧].

**٦. خواندنگەها مزگەفتا مەزن:** ئەڤ خواندنگەهە و مزگەفتا مەزن ب هەڤرا بوون، هژمارەك زۆر ژ سەیدا و مەلا ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچووینە، پتر ژ پێنجی سالانە خواندن لێ نەمایە و تنێ مزگەفتا مەزنا ئامێدیێ یە، چ پەرتووكخانە لێ نەبوون، ژ شوینوارێن وێ یێن مایی مینبەر و دەرگەهێ وێ هاتینەڤەگوهاستن بۆ بەغدا، ب مهانێن نە د جهێ خۆدا شوینوارێن وێ یێن مایی ژی دگەل عەردی هاتینەراستڤەكرن[٥٨].

**٧. خواندنگەها مزگەفتا كۆچكا میران:** ئەڤ خواندنگەهە د ناڤ كۆمەلگەهێ خانیێن مالباتا حوكمداردا بوو، تایبەت بوو ب میران و میرزادەیان و ب فەرمانا میری هاتبوو ئاڤاكرن، زانا ژ جهێن جوداڤە د ئینانە ڤێ خواندنگەهێ و دەرس لێ دگۆتن، هندەك ژ میران قۆناغێن باشێن خواندنێ دەرباز كربوون و شارەزایی د زانست و ئەدەبیات و لوجیكی (المنطق) دا هەبوون، شاعر و ئەدیب ژێ رابوون، حەز ژ زانستی دكرن و هاندانا پێشڤەبرنا زانستان دكرن و گەشبوونا ئاستێن زانستی و رەوشەنبیری ب سەرپەرشتیا وان بوو[٥٩].

**٨. خواندنگەها مایێ:** ئەڤ خواندگەهە ژ ئالیێ میر قوباد بەگ كورێ سولتان حسێن وەلی (١٥٧٣-١٥٨٣ز) ل ڤی گوندی هاتییەئاڤاكرن، لەوما ب خواندنگەها قوباد بەگێ ئێكێ ژی دهێتەناڤكرن، ژ خواندنگەهێن گرنگ و ناڤدار بوو، پترییا سەیدایێن وێ ژ مالباتا مەلا عیمادەدینێ بەرواری بوون، گەلەك ژ زانایێن ئایینی ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچووینە، شێخ مەزهەرێ مایی دەرس ل ڤێ خواندنگەهێ گۆتینە، هەتا سالا ١٩٢٤ێ یا ئاڤابوو ب قوتابییان، دەمێ ل سالا ١٩٢٤ێدا هێزێن تیارییان دگەل لەشكەرێ

ئینگلیزی ب سەردەڤەرێدا گرتی ئەڤ خواندنگەهە ب پەرتووکخانا وێ ڤە سۆت، کتا مایی ژ دەستنڤیسێن وێ مانە ل جەم مەلا تەهایێ شێخ مەزهەرێ مایی، ل سالێن هەفتییان دەزگەهێ ئەمنا عیراقێ دەست ب سەر واندا گرت[٦٠].

٩. **خواندنگەها شەرانشێ**، ژ ئالیێ حەسەن کورێ سەیفەدینێ بەهدینی ل سالا (٩٤٠مش/١٥٤٣ز) ل گوندێ شەرانشێ یێ قەزا زاخۆ هاتییەئاڤاکرن، چەند زانایێن مەزن وەك مەلا محەمەدێ شەرانشی (سالا ١٦٩٤ مرییە) و مەلا تەها (١٨٨١مرییە) و ل ئەرمشتێ هاتییەڤەشارتن و شێخ ئەحمەدێ شەرانشی و یێن دی ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچووینە، وێ ژی مولك هەبوون، داهاتێ وان ل خواندنگەهێ و مزگەفتێ دهاتەمەزاختن، پشتی ل دەسپێکا سەدسالیا چوویی خواندنگەهـ نەمای هندەکان دەست ب سەر مولکێن وێ دا گرت[٦١].

١٠. **خواندنگەها کێستە**، ژ ئالیێ میر حەسەنڤە ل گوندێ کێستەیێ بەرواری ژووری هاتییەئاڤاکرن، عومبارەکا پەرتووکان هەبوو، زانایێن وەك مەلا ئیبراهیمێ کێستەیی خودانێ کتێبا (شرح المنهاج) و شێخ یوسفێ کێستەیی بابیرێ مالباتا یوسفی و مەزنێ زاخۆ ل سەردەمێ شۆرشا بەدرخان پاشای ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچوونە، سەرئەنجامێ وێ ژی وەك خواندنگەهێن دی ل سەدسالیا بیستێ ل لاوازێ دایە هەتا ب ئێکجاری ژ ناڤچوویی[٦٢].

١١. **خواندنگەها رویسێ**، ژ ئالیێ سولتان حەسەن بابێ سولتان حسێن وەلی یێ ناڤدار ب حەزا زانستی و هاندانا زانایان ل گوندێ رویسێ یێ دەڤەرا گولی هاتییەدامەزراندن، چەند مولەك بۆ هاتبوونە وەقفکرن و داهاتێ وان ل سەیدا و قوتابیێن وێ دهاتە مەزاختن[٦٣].

١٢. **خواندنگەها ئەرمشتێ**، گوندێ ئەرمشتێ سەر ب قەزا زاخۆ ڤەیە، خواندنگەهەکا دێرین و ناڤدار لێ هەبوو، چەند زانایان لێ خواندییە، ژ وانا مەحموود کورێ ئیبراهیمی کورێ خەلیلێ بهوسی (١١٠٠ز مرییە) و شێخ حەسەنێ خۆرکی (١٣٢٥مـش/١٩٠٧ز) مرییە کەسەکێ کورە بوو و د بیاتدا بۆتانی بوو، چەند دەستنڤیسەك هەنە ل ڤێ خواندنگەهێ هاتینەڤەنڤیسین[٦٤].

١٣. **خواندنگەها شیلان**، ل گوندێشیلانێ سەر ب زاخۆڤە، مەلا سوبغەتوللا سەیدایێ ڤێ خواندنگەهێ بوو، ژ ڤێ دەڤەرێ زانایێن ناڤدار وەك (الحاجب الكشانی) و مەلا سەید عەلیێ شیلانیێ مەزن و یێن دی رابووینە[٦٥].

١٤. **خواندنگەها زاخۆ**، ئەڤ خواندنگەها د ناڤ مزگەفتا مەزنا زاخۆدا بوو، رووگەها قوتابییان، زاخۆ یەك ژ مەلبەندێن گرنگێن میرگەها بەهدینان بوو، مەزن و بەرپرسێن وێ یێن کارگێری وەك: عەلی خان بەگ برایێ سولتان ئیسماعیلێ ئێکێ و زیێر پاشای خۆ ل خواندنگەهان ب قوتابی و سەیداڤە دکرە خودان، زانایێن مەزن ل ڤێ خواندنگەهێ دەرسگۆتینە وەك: مەلا ئەحمەد بەگێ عەباسی (سالا ١٣٣٣مش/١٩١٤ز مرییە) ئیمامێ مزگەفتێ و سەیدایێ خواندنگەها وێ بوو، مەلا عەبدوللا کورێ حەجی قاسمێ زاخۆیی وەك سەیدایێ خواندنگەهێ هاتییەدامەزراندن پشتی کو ژ ئالیێ حکۆمەتا عوسمانی ڤە ل سالا (١٩٠٩)ێ ئەزموونەك ب مەرما دامەزراندنا سەیدایان یێ هاتییەکرن، هەروەسان مەلا یونسێ تەهایێ زاخۆیی (١٣٤٢مش/١٩٢٣ز) باوەرناما مەلاتیێ و شارەزاییەکا باش د زانستێن ئایینی دا هەبوو، پێشنڤێژ و سەیدایێ مزگەفتا زاخۆ و مفتیێ سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی و حکۆمەتا شاهیا عیراقی بوو، و مەلا ئەحمەد عەبدولخالقێ ئاکرەیی (سالا ١٣٧٨مـش/١٩٥٨ز مرییە) ئەو ژی هەلگرێ باوەرناما زانستی بوو و پشتی گەریانەکا زۆر بۆ دەستڤەئینانا زانستان ل زاخۆ بنەجە ببوو و ببوو پێشنڤێژ و سەیدایێ مزگەفتا زاخۆ و خواندنگەها وێ و پتر ژ پێنجی زانایێن ئایینی باوەرناما مەلایەتیێ ل سەر دەستێن وی وەرگرتییە، ب مرنا وی سەردەمێ خواندنا ئایینی ل وێ خواندنگەهێ ب داوی هاتییە و تنێ مزگەفت مایە[٦٦].

١٥. **خواندنگەها باتۆفا**، ل مزگەفتا گوندێ

باتوفا سەنتەرێ نهایێ ناحیا باتوفا، خواندنگەهەکا مەزن بوو. قوتابیێن زانستێن ئیسلامێ بەرێ خۆ دداێ، ژ سەیدایێن وێ مەلا شێخ زیائەدینی (سالا ١٩٦٢ مریە)، هەر ل باتوفا هاتییەڤەشارتن، هەر وی سەیدای ل دەڤەرا دۆسکی یان ژی دەرس دگۆتن، ژێدەرێ فەتوایان بوو ل هەردو دەڤەرێن دۆسکی و گولی[٦٧].

١٦. **دو خواندنگەهـ ل مزگەفت و تەکیا بامەرنێ:** دو خواندنگەهـ بوون یەك ل مزگەفتێ و یا دن ل تەکیا بامەرنێ، یەك ژ وانا ژ ئالیێ شێخ محەمەد کورێ شێخ تاهرێ نەقشەبەندی هاتییەئاڤاکرن و مەلا نەجمەدین کورێ مەلا ئەحمەدێ بابکێ بامەرنی (١٩٤٩ز مریە) قوتابیێ مەلا یەحیایێ مزووری دەرس لێ دان، کەسەکێ ژێهاتی و خودێ نیاس و جهێ باوەریێ بوو، دەولەمەند بوو د زانستاندا خوشنڤیسەکێ باش بوو، لێ خودان سەرەدەریەکا دژوار بوو دگەل قوتابیان، چەندین زانا ل سەر دەستێ وی پێکەهشتینە وەك: (مەلا عارف، مەلا فوئاد، مەلا سالح، مەلا محەمەد سەعیدێ جولەمێرگی و مەلا نەجمەدین) و یێن دن. هندیکە خواندنگەها دووێ یە دیارە ئەو ل بەراهیێ هاتییەئاڤاکرن و دگۆتنێ (خواندنگەها سەید مەلك ئێزدین) ئانکو مەلك عیزەدین[٦٨]، بەلگە بۆ هندێ کو ئەو ل بەراهیێ هاتییەئاڤاکرن کو هاتییەگۆتن: (شێخ محەمەدێ کورێ شێخ تاهرێ نەقشەبەندی تەکیا ب رەخ مزگەفت و خواندنگەها (سەید مەلك ئێزدین) ئاڤاکر)[٦٩].

١٧. **خواندنگەها مزگەفتا سپیندارێ:** گوندێ سپیندارێ دکەڤیتە دەڤەرا بەرێ گارەی سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤەیە، ناڤێ وێ هەڤالجێمکە دگەل گوندێ سیاری و دهێتەگۆتن (سیار و سپینداری)، د پەرتووکا (إمارە بهدینان)یا (محفوظ العباسي)دا هاتییە: ((اسپیندار ل دەڤەرا بەرواری ژێری یا سەر ب ئامێدیێ یە، مەلا ئەحمەد ئەفەندی دەرس لێ دگۆتن)[٧٠]، یا راست ئەو سپیندارە یا هەڤالجێمك دگەل سیارێ و مەلا حسێن ئەحمەد سپینداری (١٣٨٣مش/ ١٩٦٣زمریە) ئیمام و پێشنڤێژێ مزگەفتا وێ بوو، ئەو مزگەفتە کرە مەلبەندەکێ زانست و فێرکرنێ، قوتابیان ژ هەر جهەکیڤە سەخمەرات فێربوونێ قەستا وێ کر، سەیدایان باش ل دووڤ یەك هاتنە ڤێ خواندنگەهێ و هژمارەکا زانایان باوەرنامە ژ وێرێ وەرگرتن، ژ وانا: مەلا ئەحمەد عەبدولخالقێ ئاکرەیی (١٩٥٨ مریە) و مەلا حسێن ئەحمەدێ سپینداری[٧١].

١٨. **خواندنگەها گوندێ سیارێ:** هەمان گوندێ سیارێ یێ دگەل سپیندارێ ناڤێ وی دهێت و سەر ب ئامێدیێ ڤەیە[٧٢].

١٩. **خواندنگەها مزگەفتا بەرئاشێ:** ژ گوندێن بەرواری ژێری یە، نێزیکی رۆژئاڤایێ سیار و سپیندارێ، سەر ب ئامێدیێ ڤە[٧٣].

٢٠. **خواندنگەها مزگەفتا بێبادێ (بیرێ حەلانی):** دکەڤتە دەڤەرا (بەرواری ژێریا)، سەر ب ئامێدیێ ڤە[٧٤].

٢١. **خواندنگەها مزگەفتا چەمانکێ:** ژ گوندێن دەڤەرا بەرواری ژێریانە و نها ناحیەکە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، شێخ خالد کورێ شێخ شێخ حسێن پێشنڤێژ و سەیدایێ وێ بوو، مەلا حسێن موسا کو ژ دایکبوویێ سالا (١٩٣٧)ێ ئێك بوو ژ وان هەشت خویندکارێن ل نك وی دخواندن[٧٥].

٢٢. **خواندنگەها مزگەفتا ئاسهێ:** گوندەکە سەر ب ناحیا سلێڤانەیی، شێخ عەلی ئاسهی سەیدایێ وێ بوو[٧٦].

٢٣. **خواندنگەها مزگەفتا هلۆرا:** ل دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[٧٧].

٢٤. **خواندنگەها مزگەفتا تروانش:** دکەڤتە دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[٧٨].

٢٥. **خواندنگەها مزگەفتا هرۆر:** دکەڤتە دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، یا ناڤداربوو ب هەبوونا گەلەك دەستنڤیسان یێن بنەمالا حەجی محەمەد عەلی هرۆری بوون، سەیدایێ وێ ژی شێخ محەمەد بوو[٧٩].

٢٦. **خواندنگەها مزگەفتا شێلازا:** دەڤەرا

بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[80].

**٢٧. خواندنگەها مزگەفتا دێشیش،** دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[81].

**٢٨. خواندنگەها مزگەفتا ئەدنێ،** دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[82].

**٢٩. خواندنگەها مزگەفتا بازێ،** ل دەڤەرا بەرواری ژووری سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[83].

**٣٠. خواندنگەها مزگەفتا قدش،** سەر ب ناحیا سەرسنکێ قەزا ئامێدیێ یە[84].

**٣١. خواندنگەها مزگەفتا غلبیش،** سەر ب ناحیا سەرسنکێ ل قەزا ئامێدیێ[85].

**٣٢. خواندنگەها مزگەفتا ئەرز،** گوندەکە سەر ب ناحیا بامەرنێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ، ڤی گوندی کەلایەکا مێژوویی لێ هەبوو، تایەکێ میرێن ئامێدیێ حوکمرانی لێ دکرن، ژ کەسێن ناڤدار کو ل ڤی گوندی ناڤ و دەنگێن وان چووین، هۆزانڤان بەکر بەگێ ئەرزی بوو، ژ زانایێن ب ناڤ و دەنگ ژی (پیر ئەحمەدێ ئەرزی) کو ل وی گوندی هاتییە ڤەشارتن. ئەڤ خواندنگەهە هەتا ناڤەراستا سەدسالیا بیستێ ژی یا ئاڤەدانبوو و خەلکی بۆ زانستێ قەست دکرنێ[86].

**٣٣. خواندنگەها مزگەفتا بانکا،** سەر ب ناحیا بامەرنێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ[87].

**٣٤. خواندنگەها مزگەفتا ئەرەدنا،** سەر ب ناحیا سەرسنکێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ[88].

**٣٥. خواندنگەها مزگەفتا ئیسفکا،** سەر ب ناحیا سەرسنکێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ[89].

**٣٦. خواندنگەها مزگەفتا زێوا شێخ پیرامۆس،** سەر ب ناحیا بامەرنێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ[90].

**٣٧. خواندنگەها مزگەفتا گەرەگۆ،** سەر ب ناحیا سەرسنکێ یە و ل بنارا چیایێ گارەی رۆژهەلاتی سەرسنکێ[91].

**٣٨. خواندنگەها مزگەفتا دێرەش،** گوندەکە ل نێزیکی ئامێدیێ، ل بنارا چیایێ گارەی و هەمان گوندێ شێخولئیسلام شێخ عەلی یێ هەکاری یە[92].

**٣٩. خواندنگەها مزگەفتا مەزن ل دهۆکێ،** ئەڤ خواندنگەهە د ناڤ مزگەفتا (جامعا) مەزن ل ناڤەندا دهۆکێ دا بوو، حەزژێکەرێن زانستێ قەست دکرنە ڤێ مزگەفتێ بۆ خواندنا زانستێن عەرەبی و ئیسلامی، گەلەك ژ وان قوتابیێن لێ دخواندن کورێن مالباتێن وان میران بوون یێن مەزناتییا دەڤەرێ دکرن، گەلەك زانا ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچووینە، حەجی مەلا محەمەد ئیمام کورێ مەلا عومەر دهۆکی (١٣٢٤مش/١٩٠٥ز مرییە)، ل بەری هینگێ بابێ وی ئەڤ کارە دکرن، و پاشی کورێ وی (حەجی مەلا تاها ئەفەندیێ دهۆکی) (سالا ١٣٤٧مش/١٩٢٨ز مرییە) ئەڤ کارە کرییە و یێ داویێ ژێلی کو سەیدا و پێشنڤێژێ وێ بوو، وەکیلێ وەقفێ ژی بوویە، گەلەك قوتابییان بۆ زانستێن عەرەبی و شەریعێ قەستدکرنێ و ئەو بخۆ یێ شەهرەزابوو د زانستێن (علم الفرائض) دا، ب دروستی نەهاتییە زانین کا کەنگی ئەڤ خواندنگەهە هاتییە ئاڤاکرن، لێ هندە پەرتووك لێ هاتینەڤە نڤیسین، دیرۆکا دەستنڤیسینا وان ڤەدگەرێتەڤە هەردو سەدسالیێن هەڤدێ و هەژدێ زایینی، ناڤێ (محەمەد کورێ ئەحمەد دهۆکیێ کوردی) ل سەر دەستنڤیسا (المقصد فی القرارات) وەکی خودانێ پەرتووکێ هاتییە دیتن (١٦٩٩ز) و دانەکا وێ ل پەرتووکخانا ئەوقافا سلێمانیێ هەیە، دیسان پەرتووکا (الفناری) ژی یا دانەرێ وێ (محەمەد حەمزە ئەلفەناری) ل ڤێ خواندنگەهێ هاتییەڤە نڤیسین و ئەحمەد کورێ مەلا عەلی باجلۆری ل سالا (١٧٢٥ز)ی نڤیسییە. هەژییە بێژین وەك ل سەر سەردەرگەهێ وێ یێ کەڤن هاتییەنڤیسین ئەڤ مزگەفتە ل سالا ١٦٨٤ز هاتییەئاڤاکرن[93].

**٤٠. خواندنگەها مزگەفتا رێکانیا،** خواندنگەهەکا ب ناڤ و دەنگ بوو، دکەتە دناڤ بازێرێ دهۆکێ دا، مەلا سەلیم ئەفەندی کورێ مەلا عەبدەلرەحمان زاویتەیی (١٣٣٥مش/١٩١٦ز مرییە) سەیدا و پێشنڤێژێ وێ بوو، شەهرەزایی دگەلەك وارێن زانستیدا هەبوو، ناڤ و دەنگیا وی یا زانستی

چووبوو، کارێ سەیدایێ کرییە و گەلەك قوتابی ل بەر دەستی دەرکەتینە[٩٤].

**٤١. خواندنگەها مزگەفتا حەجی مستەفای،** ئەڤ خواندنگەهە دکەتە دناڤ ناڤەندا باژێرێ دهۆکێ ، خواندنگەهەکا ب ناڤ و دەنگ بوو، زانایێ ژێهاتی شێخ تاها بریفکانی (١٣٣٦مش/ ١٩١٧ز) ب کارێ پێشنڤێژیێ و سەیدایێ ب هەروە رادبوو، وی ئەڤ کارە دکر هەتا دامەزراندنا ب فەرمی وەکی سەیدا ل مزگەفتا مەزنا دهۆکێ ل سەردەمێ ئوسمانییان دەرکەتی و ما ل وی جهی هەتا وەغەرا داویێ کری[٩٥].

**٤٢. خواندنگەها مزگەفتا سێمێلێ،** دکەتە ناڤەندا سێمێلێ کو سەر ب دهۆکێ ڤەیە[٩٦].

**٤٣. خواندنگەها مزگەفتا دولبێ،** دولبێ نها دکەڤیتە سێریانا دهۆك و زاخۆ و مووسل و سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە[٩٧].

**٤٤. خواندنگەها مزگەفتا بریفکا،** بریفکا گوندەکێ نها سەر ب دهۆکێ ڤەیە، ئەڤ خواندنگەهە ل سەردەمێ شێخ شەمسەددین ئەخلاتی (٩٩٧- ١٠٨٥مش/ ١٥٨٨- ١٦٧٤ز) هاتییەئاڤاکرن، ل چاخێ سولتان سیدی خان (٩٧٠-١٠٣٩مش)[٩٨]. ژ سەیدایێن ڤێ خواندنگەهێ شێخ محەمەد کورێ شێخ عەبدوللا (برایێ شێخ نورەددینی) دهۆکی (١٣٠٥مش) و ئەو خەلیفێ مامێ خۆ بوو و یێ دەستویردای بوو ژ لایێ وی ڤە، هەر وەسان رابەرەکێ رێکا نەقشەبەندی بوو، حەز ژ زانستی و زانایان و جڤاتێن وان دکر، ل سەردەمێ وی چەند زانا ژ خواندنگەها ناڤبری دەرکەتینە و ل دهۆکێ وەغەرا داویێ کر. ژوان کەسێن سەیدایی لێ کرین شێخ فازلێ شۆشی (١٣٢١مش/١٩٠٣ مرییە) و شێخ مەمدۆحێ بریفکانی (١٩٧٦ز مرییە)، و مەلا ئەحمەدێ عەقری (١٣٧٨مش/ ١٩٥٨ز) دەستوورا زانستی دابوویێ، کو وانە ل تەکیا بریفکان دگۆتن پاشی خویندکارێن خۆ ڤەگوهاستنە مزگەفتا بریفکان. مەلا محەمەد سەعید مایی ژی زانایەکێ ژێهاتی بوو، ل دەسپێکا سەدسالیا چواردێ مشەختی وەغەرا داویێ کرییە، لێ ئەو بخۆ ئاکنجیێ گوندێ بریفکا بوو، و گەلەك پەرتووك وەکی دەستنڤیس لێ نڤیسینە، ژ وانان (ارشاد السالكين في طريق العارفين) یا دانەرێ وێ عەبدولحەمید کورێ شەمسەددین کورێ ئەحمەدێ بریفکانی و ل سالا (١٨٤٣ز)ی نڤیسییە، و پەرتووکا (منهاج العابدين) یا دانەرێ وێ ئەحمەد کورێ محەمەد حەسەنێ بریفکانی کو محەمەد کورێ مەلا عەبدولایێ مووسلی ل سا (١٨٥٣ز) ی نڤیسی[٩٩].

**٤٥. خواندنگەها مزگەفتا ئێتویت،** ئێکە ژ گوندێن مزووریان و سەر ب دهۆکێ ڤەیە و پشتی بەرفرەهبوونا باژێرێ دهۆکێ ل دەسپێکا سەدسالیا بیست و ئێکێ نها بوویە تاخەکێ باژێری، خواندنگەها وێ یا کەڤنە و حەزژێکەرێن زانستی قەست دکرنێ، یێن سەیدایی ژی ل ڤێ خواندنگەهێ کرین مەلا شێخ سالح دەرگەلی (١٣٢٧مش/١٩٠٨ز مرییە) کو پێشنڤێژ و سەیدایێ وێ بوو، مرۆڤەکێ ژ خودێ ترس بوو و کەسەکێ خێرخواز بوو، پشتی هینگێ چوو دهۆکێ و ل دووماهییا چاخێ حوکمەتا ترکیا ئوسمانی وەکی پێشنڤێژ و سەیدا هاتە دامەزراندن. پشتی هینگێ سەید حەسەن ئێتویتی (١٩٢٨ز مرییە) کو خەلکێ هەمان گوند بوو ژ بۆ خێرێ و نێزیکبوون ژ خودێ پێشنڤێژی و سەیدایی لێ کرییە، کەسەکێ دەست پاقژ بوو، ب دەستێ خۆ کار دکر دا نانێ رۆژێ پەیدا بکەت. شێخ نورەددینێ بریفکانی هەر ژ زارۆکینیا خۆ و هەتا سالا (١٨٢٧ز) ل ڤی گوندی ژیایە و ل ڤێ سالێ ئەو دگەل برایێ خۆ محەمەد ئەمین ژ بەر بەلاڤبوونا ئێشا (تاعونێ) ژێ چووینەڤە گوندێ بریفکان، پتریا بەرهەمێن وی ل گوندێ ئێتویتێ هاتینە نڤیسین، ژ نڤیسینێن وی:

١- نظم الدرر لاسماء النبي المفتخر.

٢- تعليقات على القصيدة البائية المسماه بكرب الحال من ذي الجمال والجلال.

٣- ابراز دقائق الحقائق في شرح القصيدة الحائية.

٤- شرح القصيده الهمزية.

٥- ذخر السالكين.

٦- البدور الجلیة.
ئەڤ پەرتووکە دناڤبەرا سالێن (١٨١٤- ١٨٢٢ز) هاتینە دانان.
٦- حجة اللهجة، ل سالا (١٨٢٣ز) هاتییە دانان.
٧- پەرتووکا (الظروف) یا دانەرێ وێ مەلا یونس ئەرقینی ل خواندنگەها ئێتوێتێ ل سالا (١٧٩٧ز) ی ژ لایێ محەمەد ئەمین کورێ مەلا محەمەد هاتییە نڤیسین[١٠٠].

**٤٦. خواندنگەها مزگەفتا بالەتە،** گوندەکێ دەڤەرا مزووریانە و نێزیکی گوندێ بریفکانە ب دو کیلومەترا کو مەرقەدێ شێخ نورەددین بریفکانی لێ یە، خواندنگەها وێ یا کەڤنە و یا پڕی بەرهەم بوو، ب خواندنا خۆ یا ب ناڤ و دەنگ بوو و گەلەك کەس ژێ دەرکەتینە و گەلەك خویندکار و سەیدا لێ هەبوون، ژ وان یێن سەیدایی لێ کرین شێخ نورەددینێ مەزن کو ئێك بوو ژ کەسێن ناڤدار ل دەڤەرێ، ژ وان یێن سەر ب ڤی گوندی ڤە مەلا محەمەد کورێ مەحمود کورێ ئەحمەد جەلەبیێ بالەتەیی، بابێ وی ژ ڤی گوندی چووبوو دهۆکێ و رڤشتێ وی پشتی هینگێ لێ ژیاینە[١٠١].

**٤٧. خواندنگەها مزگەفتا زاویتە،** زاویتە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریانە، نها ناحیە و هاڤینگەهە، گەلەك کەسان یا ل ڤێ خواندنگەهێ خواندی و گەلەك زانا مینا مەلا سەلیم کورێ عەبدولرەحمان زاویتەیی (١٣٣٥مش/١٩١٦ز مربیە) یێن ژێ دەرکەتین کو ل سەر دەستێ مەلا یاسین بریفکانی (١٩٠٦ز مربیە)، و مەلا مەحمود ئامێدی (١٣٢١مش/١٩٠٣مربیە)، نەڤیەکێ مەلا یەحیایێ مزووری بوو و مەلا عەبدولهادی ئەفەندی ئەتریشی (١٣٣١مش/١٩١٢ز مربیە) کو ئەو ژی نەڤیەکێ مەلا یەحیایێ مزووری یە خواندی یە. مەلا سەلیم ئەفەندی وەکی سەیدا و پێشنڤێژ ل مزگەفتا رێکانییان ل ناڤەندا بازێرێ دهۆکێ دا کارکرییە و خویندکاران ژ هەمی جهان قەستکرییێ، ل سەردەمێ ئوسمانییان وەکی قازیێ شەرعی ل ناحیا ئەتریش هاتبوو دامەزراندن و گەلەك نڤیسین وەکی دەستنڤیس هەنە[١٠٢].

**٤٨. خواندنگەها مزگەفتا مەزن ل ئێسفنێ،** دەمێ خۆدا ئەڤە تاکە مزگەفت بوو ل ناڤەندا قەزا ئێسفنێ، مەلا خەلیل کورێ سلێمان یێ ناسیار ب (مشەختی) (٢٠٠٧ز مربیە) دەرس لێ گۆتینە و خەتیب و پێشنڤێژێ وێ بوویە. و مەلا ئەحمەد گویانی ئەبو موزەفەر ل سالێن حەفتییان ژ سەدسالیا بووری پەرتووکا (هدایة المستفید في علم التجوید)ب دەرس گۆتییە من و ئەو ژی وەکی خەتیب و پێشنڤێژ هاتبوو دامەزراندن[١٠٣].

**٤٩. خواندنگەها شێخ عودەی کورێ مسافر (خواندنگەها شێخادی)،** کوژیێ- تەکیا (زاویە) شێخ عودەی کورێ مسافر دکەڤیتە گەلیێ لالش کو دووراتییا نێزیکی (١٢کم) باکوورێ رۆژهەلاتێ ئێسفنێ ناڤەندا قەزا شێخان، ئەڤ خواندنگەها ئایینی ل سالا (١٣١٠مش)ێ هاتییە ڤەکرن و هەتا سالا (١٣٢٢مش/١٨٩٢- ١٩٠٤ز) یا بەردەوامبوو. ئارمانج ژ ڤێ خواندنگەهێ هەروەك دگۆتن: ئەو بوو کو ئەڤ کەسێن سەرداچووی ژ ئیسلامێ بزڤرینەڤە سەر راستیێ و رێکا ئیسلاما پاقژ، لێ ل شوینا بانگخوازیێ ب عاقلی و رێکێن باش؛ شێوازێ رەقیێ و دژواریێ بکارهینان و ئەڤێ چەندێ ژی خرابتر لێ کر، پاشی شێخ ئەمین ئەفەندی قەرەداغی هنارتنە پەرستگەها شێخ عودەی بۆ وانە گۆتنێ و نیشادانا رێکێن راست و مووچەك بۆ وی و شاگردێن وی ژی هاتنە مەزاختن. ژ وان کەسێن وانە ل ڤێ خواندنگەهێ گۆتین محەمەد رەئوف غولامی و هندەك قوتابیێن خواندنگەهێن مزگەفتێن دەوروبەران و هندەکێن مووسلێ پێشنڤێژی ل ڤێ خواندنگەهێ دکرن، لێ ل داویێ ئەڤ خواندنگەهە یا بێ ئەنجام و بێ بەر بوو، لەوما ل سالا (١٣٢٢مش/١٩٠٤ز) هاتە هەلوەشاندن[١٠٤].

**٥٠. خواندنگەها مزگەفتا شکەفتهندیان،** گوندەکێ دەڤەرا مزووریانە، بە دووراتییا (٣کم) باکوورێ رۆژهەلاتا پەرستگەها لالش، ژ زانایێن سەیدایی ل ڤێ خواندنگێ کرین مەلا خەلیل کورێ سلێمان، یێ ناسیار ب (مشەختی) بوو.

**٥١. خواندنگەها مزگەفتا مامزدینا،** گوندەکێ دەڤەرا عەشیرەتا مزووریانە و سەر ب ناحیا باعەدرێ ڤەیە و نێزیکی (٥کم) ژ ناحیا باعەدرێ یا دوورە[١٠٥].

**٥٢. خواندنگەها مزگەفتا ئەتریش،** گوندێ ئەتریش گوندەکە سەر ب عەشیرەتا مزووریان ڤەیە و ل سالا (١٨٥١ز)ێ بوویە ناحیە و ژ لایێ کارگێری ڤە سەر ب قەزا شێخان ڤەیە، ئەڤ خواندنگەهە و مزگەفت دگەل تەکیێ ل نیڤا دووێ ژ سەدسالییا هەژدێ هاتییە ئاڤاکرن، خواندنگەها وێ یا دەولەمەند بوو ب زانینێ و شێخ و زانایان، ژوانان زانایێ ب ناڤ و دەنگ مەلا یەحیایێ مزووری (١٢٥٥مش/١٨٤١ز مرییە)، هەر وەسا مەلا مەحمود نهێلی (١٣١٦مش/١٨٨٩ز مرییە) کو زانایەکێ ژێهاتی و سەیدا بوو ل تەکیا ئەتریش، هەر وەسان زانایێ هێژا و ئایین پەروەر و رابەرێ رێکا قادری و سەیدایێ تەکیا ئەتریش محەمەد عەلی ئەتریشی (١٣١٨مش/١٩٠٠ز مرییە)، دیسان مەلا عەبدولهادی ئەتریشی (١٣٣١مش/١٩١٢ز مرییە)، کو نەڤیەکێ مەلا یەحیایێ مزووری بوو وانە ل مزگەفتا ئەتریش گۆتینە و ئەڤ خواندنگەهە ل سەردەمێ وی ژ خواندنگەهێن ئایینی یێن پێشکەتی بوو، وەسان گەلەک کەسان سەیدایی لێ کرییە، وەکی شێخێ هێژا محەمەد ئەمین ئەتریشی مودەرس کورێ شێخ محەمەد سەعید (١٣٣٥مش/١٩١٦ز مرییە)، و شێخ محەمەد ئەمین ئەتریشی کورێ شێخ محەمەد عەلی کورێ شێخ عەبدولحەمیدێ ئێکێ کو دیسان ل (١٣٣٥مش مرییە)، و مەلا ئەحمەد ئەفەندی ئەتریشی (١٣٦١مش/١٩٤١ز مرییە) ژ نەڤیێن مەلا یەحیایێ مزووری بوو، زانایەکێ ژیر و هێژا شەهرەزابوو، و شێخێ رێکا قادری سەیدایێ تەکیا ئەتریش شێخ عەبدولرەحمان کورێ شێخ محەمەد عەلی ئەتریشی (١٣٦٨مش/١٩٤٨ز مرییە).

گەلەک کەسان قەست دکرە ڤێ خواندنگەهێ و یا پڕ بوو ژ وان کەسێن حەز ژ زانستێ دکرن، گەلەک زانایێن ناڤدار ژێ دەرکەتینە، و پشتی مەلا یەحیایێ مزووری بوویە ئێك ژ سەیدایێن وێ، و شێخ عەبدولحەمیدێ زاڤا و خەلیفێ شێخ نورەددینێ بریفکانی لێ ئاکنجی بووی ناڤێ خواندنگەهێ گەلەك دەرکەت، گەلەك پەرتووك وەکی دەستنڤیس لێ هاتینەڤە نڤیسین وەکی: (شرح المحرر) یا دانەرێ وێ عەبدولکەریم ئەلرافعی،دانەیا مەحمود أورامی کورێ ئەبی ئەلغار ل سالا (١٦٦٦ز) نڤیسییە، و پەرتووکا (شرح نظم الكافي) یا دانەرێ وێ عەبدولا کورێ محەمەد بێتۆشی، حسێن کورێ درباسێ ریەتکی ل سالا (١٦٧٤ز) نڤیسییەڤە[١٠٦].

**٥٣. خواندنگەها مزگەفتا دەکان،** ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریانە دەڤەرا شێخان[١٠٧].

**٥٤. خواندنگەها مزگەفتا خورت،** ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریانە دەڤەرا شێخان[١٠٨].

**٥٥. خواندنگەها مزگەفتا مێرسیدا،** ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریانە ل دەڤەرا قەزا شێخان[١٠٩].

**٥٦. خواندنگەها مزگەفتا شمکا،** ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریانە ل دەڤەرا قەزا شێخان[١١٠].

**٥٧. خواندنگەها مزگەفتا مریبا،** ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانە ل دەڤەرا قەزا شێخان[١١١].

**٥٨. خواندنگەها مزگەفتا بابایی،** دکەڤیتە چیایێ مەقلووبی ل قەزا شێخان[١١٢].

**٥٩. خواندنگەها مزگەفتا بلان،** ژ گوندێن مزووریانە ل قەزا شێخان، سەیدایێ وێ ژی مەلا سالح بیساتی بوو[١١٣].

**٦٠. خواندنگەها مزگەفتا ریەتکێ،** ژ گوندێن مزووریانە ل قەزا شێخان، گەلەك حەزژێکەرێن زانستی ڤەدحەواندن، ژ سەیدایێن وێ مەلا حەسەن بلۆتی (١٩٤٣ز مرییە) و وی باوەرناما مەلاتیێ ژ مەلا ئەحمەدێ ئاکرەیی وەرگرتییە، شێخ عەبدوللا ریەتکی (١١٥٩مش/١٧٤٦ز مرییە) ژوان زانایان بوو کو ناڤ و دەنگێن وی ب بەرفرەهی بەلاڤەبووین، چوو بوو مووسل و ژیانا خۆ هەمی د فێرکرنا ڤوتابیێن ئایینی دا بۆراندییە و یێ بەرنیاس بوو کو دوعایێن وی ب جهـ دهاتن، ژ مالباتا وی زانا هەلکەتینە و ل مووسل ب (بيت المدرس) د بەرنیاسن. ژ وان پەرتووکێن ل ڤێ مزگەفتێ هاتینەڤە نڤیسین

(رسالة في اداب البحث)، محەمەد كورێ عەلی بەرواری ل سالا (١٧٤٣ز) نڤیسییەڤە و (رسالة في علم الهيئة) یا دانەرێ وێ مەحمود كورێ محەمەدێ جەخمینی، عەلی كورێ ئەحمەد ل سالا (١٨٠٦ز) نڤیسییەڤە[١١٤].

٦١. **خواندنگەها مزگەفتا گویزێ،** دەڤەرا بەرێ گارەی كو سەر ب ئامێدیێ ڤەیە، ژ سەیدایێن وێ مەلا حەسەن عیسا یونس، ژمارا ڤوتابیێن وێ شێست كەس بوون و ژ وانان زانایێ ب ناڤ و دەنگ مەلا حسێن موسایێ گویزی، ل دەهسالیا بەرایێ ژ سەدسالیا بیستێ چوویە بەر دلوڤانیا خودێ[١١٥].

٦٢. **خواندنگەها مزگەفتا شێرانە،** دەڤەرا بەرێ گارەی كو سەر ب ئامێدیێ ڤەیە، مەلا یاسین گۆیانی مامۆستایێ وێ بوو، ل داویا سەدسالیا چوویی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ[١١٦].

٦٣. **خواندنگەها مزگەفتا زێوكا شێخا،** دەڤەرا بەرێ گارەی كو سەر ب ئامێدیێ ڤەیە و گوندێ پیر مەحمود زێوكی بوو كو رڤشتا وی دگەهیتە سولتان حسێنی ژ مێرێن ئامێدیێ، و سەرەدان و هاتن و چوون دناڤبەرا وان دا هەبوو. پیر مەحمود شێخەكێ سۆفی بوو ل سەر رێكا قادری، كەسەكێ ئایین پەروەر و پاقژ بوو، مەلا محەممەد ئەمین بابۆلی سەیدا بوو ل وێرێ[١١٧].

٦٤. **خواندنگەها مزگەفتا باوان،** گوندەكە سەر ب دێرەلۆكێ ڤە ل قەزا ئامێدیێ[١١٨].

٦٥. **خواندنگەها مزگەفتا ئەلویلی،** دەڤەرا بـەرواری ژێریانە سەر ب ناحیا چەمانكێ ڤە و شوینوارێن وی هەتا نها ژی دیارن[١١٩].

٦٦. **خواندنگەها مزگەفتا نێروە،** سەنتەرێ ناحیا نێروەیا جاران سەر ب ئامێدیێ ڤە[١٢٠].

٦٧. **خواندنگەها مزگەفتا بەنستان،** گوندەكە سەر ب ناحیا رێكان ل قەزا ئامێدیێ، شێخ تاهر نەقشەبەندی و بابێ مەلا نەجمەددین ژ ڤی گوندی چووینە و ل بامەرنێ ئاكنجی بووینە و شێخ تاهری تەكیا خۆ لێ ئاڤاكر و پشتی هینگێ لێ ئاكنجی بوو[١٢١].

٦٨. **خواندنگەها مزگەفتا بێزەلێ،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا رێكان ل قەزا ئامێدیێ، مەلا نەبی حەجی مامۆستا بوو ل وێرێ و شەهرەزایی د زانستاندا هەبوو لەوما د دەمێ خۆدا پلەیا فەتوایان ژ میرێن ئامێدیێ پێ هاتەدان، و پشتی مرنا وی كورێ وی عەبدولخالقی (سالا ٢٠٠٢ مرییە) مەلایەتی لێكرییە، و نەجمەددین كورێ سەعیدی (١٩٦٨ز مرییە) خەلیفەیێ شێخ محەمەد مەمانی بوو ل سەر رێكا قادری سەیدایی ل وێرێ كرییە، و ژ مالباتا وانان هەردو برایێن زانایێن ژ خودێ ترس و ب باوەری مەلا نوری (ل سالا ٢٠٠٨ مرییە) كو ل كۆمەلگەها باگێرا ئاكنجی بووی و خەتیب و پێشنڤێژێ مزگەفتا وێ بووی، و مەلا عەبدولحەمید عەبدولخالق نەبی پێشنڤێژ و خەتیبێ جامعا مەزنا دهۆكێ و هەتا نها بەردەوامە ل سەر كارێ خۆ و ئەو هەردو برا ژی ل سەر رێكا باب و باپیرێن خۆ چووینە[١٢٢].

٦٩. **خواندنگەها مزگەفتا كێریا دێرێ،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا رێكان ل ئامێدیێ[١٢٣].

٧٠. **خواندنگەها مزگەفتا چێی،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا رێكان ل ئامێدیێ[١٢٤].

٧١. **خواندنگەها مزگەفتا بیاوێ،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا رێكان ل ئامێدیێ[١٢٥].

٧٢. **خواندنگەها مزگەفتا پریسە،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا رێكان ل ئامێدیێ[١٢٦].

٧٣. **خواندنگەها مزگەفتا هاریكێ،** گوندەكە سەر ب دەڤەرا ئامێدیێ ڤەیە[١٢٧].

٧٤. **خواندنگەها مزگەفتا بێركیاتێ،** گوندەكێ بەرواری ژێریانە سەر ب ئامێدیێ ڤەیە[١٢٨].

٧٥. **خواندنگەها مزگەفتا شێخكا،** گوندەكێ مزووریان و سەر ب قەزا شێخان ڤەیە[١٢٩].

٧٦. **خواندنگەها مزگەفتا شكەفتێ،** گوندەكێ بەرواری ژێریانە ناحیا چەمانكێ و قەزا ئامێدیێ[١٣٠].

٧٧. **خواندنگەها مزگەفتا چەم رەبەتێ،** گوندەكە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[١٣١].

٧٨. **خواندنگەها مزگەفتا سیانێ،** گوندەكە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[١٣٢].

٧٩. **خواندنگەها مزگەفتا سێدەرا،** گوندەکە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[١٣٣].

٨٠. **خواندنگەها مزگەفتا گرویەرکەڤرا،** گوندەکێ ئامێدیێ یە، دناڤبەرا هەردو گوندێن شکەفتێ و چەم ڕەبەتێ ل دەڤەرا نەهلا ئامێدیێ و هەردو دو گوندێن نێزیکی ئێك و مەزن بوون. پشتی ژ ناڤچوونا میرگەها بەهدینان و نەمانا تەناهی و ئاسایشێ، دزی و تالان کەتە دناڤدا و خەلکێ وان گوند هێلان، و هێشتا شوینوارێ دەرگەهێ وێ یێ دیارە[١٣٤].

٨١. **خواندنگەها مزگەفتا زیناڤا،** گوندەکە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە[١٣٥].

٨٢. **خواندنگەها مزگەفتا بێدهێ،** دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژووریا ل قەزا ئامێدیێ[١٣٦].

٨٣. **خواندنگەها مزگەفتا بێسرێ،** دکەڤیتە گەلیێ بێسرێ ل باکوورێ ڕۆژهەلاتێ دهۆکێ و نها وەك تاخەکێ دهۆکێ یە، شوینوارێن مزگەفتا وێ هەتا ڤان سالێن داویێ دیاربوون، لێ ب دەست هاتنە ژ ناڤبرن، مزگەفتا وێ ژمارەکا نە یا خراب ژ زانایان و داخوازکەرێن زانستی بخوڤە دگرت و زانایێن ب ناڤ و دەنگ ژێ دەرکەتینە، مینا زانا سەعید نەبی صارکی (١٩١٤ز مریبە) و چەندێن دی[١٣٧].

٨٤. **خواندنگەها مزگەفتا مەمانێ،** گوندەکە سەر ب ناحیا دۆسکی (مانگێشکێ) ڤەیە ل پارێزگەها دهۆکێ، مەلا ئەحمەد سۆرانی (١٩٣٣ز) وانە لێ گۆتینە، زانایەکێ ژیر و خودان شیان بوو د چارەسەرکرنا کێشێن ئالۆزێن شەرعی دا و مفتیێ وێ بوو. ژ وان کەسێن مامۆستایی لێ کرین شێخ عەبدولقەهار کورێ شێخ عەبدولجەبار کورێ شێخ عەبدولا (برایێ) شێخ نورەددین بریفکانی (١٣٣٦مش/١٩١٧زمریبە) ، کەسەکێ ئایین پەروەر و چاك بوو و یێ پێگیر بوو ب قورئان و سنەتێ و رابەرێ رێکا قادری بوو، کورێ وی پشتی وی شێخ محەمەد (١٩٨٣ز مریبە) جهێ وی گرت کو ل گەنجینیا خۆ وانێن ئایینی ل سەر دەستێ مامۆستایێن خواندنگەهە و تەکیا بریفکان وەرگرتینە، و خۆ واستاندیبە و زیرەك کریبە بۆ وەرگرتنا زانستێن ئایینی و بنەمایێن ئیسلامێ و عەقیدا، پشتی هینگێ ڤەگەریایە مەمانێ و جهێ بابێ خۆ گرتیبە بۆ ب رێڤەبرنا کاروبارێن تەکیایێ و رابەراتیێ، گەلەکێ هشیار بوو ل سەر پەیرەوکرنا حوکمێن شەرعی[١٣٨].

٨٥. **خواندنگەها مزگەفتا مفتی،** دکەڤیتە ناڤەندا دهۆکێ، خواندنگەها کەڤنارە و هەڤرکمانیا خواندنگەها مزگەفتا مەزن ل دهۆکێ دکر، حەزژێکەرێن زانستی قەست دکرنێ و سەیدایێن خودان شیان لێ بوون، مینا مەلا محەمەد عەبدولرەحمان بەرۆشکی (١٣٧٠مش مریبە) و ل وێرێ وەکی پێشنڤێژ هاتبوو دامەزراندن[١٣٩].

٨٦. **خواندنگەها مزگەفتا دێراگژنیك،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە، زانایێ خودێ ترس مەلا خەلیل عومەر (١٩٦٢ز مریبە) سەیدا بوو ل وێرێ و ژیێ خۆ هەمی د دەرسگۆتنێ و رابەراتیێ دا بریبە سەر، ژ وان کەسان بوو کو باوەرناما زانستی ژ زانا مەلا حسێن کورێ ئەحمەد سپیندارى (١٣٨٣مش/١٩٦٣ز مریبە) وەرگرتیبە[١٤٠].

٨٧. **خواندنگەها مزگەفتا کەمەکا،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤەیە، خواندنگەهەکا کەڤنا ب ناڤ و دەنگ بوو، حەجی مەلا عیسا کەمەکی پێشنڤێژی لێ کریبە و دەرس ب هەروە ژ بۆ ریبا خودێ لێ گۆتینە، کەسەکێ هێژا و مەرد و خودێ ترس بوو، یێ دەستهەل بوو د فیقهێ شافعی دا و هەمی دەرگەهێن وێ ژ بەر کربوون، دەوروبەرێن سالا (١٩٢٨ز) ل کەمەکا وەغەرا داویێ کریبە[١٤١].

٨٨. **خواندنگەها مزگەفتا بێسفکا ژێری،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە[١٤٢].

٨٩. **خواندنگەها مزگەفتا کەڤلەسنێ،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ، مەلا تاها باپیرێ زانایێن دێرگژنیکێ ل وێرێ ئاکنجی بوو[١٤٣].

٩٠. **خواندنگەها مزگەفتا سەیداڤا،** گوندەکێ ناحیا مانگێشێ یە، ب زانستی یا ب ناڤ و دەنگ بوو[١٤٤].

٩١. **خواندنگەها مزگەفتا بێسکێ،** گوندەکە

سەر ب ناحیا زاویتە ڤە، نوری ئەفەندی ئاڤاکرییە و دەرس لێ گۆتینە[١٤٥].

**٩٢. خواندنگەها مزگەفتا کۆرەمارکێ،** گوندەکە سەر ب عەشیرەتا دۆسکی، خواندنگەها وێ هەتا سالا (١٩٣٦ز)ێ یا ئاڤەدانبوو، و مەلا خەلیل کورێ سلێمان یێ ناڤدار ب (مشەختی) مەلاتی لێ کرییە و دەرس لێ گۆتینە[١٤٦].

**٩٣. خواندنگەها مزگەفتا بادێ،** گوندەکە سەر ب عەشیرەتا دۆسکییاڤە ل ناحیا زاویتە ، خواندنگەهەکا ئاڤەدانبوو ب قوتابی و سەیدایێن خودان شیان، ژ وانان مەلا محەمەد بادی، و کور و نەڤیێن وی ژی ل سەر رێبازا وی چووینە و زانا ژێ دەرکەتینە، ژ مامۆستایێن وێ خواندنگەهێ مەلا تاهر خروەیێ مزووری (١٣٠٠مش/١٨٨٣ز مرییە)، زانایەکێ ژیر و ژێهاتی بوو، شەهرەزایی د هەمی زانستان دا هەبوو و دهێتە هەژمارتن ژ زانایێن ب ناڤ و دەنگ ل دەڤەرا بەهدینان، هەڤچەرخێ مەلا عەبدولهادیێ ئەتریشی. ژ ناڤ و دەنگترین شاگردێن وی شێخ تاهایێ مایی و حەجی محەمەد دهۆکی و مەلا یاسین بریفکانی و یێن دی[١٤٧].

**٩٤. خواندنگەها مزگەفتا بەرۆشکا سەعدوونی،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە، گەلەك فەقیان قەستدکرێ و زانایێن زیرەك وانە لێ گۆتینە، ژ وانان شێخ محەمەد بەرۆشکی کو ناڤێ وی ب باشی دەمێ خۆ دا چوو بوو و یێ ژیر بوو د چارەسەرکرنا دکێشێن ئالۆزیای دا، هەر وەسان وی تێبینی و پەراوێزێن خۆ ل سەر وان دەستنڤیسێن ل نك وی، یان یێن د پەرتووکخانا وی و میراتگرێن وی دا هاتینەدیتن هەبوون، ل سالا (١٣٢٤مش/١٩٠٥)ێ وەغەرا داویێ کرییە.

برایێ وی شێخ ئەحمەدێ بەرۆشکی (١٣٢٤مش/١٩٠٥ز مرییە) کو ب تنێ چەند هەیڤەك دناڤبەرا وەغەرکرنا هەردو برا دا هەبوو، ئەو ژی یێ هێژا بوو و کار د زانستێن شەریعێ دا دکر. باوەرناما زانستی ژ زانا مەلا عەبدولهادی کورێ ئەحمەد کورێ زانا مەلا یەحیایێ مزووری وەرگرتیبە. ژ تەقوا و ترسا وی ژ خودێ هەتا مری وی پێ خۆشتر بوو مینا چاکێن بەری خۆ بەرێ دەستێ خۆ ب خۆت، ژبلی کارێ دەرسگۆتنێ و پێشنڤێژی ژی دکر . دیسان برایێ وان شێخ عەبدولا بەرۆشکی (١٣٣٩مش/١٩٢٠ز مرییە) ئەو ژی کەسەکێ خودێ پەرێس و رابەر بوو، پشتی مرنا هەردو برایێن وی، وی هەتا مرنێ بارگرانییا وانە گۆتنێ هەلگرتیبە. ئەو بنیاتێ مالباتا خۆ دگەهیننە بریفکییان و بابێ وان شێخ محەمەد حەسەن ژ بریفکان هاتییە و ل بەرۆشکێ ئاکنجی بوویە و رڤشتێ وی ماینە ل وێرێ و ناڤێ وی گوندی هەلگرتینە[١٤٨].

**٩٥. خواندنگەها مزگەفتا ناڤشکێ،** گوندەکە سەر ب ناحیا دۆسکی سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە، مەلا هاشم حسێن نعمان ناڤشکی (١٩٦٣ز مرییە) وانە لێ گۆتینە و ئەو بابێ مەلا عیسمەتی یە کو ل سالا (١٣٣٦مش/١٩٤٤ز)ێ ژ دایکبوویە و دەست د نڤیسینێ دا هەیە و نها خەتیبە ل مزگەفتا مفتی ل دهۆکێ[١٤٩].

**٩٦. خواندنگەها مزگەفتا پیرومەرا،** گوندەکە دکەڤتە پشا گەلیێ دهۆکێ[١٥٠].

**٩٧. خواندنگەها مزگەفتا گەلناسکێ،** گوندەکە سەر ب ناحیا مانگێشێ[١٥١].

**٩٨. خواندنگەها مزگەفتا باجلۆرێ،** گوندەکە ل پشت دهۆکێ ل هنداڤ سکرێ دهۆکێ یە، نێزیکە ببیتە تاخەکێ باژێرێ و جهەکێ گرنگە ژ لایێ ئابووری ڤە و گەلەك گەشتیار ژ دهۆکێ و دەرڤەی باژێری بۆ خۆشیێ قەست دکەنێ[١٥٢].

**٩٩. خواندنگەها مزگەفتا دێرکێ،** گوندەکە نێزیکی بێسفکێ و سەر ب ناحیا دۆسکی ڤەیە ل پارێزگەها دهۆکێ، نها یا خرابە و کاڤلێ وێ هەتا نها ژی ل سەر گرێن دەڤەرا دۆسکییا یێ دیارە[١٥٣].

**١٠٠. خواندنگەها مزگەفتا دەرگەلا شێخا،** گوندەکە سەر ب عەشیرەتا دۆسکییا ل پارێزگەها دهۆکێ، خواندنگەها وێ یا ئاڤەدانبوو و گەلەك حەزژێکەرێن زانستی قەست دکرنێ، ژ سەیدایێن دەرس لێ گۆتین شێخ مەعرۆف کورێ شێخ

ئیسماعیلێ دەرگەلی (١٣٢٤مش/١٩٠٦ز مربیە) ژ بنەمالا شێخێن بریفكانە، بۆ زانینێ قەستا گەلەك جهان كریە و باوەرناما زانستی ژ زانا مەلا عەبدولهادی ئەترۆشی (١٣٠٩مش/١٨١٩ز مربیە) نەڤیێ مەلا یەحیایێ مزووری ل خواندنگەها ئەترۆش وەرگرتییە. ڤەگەریایە گوندێ خۆ و مامۆستایی كریە و ناڤ و دەنگێن وی چووبوون و كەسەكێ ژیر و خودان شیان بوو و قوتابییان ژ هەمی لایان قەست دكرێ، هەتا وەغەرا داویێ كری یێ ل سەر كارێ خۆ بەردەوام بوو و قەت ژ ڤی گوندی نەدەركەت پشتی ڤەگەریایە گوندی ژ وەغەرا خۆ یا زانستی[١٥٤].

**١٠١. خواندنگەها مزگەفتا بەندا،** گوندەكە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە، مەلا ئەحمەدێ بەندی (١٩٢٥ز مربیە) ژ سەیدایێن ڤێ خواندنگەهێ بوو، ژ بۆ زانستێ ل دەڤەرێ گەریایە، ژ ئەتریشێ ناڤەندا زانستێ و رووگەها قوتابییان دەسپێكرییە، ژ بەركو زانایێن ب هێز لێ هەبوون و خەلكێ وێ یێ ڤەكری بوو بۆ وان كەسێن بەرێ خۆ دانێ. پاشی چوو سپیندارێ ل دەڤەرا بەرواری ژێریا و ل وێرێ باوەرناما زانستی وەرگرتییە، دووڤدا هاتییە گوندێ بەندا و دەست هاڤێتە پێشنڤێژیێ و مامۆستایێ هەتا وەغەرا داویێ كری.

دیسان ژ مامۆستایێن ڤێ خواندنگەهێ مەلا محەمەد ئەحمەد محەمەد (١٨٩٠- ١٩٨٢ز)، كو ل بامەرنێ بووی و ل بەندا ئاكنجی بووی، وەكی هەڤالێن خۆ ل پێشیێ ل خواندنێ و زانستێ گەریایە و بەردەوام ل سەر دەستێ مامۆستایێن تەكیا بامەرنێ خواندییە، هەتا ل سەر دەستێ وان دەرچووی و باوەرناما مەلاتیێ سەر دەستێ مەلا نەجمەددین كورێ مەلا ئەحمەد بابك (١٣٦٩مش/١٩٤٩ز مربیە) وەرگرتییە، دەمەكی پێشنڤێژی و مامۆستایێ ل گوندێ زێوێ كرییە، پاشی هەر زوی چوو گوندێ بەندا و ل وێرێ ئاكنجی بوو و هەتا وەغەرا داویێ ما ل ڤی گوندی و ناسناڤێ ڤی گوندی چوو سەر وی و ل وێرێ هەر یێ مژویلی پێشنڤێژیێ و دەرسگۆتنێ ڤەبوو[١٥٥].

**١٠٢.خواندنگەها مزگەفتا كوڤلی،** گوندەكێ سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە یە[١٥٦].

**١٠٣. خواندنگەها مزگەفتا كوریمێ،** گوندەكێ سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە یە[١٥٧].

**١٠٤. خواندنگەها مزگەفتا زێوكا كەندالا،** گوندەكێ سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە یە[١٥٨].

**١٠٥. خواندنگەها مزگەفتا تلاكرۆ،** گوندەكێ سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤە یە[١٥٩].

**١٠٦. خواندنگەها مزگەفتا بێزیهێ،** ئەڤ گوندە سەر ب زاخۆ ڤەیە، ژ سەیدایێن وێ مەلا ئەحمەد بێزهی[١٦٠].

**١٠٧.خواندنگەها مزگەفتا جوسەڤێ،** گوندەكە سەر ب قەزا زاخۆڤە[١٦١].

**١٠٨. خواندنگەها مزگەفتا تویان،** گوندەكە سەر ب قەزا زاخۆڤە[١٦٢].

**١٠٩.خواندنگەها مزگەفتا باكرمان،** گوندەكە دكەڤیتە دەڤەرا سنووریا ئیبراهیم خەلیل ل زاخۆ، شێخ عەبدولجەبار سەیدایێ وێ بوو[١٦٣].

**١١٠.خواندنگەها مزگەفتا نۆردینا،** گوندەكە سەر ب قەزا زاخۆڤە[١٦٤].

**١١١.خواندنگەها مزگەفتا سپیندارۆكێ،** گوندەكە سەر ب قەزا زاخۆڤە[١٦٥].

**١١٢.خواندنگەها مزگەفتا بۆصەلێ،** گوندەكە سەر ب عەشیرەتا سندیان ل قەزا زاخۆ[١٦٦].

**١١٣.خواندنگەها مزگەفتا بەهنوین،** گوندەكە سەر ب ناحیا دەركارێ ل قەزا زاخۆ[١٦٧].

**١١٤.خواندنگەها مزگەفتا بەهنوینا گولیبان،** گوندەكە سەر ب ناحیا باتووفا ل قەزا زاخۆ[١٦٨].

**١١٥.خواندنگەها مزگەفتا كەشانێ،** گوندەكێ عەشیرەتا سندیانە ل قەزا زاخۆ، خواندنگەها وێ یا كەڤن بوو و ب زانستی و زانایان یا ئاڤەدانبوو و زانا ئەبو عومەر ئەحمەد كورێ حاجب كورێ محەمەد كەشانیێ سندی یێ ناسیار ب ئیبن ئەلحاجب ئەلكەشانی (٣٩١مش/١٠٠٠ز) ناسناڤێ ڤی گوندی هەلگرتییە، ژ ئەبی بەكر ئیسماعیلی ڤەگێرایە[١٦٩].

**١١٦. خواندنگەها مزگەفتا رویسێ،** ژ گوندێن عەشیرەتا گولیبانە و سەر ب ناحیا گولیبان ڤەیە ل

قەزا زاخۆ[170].

**١١٧. خواندنگەها مزگەفتا شلۆنێ**، ژ گوندێن عەشیرەتا گولییانە ل قەزا زاخۆ[171].

**١١٨.خواندنگەها مزگەفتا بانك و باندور**، ژ گوندێن عەشیرەتا گولییانە ل قەزا زاخۆ[172].

**١١٩.خواندنگەها مزگەفتا باڤیا**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا باتێلێ، ژ وان کەسێن مامۆستایی لێ کرین مەلا یوسف سلێڤانەیی (١٩١٨ز مرییە)، زانایەکێ هێژا و خودێ ترس و راست و نەرم بوو، ل پێشییێ وانە ل گوندێ (ترشك) دگۆتن، پاشی ل گوندێ خۆ بخۆ[173].

**١٢٠.خواندنگەها مزگەفتا بێتاسێ**، گوندەکە سەر ب قەزا زاخۆڤە[174].

**١٢١.خواندنگەها مزگەفتا بالقۆسێ**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ[175].

**١٢٢. خواندنگەها مزگەفتا قازیان**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ[176].

**١٢٣. خواندنگەها مزگەفتا قەرقێر**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا باتێلێ. ژ سەیدایێن وێ شێخ حەسەن ئاسهی، ژ دایکبوویێ سالا (١٩٥٠) ێ، زانایەکێ ناڤدارێ دەستویردای بوو، ل دەسپێکا سالێن شێستان ژ سەدسالییا بووری چووینە باژێرێ مووسل و ل وێرێ هەتا سالێن نۆتان دەرس دگۆتنە شاگردێن زانستێن شەرعی ل (جامع الحکمە)[177].

**١٢٤.خواندنگەها مزگەفتا زاوا**، گوندەکە سەر ب ناحیا فەیدیێ ل باشووری باژێرێ دهۆکێ ل بەر چیایێ زاوا و ب تنێ چەند کیلومەترێن کێم ژ باژێرێ دهۆکێ دوورە[178].

**١٢٥. خواندنگەها مزگەفتا کاشێ**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ، نها دەڤەرەکا پیشەسازییە و پڕی کارخانەنە، خواندنگەهەکا کەڤن لێ هەبوو، ژ مامۆستایێن وێ مەلا موسا برایێ مەلا عیسای کو ناڤێ هەردووان د پەرتووکا (فضلاء بهدینان)دا هاتییە، کەسەکێ خودێ ترس بوو و دەستێ خۆ ژ دنیایێ کێشابوو و هەر یێ مژویلی پێشنڤێژیێ و دەرس دانێ بوو[179].

**١٢٦.خواندنگەها مزگەفتا گرەشی**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ[180].

**١٢٧. خواندنگەها مزگەفتا گەرمافکێ**، گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە ل ناحیا سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ[181].

**١٢٨.خواندنگەها مزگەفتا (جامعا) مەزن ل ئاکرێ**، ل ناڤەندا باژێرێ ئاکرێ یە، خواندنگەها جامعا ئاکرێ ژ لایێ سولتان حسێن وەلی کورێ سولتان حەسەنی ئەوێ پشتی مرنا بابێ خۆ ل سالا (٩٤٠مش/١٥٣٤ز) دەستەلات گرتییەدەست هاتییە ئاڤاکرن، زانایەکێ شارەزا بوو و رێزا زانست و زانایان دگرت و هاریکارییا وان دکر، ئەڤ خواندنگەهە ل تاخێ (سەرای) ل ناڤەندا باژێرێ هاتییە ئاڤاکرن، و نێزیکی (١٣٠) پەرتووکان دانابوونە پەرتووکخانا وێ، خواندنگەهەکا دەولەمەند بوو ب زانایێن ناڤدار کو دەرس لێ دگۆتن و رووگەها حەزژێکەرێن زانستی بوو و زانایێن ژێهاتی ژێ دەرکەتینە کو ب باشی ناڤێ وان چوویە. هەر وەسان مزگەفتێن دی یێن ئاکرێ ژی مینا وان زانا ژێ دەرکەتینە. ژ وان کەسێن ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرکەتین هیبەتوللا ئەفەندی (١٣٧٥مش/١٩٥٥ز مرییە)، کورێ محەمەد سەعید کورێ عەبدولرەحمان کورێ مەلا یەحیایێ مزووری، زانایەکێ مەزن و ژێهاتی و چاك بوو، ب فەرمی وەکی مفتی بۆ قەزا ئاکرێ و مامۆستایێ وەقفێ ل جامعا مەزن هاتبوو دامەزراندن، پاشی مامۆستا و ل دویڤدا نوینەرێ قەزا ئاکرێ، پاش بۆ ئەندامێ جڤاتا ماقوولان ل بەغدا هەتا وەغەرا داویێ کری و ل ئاکرێ هاتییە ڤەشارتن.

دیسان ژ دەرچوویێن ڤێ خواندنگەهێ مەلا خالدی نەهری، و مەلا ئەحمەد ئەفەندی کورێ مەلا عەبدولخالقێ ئاکرەیی (١٣٧٧مش/١٩٥٨ز مرییە)، مەزنترین زانا بوو، دەرس ل بارزان و ئامێدیێ و گوندێ

سپینداریێ ل دەڤەرا بەرواری ژێرییا گۆتینە، داویێ و ژ بەر وان سالۆخەتێن هەین ل زاخۆ وەکی پێشنڤێژ و سەیدا ل مزگەفتا (جامعا) زاخۆ ئاکنجی بوو، زانایەکێ ژێهاتی و ب سەبر و ماقویل بوو، گەلەکێ شارەزابوو د دەرکرنا هەلسەنگاندن و چارەسەرکرنا ئاریشێن زانستی دا، هەڤسەنگییەك دئێخستە دناڤبەرا زانستی و سونەتێ دا، ژمارەیەکا نە کێم ژ زانایان ل بەر دەستێ وی باوەرنامە وەرگرتینە[182].

**١٢٩. خواندنگەها مزگەفتا بجێل،** ناحیەکە سەر ب ئاکرێ ڤە، پەرتووکخانا وێ نێزیکی (٩٠) پەرتووکان لێ هەبوون[183].

**١٣٠. خواندنگەها مزگەفتا بەردەرەش،** قەزایەکە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە و خواندنگەها وێ مینا هەمی مزگەفتێن کوردستانێ یا ڤالا نەبوو ژ مامۆستا و فەقییان[184].

**١٣١. خواندنگەها مزگەفتا باشقال،** گوندەکێ عەشیرەتا سۆرچیانە و نێزیکە دێ بیتە تاخەکێ باژێرێ ئاکرێ[185].

**١٣٢. خواندنگەها مزگەفتا شۆش،** گوندەکێ قەزا ئاکرێ یە، خواندنگەها وێ یا ب ناڤ و دەنگ بوو و سەیدایێن هێژا وانە لێ دگۆتن و ژ هەمی جهان فەقییان بەرێ خۆ دانێ، و شێخێن شۆشێ ب ناڤ و دەنگ بوون، زانا و هۆزانڤان و پێشنڤێژ و خوتبەخوین و سەیدا بوون، ل ڤێ خواندنگەها بچویك کو زانایێن مەزن ژێ دەرکەتینە مینا شێخ یونس کورێ شێخ زەنونێ شۆشی کو وەکی ل سەر گۆڕێ وی هاتییە نڤیسین ل سالا (١١٨١مش مرییە)، دیسان شێخ عەبدوللایێ شۆشی کو برایێ شێخ یونسی بوو و پشتی مرنا وی شوینا وی گرتبوو و ئەو ژی پشتی مرنا وی ب تەنشت برایێ وی یونسی ڤە ل شۆشێ ڤەشارتینە. زانا شێخ عەبدوللەتیف کورێ شێخ یونس یێ ناسیار ب (سەیفی) هۆزانڤانەکێ ب ناڤ و دەنگ بوو و وەکی ل سەر گۆڕێ وی هاتییە نڤیسین نێزیکی سالا (١١٩٥مش مرییە) و دیوانەکا شعری یا هەی، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی ل سالا (١٩٩٩)ێ رابوویە ب بەلاڤکرن و تویژاندنا وێ، دیسان شێخ محەمەد تاهر شۆشی زانایەکێ ژیر و خودێ ترس و هۆزانڤان بوو، دیوانەکا شعری ب زمانێ کوردی ب ناڤێ (گولستان) ل سەر ژیاننامێ پێغەمبەرێ مەزن و چوار خەلیفێن راشدی هەیە و نها هاتییە چاپکرن، شێخ محەمەد تاهر شۆشی هێژ جحێل ژ ئەگەرێ نەخۆشیەکا دۆمدرێژ وەغەرا داویێ ل سالا (١٣٨٢مش/١٩٦٢ز) کرییە[186].

**١٣٣. خواندنگەها مزگەفتا شەرمنێ،** گوندەکێ نێزیکی شۆشێ یە ل قەزا ئاکرێ و ناڤێ وی دگەل یێ شۆشێ دهێت (شۆش و شەرمنا)[187].

**١٣٤. خواندنگەها مزگەفتا دینارتە،** ناحیا دینارتە نها سەر ب ئاکرێ ڤەیە[188].

**١٣٥. خواندنگەها مزگەفتا نەهلێ،** نەهلە نها سەر ب ئاکرێ ڤەیە[189].

**١٣٦. خواندنگەها مزگەفتا کادان،** ژ گوندێن دەڤەرا زێبار ناحیا دینارتە[190].

**١٣٧. خواندنگەها مزگەفتا هەرنێ،** ژ گوندێن دەڤەرا زێبار ناحیا دینارتە، خواندنگەها وێ یا ب ناڤ و دەنگ بوو و گەلەك سەیدایان وانە لێ گۆتینە، مینا زانا و هۆزانڤانێ بەرنیاس (خالد هەرنی) یێ ناڤدار ب (خالد زێباری) ژێ دەرکەتینە، هۆزانێن وی د نازك و جوان بوون[191].

**١٣٨. خواندنگەها مزگەفتا رەشاڤا،** گوندەکێ ناحیا دێرەلۆکێ یە، خواندنگەها وێ بنەمالەکا زانایێن ئایینی بخۆڤە دگرت، زانا ژێ دەرکەتینە و دەرس ل خواندنگەهێن ئامێدیێ و جهێن دی گۆتینە، ژ وانان مەلا محەمەد کورێ هاشم رەشاڤایی (١٩١٥-١٩٩٢ز)، پشتی ژ خواندنگەهـ قوبەهان دەرچووی وەکی پێشنڤێژ و خەتیب ل گوندێ رەشاڤا هاتبوو دامەزراندن. فەقییان ژ هەمی جهان قەستا ڤێ خواندنگەهێ دکرن و وی ب باشترین شێوە دەرس دگۆتنێ و ل دوڤ شەریعەتا ئیسلامی ب ئەرکێ خۆ رادبوو[192].

**١٣٩. خواندنگەها مزگەفتا گوهەرزێ،** گوندەکێ ناحیا دێرەلۆکێ یە، و هێشتا شوینوارێن وێ مزگەفتێ دیارن، هەر چەندە رووبەرێ وێ یێ بچویك بوو؛ لێ ب

دو نهۆم بوو، ئەڤ مزگەفتە ب رۆلێ خۆ یێ ئایینی و مێژوویی رابوویە، لێ نەهاتییە زانین کا کەنگی ئەڤ خواندنگەهە هاتییە ئاڤاکرن، لێ وەسان دهێتە پێشبینیکرن کو ل دەسپێکا سەدسالیا نۆزدێ هاتبیتە ئاڤاکرن، بەلگە ژی ل سەر وێ چەندێ ئەوە دەمێ مەلا ئەحمەد کورێ تەمەر کورێ رەشید (١٨٨٨- ١٩٧٥ز) یێ ناڤدار ب مەلا ئەحمەد گوهەرزی ل سالا (١٩٤٠ز)ێ هاتییە وێرێ مزگەفت یا ئاڤابوو، ل وێرێ پشتی گەشتەکا زانستییا درێژ دناڤ خواندنگەهێن مزگەفتادا و وەرگرتنا باوەرناما مەلاتیێ ل وێرێ ئاکنجی بوو. ل گوندێ گوهەرزێ ژی قوتابییان قەستکرێ و (٦٦) قوتابی لێ هەبوون و ئەو ب کارێ وانەگۆتنێ و بەلاڤکرنا زانستی ب باشترین شێوە رادبوو[١٩٣].

**١٤٠. خواندنگەها مزگەفتا گێرکاش،** ئەڤ گوندە ل باشوورێ رۆژهەلاتا ئامێدیێ یە، هۆزانڤان مەلا مەنسوور گرگاشی خەلکێ ڤی گوندی بوو و ژ ناسناڤێ وی دیارە کو وی دەستورناما پێشنڤێژیێ و وانە گۆتنێ وەرگرتییە و باراپتر ل سەدسالیا هەژدێ ژیایە، و مەلا پیر و مەلا محەمەد کورێ ئەحمەد یێ ناسیار ب (کوولە ١٢٤٢- ١٢٨٤مش)، و ژ نڤیسینێن وی (الزیج والهیئە)[١٩٤].

**١٤١. خواندنگەها مزگەفتا پێدە،** گوندەکێ عەشیرەتا مزووریانە، د دەمێ خۆدا سەر ب ناحیا ئەتریش و نها سەر ب زاویتەیە، مێژوویا خواندنگەها وی ڤەدگەرێتەڤە سەدسالیا هەژدێ، ژ مامۆستایێن ڤێ خواندنگەهێ زانا مەلا محەمەدێ بەرۆشکی (١٩٠٥ مریە) ژ سەیدایێن ڤێ خواندنگەهێ بوو، و مەلا ئەحمەد گوهەرزی ژ وان قوتابییان بوو یێن ل سەر دەستێ وی ل پێدە خواندین[١٩٥].

**١٤٢. خواندنگەها مزگەفتا عمرانێ (عمرانیە)،** عمرانییە گوندەك و کەلایەکا مەزنە دکەڤیتە رۆژهەلاتا باژێرێ مووسل ل نێزیکی شۆشێ، گەلەك پەرتووك گەهشتینە مە کو دیرۆکا وان ڤەدگەرێتەڤە سەدسالیا هەڤدێ زایینی ل ڤێ خواندنگەهێ هاتینەڤە نڤیسین، ژوان پەرتووکا (التصریح بمضمون التوضیح) یا دانەرێ وێ خالد ئەزهەری، کو محەمەد عەبدولباقی دۆسکی ل سالا (١٦٢٧ز) نڤیسییەڤە، و پەرتووکا (تصریف العزی) یا دانەرێ وێ سەعدەددین تەفتازانی، هەڤالەکێ دانەری ل سالا (١٦٢٧ز) نڤیسییەڤە، دیسان پەرتووکا (شرح المیبدی) یا میر حسێنی ل سەر پەرتووکا (هدایە الحکمة في المنطق)، مەلا سلێمان زێباری ل سالا (١٦٤٠ز) نڤیسییەڤە[١٩٦].

**١٤٣. خواندنگەها مزگەفتا شابانیێ (شەعبانیێ)،** گوندێ شابانیێ باکوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا باتۆڤا، گوندەکێ دیرۆکی یە و ب کەلا خۆ یا ب ناڤ و دەنگە کو مێژوویا ڤەدگەرێتەڤە سەدسالیا هەشتێ زایینی[١٩٧]، گەلەك پەرتووك ل خواندنگەها ڤێ مزگەفتێ هاتینەڤە نڤیسین، ژوانان دەستنڤیسەك یا حسێن کورێ خالدێ سندی کو ل سالا (١٥٩١ز) هاتییە نڤیسین، پێکهاتییە ژ چەند رویدانێن مێژوویی کو پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینان ڤە هەین، و دانەیەك ژ ڤێ دەستنڤیسێ دپەرتووکخانا (ئەحمەد بەغدادی) ل بەغدا هەیە، هەر وەسان پەرتووکا (فرائض منهج الطلاب) یا دانەرێ وێ زەکەریا کورێ محەمەد ئەلئەنساری، ئیسماعیل صالح و محەمەد خۆشناو ل سالا (١٦١٠ز) نڤیسیەڤە[١٩٨].

**١٤٤- خواندنگەها مزگەفتا گەلی رمان،** گوندەکێ نێزیکی بریفکانە ب دو کیلومەتران، شێخ ئەحمەد گەلی رمانی، کو ئێك ژ نەڤیێن شێخ شەمسەددین ئەخلاتی یە ئەڤ خواندنگەهە دگەل تەکیا وێ ل سەدسالیا هەژدێ دامەزراندییە، شێخ ئەحمەد ل سالا (١٧٣٧ز) چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ. پەرتووکا (ملخص علم الهیئە) یا دانەرێ وێ مەحمود کورێ محەمەد جەخمینی دڤێ خواندنگەهێ ڤە ژ لایێ عەبدولقەهار ل سالا (١٧٧٨ز)ی هاتییەڤە نڤیسین[١٩٩].

هەروەسان هەروەکی مە بەری نها ئاماژە پێکری گوندەك نەبوو ل کوردستانێ ژ پێنج مالان پێکهاتبیت مزگەفتەك لێ نەبیت و ل وێ مزگەفتێ

ژی خواندنگەهەك لێ نەبیت، ب ڤی رەنگی ناڤێ چەندین خواندنگەهێن مزگەفتان ل گوندێن دیتر د ژێدەراندا هاتییە و ل ڤێری هند دەلیڤە نەبوو یان هند ژێدەر ل بەردەست نەبوون ئاماژە پێ بكەین.

## خواندنگەهـ و پەیمانگەهێن ئیسلامی یێن حكۆمەتێ ل پارێزگەها دهۆكێ

هەژیە بێژین سەرەرای ڤەكرنا خواندنگەهێن رەسمی ژ داویا سەدسالیا نوزدێڤە و زێدەبوونا وانا ل دەڤەرێ هەتا سالێن شێستان ژ سەدسالیا چوویی خواندنگەهێن مزگەفتان كت كتە ل ڤی باژێری و گوندێ هەنێ د بەلاڤەبوون و رۆلێ خۆ دگێرا، لێ سال ل دووڤ سالێ ژی سەنگا وان رۆل و باندۆرا وان بەرامبەری خواندنگەهێن رەسمی ل كێمیێ ددا و جهێ خۆ بۆ وان د هێلا و خەلكی ژ ئەنجامێ پێدڤیاتیێن هەڤچەرخ پتر بەرێ خۆ ددا وان خواندنگەهان.

هندی پەیوەندی ب خواندنگەهێن ئیسلامی یێن رەسمیڤە هەی هەتا سالا ١٩٦٣ێ چ ژ وان خواندنگەهان ل سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆكێ نەبوون و ل ناڤ مزگەفتان زانستێن ئایینی دهاتنەخواندن و ب خواندنگەهێن ئایینیێن گرێدای مزگەفتان (المدارس الدينيه الملحقه بالمساجد) دهاتنەناڤكرن، پاشتر ئەڤ خواندنگەهە ب رەنگەكی رەسمی دگەل وەزارەتا ئەوقافێ هاتنەگرێدان و ل دهۆكێ وان قوتابییان ل مزگەفتا مەزنا دهۆكێ دخواند. ل سالا ١٩٦٤ێ بریارا ب حكومەتكرنا ڤان خواندنگەهان دەركەت و هەتا سالا ١٩٧٢ێ ڤان خواندنگەهان د ١٢ ڤۆناغاندا خواندنا خۆ ب داوی دئینا، ل سالا ١٩٦٧ێ سیستەمەكێ نوو هاتەدانان بۆ وەرگرتنا ڤان قوتابییان ل پەیمانگەهێن ئیسلامی، ل سالێن پاشتر سالێن خواندنێ هاتنەكێمكرن بۆ هەشت ڤۆناغان و سالا ١٩٧٢- ١٩٧٣ێ كرنە شەش ڤۆناغ و مانە ل سەر ڤی سیستەمی.

ل سالا ١٩٦٦ێ ناڤێ خواندنگەهێن ئایینی یێن گرێدایی مزگەفتان ب پەیمانگەها ئیسلامی (المعهد الإسلامي) هاتەگۆهارتن و مەلا محەمەدێ ئاكرەیی رێڤەبەرێ وێ بوو، ل سالا ١٩٧١ جهێ وێ ژ مزگەفتا مەزنا دهۆكێ هاتەڤەگوهاستن بۆ ئاڤاهیێ كەڤنێ رێڤەبەریا ئەوقافێ، ل سالا ١٩٧٣ دەمكی هاتەڤەگوهاستن بۆ مزگەفتا حەجی مستەفای پاشتر ئاڤاهییەكێ نوو بۆ دواناڤنجیا خواندنێن ئیسلامی ل نێزیكی دێرا كلدانان هاتەئاڤاكرن و ل وێرێ دەست ب خواندنا خۆ كرن، د ڤێ ڤۆناغێدا مەلا عەلیێ بەرۆشكی رێڤەبەرێ وێ بوو، دەمێ ل سالا ١٩٧٤ێ مەلا عەلی گەهشتییە رێزێن شۆرشا كوردستانێ مەلا حسێن یونس ماریونسی ب وی ئەركی هاتەراسپاردن و پاشتر بوو رێڤەبەرێ پەیمانگەهێ ، بەلێ ژ بەركو زۆربەیا قوتابیێن ڤێ خواندنگەهێ د وێ سالێدا گەهشتنە شۆرشێ بریارا گرتنا دەرگەهێ پەیمانگەهێ ژ ئالیێ سەرۆكاتیا دیوانا ئەوقافێ ل دهۆكێ هاتەدان، پشتی دانوستاندنا د ناڤبەرا شاندێ پارێزگەها دهۆكێ و سەرۆكاتیا ناڤبری بریارا بەردەوامیدانا خواندنێ ل پەیمانگەهێ هاتەدان، بەلێ ل سالا ١٩٧٦ێ پەیمانگەها ئیسلامی ل دهۆكێ ب دواناڤنجیا خواندنێن ئیسلامی هاتەگۆهارتن.

ئەڤ دواناڤنجییە هەتا سالا ٢٠٠٧ێ ب رەنگەكی بێ سەروبەر یا بەردەوام بوو هەتا ل سالا ٢٠٠٧ ب ئێكجاری هاتییەگرتن و دوا رێڤەبەرێ وێ شەوكەت سالح سندوری بوو. بەلێ ئەڤە نە داویا ڤی رەنگێ خواندنێ بوو ل دەڤەرێ بەلكی ل سالا ١٩٩٢ێ و ژ بەر پێدڤیاتیا رێڤەبەریا ئەوقافێ ب دەرچوویێن خواندنگەهێن ئایینی وەزارەتا ئەوقاف و كاروبارێن ئایینی ل هەرێما كوردستانێ بریارا ڤەكرنا دوا ناڤنجیا ئەوقافا ئیسلامی ل دهۆكێ (ثانوية الاوقاف الإسلامية في دهوك) دا، ئەڤ خواندنگەهە یا بەردەوام بوو هەتا ل رۆژا ٢٠١٥/٤/٥ جڤاتا وەزیرێن هەرێما كوردستانێ بریاردای هەموو خواندنگەهـ و پەیمانگەهێن سەر ب وەزارەتا ئەوقافێ ڤە بێنەڤەگوهاستن بۆسەر وەزارەتا خواندنێن بلند و وەزارەتا پەروەردێڤە[٢٠٠].

## خواندنگەها مزگەفتا مەلا عەلییێ گەرماڤی

ئەڤ خواندنگەهـە ب هزر و رەنجا مەلا عەلی کورێ مەلا نەبی سالحێ گەرماڤی (ل سالا ٢٠٠٦ مریە) ل سالا ١٩٩٦ێ ب سەیدایا تنێ وی ب خۆ و تنێ دو قوتابییان هاتەدامەزراندن، ئەو دو قوتابییە کو بەرێ بنیاتیێ ڤێ خواندنگەهێ بوون ژ بەر نە بوونا جهـ رێبان ژیار و ڤەمانا وان ل مالا مەلا عەلی ب خۆ بوون و وەك ئێك ژ ئەندامێن مالباتێ سەرەدەری دگەلدا دهاتەکرن.

پشتی دەمەکی مەلا محەمەدێ کوڤلی ژی بۆ دەرسدانێ گەهشتە مەلا عەلی و خەلکەکی ژی دەستێ هاریکاریێ بۆ خواندنگەهێ درێژ کر کو جهێ وێ ل مزگەفتا گرێ باسێ بوو و رۆژ ل دووڤ رۆژێ ئەڤ خواندنگەهـە بەرەڤ پێش چوو و هژمارا سەیدا و قوتابیێن وێ ل زێدەهیێ دا و نە تنێ ژدەڤەرێ بەلکی ژ گەلەك جهێن کوردستانێڤە قوتابییان بەرێ خۆ دا ڤێ خواندنگەهێ و مەرجێن تایبەت ل دووڤ بنەمایێن زانستی و شەرعی بۆ وەرگرتنا قوتابییان ل ڤێ خواندنگەهێ هاتنەدان کو هەتا نها یا بەردەوامە د پێکەهاندنا قوتابییاندا، هەژیە بێژین دەرچوویێن ڤێ خواندنگەهێ بووینە پێشنڤێژ و خوتبەخوین ل مزگەفتان و گەلەکان ژی پشکداری د ئەزموونێن شەشێ ئامادەییدا کریە ب ئەنجامێن باش دەرچووینە و ل کولیژ و پشکێن خواندنێن ئیسلامی ل زانکۆیێن هەرێمێ هاتینە وەرگرتن[٢٠١]، هەتا نڤیسینا ڤێ ڤەکۆلینێ ل دەستپێکا ٢٠١٦ ئەڤ خاندنکەهە بەردەوام بوویە ل سەر ئەرکێ خوو.

## کولیژا شەریعێ وخواندنێن ئیسلامی

ئەڤ کولیژە یەکەمین کولیژا ئەکادیمیە ل پارێزگەها دهۆکێ دهێتەڤەکرن ئەو ژی ب رەنج و خەمخوریا مەلا حەمدی عەبدولمەجیدێ سەلەفی (٢٠١٢/١١/٤ێ مریە) بوو و ل ١٩٩٢/٢/٣ێ هاتیەڤەکرن و قوتابی ژ هەردو رەگەزان وەردگرتن و جهێ وێ ژی ل ئاڤاهیێ دواناڤنجیا خواندنێن ئیسلامی یێ بەرامبەری رێڤەبەریا گشتیا پەروەردا دهۆکێ بوو. ل ١٩٩٤/٧/٢٦ێ ڤێ کولیژێ پێشکەتنەك بەرچاڤ ب خۆڤە دیت دەمێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ باوەری پێ ئینای و باوەرنامێن وێ ژی ب پلا بەکالوریوس هەلسەنگاندین و دەمێ خواندنێ ب چوار سالان دەسنیشانکری و باوەرناما بەکالوریس شەریعەتی و خواندنێن ئیسلامیدا دایە دەرچوویێن وێ. ڤێ کولیژێ دو پشك پشکا شەریعەتێ و پشکا خواندنێن ئیسلامی ب خۆڤە دگرتن. سال ل دووڤ سالێ هژمارا قوتابیێن وێ ل زێدەهیێ دا هەتا ل سالا ١٩٩٨ێ گەهشتیە ٢٧٩ قوتابییان و ١٠ مامۆستایان ژ هەلگرێن باوەرناما دکتورا و ماجستێرێ وانە ل ڤێ کولیژێ ددان.

زێدەباری ڤان دو پشکان کولیژێ پەرتووکخانەکا دەولەمەند ب نێزیکی ٤٤١٥ پەرتووکان و چاپخانەکا بچووك و چەند ئاڤاهیەك وەك مولك هەبوون، پشتی ئەڤ کولیژە ل سالا ٢٠٠٥ێ هاتیەگرتن، پەرتووکخانا وێ دانە دگەل کولیژا پەروەردێ یا زانکۆیا دهۆکێ و چاپخانە و ئاڤاهیێن وێ ژی بوونە مولکێ زانکۆیا دهۆکێ. پشتی ڤەگوهاستنا کولیژا پەروەردێ بۆ زاخۆ پەرتووکخانە ژی هاتەڤەگوهاستن بۆ زاخۆ و پاشتر کەتنە سەر میلاکێ زانکۆیا زاخۆ[٢٠٢].

## پەیمانگەها ئیسلامی ل دهۆکێ

ئەڤ پەیمانگەهە یەك ژ دەسکەفتێن شۆرشا ئەیلوولێ بوو، ل دەسپێکێ ناڤێ وێ پەیمانگەها ئیمام و خوتبەخوینان (معهد الائمة و الخطباء) بوو، هەتا ١٩٧٥ێ یا ئاڤابوو، پشتی پلانا جەزائیرێ یا ٦ ئادارا ١٩٧٥ خویندن ل ڤێ پەیمانگەهێ ما راوەستای و دگەلدا ژی هەوا ڤەگوهاستن و کاڤلکرنا گوندێن دەڤەرێ دەسپێکر و د ڤێ هەوێدا ب یەکجاری خواندنا ئایینی ل مزگەفتان نەما، سەروبەر ب ڤی رەنگی ما هەتا سالا ١٩٨٩- ١٩٩٠ێ حکۆمەتا عیراقێ بریارا ڤەکرنا چوار خواندنگەهێن ئایینی ل پارێزگەهێن کوردستانێ دای، بەلێ ژ بەر دەسپێکرنا شەرێ کوێتێ

ئەڤ بریارە نەهاتەبجهئینان.

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ حکۆمەتا هەرێمێ رێك ل بەر خواندنێن ئایینی خوشکر، بەلێ جهەك نەبوو دەرچوویێن دوا ناڤنجییێن ئایینی لێ بێنەوەرگرتن، ئەگەر کتەك هەبا ژی ئاستەنگ ل بەر وان دەرچوویان دهاتنەدانان، ئەو بوو ل سالا خواندنێ ١٩٩٦- ١٩٩٧ێ ب بریارا کابینا سێ یا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ (پەیمانگەها پێشنڤێژ و خوتبەخوینان) بۆ وەرگرتنا دەرچوویێن دوا ناڤنجییێن ئیسلامی هاتەدامەزراندن، پاشتر ناڤێ وێ بۆ پەیمانگەها زانستێن ئیسلامی هاتەگوهارتن و بوو دو پشك پشکا پێشنڤێژ و خوتبەخوینان و پشکا پەروەردێ.

هەتا نها ١٢ خول ژ ڤێ پەیمانگەهێ دەرچووینە، ل سالا ٢٠١٤- ٢٠١٥ێ ٤١٠ قوتابی هەمبێزکرینە، پشکا پەروەردێ کو یا تایبەتە ب کچان ٣١٣ قوتابینە و پشکا پێشنڤێژ وخوتبەخوینان ٩٧ قوتابینە. هەر د ڤی واریدا ل سالا (٢٠٠٩- ٢٠١٠)ێ پشکەکا پەیمانگەها زانستێن ئیسلامی یا ئێڤاریان یا هەولێرێ ل دهۆکێ هاتییەڤەکرن و ئەڤ پشکە دانێ ئێڤاری د ئاڤاهیێ پەیمانگەها زانستێن ئیسلامی ڤە دەوامێ دکەت[٢٠٣].

# ژێدەر و پەراوێز

١. خطط المقريزي:ج٢/٢٤٦

٢. دراسات في تاريخ التربية عند المسلمين: ص٤٠

٣. بنێرە: محمد بن عبدالله الجلي(مەلای گەورە) وجهوده العلمية:ص٣٧ - ٣٨.

٤. الدكتور محمود عبدالمولى في القسم الدراسي لكتاب آداب المعلمين، لمحمد بن سحنون: ص٦٢ - ٧٥.

٥. الاستيعاب في معرفة الأصحاب:ج٢/٦٣١ ضمن ترجمة سفيان بن وهب(١٠٠٨).وينظر: أسد الغابة:ج٢/٤٨٠ ضمن ترجمة رقم(٢١١٨) وينظر: تاريخ مدينة دمشق:ج٢١/٣٥٨ ضمن ترجمة رقم(٢٥٩٠).

٦. علماء ومدارس أربيل: زبير بلال،الموصل ـ مطبعة زهراء الحديثة، ص١٦.

٧. الإمداد شرح منظومة الإسناد:ج٦٠/٦ ـ ٦١. وعلماء قدموا إلى الموصل من الكرد ومن كردستان:ص١٨ و١٩.

٨. پەیڤەکا فارسی یە، ئانکو سوتن- شەوتین، ئەو کەسێ ب ڤی ناڤی دهێتەناڤکرن ئانکو کەسەکی سۆتی بۆ زانستان و بزاڤێ بۆ دکەت و رێزێ ل سەیدایێن خۆ دگریت و خودان رەوشتە. بنێرە: عەزیزی مەلا رەش، خوێندنی ئایینی لە دەشتی هەولێر، کۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٠ سالی ١٩٨٦، بپ ١١٤

٩. مەرەم پێ پەرتووکا (الفوائد الضيائية في النحو) یا (ملا جامی)، ئەڤ پەرتووکە بەرنامێ خواندنێ یێ قوتابیان بوو، چ سەیدایەك نەبوو ژ بۆ دەرسگۆتنێ خۆ ژ ڤێ پەرتووکێ دوور بگریت و قوتابییەك نەبوو ڤێ پەرتووکێ نەخوینیت کو پووتەکا باش ددا نهێنیێن رێزمان (النحو)یا عەرەبی، بنێرە: الإمداد شرح منظومة الإسناد:ص٧٢. دانەیەك دەستڤیس ژ ڤێ ئەرتووکی ل جەم د. نوری بەشدارێ ڤێ ڤکۆلینێ هەیە.

١٠. علماء ومدارس أربيل: ص١٦.

١١. إسهام علماء كردستان في الثقافة الإسلامية:ص٦٨.

١٢. إسهام علماء كردستان في الثقافة الإسلامية:ص٢٢.

١٣. بنێرە: علماء ومدارس أربيل:ص١٧، والإمداد شرح منظومة الإسناد:ص٦٢، وعلماء قدموا الموصل من الكرد ومن كردستان:ص١٩.

١٤. بنێرە: إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية : ص ٢١.

١٥. محمد بن عبدالله الجلي(مەلای گەورە) وجهوده العلمية: ص٤٢- ٤٣ .

١٦. هەمان ژێدەر، بث ٢٨.

١٧. هەمان ژێدەر، بث ٣١- ٣٢.

# دیرۆکا پەروەردە و فێرکرنێ ل پارێزگەها دهۆکێ

موسەدەق تۆفی

## پەروەردە و فێرکرنا نوو ژ ستەنبۆلێ هەتا بەهدینان

گومان تێدا نینە کو دەسپێکا پەروەردە و فێرکرنێ ل هەر جهەکی و هەر دەمەکی بیت دەسپێکەك سادە و ئاسایی و ل دووڤ ئاستێ وی جهی و دەمی و جڤاکێ وی جهی بوویە و ئەڤ دەسپێکە ژی بەری هەر تشتەکی ل جهێن پەرستنێ ئانکو پەرستگەها بوویە، ئایین پالنەرێ سەرەکیێ دامەزراندنا ڤان جهان بوویە و ژ بەر ڤێ چەندێ ژی پرانییا گەل و نەتەوەیێن جیهانێ ژی پەرستگەهـ کرینە جهێ فێرکرنا خویندکاران و پەروەردەکرنا وان. دەمێ ڤان پەرستگەها تێرا خویندکاران نەدکرن ژوورەك یان چەند ژوورەك بۆ کریارا فێرکرنێ ل پەرستگەهێ زێدەدکرن و ب بۆرینا دەمی دبوونە رێزێن خواندنێ و خواندنگەهـ و کولێژێن سەردەمێ خۆ و بەرنامەیێن زانستیێن وی سەردەمی تێدا دخواندن[1].

دیتنەڤا نڤیسینێ ل نیڤا هزار سالییا چوارێ بەرێ زایینی ل وەلاتێ نێڤبەرا دو رووباران ب مەزنترین دەسکەفتێن زانستی و هزریێ مرۆڤێ وی سەردەمی دهێتە زانین، ڤێ چەندێ رێك خوشکر بۆ توومارکرنا شارەزاییێن مرۆڤی و ڤەگوهاستنا ڤان شارەزاییان ژ نفشەکی بۆ یێ دن، ئەڤە ژی هاندەر بوو بۆ کەشەپێدانا تێکەهشتنا مرۆڤی ل دور سرۆشتی و جڤاکی و خودێ مرۆڤی، سرۆشتی ئالوز و ب زەحمەتێ نڤیسینا بزماری یا د وی سەردەمیدا هاتییە دیتن ئەگەرێ دامەزراندنا دەزگەهێن دەسپێکی یێن فێرکرنێ بوون د دیرۆکا مرۆڤایەتییێدا ل وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران. بۆ یەکەمین جار د دیرۆکێدا ل سەر دەمێ سومەریان خواندنگەهـ هاتنە دامەزراندن و ب (ای-دبا) ئانکو (مالا دەپان) هاتنە ناڤکرن و خویندکارێن وی سەردەمی ژی ب (دومو ای- دبا) ئانکو (کورێ مالا دەپان) هاتنە ناڤکرن[2].

پشتی پەیدابوونا ئایینێ ئیسلامێ ل سەدسالییا شەشێ زایینی و بەلاڤبوونا ڤی ئایینی و دروستبوونا دەستەلاتدارێن ئایینێ ئیسلامێ ژ بەرکو ئایینێ ئیسلامێ د چەندین دەقێن خودا ژ ئایەتێن قورئانا پیروز و فەرمووودەیێن پێغەمبەری (س) داکوکی ل سەر زانست و فێرکرنێ کریە و مووسلمان هاندایـنە ب هەر رێکەکا هەبیت و ل هەر جهەکێ بیت خۆ فێری زانین و زانستان بکەن و ئەو کەسێ خەلکەکی فێردکەت ب باشترین کەس دایە نیاسین، خەلیفە و

میر و دەستەلاتدارێن مووسلمانان ژی گرنگییەكا پتر ب بەلاڤكرنا زانستان و فێركرنێ دایە، لەوما ژی هەر زوو جهێن فێركرنێ ل تەڤایی وەلاتێن مووسلمانان بەلاڤەبوون و ل دەسپێكێ ژی ئەڤ جهێن فێركرنێ ل ناڤ مزگەفتان بوون، وەك نموونە ل داویا سەدسالیا مشەختیا یەكەم هەردو مزگەفتێن كوفە و بەسرا مەلبەندێن گرنگێن بزاڤا زانستی بوون د وی چەرخیدا[٣].

ب دامەزراندنا دەولەتا عەباسی ئاستێ زانست و فێركرنێ گەهشتە ئاستێن هەرەبلندێن وی سەردەمی و پشتی كو بەغدا بوویە پایتەختێ دەولەتا عەباسی، عەباسییان دگەل دامەزراندنا دەولەتێ گرنگییەك مەزن ددا پێشڤەبرنا زانست و زانینان و خوشكرنا رێكان ل بەر بەلاڤبوونا وان. هەروەسان گرنگییەك تایبەت ددا زانایان و كەسێن زانا ژ باژێرێ مەدینێ و جهێن دیتر ئینانە بەغدا و جهێن هەژی ددانە وان. هەروەكی خەلیفێ عەباسی پویتە دایە زانستێن ئیسلامی و زانایان و ل سالا ١٦٠مش هژمارەك ژ زانایێن خەلكێ مەدینێ و جهێن دن ئینانە بەغدا و جهێن هەژی و نێزیكی خۆ داینە وان و وان ژی رۆلەك گرنگ د بەلاڤكرنا زانستێن قورئانێ و فەرموودەیان و سونەتێ و شەریعەتێ گێرای[٤].ب ڤێ چەندێ ل بەغدا و باژێرێن دن یێن مووسلمانان دەزگەهێن فێركرنێ یێن جودا جودا بەلاڤەبوون بەلێ هەتا سالا ٤٥٩مش جهێ سەرەكی و ئێكانەیێ ڤان دەزگەهێن فێركرنێ تنێ مزگەفت بوون[٥]. د ڤێ سالێدا یەكەمین خواندنگەها سەربەخۆ ل دەرڤەی مزگەفتێ ل بەغدا هاتەدامەزراندن.

هەژیە بێژین هندی پەیوەندی ب وەلاتێن مووسلمانانڤە هەی هزرا دامەزراندنا رەنگە خواندنگەهان یان جهێن تایبەت ب خواندنێ ل دەرڤەی مزگەفتێ هێژ كەڤنترە ژ ڤێ دیرۆكێ ل سەردەمێ خەلیفێ عەباسی هارون رەشید و كورێ وی (دار الحكمە) هەبوو چەندین رەنگێن زانستان لێ دهاتنە خواندن. ل نەخوشخانێن وی سەردەمی كو ب بیمارستان دهاتنە ناڤكرن زانستێن نوشداری و دەرمانسازی دهاتنەخواندن، بیمارستانا مەزن (بیمارستان الكبیر) یا باژێرێ دیمەشقێ ئەوا (الملك العادل) نورەدین مەحموودی دامەزراندی، هەروەسان بیمارستانا مەنسوری ل قاهیرە د ڤی واریدا یا ناڤدار بوو. زانكویا ئەزهەر یا مسرێ ئەوا ل سالا ٣٥٩مش دەست ب ئاڤاكرنا وێ هاتییەكرن و ل ٧ رەمەزانا ٣٦١مش(٩٧٢ز) هاتییەڤەكرن، ل پێشییا هندێ كو جهەكێ پەرستنێ یان مزگەفت بیت وەك جهەكێ فێركرنێ هاتبوو دامەزراندن[٦]. هەر د ڤێ قۆناغێدا و ل ڤێ مزگەفتێ دەمێ دیتین زەحمەتە مزگەفت خۆ ل بەر وێ چەندێ بگریت د یەك دەمدا جهێ نڤێژان و جهێ وانەگۆتنێ بیت، ژ بەر دەنگەدەنگا ژ دەرسگۆتنێ پەیدا دبوو، مزگەفت تنێ بۆ كریارا فێركرنێ هێلان و تنێ نڤێژا ئەینییان لێ دكرن. ژ بەركو ب كارەكێ راست نە د دیتن نڤێژ ل مزگەفتێ نەهێتەكرن و داكو خواندن و فێركرنێ ژ مەزگەفتان دەربێخن ب ناچاری (دار الحكمە) یان (دار العلم) ل سالا ٣٩٥مش ل قاهیرە دامەزراندن و ئەڤە ژی پێنگاڤا یەكەم بوو بۆ دامەزراندنا خواندنگەهان[٧].

ل رۆژهەلاتێ وەلاتێن ئیسلامی ژێ خواندنگەهان پێنگاڤێن بلەزتر ژ وەلاتێ مسرێ هاڤێتن و ل داویا سەدسالیا چوارێ و دەسپێكا سەد سالیا پێنجێ مشەختی هزرا ڤەكرنا خواندنگەهێن دەرڤەی مزگەفتان ب دروستی پێكەهشتبوو و ژێدەران ئاماژە ب چەند خواندنگەهێن ب ڤی رەنگی كریە[٨] هەژیە ل ڤێرێ بێژین هزرا ڤان خواندنگەهان بەری هەر تشتەكی بەرهەمێ شەرەنیخا هزریا ناڤبەرا مەزهەبێن ئیسلامی بوو د وی سەردەمیدا. ژ بەغدا ئەڤ رەنگە خواندنگەهە بەرەڤ باژێرێن دی یێن وەلاتێن مووسلمانان بەلاڤەبوون و گرنگترینێ وان خواندنگەها ل بەغدا د وی سەردەمیدا خواندنگەها موستەنسەریە بوو ئەوا ل سالا ٦٣١مش(١٢٢٢ز)ل سەردەمێ خەلیفێ عەباسی ئەلموستەنسەر بیللا هاتییەڤەكرن[٩]. ڤەكرنا ڤان رەنگە خواندنگەهان ب شێوازێ وانێ كارگێری و فێركرنێ جوداهییەك تەواو دگەل خواندنگەهێن مزگەفتان هەبوو. بەلێ

سەرەرای ڤەکرنا ڤان خواندنگەهان رۆلێ سەرەکیێ مزگەفتان د وارێ فێرکرنێدا ل جیهانا ئیسلامی هەتا سالێن داویێ یا بەردەوام بوو. بەلێ هەر دگەل مزگەفتان رەنگەکێ دی یێ دەزگەهێن پەروەردە و فێرکرنێ پەیدابببوو دگۆتنێ (الكتاب) کو ب کوردی دگۆتنێ حوجرە، ئەڤ حوجرەیە ب دەمەکێ درێژ بەری دامەزراندنا خواندنگەهێن سەربەخۆ هاتبوونە دامەزراندن و ل سەرانسەری وەلاتێن مووسلمانان د بەلاڤەبوون و مل ب ملێ خواندنگەهان و سازیێن دی ئەرکێ خۆ د وارێ فێرکرنێدا دگێرا و هەتا نها ژی ل هندەك دەڤەرێن هندەك وەلاتێن ئیسلامی ڤی ئەرکی د گێرن، حوجرە (الكتاب) جهێ سەرەکی بوو کو تێدا زارۆك فێری خواندنا قورئانێ و خواندن و نڤیسینێ و هندەك بابەتێن دی دبوون[١٠]. حوجرە (الكتاب) جهێ فێرکرنا زارۆکان جهەکێ سەربەخۆ یان ژوورەك ژ خانیەکی یان ژوورەکا برەخ مزگەفتێڤە یان دگەل مزگەفتێ بوو، ئەڤ جوداکرنە ژی ژ مزگەفتێ ژ بەر هندێ بوو کو فێرکرنا زارۆکان دناڤ مزگەفتێدا نە جهێ رازیبوونا خەلکەکی بوو، چنکو وان زارۆکان گرنگی ب مزگەفتێ و پاقژیا وێ نە ددا، ئەڤ حوجرەیە وەك دەزگەهێن تایبەت بوون، دەولەتێ چ رۆل د دامەزراندنا وێ و سەرپەرشتی و مەزاختیێ وێ دا نە دگێرا، بەلکی خەلکێ ب خۆ پشتەڤانی ل ڤی جهی دکرئەو ژی ب دانا کرێیا مامۆستای ب دراڤی یان ب کەرەستێن دی[١١].

شێوازێ فێرکرنێ ل ڤان حوجرەیان شێوازێ چەند جارکی دووبارەکرنا خواندنێ بوو، ئەو ژی ب دەنگێ بلند هەتا ژ بەر دکر، گەلەك جاران قوتابی سورەتێن قورئانێ ژ بەردکرن بێی کو پەیڤێن وێ ژ هەڤجوداکەت، پاشتر قوتابی د چوو د قۆناغا خواندنا بلەزدا کو د گۆتنێ رەوانکرن و بەردەوام دبوو هەتا قورئان ختم دکر، ئانکو خواندنا قورئانێ ب داوی دئینا[١٢].

جهەکێ دی یێ خواندنێ هەبوو ئەو ژی کوچکێن خەلیفە و میران بوون، وان ل دووڤ ئاراستەکرنا خۆ زارۆکێن خۆ فێردکرن و بەرنامێ خواندنێ بۆ دادنا و مامۆستا بۆ دەستنیشاندکرن، ئەو مامۆستایێن ل ڤان کوچکان زارۆك فێردکرن ب (المؤدب) دهاتنە ناڤکرن، هەتا ژ ژیێ زرکوریێ (الصبا) دەرباز دبوونە ئاستێ خەلەکێن خواندنێ ل مزگەفت و خواندنگەهان[١٣].

ئەم دکارین بێژین هەردو جهێن فێرکرنێ حوجرە و کوچکێن میر و خەلیفەیان قۆناغێن دەسپێکی یێن فێرکرنێ بوون و قوتابی ژ وێرێ بەرەف خەلەکێن خواندنێ ل مزگەفتان و خواندنگەهان دچوون.

رەنگەکێ دیێ فێرکرنێ ل جیهانا ئیسلامی هەبوو دگۆتنێ بەرۆك (الربط) و کوژی (الزاوية) ڤان جهان هەرچەندە پەیوەندییەکا تایبەت ب رێبازێن تەسەوفێ و شێخایەتیێ ڤە هەبوو، بەلێ ب رەنگەکێ گشتی ئەڤە نە تنێ جهێن خوداپەرستی و پرهێزکاریی(التقوى)بوون بەلکی هندەك زانایان ئەڤ جهە کربوونە جهێن نڤیسینێ و ڤەکۆلینان و دەرسگۆتنێ و دانا دەستووررێێن مەلایەتیێ و دەستووریێن زانستی[١٤].

هەروەکی ئاماژە پێ هاتییەکرن سەروبەرێ پەروەردە و فێرکرنێ ل جیهانا ئیسلامی ب ڤی رەنگی بوو، دەسپێکا فێرکرنا خواندن و نڤیسینێ ل مزگەفتان بوو، پاشتر حوجرە (الكتاب) وەك جهەکێ سەر ب مزگەفتێ، بەلێ ڤەدەر ژ حەرەمێ مزگەفتێ بۆ قۆناغا دەسپێکێ یا خواندنێ ئانکو قۆناغا فێرکرنا قورئانێ و خواندن و نڤیسینێ هاتبوونە تەرخانکرن و مزگەفت مان جهێن خواندنێن بلندتر یان خەلەکێن خواندنێ. د هەمان دەمدا زارۆکێن خەلیفە و میران ل کوچکێن خۆ ئەڤ قۆناغێن دەسپێکی دخواندن. ل سەد سالیا پێنجێ مشەختی یەکەمین خواندنگەها دەرڤەی مزگەفتێ ب دروستی ل سالا ٤٥٩مش هاتە دامەزراندن و ئەڤ خواندنگەهە ژ بەغداڤە بەرەف باژێرێن دی یێن جیهانا ئیسلامی بەلاڤەبوون. ئەڤ خواندنگەهە ژ ئالیێ وەزیرێ سەلجوقی(نظام الملك قوام الدين ابو على الحسين بن على بن اسحاق بن العباس الطوسى) وەزیرێ (الب ارسلان السلجوقي) و پشتی وی ژی وەزیرێ کوڕێ وی (ملك شاه)ی، ل سالا ٤٥٧مش دەست ب ئاڤاکرنا

ڤێ خواندنگەهێ كر و ل سالا ٤٥٩ ڤەكر و ب خواندنگەها نیزامیە (المدرسە النظامیە) ناڤكر. هەر ڤی وەزیری خواندنگەهەكا ب ڤی رەنگی ب ناڤێ (النظامیة)ل مووسل سالا ٤٨٥مش ڤەكر و گەلەك خواندنگەهێن ب ڤی رەنگی ل جهێن دی ژ وان ژی ل جزیرا بۆتان (جزیرە ابن عمر) ڤەكرن، خەلكەكێ دی ژی ب ڤەكرنا ڤان رەنگە خواندنگەهان چاڤ ل وی كرن[15]. ئەڤ خواندنگەهە یەك ژ دیارەدەیێن پێشكەتنا پەروەردەیی و زانستی بوون ل جیهانا ئیسلامی، خەلیفە و میر و ماقوولێن مووسلمانان بێی كو خۆ ب بەرفرهیێن ئەگەرێن پەیدابوونا ڤان خواندنگەهانڤە مژوول بكەن گەلەك گرنگی ب ئاڤاكرنا ڤان خواندنگەهان ددا، مەردانە دراڤ ژێرا دمەزاخت، ئەڤ خواندنگەهە پێكدهاتن ژ ژوورا خواندنێ، ژوورا مامۆستایان، پەرتووكخانە، ژوورێن ڤەمانا قوتابیێن هەژار و لێنانگەهـ[16].

هەژیە بێژین هندەك ژ ڤان خواندنگەهان ژ ئالیێ كارگێری و ئاڤاهی و مامۆستا و جۆرێن فێركرنێ و زانستێن لێ دهاتنە خواندن و رێخوشكرنێن بۆ مامۆستا و قوتابیان دهاتنە كرن گەهشتبوونە ئاستێن هەرە بلند وەك خواندنگەها ئەلموستەنسەریە ئەوا ل سالا ١٢٢٢ز هاتیە ڤەكرن[17].

پشتی داگیركرنا بەغدا ل شوباتا ١٢٥٨ز ژ ئالیێ لەشكەرێ هولاكوی ڤە، سەروبەرێ زانستی و فێركرنێ ل بەغدا و گەلەك وەلاتێن دن یێن مووسلمانان بەرەڤ لاوازیێ چوو، ئەڤ وەلاتە كەتنە بەر چەند شەر و هێرشێن داگیركرنێ وەك هێرشێن مەغولان و سەفەویان و ئۆسمانییان و دەستەلات ب ڤی رەنگی ما هەتا دەستەلاتێ دەڤەرێن رۆژهەلاتێ ناڤینێ نها كەتیە دەست دەولەتا ئوسمانی ئەوا ل سالا ١٢٩٩ز هاتیە دامەزراندن و هەتا سالا ١٩٢٣ دومكری.

پشتی دەستەلاتێ ڤێ دەولەتێ ب تەواوی سەقامگیر بووی و سیستەمێ پەروەردە و فێركرنێ سیستەمێ فێركرنێ هەمان سیستەمێ بەرێ بوو یێ ل مزگەفتان و حوجران و خواندنگەهێن ئایینی:

## - حوجرە (الكتاب- الكتاتیب)

ل سەرانسەری وەلاتێن ئیسلامی د بەلاڤەبوون، ئەوا هاریكار بۆ ڤێ چەندێ ل دەسپێكێ دەولەتا ئوسمانی كارێ فێركرنێ ب ئەركێ خۆ نە دزانی بەلكی ب ئەركێ خەلكی دزانی. خواندن ل ڤان جهان یا بێ بەرامبەر بوو، بەلێ سەمیانێن قوتابیان رەنگەكێ هاریكاریێ ددا مامۆستایان (سەیدایان- مەلایان) بەرامبەری فێركرنا زارۆكێن وان. ڤان حوجران ل دووڤ شێوازەكێ تایبەتێ پێكهاتی (د سەروبەرەكێ ساخلەمیێ خراب و خرابترین رێبازێن فێركرنێ دا) كارێ خۆ دكر، گازندە و نەرازیبوونا خەلكەكی دەولەت ناچاركر ب قانوونەكێ چاڤدێریا ڤان جهان بكەت.

## - خواندنگەهێن ئایینی:

بەردەوامیا وان خواندنگەهان بوون یێن د چەرخێن ناڤینێن ئیسلامیدا هاتینە ڤەكرن، سولتان و میر و والی و دەولەمەندان ب مەرەما دلسۆزیێ بۆ ئایینی ڤەدكرن و هاریكاریا وان دكر، ئەو بابەتێن تێدا دهاتنە خواندن وەسان نەبوون خودان دژیانا خۆیا رۆژانەدا مفای ژێ وەرگریت و نە ل ئاستێ سەردەمێ خۆ بوون، د سەردەمێن داویێ یێن ئوسمانیدا ئەڤ خواندنگەهە ژ هەموو زانستێن عەقلی دووركەتبوون و گرنگی ددا زانستێن نەقلی. ژ ئالیێ كارگێری و شیانانڤە د سەروبەرەكێ خرابدا بوون[18].

سەرەرای ڤی سەروبەری ڤان خواندنگەهان رۆلەكێ گرنگ د ژیانا وی سەردەمیدا هەبوو، ژ ئالیەكیڤە رۆلێ خۆ د بەلاڤكرنا بنەمایێن ئایینی و رەوشتێن ئیسلامیدا دگێرا، و ژ ئالیێ دیڤە تاكە ژێدەرێ دابینكرنا كەسێن زانا و ئەدیب و نڤیسەرو فەرمانبەران بۆ جڤاكێ وی سەردەمی[19].

هەروەكی دیار ئەڤ دەزگەهێن ئاماژە پێكری د وارێ فێركرنێدا هەمان ئارمانجێ دەولەتا ئوسمانی هەبوو، كو تاكە خەما دەولەتێ ئەو بوو خەلكەكی وەسان پەروەردە بكەن تنێ پێكیر و دلسۆزێن دەولەتێ

و سولتانی بن، ژ بەرکو دەولەتێ خۆ ب دەولەتەك ئایینی ددا نیاسین و زانایێ ئایینی جهەکێ دیارکری د جڤاکیدا و باندۆرا خۆ ل سەر ئاراستەکرنا دەستەلاتداریێ هەبوو لەوما ژی گرنگی ددا فێرکرنا ئایینی.[20]

ب ڤی رەنگی ب درێژیا چەندین چەرخان فێرکرن ل ڤان وەلاتان ل ژێر کاریگەریا سیاسەتا دەولەتا ئوسمانی بوو ئەو دەولەتا کاروبارێن پەروەردە و فێرکرنێ پشتگوهڤە هاڤێتین[21]. و ئەڤ سەروبەرە یێ بەردەوام بوو هەتا دەولەتا ئوسمانی دەست ب دامەزراندنا خواندنگەهێن نوو ل سەر شێوازێ ئەوروپی کری ئەو ژی بۆ دابینکرنا فەرمانبەران بۆ دەزگەهێن دەولەتێ[22]. ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی دەزگەهێن فێرکرنا ئایینی گرنگیا خۆ ژ دەستدا بوو و خەلکەکی ب کێمی بەرێ خۆ دایێ و کاریگەریا وان د جڤاکیدا ل کێمیێ ددا، سەرەرای ڤێ چەندێ ژی ئەڤ دەزگەهە مل ب ملێ خواندنگەهێن نوویێن رەسمی د بەردەوام بوون و ل دووڤ ئاماران ل جهەکێ وەك عیراقێ ل داویا سەردەمێ ئۆسمانییان ١٤٩ خواندنگەهێن ئایینی هەبوون[23]

## ڤەکرنا خواندنگەهێن نوو

بەری کو دەربارەی دەسپێکا ڤەکرنا خواندنگەهێن نوو یێن رەسمی یان ژی قۆناغا نوویا خواندنێ ل دەڤەرێ ب پەیڤین پێدڤیە خواندنگەهێن نوو بناسین. د پەسنا ڤان خواندنگەهاندا هاتییە گۆتن: ئەو خواندنگەهەنە ئەوێن ل سەر شێوازێ فێرکرنێ یێ ئەوروپی برێڤە دچن کو بەرنامەکێ خواندنێ یێ پێکهاتی ژ چەندین بابەتێن (المواد) خواندنێ و ئارمانجێ خواندنا وان دیار هەبیت، مامۆستایێن بەرهەڤکری و خودان شیان ب ئەرکێ گۆتنەڤا وان بابەتان رادبن، د خواندنگەهێن نوودا پەرتووکێن خواندنێ یێن بەرهەڤکری ل دووڤ بەرنامێن خواندنێ هەنە و ئەزموونێن رێك و پێك تێدا دهێنەکرن و خشتەیێن وانەیێن حەفتیانە هەنە[24].

هەروەسان د پەسنا خواندنگەهێن نوودا ئەوێن د سەردەمێ داویێ یێ دەولەتا ئوسمانیدا هاتینە ڤەکرن هاتییە گۆتن: ئەو خواندنگەهن ئەوێن دەولەتێ ل سەر شێوازێ خواندنگەهێن ئەوروپی دامەزراندین. ئەڤ خواندنگەهە ژ حوجرە و خواندنگەهێن ئیسلامی د جودانە ب وێ چەندێ کو زانست ل دووڤ بەرنامەکێ دیارکری دهاتنە گۆتن، مامۆستایێن بۆ ڤێ چەندێ هاتینە بەرهەڤکرن ئەڤ وانەیە دگۆتن، هەر زانستەکی ژی پەرتووکەکا تایبەت ب خۆ هەبوو، ئەڤە ژی ل دووڤ خشتەیەکێ هەفتیانەیێ وان بابەتان و ئەنجامدانا ئەزموونێن دەوری دهاتە ئەنجامدان[25].

بەری نها ئاماژە ب سەروبەرێ پەروەردە و فێرکرنێ ل سنوورێن دەولەتا ئوسمانی هاتەکرن، سەروبەر ب ڤی رەنگی یێ لاواز و پاشڤەمای بوو. بەلێ دەسپێکا درووستا فێرکرنا رەسمیا نوو دزڤریتەڤە ناڤبەرا سالێن١٧٩٣- ١٧٩٥ دەمێ سولتان سەلیمێ سیێ (١٧٨٩- ١٨٠٧) هندەك خواندنگەهێن لەشکەری دامەزراندنین، کو مامۆستایێن وان بیانی و پرانی فرەنسی بوون و زانستێن نوو تێدا دهاتنە گۆتن و زمانێ خواندنێ زمانێ فرەنسی بوو، مەرەما سولتانی ژ دامەزراندنا ڤان خواندنگەهان دامەزراندنا لەشکەرەکێ نوو بوو کو جهێ لەشکەرێ ئینکشاریێ * کەڤن بگریت ئەوێ بێ هێز بووی و بێ سەروبەر و تێکچووی مای[26].

بەلێ وەسان دیارە کریارێن ڤی سولتانی ژ وارێ لەشکەری دەرنەکەتینە و د سنوورەکێ چوارچوڤەکریدا بوون، لەوما ژی دەمێ ئاماژە ب دەسپێکا بزاڤا فێرکرنا نوو ل دەولەتا ئوسمانی دهێتەکرن ئاماژە ب دەسپێکا چارێکا یەکەما سەدسالیا نوزدێ وەك دەسپێکا بزاڤا پەروەردە و فێرکرنا نوو ل دەولەتا ئوسمانی دهێتەکرن، ب تایبەت دەمێ سولتان مەحموودێ دووێ ١٨٠٨- ١٨٣٩ز دەستەلات گرتیەدەست هندەك خواندنگەهێن دن یێن لەشکەرییێن نوو ب سەرپەرشتیا ئەفسەرێن ئەلمانی و نەمساوی بۆ فێرکرنا ئەفسەران ب گشت تایبەتمەندیێن وانڤە ڤەکرن و زمانێ سەرەکیێ خواندنێ ل ڤان خواندنگەهان زمانێ

تركی بوو. هەر ل سەردەمێ ڤی سولتانی هندەك شاند بۆ خواندنێن پراكتیكی هنارتنە ئەوروپا و دو خواندنگەهێن لەشكەرێن بلند بۆ نوشداریێ و ئەندازیاریێ هاتنەڤەكرن و بۆ یەكەمین جار د وارێ فێركرنا مەدەنیدا هندەك خواندنگەهێن سەرەتایی و دوا ناڤنجی ڤەكرن[٢٧].

ئەركێ نووكرنا وارێ فێركرنێ و گورانكاریێ د بنیاتێن فێركرنێدا ل دەولەتا ئوسمانی سەر ب (مجلس الامور النافعه)بوو ئەوا ل ١٨٣٨ راپۆرتەك بەلاڤكری و تێدا خواستی وەك بنیاتەكێ موكم بۆ پێشڤەبرنا وارێ فێركرنێ گرنگی ب فێركرنا سەرەتایی بێتەدان، بەلێ هەر زوو ئەڤ راپۆرتە پشتگوهڤە هاتە هاڤێتن ژ بەركو كەسایەتیێن ئایینی دژی هەر بزاڤەكا چاكسازیێ بوون د وارێ فێركرنێدا. لەوما ژی ڤێ جڤاتێ هەر زوو هزرەكا نوو بەرچاڤكر كو پێكهاتبوو ژ دامەزراندنا رەنگەكێ نوویێ خواندنێ كو قوناغا ناڤین بیت دناڤبەرا خواندنا حوجرەیان (الكتاتیب) و دەزگەهێن فێركرنا بلند یێن رەسمی كو ب خواندنگەهێن روشدیە (الرشدیه) هاتنە ناڤكرن، و دەسپێكا دامەزراندنا ڤان رەنگە خواندنگەهان دزڤریتەڤە سالا ١٨٣٨ی[٢٨] ئانكو دو سالێن داویێ ژ دەستەلاتداریا سولتان مەحموودێ دووێ.

هەژیە بێژین هندەك ژێدەرێن دی دامەزراندنا خواندنگەهێن روشدی دزڤرینەڤە سەردەمێ سولتان عەبدولمەجیدی ١٨٣٩- ١٨٦١ز پشتی ل سالا ١٩٣٩ی بەرنامێ چاكسازیێ ئەوێ ب (خط گلخانه) هاتیە ناڤكرن هاتیە راگەهاندن، ل دووڤ ژێدەرەكی ل سالا ١٨٤٧ی[٢٩] و ل دووڤ ژێدەرەكێ دی ل سالا ١٨٦٩ [٣٠] خواندنگەهێن روشدی هاتینە دامەزراندن. ژێدەرەكێ دی دبێژیت ل نیڤا سەد سالیا نوزدێ هژمارا خواندنگەهێن روشدی ژ شەش خواندنگەهان نە دبۆری و (٨٧٠) خویندكاران لێ دخواند.[٣١] ل دووڤ ڤێ چەندێ بیت ئەم دكارین بێژین نیڤا سەدساليا نوزدێ دەسپێكا ڤەكرنا خواندنگەهێن روشدی یە ل دەولەتا ئوسمانی ئانكو دەسپێكا چەسپاندنا سیستەمێ نوویێ خواندنێ یە د سنوورێن ڤێ ئیمپراتورێدا. هەژیە بێژین د وی سەردەمیدا ب زمانێ تركیا ئوسمانی پەیڤا (مكتب) بۆ خواندنگەهێن نوو ئانكو رەسمی دهاتە گوتن و پەیڤا (مدرسه) بۆ خواندنگەهێن ئەهلی و ئایینی دهاتە گوتن [٣٢]. هەروەسان خواندنگەهێن روشدی (مكاتب، المدارس الرشدیه) قوناغا ناڤبەرا حوجرەیان و ئامادەیان بوو، ئانكو ناڤنجیا نها بوو و پەیڤا (الرشدیه) ژ پەیڤا (الرشد) یا عەرەبی ئانكو پێگەهشتی هاتیە وەرگرتن، دەمێ خواندنێ ل ڤان خواندنگەهان پشتی خواندنا حوجرەیان سێ سال بوون، پاشتر بوونە سێ سال پشتی خواندنا سەرەتایی[٣٣].

پشتی كو سولتان عەبدولمەجیدی ل سالا ١٨٣٩ی دەستەلات گرتیەدەست، سەردەمێ وی ب سەردەمێ چاكسازیێن بەرفرەهـ و گرنگیدان ب نووكرنێ و مفا وەرگرتن ژ وەلاتێن رۆژئاڤا دهێتە نیاسین، د ئەنجامێ ڤێ چەندێدا ژی هەر ل سالا ١٨٣٩ی ئەوا دبێژنێ (خط گلخانه) كو پێكهاتی بوو ژ هندەك چاكسازیان د ناڤ ئیمبراتوریا ئوسمانیدا راگەهاند، كو ب چاكترین وان دەسكەفتیان د هێتە نیاسین یێن بزاڤا چاكسازیێ ل دەولەتا ئوسمانی د وی سەردەمیدا دەستڤە ئینایین[٣٤].

وارێ فێركرنێ پشكەك مەزن ژ گرنگی پێدانا چاكسازیخوازان هەبوو، پشتی (خط گلخانه) ل سالا ١٨٤٥دەولەتێ لیژنەك حەفت كەسی ژ ناڤدارترین كەسایەتیێن زانا و خۆدی شیان پێكئینا. ئەڤ لیژنەیە هاتە راسپاردن ب ڤەكولینا سەروبەرێ خواندنگەهان و بەرچاڤكرنا پێشنیازێن پێویست بۆ سەروبەركرنا وارێ فێركرنی و بەرفرەهكرن و بلندكرنا ئاستێ وێ و ل سالا ١٨٤٦ ڤێ لیژنێ راپۆرتا خۆ بلندكر كو بەرنامەكێ بەرفرەهـ و هەمەلایەنەیێ سەروبەرێ فێركرنێ ب خوڤە دگرت. هەر ڤێ لیژنێ پێشنیازكر دیوانا زانیاریێن گشتی (مكتب عمومی نظارتی) بێتە دامەزراندن و داكو سەرپەرشتیا وارێ فێركرنێ بكەت، هەروەسان پێشنیاز كر زانكۆیا ئوسمانی ب ناڤێ (دار الفنون) بێتە دامەزراندن[٣٥].

هەروەك ژێدەرەك ئاماژە پێ دکەت بەرنامێ ڤێ لیژنێ ل سالا ١٨٦٩ێ کەتە د وارێ پراکتیکیدا و د ڤێ سالێدا خواندنگەهێن روشدی (المکاتب الرشدية) و خواندنگەهێن تەکنیکی بۆ ئامادەکرنا فەرمانبەرێن مەدەنی و لەشکەری بۆ دەولەتێ هاتنە ڤەکرن.[٣٦]

بەلێ دهێتە زانین پشتی کو لیژنا ناڤبری ل سالا ١٨٤٦ راپۆرتا خۆ پێشکەشکری و پێشنیازێن خۆ بەرچاڤکرین، ل مەها تەباخا ١٨٤٦ێ کوچکا سولتانی (باب العالی) قانوونا چاکسازیا سیستەمێ فێرکرنێ ل دەولەتا ئۆسمانی راگەهاند و ل دووڤ ڤێ قانوونێ دەولەتێ سەرپەرشتییا کارێ فێرکرنێ ل شوونا زانایێن ئایینی گرتە دەست، ئەڤە ژی ب رێکا جڤاتا هەردەم یا زانیاریان (مجلس دائم للمعارف) ب سەرۆکاتییا وەزیرێ دەرڤە. ل دووڤ ڤێ قانوونێ فێرکرن ل هەموو قۆناغان یا بێ بەرامبەرە دڤێت مامۆستایێن خۆدی شیان ل شوونا زەلامێن ئایینی بۆ فێرکرنێ بێنە دامەزراندن. پشتی ڤێ ب سالەکێ ئانکو ل سالا ١٨٤٧ وەزارەتا زانیاریێن گشتی (نظارتي معارف عمومية) ل شوونا دیوانا زانیاریێن گشتی هاتە دامەزراندن[٣٧].

وەزارەتا زانیاریان ئەرکێ ئاڤاکرن و دامەزراندنا خواندنگەهێن نوو کو زانستێن هەڤچەرخ وەك ئەندازیاری، ژمێریاری، جوگرافیا، دیرۆك، ساخلەمی تێدا دهێنەخواندن و مامۆستایێن خۆدی شیان و بەرهەڤکری وانەیان (دەرسان) تێدا دبێژن ب خۆڤە گرت[٣٨].

ل سالا ١٨٥٦ێ سولتان عەبدولمەجیدی بەرنامەکێ دی یێ چاکسازیێ ب ناڤێ (خطی همایون) راگەهاند ل دووڤ ڤێ بەرنامەی پشتەڤانی ل بەرنامێ پێشتر یێ چاکسازیێ هاتییەکرن و باوەری ب هندێ ئینایە کو وەلات پێدڤی ب چاکسازیێ یە د گشت وارێن کارگێری و ئابووری و رەوشەنبیریدا، ل دووڤ ڤی بەرنامەی دڤێت قوتابیێن مووسلمان و نە مووسلمان یێن وەلاتێ ئۆسمانی ل خواندنگەهێن رەسمی بێنە وەرگرتن، هەروەسان ماف دایە نە مووسلمانان خواندنگەهێن تایبەت بۆ خۆ بەلێ ل ژێر سەرپەرشتییا جڤاتێن زانیاریێ ڤەکەن، کو ئەڤ جڤاتە ل ویلایەتان ب ئەندامەتییا مووسلمان و نە مووسلمانان دهێنە ڤەکرن[٣٩].

ل سالا ١٨٦١ گورانکاریێن بەرفرەهتر د وارێ پەروەردە و فێرکرنێدا رووادان، ئەڤ گورانکاریە نێزیکی سیستەمێ علمانی بوون، د ڤێ سالێدا کو سولتان عەبدولعەزیزی ١٨٦١- ١٨٧٦دەستەلات گرتیە دەست، لێژنێن تایبەت ل وەزارەتا زانیاریان بۆ پێشڤەبرنا وارێ فێرکرنێ و دەسپێکرنا خواندنا کچان هاتنە دانان و بریار ل سەر چەند پێرابوونەکێن دی ژ بۆ بەلاڤکرنا کریارا فێرکرنێ هاتنە دان. بەلێ ئاریشێن سیاسی لەشکەری و دارایی یێن د وی سەردەمیدا توشی دەولەتێ بووین رێك نەدا بۆ ڤەکرنا پتر ژ چەند خواندنگەهەکێن کێم، ب رەنگەکی ل نیڤا سەد سالییا نوزدێ هژمارا خواندنگەهێن روشدی ژ شەشان دەرباز نە دبوو و هژمارا قوتابیێن وان ژی تنێ ٧٨٠ خویندکار بوون، ئەڤە ژی هژمارەکا کێمە ئەگەر بەراورد بکەین دگەل وان بەرنامان یێن بۆ بەلاڤکرنا زانیاریان د وی سەردەمیدا هاتینە دانان.

ژ بەر هندێ دەستەلاتدارێن دەولەتێ رێك دا شاندێن مزگینی هێنەرێن جودا جودا خواندنگەهان ل ویلایەتان ڤەکەن. هەروەسان ل سالا ١٨٦٨ بریار ل سەر ڤەکرنا خواندنگەهەکا دواناڤنجی ل (غلطة سرای) ب ناڤێ لیسیە یان خواندنگەها سولتانی هاتەدان و دەرسێن وێ ب زمانێ فرەنسی بوون و زانستێن نوو د خواندن[٤٠].

ل ٢٠ ئیلونا ١٨٦٩ قانوونا زانیاریا گشتی (معارف عمومیه نظامنامة سي) هاتە راگەهاندن، ل دووڤ ڤێ قانوونێ سیستەمەکێ مەدەنیێ تێرو تەسەل بۆ فێرکرنا رەسمی یا راستەوخۆ یا سەر ب دەولەتێڤە هاتە دانان. د ڤێ قانوونێدا جڤاتا بلندا زانیاری و جڤاتێن زانیاری ل ویلایەتان هاتنە دامەزراندن، دەستەلاتێ وان ب سەرپەرشتییا جێبەجێکرنا فەرمان و رێنمایێن وەزارەتا زانیاری هاتە دیارکرن. هەروەسان ل دووڤ ڤێ قانوونێ سیستەمێ ئەزموونان و قۆناغێن خواندنێ

کو پێکهاتبوون ژ سەرەتایی (مکاتب الصبیان) دەمێ وان چوار سال بوون، ناڤنجی (مکاتب الرشدیه) دەمێ وان سێ سال بوون و قۆناغا ئامادەیی (المکاتب الاعدادیه) دەمێ وان چوار سال بوون. زێدەباری خواندنگەها سولتانی کو دەمێ وێ ١٢ سال بوون ژ وانا پێنج سال بۆ قۆناغا سەرەتایی، هەروەسان خواندنگەهێن پیشەیی و مامۆستایان و خواندنێن بلند. هەروەسان ڤێ قانوونێ چەند برگەیێن دی ب خۆڤە گرتبوون یێن پەیوەندی ب کاروبارێن خواندن و فێرکرن و خویندکار و مامۆستایان ڤە...هتد هەی [41].

هەژیە بێژین یاسا زانیارێن گشتی یا سالا ١٨٦٩ ب رەنگەکێ مەزن کەتبوو ژێر کاریگەریا سیستەمێ فێرکرنێ یێ فرەنسی، گرنگترین خالێن ڤێ کاریگەریێ ژی سەرپەرشتیا هەموو رەنگێن خواندنێ و دامەزراندنا جڤاتێن زانیاریێ بوون. یاسایێ فێرکرنا سەرەتایی یێ فرەنسی یێ سالا ١٨٣٣گرنگترین یاسایێن فرەنسی بوون یێن سیستەمێ فێرکرنا ئوسمانی پشتا خۆ پێ گەرمکری [42].

ژ برگەیێن یاسا زانیارێن گشتی یێن ٢٢ئیلونا ١٨٦٩ یێن پەیوەندی ب بابەتێ مەڤە هەی دامەزراندنا جڤاتێن زانیاریە ل ویلایەتان کو هاتبوونە راسپاردن ب ئەرکێ سەرپەرشتیا کریارا پەروەردە و فێرکرنێ ل ویلایەتێن سەر ب دەولەتا ئۆسمانیڤە، ئانکو ئەرکێ ڤەکرنا خواندنگەهان و دابینکرنا مامۆستایان و هەر تشتەکێ دی یێ پەیوەندی ب فێرکرنێ ڤە هەبیت د دەستێ ڤان جڤاتان دا بوو.

## دەسپێکا خواندنا فەرمی ل دەڤەرا بەهدینان

هەروەك د بەرپەرێن چوویدا دیار بووی سالێن دکەڤنە ناڤبەرا چارێکا دووێ و داویا چارێکا سێێ ژ سەدسالیا نوزدێ قۆناغا دەسپێك و پێشڤەچوونا کریارا ڤەکرنا خواندنگەهێن نوو و جۆراوجۆر و راگەهاندنا یاسایێن تایبەت ب وارێ پەروەردە و فێرکرنێ بوو ل دەولەتا ئۆسمانی، ب تایبەت ل پایتەختێ دەولەتێ ستەنبۆلێ و ژ وێرێ بەرەف باژێرێن دێ یێن ترکیا نها و ویلایەتێن دن ژ وان ژی ویلایەتێن بەغدا و مووسل بوو کو پاشتر دگەل ویلایەتا بەسرا عیراقا نها ژێ پێکهات. دەڤەرا ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت دەڤەرا بەهدینان ئانکو پارێزگەها دهۆکێ یا نها، وی دەمی پشکەك بوو ژ لیوا (سەنجەقا) مووسل یا سەر ب ویلایەتا مووسل، ڤێ ویلایەتێ ژی پەیوەندیەك راستەو خۆ دگەل ویلایەتا بەغدا هەبوو. لەوما ژی بۆ زانینا سەروبەرێ فێرکرنێ ل دەڤەرا بەهدینان دڤێت تشتەکی ژ وی سەروبەری ب گشتی ل هەردو ویلایەتان بزانین.

ل ڤێرێ پێدڤیە بێژین ڤەکرنا خواندنگەهێن رەسمی ل باشوورێ کوردستانێ کو سەردەمی پشکەك بوو ژ ویلایەتا مووسل ب چاڤ هندەك جهێن دن یێن سەر ب دەولەتا ئوسمانیڤە یا پاشکەتی، ئەڤە ژی ئەنجامێ هندێیە کو دەسکەفت و تشتێن نوو ل بەراهیێ ل پایتەختێ دەولەتا ئۆسمانی دهاتنە دیتن، پاشتر هێدی هێدی ئەو ژی ل دووڤ دووری و نێزیکیێ و باندۆرا هندەك کەسایەتییان دگەهشتنە ویلایەتان و دەڤەرێن دن یێن سەر ب ویلایەتان، هەروەك دیار گرنگیا ویلایەتێ ژی د ڤی واریدا رۆلێ خۆ هەبوو [43].

کریارا فێرکرنا رەسمی ل ویلایەتا بەغدا کو یەك ژ ویلایەتێن گرنگێن ئۆسمانی بوو ژ سەردەمێ والییەتیا مەدحەت پاشای ١٨٦٩- ١٨٧٢ ڤە ل بەغدا دەسپێدکەت، پێدڤییە بێتە گۆتن بەری کو مەدحەت پاشا ببیتە والیێ بەغدا هەر وی بزاڤێن مەزن ژ بۆ ئەنجامدانا چاکسازیان د ژیانا سیاسی و جڤاکیدا ل دەولەتا ئۆسمانی کرینە و ژ ئەنجامێ بزاڤێن وی دەستوورێ ئۆسمانی هاتییە راگەهاندن و ڤی دەستووری چەند برگەیەك دەربارەی پەروەردە و فێرکرنێ ب خۆڤە دگرتن. ل دووڤ مادێ ١٥ ژ ڤی دەستووری پەروەردە و فێرکرن مافێ هەر وەلاتییەکێ ئۆسمانییە ب مەرجەکی پێگیریێ ب یاسایان بکەت، مادێ ١٦ ژی هەموو خواندنگەهـ ئێخستینە ژێر سەرپەرشتیا دەولەتێ و دڤێت سیستەمێ وان یێ یەکگرتی بیت، ل دووڤ مادێ ١١٤ فێرکرنا سەرەتایی

پێدڤیە ل سەر هەمو کەسەکی ل دەولەتا ئۆسمانی و ل هەر جهەکی بیت(٤٤).

دەمێ مەدحەت پاشای دەستەلاتێ والیتیێ ل بەغدا گرتیە دەست هەرسێ ویلایەتێن مووسل و بەغدا و بەسرا د هەموو وارێن سیاسی و جڤاکی و رەوشەنبیریدا د سەروبەرەکێ ئالوز و خرابدا دژیان، چاکسازیێ ل بەغدا و وان ویلایەتان ل سەر دەستێ مەدحەت پاشای دەسپێکر و ڤێ چاکسازیێ گشت وارێن سیاسی، جڤاکی، کارگێری، پەروەردە و فێرکرنێ ڤەگرتن (٤٥).

کاریگەریێن چاکسازیێن بەری هنگی ل دەولەتا ئۆسمانی هاتینە ئەنجامدان هەتا سەردەمێ مەدحەت پاشای ب عیراقێ ڤە دیار نەبوون، ئەو ژ باشترین والیان بوو یێن دەولەتێ هنارتینە بەغدا، وی ب جێبەجێکرنا یاسا ویلایەتێن ئوسمانی یا سالا ١٨٦٤دەست ب چاکسازیان کر(٤٦).

ل پێشیا ڤان چاکسازیان ژی ڤەکرنا یەکەمین خواندنگەها روشدی یا لەشکەری بوو ل بەغدا ل سالا ١٨٦٩، ئەڤە پێنگاڤا یەکێ بوو بۆ بەرهەڤکرنا ئەفسەرێن عیراقی بۆ لەشکەری، دەرچوویێن حوجرەیان ل ڤێ خواندنگەهێ دهاتنە وەرگرتن، زمانێن ترکی و عەرەبی و فارسی و وانەیێن دیرۆک، جوگرافیا، ژمێریاری، ئایین و جوانیا خەتی دهاتنە خواندن و زۆربەی مامۆستایێن وێ ژی ئەفسەرێن ترك بوون. خواندن ل ڤێ خواندنگەهێ بێی بەرامبەر بوو، ئەفسەران ژی جهەکێ گرنگ د جڤاکیدا هەبوو، لەوما ژی خەلکێ عیراقێ ئارەزوویەکا زۆر ل سەر خواندنێ ل ڤێ خواندنگەهێ هەبوو(٤٧).

هەژیە بێژین هەروەك ل پایتەختێ دەولەتا ئۆسمانی ژی بەری خواندنگەهێن مەدەنی گرنگی ب خواندنگەهێن لەشکەری هاتیەدان، ل عیراقێ ژی خواندنگەهێن لەشکەری بەری یێن مەدەنی هاتینە ڤەکرن. خواندنگەها روشدی یا لەشکەری (یان ژی ناڤنجیا روشدی) یا بەغدا ئەوا ل سالا ١٨٦٩ هاتیە ڤەکرن یەکەمین خواندنگەها رەسمیا دەولەتێیە ل بەغدا هاتیە ڤەکرن. ژ ئەنجامێ ڤێ گرنگی دانا مەدحەت پاشای ب خواندنگەهێن روشدی یێن لەشکەری، خواندنگەها روشدی یا لەشکەری ل سلێمانیی ل سالا ١٨٧٠ هاتیەڤەکرن و هەروەسان ئامادەییەکا لەشکەری ل بەغدا هاتیە ڤەکرن(٤٨).

پێنگاڤا دووێ یا مەدحەت پاشای د وارێ فێرکرنێدا ڤەکرنا یەکەمین خواندنگەها روشدی یا مەدەنی بوو، ئەڤ خواندنگەهە ل ١٥ رەجەب ١٢٧٦مش (١٨٧٠)ز ل بەغدا هاتەڤەکرن، ب ڤێ چەندێ ژی پشتی ڤەکرنا خواندنگەهێن نوو ل ستەنبۆلێ ب ٣٠ سالان ئەڤ رەنگە خواندنگەهە ل بەغدا هاتینە ڤەکرن(٤٩). ژێدەرەکێ دی ب ڤەگوهاستن ژ رۆژناما (الزوراء)یا بەغدا هژمار ١٧رۆژا ٢٨ جمادی الاخر١٢٨٦مش بەرامبەری ٢٣ئەیلول ١٢٨٥رۆمی دیاردکەت خواندنگەها روشدی یا مەدەنی بەری یا لەشکەری ل بەغدا هاتیە دامەزراندن و ل دووڤ ئاگاداریا د رۆژناما ناڤبریدا هاتیە بەلاڤکرن دوا دەم بۆ وەرگرتنا قوتابییان ١٥ رەجەبا ١٢٨٦ئانكو ٢١ چریا دووێ ١٨٦٩بوویە و ڤەكۆلەر وەسان بۆ دچیت كو ڤێ خواندنگەهێ ل داویا چریا دووێ یان دەسپێكا كانوونا ئێكێ وێ سالێ دەرگەهێن خۆ ڤەكرینە. هەمان ڤەكۆلەر دیاردكەت كو خواندنگەها روشدی یا لەشكەری ل بەغدا ل دەسپێكا ١٨٧٠ هاتییە ڤەكرن، ئەو ژی وەك دەسپێك بۆ ڤەكرنا ئامادەییا لەشكەری ل بەغدا (٥٠).

ئەوا جهێ سەرنجراكێشانێ بە خواندنگەهێن روشدی ئانكو یێن ناڤنجی بەری یێن سەرەتایی هاتینە ڤەكرن هەروەكی پاشتر دێ دیار بیت، ئەڤە ژی ژ بەر وێ چەندێیە كو وی دەمی دەزگەهـ و فەرمانگەهێن دەولەتێ پێدڤی فەرمانبەران بوون، لەوما یەكسەر دەرچوویێن حوجرەیان ل خواندنگەهێن روشدی ئانكو ناڤنجییێن وی سەردەمی وەردگرتن كو هێژ خواندنگەهێن سەرەتایی نەهاتبوونە ڤەكرن(٥١).

ب مەرەما پێشڤەبرنا سەروبەرێ ئابووریێ عیراقێ و بەلاڤكرنا پێشەسازیان مەدحەت پاشای گرنگی دا خواندنا پیشەیی دایە و ل سالا ١٨٧١یەكەمین خواندنگەها پیشەیی ل بەغدا ڤەكر، ژ چەند

پشکەکان پێکهاتبوو و هەر پشکەکێ پیشەیەک لێ دهاتە خواندن و ب (مکتب النسیة) هاتبوو ناڤکرن[٥٢].

پشتی مەدحەت پاشای رەدیف پاشای د ناڤبەرا ١٨٧٢- ١٨٧٤یدا دەستەلاتێ والیتیێ گرتە دەست، ڤی والی ل سالا ١٨٧٣ یەکەمین خواندنگەها ئامادەیی ل بەغدا ڤەکر بەلێ سەروبەرێ خواندنا سەرەتایی و یا کچان چ گۆهرینێن باشتر نەکەتنێ[٥٣].

ژ دەسپێکا سالێن هەشتێیان ژ سەد ساليا نوزدێ سەروبەرێ پەروەردە و فێرکرنێ بەرەڤ باشتر دچوو، جڤاتا زانیاریان کو ل شوونا رێڤەبەریا پەروەردە یا ئەڤرۆ بوو ل سالا ١٨٨٤ ل هەردو ویلایەتێن مووسل و بەغدا هاتنە دامەزراندن ڤان جڤاتان راستەوخۆ پەیوەندی دگەل وەزارەتا زانیاریان ل ستەنبۆلێ هەبوو، پاشتر ژی ئەڤ جڤاتە ل هندەك لیوا و قەزایان هاتنە ڤەکرن. ب ڤێ چەندێ ژی رێك ل بەر پێشڤەچوونا فێرکرنێ پتر هاتنەڤەکرن، ل سالا ١٨٨٩ێ گرنگی ب ڤەکرنا خواندنگەهێن سەرەتایی ل ویلایەتا بەغدا هاتە دان، چوار خواندنگەهێن سەرتایی ل بەغدا دووڤرا چەندەك ل بەسرا هاتنە ڤەکرن[٥٤]. هەژیە ل ڤێرێ بێتە گۆتن هەرسێ کۆمێن کاسولیك( کلدان و سریان و ئەرمەن)ان ل سالا ١٨٧٨ خواندنگەهەك سەرەتایی ل بەغدا ڤەکربوو، دەمێ خواندنێ ل ڤێ خواندنگەهێ چوار سال بوون[٥٥].

ب ڤی رەنگی دەسپێکەك بۆ کریارا فێرکرنێ ب هەر سێ ڤۆناغێن سەرەتایی، روشدی (ناڤنجی) و ئامادەیی ڤە ل ویلایەتا بەغدا هاتەدانان. هندی پەیوەندی ب ویلایەتا مووسل ڤە هەی کو وی دەمی ژ لیوایێن (سەنجەقێن) مووسل و کەرکووك و سلێمانیێ پێن وی سەردەمی[٥٦] و پارێزگەهێن دهۆك، مووسل، هەولێر، کەرکووك و سلێمانیێ پێن نها پێکدهات.

ل دووڤ ژێدەرێن بەردەست یەکەمین خواندنگەها نوو ل مووسلێ ل سالا ١٨٤٠ ژ ئالیێ قەشەیێن دومونیکانڤە هاتیە ڤەکرن[٥٧]. ژێدەرەکێ دی دبێژیت خواندنگەها دومونیکان یا سەرەتایی ل مووسلێ سالا ١٨٥٤هاتیە دامەزراندن[٥٨]. هەتا سالا ١٨٧٤ل مووسلێ ١١خواندنگەهێن ب ڤی رەنگی و ل گوندێن مەسیحیان پێن دەوروبەرێن مووسلێ ژی ١٠ خواندنگەهێن ب ڤی رەنگی هەبوون. هەر ئەڤ ژێدەرە دبێژیت ل سالا ١٨٦١یەکەمین خواندنگەها سەرەتایی یا دەولەتێ ل نێزیکی دەڤەرا (باب لگش) ل مووسلێ هاتیە ڤەکرن و ئەڤ خواندنگەهە ژ رێزێن سەرەتایی و روشدی (ناڤنجی) پێکدهات، و ل سالا ١٨٩٠ خواندنگەها روشدی ژ یا سەرەتایی هاتیە جوداکرن، و ل سالا١٨٩٤ خواندنگەهەکا دی یا سەرتایی ل مووسلێ هاتیەڤەکرن، د هەمان سالێدا فەرمانگەها زانیاری (دائرە المعارف) ل مووسلێ هاتیەڤەکرن و ل سالا ١٨٩٥ێ خواندنگەها روشدی ب خواندنگەها دواناڤنجی(مکتب اعدادی ملکی) هاتیە گوهارتن[٥٩].

هندی پەیوەندی ب خواندنا پیشەیی ڤە هەی یەکەمین خواندنگەها پیشەیی (مدرسە صنائع موصل) ل سالا ١٨٧٢ و یەکەمین خواندنگەها مامۆستایان هەر ل مووسلێ سالا ١٩٠٠هاتینەڤەکرن[٦٠].

ب ڤێ چەندێ دبیت خواندنگەها سەرەتایی یا دەولەتێ ل مووسلێ ٢٨ سالان بەری بەغدا هاتیەڤەکرن، بەلێ خواندنگەها روشدی ٨ سالان بەری بەغدا هاتیەڤەکرن، بەلێ ژێدەرێ ئاماژە ب وێ چەندێ کری کو ل سالا ١٨٨٩چوار خواندنگەهێن سەرەتایی ل بەغدا هاتینەڤەکرن دبێژیت: د وی سەردەمیدا چ خواندنگەهێن سەرەتایی ل مووسلێ نەبوون بەلکی سێ خواندنگەهێن روشدی ل مووسلێ هەبوون کو رێزێن سەرەتایی ب خۆڤە دگرتن، هەمان ژێدەر د پەراوێزێدا دبێژیت: تنێ ژێدەرەکی ئاماژە ب وێ چەندێ کریە کو یەکەمین خواندنگەها سەرەتاییا نوو ل سالا ١٨٦١ل مووسلێ هاتیە دامەزراندن[٦١]. ب هەر رەنگەکێ هەبیت ئەڤ خواندنگەهە سەرتایی بیت یان روشدی، یا تێکەل (ژ سەرەتایی و ناڤنجی)ل سالا ١٨٦١ێ دبیتە سالا ڤەکرنا یەکەمین خواندنگەها نوو و رەسمی یا

دەولەتا ئوسمانی ل باژێرێ مووسلێ و سەرانسەری ویلایەتا مووسل یا ئۆسمانی. هەژیە بێژین د دو دەهکێن داویێ ژ سەدسالییا نوزدێ کریارا پەروەردە و فێرکرنێ و ڤەکرنا خواندنگەهان ژ بەر چەندین ئەگەران ب پێنگاڤێن کورت و لاواز بەرەف پێش دچوو، بۆ نموونە ل سالا ١٨٨٩ێ ل هەر سێ ویلایەتێن مووسل و بەغدا و بەسرا تنێ ١٥ خواندنگەهێن روشدی هەبوون و ٨٤٠ خویندکاران لێ دخواند و وان دەرچوویێن حوجرەیان بوون[١٢]. ل دووڤ ئامارێن سالا ١٩٠٠ێ بوونە ١٧ خواندنگەهێن روشدی ب ١٢١٨خویندکاران و دو خواندنگەهێن ئامادەیی ل مووسل و بەغدا ب ٤٤٨ قوتابیان[١٣]. و د ڤێ سالێدا سێ خواندنگەهێن مامۆستایان ل مووسل و بەغدا و بەسرا هاتنە ڤەکرن. پشتی سالا ١٩٠٠ کریارا پەروەردە و فێرکرنێ تنێ پێنج خواندنگەهێن روشدی ل بەغدا هەبوون، ل سالا ١٩٠٥ ئەڤ هژمارە گەهشتە ١٩ خواندنگەهان. هەر ب ڤی رەنگی ئەڤ هژمارە ژ ٩ خواندنگەهان ل ویلایەتا مووسل گەهشتە ١٤خواندنگەهان و ل بەسرا ژ ٦ ان گەهشتە ٧ خواندنگەهان[١٤].

هندێ پەیوەندێ ب لیوا و قەزایێن سەر ب ویلایەتا مووسل ڤە هەی ژێدەران ئاماژە ب وێ چەندێ کریە ل کەرکووکێ ل سالا ١٨٧٠، سلێمانیێ ١٨٧٥، هەولێرێ ١٨٧٥، و سەلاحیێ (کفری) ١٨٨٠خواندنگەهێن روشدی هاتینە ڤەکرن. وەسان دیارە ئەڤ خواندنگەهە خواندنگەهێن روشدی یێن لەشکەری بوون، چنکو هەمان ژێدەر دپەراوێزێدا دبێژیت: ل سالا ١٨٧٠ خواندنگەها روشدی یا مولکی (مەدەنی) ب هاریکاریا خەلکی ل باژێرێ کەرکووکێ هاتییە ڤەکرن[١٥]. هەروەسان د ژێدەرەکێ دیدا هاتییە کو ل سالا ١٨٧٠ ب هاریکاریا خەلکێ باژێری خواندنگەها روشدی یا مەدەنی ل کەرکووکێ هاتییە ڤەکرن و ل دووڤ رۆژناما (الزوراء) یا ٢٠ تیرمەها ١٨٧٠د وێ سالێدا هەشتێ قوتابی ل ڤێ خواندنگەهێ هاتینە وەرگرتن[١٦]. هەژیە ل ڤێرێ بێتە گۆتن ژێدەر ل سەر وێ چەندێ پێکهاتینە کو خواندنگەها روشدی یا لەشکەری ل سلێمانیێ ل سالا ١٨٧٠ سەردەمێ والیەتیا مەدحەت پاشای ل بەغدا هاتییە ڤەکرن نەك ل سالا ١٨٧٥وەك ژێدەرێ چوویی ئاماژە پێکری و تنێ ڤی ژێدەری ئاماژە ب ڤەکرناخواندنگەهێن روشدی لەشکەری بن یان مەدەنی ل باژێرێن ناڤبری د وان سالێن دیارکریدا کریە[١٧]. هەروەسان چ پێنەڤێت بێژین خواندنگەها روشدی یا سلێمانیێ خواندنگەها لەشکەری بوویە و ژێدەران ژی ئەڤ چەندە پشتراستکریە، هەروەسان ناڤداریا ڤێ خواندنگەهێ و کاریگەریا وێ و دەرچوویێن وێ د قۆناغێن پاشتردا ل ئاستەکینە مرۆڤ دکاریت بێژیت: ژ وان خواندنگەهێن ئاماژەپێکری تنێ ئەو خواندنگەهە هەبوویە و یێن دی نەبووینە یان ژی بریار پێ هاتییەدان و نەهاتینە ڤەکرن.

ب گومانڤە ژ سالناما ئۆسمانی یا سالا ١٨٧٣ (١٢٩٠)رۆمی هاتییە ڤەگوهاستن کو د ڤێ سالێدا چەند مەکتەب ل دەڤەرێن ژێری یێن باشوورێ کوردستانێ هەبوونە و هژمارا قوتابیێن وان ژی ب رەنگێ ژێری دیارکریە:

| مەکتەب | هژمارا قوتابیان |
|---|---|
| مەندەلی | ١٨ |
| هەولێر | ٣٩ |
| کەرکووك | ٢٥ |
| سلێمانیێ | ٣٨ |
| ئاکرێ | ٣٥ |
| رەواندز | ٣٠ |

بەلێ ڤەکۆلەر یێ دلنیا نینە کو ئەڤ خواندنگەهێن د سالنامێن ئۆسمانیدا ب مەکتەب هاتینە ناڤکرن خواندنگەهێن ئایینی بوونە یان خواندنگەهێن رەسمی بوونە، ژ بەرکو د سالنامێن ئۆسمانی ئەڤ دو رەنگە خواندنگەهە تێکەلی یەك کرینە، هەرچەندە ئۆسمانیان پەیڤا مەدرەسە بۆ خواندنگەهێن ئایینی و پەیڤا مەکتەب بۆ

خواندنگەهێن نوویێن رەسمی ب كارئینایە[68].

هەمان ژێدەر دبێژیت: ئۆسمانییان ل سالا ١٨٨٠ ل بەغدا و مووسل و كەركووك و سلێمانیێ خواندنگەهـ ڤەكرینە و ل باژێرێ كویێ ژی ڤەكریە بەلێ گەلەك پێڤە نەچوویە هاتییەگرتن. هەروەسان ئاماژە ب هندێ دكەت ل سالا ١٨٦٨ ئامادەییا مولكی ل باژێرێ سلێمانیێ هاتییەڤەكرن[69]. هەروەسان زۆربەی ژێدەر د وێ باوەریێدانە كو پشتی ڤەكرنا یەكەمین خواندنگەها سەرەتاییا نوو یا رەسمی ل بەغدا ل سالا ١٨٨٦یەكەمین خواندنگەها سەرەتاییا رەسمی ل باشوورێ كوردستانێ ل گوندێ عەلیاوە یێ دەڤەرا خانەقین ل سالا ١٨٨٧ هاتییەڤەكرن[70].

هەروەسان د سالناما ویلایەتا مووسل یا ئۆسمانیێ (سالا١٣٠٨مش/١٨٩٠ز) ئاماژە ب بوونا مەكتەبەكا روشدی ل شارەزورێ، ٥ مەكتەب ل كەركووكێ، یەك ل توزخورماتو، ل قەزا هەولێرێ ٦ مەدرەسە، ٥ مەكتەب، ٥ مەدرەسە ل سلێمانیێ ژی ئاماژە ب ناڤێ مەكتەبا روشدی و مامۆستایێن وێ و هژمارا ١٠٣ خویندكارێن وێ هاتییەكرن. لێ مرۆڤ دكاریت باوەریێ تنێ ب ئەڤا سلێمانیێ بكەت و یێن دی ژی وەك ڤكۆلەر ب خۆ ئاماژە پێ دكەت، ل ڤێرێ ژی تێكەلكرن د ناڤبەرا خواندنگەهێن ئایینی(مەدرەسە) و یێن رەسمی (مەكتەب)دا هاتییەكرن و جهێ گومانێ یە كو د وێ دەمیدا ل كەركووك پێنج یان شەش خواندنگەهێن رەسمی هەبن، هەمان تشت دەربارەی هەولێرێ ژی. پێزانینێن سالناما ١٣١٠مش(١٨٩٢) هەتا ئاستەكی هەمان پێزانین دوبارەكرینەڤە[71].

ب ڤی رەنگی هندەك پێزانینێن سەرەتایی دەربارەی رەوشا خواندنێ ل ویلایەتا مووسل و لیوا (سنجەق) و هندەك قەزاێن سەرب وێ ڤە مە بەرچاڤكرن. بەلێ دەڤەرا بەهدینان یان ژی پارێزگەها دهۆكێ یا نها هەتا دەهسالێن داویێ ژ سەد سالیا نوزدێ چ نیشانەك یان ئاماژە پێكرنەك ل بەر دەستێن مە نینە كو رەنگە خواندنەك یان خواندنگەهێن رەسمی هەتا ڤێ دیرۆكێ ل ڤێ دەڤەرێ هەبن، تنێ ئەو نەبن یا كو سالناما ئۆسمانی یا سالا ١٨٧٣ ئاماژە پێكری كو مەكتەبەك ل ئاكرێ هەبوویە و ٣٥ خویندكاران لێ دخواند، لێ ڤەكۆلەر ب خۆ د گومانێ دایە كو ئەڤ مەكتەبە خواندنگەها ئایینی بوو یان خواندنگەها رەسمی بوو[72].

د بەلگەنامەكا ئۆسمانیدا هاتیە كو نڤیسینەكا ویلایەتا مووسلە دەربارەی كارێن پێدڤیە بێنەكرن بۆ پێشڤەبرنا زانیاری(مەعارف) ل مووسل و شەهرەزور(كەركووك) و سلێمانیێ ل (٢٩ تشرین الاول ١٣٠٨رۆمی- ٢٠ ربیع الاخر١٣١٠مش) بۆ هەمایونی ئانكو دەستەلاتداریا بلند ل ستەنبۆلێ هاتییە هنارتن و فەرمانبەرێن ب ڤەكۆلینا بابەتی و داخوازێن نڤیسینێ هاتینە راسپاردن ل (٣٠ تشرین الاول ١٣٠٨ رۆمی) ١٢ كانوونا یەكێ ١٨٩٢ز تێبینیێن خۆ ل سەر نڤیسینە، كورتیا نڤیسینێ داخوازا چاكسازیێ د خواندنگەهێن روشدی یێن مووسل و شەهرەزور و سلێمانیێ و ڤەكرنا هندەك خواندنگەهێن سەرەتایی كریە، هەروەسان داخوازا سەروبەركرنا كارێ وان خواندنگەهان كریە یێن ب فەرمانا هەمایونی ل شێخان و ناڤ شەبەكان هاتینەڤەكرن و فەرمانبەرێن ب ڤەكوولینێ رابووین ئەڤ چەندە پەسەند كریە[73].

ئەڤە ب خۆ وێ چەندێ دگەهینیت كو هەتا سالا ١٨٩٢ سەروبەرێ فێركرنێ ل ویلایەتا مووسل یێ باش نەبوویە، هندەك خواندنگەهێن روشدی هەبوون ئەو ژی ل مەلبەندێن لیوا ئانكو مووسل، شەهرەزور(كەركوك) و سلێمانیێ، خواندنگەهێن سەرەتایی نەبووینە یان د رێزا نەبوونێدا بوونە، خواندنگەهێن شێخان و ناڤ شەبەكان ژی بێ سەروبەر بوونە و بۆ مەرەمێن تایبەت هاتینە ڤەكرن.

هندی پەیوەندی ب خواندنگەهێن شێخان ڤە هەی، ئەو ب خۆ خواندنگەهـ و مزگەفت بوون، ل شێخان، باشیكێ، باعەدرێ، خەتارا مەزن، گرێ پەحنێ و بەحزانێ دگەل خواندنگەهەكێ ل مەزارێ شێخ ئادی پشتی هێرشا سالا ١٨٩٢یا فەریق عومەر وەهبی پاشای بۆ سەر ئێزدیان هاتبوونە ڤەكرن

و مەرەم ژ ڤەکرنا وان گوهرینا باوەریا ئاینی یا ئێزدییان بوو ژ ئێزداتیێ بۆ مووسلمانیێ. ب نەمانا دەستەلاتداریا عومەر وەهبی پاشای و زڤرینەڤا وان ئێزدیان یێن ژ بەر هێرشێن وی رەڤینە دەڤەرێن دوورتر و ب ئاسایی بوونا کاودانێ دەڤەرێ ئەڤ خواندنگەهـ و مزگەفتە ژی ژ ناڤچوون. هەژیە بێژین زمانێ خواندنێ ل ڤان خواندنگەهـان کوردی و عەرەبی بوو[٧٤].

هندی پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینان قەزایێن دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ و ئاکرێ ڤە هەی کو وی دەمی سەر ب لیوا (سنجەق)ا مووسل یا ویلایەتا مووسل ڤە بوون، هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ل مووسل ب خۆ ژی ب درەنگیڤە ل سالا ١٨٦١خواندنگەهـەکا روشدی هاتییە ڤەکرن کو هەردو قۆناغێن سەرەتایی و ناڤنجی ب خۆ دگرتن و ل سالا ١٨٩٠خواندنا سەرتایی و روشـدی ژ هـەڤ هاتینە جوداکرن و پشتی وێ ب چوار سالان ئانکو ل سالا ١٨٩٤ خواندنگەهـەکا دی یا سەرتایی ل باژێرێ مووسل هاتییەڤەکرن و ل سالا ١٨٩٥ئەڤ خواندنگەها روشدی بوویە دوا ناڤنجی (مکتب اعدادی ملکی)[٧٥]. هندی پەیوەندێ ب دەرڤەی باژێرێ مووسلێ ڤە هەی ل سالا ١٨٩٠پێنج خواندنگەهـ ل گوندێن دەوروبەرێن وێ گوکجەلی، منارە شبك، تۆپزادە، دەراویش و عومەر قەبوجی هاتینە ڤەکرن و ل سالا ١٨٩٢ پێنجێن دی ل گوندێن یارمجە، ئەبو جەربوعیە، ئۆرتە، قەرەقوینلی، شریخان هاتینە ڤەکرن[٧٦]. هەتا ڤێ سالێ ئاماژە ب ڤەکرنا خواندنگەهـان ل دەڤەرا بەهدینان و قەزا و گوند و ناحیێن وێ نینە، تنێ ئەڤ ژێدەرە دبێژیت: ل سالا ١٨٩٣خواندنگەهـەك ل ناحیا سندی گولی یا قەزا زاخۆ هاتییەڤەکرن بێی کو ناڤێ سەنتەرێ ناحیێ بینیت[٧٧]. بەلێ ڤەکۆلەرەك یێ ب گومانە ل سەر ڤێ چەندێ و دوور نابینیت کو ئەڤ خواندنگەهـە خواندنگەهـەکا ئایینی بیت و ئەو ب خۆ دبێژیت: ل سالا ١٨٩٨ ل هەر یەك ژ زاخۆ، دهۆك، ئاکرێ و ئامێدیێ خواندنگەهـ هاتییە ڤەکرن و مەزاختیێ سالانە بۆ وان خواندنگەهـان ب ١٨٠٠٠ قروشان هاتییە تەخمینکرن[٧٨]. هەژیە بێژین سالنامێن وەزارەتا زانیارێن گشتی یا ئۆسمانی (سالنامەو نظارت معارف عمومیة- س ن م ع) ژێدەرێ سەرەکینە بۆ پێزانینان دەربارەی خواندنگەها ناحیا سندی گوللی و سالنامە ژی نە هەموو دەمان ژێدەرێن جهێ باوەریێ نە.

ژێدەرێن دی ژی ئاماژە ب هندێ کریە کو ل سالا ١٨٩٨ێ ١٤ خواندنگەهـێن سەرەتایی ل ویلایەتا مووسلێ پێنج ل مووسلێ و یێن دن ل قەزایێن زاخۆ، دهۆك، ئاکرێ، ئامێدیێ، ئەربیل و سێ ل کەرکووك و یەك ل سلێمانیێ هاتینە ڤەکرن، و ژ ڤێ سالێ هەتا ١٩٠٨چوار خواندنگەهـێن دن دو ل مووسلێ سالا ١٨٩٩ و یەك ل کویسنجەق سالا ١٨٩٩ و یادی ل گوندێ نەینەوا سالا ١٩٠٩ هاتینە ڤەکرن[٧٩].

سالنامێن ویلایەتا مووسل یێن ناڤبەرا سالێن ١٣٠٨- ١٣٣٠ئانکو ١٨٩٠-١٨٩١ هەتا ١٩١١- ١٩١٢ز باشترین ژێدەرن ئاماژە ب هندەك ئالیێن کاودانێ کارگێری و ئابووری و جڤاکیێ دەڤەرێ کری، هندی پەیوەندی ب سەروبەرێ فێرکرنێ ڤە هەی د کاودانێ جڤاکیدا ئاماژە پێ هاتییەکرن و دیاردبیت کو ئۆسمانیان چ رەنگە پووتەپێکرنەك نەدایە ڤی واری، د سالناما سالا ١٣١٠ (١٨٩٢- ١٨٩٣) تنێ ئاماژە ب هندێ هاتییەکرن کو ل دهۆکێ ١١خواندنگەهـێن ئەهلی بۆ فێرکرنا زارۆکان هەبوون، ٧ یێن مووسلمانان ٢یێن مەسیحیان ٢ یێن جوویان، ئانکو هەتا ڤێ سالێ چ خواندنگەهـێن رەسمی لێ نەبوون. بەلێ سالناما سالا ١٣٢٥ (١٩٠٧-١٩٠٨) ئاماژە ب هندێ هاتییەکرن کو دو خواندنگەهـ (مدرستان) و مەکتەبەك (کتابخانه)* ل زاخۆ و خواندنگەهـەکا سەرەتایی ل دهۆکێ هەبوون، و سالناما ١٣٣٠ (١٩١١- ١٩١٢) ئاماژە ب بوونا لیژنەکا زانیاری (معارف قومسیونی) ل قەزا ئامێدیێ کریە کو یا پێکهاتی بوویە ژ دو (مودەرسان و موعەلمەکی) ژ خەلکێ دەڤەرێ بێی کو پێزانینێن بەرفرەهتر ل سەر فێرکرنێ و سازیێن فێرکرنێ ل دەڤەرێ بەرچاڤ بکەت[٨٠].

د. مەسعوود کتانی د گۆتارەکێ خۆدا دیاردکەت: خواندنگەهـا سەرتایی د ناڤبەرا سالێن ١٨٩٨- ١٩٠٠

ل ئامێدیێ هاتییە ڤەکرن، و د بەردەوامیا گۆتارێ خۆدا دبێژیت: ئەڤ خواندنگەهە دهاتە گرتن و ڤەکرن و هندەکان بێ سەروبەر لێ دخواند هەتا ل سالا ١٩٠٨- ١٩٠٩ێ کەتیە سەر قامەکێ و جهێ وێ یێ بەراهیێ د خواندنگەها مراد خانی یا ئایینی ڤە بوو پاشێ برە مزگەفتا مەزن، پاشێ برە قشلا مەزن[٨١].

ژێدەرەکێ دی دبێژیت دەمێ ل سالا ١٩١٦ کەڤنترین مامۆستایێ ئامێدیێ حەسەن زێوەر شەعبان خواندنگەها مامۆستایان ل مووسلێ ب داوی ئینای هەر وێ سالێ ل ئامێدیێ هاتە دامەزراندن، ئانکو د وێ سالێدا ل ئامێدیێ خواندنگەها رەسمی هەبوویە[٨٢].

د. مەسعود کتانی د گۆتارەکێ دی دا ل دوور یەکەمین خواندنگەها سەرتاییا ئامێدیێ د دەت دیارکرن کو بابێ وی حەجی مستەفا سەعید حەجی مەحموود کتانی ئێك ژ سێ قوتابیان بوو یێن سەرەتایی ل سالا ١٩١٦ ل ئامێدیێ تەڤاڤکری. د بەردەوامییا گۆتارێدا دبێژیت: ئەم دگەهینە سالێن ١٩٠٧- ١٩٠٨کو فەرمان هاتییە دان سەرتایی ل ئامێدیێ ڤەکەن، پاشتر د هەمان گۆتارێدا ئاماژە کریە ناڤێن کۆمەکا کەسان کر د ناڤبەرا سالێن ١٨٩٨- ١٩١٠یدا ل ڤێ خواندنگەهێ خواندیە، ئانکو دامەزراندنا خواندنگەها سەرتایی ل ئامێدیێ زڤراندیەڤە سالا١٨٩٨[٨٣].

ب پێداچوونا ڤان ژێدەران دێ گەهینە وێ باوەریێ کو د دەهـ سالێن داویێ یێن سەد سالییا نوزدێ دەسپێکا ڤەکرنا خواندنگەهێن رەسمی (نوو) بوو ل قەزایێن بەهدینان زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ و دهۆك، یان ژی پارێزگەها دهۆك یا نها، و دوور نابینین سالا ١٨٩٨ێ سالا دەسپێکیا ڤان خواندنگەهان بیتن. ئەوا پتر مە ل ڤێ چەندێ پشتراست دکەت ئەوە، هەموو ژێدەرێن ئاماژە ب سەروبەرێ خواندنێ ل دەڤەرێ ل دەسپێکا سەدسالییا بیستێ کرین درشدن ل سەر وێ چەندێ کو: بەلێ د ڤێ قۆناغێدا خواندنگەهێن سەرتایی ل دەڤەرێ هەبوون، وەك د سالنامێن ئۆسمانییێن ١٩١٢دا ئاماژە ب ڤان خواندنگەهان کری:

| قەزا | جورێ خواندنگەهێ | هژمار | مامۆستا |
|---|---|---|---|
| دهۆك | سەرەتایی | ١ | ئەحمەد ئەفەندی |
| | بچووکان | ٢ | |
| زاخۆ | سەرەتایی | ١ | ئیبراهیم ئەفەندی |
| | ئایینی | ١ | |
| ئاکرێ | سەرتایی | ١ | مستەفا ئەفەندی |
| | ئایینی | ٣ | |
| | بچووکان | ٤ | |
| ئامێدیێ | سەرتایی | ١ | حاجی خدر[٨٤] |

ل دووڤ سالناما ئۆسمانیا ١٣٣٠مش (١٩١١- ١٩١٢)ز لیژنەکا زانیاری (معارف قوموسیونی) ل قەزا ئامێدیێ هەبوو، ئانکو بەری ڤی دەمی خواندنگەهـ ل ڤێ قەزایێ هەبوو[٨٥].

د هەمان دەمدا ژێدەرەکێ دی ب ڤەگوهاستن ژ ئامارا رەسمیا خواندنگەهێن حکۆمەتێ ل ویلایەتا مووسلێ ل سالا ١٩٠٥ ئاماژە ب بوونا خواندنگەهان ل قەزایێن ناڤبری کریە.[٨٦] ل دووڤ بەلگەنامەکا وەزارەتا زانیاری (وزاره المعارف) یا عیراقێ یا سالا خواندنێ ١٩٢٤- ١٩٢٥ێ ل سالا ١٩١٣ێ ئانکو بەری شەرێ جیهانیێ یەکەم ٥١ خواندنگەهـ ل ویلایەتا مووسل یا پێکهاتی ژ لیوایێن مووسل، کەرکووك و سلێمانیێ هەبوون.[٨٧] ب ڤێ چەندێ ژی پتر باوەری دروست دبیت کو هەر یەك ژ چوار قەزایێن بەهدینان خواندنگەهەك بەرکەتیە، د دەمەکیدا کو دهێتە زانین وی چاخی لیوا مووسل ژ قەزایێن ئامێدیێ، دهۆك، زاخۆ، ئاکرێ و شنگالێ پێکدهات.

د دەمێ خۆدا د هژمار ٦ گولانا ١٩٩٩ کوڤارا دهۆك بەلگەنامەکا دەرچوونێ یا حاجی خەلیل ئەفەندی ئیبراهیم ئەفەندی هاتییە بەلاڤکرن،

**باوەرنامەیا دەرچونێ ژ خواندنگەها سەرەتای یا دهۆکێ ل سالا ١٩٠٩**


دولت علیهٔ عثمانیه

ناڤبری خویندکارێ خواندنگەها سەرتایيا دهۆکێ بوو، باوەرنامە ژی باوەرناما دەرچوونێ یە ژ قۆناغا خواندنگەهێن سەرتایی (مکاتب ابتدائیه شهادتنامەسی)یە و ژ سەرەتاییا دهۆکێ (دهوك ابتدائیه مکتبی) ل ٤جمادی الاخر١٣٢٨ ئانکو ١٩٠٩-١٩١٠ دەرچوويە و دەهـ کەسان ژ وان ژی مامۆستایێ خواندنگەهێ مۆرا خۆ ل سەر ڤێ باوەرنامێ دایە ئانکو پەسەندکریە[٨٨]. ب ڤێ چەندێ ئەگەر وی سەردەمی قۆناغا سەرتایی چوار یان پێنج سال بیت ئەڤە سالا ١٩٠٥- ١٩٠٦خواندنگەها سەرتایی ل دهۆکێ هەبوویە.

هندی پەیوەندی ب زاخۆڤە هەی ئەڤە ژێدەرەك دبێژیت: ل سالا ١٨٩٨ل مەلبەندێ باژێری یەکەمین خواندنگەها رەسمی هاتییە ڤەکرن، ل سالا ١٩١٢ێ هژمارا قوتابیان د ناڤبەرا ٣٠- ٥٠ قوتابیان بوو، فێرکرن تێدا ب زمانێ ترکی بوو[٨٩]. هەتا ڤێرێ دوبارەکرنا هەمان پێزانینایە یێن بەری نها ئاماژە پێ هاتییە کرن، تنێ نڤیسکار ئاماژە ب هندێ دکەت کو ل سالا ١٩١٣ئەڤ خواندنگەهە د خانیێ (ئەسعەد ئال عیسا)ڤە بوو ل تاخێ قەرەچان یێ زاخۆ[٩٠].

ل دووڤ ڤان هەموو ژێدەران دهێتە سەلماندن کو خواندنگەهێن سەرەتایی ل داویا سەد سالیيا نوزدێ و دەسپێکا سەدسالیيا بیستێ ل باژێرێن دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ و ئاکرێ هاتینەڤەکرن و سالا ١٨٩٨دێ دەسپێکا ڤەکرنا خواندنگەهێن نوو و فەرمی بوو ل باژێرێن ناڤبری و هەتا نها چ ئاماژە پێکرنەك ل بەر دەست نینە کو خواندنگەهـ ل جهەکێ دی ژبلی ڤان باژێران هاتبنە ڤەکرن، ئەڤ سالە ژی هەڤدەمە دگەل سالا دەرچوونا یەکەمین رۆژناما کوردی (کوردستان) ل ٢٢نیسانا ١٨٩٨ێ ل باژێرێ قاهیرە.

ب ڤێ چەندێ دەسپێکا سەدسالیيا بیستێ دەسپێکا قۆناغەك نوو بوو د وارێ فێرکرنێدا ل دەڤەرا بەهدینان و ئەڤ دەسپێکە ژ هەموو ویلایەتا مووسل دگریت، ل سالا ١٩٠٠ یەکەمین خواندنگەها مامۆستایان (دار المعلمین) ل مووسل هاتەڤەکرن، قوتابیێن دەرچوویێن خواندنگەهێن روشدی ل ڤێ خواندنگەهێ دهاتنە وەرگرتن، دەمێ خواندنێ سێ سال بوون، پشتی کودەتایا ئۆسمانیا سالا ١٩٠٨ێ بوونە چوار سال، مەرەم ژ ڤەکرنا وێ دابینکرنا پێدڤیاتییا خواندنگەهان بوو ژ مامۆستایان[٩١]. گومان ژی تێدا نینە بەرهەڤکرنا مامۆستایان پتر هاریکار بوویە بۆ ڤەکرنا پتر خواندنگەهێن نوو و شوونەوارێن ڤێ خواندنگەها مامۆستایان ل سەر خواندنگەهێن دەڤەرێ پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا نوویا عیراقێ یا دیارە.

پشتی شۆرشا ٢٣تەباخا ١٩٠٨یا کۆمەلا (ئیتحاد و تەرەقی) ل ستەنبۆلێ دژی سولتان عەبدولحەمیدی

پێ رابووی و سولتان ناچار كری ل دووڤ دەستووری دەستەلاتداریێ بكەت و دەستووری سالا ١٨٧٦ ئەوێ وی ب خۆ ل سالا ١٨٧٧ دەست ژێ بەردای ڤەژینتەڤە و كار پێ بكەت و پشتی نیسانا ١٩٠٩ ڤێ كۆمەلێ سولتان عەبدولحەمید ژ دەستەلاتی لادا و ل شوونا وی سولتان محەمەد رەشادێ پێنجی(١٩٠٩- ١٩١٨) دانا سەر كورسیا دەستەلاتی و هەر د ئەیلولا ڤێ سالێدا ڤێ كۆمەلێ بەرنامێ خۆیێ كاری راگەهاند، گرنگیدانا دەولەتێ ب سیاسەتا فێركرنێ و ڤەكرنا دەرگەهێن خواندنگەهان ل بەر گشت خەلكی ژ بنەمایێن گرنگێن ڤی بەرنامەی بوون[٩٢]. زێدەباری خواندنگەهێن دەولەتێ ڤێ كۆمەلێ لقێن خۆ ل هەموو ویلایەتان ڤەكرن و ب مەرەما بەلاڤكرنا بیروباوەرێن خۆ خواندنگەهێن سەر ب كۆمەلا خۆڤە ل ڤان لقان ڤەكرن و مامۆستا ژ ئەندامێن خۆ بۆ تەرخانكرن، ئەڤ سەروبەرێ دەستووریێ هاندەر بوو بزاڤەكا چوارچوڤەكری ل سەر ئاستێن رەسمی و مللی بۆ ڤەكرنا خواندنگەهان بێتەكرن[٩٣].

ب دروستبوونا سەقایەكێ هاریكار و رێژیەكا ئازادیێ، نوونەرێن دەڤەرێن جودا جودا د جڤاتا نوونەران (مجلس مبعوثان)دا داخوازێن خۆ بۆ پتر گرنگیدانێ ب واریێ فێركرنێ بلندكرن، دو نوونەرێن كەركووكێ ل یەكێ ئادارا ١٩٠٩ێ یاداشتنامەك دا سەرۆكێ جڤاتێ و تێدا ئاماژە كرە پاشكەتنا سەروبەرێ فێركرنێ ل لیوا كەركووكێ و كێماسیێن خواندنگەهێن هەیی بۆ وەرگرتنا هژمارەكا زێدەترا قوتابیان و تێدا داخوازا ڤەكرنا خواندنگەهێن ئامادەیی و روشدی و سەرەتاییێن نوو كربوو. هەر دڤان سالاندا نوونەرێن گەلەك دەڤەر و ویلایەتێن دي داخوازا پتر گرنگیدانێ ب سەروبەرێ فێركرنێ دكرن[٩٤].

سەروبەرێ پەورەردە و فێركرنێ ل ویلایەتا مووسل كو دەڤەرا بەهدینان پشكەك بوو ژ ڤێ ویلایەتێ هەروەكی پێشتر ژی ئاماژە پێ هاتییەكرن ل قۆناغا دەسپێكێ هژمارا خواندنگەهان و مامۆستایان یا كێم بوو، هەتا سالا ١٩١٥ ل سەرانسەری ویلایەتێ ٥١ خواندنگەهێن سەرەتایی ب ٨٤ مامۆستایان و ١٩٤٩ قوتابیان هەبوون، ئانكو هەر خواندنگەهەكێ كێمتر ژ دو مامۆستایان بەردكەت. د هەمان دەمدا ئەگەر بەراوردەكێ د ناڤبەرا هژمارا خواندنگەهان ل ویلایەتا مووسل و ویلایەتێن دن یێن دەولەتا ئۆسمانی بكەین دێ بینین ویلایەتا مووسل ب رێژا ٢١ێ ژ كۆما ٢٢ ویلایەتێن دەولەتا ئۆسمانی ژێ پێكدهات دهێت[٩٥].

ئەگەر ئەڤە سەروبەرێ فێركرنێ بیت ل ویلایەتا مووسل ب گشتی گومان تێدانینە سەروبەر ل قەزایێن وێ دێ هێشتا خرابتر بیت، د دەمەكیدا د پولێنكرنا قەزایاندا هەریەك ژ چوار قەزایێن بەهدینان ئامێدیێ ب پلا یەكێ و زاخۆ ب پلا دووێ و ئاكرێ و دهۆك ب پلا سێێ دهاتن[٩٦].

هەژیە بێژین ڤەكرنا خواندنگەهان ل قەزایێن كوردی یێن لیوا مووسل و خواندنا كوردی ژ وان داخوازیان بوون یێن كۆمەكا كەسایەتیێن دەڤەرێ د كۆمبوونەكێدا ب سەرپەرشتیا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی ل دهۆكێ د یاداشتەكێدا بۆ دەستەلاتداریا ئۆسمانی ستەنبۆلێ بلند كری[٩٧].

ل سالا ١٩١٤ێ شەرێ جیهانیێ یەكەم دەسپێكر و ب موركرنا پێكهاتنا موندرس د ناڤبەرا دەولەتا ئۆسمانی و هێزێن هەڤپەیمانێن وی چاخی ل ١٩١٨/١٠/٣١ شەر ب داوی هات [٩٨]. دەولەتا ئۆسمانی ب هەڤپەیمانیێ د گەل ئەلمانیا د رۆژێن بەراهیێن شەری دژی هێزێن هەڤپەیمانێن پێكهاتی ژ بریتانیا و فرەنسا و روسیا و چەند دەولەتێن دی كەتە د مەیدانا شەریدا. لەوما هەر ژ دەسپێكی عیراق بوو مەیدانا شەری و هێزێن بریتانی ژ كەنداڤی بەرەف عیراقێ هێرش ئینان و ب درێژیا سالێن شەری شەر و لێكدان ل ڤی وەلاتی د ناڤبەرا لەشكەرێ بریتانی و یێ ئۆسمانی د بەردەوام بوون و لەشكەرێ بریتانی بەرەف ژوور ب ناڤ عیراقێ ڤە دهات. بەری راگەهاندنا ئاگربەستا موندرس ل ٣٠ چریا ئێكێ ١٩١٨ لەشكەرێ بریتانی ب ناڤ ویلایەتا مووسل ڤە هاتبوو لێ هێژ نەگەهشتبوو باژێری و پشتی ئاگر بەستێ ل رۆژا ١١/٨ هاتە دناڤ باژێرێ مووسل

دا، سەرەرای نەرازیبوونا سەرلەشكەرێ ئۆسمانی عەلی ئیحسان پاشای كو ئەڤە دگەل ئاگر بەستێ ناگونجیت، بەلێ كەسەكی پووتە ب نەرازیبوونا وی نەكر ئەو ژ ب ناچاری ژ باژێری دەركەت[99].

ئاماژە ب سەروبەرێ فێركرنێ بەری شەری هاتەكرن كو هێز ل دەسپێكی و د سەروبەرەكێ لاواز و پاشڤەمای بوو. گەلۆ ئەڤ سەروبەرە د سالێن شەریدا دێ یێ چاوان بیت..؟ هیچ گومان تێدا نینە د هەر شەرەكیدا بیت سەروبەرێ فێركرنێ دێ ژ هەر تشتەكێ دی خرابتر بیت و چەند جاركی دێ بەرەڤ پاش زڤریتەڤە، دەرگەهێن خواندنگەهان دهێنەگرتن، مامۆستا و قوتابی بەلاڤەدبن، هەر ئەڤە ژی د دەمێ شەریدا ب سەرێ هەر سێ ویلایەتێن بەسرا و بەغدا و مووسل هاتبوو، دەرگەهێ خواندنگەهێن سەردەمێ ئۆسمانی هاتبوونە گرتن، گەلەك ژ مامۆستایێن وان دەمێ لەشكەرێ بریتانی ب سەر دەڤەرێن واندا گرتی دگەل لەشكەرێ شكەستیێ ئۆسمانی ڤەكشیابوون، خەلكەكی ژی كەرەستە و ناڤمالیێن خواندنگەهان ل بەغدا تالان كربوو، د ڤی سەروبەریدا دێ یا ب زەحمەت بیت هەر دەستەلاتدارییەك هزرا خۆ د ڤەكرنا خواندنگەهاندا بكەت وەسان زوو بكاریت هزرا خۆ بجە بینیت.[100]

پێدڤیە ئەو ژی بێتە گۆتن كو سەروبەر ل مووسلێ باشتر بوو دەمێ لەشكەرێ بریتانی هاتینە د باژێریدا خواندنگەهێن وێ بەردەوام بوون د كریارا فێركرنێدا، نەكەتبوونە بەر خرابكرن و تێكدانێ، مامۆستایێن وان ب ئەركێ خۆ رادبوون و دگەل لەشكەرێ ئۆسمانی نە ڤەكشیابوون بەلێ پرانییا ڤان خواندنگەهان ل دەڤەرێن مەسیحیێن دەوروبەرێن مووسلێ بوون[101].

ئەگەر ب ڤی چاڤی بەرێ خۆ بدەینە هەر چوار قەزایێن دەڤەرا بەهدینان كو دبنیاتدا ب چاڤ باژێرێن مەلبەندێن ویلایەتان بەسرا، بەغدا و مووسل باژێركێن پاشڤەمای بوون و خواندنگەهێن وان ژی مینا وان د پاشڤەمای بوونە، باوەر ناهێتە كرن ڤان خواندنگەهان خۆ ل بەر درێن گرانێن شەرێ جیهانی گرتبیت و دەرگەهێن وان نەهاتبنە گرتن، هەر چەندە وەك بەری نها ژێ مە دیاركری هندەك ئاماژە هەنە كو خواندنگەها سەرەتایا ئامێدیێ هەتا سالا ١٩١٦ێ یا بەردەوام بوو.

هەروەسان ژ ژیاناما (ترجمە حال) مامۆستایەكێ پێشەنگێ زاخۆیی محەمەد شاكر دورسون* دهێتەزانین كو ل سالا ١٩١٢ل خواندنگەها سەرەتایا زاخۆ هاتییەوەرگرتن و ل سالا ١٩١٨ێ قۆناغا سەرەتایی ل ڤێ خواندنگەهێ ب داویئینایە[102].ئانكو د سالێن شەریدا خواندن ل ڤێ خواندنگەهێ یا بەردەوام بوویە.

ب هەر رەنگەكێ هەبیت ب داوی هاتنا شەرێ جیهانی دەستەلاتێ دەولەتا ئۆسمانی ل دەڤەرێن بابەتێ مە ژێ دگریت ب داوی هات و وەك ئاماژە پێ هاتییەكرن ل ١٩١٨/١١/٧ێ لەشكەرێ بریتانیا باژێرێ مووسلێ گرت و پشتی وێ ژی ب دەمەكێ نەدرێژ باژێرك و دەڤەرێن بەهدینان هاتنە گرتن، ب ڤی رەنگی هەموو سنوورێن لیوا (سەنجەقا) مووسل كەتنە ژێردەستەلاتدارییا داگیركارییا بریتانیا، یاكو د چەند هەیڤێن بەراهیێدا راستەوخۆ ل ژێر كارگێرییا لەشكەرێ بریتانیا بوو و دەستەلاتێ مەدەنیێ بەغدا ئەوێ ئینگلیزی ب خۆ دامەزراندنی چ دەستەلات ل سەر مووسلێ نەبوو، پشتی چەند هەیڤەكان ناكوكییا ناڤبەرا بریتانیا و فرەنسا سەر ویلایەتا مووسل ب داویهات و هەردو ئالی پێكهاتن كو مووسل سەر ب دەستەلاتدارییا بریتانیا ڤە بیت ل عیراقێ و دگەل كارگێرییا مەدەنیا بەغدا هاتە گرێدان،[103] هەتا ویلایەتا مووسل ب یەكجاری ل ١٩٢٥/١٢/١٦دگەل عیراقێ هاتییە گرێدان[104].

هندی پەیوەندی ب قۆناغا دەسپێكا دەستەلاتدارییا بریتانی ل مووسل هەی كو ب قۆناغا دەستەلاتدارییا داگیركارییا بریتانیا دهێتە ناڤكرن، دهێتە زانین كو كابتن بیس E.H.Base وەك بریكارێ وەزیرێ زانیاری (وكیل ناظر المعارف) ل مووسلێ هاتییە دامەزراندن و بوویە سەرپەرشتێ

راستەوخۆ یێ کاروبارێن فێرکرنێ ل ڤێ ویلایەتێ و ل دەسپێکا مەها کانوونا یەکێ ١٩١٨ێ گەهشتیە مووسل[١٠٥].

دەمێ ناڤبری گەهشتیە مووسل ٦ خواندنگەهێن سەرەتایی یێن کوران و ٣ خواندنگەهێن سەرەتایی یێن کچان یێن مووسلمانان، ٣ خواندنگەهێن سەرەتایی یێن کوران دو یێن کچان یێن کلدانان و رەوزەکا زارۆکان یا دومونیکان ل مووسل هەبوون، هەروەسان مەسیحیێن یەعقوبی ژی خواندنگەها (الطاهره) یا کچان و ٤ خواندنگەهێن تایبەت یێن کوران ل گوندێن دەوروبەرێن مووسلێ هەبوون، زێدەباری خواندنگەها ئامادەیی مولکی و یا مامۆستایان یا ژ کار کەتی. کابتن بیس ب مهانا هندێ مامۆستایێن ڤان خواندنگەهان ترکن و رەوشەنبیریا ترکی هەیە، هەموو ئەڤ خواندنگەهە ژ بلی خواندنگەها (الوطن) و خواندنگەها ئامادەیی گرتن و مامۆستایێن وان ب مهانا هندێ کو د بێ شیانن و یان ئەوێن نەڤێت بەردەوامیێ ب پیشەیێ فێرکرنێ بدەن دەرێخستن و یێن مایی ل خواندنگەها (الوطن) و (الخضریه) ئەوا پاشتر ڤەکری دامەرزاندن، بەلێ هەر سێ خواندنگەهێن مەسیحیان د بەردەوام بوون و کابتن بیس رازیبوو ل سەر ڤەکرنا خواندنگەهەکێ بۆ جوویان و هەر وی بەرهەڤیێن پێدڤی کرن بۆ ڤەکرنا خواندنگەها پروتستانتا یا سەر ب شاندێ دێرا ئینگلیزی ئەوا د سالێن شەریدا هاتییەگرتن، و پاشتر ب فەرمانا حاکمێ سیاسیێ مووسلێ (لچمن) ی خواندنگەها سیێ یا کوران بۆ مووسلمانان هاتەڤەکرن و خواندنگەهەکا کچان ب ناڤێ خواندنگەها (حدیقه المعرفة) ل ١٩١٩/١/١٤ێ هاتەڤەکرن پاشتر خواندنگەهەکا دی یا کچان ب ناڤێ (الخزامیة) هاتە ڤەکرن[١٠٦].

ژێدەران ئاماژە ب هندێ نەکریە دەمێ دەستەلاتداریا دەڤەرا بەهدینان کەتیە دەست لەشکەرێ ئینگلیزی چەند خواندنگەه ل دەڤەرێ هەبوون، ل کیژان باژێرك و گوندان..؟ د گرتی بوون یان د ڤەکری..؟ بەلێ دهێتە زانین پشتی کو کابتن (بیس)ی گەریانەکا دووڤچوونێ ل سەروبەرێ خواندنگەهێن دەڤەرێن سەر ب ویلایەتا مووسل کری و دیتێ خواندنگەه د گرتینە، بریار دا کارێ پێدڤی بکەت بۆ دوبارە ڤەکرنا وان خواندنگەهان ئەگەر تێرا وان مامۆستا هەبن. ب ڤی رەنگی خواندنگەهێن هەولێر، کوێر، تەلەعفەر، دهۆك، ئاکرێ و زاخۆ و خواندنگەهەك ل سلێمانیێ هاتنە ڤەکرن، هەروەسان بریار دا خواندنگەها (المدرسه العلمیه) و خواندنگەهەکا سەرەتایی سەر ژ نوو ل کەرکووکێ بێنە ڤەکرن.[١٠٧] وەك دیار ئەڤە د نیڤا یەکەما سالا ١٩١٩یدا بوو.

ژ ڤی دەڤی د هێتە زانین ئەڤ خواندنگەهە د سالێن شەریدا دگرتی بوون و سەر ژ نوو هاتینە ڤەکرن، هەروەسان تێبینی د هێتەکرن کو ڤی دەڤی ئاماژە ب خواندنگەها سەرەتایا ئامێدیێ

| لیوا | هژمارا خواندنگەهان | هـ. رێزان | هـ. قوتابیان | هـ. مامۆستایان |
|---|---|---|---|---|
| مووسل (باژێر) | ١٤ | ٥٥ | ١٦٨٥ | ١٠٩ |
| | ٢ یێن کچان | ١٠ | ٢٩٨ | ١٥ |
| ناحیێن وێ | ٩ | ١٩ | ٣١٣ | ١٦ |
| ئەربیل | ٢ | ٩ | ٢٢٠ | ١٦ |
| کەرکووك | ٤ | ١٤ | ٣٠١ | ١٨ |
| سلێمانیی | ٣ | ١١ | ٢٣٧ | ١٣ |

نەدایە كو سەر ژ نوو هاتبیتە ڤەكرن، ئەڤە ژی رەنگە باوەریەكێ بۆ مرۆڤی دروست دكەت كو ئەڤ خواندنگەهە د سالێن شەرێ جیهانیدا یا بەردەوام بوویە و نەهاتیەگرتن. خواندنگەها زاخۆ ژی هەروەك مە دیاركری د سالێن شەریدا یا بەردەوام بوویە، لێ دیارە دقۆناغا ئالوگورێن كارگێری و دەستەلاتداریێ و ڤەكشیانا ئۆسمانییان و هاتنا لەشكەرێ ئینگلیزی هاتییەگرتن و ل سالا ١٩١٩ێ سەرژنوو هاتییەڤەكرن.

ژبێ ڤان خواندنگەهان چەند درێژ بوویە..؟ هەتا كەنگی بەردەوامی ب كارێ خۆیێ فێركرنێ دایە..؟ ئەڤ پرسیارە پێدڤی بەرسڤێ نە و د ژێدەراندا بەرسڤەكا تێر و تەسەل یا ڤان پرسیاران نینە. بەلێ ئەوا د هێتە زانین ل ٢٣ تەباخا ١٩٢١دەولەتا شاهیا عیراقی هاتە راگەهاندن، ب ڤێ چەندێ دەستەلاتداریا لەشكەریا راستەوخۆیا بریتانی كو ب قۆناغا داگیركاریێ دهێتە ناڤكرن ب داوی هات. ل دووڤ سیستەمێ نوو سەرۆكوەزیرێ قۆناغا چوویی دەست ژ كاری بەردا و ل دووڤ راسپاردنا شاهی (مەلكێ) عیراقێ هەر وی سەرۆكوەزیرانی عەبدولرەحمان نەقیب ی یەكەمین وەزارەتا سەردەمێ شاهینیا عیراقێ دامەزراند و محەمەد عەلی هیبەتولدین ئەلشەهرەستانی د ڤێ وەزارەتێدا وەك وەزیرێ زانیاری (معارف- پەروەردا نها) هاتەدانان[١٠٨]. ل دووڤ رۆژناما (العراق) یا رۆژا ١٩٢٣/٨/٦ سەرژمێریا خواندنگەهان ل دەڤەرا مووسل كو وی چاخی عیراق ژ سێ كەرتێن پەروەردێ پێكهاتبوو ب ڤی رەنگی بوو:

د هەمان دەمدا خواندنگەهەكا ئەهلی یا ئیسلامی ل مووسل، دو خواندنگەهێن ئەهلی یێن مەسیحیان ل مووسل، ١٢ ل دەوروبەران، ٧ خواندنگەهێن ئەهلی یێن كچان یێن مەسیحیان ل مووسل و ٨ ل دەوروبەرێن مووسل هەبوون[١٠٩].

ئەڤە سەروبەرێ خواندنگەهان بوو بەری راگەهاندنا دەولەتا شاهیا عیراقێ ب چەند رۆژەكان ل مووسلێ و دەوروبەرێن وێ، ئانكو د وی دەمیدا ل پاریزگەهێن مووسل و دهۆك یێن ئەڤرۆ تنێ ٢٣ خواندنگەهێن كوران و ٢ یێن كچان، ٢ خواندنگەهێن ئیسلامی یێن ئەهلی زێدەباری خواندنگەهێن مەسیحیان، هندی پەیوەندی ب قەزایێن كوردی یێن لیوا مووسلڤە هەی، ئەرێ هەر یەك ژ ڤان قەزایێن كوردی كو مەرەم پێ دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ، و ئاكرێ نە یەك ژ ڤان خواندنگەهان بەردكەڤت یێن د ڤی ژێدەریدا ب (النواحی) هاتینە هژمارتن، كو هەروەك دهێتە زانین لیوا مووسل وی دەمی ژ قەزایێن دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ، ئاكرێ، و شنگال پێكدهات..؟ یان ژی مەرەم ژ (النواحی) باژێركێن دەوروبەرێن مووسلێ نە..؟ بۆ بەرسڤا ڤان پرسیاران پێدڤیە پتر دووڤچوونا سەریەری د ڤێ قۆناغێدا بكەین. پشتی سەرژمێریا رۆژا ٨/٦یا ئاماژە پێكری ل ١٩٢١/١٢/٢١ێ میلاكێ یەكەمین وەزارەتا زانیاریا عیراقێ هاتییە راگەهاندن، ل دووڤ ڤی میلاكی تنێ ل مووسل و قەزا و ناحیێن وێ ئانكو سنوورێ رێڤەبەریا زانیاریا مووسل (مدیریە معارف الموصل) ژبلی خواندنگەها پیشەسازیا مووسل و كەركووكێ و دواناڤنجیا (الوطن)یا مووسلێ و ٥٣ خواندنگەهـ ل لیوا مووسل هەبوون، ژ وانا ٢٥ خواندنگەهـ وەك ژ ناڤێن وان دیار تایبەت یێن مەسیحیان بوون، ئانكو ٢٨ خواندنگەهـ بۆ سەرانسەری لیوا مووسل د مینن[١١٠]. ئەڤە ژی نێزیكی وێ سەرژمێریێ یە یا ل ١٩٢١/٨/٦ هاتییە راگەهاندن كو ١٤ خواندنگەهـ ل ناڤ باژێرێ مووسلێ و ٩ ژی ل دەڤەرێن دەرڤەی مووسلێ، ئانكو تنێ ٢٣ خواندنگەهـ ل سەرانسەری لیوا مووسل هەبوون.

هەژیە بێژین د میلاكێ وەزارەتا زانیاریا عیراقێ یێ ١٩٢١/١٢/٢١ ل دەڤەرا بەهدینان تنێ ئاماژە ب خواندنگەهێن دهۆك و زاخۆ هاتییە كرن و میلاكێ وان ب رەنگێ ژێری هاتییە دیاركرن:

**خواندنگەها زاخۆ**

رێڤەبەر: قەشە مەنسوور فارس

**خواندنگەها دهۆكێ**

رێڤەبەر: یاسین سدقی

مامۆستا: محەمەد عارف
مامۆستا: قەشە پولس بەهرو
مامۆستا: ئەحمەد حەمدی*
مامۆستا: سەلوم خلنام شەمعون[111]

ئەگەر ل دووڤ ڤان ژێدەر و پێزانینان بچین ل داوییا سالا ۱۹۲۱تنێ دو خواندنگەهێن رەسمی ل بەهدینان خواندنگەهـا دهۆكێ و زاخۆ د وێ سالێدا ل سەر كارێ فێركرنێ د بەردەوام بووینە، و ئەو ۹ خواندنگەهێن ل سەر دەڤەرێن مووسلێ (موصل النواحی) هاتینە هژمارتن پتر دێ ژ باژێركێن دەوروبەرێن مووسل گرن و ب پێداچوونا ناڤێن خواندنگەهـان یێن د میلاكێ ۱۲/۲۱/ ۱۹۲۱یدا هاتین ئەڤ بۆچوونە ل جەم مە موكمتر لێ دهێت. ب ڤی رەنگی ئەم دكارین بێژین ل داوییا سالا ۱۹۲۱ێ ئانكو مەهێن دەسپێكی یێن دامەزراندنا حكۆمەتا مەلكی یا عیراقێ كارێ فێركرنی ل دو خواندنگەهێن دەڤەرا بەهدینان دهاتەكرن ئەو ژی خواندنگەهێن دهۆك و زاخۆ بوون. ب بەرچاڤ وەرگرتنا سەروبەرێ دەڤەرێ یێ وی سەردەمی و نەبوونا دەزگەهێن كارگێری یێن رێك و پێك و نە سەقامگیرییا كاودانێ تەناهیێ و ئاریشێن ژ سەرەدەرییا خراب و پاشڤەروویا دەولەتا ئۆسمانی بۆ خەلكێ ڤەماین باوەرییا مرۆڤی ب ڤێ بۆچوونێ موكمتر لێ دهێت.

پشتی دامەزراندنا حكۆمەتا شاهییا عیراقێ ل مەها تەباخا ۱۹۲۱ێ هێدی هێدی دەزگەهێن مەدەنی یێن عیراقێ ل لیوا و قەزا ناحیێن عیراقێ هاتنەڤەكرن، قائیمەقامێن عیراقی یێن مەدەنی شوونا ئەفسەرێن لەشكەرێن ئینگلیزی ل مەهێن بەراهیێ یێن ۱۹۲۲ێ دەستەلات گرتە دەست، هەر بۆ نموونە یەكەمین قائیمەقامێ عیراقێ ل مەها نیسانا ۱۹۲۲ێ ل دهۆكێ هاتییەدامەزراندن[112]. ب دەست بكاربوونا قائیمەقام و دەزگەهێن مەدەنی یێن عیراقی ل دەڤەرێ دەست ب ڤەكرنا خواندنگەهێن سەرەتایی ل ڤان دەڤەران هاتەكرن، ل دهۆكێ ل ۷ چریا دووێ ۱۹۲۲ێ، ل ئامێدیێ ل ٤ شوباتا ۱۹۲۲، ل زاخۆ ل سالا ۱۹۲۲ و ل ئاكرێ ژی هەر ل سالا ۱۹۲۲ێ یەكەمین خواندنگەهێن سەر دەمێ مەلكی هاتینە ڤەكرن[113]، راستر ئەوە بێژین دڤان مێژوو یێن ئاماژە پێكری ڤان خواندنگەهان ب دەست وەرگرتن یان تووماركرنا خویندكارێن نوو كریە. ب ڤێ چەندێ ل سەنتەرێ هەر چوار قەزایێن بەهدینان ل سالا ۱۹۲۲ێ یەكەمین خواندنگەهێن سەردەمێ مەلكی هاتنەڤەكرن، كو هەمان ئەو چوار خواندنگەهە بوون یێن ل داوییا سەدسالییا نوزدێ سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی هاتینەڤەكرن.

ل ڤێرێ دبیت پرسیارەك بێتەكرن گەلۆ د ڤێ سالێدا تنێ ل ڤان چوار باژێركان خواندنگەهـ هاتینەڤەكرن..؟ د بەرسڤێدا دێ بێژین هەتا نها چ ژێدەر یان بەلگەنامە ل بەردەستێ مە نینن وێ چەندێ بسەلمینن ژبلی ڤان چوار باژێران ل جهەكێ دی یێ دەڤەرێ ل سالا ۱۹۲۲ خواندنگەهـ هەبوونە یان هاتینەڤەكرن.. تنێ ژێدەرەكی ئاماژە ب وێ چەندێ كریە كو نیسانا ۱۹۲۲پێنج خواندنگەهـ ل قەزا ئامێدیێ هەبوون، ئەو ژی نامەیەكا (كاتب تەحریر)ێ ئامێدیێ رەسول ناجی یە كو بۆ رۆژناما پێشكەوتن یا سلێمانیێ نڤیسییە و دهژمار۱۰۳یا ۱۳ نیسانا ۱۹۲۲ێ هاتییە بەلاڤكرن كو تێدا هاتییە: لە سایەی حكۆمەتی موعەزەمەی بریتانیا ئەمرۆ ئەم محال ی بەهدینان بە نیسبەت جێگای تر لە حالی رەفاهیەت و سعادەتدا دەژین و لە جیهەتی مەعارفەوە لە قەزای عمادیە پێنج مەدرەسە لە نوێ كراوەتەوە لەم رۆژانەدا بۆ چاودێری حەزرەتی نائیبی مشاوری لیوای مووسل (كابتن جاردین) لەگەل مشاوری مەعارف تەشریفیان كردە عمادیە هەر كەمیەكی لەم مەدرەسانە هەبوو هەموویان تەواو كرد جگەی ئەمیش ئەمریان بە مامۆستاكان فەرمو كتێبەكانی عەرەبی بە زمانی كوردی تەرجمە بكەن و بە منالەكانی بخوێنن[114].

گەلۆ ئەرێ راستە ل نیسانا ۱۹۲۲پێنج خواندنگەهـ ل قەزا ئامێدیێ هەبوون..؟ ئەڤ پێنج خواندنگەهە ل كیژ جهـ یان گوندێ ئامێدیێ بوون..؟ سەرەنجامێ ڤان خواندنگەهـان چ لێ هات..؟

**باوەرنامەیا دەرچوونێ یا مامۆستا (شاكر دورسون ١٩٠٣-١٩٩٦)یا سالا ١٩٢٤ -١٩٢٥ یا خواندنگەھا مامۆستایان ل بەغدا**

المملكة العراقية
وزارة المعارف
بغداد
شهادة دار المعلمين

عدد ٥

التصوير

السجل

اسم الطالب: شاكر
اسم والده: طورسون آل ضياط
تاريخ ميلاده: ١٩٠٣
بلده: زاخو
عنوانه الدائم:

| العربية | الانكليزي | المعلومات | الصحية | التربية | الرياضيات | الجغرافية | تاريخ | طبيعيات | الدين | المجموع | الرسم | عمل اليد | الرياضة البدنية | النشيد | المجموع | المجموع الكلي | السلوك | العناية | المواظبة | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | — | — | — | ٧½ | ٧ | ٩ | ٨ | ٩ | ١٠ | ٥٨½ | ٧ | ٩ | ٨ | ٧ | ٢١ | ٨٩½ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٩٢٤ : ٩٢٣ |
| ٨ | — | ١٠ | ٨ | ٧ | ٨ | ٨ | ٧ | ١٠ | ٨ | ٧٤ | ١٠ | ٨ | ٧ | ١٠ | ٤٥ | ١٠٩ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٩٢٥ : ٩٢٤ |
| ٨ | — | ١٠ | ٨ | ٧ | ٨ | ٩ | ٩ | ١٠ | ٩ | ٧٧ | ٩ | ٩ | ٨ | ٩ | ٤٥ | ١١٢ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | المتوسط |

ان شاكر طورسون بن طورسون آل ضياط من تلاميذ دار المعلمين الاولية ذات الصفين في بغداد قد دخل الامتحان النهائي لسنة ١٩٢٤ – ٥ ١٩٢
فاحرز مئة وتسعة درجة من المجموع وكانت مرتبته الثاني عشر بين ثلاثين تلميذاً وبذلك قد اعطي هذه الشهادة

في ١ ايلول سنة ١٩٢٥ وفي ١١ صفر سنة ١٣٤٤

مدير المدرسة

نصادق عليها
وزير المعارف

بەلگەیەك دی ژ بلی نامەیا رەسول ناجی ل بەر دەست هەیە راستیا بوونا ڤان خواندنگەهان بسەلمینیت..؟ د بەرسڤا ڤان پرسیاراندا تنێ ئەم دێ بێژین چ ژێدەر ل بەردەستێ مە نینن راستیا بوونا ڤان پێنج خواندنگەهان یان جهێ بوونا وان ل قەزا ئامێدیێ بسەلمینن. تنێ د ژێدەرەکیدا هاتییە کو ل سالا ١٩٢٢ خواندنگەها سەرتایی ل بامەرنێ هاتییە ڤەکرن و نڤیسەرێ بابەتی ژی بۆ ڤێ چەندێ پشتگەرمێ راپۆرتا پشکنەرێ پەروەردا مووسل یا ٦-١٩٥٨/٥/٨ێ یە، بەلێ وەك نڤیسەر دبێژیت: ژ بەرکو دەولەتێ مامۆستا بۆ ڤێ خواندنگەهێ بەرهەڤ نەکربوون، شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی دو مامۆستا راسپاردن کارێ فێرکرنێ ل دووڤ پەیرەو و پرۆگرامێ پەروەردێ ل ڤێ خواندنگەهێ برێڤەبەن و هەر وی ژی پێدڤیێن خواندنگەهێ و مووچەیێ مامۆستایان دابینکریە[115].

ل ڤێرێ ئەم دوور نابینین د وێ سالێدا ئانکو سالا ١٩٢٢ێ بریارا ڤەکرنا پێنج خواندنگەهان ل قەزا ئامێدیێ هاتبیتە دان بەلێ پێدڤیاتی و مامۆستا بۆ نەهاتینە دابینکرن و وەك خواندنگەها بامەرنێ کەسەکی خۆ لێ نەکریە خودان، لەوما ژی ژ بلی خواندنگەهێن ئامێدیی و بامەرنێ خواندنگەهێن دی دەست ب کارێ خۆ نەکریە.

د ئەنجامێ ڤی ڤەکۆلینێدا دێ گەهینە وێ چەندێ کەڤنترین خواندنگەهێن سەرەتایی ل دەڤەرا بەهدینان، سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ هاتینەدامەزراندن خواندنگەهێن دهۆك، ئامێدیێ، ئاکرێ و زاخۆ نە، ل داویا سەدسالیا نوزدێ سالا ١٨٩٢ێ هاتینەدامەزراندن و هەر ئەڤ خواندنگەهە بووینە یەکەمین خواندنگەهێن ل سەردەمێ مەلکیێ عیراقێ هاتینە دامەزراندن.

ل ڤێرێ داکو هەکەر ب کورتی ژی بیت پانۆرامایەکا سەروبەرێ پەروەردە و فێرکرنێ ل سنوورێن نهایێن پارێزگەها دهۆکێ بەرچاڤبکەین دێ ب کورتی ئاماژە ب ڤێ سەروبەری د سێ قۆناغاندا کەین، قۆناغا سەردەمێ شاهینی ١٩٢١- ١٩٥٨، قۆناغا سەردەمێ کۆماری ١٩٥٨- ١٩٩٠ و قۆناغا سەردەمێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ.

- قۆناغا سەردەمێ شاهینی ١٩٢١- ١٩٥٨:

وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ل دەسپێکا ڤێ قۆناغێ هەرچوار خواندنگەهێن سەردەمێ ئوسمانی ل ئامێدیێ، زاخۆ، دهۆك و ئاکرێ هاتنەڤەدامەزراندن و دەست ب کارێ خۆ یێ فێرکرنێ کرن، بەلێ بۆ قۆناغا پشتی وان هەتا سالا ١٩٥٨ێ ژ بەر چەندین ئەگەران چ ژێدەر یان داتا و بەلگەنامە ل بەر دەست نینن بزانن د ڤان ٣٧ سالاندا چەند خواندنگەهێن دیتر ل دەڤەرێ هاتینەڤەکرن، تنێ ژ ئەنجامێ دووڤچوون و لێگەریانا خۆ ئەم گەهشتینە ڤێ هژمارا خواندنگەهان د هەر دەهـ سالەکاندا کو ل دەڤەرێ هاتینەڤەکرن یان هەبوونە ئانکو د هەردەهـ سالەکاندا ئەو خواندنگەهێن دیتر لێ زێدەبوونە:

## ناڤبەرا ١٩٢٢- ١٩٣٠

دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ، ئاکرێ، ئەتریش، بامەرنێ ١٩٢٢، مانگێش ١٩٢٤، فیشخابوور ١٩٢٤- ١٩٢٥، پێدە ١٩٢٩، سەرسنکێ ١٩٢٩، سێمێلێ ١٩٢٤ هەبوو و هاتییەگرتن، کانیماسێ، دهۆك کچان ١٩٢٨

## ناڤبەرا ١٩٣١- ١٩٤٠

ئاسهێ ١٩٣٢، باتووفا ١٩٣٤- ١٩٣٥ هەبوو و هاتییەگرتن، سەناتێ ١٩٣١- ١٩٣٢، هورە ١٩٣٢، بێدوهێ ١٩٣٧، بێتاس ١٩٣٩، زاویتە ١٩٣٦ هەبوو و هاتییەگرتن،شێخکا ١٩٣٨، بریفکان، بەردەرەش، زاخۆ کچان، ئامێدیێ کچان، ئاکرێ کچان

## ناڤبەرا ١٩٤١- ١٩٥٠

بیرسڤێ١٩٤٤، بێتاسێ ١٩٤٠- ١٩٤١، شوش ١٩٤٦هەبوو، زەنکان ١٩٤٦ هەبوو، باعەدرێ ١٩٤٦هەبوو، ئەرەدنا ١٩٤٥- ١٩٤٦، هەوریسکێ ١٩٤٧ هەبوو، شێخکا ١٩٤٧،سەید ئەحمەد ١٩٤٩، بیراکەپرا

## ناڤبەرا ١٩٥١- ١٩٦٠

گوهبەلێ ١٩٥١، دهۆك يا دووى، بێبۆ ١٩٥١- ١٩٥٢، ئاكرێ يا دووێ ١٩٥٥، ئێتويت ١٩٥٢، پيرومەرا ١٩٥٢، مرێبا ١٩٥٣، كەلاتێ ١٩٥٣، منارا و تەلعەدەس ١٩٥٣، مێرسيس ١٩٥٣، شەرانش ١٩٥٦، سپيندارێ ١٩٥٣، تروانشێ ١٩٥١، ديرەبوون ١٩٥٤، داوديێ ١٩٥٣، سێميلێ ١٩٥٢ هاتييەڤەكرن، سينا ١٩٥٧- ١٩٥٨، پيرومەرا، زاخۆ يا دووێ ١٩٥٢، ئاكرێ يا دووێ ١٩٥٢، عينسفنێ ١٩٥٢، بامەرنێ كچان ١٩٥٧، كرسێ، هەرنێ ١٩٥٥هەبوو، شوش ١٩٥٥، بيرسڤێ ١٩٥٥، بەحزانێ، بێباد،داوديێ، (الاخۆ) دهۆك- بەهدينان، بەريۆر عليا، شكەفتهندى، هوكێ (دەڤەرا نەهلێ ١٩٥٧)، باكرمان- ناحيا سورچى ١٩٦٠- ١٩٦١ سەروكانى، سندورێ، چێ، شێخ هەسنا، بالەتە، كەمەكا، راڤينا، دورێ، پێدە، هيس، پيرئومەرا، كورەمارکێ، كەمەكا، هلوە ئيسلام، سوارەتوكا، زێوا محەمەد ياسينى، پيچەكا ژوورى، شێزێ ١٩٥٨، قەسرا مەلا تەيبى ١٩٥٨، و سەيزارى ١٩٥٨.

## قۆناغا سەردەمێ كۆمارى ١٩٥٨- ١٩٩٠

ئەڤ قۆناغە ب خۆ ل سەر دو قۆناغان دهێتە دابەشكرن: قۆناغا ناڤبەرا ١٩٥٨- ١٩٧٠ و قۆناغا ١٩٧٠- ١٩٩٠ێ، ل دەسپێكا ڤێ قۆناغا ب تايبەت د ناڤبەرا تيرمەها ١٩٥٨- ئەيلوولا ١٩٦١ ب رەنگەكێ بەرچاڤ هژمارەكا زێدەترا خواندنگەهان ل سنوورێ نهايى پارێزگەهێ هاتنەڤەكرن و د سالا خواندنێ ١٩٥٩- ١٩٦٠ێدا بۆ يەكەمين جار دەست ب خواندنا كوردى ل دەڤەرێ هاتەكرن، ب كورتى ئەم د كارين بێژين د ناڤبەرا ١٩٦٠ – ١٩٧٠ێدا ئەڤ خواندنگەهە ل يێن ئاماژەپێكرى زێدەبووينە:

## ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٧٠

بيزوهێ، باختمێ، راڤينا، جەلكێ سەرى(عليا)، ميرگێ، سەرسنكێ كچان، ئەرەدنا كچان، قويسێ، زراڤكێ، كوانێ، ديهێ، كورك، مانكێش كچان، گوهبەلێ، باتنايا (باگنايا)، دورێ، دوبەردان، چەم ستى، گەلنازكێ، رەبەتكێ، ئيشكێ، گوبزئاڤا، دوتازا، دێرگژنيك،زێوكا عەبوى، مەهەتێ، دوغاتا، ئاڤگەنيێ، كرساف، خەزنەتەپە، باستكێ سەرى، بادێ، بەندا، بۆزان، كەندالا، ئاڤزريكا ميرى، شەرانش ئيسلام، سەروكانيێ، كولێ، نورەدينا، ديرەشيش، باتيلێ، ملا عەرەب، بێبادێ، سكرينێ، هيس، هرور، كورەماركێ، هيش، گركا، ديهێ، رەزگە، راڤينا، وەرميلێ، كوانێ، سوار، ليفو، بوصەلێ، ناڤكەندالا، دێمكا، دارهۆزان، ئاڤگەنيێ، بافيا، سكرين، مايێ ئيسلام، چەلكێ سەرى، دورێ، ئينشكێ، اسيان، ميزێ، خەتا مەزن، رەبەتكێ، بازوايا، زاوا، باشويكێ، كەمەكا، شاريا، زيلكان،مامرەشان، كوجۆ، خورزان، قەسركێ، خانەصور، گرێ عەرەبا، دهۆلێ، زۆراڤا، خورزان، كەندالا، زيناڤا ميرى، كولێ، هيشێ...

بەلێ هەر د ڤێ قۆناغێدا و پشتى دەسپێكرنا شۆرشا كوردستانێ ل ئەيلوولا ١٩٦١ێ هژمارەكا زۆر ژ ڤان هەموو خواندنگەهان هاتينەگرتن ب رەنگەكى ل دووڤ بەلگەنامەيەكا بەردەست ل سنوورێ قەزا ئاميديى ل سالا ١٩٦٢ێ تنێ دو خواندنگەهـ مابوونە ڤەكرى و ئەو ژى د سەروبەرەك دژواردا بوون[١١٦] و ب درێژيا ڤان دەهـ سالان گەلەك ژ ڤان خواندنگەهان د گرتى بوونە هەتا پشتى پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ هاتينەڤەكرن و هندەك ژى ل دووڤ سەروبەرێ دەڤەرێ جار دهاتنەگرتن و جار دهاتنەڤەكرن[١١٧]. ب رەنگەكى بەرى راگەهاندنا پێكهاتنا ١١ئادارا ١٩٧٠ێ ل هەرسێ قەزايێن ل بەراهيێ پارێزگەها دهۆكێ ژێ پێكدهات (دهۆك، ئاميديێ و زاخۆ) د هەرسێ قۆناغێن خواندنێ تنێ ٧٣ خواندنگەهـ هەبوون، بەلێ پشتى پێكهاتنێ ب دو سالان هژمارا خواندنگەهان ل سنوورێ هەرسێ قەزايێن پارێزگەها دهۆكێ گەهشتە ١٥٨خواندنگەهان[١١٨]. ڤێ هژمارێ بەردەوام ل زێدەهيێ ددا. بەلێ ڤێ قۆناغێ گەلەك نەڤەكێشا شەرێ ئادارا ١٩٧٤- ئادارا ١٩٧٥د ناڤبەرا شۆرشا كوردستانێ و حكۆمەتا عيراقێ ب سەرداهات، شەر ب شكەستنا شۆرشا كوردستانێ ب داويهات، دەليڤەكا باش بۆ حزبا بەعسا شوفينيزم

هەلکەت ئەوا د دلێ وی دا بەرامبەری کورد و کوردستانێ بجهـ بینیت، د پێنگاڤا بەراهیێدا دەست ب نەهێلانا خواندنا کوردی کر. د هەمان دەمدا دەست ب ڤەگوهاستنا گوند بازێرکێن دەڤەرێ کر، قوناغ ل دووڤ قوناغێ هژمارا هەرە زۆرا گوند و بازێرکێن پارێزگەهێ ژ جهێن وان ڤەگوهاستن و ل هندەك کۆمەلگەهان کۆمکرن. د ڤێ کریارێدا هژمارەك مەزن ژ خواندنگەهان هاتنەگرتن و خویندکار و مامۆستایێن وان ل خواندنگەهێن کۆمەلگەهان و مەلبەندێ پارێزگەهێ و قەزایان هاتنەدابەشکرن، رێڤەبەریا پەروەردێ ژی وەك بینەرەکێ بێ دەستەلات بەرێ خۆ ددا گرتن و ڤەگوهاستنا خواندنگەهان ب خویندکار و مامۆستایێن وان ڤە، هند ژ دەستان دهات فەرمانێن کارگێری بۆ گرتن و ڤەگوهاستنا خواندنگەهان رابگەهینیت. هەر بۆ نموونە ب یەك بەیانا رێڤەبەریا گشتیا پەروەردێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل ۱۹۷۸/۸/۱٤ێ ۲۸ خواندنگەهـ هاتینەگرتن ژ بەرکو خەلکێ وان گوندان هاتبوونە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهێن ب کوتەکی[119]. بەلێ سەرەرای ڤی سەروبەری ل سالا خواندنێ ۱۹۸٤- ۱۹۸٥ێ ل سەرانسەرێ سنوورێ ئاماژەپێکریێ پارێزگەهێ هژمارا خواندنگەهان گەهشتە ۳۲٥ خواندنگەهێن سەرەتایی و ٤۱ خواندنگەهێن ناڤنجی و دوا ناڤنجی و ئامادەیی و پیشەیی[120].

سەروبەرێ سیاسی و لەشکەری کاریگەرییەك مەزن ل سەر سەروبەرێ خواندنێ و خواندنگەها ل پارێزگەها دهۆکی هەبوو و د ئەنجامدا بەردەوام خواندنگەهـ دهاتنەگرتن، هەر بۆ نموونە ل دەسپێکا سالا خواندنێ ۱۹۸٥- ۱۹۸٦ێ ب بریارا لیژنا ئەمنیا پارێزگەها دهۆکێ هژمار ۲۳٦ رۆژا ۱۹۸٥/۹/۲۲ێ ۲۰۸ خواندنگەهـ ل گوندێن پارێزگەها دهۆکێ ب مهانا هندێ کو ل دەرڤەی دەستەلاتێ حکۆمەتێنە و ل دووڤ فەرمانا کارگێریا رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ ٥۷٥ ل ۱۹۸٥/۱۰/۲۰ێ هاتنەگرتن[121].

سەرەرای ڤی سەروبەری هەمیێ ژی ژ ئەنجامێ زێدەبوونا هژمارا خەلکێ پارێزگەهێ و کۆمبوونا بەرفرەهـ خەلکێ گوندان ل بازێر و کۆمەلگەهان حکۆمەتا عیراقێ ناچار دبوو هژمارەکا دیترا خواندنگەهان ل بازێر و بازێرك و کۆمەلگەها ڤەکەت، ب رەنگەکی ل سەرانسەری سنوورێ پارێزگەهێ کو هەرچوار قەزایێن (دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و سێمێلێ) ڤەدگرت ل دووڤ ئامارا پەروەردەیی یا رێڤەبەریا گشتی یا پەروەدا دهۆکێ یا سالا خواندنێ ۱۹۹۰- ۱۹۹۱ێ ۲۱۲ خواندنگەهـ ب گشت قوناغێن خواندنێ هەبوون[122].

پشتی سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ و دامەزراندنا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ل ژێر سیبەرا دەستەلاتا کورستانی یا رەنگ سەربەخۆ سەرەرای کێم ئەزموونیا بەرپرسێن کوردستانێ د دەولەتدارێیدا و سەرەرای دو دووڕپێچێن ئابووری ل سەر کوردستانێ و شەرەنیخا ناڤخۆیی ل هەرێما کوردستانێ و دژایەتیا دەولەتێن جیران بۆ دەستەلاتداریا کوردی ل باشوورێ کوردستانێ پێنگاڤێن بەرچاڤ د وارێ پەروەردە و فێرکرنێدا هاتنە هاڤێتن، ل سالا خواندنێ ۱۹۹۳- ۱۹۹٤ێ هژمارا خواندنگەهان ب گشت قوناغێن خواندنێ ڤە گەهشتە ۳۹۹ خواندنگەهان، ئانکو ۱۸۷ خواندنگەهێن زێدەتر هاتینەڤەکرن، ئەڤ زێدەبوونە ژی د هەمی قوناغاندا بوویە، بۆ نموونە ل سالا ۱۹۹۰- ۱۹۹۱ێ ل سەرانسەری دهۆکێ ۱۲۷ خواندنگەهێن سەرەتایی و ٥٤ خواندنگەهێن (ناڤنجی و دواناڤنجی و ئامادەیی) و تنێ دو پەیمانگەهـ ل سەرانسەری دهۆکێ هەبوون ل سالا خواندنێ ۱۹۹۳- ۱۹۹٤ێ ئەڤ هژمارە گەهشتنە ۲۹٦ خواندنگەهێن سەرەتایی، ۷ باغچەیێن ساڤایان، ۲ سەرەتای یێن ئیسلامی، ۳ خواندنگەهێن ناوجوانان، ۲ دواناوەندیێن ئیسلام، و ۷٦ خواندنگەهێن (ناڤنجی و دواناڤنجی و ئامادەیی) و پێنج پەیمانگەهـ هەموو دبوونە ۳۹۱ خواندنگەهـ و پەیمانگەهـ[123].

زێدەباری ڤەکرنا چەندین پەیمانگەهـ و زانکۆیان کو د جهەکێ دی یێ ڤێ ئینسکلوپیدیایێ ئاماژە پێ هاتییەکرن، سال ل دووڤ سالێ پەروەردە و فێرکرنی ل پارێزگەها دهۆکێ پێنگاڤێن باش بەرەڤ پێش هاڤێتینە، ل سالا ۱۹۹٦- ۱۱۹۷ ێ هژمارا

خواندنگەهـان ب گشت قۆناغێن خواندنێ ڤە گەهشتە ٥٠٤ خواندنگەهـان ل سالا ٢٠٠٢- ٢٠٠٣ێ ئەڤ هژمارە گەهشتە٧٥٨ خواندنگەهـان[١٢٤]. ئەگەر ڤێ هژمارێ بەراوردبکەین دگەل سالا خواندنێ ١٩٩٠- ١٩٩١ێ کو پتریا سالێ خواندنێ د سەردەمێ دەستەلاتداریا حکۆمەتا بەعسدا بوو دێ بینن د ناڤبەرا ١٢ سالاندا ٥٤٦ خواندنگەهێن نوو ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ هاتینەڤەکرن وێ چەندێ ژی بەرچاوەرگرین هەردو قەزایێن ئاکرێ (ئاکرێ و بەردەرەش) و شێخان پشتی سەرهلدانێ هاتینە سەر پارێزگەها دهۆکێ.

ب روودانا شەرێ رزگارکرنا عیراقێ ل سالا ٢٠٠٣ێ و ژناڤچوونا رژێما بەعسا حوکمدار ل عیراقێ سەروبەر ل سەرانسەری کوردستانێ هاتەگۆهارتن و ئەگەرێن پێشڤەچوونێ د هەموو وارانده زێدەتر لێ هاتن و پێشڤەچوونەکا مەزن سەرانسەری هەرێما کوردستانێ ڤەگرت و ڤێ پێشڤەچوونێ ژوارێ پەروەردە و فێرکرنێ ژی گرت، یا هەرە گرنگ د ڤێ قۆناغێدا دەڤەرێن نوو رزگارکرێن باشوورێ کوردستانێ ئەوێن هەتا نها وەك کارگێری سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤە ئەرکێ سەرپەرشتی و پێشڤەبرنا سەروبەرێ وانێ پەروەردێ کەتە سەر پارێزگەها دهۆکێ و خواندنا کوردی ل وان دەڤەرا هاتەچەسپاندن، ئانکو سەروبەرێ پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ ژی بەرفرەهتر لێ هات، ژ ئەنجامێ ڤی سەروبەرێ نوو و هاتنەپێشا ئەگەرێن پێشڤەچوونا واری پەروەردێ بێن ئاماژەپێکری هژمارا خواندنگەهـان ب هەموو قۆناغێن خواندنێ ڤە ل سالا خواندنێ ٢٠٠٣- ٢٠٠٤ێ گەهشتە ٩٤٢ خواندنگەهـانن ل سالا ٢٠٠٧- ٢٠٠٨ێ گەهشتە ١٢١١ خواندنگەهـان، ل سالا ٢٠١٠-٢٠١١ێ گەهشتە ١٢٩٣ خواندنگەهـان[١٢٥] کو ئەڤ هژمارە خواندنگەهێن سەرانسەری پارێزگەهێ دگەل دەڤەرێن نوو رزگارکرێن سەر ب سنوورێ پارێزگەها مووسلێ ب خۆڤە دگریت، ل ڤێرێ ئەگەر رێەیا پێشڤەچوونێ د وارێ ڤەکرنا خواندنگەهـا د ناڤبەرا سالا ١٩٩٠- ١٩٩١ و سالا ٢٠٠٢- ٢٠٠٣ وەرگرین دێ بینین رێژا ٪ هژمارا خواندنگەهـا زێدەبوویە. ئەڤ هژمارە ل سالا خواندنێ ٢٠١٣- ٢٠١٤ گەهشتییە ١٦٢٦ خواندنگەهـان کو ١٣١٢ژێ خواندنگەهێن بنەرەتینە و ل سالا ٢٠١٦- ٢٠١٧ ئەڤ هژمارە گەهشتییە ١٦٠٥ خواندنگەهـان کو ١٢٧٠ ژێ خواندنگەهێن بنەرەتینە[١٢٦].

ب ڤی رەنگی د بینین پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ واری پەروەردێ پێشڤەچوونەکا مەزنتر ب خۆڤە دیتییە و پشتە نەمانا حکۆمەتا بەعسی ئەڤ پێشکەتنە هێز مەزنتر لێ هاتییە و پێنگاڤێن مەزنتر بەرەڤ پێش چوویە.

## ژێدەر و پەراوێز


١. عزيز ياور، التعليم و فصول من تاريخ مدارس خانقين١٨٨٧- ٢٠٠٧م،(السليمانية- ٢٠٠٩)، ص ١٩.

٢. الدكتور جمال اسد مزعل، نظام التعليم في العراق، (الموصل- ١٩٨٩)، ص١٦.

٣. عزيز ياور، ژێدەرێبەرێ، بپ ١٩.

٤. الدكتور جمال اسعد مزعل، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٧.

٥. هەمان ژێدەر، بپ١٧.

٦. عماد عبدالسلام رؤوف، مدارس بغداد في العصر العباسي،(بغداد- ١٩٦٦)، ص٨ ؛ دكتور سعيد مرسي احمد و دكتور سعيد اسماعيل علي، تاريخ التربية و التعليم، (القاهرة- ١٩٧٤)، ص١٥٣.

٧. عماد عبدالسلام رؤوف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩.

٨. هەمان ژێدەر، بپ ٩- ١٠

# خواندن ب زمانێ کوردی ل بەهدینان

موسەدەق تۆڤی

پشتی پەیدابوونا ئایینێ ئیسلامێ کریارا فێرکرنێ ل مزگەفتان و حوجەرەیان پاشتر ژی ل خواندنگەهێن ئایینی یێن سەربەخۆ ئانکو یێن دەرڤەی مزگەفتان دەسپێکریە و هیچ گومان تێدا نینە دەسپێك و داوییێن ڤێ خواندنێ نە تنێ ل وەلاتێن عەرەبی بەلکی ل سەرانسەری جیهانا ئیسلامی ب زمانێ عەرەبی بوون. کوردستانا مە ژی پشکەك بوو ژ ڤێ جیهانێ بەلی ب بۆرینا دەم و چەرخان و ژ ئەنجامێ گەلەك پێدڤیاتییان و ب مەرەما هندێ رێك ل بەر قوتابی ب تایبەت د قوناغێن زارۆکینیێ و دەسپێکا خواندنێدا خوشبیت باشتر د زانستێن ئیسلامی بگەهیت و زووتر فێری زمانێ عەرەبی ببیت، کو زانستێن ئیسلامی وی چەرخی پێ هاتبوونە نڤیسین، هندەك ژ زانا و مەلایێن کورد ب تایبەت ئەوێن هزرەکا نەتەوەیی ل جەم هەی، هندەك ژ ڤان زانستان ب تایبەت ڤوناغێن دەسپێکی یێن ڤان زانستان ب کوردی نڤیسین و هندەك فەرهەنگوك و پەرتووکێن دی یێن فێربوونا زمان و رێزمانا کوردی و هندەك پەرتووکێن باوەریێن ئایینی ئانکو عەقیدەیان و مەولوودنامەیان ب کوردی بنڤیسن و ب قوتابیێن خۆ بدەنە خواندن. ئەڤ بەرهەمێن زانایێن کورد دگەل چەندین ژێدەرێن دی یێن عەرەبی و فارسی بەرنامێن خواندنێ بوون ل خواندنگەهێن ئایینی ل کوردستانێ هەتا ژیێ ڤان خواندنگەهان ب داویهاتی. هەژیە بێژین ئەڤ بەرهەمە دگەل بەرهەمێن دیترێن زانایێن کورد ژ هەلبەستێ و درەنگتر ژی پەخشانێ گەنجینا دەولەمەندا ئەدەبیات و رەوشەنبیریا کوردی پێك دئینن.

ژ وان بەرهەمان یێن چەند سەد سالەکان هاتینە خواندن و قوتابیێ کورد ئانکو فەقیێ کورد ل حوجرە و مزگەفتان و خواندنگەهێن ئایینی مفا ژێ وەرگرتی:

**دەستوورا زمانێ عەرەبی ب کوردی،** ئەڤ بەرهەمە رێزمانا زمانێ عەرەبی یە بەلێ ب کوردی هاتییە شروڤەکرن، ل سەدسالیا (دەهێ مشەختی/١٦-١٧زایینی) ژ ئالیێ عەلی تەرەماخی ڤە هاتییە دانان[1].ئەڤ دەستوورە پێکهاتییە ژ:

١- اسم (ناڤ) شەش پشکە.

٢- فعل(کردار- فرمان) حەفت پشکە.

٣- حرف (تیپ).

٤- صرف فارسی ئانکو رێزمانا فارسی و بەراورد کریە دگەل عەرەبی ١٦ پشکە و ل هندەك جهان ژی بەراوردکریە دگەل کوردی[2].

**مەلا مەحموودێ بازیدی*** د وێ پیشەكیێدا یا بۆ دەستوورا عەلی تەرەماخی نڤیسی دیاردكەت كو مەرەما نڤیسكاری ژ نڤیسینا ڤێ پەرتووكێ بۆ ب ساناهیكرنا فێربوونا زانستێ (صرف)ێ زمانێ عەرەبی یە ل جەم زارۆكێن كورد ئەوێن ل خواندنگەهێن وی سەردەمی دخواندن، هەروەكی دبێژیت: ئەوی عەلی تەرەماخی بخۆ بدەستێ خۆ د نیڤا گوندی مزگەفت و مەدرەسە بنا كرینە، و وی مودەیەكی بخۆ ژی دەرس گۆتینە، وەك دیتییە و موشاهەدەكرینە كو علمێ صرفێ فنكی زەحمەت و دژوار و ئاسێ یە. و موبتەدی زوو ب زوو صیغە و ئەعلالێد وان ژ كتێبێد عەرەبیە اخراج ناكن. ژ بۆی هیسییا موبتەدییان ب زمانێ كرمانجان عیبارەتەكی تەصریفی تەصنیف كری یە كو ئەو عیبارەت د نیڤا طەلەبەیێ د ئەكرادان قەوی مەقبوول و ئەهەم و لازمە[٣].

عەلی تەرەماخی ب خۆ د دەستوورا خۆدا كو ب (هذا عباره علی ترماخی و هذا كتاب صرف لسان كردی) ناڤكریە، د دەت دیاركرن كو بنیاتێ هەموو زانستان زانستێ رێزمانێ یە، لەورا ژی پێویستە ب زمانێ كوردی زانستێ رێزمانێ بزانن، هەروەك دبێژیت: اعلم تو بزان ئەی موفره دی موذەكەرێ موخاطب كو بۆی طایفا ئەكرادانرا ژی لازمە كو ب زمانێ كرمانجی ئەو ژ علمێ صەرفێ بزانن، لورا بنا و ئەساسا حەموو علمان ل سەر صەرفێ یە[٤]. ب ڤێ برگەیێ دەست ب رێزمانا خۆ كریە و ل داویێ بۆ قوتابییان دایە دیاركرن كو ئەڤە كورتییەكا زانستێن رێزمانێ یە و ل دووڤ شیانێن خۆ بەرهەڤكریە، بەلێ ب كورتیێ زانست بدەستڤە ناهێن و پێویستە قوتابی پتر پەرتووكێن رێزمانێ بخوینیت، هەروەك دبێژیت: اڤنە بەعضێ قەواعیدێد جوزئیە بوون كو من بیحەیسو قودرەت تەنزیم كرییە، لاكین ئەڤ نە جزوی نە، بجزوی كول حاصل نابی، لازمە تو كتێبێد صەرفیە بخوونی ئیجاری ئەصل و فەرع و قەواعیدێ صەرفیە مەعلومێ تە دبی، یانێ علمێ صرف موتلەق ژ حەموو علمان چەتین ترە..[٥]

دەمێ د (هزارساڵیا مشەختی- سەدساڵیا ١٦-١٧ز) عەلی تەرەماخی ئەڤ بەرهەمە ب كوردی بۆ قوتابیێن خواندنگەهێن ئایینی یێن كورد نڤیسی ئەو نێزیكی هزار سالان بوو د بەرنامێن خواندنێ ل كوردستانێ و وەلاتێن دی یێن مووسلمانان نە تنێ زانستێ رێزمانا عەرەبی (صرف) بەلكی هەموو زانستێن وی سەردەمی دهاتنە خواندن ب زمانێ عەرەبی بوون، بەلێ مەلاییێن كورد ئەڤ دەرسە ب كوردی بۆ قوتابیێن خۆ دگۆتنەڤە و شروڤە دكرن هەرچەندە كەرستە و ژێدەرێن وان عەرەبی بوون و عەلی تەرەماخی ب ڤێ پێنگاڤێ كو ژ هەستێ وی یێ نەتەوەیی بوو دەسپێكەك بۆ ب كوردیكرنا بەرنامێن خواندنێ دانایە، هەروەك د. مارف خەزنەدار دبێژیت: ئەمە بۆ ئەو سەردەمە ئەوپەری نیشتمان پەروەری و هەستی كوردایەتی بووە.[٦]*

• **نووبهارا ئەحمەدێ خانی:** فەرهەنگەكا عەرەبی كوردی یە، ئەحمەدێ خانی(١٦٥٠-١٧٠٧) ل ساڵا١٦٨٣ ب هەلبەست ڤەهاندیە دا كو زارۆكێ كورد د رێكا ڤێ فەرهەنگە هەلبەستێرا باشتر فێری زمانێ عەرەبی ببیت، پاشترد قورئانێ و ژێدەرێن دن یێن ئیسلامێ شارەزا ببیت، هەروەكی خانی ب خۆ دبێژیت:

**ژ پاش حەمد و صەلەواتان، ئەڤ چەند كەلیمەنە ژ لوغاتان،**
**ڤێك ئێخستن ئەحمەدێ خانی، ناڤ نووبهارا بچوكان دانی،**
**نە ژ بۆ صاحب رەواجان، بەلكی ژ بۆ بچووكێد كرمانجان،**
**وەك ژ قورئانێ خلاص بن، لازمە ل سەوادێ چاڤناسبن،**
**دا ب ڤان چەند رەش بەلەكان، ل وان طەبیعەت مەلەكان،**
**دەرێ زهنی ڤەبیتن، هەرچی دخوون زەحمەت نەبیتن**[٧]

هەروەكی دهێتە ڤەگێران خانی ب خۆ ل خواندنگەها بازیدێ دەرس داینە قوتابیان و مەرەما وی ژی ژ دانانا نووبهارێ روهنكرن و سڤككرنا زمانێ عەرەبیی ب گرێك بوو ل بەر شاگردێن كورد[٨] هەژیە بێژین گەلەك زانایێن دی پشتی خانی ئەڤ رەنگە فەرهەنگە ڤەهاندینە، وەك فەرهەنگێن:

**- ئەحمەدی یا شێخ مارفێ نودەیی(١٧٥٦-١٨٣٦)**

**- گولزار، ئیسماعیلێ بازیدی(١٠٦٥- ١١٢١مش)**

- مرصاد الاكفال،(١٨٨٥- ١٩٣٥)
- دو رشته، مەلا عەبدولكەریمی مودەریس، ١٩٧٠ چاپبوویە[٩].

* عەقیدا ئیمانی- عەقیدا ئەحمەدێ خانی، وەسان دیارە هەستا نەتەوەییا خانی ل ئاستەكێ هەرە پێشكەتی و پێگەهشتنا هزری بوویە، لەوما ژی نەتنی هزر ل هندێ كریە زارۆكێن كورد د رێكا نووبهارێرا فێری عەرەبی ببن، دا ب فێربوونا عەرەبی فێری بنەمایێن ئایینێ ئیسلامێ ببن، بەلكی بزاڤ كرینە زارۆكێ كورد ب كوردی فێری باوەرییا (عەقیدا) ئیمانی و بنەمایێن (روكنێن) ئیمانێ و بنەمایێن ئیسلامێ ببیت، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی عەقیدا ئیمانی كو هندەك جاران ژی ب عەقیدا خانی هاتییە ناڤكرن بۆ فێربوونا رووكنێن ئایینی و ستوونێن ئیسلامێ دانایە و ئەڤ بەرهەمە بوویە یەك ژ بەرنامێن خواندنێ وەك سەیدا سادق بەهائەدین دبێژیت: ئەڤ باوەرینامە سەیدایێ خانی دگەل نووبهارا وی هەتا كو ڤان سالێن دیماهیی د خویندنگەهێت ئولی یێت كوردی دا ل دەڤەرا بەهدینا، هەكاری، موشێ و وانێ، دیاربەكرێ و بۆتان ب دەرس دهاتە خویندن و شاگردێت كورد ژ بەر دكرن[١٠].

* مولوودا مەلایێ باتەیی، ل سەد سالییا شازدێ زایینی هاتییە نڤیسین هەتا نها چەند جاران هاتییە چاپكرن، باتەیی ب مولوودناما خۆ ل هەموو كوژی و قورنەتێن دەڤەرا هەكاری، بەهدینان و بۆتان، دیاربكر و مۆش و سەرحەدان ب ناڤودەنگ بوویە[١١].

* تصریف و ظروف و تركیبا مەلا یونسێ هەلكەتینی، ئەڤ زانایە ل سالا ١٨٧٥ خۆدیێ سێ نامەیانە د زانستێن صرفدا، (تصریف) و (ظروف) و (تركیب) ب زمانێ كوردی[١٢].

* نەهجولئەناما مەلا خەلیلێ سێرتی، (نهج الانام) یەك ژ ناڤدارترین بەرهەمێن شاعر و زانایێ ناڤدارێ كورد مەلا خەلیلێ سێرتی یە، دو دانە ژ ڤی بەرهەمی یەك ب زمانێ عەرەبی و یەك ب زمانێ كوردی دانایـنە، هەرچەندە هەردو ڤەهینوك ب ئێك ناڤینە و بابەتێ وان ژی ئێكە، بەلێ ئێك ژ وان نەوەرگێرانە بۆ یادی، بەلكی هندەك كێم و زێدەهی دناڤبەرا هەردو دانەیاندا هەنە[١٣].

سەیدا ئەبو زەید سندی د بابەتەكیدا ب ناڤێ مێژووا خواندنێ ل پاییزا ١٩٧١ئاماژە ب ڤی بەرهەمی كریە وەك وان پەرتووكێن كوردی یێن ل خواندنگەهێن ئایینی یێن كوردستانێ د هاتنە خواندن[١٤].

هەروەكی مەلا خەلیلی ب خۆ گۆتی وی ئەڤ ڤەهینۆكە ل سەر داخوازا برایەكێ خۆ بۆ زارۆكێن كرمانج یا نڤیسی دا بۆ خۆ مفای ژێ وەرگرن. ئەڤ ڤەهینۆكە بابەتێن عەقیدێ، سیرەتێ (ژیاننامـا پێغەمبەری س) و ئەخلاق و ئادابان ڤەدگریت، ئەڤ كتێبا مەلا خەلیلی ب درێژیا سەدسالان و پتر ل مزگەفتێن كوردستانێ ب دەرسینی دهاتە خواندن[١٥] ب ڤێ چەندێ مەلا خەلیلێ سێرتی ل دووڤ رێبازا عەلی تەرەماخی و ئەحمەدێ خانی بزاڤێن ب كوردیكرنا هندەك ژ بەرنامێن خواندنا وی سەردەمی كریە و هندەكێن دی ژی پاشتر رێكا وان گرتیە بەر.

هەر ب ڤی رەنگی گەلەك زانایێن دیترێن كورد بابەتێن دینێ فێركرنا وی سەردەمی ب كوردی بۆ قوتابیان وەك ڤەهینۆكا (سر المحشر) یا فەق رەشیدێ هەكاری (سەدسالیا ١٨-١٩ زایینی ژیایە) و ڤەهینۆكا وی یەك ژ ڤەهینۆكێن كرمانجیە كو مەلا و فەقییان ل هندەك دەڤەرێن كوردستانێ ل مزگەفت و خواندنگەهێن دینی دخواندن[١٦]. هەروەسان ڤەهینۆكا مەلا خەلیلی د علمێ نەحوێدا وەك دیارئەڤ.....یا دروست بیت[١٧] (١٧/١٠) هەروەسان ڤەهینۆكا مەلا هادیێ لجەیی ١٨٦٠- ١٩١٢ كو ئەو د علمێ تەجویدێ دایە[١٨].

ل هندەك دەڤەرێن دەڤەرێن دیترێن كوردستانێ فەرهەنگە هەلبەستا (ڤەهینۆكا) ئەحمەدی باشێخ مارفێ نودەیی ل شوونا نووبهارا ئەحمەدێ خانی دهاتە خواندن[١٩]. ل دەڤەرێن ئەردەلان و هەورامان (رۆڵە بزانی) یا مەلا خدرێ رواری (١٧٢١-١٧٨٠) دهاتە خواندن، كو نامیلكەكا بچووكە ل ئاستێ زارۆكان و ب زاراڤێ هەورامانی هاتییە دانان دا كو فێری ئەسل و فروعێن ئایینی ببن، هەروەسان

ئاسمان و زەمین دهاتە خواندن کو ئەو ژی ژ نڤیسینا میرزا قادرێ پاوەیی یە و ب زاراڤێ هەورامی یە[20]. هەروەسان هندەك کتێبێن دی یێن سڤك ب کوردی ل دەڤەرێن جودا جودا یێن کوردستانێ ل قوناغێن بەراهیێ یێن خواندنی ب زارۆکان دهاتنە خواندن دا کو رێك ل بەر وان ڤەبیت بۆ باشتر فێربوونا زمانێ عەرەبی و زانستێن ئایینێ ئیسلامێ یێن بەرفرەهتر.

هندی پەیوەندی ب زمانێ خواندنێ ڤە هەی پشتی خواندنگەهێن نوو (رەسمی) هاتینە ڤەکرن، د سەردەمێ سولتانێ ئوسمانی سولتان سەلیمێ سیێ (١٧٨٩- ١٨٠٧) د ناڤبەرا ١٧٩٣-١٧٩٥ێ هندەك خواندنگەهێن لەشکەری هاتنە ڤەکرن کو پرانییا مامۆستایێن وان فرەنسی و زمانێ خواندنێ ژی فرەنسی بوو.

بەلێ د سەردەمێ سولتانێ پشتی وی سولتان مەحموودێ دووێ (١٨٠٨-١٨٣٩) هندەك خواندنگەهێن لەشکەری و ل دووڤرا دو خواندنگەهێن لەشکەرێن بلند یەك بۆ نوشداریێ و یا دن بۆ ئەندازیاریێ و هندەك سەرتایی و دوا ناڤنجییێن مەدەنی هاتنە ڤەکرن کو زمانێ خواندنێ و فێرکرنێ تێدا زمانێ ترکی (یا ئوسمانی) بوو[21] پاشتر ژی د هەر سەردەمەکیدا و هەر رەنگێ خواندنگەهەکێ هاتبیتە ڤەکرن زمانێ فێرکرنێ تێدا زمانێ ترکی بوو و هندەك جاران ژی زمانێ فرەنسی و هندەك زمانێن بیانی دهاتە خواندن.

ل دووڤ هەردو بەرنامێن چاکسازیێ یێن سولتان عەبدولمەجیدی (١٨٣٩-١٨٦١) بەرنامێ ب (خطي شريف گلخانه) هاتییە ناڤکرن و ل سالا ١٨٣٩هاتییە راگەهاندن و بەرنامێ ب (خطي همايون) هاتییە ناڤکرن و ل سالا ١٨٥٦هاتییە راگەهاندن، هەروەسان قانوونا چاکسازیا سیستەمێ فێرکرنێ ل دەولەتا ئوسمانی یێ ل مەها تەباخا ١٨٤٦هاتییە راگەهاندن هەروەلاتیەکێ ئوسمانی مافێ خواندن و فێربوونێ ل خواندنگەهێن دەولەتێ هەبوو بەلێ ئاماژە ب مافێ فێربوونێ ب زمانەکێ دی ژبلی ترکیا ئوسمانی نە هاتییە کرن[22]، بەلێ دڤێت بێتە گۆتن ئەو خواندنگەها دوا ناڤنجیا ل سالا ١٨٦٨ ب ناڤێ لیسیە یان ژی خواندنگەها سولتانی (المدرسة السلطانية) هاتییە ڤەکرن قوتابیان تێدا زۆربەی دەرسێن خۆ ب زمانێ فرەنسی وەردگرتن. و ل دووڤ بەرنامێن خواندنێ یێن وی سەردەمی ل قوناغا روشدیە ئانکو ناڤنجیا وی سەردەمی رێزمانا فارسی و عەرەبی دهاتنە خواندن دگەل دەرسێن دیتر کو هەموو ب ترکی بوون. بەلێ د قوناغا ئامادەییدا ئەڤ دو دەرسێن عەرەبی و فارسی نە دمان[23]، هەر ژ سالا ١٨٨٥ ڤە زمانێ فرەنسی و ژ سالا ١٩٠٦ڤە زمانێ ئینگلیزی وەك دەرسەك هەر ل قوناغا روشدیە هاتنە خواندن[24]. د قوناغا ئامادەییا لەشکەریدا کو دەمێ وێ سێ سال بوون، ژ سالا ١٨٩٢ڤە بوونە چوار سال زمانێ فرەنسی و ژ سالا ١٨٩٢ ڤە زمانێ ئینگلیزی و ژ سالا ١٩٠٦ڤە زمانێ ئەلمانی و رووسی وەك دەرسەك دهاتنە خواندن[25].

ئەوا ل ڤێرێ تێبینی دهێتەکرن زمانێ عەرەبی د قوناغا روشدیە (ناڤنجی)دا دگەل زمانێ فارسی وەك زمانەکێ بیانی ب بەرتەنگی دهاتنە خواندن و هەر د قوناغێن روشدی و ئامادەییدا ژ بیست سالێن داویێ یێن سەدسالییا نوزدێڤە زمانێن فرەنسی، ئینگلیزی، ئەلمانی و رووسی وەك دەرس هاتینە خواندن بەلێ زمانێن گەلێن ل ژێر دەستەلاتدارییا ئوسمانی ب تایبەت ژی زمانێ کوردی ب هیچ رەنگەکی و د چ قوناغەکێدا و ل چ جهەکی نەهاتییە خواندن.

هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن هەتا سالا ١٩٠٨ د هەموو قوناغێن خواندنێ یێن وی سەردەمیدا زمانێ رەسمیێ خواندنێ زمانێ (ترکی)یا ئوسمانی بوو تنێ ل قوناغا ناڤنجی و خواندنگەهێن مامۆستایاندا زمانێ عەرەبی و فارسی هەریەك وەك دەرسەك دهاتنە خواندن، زێدەباری خواندنا زمانێن دیترێن بیانی د قوناغێن جودا دا[26].

سەروبەرێ خواندنێ و زمانێ خواندنێ ل وەلاتێن ژێر دەستەلاتێ ئوسمانی ب ڤی رەنگی بوو هەتا روودانا کودەتا ئوسمانی ل ٢٣تەمووزا ١٩٠٨ێ، ئەوا چەند ئەفسەرێن سەر ب کۆمەلا هەڤگرتن و پێشکەتن (اتحاد و ترقي جمعيتسي) دژی

دەستەلاتێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ بەرپاكری و د ئەنجامدا كۆمەلێ دەستەلات گرتەدەست. پشتی ڤێ رووداني گەلێن ژێر دەستەلاتێ ئوسمانی ب تایبەت عەرەبان كو پشكەك مەزن ژ جوگرافیا دەولەتا ئوسمانی ڤەدگرت، بزاڤكرن زمانێ وانێ نەتەوەیی ل خواندنگەهێن وەلاتێن وان بێتە خواندن، ڤان بزاڤان ل بازێرێن مەزن ب تایبەت ئەوێن مەلبەندێن ویلایەتان وەك بێروتێ و شامێ و بەغدا و بەسرا ب ڤەكرنا هندەك خواندنگەهێن ئەهلیێن عەرەبی وەك خواندنگەها (تذكار الحرية) ل بەسرا كو خواندن تێدا ب زمانێ عەرەبی بوو دەسپێكر، بەلێ ئەڤ خواندنگەهە هەر زوو هاتەگرتن، ژ بەركو دەستهلاتدارێن ئوسمانی دڤیا زمانێ تركی وەك زمانێ خواندنێ ل سەر وان بسەپینن، دەمێ ڤیانا وان بجهـ نەهاتی خواندنگەهـ گرتن. خواندنگەها دووێ یا ئەهلی و ب زمانێ عەرەبی ب ناڤێ خواندنگەها (الترقي الجعفري العثماني) ل داوییا ۱۹۰۸ێ ل بەغدا هاتە ڤەكرن. ڤێ خواندنگەهێ رۆلەك گرنگ د رەوشەنبیركرن و هشیاركرنێدا گێرا، گەلەك ژ كەسایەتیێن عیراقی یێن پاشتر پلەیێن بلند د دەستەلاتێ دەولەتا عیراقێدا گێرای دەرچوویێن ڤێ خواندنگەهێنە[27].

هەروەك دهێتە زانین یاسا و سیستەم و رێنمایێن تایبەت ب سەروبەرێ پەروەردە و فێركرنێ ئەو یاسا بوون یێن ل سالا ۱۸۷۰دەركەتین و ل دووڤ وان ژی رێڤەبەریێن زانیاریێن ویلایەتان كو ل شوونا رێڤەبەریێن پەروەردە یێن نها بوون هیچ دەستەلاتەك نەبوو كو سیاسەتا فێركرنێ ل دووڤ پێدڤیاتیێن ویلایەتان رێكبێخن. زێدەباری ڤێ چەندێ ژی ئەوێن سەرپەرشتیا ڤان رێڤەبەریان دكرن و پرانییا ئەوێن د وارێ فێركرنێدا كار دكرن ترك بوون و زمانێ فێركرنێ ژی زمانێ تركی بوو. زمانێ عەرەبی كو زمانێ مەزنترین گەلێن ژێردەستێ ئوسمانی بوو و زمانێ خەلكێ چەندین ویلایەتێن ئوسمانی و زمانێ ئایینێ ئیسلامێ دینێ رەسمیێ دەولەتا ئوسمانی بوو د چەند دەمژمێرەكێن دیاركریدا دهاتەخواندن و مامۆستایێن ترك یێن زمانێ عەرەبی نەدزانی دەرسێن زمانێ عەرەبی ددانە خویندكاران، ژ بەر ڤێ چەندێ خەلكێ خۆ ژ خواندنێ ل خواندنگەهێن تركی دووردگرتن و پتر بەرەڤ خواندنگەهێن ئەهلی و خواندنگەهێن شاندێن مزگینیدەرێن بیانی دچوون كو وان گرنگی ددا زمانێ عەرەبی و سیستەمێ وانێ خواندنێ ب سەروبەر تر بوو[28].

گەلۆ ئەگەر ئەڤە سەروبەرێ زمانێ عەرەبی بیتن، بێ گومان ژ بەر چەندین ئەگەران سەروبەرێ زمانێ كوردی ل خواندنگەهان نەك خرابتر بوویە، بەلكی هەتا نها چ نیشانەك ل بەر دەستێ مە نینە هەتا رۆژا ۲۳ تیرمەها تەباخا ۱۹۰۸ێ ل خواندنگەهەكێ دەرسەكا زمانێ كوردی هاتبیتە خواندن یان هندەكان داخوازەك بۆ خواندنا زمانێ كوردی پێشكەشی دەولەتی كربیت یان بزاڤەك بۆ ڤێ مەرەمێ ئەنجام دابیتن، تنێ ژ هندەك ژێدەران دهێتە زانین كو ئەو خواندنگەهێن پشتی هێرشا ۱۸۹۲یا فەریق عومەر وەهبی بۆ سەر ئێزدیان ل دەڤەرا شێخان و ناڤ شەبەكان هاتینەڤەكرن بۆ هندەك مەرەمێن تایبەت خواندن تێدا ب كوردی و عەرەبی بوویە، هەروەك ئاماژە پێ هاتییەكرن ب نەمانا دەستەلاتا عومەر وەهبی و ب ئاساییبوونا سەروبەرێ دەڤەرێ ئەڤ خواندنگەهە ژ ناڤچوون[29].

ئەوا دهێتە زانین یەكەمین پێنگاڤ بۆ خواندنا زمانێ كوردی ل خواندنگەهان پشتی كودەتا ئوسمانی یا ۱۹۰۸ هاتییە هاڤێتن، دەمێ ل ۹ ئیلونا ۱۹۰۸ هندەك كەسایەتیێن كورد ژ وان ژی شێخ عەبدولقادرێ شەمدینان، ئەمین عالی بەدرخان، خەلیل خەیالی، جەمیل پاشایێ ئامەدێ و ژەنەرال شەریف پاشا كۆمەلەیەك كوردی ب ناڤێ كۆمەلا هەڤكاری و پێشكەتنا كوردان (كرد تعاون و ترقي جمعيتي) ل ستەنبۆلێ دامەزراندی كو ب یەكەمین رێكخستنا كوردی دهێتە نیاسین. ب پشتەڤانیا ڤێ كۆمەلێ كۆمەلەیەكا رەوشەنبیریا كوردی ب ناڤێ كۆمەلا كورد ژ بۆ بەلاڤكرنا زانینێ (كرد تعميم معارف جمعيتي) هەر د ڤێ سالێدا

هاتییە دامەزراندن، ئەرکێن ڤێ کۆمەلێ ڤەکرنا خواندنگەهان و چاپکرنا کتێبێن کوردی بوو، ڤێ کۆمەلێ ل سالا ١٩٠٩ێ (ل دووڤ هندەك ژێدەران سالا ١٩٠٨ی) خواندنگەهەك بۆ زارۆکێن کورد ل ستەنبۆلێ ڤەکر. ژێ ڤان هەردو کۆمەلان یێ درێژ نەبوو، کۆمەلا هاریکاری و پێشکەتنا کوردان ل سالا ١٩٠٩ێ و کۆمەلا کورد ژ بۆ بەلاڤکرنا زانینێ ل سالا ١٩١٠ێ وەك دیار هاتنە گرتن[٣٠].

ب ڤێ چەندێ خواندنگەها ڤێ کۆمەلێ دبیتە یەکەمین خواندنگەها کوردان ب خۆ بۆ زارۆکێن خۆ ڤەکری، ئەڤ خواندنگەهە خواندنگەهەکا ئەهلی بوو ب پشتەڤانیا دراڤیا کەسایەتی و دەولەمەندێن کوردان هاتبوو ڤەکرن، هەروەك رۆژنامەکا فرەنسی ئاماژە پێکری میر عەبدولرەزاق بەدرخانی د ئاهەنگا ڤەکرنا وێ دا ٣٠ لیرێن ئوسمانی بەخشیبوونە خواندنگەهێ و ژڤان دابوو هەر هەیڤ گۆژمەکێ دراڤی ببەخشیتە خواندنگەهێ، ئەڤ خواندنگەهە ل دەسپێکا ١٩١٩ ل دەڤەرا دیوانیولۆ ل جادا حەجی پاشا یا ستەنبۆلێ هاتبوو ڤەکرن، ڤەکرنا وێ ب روودانەکا گرنگ د ژیانا کوردێن ستەنبۆلێ دا هاتییە ناسین. رۆژنامێن وی سەردەمی یێن ستەنبۆلێ ب تایبەت یێن ئەرمەنی ئاماژە ب ڤەکرنا وێ خواندنگەهێ کربوون[٣١].

هەژیە بێژین یەك ژ دامەزرینەرێن ڤی کۆمەلێ خەلیل خەیالی* رۆلەك گرنگ د دامەزراندنا کۆمەلا کورد ژ بۆ بەلاڤکرنا زانینێ و یەکەمین خواندنگەها کوردی یا ڤێ کۆمەلێ ب ناڤێ (کرد نمونە ابتدائیەسی- مشروطیە) سەرەتاییا نموونەییا کوردی- یا دەستووری ل تاخێ (جنبرلي طاش)** یێ ستەنبۆلێ دامەزراندی و زارۆکێن کورد تێدا ب زمانێ کوردی دخواندن هەبوویە و هەر ڤی کەسی یەکەمین ئەلیفبا کوردی ب تیپێن عەرەبی نڤیسییە و ل سالا ١٩٠٩ل ستەنبۆلێ چاپکریە، وەسان دیار دبیت کو خواندن ب زمانێ کوردی ل ڤێ خواندنگەهێ ب ناڤتێدان و بزاڤێن وی بوویە و ئەلیفبا وی ژی ل ڤێ خواندنگەهێ دهاتە خواندن[٣٢]، هەژیە بێژین ژیێ ڤی خواندنگەهێ و کۆمەلەیا ئەو دامەزراندنی ژ سالا ١٩١٠ێ نەبۆریە.

فەرە ل ڤێرێ بێتەگۆتن هەڤدەم یان د دەمەکێ نێزیك دگەل ڤەکرنا ڤێ خواندنگەهێ د روودانێن شۆرشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزان (١٣٣٣مش) ١٩١٤ یێن ناڤبەرا ١٩٠٧-١٩١٤ دا شێخ عەبدولسەلامی دگەل کۆمەکا کەسایەتی و مەزن و زانایێن دەڤەرا بەهدینان پشتی دەمەکی ژ کودەتا ١٩٠٨ کۆمبوونەك ل دهۆکێ و ل تەکیا شێخ نورمحەمەدێ بریفکانی کریە و د ئەنجامدا بیرئانینەك(یاداشتەك) دایە کوچکا سولتانی (باب العالي) و جڤاتا نوونەرێن ئوسمانی و چەند داخوازەك تێدا ب ناڤێ خەلکێ دەڤەرێ بەرچاڤکرینە و د خالا یەکەما ڤان داخوازیاندا هاتییە کو زمانێ کوردی ببیتە زمانێ رەسمی ل قەزایێن زێبار، ئاکرێ، دهۆك، ئامێدیێ زاخۆ و دخالا دووێدا هاتییە زمانێ کوردی ببیتە زمانێ فێرکرنێ مل بملێ زمانێ ترکی ڤە[٣٣]. هەرچەندە ئەڤ داخوازیە نەهاتییە بجهـ ئینان و ئەنجامێن وێ هێرشێن درندانە بوون بۆ سەر دەڤەرا بارزان و پاشتر گرتن و سێدارەدانا شێخ عەبدولسەلامی بوو ل داویا ١٩١٤، بەلێ ب یەکەمین داخوازناما خەلکێ کوردستانێ بۆ خواندنێ ب زمانێ کوردی دهێتە نیاسین.

بزاڤا دیتر بۆ ڤەکرنا خواندنگەها کوردی هاتییە کرن ل سالا ١٩١٣ێ ل بازێرێ خویێ یێ رۆژهەلاتێ کوردستانێ بوو، دەمێ عەبدولرەزاق بەدرخانی ب هاریکاریا سمکویێ شکاك ل ڤی بازێری کۆمەلەیەك رەوشەنبیری ب ناڤێ (جیهاندانی- جیهانزانی) دامەزراندی، چالاکیا بەراهیێ یا ڤی کۆمەلەیێ ڤەکرنا خواندنگەهەکا کوردی بوو و بۆ ڤێ مەرەمێ ژی هەروەك عەبدولرەزاق بەدرخان د دیت تیپێن عەرەبی بکێر نڤیسینا کوردی ناهێن لەوما ژی بزاڤکرن ل سەر بنیاتێ تیپێن نڤیسینا زمانێ رووسی هندەك تیپ بۆ زمانێ کوردی بینە بەرهەڤکرن، بۆ ڤێ چەندێ ژی پەیوەندی ب رۆژهەلاتناس ی.ا.ئوربللی ل پەیمانگەها زانستێن رووسی ل پترسبۆرگێ کرن،

بەلێ ژ بەر کاودانێن وی سەردەمی بزاڤا بەرهەڤکرنا وان تیپان سەرنەگرت و خواندنگەهە ژی پشتی دەمەکێ کورت هاتەگرتن[٣٤]. ئەڤ خواندنگەهە ب ٢٩ خویندکاران ل رۆژا ٢٢چریا یەکەم ١٩١٣ێ ب ئامادەبوونا سمکویێ شکاك و سەرکردێ لەشکەرێ رووسی ل وێ دەڤەرێ و بەرپرسێن کارگێری و هندەك کەسایەتی و مەزنێن وێ دەڤەرێ هاتبوو ڤەکرن، ئەڤ خواندنگەهە پتر خواندنگەهەکا پیشەیی بوو[٣٥].

وەسان دیارە دسالێن شەرێ جیهانیێ یەکەمدا چالاکیێن کۆمەلە و رێکخراوێن کوردی هاتینە راوەستاندن لەوما بابەتێ ڤەکرنا خواندنگەهان و خواندنا کوردی ژی بێ دەنگ بوویە و چ نیشانەك ل بەر دەست نینە کەسەکی ل ستەنبۆلێ یان ل باژێرێن کوردستانێ بۆ ڤی مەرەمێ کارەك کربیت. کاودان ب ڤی سەروبەری دمینیت هەتا ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ یەکەم ل ٣٠ چریا یەکەم ١٩١٨ێ، پشتی راوەستاندنا شەری ب دەمەکێ کورت ل داویا سالا ١٩١٨ێ کۆمەلا پێشکەتنا کوردستانێ (کردستان تعالی جمعیتی) هاتییە دامەزراندن و ب ناڤتێدان و پشتەڤانیا ڤێ کۆمەلێ کۆمەلا کورد ژ بۆ بەلاڤکرنا زانینێ و وەشانان (کرد تعمیم معارف و نشریات جمعیتی) ل دەسپێکا سالا ١٩١٩ هاتییە دامەزراندن[٣٦].

پێکئینانا دەرسێن ب زمانی کوردی د خواندنگەهێن پێشن دا، ڤەکرنا دەرسخانێن شەڤین، ڤەکرنا خواندنگەهەکا شەڤین و ب پیشە بۆ زارۆکێن سێوی و بێکەس، ڤەکرنا خواندنگەهەکا شەڤین و ب پیشە بۆ کچێن سێوی و بێکەس، ڤەکرنا خواندنگەهەکا مامۆستایان کوردی ژ بەرنامێ ڤێ کۆمەلێ بوون، بەلێ ژیێ ڤێ کۆمەلەیێ ژ سالەکێ دووان نەبۆرییە و نەکاریە تشتەکی ژ بەرنامێ خۆ بجهـ بینیت[٣٧]، ل داویا سالا ١٩٢١ دەمێ کەمال ئەتاتۆرکی دەستەلاتێ ترکیا گرتیە دەست، دەرگەهێ گشت کۆمەلە و چالاکیێن رەوشەنبیری و سیاسیێن کوردی ل ستەنبۆلێ و سەرانسەری باکوورێ کوردستانێ هاتنە گرتن. ل ڤێرێ هەژیە بێژین ئەڤ بزاڤێن هەتا نها بۆ ڤەکرنا خواندنگەهێن کوردی بزاڤێن ئەهلی و کەسی بووینە و حکۆمەتێن هەتا داویا شەرێ جیهانیێ یەکەم دەستەلاتداری ل کوردستانێ کری وەك دەولەتا ئوسمانی و دەولەتا قاجاریا ئیرانێ چ رۆلەك د ڤی واریدا نەگێرایە، بەلکی دژایەتیا هەر پرۆژەکی کریە کەسەکی یان ئالیەکی د ڤی واریدا بزاڤ بۆ کربیت.

د سالێن شەرێ جیهانیێ یەکەمدا و د دوسالێن پشتی شەریدا دەسپێکا بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی ل عیراقێ و باشوورێ کوردستانێ یێ هێژ چارەنڤیسێ وی نەهاتییە دیارکرن پەیدا بوو. هەروەك زێدەرەك ئاماژە پێ دکەت ل داویا سالا ١٩١٩ ل عیراقێ ٧٥ خواندنگەهێن سەرتایی هەبوون، د ٥٦خواندنگەهاندا فێرکرن ب زمانێ عەرەبی بوو، ل ١١خواندنگەهان ب زمانێ ترکی بوو ل گوندێن تورکمان یێن بەلاڤە ل سنوورێ رۆژهەلاتی ژ مەندەلی هەتا ئەربیل و ل تەلەعفرێ، ل ٦ خواندنگەهان ب زمانێ کوردی و ل خواندنگەهەکێ ب زاراڤێ شەبەکیێ کوردی و ل خواندنگەهەکا دی ب فارسی بوو، و ل خواندنگەهێن سریان و کلدانێن ویلایەتا مووسلێ ژی ب (فەلەکانی) سریانیا نوو بوو. دگەل هندێ ژی عەرەبی وەك زمانێ نڤیسینێ ل خواندنگەهێن بلندتر ژ ڤانا دهاتە بکارئینان. هەمان ژێدەر دبێژیت: ل سەردەمێ حکۆمەتا ئوسمانی هەموو فێرکرن ب زمانێ ترکی بوو و خواندنگەهان خۆ ژ ڤان گرێکان دووردگرت، ئارمانجێ مە بوو ئەو چەندە کو زارۆکان ب وی زمانی فێرکەین یێ تێ دگەهن، د وان بەرنامێن خواندنێ یێن گولانا ١٩١٩دەرکەتین هاتییە زمانێ فێرکرنێ زمانێ ناڤخۆیی یێ بەربەلاڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ نها عەرەبی ل خواندنگەهێن کوردی و تورکمانی وەك زمانەکێ بیانی دهێتە خواندن[٣٨].

ل ڤێرێ دیار دبیت لەشکەرێ ئینگلیزی یێ وی چاخی ب لەشکەرێ داگیرکەر دهاتە ناڤکرن، چاوان ب هاتنا وان رێك ل بەر خواندنا عەرەبی ڤەکریە و رێك ل بەر رۆژنامەڤانیێ ب زمانێ کوردی ڤەکریە ئەو ژی ب بەلاڤکرنا رۆژناما تێگەیشتنی راستی* بلا بۆ

مەرەمێن خۆیێن تایبەت ژێ بیتن، هەر ب ڤی رەنگی رێك ل بەر خواندن و فێركرنێ ب كوردی خوشكرییە، ئانكو ئەم دكارین بێژین پشتی ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ یەكەم بۆ یەكەمین جار زمانێ كوردی ل خواندنگەهێن رەسمی هاتییە خواندن حنێرا ڤێ چەندێ ژی دزڤریتەڤە بۆ دەستەلاتداریا بریتانی و ئەم دكارین بێژین بەری دامەزراندنا حكۆمەتا مەلكییا عیراقێ ل ٢٣ تەباخا ١٩٢١ێ خواندنا كوردی ل هندەك خواندنگەهان هەبوویە، هەرچەندە پێزانین ل بەر دەست نینن ئەو شەش خواندنگەهێن كوردی یێن سالا ١٩١٩ێ ل كیژ دەڤەرێ یان باژێری بوون.

ل ڤێرێ پێویستە بێتە گۆتن ل ١٩ چریا دووێ ١٩١٨ێ یەكەمین دەستەلاتداریا كوردی - یەكەمین قۆناغا حوكمداریا شێخ مەحموودێ نەمر- ل سلێمانیێ ب پەسەندا حاكمێ گشتیێ ئینگلیزی ل بەغدا و ب ئامادەبوونا نوونەرێ وی میجەر نوئێلی هاتەراگەهاندن و ڤێ قۆناغا حوكمداریا شێخ مەحموودی هەتا ٢٢ گولانا ١٩١٩ێ ڤەكێشا[٣٩].

ئەوا تێبینی دهێتەكرن د ڤێ قۆناغێدا كو ناڤبەرا چریا دووێ ١٩١٨ هەتا ٢٢ گولانا ١٩١٩ێ ئانكو تنێ شەش هەیڤان ڤەكێشایە سەروبەرێ وی سەردەمی دەلیڤە نەدایە هندێ گرنگیەك ب بابەتێ خواندنێ و خواندنگەهان بێتەدان و وەك ژێدەر ئاماژە پێ دكەن هەتا نێزیكی سێ سالان پشتی هاتنا ئینگلیزی بۆ سلێمانیێ چ خواندنگەهـ ل وی باژێری نەبوون[٤٠]. بەلێ پشتی كو ل ٢١ گولانا ١٩١٩ لەشكەرێ ئینكلیزی سەر ژ نوو دەستەلاتێ باژێری گرتیە دەست، ئەفسەرێ ئینگلیزێ كوردیزان و شارەزایێ كاروبارێن كوردان میجەر سون* وەك حاكمێ سیاسیێ سلێمانیێ دەست بكار بووی، ڤی ئەفسەری سەخمەرات رازیكرنا خەلكێ دەڤەرێ چەند پێنگاڤەكێن د بەرژەوەندیا وی خەلكیدا هاڤێتن. یەك ژ ڤان پێنگاڤان ژی ئینانا چاپخانەكی و پاشتر بەلاڤكرنا یەكەمین رۆژناما سلێمانیێ بوو ب ناڤێ پێشكەوتن ل ١٩ نیسانا ١٩٢٠- ٢٩ خزیرانا ١٩٢٢، ب ڤێ چەندێ ژی ڤی ئەفسەرێ لەشكەرێ داگیركەر نەتنێ رێك ل بەر رۆژنامەڤانیا كوردی بەلكی ل بەر تەڤایی وارێن رەوشەنبیری ل دەڤەرێ ڤەكر، ڤەكرنا خواندنگەهان ژی یەك ژ ڤان واران بوو یێن میجەرسونی گرنگی پێدای، ل مەها كانوونا ئێكی ١٩١٩ێ دەمێ كابتن جیرۆم فارل هاریكارێ وەزیرێ زانیارییێن گشتی سەرەدانا سلێمانیێ دكەت كو وی دەمی میجەرسون حاكمێ وێ یێ سیاسی بوو، دەمێ چوویە سەرەدانا خواندنگەهێن باژێری و دەوروبەرێن وێ، دیت سەروبەرێ فێركرنێ ل ڤان خواندنگەهان گەلەكێ پاشڤەمایە و مامۆستا نە خۆدی شیانن، ژ بەركو فێركرن ب زمانێ كوردی بوو و ڤی زمانی رێزمانەك نڤیسی و رێنڤیسەك رێك و پێك نەبوو، ئەو و مێجەر سون ب ئەركێ دانانا رێزمانا زمانێ كوردی و سەروبەركرنا رێنڤیسا وی رابوون ئەو ژی ل دووڤ رێكا دەنگان و دەمێ فارل زڤریەڤە بەغدا بەرهەڤی كرن بۆ چاپكرنا پەرتووكەكا تایبەت ب (خواندنا كوردی)[٤١]. میجەرسۆنی وەك محەمەد ئەمین زەكی د پەسنا وی دا گۆتی: بە قەدەر كوردێك كوردی ئەزانی و لە عالمێكی كورد زیاتر شارەزایی زمانەكەمان بوو[٤٢]. ڤی ئەفسەری كو د وی سەردەمیدا تاكە دەستەلاتدارێ سلێمانیێ بوو حەز دكر زمانێ كوردی پێشبكەڤیت و ببیتە زمانێ نڤیسینێ و بۆ جێبەجێكرنا ڤێ مەرەمێ پەنا برە بەر گەلەك كارێن ب ئەنجام، وەك د. كەمال مەزهەر دبێژیت: هەر كە بووە حاكمی سیاسی سلێمانی كوردی كردە زمانی خوێندن و نووسین و پەیوەندی نێوان دەزگاكانی میری. بە خێرایی كتێبی ئەلفبای كوردی چاپكرد و خۆی بە سەر فێرگەكاندا دەگەرا و زۆر گەرم مامۆستا و فەقییانی ئەو قوتابخانانەی بۆ بەكار هێنانی زمانی كوردی هاندەدا. جگە لەوەی سۆن كەوتە هاندانی نووسەر و شاعیرانی كورد بۆ ئەوەی زیاتر پەتی بنووسن....[٤٣] ب ڤی رەنگی ل سەر دەستێ ڤی ئەفسەرێ ئینگلیز بنیاتەك بۆ خواندنا كوردی و پێدڤیێن خواندنێ ژ چاپخانەیێ بۆ چاپكرنا بەرنامێن خواندنێ ل سنوورێ پارێزگەها نهایا سلێمانیێ هاتەدانان.

ب زڤرینەڤا شێخ مەحموودی بۆ سلێمانیێ ل ٢٢ئەیلولا ١٩٢٢ و راگەهاندنا قۆناغا دووێ ژ حوکمداریا وی یا سەربەخۆ یا کو هەتا ٣ ئادارا ١٩٢٣ ڤەکێشای[٤٤] پتر سەروبەر هاریکار بوون بۆ ڤەکرنا خواندنگەهان و خواندنا کوردی و کەسایەتیەکێ رەوشەنبیر وەك مستەفا پاشا یا مولکی وەك وەزیرێ زانیاری (مەعارف) د حکۆمەتا نوویا شێخ مەحموودی هاتە دانان و خواندنگەهەکا ناڤنجی و سێ یێن سەرتایی ل سلێمانیێ هاتنەڤەکرن[٤٥]، کو چ گومان تێدا نینە زمانێ خواندنێ ل ڤان خواندنگەهان کوردی بوو و پشتی دوبارە داگیرکرنا سلێمانیێ ل ٣ ئادارا ١٩٢٣ و گرێدانەڤا سلێمانیێ وەك لیوایەك دگەل عیراقێ زمانێ کوردی وەك زمانێ خواندنێ ل قۆناغا سەرەتایی هاتەچەسپاندن. بەلێ ئەڤا ل سلێمانیێ روودای نە یەکەمین پێنگاڤا ب کوردیکرنا خواندنێ بوویە ل باشوورێ کوردستانێ. بەلێ وەك ئاماژە پێهاتییەکرن پشتی گەهشتنا لەشکەرێ ئینگلیزی بۆ بەغدا چاوان رێك ل بەر خواندنا عەرەبی ڤەکریە ب هەمان شێوە رێك ل بەر خواندنا کوردی ژی ڤەکریە و پشتی کو دەستەلاتێ سەرانسەری باشوورێ کوردستانێ گرتیەدەست بەری کو دەولەتا عیراقێ یا مەلکی بێتە دامەزراندن ئەڤ رێخوشکرنە هێژ بەرفرەهتر بوویە، ژ بەرکو ئارمانجێ دەستەلاتداریا نوو ئەو بوو زارۆکان ب وی زمانی فێرکەن یێ تێ دگەهن، لەوما ژی ل دووڤ وان بەرنامێن خواندنێ یێن ل گولانا ١٩١٩ دەرکەتین، زمانێ خواندنێ ئەو زمانێ ناڤخوییە یێ بەربەلاڤە[٤٦]. ب ڤێ چەندێ رێك دا ئەو جهێن خواندنگەهە و شیان لێ هەین ب کوردی بێتە خواندن و ئەز باوەرم ئەو شەش خواندنگەهێن هەمان ژێدەری ئاماژە پێکری کو ل سالا ١٩١٩ ب کوردی خواندن لێ دهاتەکرن خواندنگەهێن دەرڤەی سنوورێ سلێمانیێ بوونە، ژ بەرکو وەك د ژێدەراندا دیار دبیت هەتا پشتی ئادارا ١٩٢٣ هەردەمێ ئاماژە ب لیوایێن عیراقێ هاتییەکرن ئاماژە ب سلێمانیێ وەك لیوایەکا دەرڤەی دەستەلاتێ دەولەتا عیراقێ هاتییەکرن[٤٧].

ب ڤێ چەندێ دیار دبیت بەری راگەهاندنا دەولەتا مەلکیا عیراقێ خواندنا کوردی ل دەڤەرێن کوردان هەبوویە، ئەڤ هەبوونە ژی پتر گرێدای سەروبەرێ دەڤەرێ و ئاستێ رەوشەنبیریا وان و سەروبەرێ حاکمێ سیاسی و لەشکەرێ ئینگلیزی بوویە ل دەڤەری، هەروەك رۆلێ میجەرسۆنی ل سلێمانیێ گێرای. بەلێ پشتی دامەزراندنا رەسمیا دەولەتا عیراقێ و پێگیربوونا وێ ب چەند پێکهاتن و پەیمانامەکان دگەل حکۆمەتا بریتانیا ب پەسنا هندێ کو دەولەتا ئینتیدابێ بوو ل دور مافێن گەلێ کورد د چوار چوڤێ عیراقێدا ژ وان ژی بەیاننامە مەندوبێ سامی سێر پێرسی کوك یا ١٦ گولانا ١٩٢١ دەمێ داخواز ژ جڤاتا وەزیرێن عیراقێ یا بەروەخت کری هندەك پێرابوونان بگریتە بەر بۆ برێڤەبرنا باشوورێ کوردستانێ[٤٨]، هەروەسان بەیاننامە هەڤپشکا ناڤبەرا بریتانیا و عیراقێ یا ٢٤ کانوونا یەکەم ١٩٢٢ کو مافێ دامەزراندنا دەولەتەکا سەربەخۆ د چوارچوڤێ سنوورێ عیراقێدا دایە کوردان[٤٩]، هەروەسان بریارا حکۆمەتا عیراقێ کو پێگیریا خۆ ب هندەك مافێن گەلێ کورد دیارکری[٥٠]، هەتا دگەهیتە ئەو مافێن کو کۆما مللەتان ل ٨کانوونا یەکەم ١٩٢٥ بۆ کوردان بریار ل سەردای دەمێ راپۆرتا کۆموسیۆنا تایبەت ب ویلایەتا مۆسلێ پەسەند کری و ئەڤ ویلایەتە ب رەسمی دایە دگەل عیراقێ[٥١]، عیراق ناچار بوو خواندنێ ل خواندنگەهان ب زمانێ کوردی ل هندەك دەڤەرێن باشوورێ کوردستانێ بجهبینیت، ئەو ژی تنێ ل قۆناغا سەرەتایی. ل ڤێرێ پێدڤی دزانم چەند خالەك بێنە بەرچاڤکرن:

- ئەڤ خواندنا کوردی د ڤی سنوورێ بەرتەنگدا دیفاکتو (امر الواقع) بوو بەری کو پێگیرکرنا دەستەلاتدارێن وی چاخی یێن عیراقێ بیت ب پەیماننامە و پێکهاتن و بریارێن نێڤدەولەتی، ژ بەرکو ئەڤ خواندنە بەری دامەزراندنا عیراقێ و پەیماننامە و بریارێن ئاماژەپێکری هەبوو.

- هیچ پێکهاتن یان بریارەکێ دەستنیشاننەکریە کو خواندنا کوردی تنێ دێ ل قۆناغا سەرەتایی بیتن

یان دێ ژ ڤێ دەڤەرێ گریت و ژ یا دی ناگریت، بەلکی ئەڤ سنووردار کرنە بەرهەمێ هزرا بەرتەنگا هندەم مەزنە دەستەلاتدارێن عیراقێ بوو.

- ئاستێ کارگێریێ دەڤەرێن کوردنشین رۆلێ خۆ د ڤی واریدا گێرایە، بوونا لیوا (پارێزگەهێن) کوردی وەك سلێمانیێ و هەولێر و کەرکووکێ پتر هاریکار بوویە ژ بۆ چەسپاندنا خواندنا کوردی ژ قەزایێن کوردی یێن سەر ب لیوا مووسل یان قەزا خانەقین یا سەر ب لیوا دیالا ڤە.

- هەر ژ دەسپێکێڤە رەوشەنبیر و پەروەردەکارێن کورد ڤیایە خواندنا کوردی هەموو قۆناغێن خواندنێ ڤەگریت، بەلێ رێگر د ڤێ رێکێدا تنێ دەستەلاتدارێن عیراقێ بوون، هەروەك ئەو بگر و ڤەکێشا د ڤی واریدا دناڤبەرا توفیق وەهبی و ساتع ئەلحوسەری رووداى[٥٢]*.

بەردەوامی ب خواندنا کوردی ل قۆناغا سەرتایی ل هەردو لیوایێن سلێمانیێ و هەولێرێ و هندەك خواندنگەهێن کەرکووکێ هاتەدان، کوردێن لیوا مووسل (دەڤەرا بەهدینان- پارێزگەها دهۆك یا نها و قەزا شنگال و دەڤەرێن هێژ سەر ب مووسلڤە) و لیوا دیالێ و لیوا کوت ژ ڤێ چەندێ هاتنە بێ باهرکرن. ژ گەلەك دەقان دهێتە زانین کو بوونا راوێژکار یان یان پشکێنەرێن گشتی یێن دەستەلاتداریا بریتانی هەتا سالا ١٩٢٩ هاریکاربوویە بۆ بەردەوامیا خواندنا کوردی یان ژی رێگربوویە ل بەر کەسانێن شوفینستێن عەرەب ئەگەر بڤێت بەرێکەکێ بدەنە بەر خواندنا کوردی، کوردان ژی هەست ب ڤێ کاریگەریێ کریە هەروەك ژێدەرەك دبێژیت: بەلام دیارە تا سالی ١٩٢٩ کورد هەستیان بەم کاریگەرییە کردووە، تەنانەت بە فاکتەرێکی گرنگی پێشکەوتنی خوێندنی کوردیشیان لە کوردستانی عیراق زانیووە، لەم رووەشەوە لە وتارێکی رۆژنامەیەکی کوردی ئەو ساڵەدا هاتووە: بەلام لە وەتەی حکومەتی فەخیمەی بریتانیا موحافەزەی حقوقی ئەم مللەتە ئەکات بە سەبەب لوتف و شەفەقەتی حکومەتی فەخیمەوە و بە واستەی موقەرەراتی موحیبە و عدلەی عوسبەتولئومەمەوەیەکان سەربەست کراو و ئەمروو لە موحیتەکەمان تەدریسات و موخابەرات بەرەسمی بە زبانی مادەر زادی خۆمانە...»[٥٣] د دەمێ سەرەدانا مستەر سمیس پشکێنەرێ گشتیێ زانیاری (مەعارف) بۆ باژێرێ سلێمانیێ ئەڤا ل سەری ئاماژە پێ هاتییەکرن دوبارە بووڤە، رۆژناما (ژیان) ب خۆ د سەرگوتارا خۆدا پەسنەکا زێدەیا ناڤبری و ئیدارا بریتانی کریە ژ بەر گرنگیدانا وێ ب سەروبەرێ خواندنێ ل باشوورێ کوردستانێ و رۆژنامە دبێژیت: (ئیمە کە ملەتی دواکەوتووی کوردین وا ئەمرۆ لە ژێر صەحابەت و چاودێری حکومەتی فەخیمەدا بە ناوی عیراقەوە ئەژین و بە قتعی لێمان مەعلوم بوو کە هەر عیلمە و هەر مەعریفەتە ئێمە پێش ئەخات و مەسعوودمان ئەکات.

لەو بارەوە هەموو هەوڵ و تەقەلایەکمان حەصر کردووتە سەر مەعارف و لە مەزیاتر ئارەزوویەکی ترمان نیە. و هەموو چاك ئەیزانین ئەم مەعارفەی کە و ئەم تەرەقیەی کە کردوومانە هەر بە سەبەب لوتف و شەفەقەتی صاحب مەنصەباتی حکومەتی فەخیمەوە هاتووتە وجود.

لە حاڵێکا کە نەمان ئەزانی بە زبانی خۆمان بنووسین و بخوێنینەوە ئێستاکە کە هەموو قوتابخانەکانمان بە کوردی بە زمانی مادەر زادەی خۆمان ئەخوێنین و هەموو موخابەراتی رەسمی و مللیمان و ئەکسەری کتابی مەکتەبمان بە کوردی یە)[٥٤]

بەلێ دڤێ قۆناغێدا خواندنا کوردی یا بێ ئاستەنگ نەبوو و چەندین جۆرێن ئاستەنگان کەتینە د رێکا بەردەوامیدانێ ب خواندنا کوردی، ئەڤ ئاستەنگە ژی دو جۆرێن سەرەکینە:

- نەبوونا رێنڤیسەکا رێك و پێك بۆ زمانێ کوردی و نەبوونا پەرتووکێن خواندنگەهان ب زمانێ کوردی کو هەتا دەسپێکا سالێن سیهان هژمارا پەرتووکێن کوردی یێن خواندنگەهان نە گەهشتبوو دەهـ پەرتووکان. دیرۆکنڤیس محەمەد ئەمین زەکی کو ئەو ب خۆ د سالا ١٩٢٨یدا بۆ دەمێ چەند مەهەکان

وەزیرێ زانیاری (مەعارف) بوو، د نڤیسینەکا خۆیا وێ ساڵێدا دبێژیت: کتێبی کوردی، مەعلوومی هەمووتانە کە حەقیقەتەن زۆر کەمە ئەتوانم بلێم لە جوملەی نەبوانە. تا ئێستا وەك من بیزانم پێنج کتێب ئەمانەیش کتێبی (ئەلف و بێ)، (قیرائەت)، (تاریخێکی بچووك) و دو جلدی (مەعلوماتی دین) ە. لە زەرفی ئەم چوار مانگە کە من لە مەعاریفدا بووم سێ کتێبی تر هات. خۆم بەنەفسی خۆم تەدقیق و تەصحیحم کردن (کتێبی ئەخلاق) و جلدێ سێیەمی (مەعلوماتی دین) درا بە چاپخانە، کتێبی (عیلمی ئەشیا) کە بۆ صونفی دووەمی ئیبتدائی دروست کرابوو چونکە قوتابی ئەم صونفە بە تەواوی ناتوانن کتێب بخوێننەوە و لە هەموو مەکتەبەکانی عیراقدا هەر بە شیفاهی بە زانێکی موناسیب بۆ قوتابیە بچکولەکان تەعریف دەکرێ لەبەر ئەمە ئیحتیاج بە تەبعی ئەم کتێبە نەبینرا و بە واستەیەکەوە بۆ صاحیبەکەیم نووسی کە کتێبێ بۆ صونفی سێیەم و چوارەم بکا باشترە[٥٥].

زێدەباری ڤێ چەندێ ژی ئەڤ هژمارا کێما پەرتووکان پرانییا وان پەرتووکێن وەگێڕای بوون ژ زمانێ عەرەبی و دەربرین ژ هزرا هندەك ڕەوشەنبیرێن نەتەوەیێن توندرەوێن عەرەب دکرن و ژ ئالیێ ساتع ئەلحوسەری و کەسانێن وەك وی هاتبوونە دانان و تایبەتمەندیا کوردان و خەلکێ کوردستانێ د ڤی واریدا نەهاتبوو بەرچاڤکرن[٥٦].

- خواندنا کوردی ل عیراقێ پشتی شەرێ جیهانیێ یەکەم بوو دیفاکتویەك، بەلێ هندەك دەستەلاتدارێن عەرەبێن عیراقێ ژ دل دژایەتیا خواندنا کوردی دکرن. ل ساڵا ١٩٢١ بگرو ڤەکێش ل سەر خواندنا زمانێ کوردی یا گەرم بوو، ب تایبەت ژی ل سنوورێ ڕێڤەبەریا گشتیا زانیارییا(مەعارفا) دەڤەرا مووسلێ کو دەڤەرێن باشوورێ کوردستانێ د وی سەردەمیدا سەر ب ڤێ ڕێڤەبەریێ ڤە بوون و کەسەکێ وەك سەلیم حەسون کو پشکێنەرێ دەڤەرا مووسلێ بوو دژایەتیا فێرکرنێ ب زمانێ کوردی کریە، کەسایەتیێ ساتوح ئەلحوسەری کو ژ ئادارا ١٩٢٢- کانوونا دووێ ١٩٢٣ وەك جێگرێ وەزیرێ زانیاری و هەتا ٢٣ تیرمەها ١٩٢٧ وەك ڕێڤەبەرێ گشتیێ زانیاری و جهێ باوەریا شاهێ عیراقێ د وارێ پەروەردە و فێرکرنێدا کارکریە ئەوا د شیانێن وی دا دژایەتیا خواندنا کوردی کریە، بگرو ڤەکێشا ناڤبەرا وی و توفیق وەهبی بەگی کو وی ب خۆ د بیرئانینێن خۆدا ئاماژە پێکریە گرۆڤێ دژایەتیا وی یە بۆ خواندنا کوردی[٥٧].

وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ ب خۆ ل دەسپێکا ساڵا ١٩٢٤ هەست ب ڤێ چەندێ کریە و ب نڤیسینەکێ وەزارەتا زانیاری ئاگادار کرینە کو: وانا لیوایێن کوردی پشتگوهڤە هاڤێتینە و داخواز ژ وانکریە پتر گرنگیێ ب ڤان لیوایان بدەن. وەك ساتوح ئەلحوسەری ب خۆ ڤەدگێڕیت وی ب نڤیسینەکێ بەرسڤا وان دایە و باوەری بۆ وەزیرێ ناڤخۆیی حکمەت سلێمان چێکریە و هەر ئەو ب خۆ ژ زار وەزیرێ ناڤبری ڤەدگێڕیت کو وی ئانکو وەزیری ئەڤ نڤیسینە ل دووڤ داخوازا ئەدمونزێ ڕاوێژکارێ وەزارەتا ناڤخۆیی و شارەزایێ کاروبارێن کوردان هنارتیە[٥٨].

ل ڤێرێ دیاردبیت کو دەستەلاتدارێن ئنگلیزی وەك دەولەتا ئینتیدابێ پتر ژ دەستەلاتدارێن عەرەبێن عیراقی خەمخوری ژ مافێن کوردان ل عیراقێ کریە، ژ بەرکو ئەو پێگیربوون ب جێبەجێکرنا هندەك مافێن کوردان ل دووڤ هندەك پەیمان و پێکهاتنێن ناڤدەولەتی. بەلێ دەستەلاتدارێن عیراقێ یێن عەرەب ئەگەر جارەکێ ئاڤریەك ژی ل مافێن گەلێ کورد دا بیتەڤە مەرەمەك سیاسی یان ئارمانجەك دیتر پێ هەبوویە. بۆ نموونە دەمێ ل ٧ نیسانا ١٩٢٤ سەرۆکوەزیرێن وی چاخی جەعفەر ئەلعەسکەری پرۆژێ قانوونا بنیاتی (دەستوور) پێشکەشی سەرۆکێ جڤاتا نوونەران عەبدولموحسین سەعدونی کری دا بۆ جڤاتێ بەرچاڤ بکەت، دەمی مادێ ١٤ ژ ڤی پرۆژەی ل ڕۆژا ٦خزیرانێ هاتیە خواندن ل دووڤ ڤی مادەی (جوینێن جودا مافێ دامەزراندنا خواندنگەهان بۆ فێرکرنا کەسێن خۆ ب زمانێ خۆیێ تایبەت و پاریزگاریێ ژی هەیە ب مەرجەکی ل دووڤ بەرنامێن گشتیێن قانوون دیاردکەت بگونجن) ل ڤێرێ عەبدولموحسین

سەعدونی ب خۆ سەرۆکاتیا جڤینێ هێلا و هاتە دناڤ دانوستاندنێدا و دەربارەی بابەتی پەیڤی و گۆت: ئەز ب پێویست و فەر دبینم ئەم د ئازاد بین و ئازادیێ بدەینە گشت رەگەزان... ل عیراقێ رەگەزەکێ مەزن هەیە ئەو ژی کوردن، ئەگەر مافێ کوردان نەدەین و نەهێلین خواندنگەهێن وان ب زمانێ کوردی بخوینن دێ ئەنجام د خراب بن... ئەز هیڤیێ ژ جڤاتێ دکەم رەزیلیێ د دانا ڤی مافیدا نەکەت، دا کو ژ دل هەڤگرتی و پێکهاتی بن ل سەر یەکێتیا عەرەبی یا کو ئەم هەموو ل وێ هیڤیێ نە(٥٩).

بەلێ سەرەرای ڤان هەموو پەیمان و پێکهاتن و سۆزان هەر ژ دەسپێکا دامەزراندنا عیراقێ ڤە دژایەتیا خواندنا کوردی هاتییە کرن. ل سالا ١٩٢٢ل سەنتەرێ باژێرێ کەرکووکێ خواندنگەهەك ب ناڤێ خواندنگەها تەکیە هاتییەڤەکرن، خواندن تێدا ب زمانێ کوردی بوو، رێژەیەکا زۆر ژ قوتابیێن کورد بەرێ خۆدا ڤێ خواندنگەهێ هەتا هژمارا قوتابیان گەهشتیە سەد قوتابیان، بەلێ وەزارەتا زانیاری یا عیراقێ بریارا داخستنا ڤێ خواندنگەهێ دا(٦٠).

ب ڤێ چەندێ بەرهنگاری یان دژایەتییا خواندنا کوردی بەردەوام بوویە، کەسایەتی و رەوشەنبیرێن کورد ژی هەست ب ڤێ چەندێ کریە، هەلویست ژی بەرامبەر وەرگرتینە، دیرۆکنڤیس محەمەد ئەمین زەکی کو وی چاخی ئەندامێ جڤاتا نوونەرێن عیراقێ بوویە، د بیرئانینەکێدا بۆ شاهـ فەیسەل شاهێ عیراقێ ل ٢٠ کانوونا دووێ ١٩٣٠ دەربارەی خواندنا کوردی ل کەرکووکێ دبێژیت: لە لیوای کەرکووکا کە بەشی زۆری ئەهالیەکەی یەعنی ٥١٪ کوردە بە غەیرێ سێ هیچ مەکتەبێکی نییە کە کوردی دەرس بخوێنێ و ٢٥ مەکتەبەکەی تری یەکدوویەکی نەبێ، ئەوانی تر هەموو بە تورکی دەرس ئەڵێنەوە، وەلحاڵ ئەوانەی بە تورکی قسە ئەکەن نوفووسیان ١٢٪ی نوفووسی لیواکە زیاتر نییە(٦١).

خواندنا کوردی ل لیوا مووسلێ دبێژیت: لە حالی حاضر لە هەر هەر پێنج قە ضای کوردەکانا کە لە چوار سێ بەشی کوردە، مەکتەبێك نابینین کە زمانی تەدریسی کوردی بێ، ئیسباتی ئەمەش کاغەزی مودیری مەعارفی مە نطیقە ی مووسلە کە بە تەئریخی٢/١١/١٩٣٠ ژمارە ٣٥١/١ بۆ مودیری مەعارفی عامی نووسیوە و لەم کاغەزەدا بە ئاشکرا پێی لێ ئەنێ کە لە مەنتەقەی مووسلدا مەکتەبێکی تیا نییە کە بە کوردی دەرس بخوێنێ. ژ بەرکو محەمەد ئەمین زەکی وەك ئەو ب خۆ دبێژیت بەری هنگی خواندنگەهێن کوردی ل ڤان جهان هەبوونە لەوما ژی پاشتر نەرازیبونا خۆ ل سەر سەرەدەریا وەزیرێ زانیاری دیاردکەت و دبێژیتە شاهێ عیراقێ: ئەوەش بە تەواوی هەڵگرتنی زمانی کوردییە لە طەرەفی وەزارەتی مەعاریفەوە لە مەکتەبەکانی هەر پێنج قەزاکەدا، ئینجا نازانم کە وەزارەتی مەعاریف لە خۆیەوە بووە یاخۆد بە ئیعازی حکۆمەت بوو کە زمانی کوردی لەو مەکتەبانەدا دەرکرد وە لە هەردو حاڵدا ئەم موعامەلەیە صەرفی نەظەری لەوەی کە موخالیفی عیلمی تەربیە و دەعوای حکۆمەتە بە هیچ شتێك تەئویل ناکرێ، ئیللا ئەوە نەبێ کە بگەرێتەوە سەر ئوصووڵە پڕ ضەرەری کە لە زەمانی تورکەکانا تەطبیق ئەکرا وە ئەوەی کە برا عەرەبەکانمان بیلنەفس خۆیان دائیما شکاتیان لێ ئەکرد(٦٢).

د بیرئانینەکێدا کو نەهـ نوونەرێن کورد د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا دەربارەی سەروبەرێ فێرکرنێ و ئەگەرێن پاشکەتنا پەروەردێ ل دەڤەرێن کوردستانێ بۆ وەزیرێ زانیاری بلند کری و پێشنیازێن خۆ بۆ نەهێلانا ڤێ پاشکەتنێ د چەند خالەکاندا بەرچاڤکرینە و د خالا داویێ یا پێشنیازاندا گۆتیە: هەردەمێ خواندنگەهـ و زانیاری ل ڤێ دەڤەرێ ب ڤی رەنگێ مە بۆ هەوە بەرچاڤکری هاتنە رێکخستن وی دەمی دێ دایك و بابان ئارەزوو هەبیت زارۆکێن خۆ بۆ فێرکرنێ بهنێرنە خواندنگەهان(٦٣).

هەژیە ل ڤێرێ بێتە گۆتن رۆژنامەڤانییا کوردی یا وی سەردەمی: دیاری کوردستان- بەغدا، ژیان - سلێمانی، زارکرمانجی- رەواندز (٢٥گولان ١٩٢٦- ٢٣ تەمووز ١٩٣٢) د ڤی واریدا بەرگری ژ مافێن گەلێ

کورد ب تایبەت پەروەردە و فێرکرنێ ب زمانێ کوردی کریە و هەردەم بۆ ڤێ بەرگرییێ پشتگەرمێن سووز و پێکهاتنێن دەولەتا عیراقێ و دەستەلاتداریا ئینتیدابا بریتانی و بریارێن ناڤدەولەتی و کۆما مللەتان بوونە و رۆژنامێن ناڤبری بەرپەرێن خۆ بۆ هەر بابەتەکێ پەیوەندی ب ڤی واریڤە هەی تەرخانکرینە. د هەمان دەمدا هندەك ژ مەزنە بەرپرسیارێن عیراقێ ژی چ ژ بۆ چەسپاندنا دەستەلاتا نوو دامەزرانییا عیراقێ بیت ژ بۆ رازیکرنا دەستەلاتداریا ئینتیدابا بریتانی بیتن ل عیراقێ، چ ژ بۆ رازیکرنا جڤاکێ ناڤدەولەتی بیت ب تایبەت کۆما مللەتان و وەرگرتنا عیراقێ بیت د ڤێ سازیێدا و هندەك جاران ڤان مەزنە بەرپرسێن عیراقی بریارێن تایبەت ب پەروەردە و فێرکرنێ ب زمانێ کوردی ل دەڤەرێن کوردان داینە و ئەڤ بریارە بووینە جهێ رازیبوون و دەستخوشییا بەرپرس و مەزنێن کوردان: دەمێ نوری سەعیدی ۱۹۳۰/۳/۲۳ سەرۆکاتییا وەزیران گرتیە دەست بریاردا پرۆژێ قانوونەکێ بەرهەڤ بکەت و پێشکەشی جڤاتا ئومەتێ (مجلس الامە) بکەت، ل دووڤ وی پرۆژەی و پشتگەرمی ب قانوونا بنیاتیا دەولەتێ و ل سەر مەرج و بەرنامەکێ روحی و پەیمانەکا دایە کوردان جێبەجێ بکەت و زمانێ کوردی ل جهێن کوردان ببیتە زمانێ رەسمی. ڤێ چەندێ د رۆژنامێن بەغدا یێن وێ سەردەمیدا دەنگ ڤەدابوو، (حزب الوطنی) خۆ نەرازی کربوو و رۆژناما (البلاد)یا بەغدا بەلاڤکربوو کو کەسەکی ب ناڤێ عەلی مەحموود یێ پارێزەر د کۆمبوونا حزبێدا پەیڤەك خواندبوو و ب توندی رەخنە ل سەرۆکوەزیران گرتبوو و هێرش کربوونە سەر کوردان و گۆتبوو نابیت زمانێ رەسمی ل کوردستانێ کوردی بیت و د بەرسڤێدا سەرۆکوەزیران هەروەك کۆڤارا (زارکرمانجی) ژ رۆژنامێن بەغدا ڤەگوهاستی ب ڤی رەنگی بەرسڤ دابوو: (بەلام قسەی من کە لە قەظیەی کوردان دوابوم وە لەو مەجلیسەدا خستبوویانە نێو قسانەوە ئەمەیە نابێ ئەوە لە بیر بکەین وەختێکی لە عەهدی عوسمانییەکاندا تێدەگەیشتین و هوشمان هاتبووە سەر. ئێمە داوامان دەکرد و دەکوشاین بۆ ئەمە لە ئەماکین و مەملەکەتی عەرەباندا زمانی عەرەبی ببێت زمانێکی رەسمی، حەزرەتی خەتیب کە لەوە دوابوو خەلەتاوە لە پاش ئیفلاسی چاوراوی تورك بوون لە مەملەکەتی عوسمانیاندا هەر ئەو خەلەتانە نەبوو ئەو عونصرانەی لەو مەملەکەتانەدا بلاوکردەوە ویران کران؟

ئێمە دەمانەوێ برا کوردەکانمان خاوەندی صەمیمی وەکو عەرەبەکان بۆ پێگەیاندنی مەملەکەتەکەیان بە دڵێکی پاك بکوشن نەك بە قسەی خاو[١٤]. کۆڤارا (زارکرمانجی) ب گەرمی ب ناڤێ کوردان ب تایبەت کوردێن رەواندزێ سوپاسییا سەرۆکوەزیران کریە و پشتەڤانی ل هەلویستێ وی کریە و هیڤی خواستیە کورد د سەردەمێ ڤێ وەزارەتێدا بگەهنە و ب لەز گۆتنا سەرۆکوەزیران د قانوونا بنیاتیدا بێتە چەسپاندن. زێدەباری (زارکرمانجی) سەرۆکباژێرڤانیێن سلێمانیێ، هەولێرێ، کەرکووکێ، رەواندزی و کەسایەتی و ماقوولێن ڤان باژێر و دەڤەران بروسکێن پشتەڤانیێ بۆ سەرۆکوەزیران و مەندوبێ سامی و راوێژکارێن وەزارەتا ناڤخۆیی و دادوەری هنارتینە و ئەڤ بروسکەیە د رۆژنامێن وی چاخی یێن بەغدادا هاتینە بەلاڤکرن[١٥]. هەژیە بێتە گۆتن هەروەك بەری نها ئاماژە پێ هاتییەکرن ل ٢٣ گولانا ۱۹۳۱قانوونا زمانێن خۆجهی ل سەردەمێ سەرۆکوەزیران نوری سەعیدی هاتییە بەلاڤکرن.

نوونەرێن کورد د جڤانا نوونەرێن عیراقێدا هەر زوو هەست ب وێ چەندێ کریە کو هندەك دەستەلاتدار یان بریار بدەستێن عیراقی دژایەتیا خواندنا کوردی و پێشکەتن و بەلاڤبوونا پەروەردێ ب زمانێ کوردی دکەن. دیرۆکنڤیس و ئەندامێ جڤاتا نوونەران د بیرئانینەکێدا کو ل ۲۰ کانوونا دووێ ۱۹۳۲ێ دەربارەی پێگیرینەکرنا عیراقێ ب بریارێن کۆما مللەتان بۆ شاهێ عیراقێ بلندکری پشتی کو ئاماژە ب نەبوونا خواندنا کوردی و سەپاندنا زمانێ تورکی ل سەر پرانییا کوردی یا کەرکووکێ کری دبێژیت: شوبهە نییە نەبوونی مەکتەبی کوردی لە قەضاکان و مەرکەزی ئەم لیوایەدا کە نیوەی خەڵکەکەی یان

زیاتر لە نیوەی کوردن، ئەهالی کورد سەوق ئەکاتە سەر ئەوەی کە یا منالّکانیان نەنێرنە مەکتەب چونکە نایەنەوێ زمانی تورکی قوبوولّ بکەن، وە یا نا بە دلّ بیانخەن، طەبیعی ئەم نەوعە وەضعیە تە شایانی شایانی تەئەسوفە، وە لە عەینی وەختا لە لایەکەوە موخالیفی عیلمی تەربییەیە، وە لە لایەکی تریشەوە موافقی مەصلەحەتی حکوّمەت نییە، بەلّم مەیدانداني حکوّمەت بۆ مانەوە و دەوامکردنی ئەم وە ضعییە تە غەریبە بە هیچ شتێك تەئویل ناکرێ، ئیللا بە وە نەبێ کە حکوّمەت ئەیەوێ تەشجیعیان بکا بۆ ئەم زمانە و بۆ بلاّوبوونەوەی، تا چە ربە لە کورد بدا، وە تورکمان ئامادەبکا بۆ ئەوەی کە زیاتر لە ئیستە بە سەر کورددا زالّ بن،...»[٦٦] پاشتر ژی ئاماژە دکەتە سەروبەرێ خواندنێ ل لیوا مووسل و دبێژیت: لە حالی حاچر لە هەر پێنج قە چای کوردەکانا کە لە چوار سێ بەشی کوردە، مەکتەبێك نابینین زمانی تەدریسی کوردی بێت، ئیسباتی ئەمەش کاغەزی مودیری مەعاریفی مە نطە قە ی مووسلە کە بە تەئریخی ١٩٣٠/١١/٢ ژمارە ٣٥١/١ بۆ مودیری مەعاریفی عامی نووسیوەو لەم کاغەزەدا بە ئاشکرا پێی لێ ئەنێ کە لە مە نطە قە ی موصل دا مەکتەبێکی تیا نییە کە بە کوردی دەرس بخوێنی[٦٧].

ب ڤی رەنگی دیار دبیت کو سەرەرای هندێ کو خواندنا کوردی د سنوورەکێ بەرتەنگدا بەری دامەزراندنا دەولەتا شاهیيا عیراقێ ل تەباخا ١٩٢١بوو دیفاکتویەك و ئەڤ دیفاکتویە ب دامەزراندنا حوکمداریيا شێخ مەحموودی ل سلێمانیێ و ڤەدەربوونا سلێمانیێ ژ دەستەلاتێ حکوّمەتا بەغدا هەتا سالا ١٩٢٣ پتر جێگیر بوو، پشتی دامەزراندنا ڤێ حکوّمەتێ و راگەهاندنا حکوّمەتا ئینتیدابا بریتانی ل عیراقێ د هەر پێکهاتنەکا د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا و دناڤبەرا وان و کوّما مللەتاندا هاتیە گرێدان و پاشتر ژی بریارا کوّما مللەتان یا کانوونا ئێکی ١٩٢٥ ب گرێدانا ویلایەتا موسل یا سەردەمێ ئوسمانی داکوکی ل سەر خواندنا زمانێ کوردی و پەروەردێ ب زمانێ کوردی هاتیەکرن.

زێدەباری بزاڤێن کەسایەتی و رەوشەنبیر و نوونەرێن کوردان د جڤاتا نوونەراندا و بۆ پتر دەستڤەئینان و چەسپاندن و جێبەجێکرنا خواندنێ ب ڤی زمانی ل خواندنگەهان و سۆز و پەیمانێن هندەك بەرپرسێن عیراقێ بۆ بجهئینانا ڤی مافێ چەندین جاران بریار پێ هاتینەدان، سازیيا ناڤدەولەتی (کوّما مللەتان) ژی وەك ئەرکەکێ وێ بۆ دووڤچوونا وان بریارێن کو بریتانیا پێ بوویە دەولەتا ئینتیدابێ ل عیراقێ و پاشتر ژی ویلایەتا موسل پێ دایە دگەل عیراقێ بەردەوام دووڤچوونا جێبەجێکرنا وان بریاران کریە کو هندەك ژ مافێن کوردان دابین کرینە ژ وان مافان ژی مافێ خواندنا کوردی و ب رەسمیکرنا زمانێ کوردی و بکارئینانا زمانێ کوردی ل دادگەهان. رۆژنامەڤانیيا کوردی یا وی سەردەمی ژی ئاماژەدایە وان دووڤچوونێن کوّما مللەتان، هەر بۆ نموونە وەك ژ کوڤارا (زارکرمانجی)دیار دبیت دناڤبەرا سالێن ١٩٢٧-١٩٢٨یدا هندەکان ل سنوورێ لیوا هەولێرێ بزاڤێن ژ ناڤبرنا خواندنا کوردی کرینە، ژ بەر ڤێ چەندێ ژی کوّما مللەتان د کوّمبوونا خۆیا مەها چریا دووێ ١٩٢٨دووڤچوونا بابەتی کریە و سەرۆکێ کوّمێ ل دور ڤی بابەتی پرسیار ژ نوونەرێ مەندوبێ سامیێ بریتانی ل عیراقێ کریە وی ژی وەکی خۆ بەرسڤ دایە[٦٨]. هەر ب ڤی رەنگی د کوّمبوونا شازدێ یا کوّمۆسیۆنا هەردەم یا ئینتیدابێ یا کوّما مللەتان ئەوا ل ٦ چریا دووێ ١٩٢٩ هاتیە گرێدان ئەندامێ جڤاتا کوّما مللەتان مستر ملدینتڤیك د جڤاتێدا ئاماژە ب وێ چەندێ کریە (کو کورد شکایەت و گازندێ دکەن کو گرنگی ب فێرکرنا زارۆکێن وان و رێخوشکرنێ ل بەر پەروەردەیا وان نەهاتیەدان...)[٦٩]

ژ ئەنجامێ هەول و بزاڤێن کوردان و گرنگیدانا کوّما مللەتان و چەند ئالیەکان و هندەك مەزنە بەرپرسێن عیراقی خواندنا کوردی ل خواندنگەهێن پرانییا باشوورێ کوردستانێ د سنوورەکێ بەرتەنگدا سەقامگیر بوو و هێدی هێدی پێشڤە چوو و بەلێ تنێ د ڤۆناغا سەرەتاییدا و ژ سنوورێ هەردو لیوایێن

سلێمانیێ هەولێرێ و هندەك ژ لیوا کەرکووکێ دەرنەکەتیە. ب دەرچوونا قانوونا زمانێن ناڤخۆیی هژمار ٧٤ سالا ١٩٣١ل ٢٣ گولانا ١٩٣١ خواندنا کوردی پتر روویەکێ قانوونی ب خۆڤە گرت و دەولەت ژی پێگیرکر ب جێبەجێکرنا ڤێ قانوونێ ب رامانەکا دی کار بۆ چەسپاندنا ڤێ قانوونێ بکەت، بەلێ د هەمان سنوورێ بەرتەنگدا[٧٠].

هەژیە بێتە گۆتن ژ بۆ تەناکرنا سەروبەری ل دەڤەرێن کوردستانێ و دیارکرنا نیازپاکیا خۆ بەرامبەری کوردان و گەلێن دیترێن عیراقێ و خوشکرنا رێکێ ل بەرخۆ بۆ چوونە ناڤ (کۆما مللەتان) و ژ بەرکو ئەڤ قانوونە یەك ژ گرەنتیان بوو یێن کو (کۆما مللەتان) کرینە مەرج ل سەر عیراقێ بۆ چوونە ناڤ وێ سازیێ، عیراق ب خۆ پێدڤی ب ڤێ کریارێ بوو و ب ناچاری ئەڤ قانوونە راگەهاند[٧١].

ژ سالا ١٩٣١ب ڤە خواندنا کوردی ل باشوورێ کوردستانێ د وی سنوورێ بەرتەنگ و چوارچوڤەکریدا کەتە د قۆناغەکا نوودا کو قۆناغا ب قانوونیکرن و رەسمیکرنا ڤی زمانی یە ل خواندنگەهان، د ئەنجامدا ژی رۆژ ل دووڤ رۆژێ خواندنا کوردی کو تنێ د قۆناغا سەرەتاییدا بوو بەرەڤ پێش دچوو، پەرتووکێن بەرنامێن خواندنێ ل دووڤ هەمان بەرنامێن خواندنا عەرەبی ل عیراقێ ژ عەرەبی دهاتنە وەرگێران بۆ زمانێ کوردی و ژ ئالیێ وەزارەتا زانیاری و پاشتر ژی پەروەردەیا عیراقێ دهاتنە چاپکرن و بەلاڤکرن ل سەر خواندنگەهێن لیوایێن سلێمانیێ و هەولێرێ و کەرکووکێ، ب بەردەوامیدانێ ب خواندنا کوردی ل قۆناغا سەرەتایی سال ل دووڤ سالێ زمانێ کوردی پتر دهاتە ڤەوژارتن ژ پەیڤێن بیانی و کوردی یا پەتی جهێ خۆ دگرت، د هەمان دەمدا زمانێ کوردی پتر ب ئیدیەم و زاراڤێن پەروەردەیی و زانستی و ئابووری...هتد دەولەمەند دبوو و بەرهەڤ دبوو کو قۆناغێن دن یێن خواندنا ناڤنجی و ئامادەیی و بەرەڤ ژوور پێ بێنە خواندن کو ئەڤە ژی داخوازا پەروەردەکار و رەوشەنبیر و سیاسەتمەدارێن کورد و بزاڤا رزگاریخوازا کوردی بوو هەتا ل دووڤ پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠بوویە زمانێ خواندنێ ل قۆناغێن ناڤنجی و ئامادەیی و پاشتر ژی زانکۆیی.

## خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان

هەروەك د بەریەرێن چوویدا ئاماژە پێ هاتییەکرن ب درێژیا سەردەمی شاهی ل عیراقێ خواندنا کوردی تنێ ژ لیوایێن سلێمانیێ و هەولێرێ و کەرکووکێ دگرت، قەزایێن کوردی یێن لیوا مووسلێ ئانکو دەڤەرا بەهدینان و قەزا و دەڤەرێن کوردی یێن لیوایێن دیالا و کوت ژ ڤێ خواندنێ هاتبوونە بێ باهرکرن و ئەڤ سەروبەرە هەتا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ل عیراقێ یێ بەردەوام بوو، ژ خێر و بێرێن ڤێ شۆرشێ بۆ یەکەمین جار ل سالا ١٩٥٩- ١٩٦٠ خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان هاتە خواندن.

ل ڤێرێ پرسیار دهێتەکرن بۆچی هەر ل دەسپێکێ زمانێ کوردی ل ڤێ دەڤەرێ ژی وەك لیوایێن سلێمانیێ و هەولێرێ و کەرکووکێ (هندەك جاران و ب کێمی) نەهاتییە خواندن و ئەگەرێن ڤێ نەخواندنێ چ بوون...؟ ل دووڤ پێزانینێن مە کەسەکی هەتا نها دووڤچوونا ڤی بابەتی نەکریە و ل بەرسڤا ڤان پرسیاران نەگەریایە، لەوما ژی ژێدەرێن تایبەت ب ڤی واری نینن و پێزانینێن مە ژی ل دور بابەتی دێ کێم بن و تێر تەسەل نابن، بەلێ سەرەرای ڤێ چەندێ دێ ل بەرسڤێ گەرێین و ئاماژە ب وان بزاڤان کەین یێن بۆ ڤێ مەرەمێ هاتینە کرن.

ژ سەدسالیا شازدێ زایینی بەرەڤ ژوور ل خواندنگەهێن ئایینی بزاڤ هاتینەکرن پشکەك یان هندەك ژ خواندنا ئایینی ب کوردی بیت، ئەڤە ب خۆ وێ چەندێ دگەهینیت کو زمانێ کوردی ل ڤێ دەڤەرێ بەری دەسپێکرنا خواندنگەهێن رەسمی د سنوورەکێ دیاریکریدا زمانێ خواندنێ بوویە. پشتی پەیدابوونا خواندنگەهێن رەسمی د سنوورێن دەولەتا ئوسمانیدا کەڤنترین بزاڤا بۆ خواندنا کوردی ل ڤێ دەڤەرێ هاتییەکرن د سەردەمێ شۆرشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی (١٩٠٧- ١٩١٤) بوو، ژێدەر ئاماژە پێ دکەن د کۆمبوونەکێدا یا شێخ عەبدولسەلامی دگەل کەسایەتی و مەزنێن دەڤەرا بەهدینان ل سالا ١٩٠٨ێ ل تەکیا شێخ نور محەمەدی ل دهۆکێ ئەنجامدای ئامادەبوویی

ل سەر بیرئانینەکێ(یاداشتەکێ) دەربار ەی مافێن گەلێ کورد پێکهاتن و ب رێکا والیێ مووسلێ بۆ دەستەلاتداریا ئوسمانی ل ستەنبۆلێ هنارتن و د خالا یەکەمدا داخوازدکەن زمانێ کوردی ل پێنج قەزایێن دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ و شنگال ببیتە زمانێ رەسمی و د خالا دوویێدا داخوازدکەن فێرکرن د ڤان قەزایاندا ب زمانێ کوردی بیت[72]. هەرچەندە دەقێ ڤێ بیرئانینێ یا کو چەندین ژێدەرێن کوردی و بیانی ئاماژە پێکری هێژ نەهاتیە دیتن، بەلێ ب یەکەمین بزاڤ د هێتە نیاسین بۆ بکوردیکرنا خواندنگەهان ل دەڤەرا بەهدینان، راستە ڤێ بزاڤێ سەرنەگرت و شۆرشا شێخ عەبدولسەلامی ب سێدارەدانا وی ل ١٩١٤ ب داویهات. بەلێ ئەڤ بزاڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو خەلکەکی بەری دامەزراندنا دەولەتا عیراقی هزر ل خواندنا کوردی ل ڤێ دەڤەرێ کریە، ب سێدارەدانا شێخ عەبدولسەلامی و دەسپێکرنا شەرێ جیهانیێ یەکەم ١٩١٤- ١٩١٨ ئەڤ بزاڤە بێ دەنگ بووینە. بەلێ ب داویهاتنا شەری و نەمانا دەستەلاتداریا ئوسمانی و گەهشتنا لەشکەرێ بریتانی بۆ دەڤەرێ و سەرژنوو دامەزراندنا دەزگەهێن کارگێری ل دەڤەرێ ژ وان ژی خواندنگەهان ل ژێر سەرپەرشتیا ئەفسەرێن بریتانی بابەتێ خواندنێ ب زمانێ کوردی هاتەڤە لڤاندن. هەروەك د بەرپەرێن چوویدا ئاماژە پێ هاتیەکرن ل دەسپێکا هاتنا لەشکەرێ بریتانی بۆ عیراقێ هەرجهێ گەهشتینێ هاندانا خەلکی کریە بۆ خواندنێ ب زمانێ خۆجهی و رێك ژی ل بەر ڤێ چەندێ خوشکرینە، د ئەنجامێ ڤێ چەندیدا ژ کۆما ٧٥ خواندنگەهێن سەرتایی و دەسپێکیێن عیراقێ ل داویا سالا ١٩١٩ل ٦ خواندنگەهان فێرکرن ب زمانێ کوردی و ل خواندنگەهەکێ ژی ب زاراڤێ شەبەکیێ کوردی بوو[73]. گومان تێدا نینە ڤێ چەندێ ژ دەڤەرا بەهدینان ژی گرتیە، بەلێ بۆچی خەلکێ دەڤەرێ مفا ژێ وەرنەگرتیە..؟ ئەڤێ دێ هێلین بۆ داویا ڤی بابەتی.

هەروەکی کەسەکی ب ناڤێ رەسول ناجی کو وی سەردەمی (کاتب تحریر) بوو ل قەزا ئامێدیێ نامەیەك ل دور ڤی بابەتی بۆ رۆژناما (پێشکەوتن) یا سلێمانیێ هنارتیە و د هژمار ١٠٣یا ١٣ نیسانا ١٩٢٢ هاتیەبەلاڤکرن و تێدا دبێژیت: نها پێنج خواندنگەهـ ل قەزا ئامێدیێ هەنە و د ڤان رۆژاندا جێگرێ راوێژکارێ لیوا مووسل کابتن جاردن دگەل راوێژکارێ پەروەردێ سەرەدانا ئامێدیێ و ڤان پێنج خواندنگەهان کریە و کێماسی و پێدڤیێن وان بجهئینانە و فەرماندایە مامۆستایان کتێبێن عەرەبی وەرگێرنە سەر زمانێ کوردی و ب زارۆکان بدەنە خواندن. ل داویا ناما خۆ رەسول ناجی داخواز دکەت: رەجا ئەکەم ئەو کەسانەی کە خۆی بە مونەوری کورد دەزانێ لەم ئەدەبیات و ئاساری کە لە سلێمانی بە زمانی کوردی مومکین دەبێت بە واسیتەی پێشکەوتن لە چاپ بدات بۆ بلاوکردنەوەی زمانەکەمان بۆ قەزاکانی بەهدینان بنێررێت، گەلێك لازم و پێویستە[74]. گەلۆ دوبارە ڤێ دەڤەرێ بۆچی مفا ژ ڤێ دەلیڤێ وەرنەگرتیە..؟ ئەڤێ بەرسڤێ ژی دێ هێلین بۆ داویا بابەتی. بەلێ پێدڤیە بێژین کو ئەڤ نامەیە هەرچەندە خۆدیێ وێ کەسەکێ خەلکێ هەولێرێ و نە خەلکێ دەڤەرێ بوو بەلگەنامەکا دیرۆکییە د وی دەمیدا کو هێژ دەستەلاتێ عیراقێ ل کوردستانا ژێری خۆجهـ نەبووی هزر ل خواندنا کوردی ل دەڤەرێ هاتیە کرن، لەوما ژی هاریکارێ راوێژکارێ ئینگلیزی ل مووسل فەرماندایە کتێبێن عەرەبی بینە کوردی و ل خواندنگەهان بێنە خواندن. بەلێ نە فەرمانا راوێژکارێ ئینگلیزی هاتیە بجهئینان و نە ژی چ بۆ ئەوا د هزرا خەلکەکیدا دەربارەی خواندنا کوردی ل دەڤەرێ هاتیەکرن.

پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقی ل تەباخا ١٩٢١ و دەست بکاربوونا قائیمەقامێن عیراقی ل ڤان قەزایان، ژ سالا ١٩٢٢ڤە بەرەف ژوور ئەڤ قەزایە هەروەك سەردەمێ ئوسمانی سەر ب لیوا مووسل بوونە و هەردەم ژی دەستەلاتداریا لیوایێ دەستەلاتدارییەکا عەرەبی بوویە و ب عەقلیەتەکا عەرەبی ژی سەرەدەری دگەل قەزایێن کوردی کریە و

د زۆربەی دەماندا ژی قائیمەقام و رێڤەبەرێن ناحیان و مەزنە بەرپرسێن دن عەرەب بوونە. محەمەد ئەمین زەكی د وێ بیرئانینێدا ئەوا ل ٢٠ كانوونا دووێ ١٩٣٠ دایە شاهێ عیراقێ ددەت دیاركرن ل پێنج قەزایێن لیوا مووسلێ ٦٦٪ فەرمانبەرێن وان نە كوردن، ئەو ٣٤٪ یێن كورد ژی فەرمانبەرێن بچووكن ئەوێن كەسێن بێ چارە نەبن كەس كەس پێ رازی نابیتن[٧٥].

گومان تێدا نینە د ڤی سەروبەریدا كەسەكی هزر ل خواندنا كوردی ل ڤێ دەڤەرێ نەكریە و خواندن ب زمانێ عەرەبی ب بێ دەنگی ل سەر خەلكێ دەڤەرێ هاتیە سەپاندن، ئانكو ئەو كتا كێما زارۆكێن دەڤەرێ یێن ل خواندنگەهان دخواندن ژ خواندنا تركیا ئوسمانی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ خواندنا عەرەبی بەرڤاژی دگەل هندەك هندەك دەڤەرێن دیترێن باشووری كوردستانێ ژ خواندنا تركی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ خواندنێ ب زمانێ كوردی*.

هەر د ڤی واریدا و ب مەرەما جێبەجێكرنا خواندنا كوردی ل خواندنگەهێن دەڤەرێ ل ئادارا ١٩٣٠ شەش ئەندامێن كورد د جڤاتا نوونەراندا بیرئانینەك دایە سەرۆك وەزیرێن عیراقێ دەربارەی مافێن گەلێ كورد، د خالا یەكەم یا ڤێ بیرئانینێدا داخوازكریە بۆ قەزایێن كوردی یێن لیوا مووسل لیوایەك (پارێزگەهەك) ل دهۆكێ بێتە دامەزراندن و زمانێ كوردی تێدا ببیتە زمانێ رەسمی[٧٦]. د ئەنجامێ ڤێ بزاڤێ و چەندین بزاڤێن دیتردا وەك ئاماژە پێ هاتیەكرن قانوونا زمانێن ناڤخۆیی هژمار ٧٤ سالا ١٩٣١ل ٢٣ گولانا ١٩٣١ هاتە راگەهاندن و خواندنا كوردی پتر روویەكێ قانوونی ب خۆڤە گرت. د ڤێ قانوونێدا كو ل ١ خزیرانا ١٩٣١د رۆژنامەیا رەسمیا (الوقایع العراقیة)دا هاتیە بەلاڤكرن داكوكی هاتیەكرن كو ل قەزایێن لیوا مووسل ئامێدیی، زاخۆ، دهۆك، ئاكرێ،زێبار زمانێ كوردی دێ زمانێ رەسمیێ دادگەهان و فەرمانگەهان و خواندنێ بیتن و خەلكێ ڤان قەزایان دێ د دەمێ سالەكێدا ژ جێبەجێكرنا ڤێ قانوونێ شێوەیێ زمانێ كوردی یێ وان دڤێت بۆ خۆ هەلبژێرن[٧٧].

ل ڤێرێ دو خالێن گرنگ هەنە، ڤێ قانوونێ ماف دایە خەلكێ بەهدینان ب كوردی بخوینن، د هەمان دەمدا ماف دایە وان بۆ خۆ وی زاراڤی هەلبژێرن یێ وان بڤێت و بۆ خۆ دهەلبژێرن. ل ژێر كاریگەریا دەركەتنا ڤێ قانوونێ و پێدڤیاتیا حكۆمەتا عیراقێ كو روویەكێ باش د سەرەدەریا خۆدا دگەل كوردان بدەتە ناڤەندێن جیهانی ب تایبەت كۆما مللەتان، مەلا محەمەد سەعیدێ دهۆكی١٨٩٧- ١٩٧٦ مامۆستایێ خواندنگەها سەرەتاییا دهۆكی رێزمانەك ب كوردی بۆ خواندنگەهێن دەڤەرێ ب زاراڤێ كرمانجیا ژووری دانایە و بزاڤكرینە كو ئەو رێزمان و زاراڤە ل دەڤەرا بەهدینان بێنە خواندن و بۆ دەمەكی ژی هەروەك هاتییە ڤەگێران هاتییە خواندن. هەروەسان مامۆستایەكێ دی كو وی دەمی خویندكارێ رێزێن بەراهیێ یێن قۆناغا سەرەتایی بوو ڤەدگێریت: كو ل سالا ١٩٣٢ كتێبێن كوردی ل سەر مە هاتنەدابەشكرن و خویندكار ب ڤێ چەندێ خۆشحالبوون، بەلێ پشتی سێ رۆژان ئەو كتێب ژ مە ستاندنەڤە و دگۆتن: كو نوونەرێ قەزا شێخان ل جڤاتا نوونەرێن عیراقێ گۆتبوو مە نەڤێت ئەم ب كوردی بخوینین و ئەم دێ ب عەرەبی خوونین..!![٧٨]

زێدەباری ڤێ چەندێ هەروەك د نڤیسارەكا رێڤەبەرێ زانیاریا دەڤەرا مووسل یا ١٢تیرمەها ١٩٣٣ دیاردبیت جڤاتا وەزیرێن عیراقێ رازی بوویە (زمانێ بەهدینانی)* ببیتە زمانێ رەسمی ل قەزایێن باكووری یێن سەر ب لیوا مووسلڤە و داخواز ژ وەزارەتا زانیاری كریە لیژنەكێ ژ تایبەتمەندێن خۆجهی پێكبینیت داكو بریارێ ل سەر باشترین رێك بدەن كو بگرنە بەر داكو بنیاتێن نڤیسینێ ب ڤی زمانێ ل سەر دانن. د ڤێ نڤیسارێدا كو بۆ مامۆستایێ خواندنگەها دهۆكێ یا كوران شاكر ئەفەندی دورسن** هاتیەهنارتن و ئەو وەك ئەندامێ وێ لیژنێ دەستنیشانكریە بریار دایە یەكەمین جڤینا وێ لیژنێ ل ١٩٣٣/٧/١٧ بێتە گرێدان[٧٩].

ل ڤێرێ دیاردبیت كو خواندن ب زمانێ كوردی و زاراڤێ دەڤەرێ د ڤێ قۆناغێدا ژ دەستەلاتێ

پاسادانانێ دەرکەتیە و دەستەلاتێ بجهێنانێ ژێ بریار ل سەردایە و کەتیە د قۆناغا دەسپێکێ یا بجهێنانێدا.

بەلێ وەسان دیارە ژ بەر هەر ئەگەرەکی بیتن کو پاشتر دێ ئاماژە پێ کەین خەلکێ دەڤەرێ مفا ژ ڤێ دەلیڤێ ژێ وەرنەگرتیە یان خەلکەکی ژ ئەنجامێ نە هشیاری و پاشڤەمانا وان نەهێلایە مفای ژ ڤێ دەلیڤێ وەرگرن و بەردەوامی ب خواندنێ ب زمانێ عەرەبی هاتییە دان.

جارەکا دن د روودانێن شۆرشا بارزان ١٩٤٣-١٩٤٥یدا بابەتێ خواندنێ ب زمانێ کوردی ل ڤێ دەڤەرێ هاتییەڤە ئازراندن و ئێك ژ داخوازیێن شۆرشا بارزان یێن ل رۆژا ١٩٤٤/١/٧ پێشکەشی نوونەرێ حکۆمەتا عیراقێ کرین ئەو بوو کو قەزایێن کوردیێن لیوا مووسل سەر ب ویلایەتا کوردستانێ ڤە بن و زمانێ کوردی ل وێرێ زمانێ رەسمی بیت[٨٠].

ب شکەستنا شۆرشا بارزان ئەڤ بابەتە هاتییە نڤاندن و هەتا شۆرشا عیراقێ یا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨دەڤەرا بەهدینان یان ژێ قەزایێن کوردیێن لیوا مووسلێ ژ خواندنا کوردی هاتینە بێ باهرکرن. د یەکەمین سالا خواندنێ یا پشتی شۆرشێ ئانکو د سالا ١٩٥٩-١٩٦٠یدا ژ رێزا یەکێ سەرەتاییڤە دەست ب خواندنێ ب زمانێ کوردی ل خواندنگەهێن دەڤەرێ هاتییەکرن.

بەلێ بەری بچینە د ڤێ قۆناغێدا پێویستە هەلسەنگاندنەکا قۆناغا ناڤبەرا سالێن١٩٢١-١٩٥٨ێ بکەین و ل وان ئەگەران بگەرێین یێن بووینە ئەگەرێ بێ باهرکرنا دەڤەرێ ژ خواندنێ ب زمانێ کوردی و راشکاوانە ئاماژە ب وان ئەگەران بکەین هەرچەندە هندەك ژ وان ئەگەران ئەم ب خۆ ژێ بین و کێماتی بیتن بۆ دیرۆکا مە. هەر چاوان بیتن د ئەنجامێ دووڤچوونا مە ئەم دکارین ئاماژە ب ڤان ئەگەران بکەین:

**پێکهاتا رەوشەنبیری جڤاکی یا خەلکێ دەڤەرێ**

ناهێتە ڤەشارتن پێکهاتا خەلکێ دەڤەرێ پێکهاتەکا عەشیرەتی و پاشڤەمای بوو، رێژەیەکا زۆرا خەلکێ دەڤەرێ نەخویندەوار بوون، کتا کێما خویندەواران ژێ نیڤ خویندەوار بوون یان د رێکا حوجرە و مزگەفتانرا فێری هندەك بەراهیێن خویندەوارێ ببوون، هەتا داویا سالێن سیهان ژ سەدسالیا چوویی دەرچوویێن قۆناغێن ناڤنجی و ئامادەیی یان بەرەڤ ژوور ل ڤێ دەڤەرێ نەبوون یان ژێ دەگمەن بوون، نەبوونا قۆناغا ناڤنجی و دواناڤنجی ل ڤێ دەڤەرێ ئەگەرێ سەرەکیێ ڤێ چەندێ بوو، یەکەمین خواندنگەها ناڤنجی ل سەرانسەری دەڤەرێ ل سالا ١٩٤٥- ١٩٤٦ ل دهۆکێ هاتییەڤەکرن[٨١]زێدەباری هەژاریێ کو رێك نەدایە خەلکێ زارۆکێن خۆ بۆ خواندنا قۆناغا ناڤنجی بهنێرنە جهێن دوورتر وەك مووسلێ، هەروەسان عەقلیەتا عەشیرەتی هندەك بۆچوونێن بەرتەنگێن ئایینی و سەروبەرێ ئابووریێ وی سەردەمی ژێ رێکێن خواندن و فێربوونێ ل بەر خەلکی بەرتەنگ کرینە، د ڤی سەروبەریدا نە خەلکەکێ خواندەڤا و رەوشەنبیر نە ژێ خۆدی هەستەکا نەتەوەیی ل دەڤەرێ هەلدکەڤیت هزرێ ل فێربوونا زمانێ خۆیێ نەتەوەیی یان ژێ بزاڤێ بۆ ڤەکرنا خواندنگەهان ب ڤی زمانی بکەت، بوونا کتەکا کێما کەسانێن رەوشەنبیر کو خەم ژ کوردی خواریتن وەك مەلا محەمەد سەعیدێ بریفکانی یان شاکر درسن د ڤی کاودانیدا چ ژ سەروبەری ناگوهریت. هەروەك دهێتە زانین ل داویا سالێن سیهان و دەسپێکا چلان ژ سەدسالیا بیستێ هژمارەکا خویندکارێن خەلکێ دەڤەرێ بۆ خواندنا قۆناغێن ناڤنجی و ئامادەیی و زانکۆیێ و خواندنێن لەشکەری گەهشتنە مووسلێ و بەغدایێ و د ئەنجامێ تێکەلیا وان دگەل خویندکارێن دەڤەرێن دیترێن کوردستانێ و نێزیکبوونا وان ژ زێدەرێن رەوشەنبیریا کوردی و پەیوەندیا وان دگەل رێکخستنێن کوردی نەمازە (کۆمەلا هیوا) هەروەسان ل ژێر کاریگەریا چالاکیێن کۆمەلا خۆیبوون(١٩٢٧- ١٩٤٣) و چالاکیێن رەوشەنبیری و چاپەمەنیێن مالباتا بەردخانییان ل شامێ د ناڤبەرا ١٩٣٢- ١٩٤٣ێ رەنگەکێ هەستا نەتەوایەتی و عەشقا زمان و رەوشەنبیریا کوردی ل جەم وان پەیدا

بوویە[٨٢]. ئەڤ کەسە ژ نقشێ بەراهیێ یێ خەلکێ دەڤەرێ بوون خۆ فێری نڤیسین و خواندنێ ب زمانێ کوردی کری و شوون تبلێن وان د دیارن، بەلێ شیانێن وان و سەنگا جڤاکیا وان و دەلیڤێن بەردەستێن وان یێن هندێ نەبوون خەلکەکی ب بەرفرەهی فێری خواندن و نڤیسینا کوردی بکەن یان هزرێ ل ڤەکرنا خواندنگەهان ب زمانێ کوردی بکەن.

*** ل دووڤ هەموو وان پێکهاتنێن د ناڤبەرا بریتانیا** وەك دەولەتا ئینتیدابێ و کۆمەلا مللەتان دەربارەی عیراقا نوو دامەزراندی هاتینەکرن و ل دووڤ هەموو وان پێکهاتنێن ناڤبەرا عیراقێ و بریتانیا و ل دووڤ هەموو وان سۆز و پەیمانێن مەزنە بەرپرسێن عیراقێ داینە خەلکێ کوردستانی خواندن ب زمانی نەتەوەیی مافێ رەوایێ گشت خەلکێ کوردستانێ یە بەلێ خەلکێ دەڤەرا بەهدینان یان دەڤەرێن کوردیێن لیوا مووسلێ مفا ژ ڤی مافی وەرنەگرتیە، هەروەسان ل دەسپێکا هاتنا لەشکەرێ بریتانی بۆ عیراقێ دەستەلاتداریا نوو بۆ خۆ کربە ئارمانج کو زارۆکان ب وی زمانی فێرکەن یێ ئەو تێ دگەهن و د وان بەرناماندا یێن ل گولانا ١٩١٩ هاتینە راگەهاندن کو زمانێ فێرکرنێ دێ ئەو زمانێ خۆجهیێ بەربەلاڤ بیتن[٨٣]. ڤێ چەندێ ژ زمانێ کوردی گرتیە و ماف دایە هەر دەڤەرەکا باشووری کوردستانێ ب کوردی بخوینن، دەمێ جێگرێ راوێژکارێ لیوا مووسلێ دگەل راوێژکارێ پەروەردێ ل بهارا ١٩٢٢ سەرەدانا خواندنگەهێن ئامێدیێ کری و فەرماندایە مامۆستایان کتێبێن عەرەبی وەرگێرنە سەر زمانێ کوردی و ب زارۆکان بدەنە خواندن[٨٤]. ل ڤێرێ ژی خەلکێ دەڤەرێ مفا ژ ڤێ دەلیڤێ وەرنەگرتیە و هەروەك مفا ژ دوادەلیڤەیێن ل گولانا ١٩٣١ دگەل راگەهاندنا قانوونا زمانێن ناڤخۆیی (خۆجهی) و بریارا جڤاتا وەزیرێن عیراقێ ل تیرمەها ١٩٣٣ بۆ ڤی خەلکی هەلکەتی نەدیتی، قانوونا ئاماژەپێکری نە تنێ ماف دایە خەلکێ دەڤەرێ ب کوردی بخوینن، بەلکی ماف دایە وانا ئەو دشێن ب وی زاراڤی بخوینن ئەوێ ئەو هەلدبژێرن و ل سەر پێك دهێن[٨٥]. پاشتر ژی ل ١٩٣٣ئەڤ مافە بەرەف قۆناغا بجهئینانێ چوویە.

*** زێدەباری نەبوونا خەلکەکێ رەوشەنبیر و خۆدی هەستێ نەتەوایەتی** یێ دخالا چوویدا ئاماژە پێ هاتیبەکرن وەك دو هوکارێن سەرەکیێن خەلکێ دەڤەرێ ژ خواندنا کوردی بێ باهر کرین، فاکتەرەکێ دی یێ ڤێ بێ باهرکرنێ د وێ قۆناغێدا کەسایەتی و مەزن و خۆدی دەستەلاتێن دەڤەرێ و بەرپرسێن کارگێریێن دەڤەرێ کو یەك یەکە دێ ئاماژە ب هەموویان کەین:

- هەروەك ئاماژە پێ هاتیە کرن وی سەردەمی پێکهاتا دەڤەرێ نە پێکهاتەکا باژێری شارستانی رەوشەنبیری بوو بەلکی پێکهاتەکا عەشیرەتی پاشکەتی بوو کو ئاغا و بەگ و شێخێن تەریقەتێن ئایینی مەزناتی و دەستەلاتداری ل خەلکێ دەڤەرێ دکرن، هەر ئەڤە ژی بوون خەلەکا پەیوەندیێ د ناڤبەرا خەلکێ و دەستەلاتدارێن رەسمیێن دەولەتێ، هەر ڤان و نوونەرێن وان نوونەراتیا خەلکێ دەڤەرێ د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا دکرن، ئەگەر پێداچوونەکا ب ژیانا ڤان ئاغا و بەگ و شێخان و نوونەرێن وان د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا بکەین دێ بینین دەگمەن نەبیت کەسەك ژ وانا نینە هەستا نەتەوایەتی ل جەم هەبیت کو خۆدی هەلویستەکێ نەتەوەیی بیتن، یان رۆژەکێ ژ رۆژان بەرگریێ ژ مافەکێ نەتەوەیی وەك مافێ خواندنێ ب زمانێ نەتەوەیی بکەت، بەلکی گەلەك ژ وانا هەردەم د بەرهەڤ بوون بۆ دژایەتیکرنا هەر لڤینەکا بێهنا نەتەوەیی ژێ بهێت و ب هەمان شێوە ژی نوونەرێن دەڤەرێ ل جڤاتا نوونەران کو هەر ئەو ئاغا و بەگ و شێخە یان بەربژێرێن وان بوون ژ بلی یەك دوبەکێن وەك حازم شەمدینان و شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی نەبن کەسەکێ دی ژ وان کەسان نەبوون ل دەلیڤەکێ بگەرێن خزمەتەکێ بۆ وی خەلکێ خۆ وەك ب کوردیکرنا خواندنگەهان پێشکەش بکەن[٨٦].

ل ڤێرێ داکو بۆچوونا مە تنێ گۆتن نەبیت دێ گۆتنا خۆ ب بەلگە و ژێدەرێن دیرۆکی سەلمینین،

وەك پێشتر ئاماژە پێ هاتییەكرن ل تیرمەها ١٩٣٣جڤاتا وەزیرێن عیراقێ رازیبوویە ل سەر خواندنێ ب زمانێ كوردیێ خۆجهیێ دەڤەرێ و بۆ ڤێ مەرەمێ رێڤەبەریا زانیاریا لیوا مووسلێ بەرهەڤیكرینە و لیژنەك ژ تایبەتمەندان پێكئینایە و بەرهەڤیا وەزارەتێ دیاركریە بۆ دیتنا هەموو ئەو پەرتووكێن بۆ وێ دهێنەپێشكەشكرن چ ئەوێن ژ ئالیێ نڤیسەرانڤە دهێنەدانان یان ئەوێن ژ بەرنامێن رەسمیێن خواندنێ دهێنە وەرگێران و هاندان و هاریكاریا وان پشتی كو لیژنا ئاماژەپێكری بریارێ ل سەر بنەما و رێكێن نڤیسینا ڤی ددەت. هەروەسان بریاربوو ئەڤ لیژنەیە بۆ ڤێ مەرەمێ ل دەمژمێر نەهێ رۆژا یەكشەمبی ١٩٣٣/٧/١٧ ل دیوانا رێڤەبەریا زانیاریا مووسلێ كۆمببیت[٨٧].

ئەڤ كۆمبوونە هاتەكرن یان یان نە.؟ چما ئەڤ بریارا جڤاتا وەزیران نەهاتەبجهئینان..؟ ئەگەر چ بوون..كی بوونە ئاستەنگ..؟ چ ژێدەرەك یان بەلگەنامەیەك ل بەر دەستێ مە نینە بەرسڤا ڤان پرسیاران بدەت. تنێ ئەم دكارین بێی هیچ گومانەك بێژین ئەو بریار نەهاتەبجهئینان و زمانێ كوردی ل دەڤەرێ نەهاتەخواندن، لەوما ژی د خولا جڤاتا نوونەرێن عیراقێ یا ناڤبەرا تەباخا ١٩٣٥- چریا ئێكێ ١٩٣٦ێ نوونەرێ سلێمانیێ د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا عەلی كەمال* بابەتێ خواندنا كوردی ل قەزایێن كوردی یێن لیوا مووسلێ د ئازرینیت و پرسیاردكەت بۆچی كوردی ل ڤان دەڤەران ژی وەك سلێمانیێ و هەولێرێ ناهێتەخواندن و داخواز دكەت زمانێ كوردی ل ڤان دەڤەران ژی بێتەخواندن. پشتی دانوستاندنێ بریار دهێتەپاشئێخستن بۆ جڤینا پاشترا جڤاتێ و جڤینا پاشتر ژی د كەڤیتە پشتی پشوویا جڤاتێ.[٨٨]

د ڤێ ناڤبەرێدا بەرهەڤیەكا باش دژی بۆچوونا عەلی كەمالی ل جڤاتا نوونەران هاتیەكرن، دهژمارا ٤٦٧ یا ٢٠ئادارا ١٩٣٦ رۆژناما (البلاغ) یا مووسلێ ل ژێر مانشێتی (احتجاجات علی بیان نائب السليمانية علی كمال) هەروەسان (زاخو تستنكر و تحتج علی فكرة تنتقص الوحدة العراقية) چەندین بروسكێن نەرازیبوونێ دژی بەیانا عەلی كەمالی بۆ خواندنا كوردی ل دەڤەرێ بەلاڤكرینە و عەلی كەمالێ بەرگری ژ بەرژەوەندیا وان دكر ب تێكدانا ئێكەتیا نیشتمانی گونەهباركریە كەسێن ئەڤ بروسكە مووركرین و هنارتین: حاجی خەلیل، سەعید یوسف خدر ئەندامێن جڤاتا باژێرڤانییا زاخۆ، عەزوز ئیبراهیم رشید موختارێ تاخێن رویتا، ئیبراهیم موختارێ تاخێ گویان، محێ دین موختارێ تاخێ سویكێ، رەمەزان موختارێ گوندكی، میرزا ئەحمەد سەرۆكێ جونكی، نیعمەت حامد و حەجی سادق و سالحێ عەبدی ئاغای ب ناڤێ سەرۆكعەشیرەتێن گوللی، جەمیل عەبدی ئاغا ژ پێش سەرۆكێن عەشیرتا سندی ڤە، عەبدولكەریم شەمیدن ئاغا ژ سەرۆكێن عەشیرەتا سلێڤانەیی، حسێن غازی سەرۆكعەشیرتێ بەنستانی و سەرۆكێ ئەرمەنیان و هندەك ناڤێن دیتر[٨٩].

د هژمارەكا دیترا رۆژناما ( البلاغ)ل ژێر مانشێتێ (يعلنون استنكارهم للصدى المشؤم و تمسكهم بالوحدة العراقيه) هەروەكی (الوحدة العراقية) تنێ خەما سەرۆكعەشیرەتێن دەڤەرێ بیت، وەك د دەقێ رۆژنامێدا هاتی سەرۆك و ماقوولێن عەشیرەتێن ئامێدیێ و دهۆكێ د برۆسكەكێدا ب توندی نەرازیبوونا خۆ دژی رەخنەیا عەلی كەمالی ل سەر سازیێن كارگێری و زانیاری (الادارة و المعارف) دیاركریە و داخوازا عەلی كەمالی بۆ خواندنا كوردی ل بەهدینان ب بانگەوازەكا شویم كو دڤێت دژی ئێكەتیا عیراقێ ب ئازرینیت دایەنیاسین و وان سەرۆكعەشیرەتان پێگیریا خۆ ب ریشالوكێن تەختێ شاهیێ عیراقێ دیاركریە وەك د دەقێ رۆژنامێدا هاتی ئەو سەرۆكعەشیرەت و ماقوولە ژی سەعید دێوالی سەرۆكعەشیرەتێ دۆسكی، شێخ نورەدینێ بریفكانی سەرۆكعەشیرەتێ مزووری، حەجی مەلۆ ژ سەرۆكێن عەشیرەتا دۆسكی(یا راست مزووری یە) شەفیق سەرۆكعەشیرەتێ گەودا، طەیار ئاغا سەرۆكعەشیرەتێ شەرەفان و حاجی محەمەد ئاغا ژ سەرۆكێن عەشیرەتا دۆسكی[٩٠].

ب ڤێ چەندێ كەسایەتیەكێ كوردێ نوونەر د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا بەرگری ژ مافێ خەلكێ دەڤەرا بەهدینان ب خواندنێ ب زمانێ كوردی كریە، بەلێ ڤان سەرۆك و ماقوولان بەرسنگێ وی گرتیە و نەهێلایە زارۆكێن وان ب زمانێ كوردی بخوینن. و ب ڤێ چەندێ ئەم دوورنابینین هەرڤان كەسان بزاڤا ل سالا ١٩٣٣ێ بۆ خواندنا كوردی هاتییەكرن و بریارا جڤاتا وەزیرێن عیراقێ ژ ناڤبریبیت. دهەمان دەمدا دێ بێژین دەستەك ژ عەرەبێن شوفێنی ل پشت وان هەبوویە، ژ بەركو ئەو شێوازێ د بروسكاندا هاتی ژ ئاستێ رەوشەنبیریێ وان كەسان بلندترە، بەلێ بكەر و یێن دژی خواندنا كوردی ل دەڤەرێ راوەستیاین هەر ئاغا و سەرۆكعەشیرەتێن دەڤەرێ ب خۆ بوونە.

**- بەرپرسێن كارگێرێن دەڤەرێ:**

هەروەك د وێ بیرئانینێدا هاتی ئەوا ٣٠ كانوونا دووێ ١٩٣٠مـحەمەد ئەمین زەكی دایە شاهێ عیراقێ ل سالا ١٩٢٦ل هەر پێنج قەزایێن كوردیێن لیوا مووسلێ رێژا فەرمانبەرێن كورد ٣٤٪ بوو بەرامبەری ٦٦٪ فەرمانبەرێن نە كورد، ئەو ٣٤٪ ژی ئەو كارێن سادە و بچووك بوون یێن كەسێن زۆر پێدڤی نەبن كەس پێ رازی نەدبوون، وەك گرۆڤ ژی ئاماژە پێكریە كو چوار ژ وان قائیمەقامان* و (مودیر مال و موعاونی شورطە و موفەووەظین و مەئموره گەورەكانی تر هەموو غەیرە كوردن و ژمارەی نائیبەكانیان بە نیسبەتی نوفووسیان ئەبوایە سیان یان چوار بووایە كەچی هەر دووانن)[٩١].

نە تنێ د ڤێ سالێدا بەلكی ب درێژیا سالێن ١٩٢١-١٩٥٨ سەروبەرێ كارگێریێ دەڤەرێ ب ڤی رەنگی بوو، بۆ نموونە هەتا سالا ١٩٥٨یەك قائیمەقامێ خەلكێ ئامێدیێ یان خەلكێ دەڤەرێ قائیمەقامی ل ئامێدیێ نەكریە، یەكەمین قائیمەقامێ خەلكێ ئامێدیێ ب خۆ عەگید سدیق بوو یێ ل سالا ١٩٦٩ بوویە قائیمەقامێ ئامێدیێ[٩٢]. ئەز باوەرم سەروبەر ل قەزایێن دهۆك، ئاكرێ و زاخۆ ژی هەر ب ڤی رەنگی بوویە.

هیچ گومان تێدا نینە ئەگەر بەرپرسێن كارگێرین بلندێن جهەكی نە خەلكێ وی جهی بن، ئەو چ خەمەكێ ژ بەرژەوەندیێن خەلكێ وی جهی ناخون. ژ بەركو دەڤەرا بەهدینان وەك چەند قەزایەك گرێدایی لیوا مووسل بوویە، ل سەنتەرێ ڤێ لیوایێ ژی دەستەلات د دەستێن عەرەباندا بوویە، گەلەك جاران ژی عەرەبێن توندرەوێن نەتەوەیی بوون، وان ژی ب هەستەكا شوفێنیزمی سەرەدەری دگەل دەڤەرێن كوردی كریە و ژ ئالیێ پەروەردە و فێركرنێ ڤە ب چاڤەكێ عەرەبانە سەرەدەری دگەل ڤان دەڤەران كریە و ڤیایە هەردەم زمان و خواندنا عەرەبی ل سەر وان بسەپینن. ب ڤی رەنگی قائیمەقام و بەرپرسێن ئیداریێن ڤێ دەڤەرێ نە خەلكێ دەڤەرێ بوون خەمەكێ ژ كوردیكرنا خواندنێ ل دەڤەرێ بخون و بەرپرسێن بلندتر یێن خۆدی دەستەلات ل سەنتەرێ لیوایێ (پارێزگەهێ) دژی هەر كوردیكرنەكێ بوون، بەلكی هندەك جاران دژی ئاخفتنێ بوونە ب زمانێ دایكێ ل خواندنگەهان، ل دور ڤێ چەندێ دێ نموونەكێ بەرچاڤكەین: د راپۆرتەكا پشكێنەرێ خواندنگەهێن سەرەتایی مەحموود عەتار باشی یێ سەر ب رێڤەبەریا زانیاری (معارف)یا مووسل هژمار ٦٤٠ ل ١٩٥٧/١١/١٣ دەربارەی سەروبەرێ خویندكارێن خواندنگەها سەرەتاییا مانگێشكێ هاتییە: من دیت ئاستێ زانستیێ هندەك خویندكاران ل رێزێن پێنجێ و شەشێ یێ لاوازە. ب رەنگەكێ گشتی خویندكار د لاوازن د زمانێ عەرەبیدا و شیانێن تێگەهشتنێ و دەربرینێ ب زمانێ عەرەبی نینن. من داكوكی ل سەر مامۆستایان كر كو زمانێ خۆجهی د دەمێ دەرسێدا نەهێتە بكارئینان[٩٣]. پشكێنەرێ تایبەتمەند كو دڤێت كەسەكێ شارەزابیت د سەروبەر و دەروونێ خویندكاری و هەست ب وێ چەندێ بكەت كو زمانێ دایكێ ئانكو زمانێ خۆجهی فاكتەرێ هەرە سەرەكیێ فێركرنا خویندكارییە و ڤێ راستیێ بكەهینتە یێن ژ خۆ بلندتر، فەرمان ددەت كو زمانێ خۆ جهی ددەرسێدا نەهێتە بكارئینان. هەروەسان ئەز ب دوور نابینم هەر ڤان بەرپرسێن بیانی ل دەڤەرێ و بەرپرسێن عەرەب ل سەنتەرێ پارێزگەهێ رۆلەكێ

سەرەکی د هاندانا ئاغا و سەرۆکعەشیرەتاندا هەبیت بۆ نڤیسینا وان برووسکان دژی عەلی کەمالی یێ بەرگری ژ بەرژەوەندیا زارۆکێن وان کری و وەك مە ئاماژەپێکری ژ شێوازێ وان برووسکان دیاردبیت کو ژ ئاستێ رەوشەنبیریا وان کەسان بلندترە یێن مووورکرین.

ب ڤی رەنگی نەکەسەکی ژ خەلکێ دەڤەرێ، نەکەسەکی ژ مەزن و دەستەلاتدار و پەرلەمانتارێن دەڤەرێ، نە ژی کەسەکی ژ کاربدەستێن کارگێرێن دەڤەرێ، نە ژی کاربدەستێن سەنتەرێ لیوا مووسلێ هزرەك ل ب کوردیکرنا خواندنگەهێن دەڤەرێ کریە، بەلکی ئەگەر هندەك جاران سڤکە لڤینەك بۆ ڤێ چەندێ هاتبیتەکرن دژایەتیا ڤێ لڤینێ هاتییەکرن، گومان ژی تێدا نینە ل ئاستێن بلندتر یێن وەزارەتا زانیاری ل بەغدا ل سەروبەرێن ب ڤی رەنگی دگەریان کو دژایەتیا خواندنا کوردی بکەن ل ئەو جهێن دشیانێن واندا بیتن بکەن.

هندی پەیوەندی ب خواندنا کوردی ڤە ل دەڤەرا بەهدینان هەبیت پێدڤیە ئاماژە ب چەند خالەکێن دی یێن پەیوەندی ب بابەتیڤە هەی بدەین کو پشکەکن ژ دیرۆکا فێرکرنێ ل دەڤەرێ:

*** د وێ بیرئانینێدا یا محەمەد ئەمین زەکی** ل ٢٠ کانوونا دووێ ١٩٣٠دایە شاه فەیسەل شاهێ عیراقێ دبێژیت:لە حالی حاضر لە هەر پێنج قەضای کوردەکانا کە لە چوار سێ بەشی کوردە، مەکتەبێك نابینین کە زمانی تەدریسی کوردی بێ، ئیپباتی ئەمەش کاغەزی مودیری مەعارفی مەنطیقە ی مووصل کە بە تەئریخی ١٩٣٠/١١/٢ ژمارەی ٣٥١/١ بۆ مودیری مەعاریفی عامی نووسیوە و لەم کاغەزەدا بە ئاشکرایی پێی لێ ئەنێ کە لە مووصلدا مەکتەبێکی تیا نیە کە بە کوردی دەرس بخوێنێ، حاڵ وایە ئەگەر تەماشای مادە ٩ی خوطبە ی وەزیری موستەعمەرات بکەین ئەبینین ١٣ مەکتەبی کوردی تیا باسکراوە (لەم ١٣ مەکتەبە شەشیان لە مەنگیقە ی مووصدا یە) وە خۆم بیلنەفس لە ساڵی ١٩٢٧دا ١٥ مەکتەبی کوردیم لە مە نطیقە ی مووصلدا دیوە، سەرەرای ئەمە بەرامبەر بە بەڵێنی وەزیری موستەعمەرات کە لە مادەی ١٥ خوطبە کەیدا بەیان کراوە، خیلافێکی تریش ئەبینین، وە ئەوەش بە تەواوی هەڵ گرتنی زمانی کوردییە لە طە رەف وەزارەتی مەعاریفەوە لە هەر پێنج قە طاکە دا، ئینجا نازانم ئایا وەزارەتی مەعاریف لە خۆیەوە وە یا خۆد بە ئیعازی حکۆمەت بوو کە زمانی کوردیی لەو مەکتەبانەدا دەرکرد[٩٤]. د ڤی دەقیدا چەند خالەك هەژی ئاماژە پێکرنێنە:

- ل دووڤ خوتبا وەزیرێ موستەعمەراتێ بریتانی ل ١٩٢٦/٩/٣ ل کۆما مللەتان ژ ١٣ خواندنگەهێن کوردی ٦ ژ وان ل مەنتەقەی مووصلدا بوونە.
- محەمەد ئەمین زەکی ب خۆ ل سالا ١٩٢٧ێ ١٥ خواندنگەهێن کوردی ل دەڤەرا مووسلێ دیتینە.
- ل مەها چریا دووێ ١٩٣٠هیچ خواندنگەهەکا (مەکتەبێکی) کوردی ل دەڤەرا مووصلێ نینن.

تێبینیێن مە ل سەر ڤان خاڵن:

* چ ژێدەرەك ل بەر دەست نینە بسەلمینیت ل سالا ١٩٢٦ێ ٦ خواندنگەهێن کوردی و ل سالا ١٩٢٧ێ ١٥ خواندنگەهێن کوردی ل دەڤەرا مووسلێ (ئانکۆ پارێزگەهێن نەینەوا و دهۆك یێن ئەڤرۆ) هەبوونە، ل هەموو دەڤەرێن کوردنشینێن لیوا مووسل یا وی دەمی ١٥ خواندنگەهە نەبوونە.

* نە وەزیرێ موستەعمەرات نە ژی محەمەد ئەمین زەکی ئاماژە پێنەکریە ئەڤ خواندنگەهە ل کیژ باژێرکی یان گوندی بوون، ب کیژ زاراڤێ کوردی دخواندن..؟ ژ بەرکو ل دووڤ گۆتنا محەمەد ئەمین زەکی ب خۆ هەتا سالا ١٩٢٨ تنێ پێنج پەرتووکێن بەرنامێن خواندنێ ب کوردی چاپبوونە[٩٥]. بێی کو ئاماژە ب هندێ کریت ئەڤ پەرتووکە سەر کیژ خواندنگەهان یان یێن کیژ دەڤەران هاتینە دابەشکرن، ئەگەر ئەڤ پەرتووکە گەهشتینە لیوا مووسل ئەرێ وی سەردەمی ئەو مامۆستایە ل ڤێ دەڤەرێ هەبوونە ب زاراڤێ وان پەرتووکان خویندکاران فێرکەن.

* د کورتیا وان دو راپۆرتان یێن د رۆژناما ژین دا ل

٢١خزیرانا ١٩٢٨ هاتینە بەلاڤكرن هەروەك رۆژناما گۆتی نوونەرێ سلێمانیێ رێزدار محەمەد ئەمین زەكی پێشكەشی جڤاتا بلندا نوونەران (مجلس عالی مبعوثان) كری دەربارەی سەروبەرێ زانیاری ل كوردستانێ و دانانا لیژنەكا دانان و وەرگێرانا پەرتووكێن كوردی خواندنێ ب كوردی هاتیە: لە لیوای مووصل، هەولێر، كەركووك، سلێمانی دا حالی حاچر ٣٨ مەكتەبی كوردی تیا مەوجودە[٩٦]. ل ڤێرێ باوەری ناهێتە كرن ژ ٣٨ خواندنگەهێن كوردی ١٥ ل لیوا مووسلێ بن. د كورتیا راپۆرتا دوویدا هاتییە: ئەو مەكتەبانەی لە لیوای سلیمانی و كەركووك و هەولێر مەوجودن قسمێكیان لەطەرەف مودیریەتی مەنطەقەی موصل و قسمێكیان لە طە رە ف مودیریەتی مە نطەقەی بەغداوە ئیدارە ئەكرێن[٩٧]. ئەڤە رەنگەكێ باوەریێ ل جەم ڤكۆلەری دروست دكەت كو ١٥ خواندنگەهێن لیوا مووسلێ یێن ئەمین زەكی ژێ دبێژیت یێن لیوایێن دیتر بن بەلێ ژ ئالیێ رێڤەبەریا زانیاری (معارف)دەڤەرا مووسلێ دهاتنە رێڤەبرن. ل ڤێرێ پێدڤیە بێتە گۆتن ل سالا ١٩٢٦دەست ب خواندنا كوردی ل لیوا هەولێرێ هاتییەكرن[٩٨]. بەلێ د هەمان كورتە راپۆرتێدا دوبارە ئاماژە ب ١٦خواندنگەهێن كوردی یێن لیوا مووسل هاتییەكرن: وە لی عەینی زەماندا بۆ ئەو شازدە مەكتەبە كوردی كە لە لیوای موصل دا هەیە بۆ تەفتیش و مراقب یان موفەتشینی كوردی موقتەدیر استیخدام و عەلاوەی قادروی مودیریەتی مەنطەقەی موصل بكەن و موحەقەق لێم مەعلومە كە مەجلسی عالیتان ئەبێ بە ڤە هیر و امیدم ترویج بفەرمون[٩٩]. دوبارە ڤەكۆلەری دئێخیتە د گومانێدا ل سەر هەبوون و نەبوونا وێ هژمارا خواندنگەهێن كوردی ل لیوا مووسلێ، ئەگەر ڤێ گومانێ ژی وەربگرین دێ بێژین ژێلی ڤی ژێدەری یێ محەمەد ئەمین زەكی چ ژێدەرێن دی ل بەردەست نینن ئاماژە ب بوونا ١٥ یان ١٦ خواندنگەهێن كوردی ل لیوا مووسلێ كربیت. وێ چەندێ ژی ل بەر چاڤ وەرگرین كو ل سالا ١٩٢٤- ١٩٢٥تنێ ٥١ خواندنگەهێن سەرەتایی ل هەموو ویلایەتا مووسل هەبوون[١٠٠]. ل دووڤ گەریانا مە ژی د وی سەردەمیدا ١٥ یان ١٦ خواندنگەهـ ل دەڤەرێن كوردی یێن لیوا مووسلێ نەبوون. ب ڤێ چەندێ ژی ئەم دوور نابینین ئەڤ بۆچوونا محەمەد ئەمین زەكی ژ هەستێ وی یێ پاقژی نەتەوەییڤە هاتبیت و هاتبیتە بلندكرن بۆ شاهـ و جڤاتا نوونەران یا عیراقێ و مەندوبێ سامیێ بریتانی ل عیراقێ. د هەمان دەمدا ژی دوور ناهێتە دیتن ژ بەر نەبوونا پەرتووكێن چاپكری هندەك مامۆستایان ل دەڤەرێن كوردی دەرس ب كوردی شروڤەكرین و محەمەد ئەمین زەكی ئەڤ خواندنگەهە ب كوردی دابنە نیاسین. وی ب خۆ ژی د كورتیا وێ راپۆرتێدا یا ل سالا١٩٢٨ێ هاتییە بلندكرن بۆ جڤاتا بلندا نوونەران ئاماژە ب وێ چەندێ كریە كو ژ كۆما ٥٨ بابەتێن خواندنا سەرەتایی و دواناڤنجی تنێ بۆ دەرسەكێ ژ وانا پەرتووك ب كوردی هەنە و خویندكار ناچارن تێبینیان بنڤیسن[١٠١].

* هەروەك دهێتە زانین پشتی كو ل داوییا ١٩٢٥ ئاریشا ویلایەتا مووسل ب داویهاتی و (كۆما مللەتان) ل دووڤ چەند مەرجەكێن دیاركری ویلایەتا مووسل كو باشوورێ كوردستانێ یێ نها ب خۆڤە دگریت دایە دگەل عیراقێ، وان مەرجان پێویست دكر دەولەتا عیراقێ سەرەدەرییەكا وەك هەڤ دگەل هەموو پێكهاتێن عیراقێ بكەت و د وارێ ڤێ وەكهەڤیێدا پێویست دكر دەست ب جێبەجێكرنا هندەك مافان بكەت یێن بەری نها پەیماننامە و پێكهاتنێن ناڤدەولەتی و پێكهاتنێن ناڤبەرا دەستەلاتداریا ئینتیدابا بریتانی و دەولەتا نوو دامەزراندیا عیراقێ بۆ گەلێ كورد ل باشوورێ كوردستانێ بریار پێدای و ڤان مافان ژی بێخیتە د چوارچوڤەكێ دەستووریدا. د هەمان دەمدا عیراقێ كاردكر كو ل ژێر دەستەلاتێ ئینتیدابێ رزگار ببیت و وەك دەولەتەكا سەربەخۆ ببیتە ئەندام د (كۆما مللەتان)دا و پێشوەخت مەرجێ ڤێ سازیێ ژی بۆ وەرگرتنێ ئەو بوو عیراق هەموو سوز و پێگیریێن خۆ د وارێ مافێن نەتەوەیێن كوردانداً بجهبینیت. هەر

د ڤێ قۆناغێدا ب تایبەت د سالا ١٩٣٠یدا چەندین بروسکێن نەرازیبوونێ دژی سیاسەتا دەولەتا عیراقێ بەرامبەری کوردان ژ رێکخراو و کەسایەتیێن کورد گەهشتنە هەردو حکۆمەتێن بریتانیا و عیراقێ و (کۆما مللەتان) و تێدا داخواز دکرن عیراق سوز و پێگیریێن خۆ بەرامبەری مافێن کوردان و (کۆما مللەتان) بجهـ بینیت. ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی عیراق ناچار بوو قانوونا زمانێن خۆجهی- ناڤخۆیی (قانون اللغات المحلیه) هژمار ٧٤ سالا ١٩٣١ل ٢٣ گولانا ١٩٣١ رابگەهینیت[١٠٢].

هەروەکی دیار ژ دەقێ قانوونێ هەر کوردەکی ل هەر جهەکێ ئاماژە پێکری د برگێن قانوونێدا ماف هەیە ب زمانێ خۆ بخوینیت و ل دادگەهان ژی ب وی زمانی سەردەری دگەل وی بێتەکرن، زێدەباری ڤێ چەندێ تایبەتمەندیا دەڤەرا بەهدینان پاراستیە و ماف دایە وان (قەزایێن کوردیێن مووسلێ) د دەمێ سالەکێدا وی شێوازێ زمانێ کوردی هەلبژێرن یێ وان دڤێت، ئانکو وان ماف هەیە زاراڤێ خۆ یان هەر زاراڤەکێ دی یێ وان دڤێت بۆ خۆ هەلبژێرن، هەژیە بێژین هەتا نها ژی چ قانوونەکا عیراقی و کوردستانی هوسان ب ئاشکرایی ئەڤ مافە نەدایە خەلکێ دەڤەرێ.

ل ڤێرێ پێدڤیە ئاماژە ب دو مژارێن پەیوەندی ب ڤێ قانوونێ و خەلکێ دەڤەرێڤە هەی بێتە کرن:

١- دهێتە ڤەگێران دەمێ ل سالا ١٩٣٠حکۆمەتا عیراقێ داخواز ژ کۆما مللەتان کری کو ژ بن ئینتیدابا بریتانی سەرخۆبوونا خۆ وەرگریت و ببیتە ئەندام د (کۆما مللەتان)دا ڤێ سازیێ ژ عیراقێ خواست: کو مافێن وان نەتەوەیێن د عیراقێدا دژین نەخاسم مللەتێ کورد ب دروستی بدەتێ، عیراقێ ژی وەسان بۆ کۆما مللەتان دا خویاکرن کو ئەو نەتەوەیێن د عیراقێدا ب سەربەستی دژین و مللەتێ کورد ژی مافێن خۆ وەرگرتینە و ب زمانێ خۆ ژی د خوینن و دنڤیسین، هەروەسان عیراقێ بەرهەڤیا خۆ دیارکر بۆ هەر لیژنەیەك بهێت بۆ ڤێ چەندێ. لێ بەری لیژنە بهێت عیراقێ داخواز ژ هندەك زمانزان و خەمخۆر و زانایێن کوردان کر کو رێزمانەکێ بۆ زارۆکێن دەڤەرا کوردستانێ بەرهەڤبکەن داکو ل خویندنگەهان بێتەخواندن... زمانزان و شاعیر و زانایێ دینی مەلا محەمەد سەعید یاسین گەلەك ب ڤێ چەندێ دلخۆشبوو و هەمی شیانین خۆ مەزاختن داکو رێزمانەکا کوردی بۆ زارۆکێن کوردان بەرهەڤبکەت، پشتی رێزمان هاتیەبەرهەڤکرن هندەك مامۆستا ژی هاتنەهەلبژارتن داکو وانێن زمانێ کوردی ل هندەك خواندنگەهان ببێژن ژ وانا عەبدولحەکیم ئیبراهیم کو بچیتە زاخۆ، شاکر دورسن کو بچیتە ئامێدیێ، هوسا ب ڤی رەنگی دەمێ لیژنە هاتی و سەرەدانا کوردستانێ کری و ب چاڤێن خۆ دیتی کو ل خواندنگەهێن کوردستانێ خواندن ب زمانێ کوردی یە ئەو ژی زڤرینەڤە و ئەڤ راستیە بۆ کۆما مللەتان گۆت. لێ مخابن دەمێ لیژنە زڤریەڤە جارەکا دی رژێما عیراقێ زمانێ کوردی قەدەغەکرەڤە[١٠٣]. ل ڤێرێ پیویستە بەری هەر تشتەکی بێژین ئەوا ل ڤێری نڤیسکاری چەند جارەکان گۆتی دەڤەرا کوردستانێ مەرەم پێ دەڤەرا بەهدینانە ئانکو قەزایێن کوردی یێن مووسلێ بوویە، چنکو ل دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ وی دەمی هەتا ئاستەکی ل قۆناغا سەرتایی خواندن ب زمانێ کوردی بوو و رێزمانا هاتیەبەرهەڤکرن ژی هەر بۆ دەڤەرا بەهدینان بوویە، هەروەسان گومان تێدا نینە ئەڤ چەندە پشتی راگەهاندنا قانوونا زمانێن خۆجهی روودایە و د بەردەوامیا هەولێن عیراقێدا بوویە بۆ چوونە ناڤ (کۆما مللەتان) و ڤێ لیژنی ژی سەرەدانا وان جهان کریە یێن بێ باهر ژ خواندنا کوردی وەك قەزایێن کوردیێن مووسلێ. و بزاڤا ڤان کەسان ژ بەرهەڤکرنا رێزمانێ و هندەك مامۆستایان بۆ دەرس گۆتنێ ئەگەر ژ ئالیێ حکۆمەتێڤە ژی هاتبنە خاپاندن ژ هەستەك نەتەوەیی و دلسۆزیا وان بوویە بۆ خواندنا کوردی. د هەمان دەمدا دێ بێژین ئەگەر کەسانێن رەوشەنبیر و خۆدی هشیاریا نەتەوەیی ل دەڤەرێ هەبانە و هندەك کەسایەتیێن خۆدی دەستەلات و شیانێن دەڤەرێ دا شێن ب مفا وەرگرتن ژ ڤێ قانوونێ و برگا داویێ ژ قانوونێ ب

رەنگەکی ژ رەنگان دا شێن ب زمانێ کوردی ب زاراڤێ خۆیێ خۆجهی بخوینن.

٢- هەمان دژایەتییا نها ل ژێر مهانەیێن جودا جودا ژ ئالیێ هندەك رەوشەنبیرێن زاراڤێ کرمانجیا ژێری دگەل هەر بزاڤەکێ بۆ پێشڤەبرنا کرنامجیا ژووری و خواندنا ڤی زاراڤی ل خواندنگەهان دهێتەکرن د وی سەردەمیدا ژی هاتییەکرن. تنێ ب دەرکەتنا ڤێ قانوونێ و برگا داویێ ژ قانوونێ کو ماف دایە خەلکێ دەڤەرێ ( وی شێوازێ زمانێ کوردی هەلبژێرن یێ وان دڤێت)، دیرۆکنڤیس محەمەد ئەمین زەکی کو د وی سەردەمیدا نوونەرێ لیوا سلێمانیێ بوو د جڤاتا نوونەراندا دژی ڤێ برگێ کەتیە د چەپەریدا و د بیرئانینەکێدا ل رۆژا ١٩٣١/٥/٢٢بۆ مەندوبێ سامیێ بریتانی ل عێراقێ ب مهانێن وەك: لەهجا ژ هەموویان پەتیتر و رێك و پێکتر، تێکدانا یەکێتییا زمانێ کوردی، نەبوونا کتێبێن کوردی ب زاراڤێ بەهدینان، دوقات بوونا مەزاختیێ حکۆمەتێ ئەگەر پەرتووکێن خواندنێ بۆ هەردو زاراڤان چاپبکەت و هندەك مهانەیێن دن و ل داویێ ژی هیڤی دکەت: لە بەر ئەم ئەسبابانە، رجا ئەکەم بە چاوێکی عەطفەوە تەماشای ئەم ئیشە بکەن و تەوەسوط بفەرموون تا تەنها لەهجەیەك بۆ هەموو کوردستانی عیراق قوبوولْ بکرێ. ئیتر زۆر شوکرو حورمەت بۆ ئێوە[١٠٤].

ل ڤێرێ پێدڤییە بێتە گۆتن کو محەمەد ئەمین زەکی ئەو چەند بەرچاڤ نەگرتیە کو زاراڤێ وی ب بەهدینان نافکری زاراڤێ کرمانجیا ژووری یە، هەرەسەرەکیترین و بەر بەلاڤترین زاراڤێ کوردی یە و کەڤنترین دەقێن کوردی ب ڤی زاراڤی هاتینە نڤیسین و د سەردەمێ نوودا ژی رۆژنامەڤانییا کوردی و چاپکرینێن کوردی ب ڤی زاراڤی دەسپێکرینە، تنێ سەروبەرێ دەهـ سالێن پشتی دامەزراندنا عیراقێ بەرچاڤکریە کو چەند خواندنگەهەك و کتەکا رۆژنامان و چەند پەرتووکێن چاپکری ب وی زاراڤێ وی ب: (هەرە فەصیحتر و رێکوپێکتر لەهجە) نافکری و وی دڤیا د وی سەردەمیدا ل سەر دەڤەرا بەهدینان بێتە سەپاندن کو محەمەد ئەمین زەکی ب خۆ دبێژیت هەتا وی دەمی تنێ پێنج پەرتووکێن چاپکرینێن خواندنگەهان ب کوردی هەبوون. ئەو چەندە بەرچاڤ نەگرتیە ئەگەر د وی دەمیدا ل دەڤەرا بەهدینان ب کوردی و زاراڤێ کرمانجیا ژووری هاتبا خواندن ئەڤە دا مفایەکێ باش گەهینیتە باکوور و رۆژئاڤایێ کوردستانی.

٣- هندی پەیوەندی ب خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینانڤە هەی پێدڤیە بێتە گۆتن هەرچەندە ژ سالا ١٩١٩- ١٩٥٨ ل زۆربەی باشوورێ کوردستانێ خواندن ل قۆناغا سەرەتایی ب زمانێ کوردی- زاراڤێ کرمانجیا ژێری(باشوور) بوو و وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن رۆژ ل دووڤ رۆژێ زمانێ کوردی- کرمانجیا ژێری پێشدکەت و ژ پەیڤێن بیانی دهاتە ڤەوژارتن و ب زاراڤ و ئیدیەمێن نوو دەولەمەند دبوو و بەرەف رێنڤیسەکا هەڤگرتی دچوو، بەلێ ڤێ پێشکەتنێ نەکو مفا نەگەهاندە دەڤەرا بەهدینان بەلکی کاریگەرییا وێ ژی ل سەر خەلکێ دەڤەرێ زۆر یا کێم بوو. بەلکی بەرڤاژی ڤێ چەندێ بزاڤا رەوشەنبیرییا کوردی ئەوا ل ١٥ گولانا ١٩٣٢ب دەرچوونا کۆڤارا (هاوار) ب تیپێن لاتینی ل شامێ دەسپێکری و هەتا سالا ١٩٤٥بەردەوام بووی سەرەرای بەرتەنگی و سنووردارییا ڤێ بزاڤێ کاریگەرییا وێ پتر بوویە ل سەر دەڤەرا بەهدینان، ب رەنگەکی ل دەسپێکا سالێن چلانڤە نیمچە خواندنگەهێن ئەهلی ل دەڤەرێ هاتینە ڤەکرن و خەلکەك تێدا فێری خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی (ئانکو تیپێن میرجەلادەتی) هاتییە کرن، وەك خواندنگەها گوندێ مایێ کو تێدا شەهید ئەنوەر مایی قوتابیێن خواندنگەها ئایینیا گوندێ مایێ دگەل دەرسێن ئایینی فێری خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی دکرن، ڤێ خواندنگەهێ سەرنجا نوونەرێ کۆڤارا (رۆناهی ١٩٤٢- ١٩٤٥شام) راکێشایە سەرا گوندێ مایێ و ڤێ خواندنگەهێ دایە و راپۆرتەك دەربارەی ڤێ خواندنگەهێ د هژمارا ١٢یا ئێکێ ئادارا ١٩٤٣ یا رۆناهی بەلاڤکریە[١٠٥]. ئەڤ نیمچە خواندنگەهە یان خولێن فێرکرنی ل جهێن دیێن وەك بامەرنێ، گەرماڤا، دهۆکێ هەبوون[١٠٦]،

و ژ ئەنجامێ ڤان نیمچە خواندنگەهان خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی ل سالێن چلان ب رەنگەکێ بەرچاڤ ل دەڤەرێ بەلاڤ ببوو، و ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی کۆڤارا (هاوار) دیڤرا ژی (رۆناهی) یێن شامێ ب رەنگەکێ بەرفرەهـ ل دەسپێکا سالێن چلان ل دەڤەرێ بەلاڤ دبوون، وەك ژێدەرەك ئاماژە پێ دکەت ل لیوا مووسل و قەزایێن وێ کۆڤارا (هاوار) ٩٩ پشکدارێن نڤیسی د تووماریێن وێ دا هەبوون، زێدەباری پشکدارێن کۆڤارێ ژ خەلکێ بەهدینان ل دەرڤەی سنووری لیوا مووسل[١٠٧].

ئەز باوەرم ئەگەر سەروبەرێ سیاسیێ هاریکاربوایە و بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی یا شامێ یا بەردەوام بوایە دا خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی ب رەنگەکێ بەرفرەهتر دا ل دەڤەرێ بەلاڤە بیت ژ بەرکو زاراڤێ ب ڤان تیپان دهاتە نڤیسین زاراڤێ خەلکێ دەڤەرێ بوو. بەروڤاژی ڤێ چەندێ ب درێژیا سالێن سەردەمێ شاهی (مەلکی) خواندن و خواندنگەهێن کوردی یێن ب زاراڤێ کرمانجیا ژێری و تیپێن عەرەبی ل سێ لیوایێن سلێمانیی، هەولێرێ و کەرکووکێ و کتا کێما رۆژنامە و کۆڤار و پەرتووکێن ب وی زاراڤی هاتینە بەلاڤکرن ئەو کاریگەریە نەکریە سەر خەلکێ دەڤەرێ ئەوا هژمارا کێما بەرهەمێن بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی یا شامێ کریە سەر دەڤەرێ.

ژ ئەنجامێ گورانکاریێن پشتی شەرێ جیهانیێ دووەم وەك شکەستنا بزاڤا رزگاریخوازا کوردی و شۆرشا بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ و راوەستانا بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی یا شامێ ئەڤ بزاڤا فێربوونا خواندن و نڤیسینا کوردی ب تیپێن لاتینی هێدی هێدی بەرەف پاش زڤریڤە و ل کێمیێ دا، بەلێ کاریگەریا وان کەسان یێن د وێ قۆناغێدا فێری خواندن و نڤیسینا کوردی ب رێنڤیسا لاتینی بووین هەتا سالێن شێستان یا بەردەوام بوو.

هەروەك ئاماژە پێ هاتیەکرن ب داویهاتنا شۆرشا بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ هەتا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ سەروبەرێ خواندنێ ل دەڤەرا بەهدینان وەکی بەرێ ما، خواندن ل هەموو خواندنگەهێن دەڤەرێ د هەموو قۆناغاندا ب زمانێ عەرەبی بوو، د هەموو وارێن دی یێن کارگێری و دادگەهان و یێن دی عەرەبی زمانێ رەسمیێ دەڤەرێ بوو. ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ و گرێدانا کارگێریا دەڤەرا بەهدینان د گەل کارگێریا لیوا مووسل رۆژ ل دووڤ رۆژێ کاریگەریا زمانێ عەرەبی ل سەر خەلکێ دەڤەرێ پتر لێ دهات و زمانێ عەرەبی جە ل بەر زمانێ کوردی بەرتەنگتر دکر.

ب رووداندا شۆرشا ١٤ تیرمەهێ سەروبەرێ سیاسی جڤاکی کارگێری و رەوشەنبیری ل سەرانسەری عیراقێ هاتە گوهارتن، پێنگاڤێن باشێن د بەرژەوەندیا وەلاتیان و ئازادیێن کەسان و نەتەوەیان هاتنە هاڤێتن، گەلێ کورد ژی ژ ڤان دەسکەفتان بێ باهر نەبوو، د یەکەمین دەستووری عیراقێدا یێ ١٣رۆژان پشتی رووداندا شرۆشا ١٤ تیرمەهێ و راگەهاندنا سیستەمێ کۆماری ئانکو ل ٢٧ تیرمەهێ هاتیە راگەهاندن، د بەندێ سێیێ ڤی دەستووریدا هاتیە کو کورد و عەرب هەڤپشکن د ڤی وەلاتیدا و خۆدی ماف و ئەرکێن وەکهەڤن[١٠٨]. ل دووڤرا چەند دەسکەفتەکێن دن بۆ گەلێ کورد ل عیراقێ دەستڤەهاتن، ژ وان دەسکەفتان یێن پەیوەندی ب بابەتێ مەڤە هەی دامەزراندنا رێڤەبەریا خواندنا کوردی و چەسپاندنا خواندنا کوردی بوو ل خواندنگەهێن تەڤایی باشووری کوردستانی، ڤێ چەندێ ژ دەڤەرا بەهدینان گرت و خواندنا کوردی ب هەمان زاراڤێ کرمانجیا ژێری ل هەموو خواندنگەهێن دەڤەر و قەزایێن کوردی یێن مووسلێ زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ، شێخان و ئاکرێ ل سالا ١٩٥٩- ١٩٦٠هاتەخواندن.

ب پێداچوونا بادەکێن خواندنگەهێن دەڤەرێ وەك خواندنگەهێن زاخۆ، باتوفا، بامەرنێ، ئامێدیێ، بێدوهێ .. و جهێن دی راستیا ڤێ گۆتنێ دیار دبیت[١٠٩]، ل دووڤ پەیڤا نوونەرێ مووسلی د دووەم کونگرەی مامۆستایانی کورد یێ دناڤبەرا ١٥-١٧ تەباخ ١٩٦٠ ل شەقلاوە هاتیە گرێدان، ل سالا ١٩٥٩- ١٩٦٠زمانێ کوردی ل ١٧٥ قوتابخانێن بەهدینان هاتە خواندن، و ل

بەر بوو بۆ سالا پاشتر ل ٢٧٥ قوتابخانا هاتبا خواندن و ئەگەر ل خواندنگەهێن شنگال و تەلعفەرێ كو هەتا وی چاخی كوردی لێ نەهاتبوو خواندن هاتبا خواندن دا هژمارا خواندنگەهێن كوردی گەهیتە ٣١٤ خواندنگەهان[١١٠].

هەژیە ل ڤێرێ بێتەگۆتن خولێن فێركرنا زمانێ كوردی و چاوانیا دەرسگۆتنێ ب كوردی بۆ مامۆستایێن دەڤەرێ ل دەسپێكا سالا ١٩٦٠ ل قەزا زاخۆ هاتبوونەڤەكرن. مامۆستا ئیبراهیم رەمەزان نەجار كو وی سەردەمێ سەرپەرشتێ پەروەردەیی بوو ل رێڤەبەریا پەروەردا مووسلێ دڤەگێریت: پشتی كو ئەم د وێ سالێدا ل كونفرانسێ سەرپەرشتێن پەروەردەیی ل بەغدا ئامادەبووین و ئەم دگەل دكتور سەدیق ئەتروشی بریكارێ وەزیرێ پەروەردێ روونشتین، بریارهاتەدان خولێن بلەز بۆ دەمێ سێ رۆژان بۆ مامۆستایێن دەڤەرێ بێنەڤەكرن دا فێری وانە گۆتنێ ب زمانێ كوردی ببن، بەرنامێ خولێ ژی من ب رازیبوونا دكتور سەدیق ئەتریشی بەرهەڤكربوو و من ل دهۆكێ، هاشم حەسەن ئاكرەیی ل ئاكرێ، عەبدولمەجید میرزا ل شێخان، عەبدولسەمەد محەمەد ل ئامێدیێ (هەرچوار سەرپەرشتێن پەروەردەیی بوون) و رێڤەبەرێ خواندنگەها زاخۆ عومەر خەلیل عەبدوللا ل زاخۆ ئەڤ خولە ب رێڤەبرن[١١١].

ڤەبوونا ڤێ هژمارا زۆرا خواندنگەهێن كوردی د یەكەمین سالا خواندنا كوردی دا ل دەڤەرا بەهدینان نیشانا پێشوازیا گەرما خەلكێ دەڤەرێیە ل خواندنا كوردی. بەلێ نە ئەوە خواندنا كوردی ل ڤێ دەڤەرێ ل ڤێ دەسپێكا ژیێ خۆ توشی ئاریشە و رێگری و دژایەتییان نە بوویت. هندی پەیوەندی ب قەزایێن كوردی یێن لیوا مووسلێ ڤە هەی یەك ژ ئاریشەیێن سەرەكی د رێكا خواندنا كوردی دا گرێدانا ڤێ دەڤەرێ بوو دگەل لیوا مووسل یا خۆدی دەستەلاتدارییەكا عەرەبی، هەروەكی بەری نها ئەڤ دەستەلاتداریا مووسلێ ئاستەنگ بوویە د رێكا خواندنا كوردی ل دەڤەرێ، نها ژی وەك خواندنا كوردی هاتییە چەسپاندن ل ڤێ دەڤەرێ، بێ گومان ئەڤ دەستەلاتدارییە یا هاریكار نابیت دگەلدا، لەوما ژی كونگرێ یەكێ یێ مامۆستایێن كورد ل شەقلاوە (١٠- ١٣ ئەیلولا ١٩٥٩ بریار دابوو رێڤەبەرییەكا زانیاری (رێڤەبەرییەكا پەروەردێ) بۆ كوردێن بەهدینان ل دهۆكێ بێتە دانان، بەلێ ئەڤ چەندە نەهاتەكرن و تنێ هاریكارەك (معاونەك) بۆ برێڤەبرنا خواندنگەهێن كوردی یێن زاخۆ دهۆك، شێخان، ئاكرێ و ئامێدیێ هاتە دامەزراندن[١١٢]. وەسان دیارە هەر زوو ئەڤ هاریكارە ژی هاتییە لادان وەك ژێدەرەك ل مەها چریا دووێ ١٩٦٠ێ دبێژیت: بەلێ پێنگاڤێت وەزارەتا زانیاری یێت ڤێ دیماهیێ دەست و دلی ل مرۆڤی سار دكەن، چنكی شولێ هاریكارێت لیوا مووسل و كەركووكێ لەغوكر و چو تشتەك نەما مزگینی بگەهینتە مرۆڤی كو داخازێت مللەتێ كورد یێت زانیاری لوا هەردو لیوا دێ هێنە بجە ئینان[١١٣]. د هەمان دەمدا خواندنگەهێن شنگال و تەلەعفرێ ژ خواندنا كوردی بێ باهر مان.

هەروەك ژێدەر ئاماژە پێ دكەن رێڤەبەریا گشتیا زانیاریا كوردی كو پشتی شۆرشا ١٤ێ تیرمەهێ بۆ سەرپەرشتیكرنا خواندنا كوردی و خواندنگەهێن كوردی هاتبوو دامەزراندن هەر ژ دەسپێكێڤە رێڤەبەرییەكا كێم دەستەلات بوویە: ئەو تشتێ مخابنیا مرۆڤی بۆ تێت (رێڤەبەریا گشتی یا زانیاریا كوردی) هەژ گاڤا ئێكێ دەست شل و گرێدایی ما و نە شیا چو بكەت ژ بەر روتین و فەرمان و عورف و عەدەتێت وەزارەتا زانیاری، و شولێ وێ بوو وەك وەسیتەكی ل نابەینا دائیرێت زانیاری ل كوردستانێ و بەرپرسیارێت وەزارەتا زانیاری ل بەغدا[١١٤].

ئەگەر سەروبەر و دەستەلاتێ رێڤەبەریا گشتی یا راستەوخۆ سەر ب وەزارەتێڤە ئەڤە بیتن، گومان تێدانینە دەستەلاتێ هاریكارەكی بۆ رێڤەبەرێ پەروەردێ یێ تایبەت ب خواندنا كوردی دێ گەلەك كێمتر بیت، لەوما ژی د كونگرێ دووێ یێ مامۆستایێن كورد ل شەقلاوە ١٥- ١٧ تەباخا ١٩٦٠ێ دوبارە داكوكی ل سەر دامەزراندنا رێڤەبەریەكا تایبەت

ب خواندنا کوردی ل دهۆکێ هاتییەکرن. زێدەباری کۆنگرەی رەوشەنبیرێن کورد ژی د دەلیڤەیێن جودا جودا دا ئەڤ داخوازیە بەرچاڤکرینە، هەروەك دکتور سەدیق ئەتروشی د گۆتارەکێدا دبێژیت: هەمی کەس دزانن شەش قەزاییت کوردی ل مووسلێ یێت هەین (ئاکرێ، شێخان، ئامێدی، دهۆك، زاخۆ و شنگار) ئەڤە ژ بلی هژمارا کوردا یا بۆش ل باژێرێ مووسلێ بخۆ و قەزایێ تەلەعفرێ هەی، هژمارا خەلکێ هەر شەش قەزا پێترە ژ نیڤا خەلکێ لیوا مووسلێ هەمیێ، مەعلومە وان قەزا گرفتارییێت خۆیێت (تەربەوی) و کۆمەلی یێت هەین، ژ بەر هندێ تشتەکێ فەرە رێبەرییەکا تایبەتی ل باژێرێ دهۆکێ بێتە دانان بۆ رێڤەبرنا زانیاریا وان شەش قەزاییێت کوردی[115].

زێدەباری ڤێ چەندێ هەروەك ژێدەر ئاماژە پێ دکەن ژ سالا ١٩٦٠ێڤە سەرەدەریا حکومەتا نوویا عیراقێ ئانکو حکومەتا عەبدولکەریم قاسمی دگەل خەلکێ کوردستانێ هاتەگوهارتن و ژ گەلەك وان مافان یێن ل دەسپێکا راگەهاندنا سیستەمێ کۆماری داینە کوردان یان بۆ کوردان بریار پێداین پەشیمانبووڤە یان ژی بەرێك دانە وان مافان. گومان تێدا نینە خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان کو هێژ ل قۆناغا دەسپێکێ بوو دێ کەڤیتە بەر ڤێ دژایەتیێ و دەسپێکا ڤێ دژایەتیێ ژی ب نە دامەزراندنا رێڤەبەرییەکا تایبەت ب خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان دەست پێکر و ب لادانا هاریکارێ رێڤەبەریا زانیاریا لیوا مووسل بۆ خواندنا کوردی گەرمتر لێ هات. بەلێ ب دەسپێکرنا شەری د ناڤبەرا لەشکەرێ عیراقێ و بزاڤا رزگاریخوازا کوردی و راگەهاندنا شۆرشا ئەیلوولا ١٩٦١ خواندنگەهێن دەڤەرا بەهدینان ب گشتی و خواندنا کوردی ب تایبەتی کەتنە د کارودانەکێ سەخت و دژواردا، ژ ئالیەکی دەرگەهێ زۆربەی خواندنگەهێن دەڤەرێ ب تایبەت ئەوێن دەڤەرێن رزگارکری یان دەڤەرێن نێزیکی کریارێن لەشکەری هاتنە گرتن، هەروەك د بەیانەکا رێڤەبەریا پەروەردا لیوامووسلێ یا ١٩٦٤/٤/٥دا دیاربیت کو بریار هاتییەدان ب دوبارە ڤەکرنەڤا ٢٧ خواندنگەهان ل دەڤەرێن سەر ب لیوا مووسل، هەموو ژی ئەو خواندنگەهە سەر ب قەزایێن مووسلێ، دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ ، ئاکرێ و شێخانن و ب پێداچوونا ناڤێن وان گوندان دیار دبیت هەموو ئەو گوندێن نێزیکی باژێران و مەلبەندێن قەزایان بوونە و ڤێ بەیانا ڤەکرنەڤا خواندنگەهان ژ گوندێن دەڤەرێن سنووری و دوورە دەست وەك دەڤەرێن نێروەرێکان، بەرواری بالا و بەرواری ژێری، زێبار، گولی و سندی نەگرتیە، هەموو ئەڤ خواندنگەهە ژی ئەو بوون ئەوێن ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلولێ هاتینە گرتن یان ژ ئەنجامێ روودانان هاتینە بەردان[116]. چەندین بەیان و فەرمانێن دی ل بەر دەست هەنە کو د دەلیڤێن جودا جودا دا بریار هاتینە دان ب ڤەکرنەڤا وان خواندنگەهان یێن ل سالێن ١٩٦١- ١٩٦٢ هاتینەگرتن. د نڤیسینەکا موتەسەرفیا لیوا مووسلێ کارگێریا خۆجهی ل ١٩٦٥/١٢/٧ بۆ رێڤەبەریا پەروەردا مووسل هنارتی ل دووڤ نڤیسنەکا قائیمەقامیا قەزا دهۆکێ رەزامەندی ل سەر راوەستاندنا خواندنێ ل خواندنگەها گوندێ بەروشکا سەعدونی هەتا دەمەکێ دیتر دایە[117]. ژ راپۆرتەکا رێڤەبەرێ خواندنگەها ئامێدیێ یا ١٩٦٢/١/٣ دیار دبیت ژ بلی خواندنگەها سەرتاییا ئامێدیێ و دوا ناڤنجیا ئامێدیی هەموو خواندنگەهێن سنوورێ قەزا ئامێدیێ دگرتینە، ئەڤ دو خواندنگەهە ژی د سەروبەرەکێ هند تەنگاڤدا دژین کو ب زەحمەتە بکارن بەردەوامیێ ب خواندنێ بدەن[118].

ب ڤێ رەنگی زۆربەی خواندنگەهێن دەڤەرا بەهدینان هاتینە گرتن و هەر دەمێ هاتبنە ڤەکرن ژی پشتی دەمەکی هاتینەڤە گرتن، بۆ نموونە د بەیانەکا رێڤەبەریا پەروەردا لیوا مووسل یا ١٩٦٩/٩/١٣دا بریارا راوەستاندنا خواندنێ ل ١٦ گوندێن ناحیێن دۆسکی، بەرواری بالا، سەرسنکێ، نێروە رێکان دایە کو چەند گوندەك ژ وانا ئەو بوون یێن د بەیانا ئاماژە پێکریا ١٩٦٤/٤/٥یدا بریارا دوبارە ڤەکرنەڤا وان هاتییەدان[119]. ژ سێ بەیانێن رێڤەبەریا پەروەردە و فێرکرنێ ل پارێزگەها دهۆکێ یێن داویا سالا ١٩٧٠ و دەسپێکا ١٩٧١ ئانکو دەسپێکا سالا خواندنێ

١٩٧٠- ١٩٧١ێ دهێتە زانین کو بریارا دوبارە ڤەکرنەڤا ٢٦ خواندنگەهان ل دەڤەرێن جوداێن پارێزگەهێ هاتیەدان، ئەڤە ژی د قۆناغا پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ دا بوو، ئەڤە ژی ئەو خواندنگەهە بوون یێن د قۆناغێن جوداێن ناڤبەرا ١٩٦١- ئادارا ١٩٧٠ێ ژ ئالیێ حکومەتێڤە هاتینەگرتن[120].

بەلێ هندی پەیوەندی ب زمانێ خواندنێ زمانێ کوردی ل دەڤەرێ هەی کو ل سالا خواندنێ ١٩٥٩-١٩٦٠دەست پێ هاتبوو کرن، چ بەلگە ل بەر دەست نینن کو ب رەسمی خواندنا کوردی ل دەڤەرێ ژ ئالیێ دەولەتا عیراقێڤە هاتبیتە راوەستاندن، بەلێ ب پێداچوونا بادەکێن خواندنگەهان دیار دبیت، چ ب فەرمانا بەرپرسێن ناڤخۆیی یێن لیوا مووسلێ یان قەزایان بیتن، چ ل ژێر فشار و مایتێکرنا بەرپرسێن سوپایێ عیراقێ بیتن ل دەڤەرێ، یان ژ ئەنجامێ لاوازی و سادەیا خەلکێ دەڤەرێ ب تایبەت هندەک مامۆستا و رێڤەبەرێن خواندنگەهان بیتن، هەر ژ سالا ١٩٦١- ١٩٦٢ێڤە ل گەلەك خواندنگەهان دەست ب نەهێلانا خواندنا کوردی هاتیەکرن، بۆ نموونە:

- ژ بادەکا خواندنگەها زاخۆ یا یەکێ دیاردبیت ل سالا ١٩٥٩-١٩٦٠دەست ب خواندنا کوردی ل ڤێ خواندنگەهێ هاتیەکرن، ل سالا ١٩٦٢- ١٩٦٣ د خشتەیێ دەرسێن خواندنگەهێدا خواندنا کوردی نەمایە و زمانێ عەرەبی شوونا وێ گرتیە[121].

- ژ نڤیسینەکا خواندنگەها مانگێشێ یا سالا ١٩٦٢ێ دیار دبیت کو ژ وان خواندنگەهێن ئەوێن ژ ئەنجامێ روودانێن دەڤەرێ هاتینە گرتن و خویندکارێن وان هاتینە ڤەگوهاستن بۆ خواندنگەها مانگێشکێ خواندنگەهێن داودیێ، دهێ، هرورێ، زێوکا عەبووی، مەجلمەختێ، بێسفکا ژێرێ و بەندا خواندنا وان ب کوردی بوو بەلێ خواندنگەهێن گلنازکێ و بەروشکا سەعدونی ب عەرەبی بوو. ئەڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو کریارا بعەرەبیکرنا خواندنگەهێن کوردی دەسپێکربوو[122].

دڤێت ل ڤێرێ بێتەگۆتن هەر ژ دەسپێکا جێبەجێکرنا خواندنا کوردی ل دەڤەرێ هندەك کەسێن پەیوەندیدار ب وارێ پەروەردێڤە دژایەتیا خواندنا کوردی ل دەڤەرێ کریە و ڤیایە ب هەر مهانەکێ بیتن نەهێلن زمانێ کوردی وەك زمانێ خواندنێ ل دەڤەرێ جهێ خۆ بگریت، ل ڤێرێ دێ ئاماژە ب نموونەکێ ب بەلگەڤە کەین:

- ١٩٦١/١٠/١٨موختارێ گوندێ دیرەبوونێ د گەل دەستەکا ئیختیاریا گوندی یا پێکهاتی ژ ١٢ کەسان داخوازەك د رێکا کارگێریا خواندنگەها گوندی را دایە رێڤەبەریا زانیاریا مووسلێ و تێدا داخوازکریە ل شوونا زمانێ کوردی ل خواندنگەها وان زمانێ عەرەبی بێتەخواندن ژ بەرکو ئەو هەست پێ دکەن کو زمانێ عەرەبی زمانێ بنیاتییە بۆ ئەو حەزدکەن زارۆکێن وان فێربنێ[123]. بەرسڤا ڤێ داخوازێ دەست مە نەکەتیە بەلێ ئەوا ژ ئەنجامێن ئەزموونێن خواندنگەهێ یێن وان سالان دیاردبیت خواندن ل خواندنگەهێ بوویە عەرەبی.

ل ١٩٦١/١٠/٢٥ جێگرێ رێڤەبەرێ خواندنگەها باتوفا دەربارەی خواندنێ ل رێزێن ئێکێ و دووێ و سێێ د نڤیسینەکێدا دبێژیتە رێڤەبەریا زانیاریا مووسلێ:

تکایە مە ئاگادار کانێ خواندن ل خواندنگەها مە ب زمانێ عەرەبی یان کوردی یە، بۆ زانین مە چ مامۆستا نینن بشێن دەرسێ ب زمانێ کوردی بێژنە ڤان رێزان و خەلکێ گوندی ب خۆ ژی حەزدکەن خواندن ب زمانێ عەرەبی بیتن.

تێبینی: ژ بەر نەبوونا پەرتووکێن کوردی بۆ ڤان رێزان مە ژ عومبارێ پەرتووکێن عەرەبی وەرگرتینە.

رێڤەبەریا زانیاری ژی د رۆژا ١٩٦٢/١١/١٢ د بەرسڤێدا دبێژیتە کارگێریا خواندنگەها باتووفا:

مە لاری نینە خویندکارێن خواندنگەها هەوە ل شوونا زمانێ کوردی ب عەرەبی بخوینن و ژ بۆ بجهـ ئینانا ڤیانا سەمیانێن وان[124].

ئەوا ل ڤێرێ تێبینی دهێتەکرن جێگرێ رێڤەبەرێ خواندنگەهێ هەروەکی کەسەکێ نە خەلکێ دەڤەرێ ل مهانان دگەریا خواندنا کوردی ژ ناڤببەت، نەبوونا مامۆستاێن شیانێن گۆتنا دەرسێن کوردی

هەبن، نەبوونا پەرتووکێن کوردی، ڤیانا سەمیانێن خویندکاران کرینە ئامراز کو داخوازا نەهێلانا خویندنا کوردی ل وێ خواندنگەهێ بکەت. جێگرێ ڕێڤەبەرێ زانیاریا مووسلێ ژی (سالم مضر باشی) ل دەلیڤەکا ب ڤی رەنگی دگەریا بەرێنکەکێ بدەتە بەر خواندنا کوردی ل دەڤەرێ. نموونەکا دی دروست بەروڤاژی ڤێ چەندێ ڕێڤەبەرێ خواندنگەها ئاسهێ ل قەزا زاخۆ ل دووڤ ڤیانا سەمیانێن خویندکاران ل ١٩٦٤/٥/١٦ داخواز ژ ڕێڤەبەرێ پەروەردا لیوا مووسل کریە کو خواندن ل خواندنگەها وان ب زمانێ کوردی بیتن و ڤێ ڕێڤەبەریێ ژی ب ئیمزا ڕێڤەبەرێ پەروەردێ (عەبدولموحسن توحلە) د بەرسڤێدا ب ڤی رەنگی رەزامەندی دایە و گۆتیە: مە لاری نینە ل دووڤ ڤیانا سەمیانێن خویندکاران ل شوونا زمانێ عەرەبی ب کوردی دەرسێ بدەنە خویندکاران[125]. نموونەکا دی ژ خواندنگەها زاویتە ل ١٩٦٣/١٠/٤ کو دبیتە دەسپێکا سالا خواندنێ ١٩٦٣- ١٩٦٤موختار و ئەندامێن جڤاتا موختاریا گوندێ زاویتە یا سەری درێکا ڕێڤەبەرێ خواندنگەهێ را داخوازەك بۆ ڕێڤەبەرێ پەروەردە و فێرکرنا لیوا مووسلێ بلندکریە و تێدا داخوازکریە خواندن ل خواندنگەها گوندێ وان ل شوونا کوردی ببیتە عەرەبی ژ بەرکو ئەو دزانن ئەگەر خویندکارێن وان ب عەرەبی بخوونن دێ مفایێ وان دوجارکی بیتن. ڕێڤەبەرێ خواندنگەهێ ژی ئەڤ داخوازە بۆ ڕێڤەبەریا پەروەردێ ل مووسلێ بلندکریە و وان ژی دەملدەست رەزامەندێ دایە خواندن ل وێ خواندنگەهێ ببیتە عەرەبی[126].

ژ ڤان نڤیسارێن ناڤبەرا ڕێڤەبەریا پەروەردا مووسلێ بۆ خواندنگەهێن دەڤەرێ دیار دبیتن:

- ب رەسمی چ فەرمان بۆ نەهێلانا خواندنا کوردی نەبوونە کو ل سەر خواندنگەهان هاتبیتە بژاندن.

- هەر بژاڤەکا بۆ ڤێ مەرەمێ هاتبیتە کرن بژاڤێن کەسان بوونە ب تایبەت ڕێڤەبەر و مامۆستا و بەرپرسێن کارگێرێن ناڤخۆیی.

- سادەیا خەلکێ و نەبوونا هشیاریا نەتەوەیی و سیاسی ل جەم وی خەلکی فاکتەرێ سەرەکی بوویە هەر دەمێ کەسانێن دژە کورد ڤیا بیتن خواندنا کوردی ژ ناڤ ببەن ل دەڤەرا بەهدینان دەسپێکریە، ل بەهدینان ژی ژ جهێن مەسیحی نشینڤە دەسپێکریە، هەر سێ نموونێن چوویی ل باتووفا و ئاسهێ و زاویتە ڤێ راستیێ دیار دکەن، ل باتووفا ڕێڤەبەرێ خواندنگەهێ ڤیانا سەمیانێن خویندکاران (ئەگەر راستی ژ بۆ گۆتنا وی هەبیت) کریە یەك ژ مهانەیان کو خواندنا کوردی پێ ژ ناڤ ببەت..!! ل ئاسهێ ڕێڤەبەرێ خواندنگەهێ ل دووڤ ڤیانا سەمیانێن خویندکاران داخوازا خواندنا کوردی ل خواندنگەها خۆ کریە، و ل زاویتە موختار و دەستەکا موختاریا گوندی کو د وی سەردەمیدا رهسپی و کەسایەتیێن گوندی و نوونەرێن خەلکێ گوندی بوون وان ب خۆ داخوازا خویندنا عەرەبی ل شوونا کوردی کریە، چ خەلکەکی پێ دابیتەکرن چ ژ سادەیی و ژ نیڤا دلێ خۆ کریتن، د هەرسێ بۆیەراندا ڤیانا سەمیانێن خویندکاران و ڕێڤەبەر یان دەستەکا فێرکرنێ ل خواندنگەهێ و خەلکێ وی جهی ژ ئالیێ ڕێڤەبەریا پەروەردا مووسلێ ڤە ب گرنگی هاتیە وەرگرتن.

- د دیدارەکێدا دگەل مامۆستا حەسەن حاجی نەعمان کو مامۆستایەکێ دلسۆزێ خەلکێ دەڤەرێیە و د وی سەردەمیدا مامۆستا بوو ل دەڤەرێ ئەگەرێن بزاڤێن ژ بۆ ژ ناڤبرنا خویندنا کوردی ل دەڤەرێ دهاتنەکرن دزڤرینتەڤە وێ چەندێ کو د وی دەمیدا بنیاتێ فێرکرنێ ب زمانێ کوردی ل دەڤەرێ یێ لاواز و ل دەسپێکێ بوو و ئاستێ هشیاریا خەلکی ژی نە ل وی ئاستێ بوو بەرگریێ ژ ڤێ چەندێ بکەن[127].

ژ بەر کو ژێدەرێن تایبەت ب سەروەبەرێ خواندنا کوردی د وێ قۆناغێدا نینن و بادەکێن خواندنگەهێن وی سەردەمی گرنگی ب بابەتی نەدایە، بەلێ ژ ئەنجامێ دووڤچوونا مە د بادەکێن خواندنگەهان و هندەك ژێدەرێن دی دا، ئەم دکارین بێژین ژ سالێن ١٩٦١- ١٩٦٢بەرەف ژوور خواندنا کوردی ب رەنگەکێ رەسمی و یەکجاری ل خواندنگەهێن دەڤەرێ نەهاتیە راکرن، بەلێ ب کریار بزاڤ بۆ ڤێ چەندێ

هاتینەکرن و هەتا ئاستەکێ مەزن ژی ل وێ کتا کێما خواندنگەهێن مایینە ل دەڤەرێ هاتیینە ژ ناڤبرن، بەلێ سەرەرای ڤێ چەندێ ل هندەك خواندنگەهان و ل هندەك ڕێزێن خواندنێ هەتا سالا ١٩٦٦ هێژ خواندن ب زمانێ کوردی یا بەردەوام بوویە.

ب ڕاگەهاندنا پێکهاتنا ٢٩ خزیرانا ١٩٦٦ د ناڤبەرا حکومەتا عیراقێ و سەرکردایەتییا شۆرشا کوردستانێ دا سەروبەر د بەرژەوەندییا خواندنا کوردی دا هاتە گوهارتن، و یەك ژ بەندێن ڤێ پێکهاتنێ داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەت کو زمانێ کوردی دێ زمانێ رەسمیێ خواندنێ بیتن ل خواندنگەهێن کوردستانێ و ژ ئەنجامێ ڤێ پێکهاتنێ هژمارەکا دیترا خواندنگەهان ل دەڤەرێ هاتنەڤەکرن یان هاتنەڤەکرن و دوبارە ل خواندنگەهێن دەڤەرێ دەست بێ خواندنێ ب زمانێ کوردی هاتەکرن.

پشتی ڤێ قۆناغێ پێکهاتنا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠ د ناڤبەرا حکومەتا عیراقێ و سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ دا هاتە مورکرن، ڤێ پێکهاتنێ ژی داکوکی ل سەر وێ چەندێ دکر کو زمانێ کوردی زمانێ رەسمیێ خواندنێ یە ل سەرانسەری کوردستانێ و ل هەموو قۆناغێن خواندنێ و هەروەسان وەك دەرسەك ل دەڤەرێن دیترێن عیراقێ دێ هێتە خواندن و هەروەسان زمانێ رەسمیێ کاروبارێن دەولەتێ یە ل کوردستانێ[١٢٨].

د ناڤبەرا ئادارا ١٩٧٠- ١٩٧٤یدا ب دەهان خواندنگەهێن دن ل سنوورێ دەڤەرا بەهدینان هاتنەڤەکرن، ل هەموویان ژی خواندن ب زمانێ کوردی بوو، یەکەمین پوستێ دەرچوویێن شەشێ سەرەتایی ب زمانێ کوردی ل سالا ١٩٧٣- ١٩٧٤گەهشتە قۆناغا ناڤنجی و یەکەمین ڕێزێن خواندنا کوردی ل قۆناغا ناڤنجی هاتنە ڤەکرن، د بەیانەکا ڕێڤەبەرییا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ دا ل ١٩٧٣/١٠/١٥ ڕێزەکا ناڤنجی دگەل خواندنگەها سەرەتایا بێرسڤێ و ڕێزەك دگەل خواندنگەها سەرەتایا کانی ماسێ و هوبەك دگەل ناڤنجیا بەدرخان ل زاخۆ و سێ هۆبە دگەل ناڤنجیا ئاشتی ل دهۆکێ بۆ خواندنا کوردی ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ هاتنەڤەکرن و سالا دووڤرا ئانکو سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ ب سێ هوبەیێن ناڤنجیا ئاشتی یا دهۆکێ بریارا ڤەکرنا یەکەمین ناڤنجیا تایبەت ب خواندنا کوردی ب ناڤێ ناڤنجیا برایەتی هاتەدان، کو ئەڤە یەکەمین ناڤنجیا کوردی بوو ل دهۆکێ و دەوروبەرێن وێ و ئەڤ ناڤنجییە پاشتر بوو ئامادەییا برایەتی یا تایبەت ب خواندنا کوردی[١٢٩].

هێژ خواندنا کوردی ل قۆناغا ناڤنجی جهێ پێ خۆ خوشنەکری، خویندکارێن کوردی یێن ڤێ قۆناغێ نە گەهشتینە قۆناغا ئامادەیی ل ئادارا ١٩٧٤ دوبارە شەری د ناڤبەرا شۆرشا کوردستانێ و حکومەتا عیراقێدا دەست پێکرەڤە، ئەڤ شەرە ب نسکویا ئادارا ١٩٧٥ ب داویهات، ئەڤ نسکویە کارەساتەکا مەزن بوو ب سەرێ خەلکێ کوردستانێ هاتی، کاریگەرییێن نەرێنی یێن نسکوویێ هێژ ژ کارەساتێ مەزنتر بوون و ڤان نەرێنییان ژی بەری هەر تشتەکێ ژ وارێ پەروەردە و خواندنا کوردی گرت و د ڤی واریدا ژی بەری هەر دەڤەرەکێ ژ دەڤەرا بەهدینان ئانکو پارێزگەها دهۆکێ و دەڤەرێن کوردی یێن سەر ب پارێزگەها مووسلێ گرت.

هێژ نسکویا ١٩٧٥ێ ب سەردانەهاتی ل هەموو خواندنگەهێن دەڤەرێن کوردییێن وی دەمی سەر ب پارێزگەها مووسلێ (نەینەوا) وەك قەزایێن ئاکرێ و شێخان و شنگال و ناڤ باژێرێ مووسلێ و دەڤەرێن دی خواندنا کوردی هاتە ژ ناڤبرن، لیژنا کاروبارێن پەروەردە و رەوشەنبیری و ئەوقافێ ل جڤاتا یاسادانانێ یا دەڤەرا کوردستانێ (المجلس التشریعي لمنطقة کردستان) د راپۆرتا خۆدا بۆ جڤاتا یاسادانانێ ل ڕۆژا ١٠ شوباتا ١٩٧٥ێ بابەتێ دیاربوونا نیشانێن بزاڤەکێ بۆ گوهرینا خواندنا کوردی بۆ عەرەبی ل پارێزگەها دهۆکێ و دروستکرنا ئاستەنگان ل بەر خواندنا زمانێ کوردی بەرچاڤکریە[١٣٠]. پشتی دانوستاندنێ ل دور بابەتێ ل جڤاتا ئاماژەپێکری گەهشتینە سێ خالان:

أ- گوهرین د زمانێ خواندنێدا ناهێتەکرن کو زمانێ کوردی یە ل دەڤەرا ئۆتۆنۆمی ب مەرجەکێ

ئەوێن نە کورد مافێ هەلبژارتنا زمانێ وان دڤێت بۆ خواندنێ هەبیتن.

ب- پێدڤیە کاودانێن ڕێخوشکەر بێنەبەرهەڤکرن بۆ بەردەوامیا خواندنا کوردی وەك بجهئینانا رەهەندێن قانوونا ئۆتۆنۆمی.

ج- لیژنە ب پێدڤی دبینیت کو ب دووڤچوونەکا مەیدانی رابیتن بۆ هەموو وان دەڤەران یێن پێدڤی ب ڤێ چەندێ دکەن داکو وێنەکێ ئاشکرایێ ڕێ سەروبەرێ فێرکرنێ ل وی جهی بەرچاڤبکەت[131].

هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن جڤاتا یاسادانانا دەڤەرا ئۆتۆنۆمی بریاردا لیژنەك ژ لیژنا پەروەردە و رەوشەنبیری و کاروبارێن ئەوقافێ یا سەر ب جڤاتا ناڤبریڤە دووڤچوونەکا مەیدانی بۆ وان جهان بکەت یێن خواندنا کوردی لێ ب عەرەبی هاتییەگۆهارتن، دئەنجامدا ل دووڤ دو فەرمانێن کارگێری یێن دیوانا جڤاتێ ل ١٦ و ٢٥ئادارا ١٩٧٥ێ ل رۆژێن ٢٦- ٣١ ئادارا ١٩٧٥ێ سەرا وان دەڤەران دا یێن خواندنا کوردی ژێ دگرت ل هەردو پارێزگەهێن دهۆك و نەینەوا و قەزا ئاکرێ** و پەیوەندی دگەل رێڤەبەرێن پەروەردێ و هندەك بەرپرس و کەسێن پەیوەندیدار ل هەردو پارێزگەهان کرن، پشتی دووڤچوونێ هەروەکی د راپۆرتا لیژنێدا یا د جڤینا هژمار ١٨یا جڤاتێدا ل ٢ نیسانا ١٩٧٥ێ خواندی بوو وان دیاربوو:

- بزاڤ و بەرهەڤیێن بەرفرەهـ و زۆر بۆ گۆهارتنا خواندنا کوردی بۆ عەرەبی دهێنەکرن، ئەڤە ژی ب ڕێکا هندەك سەمیانێن خویندکاران ل گوندێن کوردان کو داخوازنامەیان بۆ گۆهارتنا زمانێ خواندنێ ل خواندنگەهێن گوندێن وان ژ کوردی بۆ عەرەبی بلنددکەن، پشتی کو ژ بەیانا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠ێڤە خواندن ل وان خواندنگەهان ب زمانێ کوردی بوو و ل هندەکان گەهشتبوو رێژا پێنجێ سەرەتایی، ب دروستی ژی ل ٤٦ خواندنگەهێن دەڤەرێن جوداێن پارێزگەها مووسلێ و قەزا ئاکرێ* ل دووڤ نڤیسارێن پارێزگەها مووسلێ و پەروەردا مووسلێ د ناڤبەرا ١٩٧٤/٦/٦- ١٩٧٥/٣/٣ێ زمانێ خواندنێ ژ کوردی بۆ عەرەبی هاتبوو گۆهارتن. هەردڤێ راپۆرتێدا ئاماژە ب هندێ هاتییەکرن کو کریارا گۆهارتنا زمانێ خواندنێ ژ کوردی بۆ عەرەبی یا بەردەوامە و راپۆرت داکوکیێ دکەت کو ئەڤ گۆهارتنە دگەل بریارا جڤاتا سەرکردایەتیا شۆرشێ (یا حکومەتا عیراقێ) هژمار ٣١١ل ١٩٧٤/٣/٢٦ێ ناگونجیت کو تێدا هاتییە: رێ دهێتەدان بۆ ڤەکرنا خواندنگەهان بۆ کوردێن دەرڤەی دەڤەرا ئۆتۆنۆمی ل دووڤ بنەمایێن وەزارەتا پەروەردێ ددانیت. هەر د ڤێ راپۆرتێدا هاتییە: ل جهێن پارێزگەها دهۆکێ ژی بزاڤێن گۆهرینا خواندنا کوردی بۆ عەرەبی هاتینەکرن بەلێ د ڤێ سالێدا سەرنەگرتیە، بەلێ خواندنگەهەکا عەرەبی ب ناڤێ (مدرسة التآخي) هاتییەڤەکرن زێدەباری (مدرسة الاخوة للاحداث) کو پێشتر هەبوو. ل داویا راپۆرتا خۆ ژی لیژنا ئاماژە پێکری راسپاردەیێن خۆ ب رەنگێ ژێری بەرچاڤکرینە: ل دووڤ ئارمانجێن بەیانا ١١ێ ئادارا پیرۆز و قانوونا حوکمێ زاتی و جڤاتا یاسادانانێ یا دەڤەرا کوردستانێ لیژنە دبینیت کو زمانێ خواندنێ ل وان خواندنگەهان یێن ژ پشتی ١١ ئادارا ١٩٧٠ێڤە خواندن تێدا ب زمانێ کوردی یە و ل وان خواندنگەهان یێن ژ نوو ل گوندان دهێنەڤەکرن نەهێتەگۆهارتن، ژ بەرکو ئەڤە دگەل پرەنسیپێن ئۆتونۆمی و مافێن نەتەوەییێن رەوایێن گەلێ کورد ناگونجیت.

د بەردەوامیا راسپارەدیێن لیژنەیێدا هاتییە: هەروەسان لیژنە دبینیت دەلیڤە نەهێتەدان بۆ وان کەسان یێن هاندان و ناڤتێدانا گوندیان دکەن کو خواندنا کوردی بهێلن و بەرێ زارۆکێن خۆ ددەنە خواندنا عەرەبی، ل داویێ لیژنە دبینیت خواندن ب زمانێ کوردی بێتەڤە زڤراندن بۆ خواندنگەهێن سەری، ئانکو ٤٦ خواندنگەهێن خواندنا وان ژ کوردی بۆ عەرەبی هاتییەگۆهارتن[132].

ل رونشتنا رۆژا ٥ نیسانا ١٩٧٥ێ یا جڤاتا یاسادانانێ هەمان راپۆرت و هەمان راسپاردە هاتینەخواندن بێی کو دانوستاندنەك ل سەر بێتەکرن یان بریارەك ل دوور بێتەدان[133].

ب پێداچوونا ڤێ راپۆرتێ کو ل داویا ئادارا

١٩٧٥ێدا هاتیەنڤیسین و د کۆنڤیسێ روونشتنێن جڤاتا ب(جڤاتا یاسادانانێ یا دەڤەرا کوردستانێ) دهاتەناڤکرن هاتیەتوومارکرن و سالا خواندنێ ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ ڤەدگریت دیار دبیت: کو ژ مەها خزیرانا ١٩٧٤ێڤە ل دەڤەرێن کوردیێن وی سەردەمی سەر ب پارێزگەها مووسلێڤە دەست ب عەرەبیکرنا زمانێ خواندنێ هاتیەکرن و هندەك کەس سادەیا خەلکێ گوندان ب دەلیڤە دبینن و ڤێ نێچیرێ ب دەستێن وان د دەنە ئەنجامدان، هەروەسان د ڤێ سالێدا ئەڤ بزاڤە ل دهۆکێ ژی هاتینەئەنجامدان بەلێ هەتا نڤیسینا راپۆرتا ئاماژەپێکری سەرنەگرتبوون. هەروەسان ژ دووڤچوونا مە بۆ کۆنڤیسێ روونشتنێن جڤاتا یاسادانانێ یێن وێ سالێ دیاردبیت: هەروەك وێ جڤاتێ پێ چێنەببیت یان دەستەلات نەبیتن یان ل سنوورێ وان هاتبنە راوەستاندن ڤێ جڤاتێ و لیژنەیا وێ خۆ ب سەر ڤی بابەتیڤە نەبریە و خۆ لێ نەکریە خودان.

ب روودانا نسکویا ١٩٧٥ێ ب دروستی ل سالا خواندنێ ١٩٧٥- ١٩٧٦ێ دەست ب پیلانەکا هوور و بەرنامە بۆ دارشتی بۆ ژ ناڤبرنا خواندنا کوردی ل خواندنگەهێن پارێزگەها دهۆکێ هاتەکرن، وەك د ئەنجامێ دووڤچوونا مەدا دیاردبیت دو خال د ڤێ پیلانێدا ب گرنگی هاتنەوەرگرتن و کار ل سەر هاتەکرن، ئەو دو خال ژی:

- چ بریارەکا رەسمی ژ ئالیێ دەولەتێڤە نەهاتەدان بۆ نەهێلانا خواندنا کوردی ل پارێزگەهێ.

- یا دیتر پیلان ب دەستێن دویڤەلانکێن رژێمێ ژ کوردان هاتەئەنجامدان و بۆ ڤێ مەرەمێ ژی مفای ژ سادەیا خەلکێ دەڤەرێ و سەروبەرێ دەروونیێ وان پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ وەرگرتن و گونەهـ ژی هاڤێتەسەر پاتکا کوردان ب خۆ.

- د هەمان دەمدا مفا ژ وێ ڤالاهیا شۆرشگێری و سیاسی وەرگرت یا ژ ئەنجامێ شکەستنا شۆرشا کوردستانێ روودای.

ئانکو ئەوا ل سالێن سیهان روودای کو کوردان ژ خەلکێ دەڤەرێ نەهێلای پرۆژێ عەلی کەمالی یا خواندنا کوردی ل دەڤەرێ سەربگریت و ئەوا ل سالێن شێستان روودای بۆ ژ ناڤبرنا خواندنا کوردی ل دەڤەرێ ل سالا ١٩٧٥- ١٩٧٦ هاتەڤەروودان و نێچیر نێچیرا رژێما بەعسی بوو لێ ب دەستێن هندەك ژ کوردان ب خۆ هاتەکرن.

وەك ژ بەلگەنامەکا سەرکردایەتیا نڤیسینگەها رێکخستنا باکوور (قيادة مكتب تنظيم الشمال) یا حزبا بەعس یا ١٨/٣/ ١٩٨٩دیاردبیت کو وانا ل سالێن حەفتیان پرۆژەك ژ بۆ گوهرینا خواندنا کوردی بۆ خواندنا عەرەبی بەرهەڤکریوو و جێبەجێکریوو، هەروەسان د ڤێ بەلگەنامێدا دیار دبیت لیژنەك هاتیەپێکئینان بۆ پێداچوونەڤە ڤی پرۆژەی دا کو ب رێکا وێ و ب نهێنی ل سالێن خواندنێ ١٩٨٩- ١٩٩٠ و ١٩٩٠- ١٩٩١ ب یەکجاری خواندنا کوردی ل هەردو پارێزگەهێن هەولێرێ و سلێمانیێ ژی ژناڤببەن[١٣٤]، (ئانکو ب یەکجاری خواندن ب زمانێ کوردی نەمینتە ل سەرانسەری باشوورێ کوردستانێ.

ئەڤ پیلانە (پرۆژەیێ بەلگەنامەیا ئاماژە پێکری) چاوان هاتەئەنجامدان..؟ کی پێ رابوون..؟ چاوان ئەوا رژێمێ ب شەرعیەت دزانی پێدا..؟ ل پێشیا بەرسڤا ڤان پرسیاران دڤێت بێژیت ئەوا د بەلگەنامەیێدا ب سالێن حەفتیان هاتیەناڤکرن، نیڤا دووێ یە ژ سالێن حەفتیان ئانکو پشتی نسکویا ١٩٧٥، د ڤێ قۆناغێدا حکۆمەتێ سەروبەرێ دەروونیێ لاوازێ پشتی نسکویا ١٩٧٥ ب سەرێ خەلکێ کوردستانێ و ب تایبەت خەلکێ بەهدینان هاتی ب دەلیڤە زانی بۆ ئەنجامدانا پیلانا خۆ و بزاڤا کوردی ژی د وی سەردەمیدا ل سەر ئاستێ لەشکەری سیاسیێ هندێ لاواز بوو دشیانێن وێ دا نەبوو ب هیچ رەنگەکی بەرسنگێ ڤێ پیلانێ بگریت. د هەمان دەمدا وەك د کۆنڤیسێ جڤاتا یاسادانانێدا هاتیی دەلیڤە هەبوو ل بەر هندەك کەسان هاندان و ناڤتێدانا گوندیان دکرن کو خواندنا کوردی بهێلن و بەرێ زارۆکێن خۆ بدەنە خواندنا عەرەبی[١٣٥]. بەلگەنامە ل بەردەستێ مە نینن دەسپێکا پیلانێ ژ کیرێ دەسپێکر،

لێ ئەوا ژ بەلگەنامێ دیاردبیت ژ بارەگایێن حزبا بەعسڤە دەسپێكر، ئانكو بارەگایێن حزبا بەعس مەكویا ئەنجامدانا پیلانێ بوون، بەلێ ب دەستێن رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ، ئەو ژی ب گێرانا شانۆگەریەكێ ب ناڤێ راپرسی (الاستفتاء) د ناڤبەرا سەمیانێن خویندكاراندا كانێ وانێ دڤێت زارۆكێن وانا ب كوردی بخوینن یان ب عەرەبی....؟ ژ ئەنجامێ نڤیسینەكا رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ ب هژمار ١٤٨٧٢/٥ ل ١٩٧٥/٩/٣٠ ل سەر هەموو خواندنگەهێن پارێزگەهێ هاتییەبژاندن[١٣٦]، راپرسیەك د ناڤبەرا سەمیانێن خویندكاران ل خواندنگەهێن پارێزگەهێ هاتەكرن كانێ وانا دڤێت زارۆكێن وان ب كوردی یان ب عەرەبی بخوینن..؟ ئەنجامێن راپرسیێ ژی هەروەك پێش ئەنجامدانا وێ د دیاربوون ئەو بوو كو دڤێت ب عەرەبی بخوینن. چەند نموونەك ژ وان شانۆگەریێن د گۆتنێ راپرسی ل بەر دەستن، دێ ئەنجامێن وان وەك د نڤیساراندا هاتین دیاركەین و پاشتر دێ تێبینیێن خۆ بەرچاڤكەین:

ل خواندنگەها گوندێ بێتاسێ سەر ب ناحیا رزگاری ڤە ئەنجامێن راپرسیێ ب ڤی رەنگی هاتینەبلندكرن بۆ رێڤەبەریا پەروەردێ:

پۆلا ئێكێ ٢٠ خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا عەرەبی كریە.

پۆلا دووێ ٧ خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا عەرەبی كریە.

پۆلا سیێ ٨ خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا عەرەبی كریە.

پۆلا چوارێ ١٨ خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا كوردی كریە.

پۆلا پێنجێ ٢٢ خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا كوردی كریە.

پۆلا شەشێ ١٠خویندكاربوون سەمیانێن هەموویان داخوازا خواندنا كوردی كریە[١٣٧].

ل خواندنگەها سەرەتاییا كوران یا باتوفا ئەنجام ب ڤی رەنگی بوون:

| پۆل | ئەوێن دڤێت ب عەرەبی بخوینن | ئەوێن دڤێت ب كوردی بخوینن |
|---|---|---|
| ئێكێ | ٣٣ | ٠ |
| دووێ | ٢٥ | ٠ |
| سێ | ٢٣ | ٨ |
| چواری | ٢٩ | ٣ |
| پێنجێ | ١٠ | ٦ |
| شەشێ | ١٠ | ٢٢ |
| هەموو | ١٢٠ | ٣٩[١٣٨] |

د هەمان دەمدا هەروەك د راپۆرتا پشكێنەریدا هاتی ل خواندنگەها شەرانشا مووسلمانان ل دووڤ داخوازا سەمیانێن خویندكاران ل رێزا ئێكێ و دووێ و سیێ خواندن كرنە عەرەبی و ل رێزێن چوارێ و پێنجی و شەشێ وەك خۆ ب كوردی ما[١٣٩].

د هەمان دەمدا ل خواندنگەها رەوشەن یا سەرەتاییا كچان ل ئامێدیێ وەك د نڤیسارا خواندنگەهێدا هاتی سەمیانێن حەفت خویندكاران ل رێزا پێنجێ و چوار خویندكاران ل رێزا چوارێ و تنێ سەمیانا یەك خویندكارێ ل رێزا دووێ داخوازا كوردی كربوون[١٤٠].

ل خواندنگەها گوندێ سەناتێ یێ مەسیحینشین هەروەك د راپۆرتا پشكێنەریدا هاتی ل دووڤ ئارەزوویا سەمیانێن خویندكاران خواندن ل هەر شەش رێزان دەملدەست ژ كوردی كرنە عەرەبی[١٤١].

ل گوند و خواندنگەهێن مەسیحینشینێن دەڤەرێ ل دووڤ رێنماییێن تایبەت ب خواندنگەهێن مەسیحی بێی شانۆگەریا راپرسیێ و وان بڤێت و نەڤێت ل هەموو رێزان خواندن كرنە عەربی،

بۆ نموونە ل گوندێ داودیـێ یێ سەر ب ناحیا سەرسنكێ یا وی سەردەمیڤە وەك د راپۆرتا پشكێنەریدا هاتییەنڤیسین: خواندن بوویە ب عەرەبی ل دووڤ ڕێنمایێن تایبەت ب خواندنگەهێن مەسیحی دەركەتین، زێدەباری گێرانا راپرسیەكێ دناڤ خویندكارێن مووسلمان و سەمیانێن واندا یێن ژ گوندێن مووسلمانان ل ڤێ خواندنگەهێ دخوینن[142].هەمان سەرەدەری دگەل خواندنگەها ئەرەدنا ژێری (ئەرەدنا فەلان) هاتەكرن و ئێكسەر ل سالا خواندنێ ١٩٧٥- ١٩٧٦خـواندن ل ڤێ خواندنگەهێ ل هەموو ڕێزان كرنە عەرەبی، هەروەك د راپۆرتا پشكێنەریدا هاتی: خواندن بوو ب زمانێ عەرەبی ل دووڤ ڕێنمایێن تایبەت ب گوندێن مەسیحییان[143].

ب ڤێ ڕەنگی ئەو پرۆژێ د بەلگەنامەیا ١٩٨٩/٣/١٨ ئاماژە پێ هاتییەكرن ل سنوورێ پاریزگەها دهۆكێ ب سەرپەرشتیا سەركردایەتیا لقێ دهۆكێ حزبا بەعس و ب جێبەجێكرنا ڕێڤەبەریا پەروەردا پاریزگەها دهۆكێ و ب دەستێن هندەك دیڤەلانكێن ڕژێمێ ژ خەلكێ دەڤەرێ ب گێرانا شانۆگەریا ب ناڤێ راپرسیێ هاتەبجهئینان. ب پێداچوونا بەلگەناما ١٩٨٩/٣/١٨ و بەلگەنامێن د ناڤ بادەكێن خواندنگەهـ و سازیێن پەروەردێ یێن تایبەت ب بابەتی دێ گەهینە ڤان ئەنجامان:

- ژ بەلگەناما ١٩٨٩/٣/١٨ دیاردبیت بریار ژ ئالیێ سەركردایەتیا حزبا بەعسڤە كو د هەمان دەمدا سەركردایەتیا حكومەت و دەولەتا عیراقێ بوو هاتبوودان كو دڤێت خواندنا كوردی ل دەڤەرێ نەمینیت.

- ئەڤا ب ناڤێ راپرسی هاتییەئەنجامدان كریارەك بوو پێشوەخت بریار ل سەر ئەنجامدانا وێ هاتبوودان و كو نەهێلانا خواندنا كوردی بوو ل دەڤەرێ، چ خەلك یان سەمیانێن خویندكاران درازیبانە یان نە.. د ڤی واریدا مامۆستایەكێ خواندنگەها سەلاحەدین دەربارەی وێ شانوگەریا دگۆتنێ راپرسی دبێژیت: حكۆمەتێ چ بریارێن رەسمی وەك حكۆمەت ب نڤیسین بۆ گوهارتنا خواندنا كوردی ب عەرەبی نەبوون، بەلێ بریارا خۆ ب عەرەبیكرنا خواندنێ ل بەهدینان دابوو، پتریا خەلكێ حەز دكر ب كوردی بخوینن بەلێ سەروبەر یێ وەسان بوو كەسەك نەدوێریا بێژیت مە خواندن ب عەرەبی نەڤێت، ژ ناچاری عەریزە ئیمزا دكرن كو وان خواندنا عەرەبی دڤێت، بەری راپرسیێ هندەك پشكێنەران پرسیار ژ مە كر مە گۆتنێ مە خواندنا كوردی دڤێت، هندەكان ب دروستی هەلویست وەرگرت كەسەكێ شنگالی ب ناڤێ محەمەد هاتە خواندنگەهێ و گۆت: ئەگەر هەوە مامۆستا هەبن ب كوردی دەرسان بدەن كورێ من ب تنێ بخوینیت ئەز نابەمە خواندنا عەرەبی، بەلێ بریارا عەرەبیكرنێ هاتبوو دان مە ڤیابا و مە نەڤیابا[144].

مامۆستایەكێ دیترێ وی سەردەمی وەك دیدەڤان دەربارەی ڤێ پیلانێ ڤەدگێریت: چ ئەمرێت ڕەسمی یێن حكۆمەتێ پێ دەرنەكەتن، بەلێ ڕێنماییەك (تەوجیهەك)دا بەرپرسێن خۆیێن حزبی و گازی سەمیانێن خویندكاران دكرن و دگۆتنێ ئەڤ خواندنا نها سورانی یە و چ مفا بۆ زارۆكێن هەوە تێدا نینە، مادەم هەر بادینی نینە ئەم دبینین خواندنا زارۆكێن هەوە ببیتە عەرەبی چنكو ڤێ كوردیێ چ پاشەرۆژ نینە، ب ڤی ڕەنگی بەرپرسێن حزبا بەعس چوونە خواندنگەهـان و گازی سەمیانێن خویندكاران دكرن كو داخوازناما (عەریزا) بنڤیسن كو زارۆكێن وان ب عەرەبی بخوینن، هنگی ژ ڕێزا ئێكێ دەسپێكرن هەتا هەموو ڤۆناغا ڤەگرتین. دبەردەوامیا ڤەگێرانا خۆدا ئەڤ مامۆستایە دبێژیت: خەلكێ ئاساییێ دەڤەرێ ئەڤ چەندە ب دلی نەبوو، بەلێ بەرپرسێن پەروەردێ ل دهۆكێ و هندەك دامودەزگەهێن حكۆمی كو ڕەفیق و كادرێن بەعسی بوون ئەوان هاندانا ڤێ چەندێ دكرن و دگۆتنە سەمیانێن خویندكاران كوردیێ چ پاشەرۆژ نینە و بلا زارۆكێن هەوە بزڤرنەڤە عەرەبی و عەریزا بدەن خواندنا كوردی بێتە راكرن[145].

- د چوار چووڤێ ئەوا دگۆتنێ راپرسیدا هندەك ڕێكێن دی هاتنەبكارئینان:

ژ وانا گوند و خواندنگەهێن مەسیحییان بێی هیچ راپرسیەك ل هەموو رێزێن خواندنێ بریار ل سەر بعەرەبیكرنا خواندنا وان هاتبوودان، ب ڤێ چەندێ مافێ پشكداریێ د وێ راپرسیێدا یا پێشوەخت بریار ل سەر ئەنجامێن وێ هاتییەدان نە دابوو مەسیحییان.*

- ژ بەركو بریارا ڤەبر بوو بۆ بعەرەبیكرنا خواندنێ ل دەڤەرێ لەوما بەری هەر تشتەكی داكوكی ل سەر سێ رێزێن بەراهیێ یێن قۆناغا سەرتایی هاتەكرن سێ رێزێن ٤و ٥ و ٦ێ ب ساناهی نەبوون خویندكار لێ ژ نوو دەست ب خواندنێ بعەرەبی بكەت، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی لیستێن ئیمزایێن راپرسیێ وەسان هاتبوونەرێكخستن كو هەموو یان پرانییا سەمیانێن خویندكاران داخوازا خواندنا عەرەبییا كری. هەروەك د لیستێن خواندنگەهێن سەرتایا بێتاسێ دیاردبیت كو تنێ سەمیانێ یەك خویندكار داخوازا كوردی نەكریە!!! بەروڤاژی ل هەر سێ رێزێن دیتر تنێ سەمیانێ یەك خویندكار داخوازا عەرەبی نەكریە. ب هەمان شێوە ل خواندنگەها باتووفا تنێ ل رێزا سیێ سەمیانێن هەشت خویندكاران داخوازا كوردی كریە، ئەو ژی یا بێ ئەنجام بوو ژ بەركو هەروەك چەندین كەسێن وێ سەردەمی ڤەدگێرن ئەگەر ل خواندنگەهەكێ هندەكان داخوازا خواندنا كوردی كربیت داخوازا وان بجهنەهاتییە و دبەرسڤێدا دگۆتن دشیاندا نینە بۆ چەند خویندكارەكا رێزەكا كوردی بێتە ڤەكرن.

- هەروەك ل بەراهیێ ژی ئاماژە پێ هاتییەكرن رژێما بەعسی سەروبەرێ دەروونی سیاسی لەشكەری یێ خەلكێ كوردستانێ و بزاڤا نەتەوایەتیا كوردی ل وێ سەردەمی ب تایبەت ل پارێزگەها دهۆكێ ب دەلیڤەزانی بۆ ئەنجامدانا ڤێ پیلانێ ئەوا ب ناڤێ پرۆژێ گوهرینا خواندنا كوردی بۆ عەرەبی د بەلگەنامەیا ئاماژەپێكریدا ناڤكری، د ئەنجامێ وێ سەروبەرێ دەروونیدا كتەكا كێما خەلكی هەبوون د وێ سەردەمیدا ژ بەر چەندین ئەگەران د خورا ببینن داخوازا خواندنا كوردی بكەن، بزاڤا كوردی ژی د وێ سەردەمیدا شیانێن چ رەنگێن بەرگریێ نە ل ئاستێ ناڤخویی و نە ژی ل ئاستێ دەرڤە نەبوون، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی ل ناڤەندێن جیهانی ژی كەسەك یان ئالییەك وەسان نەبوو رەنگە بەرگریەكێ ژ خەلكێ كوردستانێ بكەت. ئەڤ سەروبەرە یێ هاریكار بوو رژێم پیلانا خۆ ئەنجام بدەت، لەوما ژی رژێمێ د یەكەمین سالا خواندنێ یا پشتی نسكوویا ١٩٧٥كو سالا ١٩٧٥- ١٩٧٦بوو پرۆژێ خۆ ئەنجامدا و دگەل دەسپێكا سالا نوویا خواندنا ئانكو مەها ئەیلولا ١٩٧٥ تنێ شەش هەیڤان پشتی نسكویا شۆرشا كوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ خواندنا كوردی ل خواندنگەهێن پارێزگەها دهۆكێ هاتەگوهارتن بۆ خواندنا عەرەبی.

- دبیت پرسیار بێتەكرن گەلۆ چما ئەڤ پیلانە بەری پارێزگەهێن دی یێن سەر ب دەڤەرا (وی دەمی دگۆتنێ) ئوتونومیا كوردستانێ ل دهۆكێ هاتەبجهئینان..؟ د بەرسڤێدا دێ بێژین:

١- زێدەباری هەموو فاكتەرێن چوویی چ گومان تێدانینە ئاستێ هشیاری و رەوشەنبیریێ خەلكێ ڤێ پارێزگەهێ د وێ سەردەمیدا ژ ئاستێ هەردو پارێزگەهێن دیتر كێمتر بوو، ب رەنگەكی رژێم وەسان هزربكەت كو ئەگەر ڤێ پیلانێ ل هەر پارێزگەهەكا دی بجهبینیت دێ كاردانەڤا (بەرتەك- ردالفعل) وان گەلەك پتر بیت ژ یا خەلكێ پارێزگەهێ.

٢- بوونا رێژەیەكا خەلكێ مەسیحی كو زمانێ وانێ ناڤمالێ نە كوردی یە ل پارێزگەها دهۆكێ دەرگەهێ پێشیێ بوویە كو رژێم تێرا بێتە ناڤ مەیدانا بجهئینانا پیلانا خۆ بۆ ژ ناڤبرنا خواندنێ ب زمانێ كوردی و ناهێتەڤەشارتن حكۆمەتا عیراقێ ب هەموو رەنگان د وێ سەردەمیدا بزاڤ دكرن بۆ دوورئێخستنا مەسیحیێن دەڤەرێ ژ جڤاكێ رەسەنێ دەڤەرێ، لەوما ژی رژێمێ بێی راپرسی خواندنا عەرەبی ل سەر وان سەپاندیە.

٣- د وێ سەردەمیدا خواندنا كوردی ل دەڤەرێ هێژ یا نوو بوو و هند بنواشێ خۆ ڤاهیم نەكربوو كو خەلكەكی ناچاربكەت بەرگریێ ژ ژ ناڤبرنا وێ بكەن. د هەمان دەمدا ئەڤ خواندنە د وی

سەردەمیدا ب زاراڤێ کرمانجیا ژێری بوو و هێژ وەکی نها خەلک ل سەر ڤی زاراڤی رانەهاتبوون کو خۆ لێ بکەنە خودان ئان ب لادانا خواندنێ ب ڤی زاراڤی کاریگەرییەک مەزن بکەتە سەر سەروبەرێ وان د چەند وارادا.

٤- ئەز باوەرم ستافێ وی سەردەمی ل دامودەزگەهێن پەروەردێ ل پارێزگەها دهۆکی بەروڤاژی وێ چەندێ کو هندی دشیاندا بیت ب ئەرکێ خۆیێ نەتەوەیی و پەروەردەیی رابن و بەرگریێ ژ خواندنێ ب زمانێ کوردی بکەن، ژ ئەنجامێ ترسێ بیتن یان کێمهشیاریێ و لاوازیا هەستا نەتەوەیی بیتن، ب پشکداریا راستەوخۆ بیتن د پیلانێدا یان ب خۆمتکرنێ و دەستێ خۆ ب کولاڤێ خۆڤەگرتنێ بیتن د هاریکاربووینە دگەل پیلانا ژناڤبرنا خواندنا کوردی ل دەڤەرێ، ب پێداچوونا ب دەهان راپۆرتێن پشکێنەران یێن وێ سالێ دەربارەی بابەتێ ب عەرەبیکرنا خواندنێ هندە هاتیەنڤیسن ل دووڤ رێنماییان یان پشتی ئەنجامدانا راپرسیێ خواندن هاتەگوهارتن بۆ عەرەبی، کەسەکی ئاماژەکا بچووک ژی ب ئەنجامێن نەرێنییێن ڤێ گوهارتنێ ل سەر ئاستێن پەروەردەیی یان دەروونی یان نەتەوەیی نەکریە کو ب بچووکترین هەلویست بێتەتوومارکرن.

ب ڤی رەنگی رژێما بەعسی د رێکا بارەگا و رێکخستنێن خۆیێن حزبی را ب ب هاریکاریا دامودەزگەهێن پەروەردێ ل پارێزگەهێ و هندەک دیڤەلانکێن ناڤخۆیی پرۆژی خۆیێ گوهارتنا خواندنا کوردی ل خواندنگەهێن پارێزگەها دهۆکێ بۆ خواندنا عەرەبی ژ سالا ١٩٧٥- ١٩٧٦ڤە بجهئینا، ل هندەک خواندنگەهان د یەکدەمدا ل هەرشەش رێزێن سەرتایی خواندنا هاتەسەپاندن، ل هندەک خواندنگەهان ژ رێزێن دەسپێکی ئێکێ و دووێ و سیێ ڤە دەسپێکرن و سال ل دووڤ سالێ خواندنا کوردی ل دەڤەرێ ل کێمیێ دا و خواندنا عەرەبی شوونا وێ گرت، دگەل ڤێ چەندێ ل هندەک جهان یان خواندنگەهان هەتا سالێن داویێ ل رێزەکی یان دووان ب کوردی دهاتەخواندن. بۆ نموونە ل سالا ١٩٧٦- ١٩٧٧ خواندنا کوردی ب چ رەنگان نەمابوو ل خواندنگەها بهار یا کچان ل زاخۆ، بەلێ ل سالا ١٩٧٩- ١٩٨٠تنێ ل رێزا چوارێ دهاتەخواندن، ل سالا ١٩٨٢- ١٩٨٣تنێ وانەیا کوردی ل رێزا چوارێ و پێنجی دهاتەخواندن، ل سالا١٩٨٤- ١٩٨٥ تنێ ل رێزا ئێکێ هۆبەیا ج، و سالا پاشتر١٩٨٥- ١٩٨٦ ل رێزا دووێ هۆبەیا ب، ج، د خواندن ب زمانێ کوردی بوو، ل سالا ١٩٨٦- ١٩٨٧خواندنا کوردی ب چ رەنگان ل رێزا ئێکێ نەمابوو تنێ هۆبەیا ج ل رێزا سیێ خواندن ب کوردی مابوو، ل سالا ١٩٨٧- ١٩٨٨ خواندنا کوردی ل رێزێن ئێکێ و دووێ و سیێ نەمابوو، تنێ ل هۆبەیەکا رێزا سیێ و دو هۆبەیێن رێزا چوارێ و هۆبەیەکا رێزا پێنجێ خواندنا کوردی مابوو، ل سالا ١٩٨٨- ١٩٨٩ ب یەکجاری ل رێزێن ئێکێ و دووێ و سیێ خواندنا کوردی نەمابوو تنێ ل هۆبەیێن چوارێ و پێنجێ مابوو[١٤٦].

ل خواندنگەهێ سەرتاییا بامەرنێ ل سالا ١٩٧٩- ١٩٨٠سەروبەرێ زمانێ خواندنێ ب ڤی رەنگی بوو: رێزا ئێکێ دووێ و سیێ هۆبەیەک ب کوردی یەک ب عەرەبی، رێزا چوارێ تنێ یەک هۆبە بوو ئەو ژی ب کوردی بوو، رێزا پێنجێ هۆبەیەک ب کوردی یەک ب عەرەبی، هۆبا شەشێ تنێ یەک هۆبە بوو ئەو ژی ب کوردی بوو[١٤٧]. ئەڤە ب خۆ وێ چەندێ دگەهینیت کو سەرەرای هووراتییا د پلانا پرۆژێ گوهارتنا خواندنێ ب زمانێ کوردی بۆ زمانێ عەرەبی هێژ ل هندەک خواندنگەهان خواندنا ب زمانێ کوردی مایە یان خەلکەکی بلا یێ کێم ژی بیت داکوکێ ل سەر خواندنا کوردی کریە. بەلێ د بەردەوامیا پیلانێدا سال ل دووڤ سالێ خواندنا عەرەبی جهێ یا کوردی دگرت. ل ڤێرێ پێدڤیە بێتەگۆتن هەرچەندە ل سالا ١٩٧٥- ١٩٧٦دەست ب پرۆژێ بعەرەبیکرنا خواندنێ هاتبوو کرن، بەلێ ژ بەرڤەگوهاستنا گوندان کو هێژ هندەک خواندنگەهێن وان ب کوردی بوون یان ڤەمانا خویندکاران هەتا داویا سالێن هەشتێیان ژی ل هندەک هۆبەیێن هندەک خواندنگەهان خواندن

ب زمانێ كوردی مابوو، بەلێ ل دووڤ بەرنامێ دارشتی سال ل دووڤ سالێ بەرەف نەمانێ دچوو. رژێما بەعسی ژی وەك د بەلگەنامێدا دیاردبیت باوەری ب سەركەتنا پیلانا گوهارتنا خواندنا كوردی بۆ خواندنا عەرەبی هەبوویە لەوما بریاردایە لیژنەك تایبەت ژ دویڤلانكێن جهی باوەریێ بێتەپێكئینان بۆ پێداچوونەڤا پــرۆژێ ل پارێزگەها دهۆكێ هاتییەبجهئینان دا دگەل سەروبەرێ دەروونیێ هەردو پارێزگەهێن هەولێرێ و سلێمانیێ بگونجیت هەتا سالا خواندنێ ١٩٩٠- ١٩٩١ ل سەرانسەری وان هەردو پارێزگەهان ژی ب تەواوی خواندنێ بكەنە عەرەبی ب مەرەما ب یەكجاری ژ ناڤبرنا هەستا نەتەوایەتیا كوردی هەروەك د بەلگەنامەیێدا گۆتی: ب مەرەما ژ ناڤبرنا پێلا رەگەزپەرستیا شوفینی ل دەڤەرا كوردی و نە دەركەتنا وێ د پاشەرۆژێدا.... بەلگەنامەیێ ژێرنەكریە ئەو كەسێن دویڤەلانك یێن پشكداریێ د پێداچوون و بجهئینانا پرۆژەیدا دكەن ب: خەلاتەكێ هەژی ئەركێ پێ هاتینەراسپاردن بێنەخەلاتكرن[١٤٨]. هەژیە بەری بابەتی ب داوی بینین بێژین وەك بەرهەڤیەك بۆ بعەرەبیكرنا خواندنێ ل سەرانسەری ئەوا رژێمێ ب دەڤەرا ئوتونومیا كوردستانێ ناڤكری ل دەسپێكا ١٩٧٨ رژێما بەعسی بریارا ب عەرەبیكرنا ٤٠٪ ژ بەرنامێن خواندنێ یێن هەموو قۆناغان دابوو[١٤٩].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. د.مارف خەزنەدار، دەستووری زمانی عەرەبی بە كوردی،(بەغدا- ١٩٧١)، بپ٦.

٢. هەمان یان ژێدەر، بپ١٤-١٥.

٣. هەمان ژێدەر، بپ ٢٦. - مە پێدڤی دیت هندی د شیاندا بیت ل ڤێرێ ڤان دەقان ل دووڤ رێنڤیسا نها یا كوردی بنڤیسین

٤. هەمان ژێدەر، بپ ٢٩.

٥. هەمان ژێدەر، بپ ٥٣- ٥٤.

٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٥.

* هەروەك ئاماژە پێ هاتییەكرن عەلی تەرەماخی ل سەدساڵیا ١٦-١٧زایینی ژیایە، ل سالا ١٨٥٧-١٨٥٨ زانایێ ناڤدار مەلا مەحموودێ بازیدی ئەڤ دەستنڤیسا عەلی تەرماخی بۆ زانایێ كوردناس و كونسۆلێ ئیمبراتوریارووسیا ل ئەرزەرۆمێ ئەلێكساندر ژابا نڤیسی یەڤە و پێشەكیەك ل سەر سەروبەرێ خواندنێ ل كوردستانێ و دیرۆكا عەلی تەرەماخی بۆ نڤیسی یە، وی ژی بۆ ئەكادیمیا ئیمبراتۆریەتا رووسی ل پترسبۆرگێ هنارتیە و دناڤ دەستنڤیسێن وێ دا هاتییە پاراستن، دناڤبەرا سالێن ١٩٦٠-١٩٦٨ د.مارف خەزنەدار كو وی سەردەمی خویندكارێ خواندنێن بلند بوویە ل بترسبۆرگی ئەڤ دەستنڤیسە دیتیە و دەستنڤیسەك دن ل بەر نڤیسی یە، و پشتی زڤریەڤە بەغدا ل سالا ١٩٧١دگەل ڤەكۆلینەكێ سەر ژنوو چاپكریەڤە.

٧. تەحسین ئیبراهیم دۆسكی، دو فەرهەنگێن ڤەهاندی، (هەولێر-٢٠١٠)، بپ ١٥؛سادق بەهائەدین ئامێدی، نوبهارا سەیدایێ ئەحمەدێ خانی، (بەغدا- ١٩٧٩)، بپ١٩.

٨. سادق بەهائەدین ئامێدی، نووبهارا سەیدایێ خانی، (بەغدا- ١٩٧٩)، بپ١٨.

٩. هەردو ژێدەرێن چوویی..

١٠..سادق بەهائەدین ئامێدی، مەولویدا مەلایێ باتەیی،(بەغدا- ١٩٨٢)، بپ٥٦.

١١. ژێدەرێ چوویی، بپ٣.

١٢. تصریف و ظروف و تركیبا مەلا یونسێ هەلكەتینی،جهێ چاپێ نەهاتییە دیاركرن.

١٣. تەحسین ئیبراهیم دۆسكی، ل دۆر ئەدەبێ كرمانجی ل سەدسالا نوزدێ و بیستێ زایینی،(هەولێر- ٢٠٠٤)، بپ ٦٦.

١٤. ئەبو زێد سندی، مێژووا خواندنێ، كۆڤارا پەروەردە و زانست، هژمار٢- سالا١(پاییزا١٩٧١)،بپ ٦١

١٥. تەحسین ئیبراهیم دۆسكی، ل دۆر ئەدەبێ كرمانجی، بپ ٦٦- ٦٧.

# پرۆسا خواندنا بلند ل پارێزگەها دهۆکێ ١٩٨٨ - ٢٠١٥

مووسلح حەمزە حەسەن

پشتی سەرهلدانا بهارا سالا ١٩٩١ێ و ئەو گهۆرینێن سیاسی و ئابووری و جڤاکی یێن دووڤ خۆرا هێلاین، وەك هەلبژارتنێن پەرلەمانێ کوردستانێ ل ١٩٩٢/٥/١٩ێ و پێکئینانا ئێکەم کابینا حکومەتا هەرێمێ، لەورا ژ پێدڤیاتی هزر د بیاڤێ فێرکرن و زانینێ ل کوردستانێ ب شێوەکێ گشتی و ل پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی هاتەکرن، و چەوانیيا پێشخستنا ئەڤی کەرتێ گرنگ نەخاسمە ل (پارێزگەها دهۆکێ) چونکی پێدڤیاتییا پارێزگەهێ د ڤی واریدا یا پتر بوویە ژ دەڤەر و پارێزگەهێن دیترێن هەرێمێ، ژ بەر کۆ ل پێش وەخت ئەوان دەزگایێن زانستی و ئەکادیمی هەبووینە. هەرچەندە ل پێش وەخت ل سالا ١٩٨٨ێ ئێکەم بنیاتێ خواندنا بلند ل پارێزگەها دهۆکێ هاتبوو دانان ئەوژی (پەیمانگەها تەکنیکی یا دهۆکێ) بوویە لێ خاست و پێدڤیيا دەڤەرێ بۆ فێرکرنێ ژ ئاستێ پەیمانگەهان پتر بوویە.

د ماوەیەکێ گەلەك کێم دا ب دەهان خواندنگەهـ ل گوند وبازێرکێن دەڤەرێ هاتنە ڤەکرن، دووڤدا پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و پەیمانگەها مەلبەندی یا مامۆستایان هاتنە دامەزراندن. و ل رێکەفتی ١٩٩٢/٩/٤ێ ب بریارا ژمارە (١٤) یا پەرلەمانێ کوردستانێ زانکۆیا دهۆك هاتە دامەزراندن، و ئێکەم سەرۆکێ زانکۆیێ (عصمەت محەمەد خالد) دگەل چەند کەسەکێن دیتر خودانێن هزرا دانانا زانکۆیێ بوون[1].

لەورا پشتی ڤەکرنا پەیمانگەها تەکنیکی ل سالا ١٩٨٨ێ و کۆلیژا شەریعێ ل سالا ١٩٩١ێ ل بازێرێ دهۆکێ، ئەم دشێین بێژین سالا ١٩٩٢ێ دەستپێکا پێشکەفتنا خواندنا بالا بوویە ل دەڤەرا بەهدینان. پشتی ڤەکرنێ زانکۆیا دهۆکێ بەردەوام د وەراریدا بوویە نەخاسمە د وارێ ڤەکرنا پشکێن زانستی و کولیژان سال بۆ سالێ[2].

# زانکۆیا دهۆک




کەسێن هزرا دانانا زانکۆیێ کرین:

عصمەت محەمەد خالد خودانێ هزرا دانانا زانکۆیێ

کەسێن پشتەڤانی ل هزرا دانانا زانکۆیێ کرین:

١- عومەر محەمەد نوری

٢- ئاماد محەمەد صالح جبرائیل

٣- د. فەرهاد خورشید سلیڤانەیی

٤- د. سەلیم حەسەن حاجی

دیسان (لقمان محەمەد صالح) و خۆدێ ژێ رازی (دکتۆر ئەنوەر جەمیل سەلیم) ژ وان کەسان بوون یێن بەشداری و هەڤکاری د دانانا زانکۆیا دهۆك دا کرین. هەروەسا پارێزگاری دهۆکێ یێ وی سەردەمی (عەبدولعەزیز تەیب) کەسێ فەرمی یێ ئێکی بوویە ب کارێ دووڤچوونا بریار و فەرمانا زانکۆیێ (پۆستێ شیرەتکاری) کری زندەباری دامەراندنا کارمەندێن ریڤەبرنێ[٣].

سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ (مەسعود بارزانی) د چارچووڤێ سەردانەکا خۆدا بۆ پارێزگەها دهۆك ل رێکەفتی ٢٠٠٧/٦/١٧ێ دگەل مامۆستا و جڤاتا زانکۆیا دهۆك کۆمدبیت و پەیڤەکێ پێشکێشدکەت و دبێژیت (بریارا دامەزراندنا زانکۆیا دهۆك بریارەکا وێرەك بوویە)[٤].

هەروەسا ئێکەم جڤات بناڤێ (چڤاتا زانکۆیێ) پێکئینا و ژ ڤان مامۆستایان پێکدهات:

## ئێکەم جڤاتا زانکۆیا دهۆك:

١- عصمەت محەمەد خالد سەروکێ زانکۆیێ

٢- سەرکەوت ئەحمەد سامی هـ. سەروکێ زانکۆیێ بۆ کاروبارێن زانستی

٣- لەزگین عەبدی سندی هـ سەروکێ زانکۆیێ بۆ کاروبارێن رێڤەبرنێ

٤- د. فەرهاد خورشید سلیڤانەیی راگرێ کولیژا پزیشکی ب وەکالەت

٥- د. سەلیم حەسەن حاجی راگرێ کولیژا چاندنێ ب وەکالەت

٦- عەبدولجەلیل سلێمان ئەحمەد راگرێ کولیژا ئەندازیاری ب وەکالەت

٧- عبدوللا یاسین ئامێدی راگرێ کولیژا ئاداب ب وەکالەت

٨- د. محەمەد بەهائەدین حسێن راگرێ کولیژا شەریعێ و خواندنێن ئیسلامی

٩- عومەر محەمەد نوری نوینەرێ مامۆستایان.

١٠- جەمال تاهر ئیبراهیم راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی - دهۆك.

زانکۆیا دهۆکێ ب هەردو کولیژێن (پزیشکی و چاندنێ) دەست ب ئێکەم وەرزێ خۆ یێ خواندنێ ١٩٩٢-١٩٩٣ێ کر و دەواما وێ یا فەرمی ل ٣١/ چریا ئێکێ/١٩٩٢ێ بوویە. بۆ وەرزێ خواندنێ ١٩٩٤ - ١٩٩٥ێ زانکۆیا دهۆك شیا دو کولیژێن دیتر ل خۆ زیدەکەت، ئەوژی (کولیژا ئەندازیاری - پشکا شارستانی) و (کولیژا ئادابێ - پشکا زمان و ئەدەبێ کوردی دگەل پشکا مێژوویێ)[٥]. هەروەسا ل سالا خواندنێ ١٩٩٥

- ١٩٩٦ێ (پشکا ئابووری) ژی سەر ب کولیژا ئادابێ ڤە هاتە ڤەکرن، و هەر د ڤی وەرزێ خواندنێ دا ژمارا خویندکاران گەهشتە (١٣٥٧) خویندکاران[٦]، ل هەمان وەرزی زانکۆیێ بنگەهێ کۆمپیوتەری دانا تێدا هندەك پسپۆر و شارەزا د وارێ فێرکرن و بکارئینانا وانە گۆتنێ د بیاڤێ کۆمپیوتەری کاردکرن، زێدەباری ڤەکرنا خولێن فێرکرنێ بۆ مامۆستا و دام و دەزگایێن حکومی ل پارێزگەهێ، و بنگەهێ ڤەکۆلینێن کوردی ژی ل سالا ١٩٩٥ێ بتنێ وەك بریار هاتەڤەکرن لێ ژ بەر هندەك ئەگەران نەکەتە کاری، ل ١٤ نیسانا ١٩٩٦ێ و ژ بۆ ئەنجامدانا بزاڤ و چالاکیێن رەوشەنبیری و جڤاکی و زانستی و گێرانا کور و سمیناران زانکۆیا دهۆکێ بنگەهەکێ رەوشەنبیری بناڤێ (بنگەهێ رەوشەنبیری و جڤاکی) ڤەکر[٧].

ل سالا ٢٠١١ێ سیستەمەکێ نوو یێ کارگێری ل زانکۆیا دهۆك هاتە پەیرەوکرن، ئەوژی سیستەمێ فاکولتییان ل جهێ سیستەمێ کولیژان هاتە بکارئینان، دگەل پەیرەوکرنا پرۆگرامێ دلنیا جۆری و پتر پویتە دان ب زمانێ ئینگلیزی ب تایبەت ل سالا ئێکێ یا خواندنێ ل زانکۆیێ[٨]. لەورا زانکۆیا دهۆك ژ لایێ زانستی ڤە پێشرەوییا زانکۆیێن هەرێمێ دکەت[٩].

بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٥ - ٢٠١٦ێ و ل دووڤ نڤیسارا وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ژمارە (٢٠٠٢) ل ٢٠١٥/٨/٥ێ و فەرمانا زانکۆیا دهۆك ژمارە (٥٥٥٥) ل ٢٠١٥/٨/١٢ێ سیستەمێ (فاکولتی) هاتییە گوهارتن و دوبارە بووینە (کولیژ)[١٠].

## کولیژێن زانکۆیا دهۆك:

### ١- کولیژا پزیشکی:

دگەل دامەزراندنا زانکۆیا دهۆکێ کولیژا پزیشکی ل رۆژا ١٩٩٢/١٠/٣١ێ هاتییە ڤەکرن و بۆ سالا خواندنێ ١٩٩٢-١٩٩٣ێ دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کرییە، ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٦) سالن و ل دووڤ پسپۆریێ خویندکار باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب پزیشکی و نەشتەرگەرییا گشتی وەردگرن[١١]. هەژی ئاماژێ یە کو ل دەستپێکێ کولیژ ژ ڤان تایێن زانستی ئەوێن ل خوارێ دیارکری پێکدهاتن:

١- تایێ نشتەرگەری و ئەناتومی و ئەمبریولوجی.

٢- تایێ نوشداری و دەرمانسازی و فسیولوجی.

٣- تایێ دەردزانی و شانەزانی (هستولوجی).

٤- تایێ بویولوجی و مایکرو بایولوجی و مشەخۆران.

٥- تایێ کیمیا گشتی و کیمیا ژیانێ و فیزیك و کۆمپیۆتەر.

ژ ئێکەم وەرزێ خواندنێ و تا ئێکەم خولا دەرچوونا زانکۆیا دهۆك ژمارا خویندکارێن کور و کچێن ل ڤێ کولیژێ هاتینە وەرگرتن (١٦٦) خویندکار بوون. هەروەسا ستافێ مامۆستایێن خودان باوەرنامێن بلند (١٥) مامۆستا بوون ب پلا (دکتۆر و ماجستێر)، سەرەرای چەند پزیشکێن بسپۆرێن نەخۆشخانا ئازادی وەك وانەبێژ ل کولیژێ وانە دگۆتن، و هەژییە دیار بکەین کو هەر ژ دەستپێکی ئەڤ کولیژە شیا پەرتووکخانەکا باش بدانیت و یا دەولەمەند بوو ب ژێدەرێن تایبەتمەند و گرنگ، زێدەباری ژمارەکا کۆڤارێن زانستی کو هژمارا هەمیان پێکڤە نێزیکی (٤٢٧٣) ژێدەر بوون[١٢].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا پزیشکی:

١- د. فەرهاد خورشید سلێڤانەیی[١٣]. راگرێ کولیژێ ب وەکالەت سەرۆك

٢- د. سەفەر محەمەد حاج سەرۆکێ تایێ نوشداری و دەرمانسازی و فسیولوجی ئەندام

٣- د. مووەفەق مەسعود بەهائەدین سەرۆکێ تایێ نشتەرگەری و ئەناتومی و ئەمبریولوجی ئەندام

٤- د. سەلیم عەلی حاج مەلو سەرۆکێ تایێ کیمیا گشتی و کیمیا ژیانێ و فیزیك و کۆمپیوتەر ئەندام

٥- عەلی یەحیا سەعید سەرۆکێ تایێ بایولوجی و مایکروبایولوجی و مشەخوران ئەندام

٦- ئیسماعیل محەمەد عەبدولقەهار هـ . راگرێ کولیژێ بریاردەر

بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٠ - ٢٠٠١ێ پێکهاتێ کولیژا پزیشکی ژ ئەڤان پشکا بوویە (پشکا نشتەرگەریا گشتی و نەخۆشیێن دایك بوونێ - نۆشداریا دل و هناڤا و نۆشداریا جڤاکی - نۆشداریا زارۆکان - مشەخۆران و میکروبان و بایولوجی - ئەناتومی و سوریلانك زانێ - کیمیا و فیزیك و کۆمپیوتەر)[١٤]، و بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ێ تایێ نشتەرگەریا گشتی و نەخۆشیێن دایکبوونێ ژێك جوودابووینە و هەر ئێك ژ وان بوویە تایەکێ سەربخۆ[١٥].

دیسان بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ تایێن مایکروبایولوجی - نەخۆشیان - نۆشداریا خێزان و جڤاکی) ل کولیژا پزیشکی هاتنە زێدەکرن[١٦].

ل دووڤ پرۆژەیێ نەخشەرێیا گەرەنتیا جۆری یا پرۆگرامێ چاکسازیا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ئەوا ژ لایێ وەزارەتا فێرکرنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی یا حکومەتا هەرێما کوردستانێ هاتییە راگەهاندن و ل ٢٠١١/٧/٢٠ێ ژ لایێ ئەنجومەنێ وەزیران ڤە هاتییە چەسپاندن، سیستەمێ کارگێری ئەوێ بناڤێ (فاکولتی) ل جهێ کولیژان ل زانکۆیا دهۆك هاتە پەیرەوکرن، ناڤێ کولیژا پزیشکی هاتییە گوهۆرین و بوویە (فاکولتیا زانستێن پزیشکی) و ژ ئەڤان سکۆلان پێك دهات: (سکۆلا پزیشکی - سکۆلا پەرستاری - سکۆلا دەرمانسازی - سکۆلا نۆشداریا ددانا)، دیسان ئەڤان سکۆلان چەندین پشك (تا) هەنە کو زۆربەی وان سەر ب سکۆلا پزیشکی ڤەنە[١٧].

**پشکێن کولیژێ:**

أ- پشکێن کلینیکی: پشکا (نشتەرگەریا گشتی - نۆشداریا دل و هناڤا - نۆشداریا ددانا - نۆشداریا زارۆکان - نەخۆشیێن ژنان و زارۆك بوونێ).

ب- پشکێن زانستێن بنەرەتی: پشکا (مایکروبایۆلوجی- ئەنەتومی و شانەزانی- فسیولوجی - کیمیا ژیانێ - فارما کولوجی - فیزیك و کۆمپیۆتەر - نەخۆشییان، دگەل بنگەهێ ڤەکۆلینێن زانستی و پشکا فێربوونا بەردەوام)[١٨].

## سکۆلێن فاکولتییا زانستێن پزیشکی:

### ١- سکۆلا پزیشکی:

سکۆلا پزیشکی سەر ب فاکولتییا زانستێن پزیشکی ڤە یە، کو بناڤێ کولیژا پزیشکی بوویە دگەل دامەزراندنا زانکۆیا دهۆك ل رۆژا ١٩٩٢/١٠/٣١ێ. ماوەیێ خواندنێ ل سکۆلێ (٦) سالن.

### ٢- سکۆلا پەرستاری:

سکۆلا پەرستاری ژی سەر ب فاکولتییا زانستێن پزیشکی ڤەیە، ئەوا بناڤێ کولیژا پەرستاری ل رۆژا ٢٠٠٧/١١/١ێ هاتییە دامەزراندن، و بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٧-٢٠٠٨ێ دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کرییە. و ل وەرزێ خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ و پشتی سیستەمی کارگێری یێ نوو ل زانکۆیا دهۆك هاتییە پەیرەوکرن سکۆلا پەرستاری بوویە بەشەك ژ فاکولتییا زانستێن پزیشکی. ماوەیێ خواندنێ (٤) سالن و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێن پەرستاریێ ب دەستخۆڤە دئینیت[١٩].

### ٣- سکۆلا دەرمانسازی:

هەروەسا سکۆلا پەرستاری ژی ئێکە ژ وان سکۆلێن سەر ب فاکولتییا زانستێن پزیشکی ڤە، ئەوا ل پێش وەخت ل سالا خواندێ ٢٠٠٩-٢٠١٠ێ بناڤێ کولیژا دەرمانسازی هاتییە دامەزراندن و ل هەمان سال دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کری، لێ پشتی سیستەمێ فاکولتییا ل سالا ٢٠١١ێ ل زانکۆیا دهۆك هاتییەپەیرەوکرن ئەڤ سکۆلە بوویە بەشەك ژ فاکولتییا زانستێن پزیشکی. ماوەیێ خواندنێ (٥) سالن، و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێن دەرمانسازی وەردگریت.

### ٤- سکۆلا نوشدارییا ددانا:

پشتی سیستەمێ نوو یێ فاکولتییا ل سالا ٢٠١١ێ ل زانکۆیا دهۆك هاتییە بجهکرن، کولیژا ددانسازی ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٩- ٢٠١٠ێ هاتییە دامەزراندن و دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کری بوویە

بەشەك سەر ب فاكولتيیا زانستێن پزیشکی ڤە. ماوەیێ خواندنێ (٥) سالن، و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێ نۆشداریيا ددانا وەردگریت [٢٠].

## ٥- سکۆلا زانستێن ساخلەمی:

سکۆلا زانستێن ساخلەمی ل سالا خواندنێ ٢٠١٢ – ٢٠١٣ێ هاتییەدامەزراندن و بوویە ئێك ژ سکۆلێن فاکۆلتیيا زانستێن ساخلەمی، و ل هەمان سال دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کرییە و ژ دو پشکان پێکدهێت:

**١- پشکا سرکردن و بێ هۆشکرنێ.**
**٢- پشکا شرۆڤەکرنا نەخۆشییا.**

ماوەیێ خواندنێ ل سکۆلێ (٥) سالن، و خویندکارێ دەرچوونێ ژێ دکەت باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێن ساخلەمیێ وەردگریت [٢١].

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن کولیژا پزیشکی ل دووڤ ناسناڤێن زانستی و سالێن خواندنێ ١٩٩٦ – ١٩٩٧ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆر. هـ | مامۆستا | مامۆستایێ. هـ | کوژمێ سالی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٧-١٩٩٦ | | ٢ | ١٠ | ٩ | ٢١ |
| ١٩٩٨-١٩٩٧ | ٢ | ٢ | ١١ | ١٢ | ٢٧ |
| ١٩٩٩-١٩٩٨ | ١ | ٣ | ١٤ | ١٠ | ٢٨ |
| ٢٠٠٠-١٩٩٩ | ١ | ٥ | ١٦ | ١٦ | ٣٨ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٠ | ١ | ٥ | ١٧ | ١٧ | ٤٠ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠١ | ١ | ٥ | ١٥ | ١٨ | ٣٩ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٢ | | ٥ | ١٦ | ١٩ | ٤٠ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٣ | | ٤ | ١٨ | ٢٠ | ٤٢ |
| ٢٠٠٥-٢٠٠٤ | ١ | ٨ | ٢٢ | ٢٠ | ٥١ |
| ٢٠٠-٢٠٠٥ | ١ | ١٢ | ٢٣ | ٢٦ | ٦٢ |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٦ | ٣ | ١٢ | ٢٧ | ٢٥ | ٦٧ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٧ | ٣ | ١٤ | ٢٩ | ٢٧ | ٧٣ |
| ٢٠٠٩ -٢٠٠٨ | ٣ | ١٥ | ٤١ | ٦٨ | ١٢٧ |
| ٢٠١٠-٢٠٠٩ | ٥ | ٢٣ | ٤٧ | ٣٣ | ١٠٨ |
| ٢٠١١ -٢٠١٠ | ٣ | ١٧ | ٥٤ | ٤١ | ١١٥ |
| ٢٠١٢-٢٠١١ | ٤ | ٢٣ | ٦٢ | ٤٤ | ١٣٣ |
| ٢٠١٣-٢٠١٢ | ٦ | ٢٨ | ٦٨ | ٧١ | ١٧٣ |
| ٢٠١٤-٢٠١٣ | ٩ | ٣٠ | ٨٧ | ٨٤ | ٢١٠ |
| ٢٠١٥ - ٢٠١٤ | ٨ | ٣٠ | ٩٦ | ٨٧ | ٢٢١ |
| گوژمی گشتی | ٥٢ | ٢٤٣ | ٦٧٣ | ٦٤٧ | ١٦١٥ |

**خشتەيێ ژمارا خويندكارێن دەرچوويێن كوليژا پزيشكى ١٩٩٧ – ١٩٩٨ تاكو ٢٠١٤ – ٢٠١٥ێ**

| سالێن دەرچوونێ | پزیشکی | | کوما سالێ |
|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | |
| ١٩٩٨-١٩٩٧ | ١٥ | ٦ | ٢١ |
| ١٩٩٩-١٩٩٨ | ٢٠ | ٦ | ٢٦ |
| ٢٠٠٠-١٩٩٩ | ٢١ | ١١ | ٣٢ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٠ | ١٩ | ١٠ | ٢٩ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠١ | ٢٨ | ١٤ | ٤٢ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٢ | ٢٠ | ١٨ | ٣٨ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٣ | ٢١ | ١٠ | ٣١ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٥ | ٢٢ | ١٤ | ٣٦ |
| -٢٠٠٥٢٠٠٦ | ٢٢ | ١٨ | ٤٠ |
| -٢٠٠٦٢٠٠٧ | ٢٧ | ١٠ | ٣٧ |
| -٢٠٠٧٢٠٠٨ | ٣٥ | ٢٣ | ٥٨ |
| -٢٠٠٨٢٠٠٩ | ٣٤ | ٢٤ | ٥٨ |
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ٤٠ | ٢٧ | ٦٧ |
| -٢٠١٠٢٠١١ | ٤٣ | ٢٤ | ٦٧ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | ٣٦ | ٢٦ | ٦٢ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | ٢٩ | ٢٢ | ٥١ |
| ٢٠١٣-٢٠١٤ | ٢٢ | ٢٩ | ٥١ |
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | ٤٨ | ٩٦ | ١٤٤ |
| كوما گشت سالان | ٥٠٢ | ٣٨٨ | ٨٩٠ |
| كوما گشتى | ٨٩٠ | | ٨٩٠ |

## ٢- كوليژا چاندنێ:

كوليژا چاندنێ دگەل دانانا زانكۆيا دهۆك ل ١٩٩٢/١٠/٣١ێ دەرگەهێ خۆ ڤەكرييە و بۆ سالا خواندنێ ١٩٩٢-١٩٩٣ێ ئێكەمين دەستەكا خويندكاران وەرگرتييە، ماوەيێ خواندنێ ل ڤێ كوليژێ (٤) سالن، و خويندكارێ دەرچوويى باوەرنامەيا بەكالۆريۆس ب زانستێن چاندنێ ب دەست خوڤە د ئينيت، بۆ زانين پسپۆرى ل كوليژا چاندنێ ل قۆناغا سيێ دەست پێ دكەت پشتى خويندكار ل قۆناغا ئێكێ و دوێ زانستێن بنەرەتى يێن چاندنێ دخوينن[٢٢]، و ل دەستپێكێ كوليژا چاندنێ ب پشكا (بەرهەمێ شينكاتى)، دەستپێكرييە، و بۆ سالا دووڤدا پشكا بەرهەمێ گيانەوەرى ژى ل كوليژێ هاتييە ڤەكرن[٢٣]. هەروەسا هژمارا خويندكارێن كور و كچ يێن هەر چوار قۆناغێن خواندنێ هەر ژ دەستپێكا دامەزراندنا كوليژێ تا ئێكەم خولا دەرچوونێ د گەهشتنە (٣١٩) خويندكاران، و ستافێ مامۆستايێن خودان باوەرنامێن بلند (٢١) مامۆستا ب پلا (دكتۆرا و ماجستێر) بوون، ژمارا پەرتووك و كۆڤارێن زانستى د پەرتووكخانێ دا نێزيكى (١٠٨٣٠) ژێدەران بوون[٢٤].

## ئێكەم جڤاتا كوليژا چاندنێ:

١- د. سەليم حەسەن حاجى راگرێ كوليژێ ب وەكالەت سەروك

٢- ئەكرەم عەباس خەلەف هـ راگرێ كوليژێ برياردەر

٣- عومەر محەمەد نورى سەرۆكێ پشكا شينكاتى ئەندام

٤- ئاماد محەمەد صالح جبرائيل سەرۆكێ پشكا گيانەوەرى ئەندام

٥- د.سەعيد ئيسماعيل سلێڤانەيى نوينەرێ مامۆستا ئەندام

٦- جەعفەر محەمەد تاهر رێڤەبەرێ بنگەهێ چاندنێ ئەندام

## پشكێن كوليژا چاندنێ:

**١- پشكا بەرهەمێ رووەكى:** پشكا بەرهەمێ رووەكى دگەل دامەزراندنا كوليژا چاندنێ هاتييەڤەكرن. و ل ئێكەم وەرزێ خۆ يێ خواندنێ ١٩٩٢ - ١٩٩٣ێ پێشوازى ل خويندكاران كرييە.

**٢- پشكا بەرهەمێ گيانەوەرى:** پشكا بەرهەمێ گيانەوەرى ژى ل سالا خواندنێ ١٩٩٣ - ١٩٩٤ێ

هاتیبەدانان، و ل هەمان سال ئێکەم دەستەکا خویندکاران وەرگرتیە[٢٥].

**٣- پشکا دارستانا،** ل سالا خواندنێ ١٩٩٧ - ١٩٩٨ێ هاتیە دامەزراندن و ل هەمان سال ئێکەم دەستەکا خویندکاران وەرگرتیە[٢٦].

**٤- پشکا ئاخ و ئاڤ،** ئەڤ پشکە ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠١ – ٢٠٠٢ێ ل کولیژا چاندنێ هاتیە زێدەکرن[٢٧].

**٥- پشکا زانستێن بنەکی،** کولیژا چاندنێ سال بۆ سالێ ژ لایێ زانستی ڤە د وەرارێ دا بوویە، لەورا ل سالا ٢٠٠٨ێ شیایە پشکا (زانستێن بنەکی) ژێ ل پشکێن خۆ یێن زانستی زێدەبکەت، لێ ئەڤ پشکە چ خویندکاران بخۆڤە ناگریت، و بتنێ کارێ پێشکێشکرنا وانەیێن زانستی یێن سەرەکی وەك فیزیا و کیمیا و ماتماتیك و کۆمپیوتەر و جیولوجی بۆ خویندکارێن

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن کولیژا چاندنێ ل دووڤ پلێن زانستی و سالێن خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ تاکو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | کوژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٥ -١٩٩٦ | | ٥ | ٦ | ١٣ | ٢٤ |
| ١٩٩٦ - ١٩٩٧ | | ٨ | ٦ | ١٣ | ٢٧ |
| ١٩٩٧ – ١٩٩٨ | | ١٣ | ٧ | ١٢ | ٣٢ |
| ١٩٩٨ - ١٩٩٩ | | ١٠ | ١٠ | ١٢ | ٣٢ |
| ١٩٩٩ - ٢٠٠٠ | | ١١ | ١٠ | ٢١ | ٤٢ |
| ٢٠٠٠ – ٢٠٠١ | | ١٣ | ١٠ | ٢٣ | ٤٦ |
| ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ | ١ | ١٤ | ١٣ | ٢٤ | ٥٢ |
| ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ | ٢ | ١٠ | ١٥ | ٣٠ | ٥٧ |
| ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤ | ٢ | ١٢ | ١٤ | ٣٩ | ٦٧ |
| ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ | ٢ | ١٥ | ١٢ | ٣٩ | ٦٨ |
| ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ | ٢ | ١٨ | ١٣ | ٤٣ | ٧٦ |
| ٢٠٠٦ – ٢٠٠٧ | ٢ | ١٧ | ١٢ | ١٧ | ٤٨ |
| ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ | ٢ | ٢٣ | ٢٣ | ٦٧ | ١١٥ |
| ٢٠٠٨ – ٢٠٠٩ | ٤ | ٢٢ | ٢٧ | ٧٢ | ١٢٥ |
| ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ | ٤ | ٢٢ | ٣٤ | ٧٥ | ١٣٥ |
| ٢٠١٠ – ٢٠١١ | ٤ | ٢٢ | ٣٧ | ٧٠ | ١٣٣ |
| ٢٠١١ – ٢٠١٢ | ٣ | ٢٣ | ٣٧ | ٨٧ | ١٥٠ |
| ٢٠١٢ – ٢٠١٣ | ٤ | ٢٦ | ٤٠ | ٩٣ | ١٦٣ |
| ٢٠١٣ – ٢٠١٤ | ٤ | ٣٠ | ٤٧ | ٨٥ | ١٦٦ |
| ٢٠١٤ - ٢٠١٥ | ٧ | ٣٠ | ٤٩ | ٩٩ | ١٨٥ |
| گوژمێ گشتی | ٤٣ | ٣٤٤ | ٤٢٢ | ٩٣٤ | ١٧٤٣ |

**خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن کولیژا چاندن ١٩٩٥ – ١٩٩٦ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥**

| سالێن دەرچوونێ | بەرهەمی رووەکی | | بەرهەمی گیانەوەری | | دارستان | | بیستانکاری | | ئاخ و ئاڤ | | پاراستنا رووەکی | | کۆما سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ١٩٩٥ -١٩٩٦ | ٥٠ | ٢٠ | | | | | | | | | | | ٧٠ |
| ١٩٩٦-١٩٩٧ | ٢٠ | ٩ | ١٢ | ٣ | | | | | | | | | ٤٤ |
| ١٩٩٧ -١٩٩٨ | ٢١ | ١٢ | ٨ | ٨ | | | | | | | | | ٤٩ |
| ١٩٩٨ -١٩٩٩ | ١٩ | ١٥ | ١٢ | ٥ | | | | | | | | | ٥١ |
| ١٩٩٩-٢٠٠٠ | ٩ | ٩ | ١٠ | ٤ | ٩ | ٨ | | | | | | | ٤٩ |
| ٢٠٠٠-٢٠٠١ | ١١ | ٦ | ٥ | ٩ | ٩ | ٣ | | | | | | | ٤٣ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٢ | | | ٧ | ٩ | ٣ | ٩ | ٧ | ١٨ | | | | | ٥٣ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | | | ٢٠ | ١١ | ٩ | ١١ | ١٦ | ١٧ | | | | | ٨٤ |
| ٢٠٠٣ -٢٠٠٤ | | | ٢٤ | ١٢ | ١٠ | ١٧ | ١٥ | ١٥ | | | | | ٩٣ |
| ٢٠٠٤ -٢٠٠٥ | | | ٢٢ | ٧ | ١٢ | ١٧ | ١١ | ٢٤ | ١٠ | ٧ | | | ١١٠ |
| ٢٠٠٥ -٢٠٠٦ | | | ١٩ | ٦ | ١١ | ٨ | ١١ | ١٢ | ١١ | ١٠ | | | ٨٨ |
| ٢٠٠٦ -٢٠٠٧ | | | ١٩ | ١١ | ١٤ | ١٨ | ١٦ | ١٢ | ١٨ | ١٣ | | | ١٢١ |
| ٢٠٠٧ -٢٠٠٨ | | | ١٤ | ١٦ | ١١ | ١٠ | ١١ | ١٧ | ٩ | ١٠ | | | ٩٨ |
| ٢٠٠٨ -٢٠٠٩ | | | ١٥ | ١٥ | ١٣ | ٢٣ | ٣٠ | ١٧ | ١٣ | ١٨ | | | ١٤٤ |
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | | | ٢١ | ٧ | ٩ | ١٧ | ٨ | ١٤ | ١٥ | ٨ | | | ٩٩ |
| ٢٠١٠ -٢٠١١ | | | ١١ | ١٥ | ١٣ | ١٨ | ١٣ | ٢١ | ٦ | ١٤ | | | ١١١ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | | | ٩ | ١٢ | ٧ | ٧ | ٧ | ١٥ | ١٠ | ١٩ | ١٠ | ١٢ | ١٠٨ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | | | ١٩ | ١٥ | ٩ | ١٥ | ١٤ | ١٥ | ٨ | ١٣ | ١٢ | ١٨ | ١٣٨ |
| ٢٠١٣ -٢٠١٤ | | | ١٢ | ١٨ | ١٢ | ٢٨ | ٦ | ٣١ | ٢٠ | ١٤ | ١٨ | ١٦ | ١٧٥ |
| ٢٠١٤ -٢٠١٥ | | | ١٥ | ٢٠ | ٦ | ١٩ | | | ١٤ | ٢٥ | ١٥ | ٢٢ | ١٣٦ |
| کۆما گشت سالان | ١٣٠ | ٧١ | ٢٧٤ | ١٠٣ | ١٥٧ | ٢٠٩ | ١٦٥ | ٢٢٨ | ١٣٤ | ١٥١ | ٥٥ | ٦٨ | ١٨٦٤ |
| کۆما گشتی | ٢٠١ | | ٣٧٧ | | ٣٦٦ | | ٣٩٣ | | ٢٨٥ | | ١٢٣ | | ١٨٦٤ |

پشکێن دیتر پێشکێشدکەت.

**٦- پشکا پاراستنا رووەکی،** دیسان پشکا پاراستنا رووەکی ژی ل سالا ٢٠٠٨ێ هاتیيە دانان، و ژ دو تایێن سەرەکی پێکدهێت (زانستێن مێش و مۆران و ئێشێن رووەکی)[٢٨].

ل سالا خواندنێ ٢٠١١-٢٠١٢ێ و پشتی سیستەمێ فاکولتیيا ل زانکۆیا دهۆك هاتیيە پەیرەوکرن ناڤێ کولیژا چاندنێ بوویە (فاکولتیيا چاندن و دارستانێ)، و ل سەر ڤێ بنەمایێ سێ سکۆلێن زانستی و پێنج پشکا بوویە:

**١- سکۆلا بەرهەمێ گیانەوەری**

**٢- سکۆلا دارستانێ**

**٣- سکۆلا بەرهەمێ رووەکی،**

سکۆلا بەرهەمێ رووەکی ژ پشکێن (بیستانکاری - پاراستنا رووەکی- زانستێن ئاخ و ئاڤ - لقا زانستێن بنەکی پێك دهات[٢٩]. بۆ سالا خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ پشکا دەرامەتێن کێلگەیی ژی هاتەڤەکرن) پشتی

جارەکا دی و ل دووڤ فەرمانەکا زانکۆیێ ناڤێ فاکولتیێ بوویە (فاکولتیا چاندنێ) و ژ پشکێن (بیستانکاری - بەرهەمێ گیانەوەری - دارستان - زانستێن ئاخ و ئاڤ - پاراستنا رووەکی - دەرامەتێن کیلکەیی - و لقا زانستێن بنەکی) پێکدهات و دوبارە سیستەمێ خۆ یێ ل سەر بنەمایێ پشکان زڤراندییەڤە، و ل وەرزێ خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ پشکا گەشتیاری و توریزما ژینگەهێ ل فاکولتیا چاندنێ دەست بکار بوو[٣٠].

## ٣- کولیژا ئەندازیاری:

کولیژا ئەندازیاری ل دووڤ پێشنیازا جڤاتا زانکۆیا دهۆك - روینشتنا سێزدێ ل رۆژا ١٩٩٤/٧/٢٤ێ رەزامەندی ب ڤەکرنا کولیژا ناڤبری هاتییەکرن، و ل رۆژا ١٩٩٤/٧/٢٦ێ ژ لایێ جڤاتا بلند یا فێرکرنێ ل هەرێما کوردستانێ هاتییە پەسەندکرن. و ئاڤاهیێ وێ ب رەنگەکێ فەرمی ل رۆژا ١٩٩٤/١٠/١١ێ

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن کولیژا ئەندازیاری ل دووڤ پلێن زانستی و سالێن خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ تاکو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پروفیسور | پروفیسورێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | کۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٥- ١٩٩٦ | | ١ | ٢ | ١١ | ١٤ |
| ١٩٩٦ - ١٩٩٧ | | | ٢ | ١٠ | ١٢ |
| ١٩٩٧ – ١٩٩٨ | | | ٣ | ١٨ | ٢١ |
| ١٩٩٨ - ١٩٩٩ | ١ | ٣ | ٨ | ١٦ | ٢٨ |
| ١٩٩٩ - ٢٠٠٠ | ١ | ٤ | ٨ | ١٥ | ٢٨ |
| ٢٠٠٠ – ٢٠٠١ | ١ | ١ | ٩ | ١٧ | ٢٨ |
| ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ | ١ | ١ | ٩ | ١٥ | ٢٦ |
| ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ | | ٣ | ٩ | ١٥ | ٢٧ |
| ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤ | | ٣ | ٩ | ١٧ | ٢٩ |
| ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ | | ٤ | ٤ | ١٨ | ٢٦ |
| ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ | | ٤ | ٤ | ١٩ | ٢٧ |
| ٢٠٠٦ – ٢٠٠٧ | ١ | ١٥ | ١١ | ٣١ | ٥٨ |
| ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ | ١ | ١٤ | ١١ | ٣١ | ٥٧ |
| ٢٠٠٨ – ٢٠٠٩ | | ١٢ | ١٠ | ٣٠ | ٥٢ |
| ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ | ١ | ١٢ | ١٦ | ٥١ | ٨٠ |
| ٢٠١٠ – ٢٠١١ | ٢ | ١٢ | ٢٣ | ٥٨ | ٩٥ |
| ٢٠١١ – ٢٠١٢ | ٣ | ١٣ | ٢٦ | ٦١ | ١٠٣ |
| ٢٠١٢ – ٢٠١٣ | ٣ | ١٥ | ٢٩ | ٧٦ | ١٢٣ |
| ٢٠١٣ – ٢٠١٤ | ٤ | ١٣ | ٣٦ | ٨٥ | ١٣٨ |
| ٢٠١٤ - ٢٠١٥ | ٢ | ١١ | ٣١ | ٨٦ | ١٣٠ |
| کۆژمێ گشتی | ٢١ | ١٤١ | ٢٦٠ | ٦٨٠ | ١٢٠٢ |

**خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن کولیژا ئەندازیاری ١٩٩٧ – ١٩٩٨ تاکو ٢٠١٤ – ٢٠١٥**

| سالێن دەرچوونێ | شارستانی | | ئاڤدێری | | ژێدەرێن ئاڤێ | | تەلارسازی | | کارەبا و کۆمپیوتەر | | کۆما سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ١٩٩٧ -١٩٩٨ | ٢٥ | ٥ | | | | | | | | | ٣٠ |
| ١٩٩٨ -١٩٩٩ | ٢٣ | ٩ | ١٥ | ٧ | | | | | | | ٥٤ |
| ١٩٩٩ -٢٠٠٠ | ١٦ | ٢ | ١٥ | ٢ | | | | | | | ٣٥ |
| ٢٠٠٠-٢٠٠١ | ٢٤ | ٨ | ١٣ | ٣ | | | | | | | ٤٨ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٢ | ٢٦ | ١١ | ١٦ | ٧ | | | | | | | ٦٠ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | ٢٤ | ١٤ | ١٥ | ٤ | | | | | | | ٥٧ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٤ | ٢٤ | ٣ | ١٩ | ٧ | | | | | | | ٥٣ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٥ | ٢١ | ٧ | ٢ | ١ | ٢٤ | ٥ | | | | | ٦٠ |
| ٢٠٠٥-٢٠٠٦ | ٢٧ | ٥ | | | ١٨ | ١٩ | | | | | ٦٩ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ٣١ | ٢٠ | | | ١٧ | ١٨ | | | | | ٨٦ |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٨ | ٢٢ | ١٦ | | | ٢٠ | ٨ | | | | | ٦٦ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٩ | ٣٤ | ١٤ | | | ٣٣ | ١٥ | ١٣ | ٧ | | | ١١٦ |
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ٣٠ | ١٥ | | | ٢٤ | ١١ | ١٢ | ٦ | ١٣ | ١٥ | ١٢٦ |
| ٢٠١٠-٢٠١١ | ٢٦ | ١٣ | | | ٢٤ | ١٨ | ١٠ | ٥ | ٢٨ | ٧ | ١٣١ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | ٢٢ | ١٨ | | | ٢٦ | ٢٠ | ١٤ | ٨ | ٢٦ | ١٣ | ١٤٧ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | ٢٤ | ٨ | | | ٢٢ | ١١ | ١٥ | ١١ | ١٨ | ٧ | ١١٦ |
| ٢٠١٣-٢٠١٤ | ١٤ | ١١ | | | ٢٢ | ٢١ | ١٧ | ٧ | ٣٢ | ١٠ | ١٣٤ |
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | ٢٢ | ١١ | | | ١٦ | ١٧ | ١١ | ١٢ | ١٠ | ٢٥ | ١٢٤ |
| کۆما گشت سالان | ٤٣٣ | ١٩٠ | ٩٥ | ٣١ | ٢٤٦ | ١٦٣ | ٩٢ | ٥٦ | ١٢٧ | ٧٧ | ١٥١٠ |
| کۆما گشتی | ٦٢٣ | | ١٢٦ | | ٤٠٩ | | ١٤٨ | | ٢٠٤ | | ١٥١٠ |

هاتییەڤەکرن. کولیژا ئەندازیاری ب پشکا ئەندازیاریا شارستانی دەستپێکرییە، و ل ئێکەم وەرزێ خۆ یێ خواندنێ ١٩٩٤ - ١٩٩٥ێ (٤٠) خویندکار ل پشکا ئاڤدێری وەرگرتینە، و پشتی ژمارا مامۆستایێن بسپۆر زێدەهی بخۆڤە دیتی کولیژا ئەندازیاری ل سالا خواندنێ ١٩٩٦ - ١٩٩٧ێ شیا پشکا ئاڤدانێ ڤەکەت (ری و بزل)[٣١]. ماوەیێ خواندنێ ل کولیژا ئەندازیاری (٤) سالن، خویندکارێ دەرچووی باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب بسپۆریا ئەندازیاریێ وەردگریت[٣٢].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا ئەندازیاری:

١- عەبدولجەلیل سلێمان ئەحمەد راگرێ کولیژێ ب وەکالەت و سەرۆکێ پشکا شارستانی سەرۆك
٢- زیرەك عزیزخان ئەحمەد هـ.راگرێ ئەندام
٣- صەباح محەمەد سەعید سەروکێ پشکا ئاڤدانێ ئەندام
٤- نەجدەت صەبری عەبدولخالق مامۆستا ل کولیژێ بریاردەر.

## پشكێن كولیژا ئەندازیاری:

### ١- پشكا شارستانی:

پشكا شارستانی ل سالا خواندنێ ١٩٩٤ - ١٩٩٥ێ ئێكەم خۆلا خویندكاران وەرگرتییە، هەروەسا پشكا ئاڤدانێ (ری وبزل) ل سالا خواندنێ ١٩٩٦ - ١٩٩٧ێ (٣٨) خویندكارێن كور و كچ وەرگرتینە و سەرجەمێ خویندكارێن كولیژێ دبنە (١٤٣) خویندكار. ئەڤە و ژمارا مامۆستایێن خودان باوەرنامێن بلند (١٣) مامۆستا بوون ب پلا (دكتۆرا و ماجستیر). دیسان وەك دەستپێك پەرتووكخانەك دانابوو و تێدا ژمارەكا پەرتووكێن تایبەتمەند و زانستی كو نێزیكی (١٥٠٠) پەرتووك و كۆڤار بوون.

### ٢- پشكا ئاڤدێری:

پشكا ئاڤدێری ل سالا خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ێ هاتییەڤەكرن و ئێكەم پۆستێ خویندكاران ل هەمان سال وەرگرتییە كو ژمارا وان (٣٨) خویندكارێن كور و كچ بووینە[٣٣]. و ل سالا خواندنێ ٢٠٠٠ - ٢٠٠١ ناڤێ وێ هاتییە گوهۆرین و بوویە پشكا (ژێدەرێن ئاڤێ)[٣٤].

### ٣- پشكا تەلارسازی:

ل سالا خواندنێ ٢٠٠٤- ٢٠٠٥ێ هاتییە دانان و ل هەمان سال ئێكەم پۆستێ خویندكاران وەرگرتییە[٣٥].

### ٤- پشكا كارەب و كۆمپیۆتەر:

ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ێ هاتییەدامەزراندن و ل هەمان سال خویندكار وەرگرتینە[٣٦]. پشتی سیستەمێ كارگێری یێ نوو ل سالا ٢٠١٠ێ و سیستەمێ فاكولتیا ل زانكۆیا دهۆكێ ل جهێ كولیژان هاتییە پەیرەوكرن، ناڤێ كولیژا ئەندازیاری بوویە (فاكولتیا ئەندازیاری و زانستێن كارەكی) و ژ سێ سكۆلان پێك دهات:

١- سكۆلا ئەندازیاری و پێكهاتێ وێ ژ پشكێن (شارستانی - ژێدەرێن ئاڤێ - تەلارسازی - كارەبا و كۆمپیێتەر).

٢- سكۆلا پلاندانانێ و یا پێكهاتییە ژ ( پەیمانگەها بلند یا پلاندانانێ یا بەرێ).

٣- سكۆلا زانستێن عەرد یێن پراكتیكی و جیوئینفورماتكس، كو دێ سێ جۆرێن بەكالۆریۆسێ یێن تایبەت ب زانستێن عەردی یێن پراكتیكی ب خویندكارێن دەرچوویی بەخشیت[٣٧].

## ٤- كولیژا ئادابێ:

كولیژا ئادابێ ل دووڤ بریارا جڤاتا فێركرنا بلند ل هەرێما كوردستانێ ژمارە (٥) ل رۆژا ١٩٩٤/٧/٢٦ێ هاتییە دامەزراندن، و ل دەستپێكێ ژ دو پشكێن زانستی پێك دهات (پشكا زمان و ئەدەبێ كوردی و پشكا مێژوو). ماوەیێ خواندنێ ل كولیژێ (٤) سالن و خویندكارێ دەرچوونێ ژێ دكەت باوەرنامەیا بەكالۆریۆس ل بسپۆریا خۆ وەردگریت.

ژ بۆ پویتەدان ب زمان و ئەدەب و مێژوویا كوردی، هەر ژ دەستپێكا ڤەكرنا كولیژا ئادابێ پشكا زمان و ئەدەبێ كوردی و مێژوو هاتنەڤەكرن، پاش ل سالا خواندنێ ١٩٩٥- ١٩٩٦ێ كولیژا ئادابێ پشكا ئابووری و پشكا زمانێ ئنگلیزی ل خۆ زێدەكرن، لێ د هەمان سالدا ژ بەر كێمیا ژمارا مامۆستایێن پسپۆر پشكا زمانێ ئنگلیزی نەشیا خویندكاران وەربگریت.

ژمارا خویندكارێن كور و كچ یێن پشكا زمان و ئەدەبێ كوردی ل هەردو قۆناغێن ئێك و دو (٨٤) خویندكار بوون، دیسان یێن هەردو قۆناغێن پشكا مێژوویی ژمارا وان (٩٦) خویندكار بوون، و ل پشكا ئابووری یێن قۆناغا ئێكێ (٥٥) خویندكار بوون، ئانكو سەرجەمێ گشتی یێ خویندكاران تا سالا خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ێ (٢٣٥) خویندكار بوون، ئەڤە و ژمارا مامۆستایێن خودان باوەرنامەیێن بلند (٢٠) مامۆستا بوون ب پلا (دكتۆرا و ماجستیر)، و تا ئەڤێ سالا خواندنێ یا دەستنیشانكری پەرتووكخانا كولیژێ نیزیكی (٧٠٠٠) ژێدەران هەبوون[٣٨].

خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن كولیژا ئادابێ ل دووڤ ناسناڤێن زانستی و سالێن خواندنێ
١٩٩٥ – ١٩٩٦ تاكو ٢٠١٤ - ٢٠١٥

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆر.هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | كۆژمێ سالی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٥ - ١٩٩٦ | | ٣ | ٣ | ١٥ | ٢١ |
| ١٩٩٦ - ١٩٩٧ | | ٢ | ٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| ١٩٩٧ - ١٩٩٨ | | ١ | ٥ | ٢٠ | ٢٦ |
| ١٩٩٨ - ١٩٩٩ | | ٤ | | ٢١ | ٢٥ |
| ١٩٩٩ - ٢٠٠٠ | | ٤ | ٧ | ٢٤ | ٣٥ |
| ٢٠٠٠ - ٢٠٠١ | | ٥ | ١٠ | ٢٥ | ٤٠ |
| ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ | ١ | ٥ | ١٤ | ١٩ | ٣٩ |
| ٢٠٠٢ - ٢٠٠٣ | | ٥ | ١٥ | ٣١ | ٥١ |
| ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ | | ٤ | ١٥ | ٣٣ | ٥٢ |
| ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ | | ٧ | ٩ | ٣١ | ٤٧ |
| ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ | ٢ | ٦ | ١٣ | ٢٩ | ٥٠ |
| ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ | ٢ | ٧ | ١٤ | ٣١ | ٥٤ |
| ٢٠٠٧ - ٢٠٠٨ | ٢ | ٩ | ١٥ | ٤٣ | ٦٩ |
| ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ | ٣ | ٨ | ١٩ | ٤٧ | ٧٧ |
| ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ | ٣ | ٩ | ٢٠ | ٥٧ | ٨٩ |
| ٢٠١٠ - ٢٠١١ | ٧ | ٢٩ | ٤٢ | ١١٨ | ١٩٦ |
| ٢٠١١ - ٢٠١٢ | ٧ | ١١ | ٢٧ | ٦٧ | ١١٢ |
| ٢٠١٢ - ٢٠١٣ | ٧ | ١٢ | ٣٢ | ٦٥ | ١١٦ |
| ٢٠١٣ - ٢٠١٤ | ٧ | ١٩ | ٤٥ | ٧٥ | ١٤٦ |
| ٢٠١٤ - ٢٠١٥ | ٧ | ٢٠ | ٣٥ | ٨٩ | ١٥١ |
| كۆژمێ گشتی | ٤٨ | ١٧٠ | ٣٤٥ | ٨٦٢ | ١٤٢٥ |

## ئێكەم جڤاتا كولیژا ئادابێ:

١- عەبدوللا یاسین ئامێدی راگر ب وەكالەت سەرۆك

٢- محەمەد سالح تەیب سەرۆكێ پشكا مێژوو بریاردەر

٣- فاضل حیدر خدیدە سەرۆكێ پشكا زمانێ ئنكلیزی ئەندام

٤- مەهدی قادر خضر نوینەرێ مامۆستایان ئەندام

٥- د. فەواز جارەللا نایف سەرۆكێ پشكا ئابووری ئەندام

٦- عەبدوللا عزیز محەمەد سەرۆكێ پشكا زمانێ كوردی ئەندام

خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن کولیژا ئاداب ١٩٩٧- ١٩٩٨ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥

| سالێن دەرچوونێ | ز. كوردی | | مێژوو | | زئینگلیزی | | ز. ئینگلیزی (ئێڤاران) | | جوگرافیا | | ز.كوردی (ئێڤاران) | | مێژوو (ئێڤاران) | | شانۆ | | وەرگێران | | كۆ ما سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ١٩٩٧- ١٩٩٨ | ٨ | ١٩ | ٢٨ | ١٩ | | | | | | | | | | | | | | | ٧٤ |
| ١٩٩٨- ١٩٩٩ | ٢٠ | ٢١ | ٢٢ | ١٤ | | | | | | | | | | | | | | | ٧٧ |
| ١٩٩٩-٢٠٠٠ | ١٤ | ٢٤ | ١٥ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | | | | | | | | | | | | | ٩٨ |
| ٢٠٠٠-٢٠٠١ | ١١ | ١٩ | ١٤ | ١٢ | ٣ | ٢٩ | | | | | | | | | | | | | ٨٨ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٢ | ١٦ | ٣١ | ٩ | ١٨ | ٨ | ١٨ | | | | | | | | | | | | | ١١٠ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | ٢٢ | ٣٠ | ١٠ | ١٤ | ١٤ | ٢١ | | | | | | | | | | | | | ١١١ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٤ | ٢١ | ٤٩ | ١٤ | ١٧ | ١٠ | ٢٥ | | | | | | | | | | | | | ١٣٦ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٥ | ٢٦ | ٤٩ | ١٦ | ١٨ | ١٧ | ١٨ | | | | | | | | | | | | | ١٤٤ |
| ٢٠٠٥-٢٠٠٦ | | | | | | | ٢٩ | ١٢ | | | | | | | | | | | ٤١ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ١٧ | ١٧ | ١٠ | ٢٧ | | | ٣٣ | ١٩ | | | | | | | | | | | ١٢٣ |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٨ | ٢٠ | ١٨ | ١٣ | ١٦ | ٢٨ | ٢٤ | ١٩ | ١٢ | | | | | | | | | | | ١٥٠ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٩ | ٢٠ | ٣٢ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٠ | ٢٣ | ١٦ | ١٠ | ٢٢ | ٢٤ | | | | | | | | | ٢١١ |
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ١٠ | ١٧ | ١٢ | ١٦ | ١٣ | ٣٥ | ٢١ | ١٧ | ١٣ | ٢٤ | ١٨ | ٢١ | ٢٦ | ١٢ | | | | | ٢٥٥ |
| ٢٠١٠-٢٠١١ | ٢٠ | ٥٥ | ٢٧ | ٣٩ | ١٨ | ٣٦ | ٢٩ | ٢٨ | ٢٨ | ٣٨ | ٣٩ | ٣٩ | ٣٦ | ٢٤ | | | | | ٤٥٦ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | ٥٢ | ٣٦ | ٢٣ | ١٧ | ٣٧ | ٢٨ | ٢٥ | ٢٦ | ٢٠ | ١٩ | ٢٤ | ٢٦ | ٣٤ | ٢٨ | ٢٨ | ٦ | | | ٤٢٩ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | ١٧ | ٢٣ | ١٢ | ٢٣ | ٢٦ | ٣١ | ٢٧ | ٢٩ | ٢١ | ٢٢ | ٥٩ | ٤٩ | ٦٧ | ٣٩ | ٢٤ | ١٢ | | | ٤٨١ |
| ٢٠١٣-٢٠١٤ | ٢٧ | ٢٠ | ٣٩ | ٢٢ | ١٩ | ٢٨ | ٥٦ | ٦٠ | ٣٣ | ٢٢ | ٥٦ | ٧١ | ٦٧ | ٦١ | ٢٠ | ١٣ | | | ٦١٤ |
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | ٤٩ | ٧٢ | ٥٥ | ٤٦ | ٣٥ | ٥٠ | | | ٣٠ | ٢٠ | | | | | ١٣ | ١٣ | ٩ | ٣١ | ٤٢٣ |
| كۆما گشت سالان | ٣٢١ | ٤٦٠ | ٢٨٤ | ٣٠٨ | ٢٢٨ | ٣٣٤ | ٢٥٥ | ٢١٣ | ١٣٧ | ١٤٩ | ١٩٦ | ٢٠٦ | ٢٣٠ | ١٦٤ | ٧٢ | ٣١ | ٩ | ٣١ | ٣٦٢٨ |
| كۆما گشتی | ٧٨١ | | ٥٩٢ | | ٥٦٢ | | ٤٦٨ | | ٢٨٦ | | ٤٠٢ | | ٣٩٤ | | ١٠٣ | | ٤٠ | | ٣٦٢٨ |

## پشکێن کولیژا ئادابێ:

### ١- پشکا زمانێ کوردی:

ڤەکرنا پشکا زمانێ کوردی دگەل دامەزراندنا کولیژێ بوویە، و ل ئێکەم وەرزێ خۆ یێ خواندنێ پێشوازی ل خویندکاران کرییە.

### ٢- پشکا مێژوو:

ئەوژی دگەل دامەزراندنا کولیژێ بوویە[٣٩].

### ٢- پشکا ئابووری:

ئەڤ پشکە ل وەرزێ خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ێ هاتییە ڤەکرن، لێ پشتی کولیژا کارگێری و ئابووری هاتییە دامەزراندن، پشکا ئابووری چوویە سەر ب کولیژا ناڤبری ڤە و ژ کولیژا ئادابێ ڤەبوو[٤٠].

### ٣- پشکا زمانێ ئنگلیزی:

ئەڤ پشکە ل وەرزێ خواندنێ ١٩٩٥ - ١٩٩٦ێ هاتییەدانان، و ژ بەر نەبوونا مامۆستایێن بسپۆر خویندکار ل وەرزێ ناڤبری نەهاتنە وەرگرتن، لێ پشتی پەیدابوونا مامۆستایێن پێدڤی ل سالا خواندنێ ١٩٩٦-١٩٩٧ێ ئێکەم دەستەیا خویندکاران وەرگرتییە[٤١].

### ٤- پشکا مامۆستایان:

پشکا مامۆستایان ل سالا خواندنێ ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ێ هاتییەدانان، و ل ٢٠٠٣/٨/١٧ێ ئەوژی بناڤێ کولیژا پەروەردا بنیات بوویە ئێك ژ کولیژێن زانکۆیا دهۆك.

٥- ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٢ -٢٠٠٣ێ پشکا زمانێ ئنگلیزی ئێڤاران هاتییەدامەزراندن، و ل هەمان وەرزێ خواندنێ ئێکەم پۆستێ خویندکاران وەرگرتییە. پشتی سالا خواندنێ ٢٠٠٢ - ٢٠٠٣ێ کولیژا ئادابێ پێشوازی ل خویندکاران نەکر ژ بەر هندەك ئەگەرێن تەکنیکی و دروسبوونا کولیژا پەروەردە ژ ئەنجامێ ئێککرتنا هەردو کولیژێن (ئاداب و زانست)، بەلێ ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ێ و ل دووڤ رازیبوونا سەرۆکاتییا ئەنجومەنی وەزیران/جڤاتا خواندنا بالا ب نڤیسارا ژمارە (١٠٦١) ل رێکەفتی ٢٠٠٣/٨/١٧ێ دوبارە خویندکار هاتنە وەرگرتن[٤٢]. و بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ پشکا جۆگرافی هاتییەڤەکرن و ل هەمان سال خویندکار لێ هاتینە وەرگرتن، و ل سالا خواندنێ ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ێ پشکا زمانێ کوردی و مێژوو ئێڤاران هاتینە دانان، و سالا دووڤدا ٢٠٠٧ — ٢٠٠٨ێ پشکا شانۆ هاتییە دامەزراندن، لێ خویندکار بۆ وەرزێ دووڤدا ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ێ لێ هاتنە وەرگرتن[٤٣].

ل وەرزێ خواندنێ ٢٠١٠ - ٢٠١١ێ و پشتی کو سیستەمێ کارگێری یێ نوو ل زانکۆیا دهۆك هاتییە پەیرەوکرن، زانکۆیا دهۆك ژ (١٧) کولیژان بوویە (٨) فاکولتی، کولیژا ئادابێ و کولیژا یاسا و کولیژا کارگێری و ئابووری بووینە سکۆل و چووینە سەر ب (فاکولتییا زانستێن مرۆڤایەتی) ڤە، زێدەباری دو سەنتەرێن زانستی ژی بخۆ ڤە دگرت ئەوژی (سەنتەرێ ڤەکۆلینێن کوردی و سەنتەرێ خواندنێن ئەوروپی)[٤٤].

ل وەرزێ خواندنێ ٢٠١١-٢٠١٢ێ فاکولتییا زانستێن مرۆڤایەتی بتنێ سکۆلا ئاداب بخۆڤە دگرت پشتی هەردو سکۆلێن یاسا و کارگێری و ئابووری ژ فاکولتییا زانستێن مرۆڤایەتی ڤەقەتیاین و بووینە فاکولتییەکا جودا بناڤێ فاکولتییا (یاسا و کارگێری)[٤٥]. و هەر بۆ سالا خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ سەنتەرێ خواندنێن کۆمەلایەتی دگەل سێ پشکێن زانستی (پشکا وەرگێرانێ و پشکا زانستێن رامیاری و پشکا زانستێن کۆمەلناسی) ل فاکولتییا زانستی مرۆڤایەتی هاتنە ڤەکرن. و بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ پشکا هونەرێن شێوەکاری ژی هاتییە دامەزراندن، و ل هەمان سال ناڤێ پشکا شانۆ هاتە گوهارتن و بوویە (پشکا دراما)[٤٦].

## ٥- کولیژا کارگێری و ئابووری:

کولیژا کارگێری و ئابووری دووڤ بریارا جڤاتا فێرکرنا بلند - هەرێما کوردستانێ ژمارە (٣) رۆژا ١٩٩٦/١٢/٣١ێ هاتییە دانان، دەستپێکی ژ دو پشکان پێکدهات (پشکا ئابووری و پشکا یاسا)[٤٧].

سیستەمێ خواندنێ سالانەیە و ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٤) سالن، خویندکارێ دەرچوونێ ژێ دکەت باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب سپۆریێ ب دەستخۆڤە دئینیت[٤٨].

## پشکێن کولیژێ:

### ١- پشکا ئابووری:

پشکا ئابووری پێشتر ل سالا خواندنێ ١٩٩٥-١٩٩٦ێ سەر ب کولیژا ئادابێ ڤە هاتبوو ڤەکرن، دووڤدا چوویە سەر ب کولیژا کارگێری و ئابووری ڤە پشتی ئەڤ کولیژە ل سالا خواندنێ ١٩٩٧-١٩٩٨ێ دگەل پشکا یاسایێ هاتییە دانان.

### ٢- پشکا یاسا:

پشکا یاسا دگەل دامەزراندنا کولیژا کارگێری و ئابووری هاتییەڤەکرن[٤٩] و ل سالا خواندنێ ١٩٩٠-٢٠٠٠ێ ئەڤ پشکە بوویە کولیژەکا خۆسەر و ب ناڤێ کولیژا یاسا و رامیاری هاتییە دامەزراندن[٥٠].

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن کولیژا کارگێری و ئابووری ل دووڤ پلێن زانستی و سالێن خواندنێ ١٩٩٧ - ١٩٩٨ تاکو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هاریکار | مامۆستا | مامۆستایێ هاریکار | کۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٧ – ١٩٩٨ | | ٣ | ٢ | ١١ | ١٦ |
| ١٩٩٨ - ١٩٩٩ | | ٣ | ٤ | ٩ | ١٦ |
| ١٩٩٩ - ٢٠٠٠ | | ٣ | ٥ | ١٢ | ٢٠ |
| ٢٠٠٠ – ٢٠٠١ | | ٣ | ٦ | ١٢ | ٢١ |
| ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ | | ٣ | ٦ | ١٢ | ٢١ |
| ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ | | ٢ | ٥ | ١١ | ١٨ |
| ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤ | | ٢ | ٥ | ١٦ | ٢٣ |
| ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ | | ٣ | ٤ | ١٥ | ٢٢ |
| ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ | | ٣ | ٧ | ٢٥ | ٣٥ |
| ٢٠٠٦ – ٢٠٠٧ | | ٥ | ١٠ | ٣٦ | ٥١ |
| ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ | ٢ | ١٥ | ١١ | ٤٢ | ٧٠ |
| ٢٠٠٨ – ٢٠٠٩ | ٢ | ١٠ | ١٠ | ٤٦ | ٦٨ |
| ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ | ٢ | ١١ | ١١ | ٤٤ | ٦٨ |
| ٢٠١٠ – ٢٠١١ | ٢ | ١٠ | ١٠ | ٥٦ | ٧٨ |
| ٢٠١١ – ٢٠١٢ | ٣ | ٩ | ١١ | ٦٨ | ٩١ |
| ٢٠١٢ – ٢٠١٣ | ٤ | ٨ | ١٧ | ٧٧ | ١٠٦ |
| ٢٠١٣ – ٢٠١٤ | ٤ | ٧ | ٢٠ | ٩٥ | ١٢٦ |
| ٢٠١٤ - ٢٠١٥ | ٣ | ٩ | ١٩ | ٨٤ | ١١٥ |
| کۆژمێ گشتی | ٢٢ | ١٠٩ | ١٦٣ | ٦٧١ | ٩٦٥ |

زانکۆ ) هاتییە گوهۆرین بۆ (زانکۆیا نەورۆز) کو ل وی دەمی چوار کولیژ بخۆڤە دگرتن ( کولیژا یاسا و رامیاری، کولیژا کارگێری و ئابووری، کولیژا کۆمپیوتەر و تەکنەلۆجیا پێزانینان، و کولیژا زمان)، ئانکو ئەو پشکێن کولیژا دهۆك یا زانکۆ بووینە کولیژ[135]. هەژی ئاماژێ یە کو دەرچوویێن کولیژێن زانکۆیا نەورۆز باوەرنامەیا (بەکالۆریۆس) ل دووڤ بسپۆریێ پێ دهێتە بەخشین[136].

زانکۆیا نەورۆز هەر ژ دەستپێکێ د وەراێ دابوو و هەولدایە ژ هەمی لایەنا ڤە پێش بکەڤیت نەخاسمە ژلایی زانستی و کوالیتیێ ڤە، لەورا پشتی وێ هەلسەنگاندنا ژ لایێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ڤە بۆ سالا خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ هاتییە ئەنجامدان، زانکۆیا نەورۆز د ریزبەندییا وەزارەتێ دا پلا دوێ ل سەر ئاستێ زانکۆیێن تایبەت (ئەهلی)، و ب پلا ئێکێ دووڤ بەرنامێ دلنیایی جۆری ب دەستڤەئینا. دیسان ژ پلانێن پێشخستنا پرۆسا خواندنێ ل زانکۆیا نەورۆز، هەر ژ سالا خواندنێ ٢٠١٠ - ٢٠١١ێ دەست ب پرۆگرامێ شاندنا خویندکارێن سەرکەفتیێن ئێکێ ل هەمی کولیژێن زانکۆیێ ژ بۆ خواندنا بلند ژ دەرڤەی کوردستانێ کرییە، و (١٢) خویندکار ژ دەرچوویێن ئێکێ هنارتینە پەیمانگەها (سبینگەر) یا بریتانی، و (٢٩) بۆ زانکۆیا (شتندل) یا ئەلمانی. هەروەسا ژ بۆ هاندانا خویندکاران تاکو ب شێوازێ پێشبرکێیا زانستی ئاستێ خۆ و زانکۆیێ پێشبێخن، زانکۆیا نەورۆز هەر ژ دامەزراندنێ رابوویە ب لێبوورینا رێژەکێ ژ بهایێ پارەیێ سالانە، بۆ خویندکارێن سەرکەفتیێن ئێکێ ل هەمی پشکا ب رێژەیا (١٠٠٪) و سەرکەفتیێن دوێ ب رێژەیا (٥٠٪) و یێن سیێ ب رێژەیا (٢٥٪)[137].

وەك مە ل پێشتر ئاماژە پێدایێ کو زانکۆیا نەورۆز ژ لایێ زانستی ڤە سال بۆ سالێ د وەرارێ دا بوویە، ئەو بوو ل سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ شیایە پشکا (پەیوەندیێن نیڤ دەولەتی) ل کولیژا یاسا و رامیاری، کو خویندکارێن دەرچوویێن ئامادەیی یێن هەردو پشکێن زانستی و وێژەیی وەردگریت. و پشکا (کارگێری کار، و زانستێن دراڤی و بانکی) ل کولیژا کارگێری و ئابووری[138]. و پشکا (ئەندازیاریا کۆمپیوتەر و گەیاندنێ) ل کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری و تەکنەلۆجیا پێزانینان ب دامەزرینیت[139]. و سەبارەت شێوازێ وەرگرتنا خویندکاران ل کولیژا کارگێری و ئابووری، بۆ خواندنێن سپێدەهییان دەرچوویێن ئامادەیی یێن هەمان سالا خواندنێ ب هەردو پشکێن زانستی و وێژەیی زێدەباری دەرچوویێن ئامادەیا بازرگانی لێ دهێنە وەرگرتن، و بۆ خواندنێن ئێڤاران دورچوویێن ئامادەیی یێن سالێن بووری لێ دهێنە وەرگرتن[140].

ل سالا خواندنێ ٢٠١٣-٢٠١٤ێ کولیژا ئەندازیاری هاتییەدانان، و ژ دو پشکا پێك هاتییە (ئەندازیاریا کۆمپیوتەری و ئەندازیاریا تەلار سازی)[141]، و پشکا ئابووری ژێ ل کولیژا کارگێری و ئابووری هاتییەڤەکرن[142]. و دەربارەی خواندنا بلند زانکۆیا نەورۆز شیایە ل سالا ٢٠١٣ێ دەرگەهێ خواندنا ماستەرێ ڤەکەت، ئەوژی ب هەڤکاری دگەل زانکۆیا ئەسکەندەریە یا مسری د بسپۆرییا یاسا، ئابووری، کارگێری کار، و زمانێ ئنگلیزی، کو خواندن دناڤ زانکۆیا نەورۆز دا بوویە، و ل دووڤ وێ رێکەفتنا هاتییە ئیمزاکرن دناڤبەرا هەردو لایەنا دا ل رێکەفتی ٢٠١٢/٦/٧ێ و ژ لایێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ل حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ باوەری پێ هاتییەکرن ل دووڤ نڤیسارا رێڤەبەرییا ناردن و پەیوەندیێن رەوشنبیری ژمارە (٩٢٠٣٣) ل رێکەفتی ٢٠١٢/١٠/١٤ێ، و ل دووڤ فەرمانا وەزاری ژمارە (١١٦٠٢) ل رێکەفتی ٢٠١٣/٩/١٨ێ ئێکەم گەرا خویندکاران هاتینە وەرگرتن کو ژمارا وان پێنج خویندکار بوون. هەروەسا ژ بۆ هاندان و پێشڤەبرنا ئاستێ زانستیێ کادرێ فێرکرنێ ل زانکۆیێ، ب فەرمانەکا جڤاتا زانکۆیێ ئەوا ل نیسانا سالا ٢٠١٤ێ هاتییە دەرکرن، بریار هاتییەدان خویندکارێن خواندنا ماستەرێ د ڤی پرۆگرامی دا ب رێژا (٥٠٪)ێ ژ کرێێن خواندنێ بهێنە لێبوورین[143].

هەروەسا ل سالا ٢٠١٣ێ کولیژا یاسا و رامیاری کونفرانسێ خۆ یێ زانستی یێ ئێکێ ب بەشدارییا

دەهــان ڤـەكـۆلـيـنـێن زانسـتـی ژ لايــێ ڤـكـۆلـەرێن ئەكاديمـی يێن ناڤخـۆيی و ژ دەرڤەی كـوردسـتـانـێ گێرا[144]. ديسـان كـوليـژا كـارگـێری و ئابووری ژی سـێ كـونفرانسـێن زانسـتـی سـازكـرينە، يێ ئێـكـێ ل سـالا خـواندنـێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ و يێ دوێ ل سـالا خـواندنـێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ و يێ سـێـێ ل سـالا خـواندنـێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤[145].

ژ دەسـتـكـەفـتـيـێن زانـكـۆيا نەورۆز ل سـالا خـواندنـێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ ڤـەكـرنا سـەنتـەرێ ڤـەكـۆلـيـنـێن زانسـتـی ژ بۆ دروسـتـكـرن و ئەنجامـدانانا ڤـەكـۆلـيـنـێن زانسـتـی يێن جـۆرا و جـۆر و د هـەمـی بـياڤـان دا، هـەرەسـا خـۆ ئامادەكـرن ژ بـۆ ڤـەكـرنا خـواندنا بـلـنـد (مـاسـتـەر) ل دووڤ ياسـايا زانـكـۆيێن تايبـەت ل هـەرێما كـوردسـتـانـێ يا ژمارە (٦٥) يا سـالا ٢٠١٣ێ[146].

د بـياڤـێ پرۆتـۆكـولـێن زانسـتـی دا، زانـكـۆيا نـەورۆز گـرێبـەسـتـەك دگــەل رێـكـخـراوا (USAID) يا ئەمريكـی و ڤـەكـرنا كـلـيـنـەكـەكا ياسـايی دگـەلدا، و ژ بـۆ بهـێـزكـرنا ئاسـتـێ خـويندكـارێن كـوليـژا ياسـا و راميـاری (پشـكـا ياسـا) بـوارێ پراكـتـيـكـی دا، ئەڤـە و دگـەل ڤـەكـرنا خـواندنێن بـلـنـد ل كـوليـژا ياسـا و راميـاری ل هـەردو بەشـێن (ياسـا تايبـەت و ياسـا گـشـتـی) د چارچووڤـێ خـواندنێن بـلـنـد ل زانـكـۆيا دهـۆك. ديسـان ل هـەمـان سـال و ژ بـۆ پـێـشـخـسـتـنا ئاسـتـێ زانسـتـی و بەرچاڤـكـن و بەلاڤـكـرنا بابـەت و ڤـەكـۆلـيـنـێن زانسـتـی، كـوليـژا كـارگـێری و ئابووری كـۆڤـارەكا وەرزی بـناڤـێ (پێنـۆسـێ نەورۆز) دەرکـريـيـە. هـەژی ئامـاژێ يە كـو ل هـەمـان سـالا خـواندنـێ و ژ بـۆ بـەرزكـرنا هـەڤـركـيـيا زانسـتـی دناڤـبـەرا خـويندكـاران دا هـۆبەكـا خـويندكـارێن نموونەيی ل كـوليـژا كـارگـێری و ئابووری پشـكـا (ئابوور) هاتييەڤـەكـرن[147].

پـێدڤـی دياركـرنـێ يە كـو سـيـسـتـەمـێ خـواندنـێ ل زانـكـۆيا نەورۆز سـالانە يە، و سـالا خـواندنـێ ل ٩/١ ژ هـەر سـالـەكـێ دەسـتـپـێدكـەت. ماوەيێ خـواندنـێ ل گـشـت پـشـكـێن زانـكـۆيێ چـوار سـالـن، ژبلی پـشـكـا ئەندازياريا بـيـناسـازی (تـەلارسـازی) كـو مـاوەيـێ خـواندنـێ تێدا پێنج سـالـن[148].

و ژ بۆ بەرهەڤـكـرنا مامۆسـتايێن خـۆ، زانـكـۆيا نەورۆز سـياسـەتـەك پەيرەوكـرييە ئەوژی ب رێـكـا پالپشـتـيـكـرنا مامۆسـتا و فـەرمانبـەر و ڤـەگـێرێن سـەر ب زانـكـۆيێ ڤـە ژ بۆ تـەمامـكـرنا خـواندنا بـلـنـد (ماسـتـەر و دكـتـۆرا) ژ دەرڤـەی كـوردسـتـانـێ دگـەل دابينكـرنا هـەمـی پێدڤـيێن دارايی و ل سـەر كـيـسـتـێ زانـكـۆيێ[149].

## ئێكەم جڤاتا زانكۆيا نەورۆز:

١- د. ئازاد ئەحـمـەد سـەعدون سـەرۆكـێ زانـكـۆيێ سـەرۆكـێ جـڤـاتـێ

٢- د. هـيـثـم تاها مـحـەمـەد عـەلـی هـ سـەرۆكـێ زانـكـۆيێ بريـاردەرێ جـڤـاتـێ

٣- د. جـەلال حـسـێن عـنز راگـرێ كـوليـژا ياسـا و راميـاری ئەندام

٤- د. سـەمير فـەخری نعـمە راگـرێ كـوليـژا كـارگـێری وئابووری ئەندام

٥- د. عدی جـەمال فـەوزی راگـرێ كـوليـژا كـۆمـپـيـوتـەر و تـەكـنـەلـۆجـيا پێزانينا ئەندام

٦- عـەبـدوللا ئەحـمـەد عـبـدالرحـيـم سـەرۆكـێ سـەنديكـا ئابووريناسـێن كـوردسـتـانێ/لقـێ دهـۆك ئەندام و لايەنـی پارەدەر

### رێككەفتنێن زانستی و رەوشەنبیری یێن زانكۆیا نەورۆز دگەل:

١- زانـكـۆيا ليـسـتـر يا بريتانی ل رێـكـەفـتـی ٢٠١١/٦/٧.

٢- زانـكـۆيا زانسـتـێن كـارەكـی ل درسـدن يا ئەلمانی ل ريـكـەفـتـی ٢٠١١/٧/٩.

٣- زانـكـۆيا زانسـتـێن كـارەكـی - مـيـگـدبـۆرج يا ئەلمانی ل رێـكـەفـتـی ٢٠١١/١٠/١٨.

٤- زانـكـۆيا ئەسـكـەندەری يە / مسـر ل رێـكـەفـتـی ٢٠١٢/٦/٧.

٥- زانـكـۆيا گـرينويج يا بريتانی ل رێـكـەفـتـی ٢٠١٢/١٠/١.

٦- زانـكـۆيا تـوروس يا توركـی ل رێـكـەفـتـی ٢٠١٢/١١/١٨.

٧- زانـكـۆيا رۆژهەلاتا ناڤـين يا توركـی (قبرص) ل رێـكـەفـتـی ٢٠١٢/١٢/١.

٨- زانکۆیا UCSI یا مالیزی ل رێکەفتی ٢٠١٢/١٢/١٥.

٩- زانکۆیا مشیگان یا ئەمریکی ل رێکەفتی ٢٠١٣/٢/٤..

١٠- زانکۆیا اورال فلیشا یا رومانی ل رێکەفتی ٢٠١٣/٦/٢٤.

١١- زانکۆیا دهۆك / هەرێما کوردستانا عیراقێ ل رێکەفتی ٢٠١٥/٧/٦.

## کولیژێن زانکۆیا نەورۆز: خواندنێن سپێدەهییان:

**١- کولیژا یاسا و رامیاری/ خواندنێن سپێدەهیان،**

بنیاتێ کولیژا یاسا و رامیاری دزڤریت بۆ پشکا یاسایی/خواندنێن سپێدەهییان ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥- ٢٠٠٦ێ ل کولیژا دهۆك یا زانکۆ دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کری، کو ل وی دەمی (١٢١) خویندکار ژ کور و کچێن هەرێما کوردستانێ لێ هاتبوونە وەرگرتن. هەژییە دیار بکەین کو پتر ژ ٥٠٪ ێ ژ وان خویندکاران خەلکێ پارێزگەهێن هەولێر و سلێمانی و کەرکۆکێ بوون، چونکی ئەڤ پشکە ئێکەم پشکا یاسایی بوو بۆ خواندنا سپێدەهییان ل کەرتێ تایبەت ل سەرتاسەری کوردستانێ، یا فەرە ئاماژێ پێ ب دەین کو گەرا ئێکێ و دوێ ژ وان خویندکارێن ل ڤێ پشکێ هاتینە وەرگرتن ب رێکا رێڤەبەریا وەرگرتنا ناڤەندی بوویە[١٥٠].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا یاسا و رامیاری/ خواندنێن سپێدەهییان و ئێڤاران:

١- د. جەلال حسێن عنز راگرێ کولیژێ سەرۆکێ جڤاتێ

٢- م. ئەحمەد مستەفا عەلی هـ راگرێ کولیژێ بریاردەرێ جڤاتێ

٣- د. خالدة زەنون مەرعی نوینەرا مامۆستایان بۆ خواندنا ئێڤاران ئەندام

٤- د. مەجید خضر ئەحمەد نوینەرێ مامۆستایان بۆ خواندنا سپێدەهییان ئەندام

٥- نوینەرێ خویندکاران بۆخواندنا سپێدەهییان

٦- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنا ئێڤاران

**٢- کولیژا کارگێری وئابووری/خواندنێن سپێدەهییان،**

بنیاتێ کولیژا کارگێری وئابووری دزڤریت بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ کو ل وی دەمی بناڤێ پشکا ئابووری بوویە و سەر ب کولیژا دهۆك یا زانکۆ ڤە بوو، و بتنێ (٢١) خویندکار ژ هەردو رەگەزان هاتبوونە وەرگرتن، هەژی یە دیار بکەین کو نێزیکی ٥٠٪ ێ ژ وان خویندکارێن هاتینە وەرگرتن ژ ئامادەیا بازرگانی بوون، یێن دیتر ژ دەرچوویێن ئامادەیی ب هەردو لقێن زانستی و وێژەیی بوون. لەورا وەرگرتنا خویندکاران ب رێژەکا بەرچاڤ زێدەبوو و پشکا ئابووری بەرفرەهـ بوو، ژمارا خویندکاران ل سالا خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ گەهشتنە (٤٦٣)ێ خویندکاران ژ کور و کچان. و هەرسێ دەرچوویێن ئێکێ ل سەر ئاستێ کولیژا کارگێری وئابووری و کولیژێن دیتر دهێنە دامەزراندن ل سەر میلاکێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی وەك ڤەکێر (معید) ل کولیژێن خۆ، هەر وەکی زانکۆیێن میری[١٥١].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا کارگێری و ئابووری/خواندنێن سپێدەهییان و ئێڤاران:

١- د. سەمیر فەخری نعمە راگرێ کولیژێ سەرۆکێ جڤاتێ

٢- م. عەبدولرزاق عەزیز حەسەن هـ راگری بریاردەرێ جڤاتێ

٣- م. کسرا عنتەر عەبدوللا نوینەرا مامۆستایان بۆ خواندنا ئێڤاران ئەندام

٤- م. هاشم محەمەد سەعید نوینەرێ مامۆستایان بۆ خواندنا سپێدەهییان ئەندام

٥- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنا سپێدەهیان ئەندام

٦- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنێن ئێڤاران ئەندام

### ٣- کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری و تەکنەلۆجیا پێزانینان/خواندنێن سپێدەهیان:

دامەزراندنا کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری و تەکنەلۆجیا پێزانینان تەمامکەرا پشکا کۆمپیوتەری یە ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ ل کولیژا دهۆك یا زانکۆ هاتییە ڤەکرن، کو ل وی دەمی پێشوازیا (٤٥) خویندکاران ژ کور و کچێن هەرێما کوردستانی و پارێزگەهێن دیتر ژ دەرڤەی هەرێما کوردستانی کری، یا زانایە کو ڤێ پشکێ هەر ل دەستپێکا دامەزراندنێ و بۆ قۆناغێن دووڤدا پشت بەستن ل سەر پرۆگرامێن خواندنێ یێن کارپێکری ژ لایێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ل هەرێما کوردستانێ کریە[152]، و ل دووڤدا ئەڤ پشکە بەرفرەهبوویە تاکو بوویە بنیاتێ خواندنێن سپێدەهیان ل کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری و تەکنەلۆجیا پێزانینا ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ ژمارا خویندکارێن وێ گەهشتییە (١٥٩) خویندکاران ژ هەردو رەگەزا[153].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری و تەکنەلۆجیا پێزانینان/خواندنێن سپێدەهیان و ئێڤاران:

١- د. عودەی جەمال فەوزی راگرێ کولیژێ سەرۆکێ جڤاتێ
٢- م. نەدێ ایلیا توفیق هـ. راگری بریاردەرێ جڤاتێ
٣- م. لەمیس نزار مەتی نوینەرا مامۆستایان بۆ خواندنا سپێدەهیان ئەندام
٤- م. ئەحمەد یوسف یونس نوینەرێ مامۆستایان بۆ خواندنا ئێڤاران ئەندام
٥- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنێن سپێدەهیان
٦- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنێن ئێڤاران

٤- کولیژا زمان/خواندنێن سپێدەهیان و ئێڤاران:

پشکێن کولیژا زمان:

### ١- پشکا زمانێ ئنگلیزی:

ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ کولیژا زمان ب هەردو خواندنێن سپێدەهیان و ئێڤاران هاتییەدامەزراندن، و تنێ ب ئێك پشك دەستپێکرییە ئەوژی پشکا زمانێ ئنگلیزی بوویە. ڤێ پشکێ ل خواندنا سپێدەهیان (٣٠) خویندکار ژ هەردو رەگەزا وەرگرتینە و ل خواندنێن ئێڤاران (٢٧) خویندکار بووینە. خویندکارێن دەرچوویێن ئامادەیی ب هەردو پشکێن زانستی و وێژەیی ل ڤێ پشکێ دهێنە وەرگرتن، ماوەیێ خواندنێ چوار سالن و دەرچوویێن وێ باوەرنا ما بەکالۆریۆس ب ئەدەب و زمانێ ئنگلیزی ب دەستخۆڤە دئینیت، کولیژا زمان تاقیگەهەکا دەنگی دروستکرییە و دهێتە هژمارتن ئێکەمین تاقیگەهـ ل سەر ئاستی عیراقی هاتییە دانان ژ بەر کو یا پێکهاتییە ب نویترین ئامیرێن پێشکەفتی[154].

### ٢- پشکا زمانێ کوردی:

ل وەرزێ خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ پشکا زمانێ کوردی هاتییەدامەزراندن و پێشوازی ل خویندکاران کرییە، خویندکارێن دەرچوویێن ئامادەیی ب هەردو پشکێن زانستی و وێژەیی ل ڤێ پشکێ دهێنە وەرگرتن، ماوەیێ خواندنێ چوار سالن و دەرچوویێن وێ باوەرنا ما بەکالۆریۆس ب ئەدەب و زمانێ کوردی پێ دهێتە بەخشین[155].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا زمان/خواندنا سپێدەهیان و ئێڤاران:

١- د. ئازاد ئەحمەد سەعدون راگری کولیژێ ب وەکالەت سەرۆکێ جڤاتێ
٢- م. تارق ئیبراهیم فنوش هـ. راگری بریاردەرێ جڤاتێ
٣- مەحمود حاجی سەلیم نوینەرێ مامۆستایان بۆ خواندنا/ سپێدەهیان و ئێڤاران ئەندام
٤- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنا سپێدەهیان ئەندام
٥- نوینەرێ خویندکاران بۆ خواندنا ئێڤاران ئەندام

## خواندنێن ئێڤاران:

### ١- كولیژا یاسا و رامیاری:

ل سالا ٢٠٠٩ێ كولیژا یاسا و رامیاری هاتییەدامەزراندن وەك درێژەپێدەرا پشكا یاسا ئەوا ل سەردەمێ كولیژا دهۆك یا زانكۆ یا كو ل سالا ٢٠٠٤ێ ب خواندنێن ئێڤاران دەستپێكری، كو ل وی دەمی (٣٠٤) خویندكار ژ هەردو رەگەزا بێن كو دەلیڤا خواندنێ ژ دەستداین لێ هاتبوونە وەرگرتن، و بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ (٦٠٠) خویندكار ل ڤێ كولیژێ هاتینە وەرگرتن[١٥٦].

### ٢- كولیژا كارگێری و ئابووری:

كولیژا كارگێری و ئابووری ژی ل سالا ٢٠٠٩ێ هاتییەدامەزراندن، وەك درێژە پێدەرا پشكا ئابووری یە یا خواندنا ئێڤاران ئەوا ل سالا ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ێ و سەر ب كولیژا دهۆك یا زانكۆ ڤە هاتییەڤەكرن، كو ل وی دەمی (٤٦) خویندكار ژ كور وكچان لێ هاتبوونە وەرگرتن. بۆ قۆناغێن دووڤدا ئەڤ پشكە بەرفرەهبوویە تاكو بوویە بنیاتێ كولیژا كارگێری و ئابووری/خواندنێن ئێڤاران، و ژمارا خویندكارێن ل سالا ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ لێ هاتین وەرگرتن (٤٦٨) خویندكار بوون ژ هەردو رەگەزا[١٥٧].

### ٣- كولیژا زانستێن كۆمپیۆتەری و تەكنەلۆجیا پێزانینان:

كولیژا زانستێن كۆمپیۆتەری و تەكنەلۆجیا پێزانینان درێژە پێدەرا پشكا كۆمپیۆتەری یە/خواندنێن ئێڤاران ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ ل كولیژا دهۆك یا زانكۆ هاتییەڤەكرن، كو ل وی دەمی ڤێ پشكێ ل ئێكەم خۆلا خۆ بتنێ (٢٥) خویندكار ژ هەردو رەگەزا وەرگرتبوون، بۆ سالێن پاشتر ئەڤ پشكە بەرفرەهبوویە و بوویە بنیاتێ كولیژا زانستێن كۆمپیۆتەری و تەكنەلۆجیا پێزانینان ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ هاتییەدامەزراندن و ژمارا خویندكارێن ل هەمان سال لێ هاتینە وەرگرتن گەهشتییە (١٢٥) خویندكاران[١٥٨].

خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن زانكۆیا نەورۆز ل دووڤ سالێن خواندنێ ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ تاكو ٢٠١٤- ٢٠١٥

| سالێن خواندنێ | یاسا و رامیاری | كارگێری و ئابووری | زانستێن كۆمپیۆتەری | زمان | ئەندازیاری | كۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ | ١٢ | ٦ | | | | ١٨ |
| ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ | ١٢ | ٦ | ٥ | | | ٢٣ |
| ٢٠٠٦ – ٢٠٠٧ | ٢١ | ١٠ | ٤ | | | ٣٥ |
| ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ | ١٩ | ١١ | ٩ | | | ٣٩ |
| ٢٠٠٨ – ٢٠٠٩ | ٢٠ | ١٧ | ١٢ | | | ٤٩ |
| ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ | ٢٤ | ١١ | ١١ | ٦ | | ٥٢ |
| ٢٠١٠ – ٢٠١١ | ٢٩ | ٢٤ | ١٦ | ١٠ | | ٧٩ |
| ٢٠١١ – ٢٠١٢ | ٣٥ | ٦٠ | ١٦ | ١٠ | | ١٢١ |
| ٢٠١٢ – ٢٠١٣ | ٤٠ | ٧٠ | ١٥ | ١١ | ٨ | ١٤٤ |
| ٢٠١٣ – ٢٠١٤ | ٥١ | ٩١ | ١٦ | ٢٤ | ٢٨ | ٢١٠ |
| ٢٠١٤ - ٢٠١٥ | ٤٠ | ٩٣ | ١٢ | ٢٢ | ٣٢ | ١٩٩ |
| كۆژمێ گشتی | ٣٠٣ | ٣٩٩ | ١١٦ | ٨٣ | ٦٨ | ٩٦٩ |

## ٤- کولیژا ئەندازیاری:

کولیژا ئەندازیاری ل سالا ٢٠١٣ێ ل زانکۆیا نەورۆز هاتییەدامەزراندن، ب دو پشکا دەستپێکرییە (پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەری و گەیاندنێ ئەوا ل سالا ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ هاتییە ڤەکرن کو ل وی دەمی سەر ب کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری ڤە بوو، و پشکا بیناسازی (تەلارسازی) یا کو ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ – ٢٠١٤ێ هاتییە دروستکرن[١٥٩].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا ئەندازیاری:

١- پ. هـ. عەبدولئەمیر سهم رسن راگرێ کولیژێ سەرۆکێ جڤاتێ

٢- د. محەمەد جاسم محەمەد جاسم سەرۆکێ پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەری بریاردەرێ جڤاتێ

٣- د. زەینەب راضی عەباس سەرۆکێ پشکا ئەندازیاریا تەلارسازی ئەندام

٤- د. ئیبراهیم عومەر شێخو نوینەرێ مامۆستایان ل پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەری ئەندام

٥- د. فراس ئەحمەد مەجید نوینەرێ مامۆستایان ل پشکا ئەندازیاریا تەلارسازی ئەندام

٦- نوینەرێ خویندکاران ئەندام

## پشکێن کولیژا ئەندازیاری:

### ١- پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەر و گەیاندنێ:

ل سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەر و گەیاندنێ ل کولیژا زانستێن کۆمپیوتەری هاتییە دامەزراندن و بۆ سالا پاشتر ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ هاتییە ڤەگوهاستن و چوویە سەر ب کولیژا ئەندازیاری ڤە[١٦٠]، وەرگرتنا خویندکاران ل پشکا ئەندازیاریا کۆمپیوتەر و گەیاندنێ خویندکارێن دەرچوویێن ئامادەیی لقێ زانستی دگەل رێژەکا دیارکری ژ دەرچوویێن پشکا کۆمپیوتەری ژ

خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن زانکۆیا نەورۆز ل دووڤ سالێن خواندنێ ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥

| سالێن خواندنێ | | پشکا یاسا | | پشکا کارگێری و ئابووری | | پشکا ز. کۆمپیوتەر | | پشکا ئنگلیزی | | کوژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژ. ئێڤاری | ژ. سپێدێ | ژ. ئێڤاری | ژ. سپێدێ | ژ. ئێڤاری | ژ. سپێدێ | ژ. ئێڤاری | ژ. سپێدێ | | |
| ٢٠٠٧ -٢٠٠٦ | ٩٤ | | | | | | | | ٩٤ | |
| ٢٠٠٨ -٢٠٠٧ | ١٩٢ | | | ٣٧ | | | | | ٢٢٩ | |
| ٢٠٠٩ -٢٠٠٨ | ١١٦ | ٨٤ | ١٤ | ١٦ | ٢٤ | ٣٥ | | | ٢٨٩ | |
| ٢٠١٠ -٢٠٠٩ | ١٢٢ | ٩٩ | ٣٠ | ٣٥ | ٢٨ | ٣٣ | | | ٣٤٧ | |
| ٢٠١١ -٢٠١٠ | ١٢٣ | ٥٧ | ٧٤ | ٧٠ | ٣٣ | ٣٦ | | | ٣٩٣ | |
| ٢٠١٢ -٢٠١١ | ١١١ | ٦٠ | ١٢٣ | ٨٦ | ٣١ | ٣٥ | | | ٤٤٦ | |
| ٢٠١٣ -٢٠١٢ | ٩٨ | ٤٨ | ١٠٤ | ٨٤ | ٢٦ | ٣١ | ٢١ | ١٩ | ٤٣١ | |
| ٢٠١٤ -٢٠١٣ | ١٥٨ | ١٠٧ | ١٦٠ | ١٣٥ | ٢٨ | ٤٩ | ١٧ | ٤٥ | ٦٩٩ | |
| ٢٠١٥ -٢٠١٤ | ٥٢ | ٢٩ | ١٨٨ | ٢٢٨ | ١٠ | ٢٠ | ٢١ | ٤٠ | ٥٨٨ | |
| کوژمێ گشتی | ١٠٦٦ | ٤٨٤ | ٧٣٠ | ٦٥٤ | ١٨٠ | ٢٣٩ | ٥٩ | ١٠٤ | ٣٥١٦ | |

خواندنێن پیشەیی و دەرچوویێن دبلۆما گەهاندنێ لێ دهێنە وەرگرتن[١٦١]، ب مەرجەكی كوییێ نمرەیا وان ژ (٧٥٪) كێمتر نەبیت، ماوەیێ خواندنێ ل ڤێ پشكێ چوار سالن، و دەرچوویێن وێ باوەرنامەیا بەكالۆریۆس ب ئەندازیاریا كۆمپیوتەر و گەیاندنێ پێ دهێتە بەخشین[١٦٢].

## ٢- پشكا ئەندازیاریا بیناسازی:

پشكا بیناسازی ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ هاتییەدامەزراندن و ئێكەم گەڕا خویندكاران ل هەمان سالا خواندنێ هاتینە وەرگرتن، خویندكارێن دەرچوویێن ئامادەیی لقێ زانستی ل ڤێ پشكێ دهێنە وەرگرتن، یێن كوییێ نمرەیێن وان ژ (٨٥٪) كێمتر نەبیت، ماوەیێ خواندنێ ل ڤێ پشكێ پێنج سالن، زمانێ ئنگلیزی سیستەمێ خواندنێ یە ل ڤێ پشكێ، و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا بەكالۆریۆس د بیاڤێ ئەندازیاریا بیناسازی ب دەست خۆڤە دئینیت[١٦٣].



# زانكۆیا زاخۆ




دانانا بنیاتێ زانكۆیا زاخۆ دزڤریت بۆ سالا ٢٠٠٥ێ د چوارچۆڤێ راسپاردە و گرنگیدانا سەرۆكێ هەرێما كوردستانێ (مەسعود بارزانی) ب رەوشا خواندنا بلند و دەڤەرا زاخۆ. رێزدار (نێچیرڤان بارزانی) سەرۆكێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ (كابینا پێنجێ) دەمی بەرێ بنیاتی بۆ هەردو كولیژێن پەروەردە و بازرگانی ل كەمپا زاخۆ دانای و د گۆتارا خودا گۆتی (ئەڤە بەرێ بنیاتێ زانكۆیا زاخۆیە). و ژ بۆ دابینكرنا پرۆژەیێن پێدڤی ئامادەكاری ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ و ب رێكا زانكۆیا دهۆك بۆ زانكۆیا زاخۆ هاتنەكرن.

هەر ژ سالا ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ خویندكار بناڤێ كولیژا پەروەردە - زاخۆ و كولیژا بازرگانی هاتنە وەرگرتن. ل دووڤ بریارا سەرۆكاتییا ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (١٦٧٠) ل رێكەفتی ٢٠١٠/٧/٨ێ فەرمانا دامەزراندنا زانكۆیا زاخۆ ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ (كابینا شەشێ) دەرچوو. و وەك دەستپێك زانكۆیا زاخۆ ژ (فاكولتییا زانست و فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی) پێكدهات[١٦٤].

## ئێکەم جڤاتا زانکۆیا زاخۆ:

١- د. لەزگین عەبدی جەمیل سەرۆکێ زانکۆیێ ئەندام

٢- د. عومەر عبدالمجید الحبیب هـ. سەرۆکێ زانکۆیێ بۆ کاروبارێن زانستی ئەندام

٣- د. عەبدولحەمید سلێمان هـ.سەرۆکێ زانکۆیێ بۆ کاروبارێن کارگێری ئەندام

٤- د. لوقمان محەمەد صالح هـ. سەرۆ کێ زانکۆیێ بۆ کاروبارێن خویندکاران (بریاردەرێ جڤاتێ) ئەندام

٥- د. نەوزت ئەحمەد عثمان راگرێ فاکولتیيا زانستێن مرۆڤایەتی ئەندام

٦- د. فازل حەمید ئیسف راگرێ فاکولتیيا زانستی ئەندام

٧- م. سەلوا فەریق صالح نوینەرا مامۆستایان ئەندام

٨- فەلاح صالح ئیسماعیل نوینەرێ خویندکاران ئەندام

## فاکولتییێن زانکۆیا زاخۆ:

### ١- فاکولتییا زانست:

فاکولتییا زانست درێژەپێدەرا کولیژا (پەروەردە - زانست)ە ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ ل زاخۆ هاتییە دامەزراندن، و پشتی زانکۆیا زاخۆ ل

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن فاکولتییا زانست ل دووڤ پلێن زانستی و سالێن خواندنێ ٢٠١٠- ٢٠١١ تاکو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | کوژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٠- ٢٠١١ | ٥ | ٧ | ١٤ | ٦٨ | ٩٤ |
| ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٥ | ١٦ | ٨ | ٧١ | ١٠٠ |
| ٢٠١٢- ٢٠١٣ | ٥ | ١٣ | ١٦ | ١٠١ | ١٣٥ |
| ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ٤ | ١٧ | ٢٠ | ١٠٦ | ١٤٧ |
| ٢٠١٤- ٢٠١٥ | ١١ | ١٧ | ٣٥ | ١١٨ | ١٨١ |
| ژمارا گشتی | ٣٠ | ٧٠ | ٩٣ | ٤٦٤ | ٦٥٧ |

**خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن فاکولتییا زانست ٢٠١٠ - ٢٠١١ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | کیمیا | | بایۆلۆجی | | فیزیا | | کۆمپیوتەر | | ماتماتیك | | ژینگەهـ | | کوژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٢٠١٠- ٢٠١١ | ٢٥ | ٢٦ | ١٣ | ١٧ | ٢٦ | ١٩ | ٣١ | ٢١ | ٣١ | ١٩ | | | ٢٢٨ |
| ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٣١ | ١٥ | ٢٠ | ٢٢ | ٣٢ | ١٧ | ٢١ | ١٧ | ٤٤ | ٢٢ | | | ٢٤١ |
| ٢٠١٢- ٢٠١٣ | ٤٠ | ١٣ | ١٨ | ١٦ | ٢٩ | ١٨ | ١٩ | ١٥ | ٣١ | ١٧ | | | ٢١٦ |
| ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ٢٨ | ٢٠ | ١٩ | ٣٧ | ٢٤ | ١٨ | ٢٣ | ١٢ | ٣١ | ٢٥ | | | ٢٣٧ |
| ٢٠١٤- ٢٠١٥ | ٢٠ | ٢٤ | ١٨ | ٢٠ | ١٧ | ٢٠ | ٢٣ | ٤ | ١٩ | ١١ | ٢١ | ٢٠ | ٢١٧ |
| | ١٤٤ | ٩٨ | ٨٨ | ١١٢ | ١٢٨ | ٩٢ | ١١٧ | ٦٩ | ١٥٦ | ٩٤ | ٢١ | ٢٠ | ١١٣٩ |
| کوژمێ گشتی | ٢٤٢ | | ٢٠٠ | | ٢٢٠ | | ١٨٦ | | ٢٥٠ | | ٤١ | | ١١٣٩ |

سالا ٢٠١٠ێ و ل سەر سیستەمێ نوو یێ فاكولتییان هاتییەدامەزراندن، و ل دووڤ بریارا وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی ژمارە (٦٤٤) ل ٢٠١٠/٧/١٢ێ فاكولتیا زانست هاتییەدانان[١٦٥] و بوویە ئێك ژ فاكولتیێن زانكۆیا زاخۆ. ماوەیێ خواندنێ ل ڤێ فاكولتیێ (٤) سالن، و یێ دەرچوونێ ژێ بكەت دێ بیتە خودانێ باوەرنامەیا بەكالۆریۆس ل دووڤ بسپۆریێ[١٦٦].

## ئیكەم جڤاتا فاكولتییا زانست:

١- د. فازل حەمید ئیسف راگر سەرۆكێ جڤاتێ

٢- د. صەلاحەلدین نعمان ئەمین سەرۆكێ پشكا كیمیا ئەندام

٣- د. عومەر عەبدولمجید ئەلحەبیب سەرۆكێ پشكا زیندەوەرزانی ئەندام

٤- د. خدر رەشو شەرەف سەرۆكێ پشكا ماتماتیك ئەندام

٥- د. لوقمان محەمەد صالح سەرۆكێ پشكا فیزیك ئەندام

٦- د. عەدنان محسن عەبدولعەزیز سەرۆكێ پشكا زانستێن كۆمپیوتەری ئەندام

٧- م. رەعەد عوسمان رەمەزان هاریكارێ راگری ئەندام

**پێكهاتێ فاكولتیێ:**

١- سكۆلا زانستێن سرۆشتی: ا- پشكا كیمیا ب- پشكا بایۆلۆجی ج- پشكا زانستێن ژینگەهی[١٦٧].

٢- سكۆلا زانستێن ماتماتیك و فیزیك و زانستێن كۆمپیوتەری:

ا- پشكا ماتماتیك

ب- پشكا فیزیك

ج- پشكا زانستێن كۆمپیوتەری.

هەژی دیاركرنێ كو ئەو خویندكارێن بەری دامەزراندنا زانكۆیا زاخۆ بناڤێ كولیژا پەروەردە - زاخۆ هاتینە وەرگرتن بوویە و خواندنا وان ل سەر پرۆگرامێ كولیژا پەروەردە بەردەوام بوویە تاكو دەرچوونا وان ژێ بناڤێ (كولیژا پەروەردە - زاخۆ) هاتییە توومارکرن[١٦٨].

## ٢- فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی:

فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی ژی درێژەپێدەرا كولیژا (پەروەردە - زانست) ە ئەوا ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ ل زاخۆ هاتییەدامەزراندن، پشتی زانكۆیا زاخۆ ل سالا ٢٠١٠ێ و ل سەر سیستەمێ نوو یێ فاكولتییان هاتییە دامەزراندن، ل دووڤ بریارا وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی ژمارە (٦٤٤) ل رێكەفتی ٢٠١٠/٧/٢٧ێ فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی هاتییەدانان و بوویە ئێك ژ فاكولتیێن زانكۆیا زاخۆ. ماوەیێ خواندنێ ل ڤێ فاكولتیێ (٤) سالن، و یێ دەرچوونێ ژێ بكەت دێ بیتە خودانێ باوەرنامەیا بەكالۆریۆس ل دووڤ بسپۆریێ.

## ئێكەم جڤاتا فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی:

١- د. نەوزەت ئەحمەد عثمان-راگر ئەندام

٢- د. صەباح حسێن محەمەد-سەرۆكێ پشكا زمانێ عەرەبی ئەندام

٣- د. محەمەد سەعید محەمەد سەرۆكێ پشكا دەروونناسی ئەندام

٤- د. شەوكت عارف محەمەد سەلیم- سەرۆكێ پشكا مێژوو ئەندام

٥- د. نەوزەت جەمیل سەلیم-سەرۆكێ پشكا بازرگانی ئەندام

٦- د. نوری عەبدولرەحمان ئیبراهیم- سەرۆكێ پشكا خواندنێن ئیسلامی ئەندام

٧- م. عەبدولقادر نوری عەبدولكەریم- سەرۆكێ پشكا زمانێ كوردی ئەندام

٨- م. هودا محەمەد صالح - سەرۆكا پشكا زمانێ ئنگلیزی ئەندام.

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن فاكولتیا زانستێن مرۆڤایەتی ل دووڤ سالێن خواندنێ و پلێن زانستی ٢٠١٠- ٢٠١١ تاكو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ. هـ | مامۆستا | مامۆستایێ. هـ | كۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٠- ٢٠١١ | ٢ | ١٥ | ١٩ | ٦٨ | ١٠٤ |
| ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٢ | ١٥ | ٢٦ | ٧٦ | ١١٩ |
| ٢٠١٢- ٢٠١٣ | ١ | ١٨ | ١٩ | ٧٦ | ١١٤ |
| ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ١ | ١٩ | ٢٤ | ٨٦ | ١٣٠ |
| ٢٠١٤- ٢٠١٥ | ١ | ١٥ | ٢٥ | ٤٠ | ٨١ |
| ژمارا گشتی | ٧ | ٨٢ | ١١٣ | ٣٤٦ | ٥٤٨ |

**خشتەیێ ژمارا خویندكارێن دەرچوویێن فاكولتیا زانستێن مرۆڤایەتی ٢٠١٠ - ٢٠١١ تاكو ٢٠١٤ - ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | ئنگلیزی | | عەرەبی | | كوردی | | بازرگانی و بانك | | مێژوو | | دەروونناسی | | خواندنێن ئیسلامی | | كۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٢٠١٠- ٢٠١١ | ١٦ | ٣١ | ٢٦ | ٣٧ | ٤٠ | ٤٢ | ٢٤ | ٧ | ٤٤ | ٣٤ | ٣٩ | ٣٥ | | | ٣٧٥ |
| ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٣٠ | ٢٩ | ٢٥ | ٣١ | ٣٧ | ٢٧ | ٣٣ | ٢٢ | ٣٧ | ٢٧ | ٣٠ | ٣١ | | | ٣٥٩ |
| ٢٠١٢- ٢٠١٣ | ٢٩ | ٢٣ | ٢١ | ١٩ | ٢٥ | ١٥ | ٢٧ | ١٩ | ٢٩ | ٣٩ | ٣٠ | ١٦ | | | ٢٩٢ |
| ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ٢٢ | ٢٣ | ١٩ | ٢٧ | ٣١ | ٢٥ | ٤٠ | ٤٢ | ٢٨ | ٢٩ | | | | | ٢٨٦ |
| ٢٠١٤- ٢٠١٥ | ٢٩ | ٢٩ | ٣٨ | ٢٥ | ٣٣ | ٢٤ | ٢٩ | ١٢ | | | | | ٢٧ | ٢٤ | ٢٧٠ |
| | ١٢٦ | ١٣٥ | ١٢٩ | ١٣٩ | ١٦٦ | ١٣٣ | ١٥٣ | ١٠٢ | ١٣٨ | ١٢٩ | ٩٩ | ٨٢ | ٢٧ | ٢٤ | ١٥٨٢ |
| كۆژمێ گشتی | ٢٦١ | | ٢٦٨ | | ٢٩٩ | | ٢٥٥ | | ٢٦٧ | | ١٨١ | | ٥١ | | ١٥٨٢ |

هەژی دیاركرنێ یە كو ئەو خویندكارێن بەری دامەزراندنا زانكۆیا زاخۆ هاتینە وەرگرتن بناڤێ كولیژا پەروەردە - زاخۆ بوویە و خواندنا وان ل سەر پرۆگرامێ كولیژا پەروەردە بەردەوام بوویە تاكو دەرچوونا وان ژی بناڤێ (كولیژا پەروەردە - زاخۆ) هاتییە تووماركرن.

**فاكولتیا زانستێن مرۆڤایەتی ژ سێ سكۆلان پێكدهێت:**

**١- سكۆلا ئاداب،** و پێكهاتییە ژ پشكێن:

ا- پشكا مێژوو

ب- پشكا خواندنێن ئیسلامی

ج- پشكا دەروونناسی

**٢- سكۆلا زمان، پێكهاتییە ژ پشكێن:**

ا- پشكا زمانێ كوردی

ب- پشكا زمانێ عەرەبی

ج- پشكا زمانێ ئنگلیزی

**٣- سكۆلا بازرگانی، پێكهاتییە ژ پشكێن:**

ا- پشكا زانستێن بازرگانی و بانك ب- پشكا ئابووری كاران[١٦٩].

خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن فاکولتیا پەروەردە ل دووڤ پلێن زانستی و سالا خواندنێ ٢٠١٤-٢٠١٥

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | کۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | | ١ | ٣ | ١٤ | ١٨ |
| ژمارا گشتی | | ١ | ٣ | ١٤ | ١٨ |

**پشکێن فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی - سکۆلا ئاداب:**

**١- پشکا مێژوو**[١٧٠]**.**

**٢- پشکا خواندنێن ئیسلامی:**

ئاماژە ب فەرمانا زانکۆیێ ژمارە (١٤٩٥/٦) ل رۆژا ٢٠١١/١٠/٨ێ ل دووڤ نڤیسارا رێڤەبەریا گشتیا هویربینی و دلنیا جۆری ژمارە (١٢٤٤٤/٦) ل رۆژا ٢٠١١/٧/١٩ێ بریارا ڤەکرنا پشکا خواندنێن ئیسلامی ل فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی هاتە دان[١٧١].

**٣- پشکا زمانێ کوردی:**

پشکا زمانێ کوردی دگەل دامەزراندنا زانکۆیا زاخۆ ل سالا ٢٠١٠ێ هاتییەدانان و بوویە پشکەك ژ فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی. ڤێ پشکێ خواندنا ماستەرێ ل سالا خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ، و دکتۆرایێ ل سالا ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ ڤەکرییە[١٧٢].

**٤- پشکا زمانێ تورکی:**

ژ بۆ پتر گرنگیدان ب زمانێن بیانی و ژ پێدڤیاتیێ، ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ ل سکۆلا زمان سەر ب فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتیڤە ل زانکۆیا زاخۆ پشکا زمانێ تورکی هاتە ڤەکرن[١٧٣].

**٥- پشکا زمانێ ئنگلیزی:**

پشکا زمانێ زمانێ ئنگلیزی درێژەپێدەرا هەمان ئەوێ پشکێ یە ئەوا سەر ب کولیژا پەروەردە - زانکۆیا دهۆك ل سالا ١٩٩٥ێ هاتییەدانان، و پاش دامەزراندنا زانکۆیا زاخۆ ل سالا ٢٠١٠ێ بوویە پشکەك ژ فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی ل زانکۆیا ناڤبری. پشکا زمانێ ئنگلیزی ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ ئێکەم دەستەیا خویندکارێن ماستەرێ وەرگرتینە، کو ژمارا وان (٣) خویندکار بوون.

**٦- پشکا زمانێ عەرەبی:**

پشکا زمانێ عەرەبی ل سالا خواندنێ ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ێ هاتییەدامەزراندن، کو ل وی دەمی سەر ب کولیژا پەروەردە - زانکۆیا دهۆك ڤە بوو، لێ پشتی زانکۆیا زاخۆ ل سالا ٢٠١٠ێ هاتییەدانان پشکا ناڤبری چوویە سەر ب فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی - زانکۆیا زاخۆ ڤە. و ل سالا ٢٠١٠ - ٢٠١١ێ خواندنگا بلند (ماستەر) ل ڤێ پشکێ هاتییەڤەکرن.

**٣- فاکولتیا پەروەردە:**

دووڤ کۆمبوونا ئەنجومەنێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی ژمارە (٢) ل رێکەفتی ٢٠١٤/١١/٢ێ بریارا ڤەکرنا فاکولتیا پەروەردە ل زانکۆیا زاخۆ هاتییەدان، ئانکو ل سالا خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ دەست ب وەرگرتنا خویندکاران کرییە، وەك دەستپێك ژ سێ پشکێن زانستی پێك دهێت. ماوەیێ خواندنێ ل ڤێ کولیژێ (٤) سالن، و یێ دەرچوونێ ژێ بکەت دێ بیتە خودان باوەرنامەیا بەکالۆریۆس و ل دووڤ بسپۆریێ پێ دهێتە بەخشین[١٧٤].

## ئێكەم جڤاتا فاكولتیيا پەروەرە:

١- د. لەزگین عەبدی جەمیل راگرێ فاكولتیێ ب وەكالەت

٢- د. نەوزەت ئەحمەد (عثمان) ئەندام

٣- د. ئەحمەد قاسم محەمەد ئەندام

٤- د. نەصرەدین ئیبراهیم محەمەد ئەندام

**پشكێن فاكولتیێ:**

**١- پشكا دەروونناسیيا گشتی:**

ل سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ ناڤێ ڤێ پشكێ ژ (پەروەردە و دەروونناسی) بوویە (دەروونناسیيا گشتی)، مەبەست ژێ تاكو ئەو خویندكارێن دەرچوونێ ژ ڤێ پشكێ دكەن بهێنە پێكەهاندن و پتر پویتەی بدەنە لایەنێ سایكولۆجی[١٧٥].

**٢- پشكێن پەروەردەیا بنەرەت/ئێڤاران:**

چەند پشكەكێن زانستینە و تایبەتن بۆ مامۆستایێن سەر ب وەزارەتا پەروەردێ ڤە هاتینە ڤەكرن، پرۆگرامێن ڤان پشكا ژ بۆ پەرەپێدانا مامۆستایێن بنەرەتە، ئارمانج ژێ ئەوە تاكو مامۆستایێن بنەرت دەلیڤا بدەستڤەئینانا باوەرنامەیێن بەكالۆریۆس و ئەكادیمی و هەر ئێك دووڤ بسپۆریيا خۆ ب دەستخوڤە بینت، كو تێدا چەند بسپۆریەك هەنە وەك:

ا- بسپۆریێن زانست (زانستەكان - ماتماتیك).

ب- بسپۆریێن مرۆڤایەتی (زمانێ كوردی - زمانێ ئنگلیزی - زمانێ عەرەبی - زانستێن كۆمەلایەتی)[١٧٦].

**٣- پشكا وەرزشی:**

پشكا وەرزشی ئێكە ژپشكێن فاكولتیيا پەروەردێ ڤە و ژ لایێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی ل رێكەفتی ٢٠١٤/٨/٢٤ێ هاتیبەڤەكرن. دەلیڤا وەرگرتنێ ل پشكا وەرزشی بۆ خویندكارێن دەرچوویێن ئامادەیی ب هەردو تایێن خۆ ڤە (زانستی و ویژەیی) هاتیە رۆخساندن. وەرزێ خواندنێ ٢٠١٤ – ٢٠١٥ێ ئێكەم وەرزێ خواندنێ بوویە ل ڤێ پشكێ و (٧٨) خویندكار ژ هەردو رەگەزێن نێر و مێ لێ هاتنە وەرگرتن.

## كولیژێن زانكۆیا زاخۆ:

### ١- كولیژا كارگێری و ئابووری:

ل دووڤ كۆمبوونا ئەنجومەنێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی ژمارە (٢) ل رێكەفتی ٢٠١٤/١١/٢ێ برگا (٤) یا كاروبارێن زانستی و خواندنا بلند بریارا ڤەكرنا كولیژا كارگێری و ئابووری ل زانكۆیا زاخۆ بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ هاتیەدان. ئارمانجا سەرەكیيا ڤەكرنا ڤێ كولیژێ بەرهەڤكرنا كادرێن ئەكادیمی و زانستی یە د وارێ ئابووری و كارگێری دا ب تایبەت ژ بۆ رێڤەبرن و وەراركرنا بازرگانیێ ل سەر بنەمایێن زانستی و سەردەمیانە. دەستپێكێ كولیژا كارگێری و ئابووری ژ دو پشكێن زانستی (پشكا بازرگانی و بانك و پشكا ئابووری كاران) پێكدهێت. ماوەیێ خواندنێ ل كولیژی (٤) سالن و دەرچوونێ وێ دبیتە هەلگرێ باوەرنامەیا بەكالۆریۆس ب زانستێن كارگێری و ئابووری[١٧٧].

## ئێكەم جڤاتا كولیژا كارگێری و ئابووری:

١- د. لەزگین عەبدی جەمیل راگرێ كولیژێ ب وەكالەت

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن كولیژا كارگێری و ئابووری ل دووڤ پلێن زانستی و سالێن خواندنێ ٢٠١٤-٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | كۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | | ٣ | ٥ | ١٧ | ٢٥ |
| ژمارا گشتی | | ٣ | ٥ | ١٧ | ٢٥ |

٢- د. عەبدولحەمید سلێمان ڤاهر ئەندام
٣- د. نەوزت جەمیل سەلیم ئەندام
٤- د. رەنج محەمەد نوری ئەندام

### پشكێن زانستی یێن كولیژا كارگێری و ئابووری:

**١- پشكا بازرگانی و بانك:**

بنیاتێ ڤێ پشكێ دزڤریت بۆ كولیژا بازرگانی و بەنكی ئەوا ب بریارا وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی یا ژمارە (٨٦) ل ٢٠٠٥/٥/٣ێ هاتییەڤەكرن، ل دەستپێكی و ژ ئەگەرێ نەبوونا ئاڤاهییەكێ تایبەت بۆ ڤێ كولیژێ، وەك پشكەكا زانستی ل سالا خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ ل كولیژا كارگێری و ئابووری/زانكۆیا دهۆك ناڤێ پشكا زانستێن بازرگانی و بەنكی هاتبوو ڤەكرن، سالا خواندنێ ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ێ تنێ وەك جهـ بۆ ئاڤاهیێ خۆ یێ نوو ل كەمپا زاخۆ هاتییە ڤەگوهاستن، و ل رۆژا ٢٠٠/٩/١ وەك كولیژەكا سەربخۆ بناڤێ (كولیژا بازرگانی) كاركرییە. پشتی بریارا جڤاتا سەرۆكاتییا ئەنجومەنی وەزیران ل حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ یا ژمارە (١٦٦٨) ل رۆژا ٢٠١٠/٧/٨ێ زانكۆیا زاخۆ هاتییە دامەزراندن، ژ زانكۆیا دهۆكێ ڤەقەتیا و چوویە سەر ب زانكۆیا زاخۆ ڤە. ل سالا خواندنێ ٢٠١٠ - ٢٠١١ێ و پشتی سیستەمێ فاكولتییان ل زانكۆیا زاخۆ هاتییە بجهئینان، كولیژا بازرگانی ب پشكا خۆ ڤە یا بازرگانی و بەنكی بوویە سكۆلەك بناڤێ (سكۆلا بازرگانی) و چوویە سەر ب فاكولتییا زانستێن مرۆڤایەتی ڤە[178].

**٢- پشكا ئابووری كاران:**

ل سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ هاتییەدامەزراندن. ئێكە ژ پشكێن زانستێن پراكتیكی یێن پشكا كارگێری كار. پشكا ئابووری كاران گرنگیێ ددەتە پێدڤیێن ستراتیجی و ئاریشێن گرێدای ب رێكخراو و ستراتیجیەت و ئابووریا كاری، هەروەسا كارێ وێ بێ سەرەكی پێشكێشكرنا وانێن تیۆری و پراكتیكە ژ بۆ بلندكرنا ئاستێ خویندكاران ب وارێ زانستێن كارگێری. دیسان ناڤەرۆكا زانستی یا پشكا ئابوورە كاران چ جیاوازی دگەل پشكێن كارگێری كار ل زانكۆیێن دیتر یێن هەرێمی نینە، لێ ناڤێ پشكێ وەك ئابووری كاران بتنێ ژ بۆ جیاوازیكرنا دەرچوویان دهێت[179].

## ٢- كولیژا ئەندازیاری:

دووڤ كۆمبوونا ئەنجومەنێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی ژمارە (٢) ٢٠١٤/١١/٢ێ برگا (٤) یا كارۆ بارێن زانستی و خواندنا بلند، بریارا ڤەكرنا كولیژا ئەندازیاری ل زانكۆیا زاخۆ بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ هاتییەدان.

پێكهاتێ كولیژێ ژ پشكێن زانستی وەك دەستپێك بتنێ پشكا پەترۆل و پشكا میكانیك بووینە. ماوەیێ خواندنێ ل كولیژێ (٤) سالن[180].

### ئێكەم جڤاتا كولیژا ئەندازیاری:

١- د. لەزگین عەبدی جەمیل راگرێ كولیژێ ب وەكالەت
٢- د. فاضل حەمید ئیسف ئەندام
٣- رمضان حاجی ئیسماعیل ئەندام
٤- د. عومەر محەمەد عەلی ئەندام

**خشتەیێ ژمارا مامۆستایێن كولیژا ئەندازیاری ل دووڤ پلێن زانستی و سالا خواندنێ ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| سالێن خواندنێ | پرۆفیسۆر | پرۆفیسۆرێ هـ | مامۆستا | مامۆستایێ هـ | ژمارا سالێ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ٢٠١٤- ٢٠١٥ | | ٢ | ٤ | ٤ | ١٠ |
| ژمارا گشتی | | ٢ | ٤ | ٤ | ١٠ |

**پشکێن کولیژا ئەندازیاری:**

**١- پشکا پەترۆلی:** پشکا پەترۆلێ پێشتر ب فەرمانا وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکولینێن زانستی ژمارە (١٣٠٤٧/٤) ل رێکەفتی ٢٠١٣/٦/٢٥ێ ل زانکۆیا زاخۆ کو ل وی دەمی سەر ب ئەڤیسینگەها سەرۆکێ زانکۆیێ ڤە هاتبوو ڤەکرن.

فاکتەر و ئەگەرێ سەرەکی ژ ڤەکرنا پشکا پەترۆلێ زێدەبوونا بەرهەمێ وێ یە ل کوردستانێ و دەڤەرا زاخۆ و پێدڤیاتی ب بەرهەمڤکرنا کادرێن ئەندازیاری و بسپۆر د بیاڤێ پەترۆلێ دا[١٨١].

**٢- پشکا میکانیک:** پشکا میکانیکێ بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ ل کولیژا ئەندازیاری - زانکۆیا زاخۆ هاتییەدانان، و ل هەمان سال خویندکار لێ هاتینە وەرگرتن[١٨٢].

## زانکۆیا پۆلیتەکنیکی یا دهۆک




زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆک ڤەرێژا خواندنا تەکنیکی یە ل پارێزگەها دهۆکێ کو ڤەدگەرێتە ڤە بۆ سالا ١٩٨٨ێ دەمێ ئێکەم پەیمانگەهـ ل پارێزگەها دهۆکێ بناڤێ (پەیمانگەها تەکنیکی دهۆک) هاتییە دامەزراندن کو ل وی دەمی دهاتە هژمارتن ئێکەم بنگەهێ خواندنا بلند ل گشت پارێزگەهێ. و ژ بۆ پتر رێکخستنا کاروبارێن پەیمانگەهێن دەڤەرێ یێن زانستی و کارگێری و پێشخستنا وان ژ لایێ ئەکادیمی و تەکنیکی ڤە و ل دووڤ داخوازیا ڤان پەیمانگەهان ب بریارا ژمارە (١٩٢٩) ل رێکەفتی ٢٠١٢/٨/٧ێ جڤاتا وەزیران یا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ رەزامەندی ل سەر دامەزراندنا زانکۆیا (پۆلیتەکنیکیا دهۆک) دەربڕی و هەمی پەیمانگەهێن سەرب پارێزگەها دهۆکێ ڤە کو ل وی دەمی ژمارا وان (٨) پەیمانگەهـ بوون دگەل هاتنەگرێدان. هەروەسا جڤاتا زانکۆیێ بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٣- ٢٠١٤ێ بریاردایە دو کولیژێن دیتر ل بازێرێ دهۆکێ ڤەکەت (کولیژا تەکنیکی ئەندازیاری و کولیژا تەکنیکی کارگێری) کو هەر ئێک ژ وان وەك دەستپێك ژ دو پشکان پێکدهێت، دگەل پەیمانگەهەکا تەکنیکی ل قەزا شنگالێ[١٨٣]. و ژ بۆ پتر پێشخستنا وارێ زانستی، زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆك هەولدایە رێککەفتنێن زانستی دگەل هندەك زانکۆیێن جیهانی رێکبێخیت و شیایە ژمارەکا مامۆستایان بهنێریتە ژدەرڤەی وەلاتی ژ بۆ بهێزکرنا ئاستێ وان یێ زانستی، دیسان بۆ سالا ئەکادیمی ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ دەرگەهێ خواندنا بلند (ماستەر و دکتۆرایێ) بۆ مامۆستا و فەرمانبەرێن زانکۆیی رەخساندییە[١٨٤].

بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆك بریاردا دو کولیژێن دیتر یێن تەکنیکی ڤەکەت (کولیژا تەکنیکی تەندروستی یا شێخان و کولیژا تەکنیکی یا ئاکرێ)، کو زانکۆیا ئێکانەیە ژ سەرجەمێ شەش زانکۆیێن حکۆمی وئەهلی ل پارێزگەهێ پتر پویتەی ددەتە وارێ پراکتیکی و مەشق و راهێنانێ و ئاڤاکرنێ، هەروەسا بۆ هەمان سالا خواندنێ پشکا (ئەندازیاری پترۆکیمیاوی) ل سەر کولیژا تەکنیکی ئەندازیاری هاتە زێدەکرن و پشکا (رۆژنامەڤانیا ئەلکترۆنی) ژێ ل کولیژا تەکنیکی کارگێری هاتە دانان[١٨٥].

## ئێکەم جڤاتا زانکۆیا پۆلیتەکنیکیا دهۆك:[١٨٦]

١ - د. عەدنان موحسن عەبدولعەزیز پرۆفیسۆرێ هاریکار سەرۆکێ زانکۆیێ (سەرۆکێ جڤاتێ)

٢ - د. عەدنان موحسن عەبدولعەزیز پرۆفیسۆرێ

هاریکار راگرێ پەیمانگەها تەکنیکیا دهۆك

٣ - د. خەیری عەلی اسو پرۆفیسۆرێ هاریکار راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی کارگێری دهۆك

٤ - د. تاها زبیر سەرحان - پرۆفیسۆرێ هاریکار راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی زاخۆ

٥ - د. ئیحسان توفیق تەیب - پرۆفیسۆرێ هاریکار راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی ئامیدی

٦ - د. منهل ئیلهام عەبدال - مامۆستا راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی ئاکرێ

٧ - د. بەختیار صابر محەمەد - مامۆستا راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی بەردەرەش

٨ - د. ضیاء مستەفا سلێمان - مامۆستا راگرێ پەیمانگەها تەکنیکی شێخان

## کولیژێن زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆك:

### ١- کولیژا تەکنیکی ئەندازیاری:

دگەل دەستپێکا دامەزراندنا زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆك (کولیژا پۆلیتەکنیکی ئەندازیاری) هاتییەڤەکرن و ب دو پشکێن زانستی (پشکا رێکا و بان و پشکا سارکرن و هەواسازی)، ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ هەردو پشکێن کولیژێ ئێکەم خولا خۆ دەستپێکرییە و پتر ژ (٨٠) خویندکارێن کور و کچ وەرگرتینە. ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٤) سالن، و خویندکارێ دەرچوویێ کولیژێ دێ بیتە خودانی باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێن ئەندازیاریا تەکنیکی[١٨٧].

### ئێکەم جڤاتا کولیژا تەکنیکی یا ئەندازیاری:

١- پ.د. محەمەد سەعید صالح - راگرێ سەرپەرشت سەرۆکێ جڤاتێ

٢-ئیبراهیم فەزلەلدین - جێگرێ راگری بریاردەر

٣- نەزیر محەمەد عەلی عەبدوللا - سەرۆکێ پشکا سارکرن و هەواسازی ئەندام

### ٢- کولیژا تەکنیکی کارگێری - دهۆك:

کولیژا تەکنیکی کارگێری - دهۆك ئێکە ژ کولیژێن سەر ب زانکۆیا پۆلیتەکنیکی - دهۆك ڤە، ل سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ هاتییەدامەزراندن، ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٤) سالن و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا بەکالۆریۆس ب زانستێن تەکنیکی یێن کارگێری پێ دهێتە بەخشین، ئانکو ناسناڤێ زانستی ب کارگێریا تەکنیکی وەردگریت. کولیژا تەکنیکی کارگێری دهۆك وەك دەستپێك ب دو پشکان دەستپێکریە (پشکا تەکنەلۆجیا زانیاری I.T و پشکا ژمێریاری و دارایی).[١٨٨]

### ئێکەم جڤاتا کولیژا تەکنیکی کارگێری - دهۆك:

١- پ. هـ. د. خەیری عەلی اسو راگرێ سەرپەرشت سەرۆکێ جڤاتێ

٢- نزار رەشید نوری سەرۆکێ پشکا ژمێریاری و دارایی ئەندام

٣- ئاراز رەجەب رەشید سەرۆکێ پشکا تەکنەلۆجیا زانیاری I.T ئەندام

### ٣- کولیژا تەکنیکی یا ئاکرێ:

ئێکە ژ کولیژێن زانکۆیا پۆلیتەکنیکی دهۆك ، ل سالا ٢٠١٤ێ هاتییەدامەزراندن و بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ ئێکەم خولا خویندکاران ژ کور و کچان وەرگرتییە. وەك دەستپێك ژ دو پشکێن زانستی پێك دهێت (پشکا تەکنەلۆجیا زانیاری I.T و پشکا بیستانکاری)، ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٤) سالن[١٨٩].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا تەکنیکی یا ئاکرێ:

١- پ. هـ. د. منهل ئیلهام عەبدال راگرێ کولیژێ ب وەکالەت سەرۆکێ جڤاتێ

٢- ئەدریس عەلی حسێن سەرۆکێ پشکا تەکنەلوجیا زانیاری ئەندام

٣- پیرس تارق خورشید سەرۆکێ پشکا رەزگری ئەندام

## ٤- کولیژا تەکنیکی تەندروستی یا شێخان:

ژ بەر پێدڤیا دەڤەرێ ب کادرێ ساخلەمیێ کولیژا تەکنیکی تەندروستی یا شێخان ل سالا ٢٠١٤ێ ل سەنتەرێ قەزا شێخان هاتیەدامەزراندن، و ل سالا خواندنێ ٢٠١٤ - ٢٠١٥ێ ئێکەم خولا خویندکاران ژ کور و کچان وەرگرتیە. وەك دەستپێك کولیژە ژ دو پشکێن تەندروستی پێك دهات (پشکا شرۆڤەکرنا نەخۆشیان و پشکا تەندروستی کۆمەل) ماوەیێ خواندنێ ل کولیژێ (٤) سالن و دەرچوویێن وێ دبنە خودان باوەرنامەیا بەکالۆریۆس تەکنیکی[١٩٠].

## ئێکەم جڤاتا کولیژا تەکنیکی تەندروستی یا شێخان:

١- د. ضیاء مستەفا سلێمان راگرێ کولیژێ ب وەکالەت سەرۆکێ جڤاتێ

٢ - ئازاد تاهر محەمەد صالح جێگرێ راگری ئەندام

٣- د. هانی مسلم ئەحمەد سەرۆکێ پشکا شرۆڤەکرنا نەخۆشیان ئەندام

٤- بزاڤ ناجی رەشید سەرۆکێ پشکا تەندروستی کۆمەل ئەندام

## پەیمانگەهێن سەر ب زانکۆیا پۆلیتەکنیکی - دهۆك ڤە: پەیمانگەها تەکنیکی دهۆك

پەیمانگەها تەکنیکی دهۆك دهێتە هژمارتن ئێکەم بنگەهێ خواندنا بلند ل پارێزگەها دهۆکێ[١٩١]. ل سالا ١٩٨٨ێ هاتیە دامەزراندن، کو ل وی سەردەمی سەر ب دەستەیا پەیمانگەهێن تەکنیکی ئەوا ژ لایێ خۆ ڤە سەر ب وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی یا حکۆمەتا عیراقێ بوویە[١٩٢]. ل دەستپێکێ پەیمانگەهێ ل ئێکەم سالا خواندنێ ١٩٨٨ - ١٩٨٩ێ ب دو پشکا دەوام کریە (پشکا رۆپیڤان و پشکا ژمێریاری)، و بۆ سالا خواندنێ یا ل دووڤدا ١٩٨٩ - ١٩٩٠ێ پشکا میکانیك و پشکا سیستەمێن کۆمپیوتەری هاتیەڤەکرن. پشتی سەرهلدانا بهارا سالا ١٩٩١ێ و ڤەکێشانا کشت کارگێرێن حکۆمی ژ کوردستانێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە، پرۆسا خواندنێ ل پەیمانگەهێ یا بەردەوامبوو و چ کارتێکرن ژ لایێ زانستی ڤە لێ نەهاتەکرن، ئەڤ چەندە ژی ب خەمخوریا مامۆستا و فەرمانبەرێن کورد بوویە، هەژیە بێژین نێزیکی (٥٤) فەرمانبەران ب بسپۆرێن جودا جودا ب کارێ وانە گۆتنێ رادبوون[١٩٣]. ماوەیێ خواندنێ ل پەیمانگەهێ دو سالن دگەل مەشقا هاڤینی پشتی سالا ئێکێ ژ خواندنێ، و دەرچوویێ وێ باوەرنامەیا دبلۆم دووڤ بسپۆریێ پێ دهێتە بەخشین، هەروەسا خواندن ل پەیمانگەهێ ب رێژا ٧٠٪ ێ پراکتیکی یە و ٣٠٪ ێ تیۆرییە[١٩٤].

## ئێکەم جڤاتا پەیمانگەها تەکنیکی دهۆك[١٩٥]:

١- د. مەحفوز حەمدون عەبدلصەواف راگرێ پەیمانگەهێ سەرۆکێ جڤاتێ.

٢- محەمەد جەلال نوری هاریكارێ راگری بریاردەر.
٣- وەعدوللا ئەحمەد مراد ئەندام.
٤- شامل ئەدریس جەرجیس ئەندام.
٥- مجاهد فەهمی ئەندام.
٦- سەمیر تاها یاسین ئەندام
٧- نوینەرێ سەندیكا مامۆستایان ئەندام
٨- سەرۆكێ تایێ (الثقافة القومیة) ئەندام
٩- نوینەرێ ئێكەتیا نشتیمانیا خویندكار و لاوێن عیراقێ ئەندام

## پشكێن پەیمانگەها تەكنیكی دهوك

**- پشكێن كارگێری:**

١- پشكا ژمێریاری: ل سالا خواندنێ ١٩٨٨ - ١٩٨٩ێ هاتییەڤەكرن

٢- پشكا كۆمپیوتەری: ل سالا خواندنێ ١٩٨٩ - ١٩٩٠ێ هاتییەڤەكرن.

**- پشكێن تەكنەلۆجی:**

١- پشكا رۆپیڤان: ل سالا خواندنێ ١٩٨٨ - ١٩٨٩ێ هاتییەڤەكرن.

٢- پشكا میكانیك: ل سالا خواندنێ ١٩٨٩ - ١٩٩٠ێ هاتییەڤەكرن.

- بۆ سالا خواندنێ ١٩٩٨ - ١٩٩٩ێ پشكا (چارەسەركرنا سرۆشتی) ل پەیمانگەها تەكنیكی دهوك هاتە زێدەكرن[١٩٦].

- بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٠- ٢٠٠١ێ بریار هاتییەدان (پشكا پەرستاری، و پشكا نەخۆشەڤانی و پشكا رێڤەبەریا عۆمباران و پشكا كارگێریا كەرەستا) ل پەیمانگەهێ بێنەڤەكرن. سەبارەت پشكا كەرەستا یا بەردەوامبوو تاكو سالا خواندنێ ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ێ ژمارەكا خویندكاران وەرگرتییە، ل دووڤ پێدڤیێ بریار هاتییەدان خواندن ل ڤێ پشكێ بهێتە راوەستاندن[١٩٧] و ل هەمان سال پشكا كارگێری كار دامەزراندییە[١٩٨].

هەروەسا بریار هاتییەدان هەرسێ سەركەفتیێن ئێكێ ژ هەر پشكەكێ مافێ تەمامكرنا خواندنێ ل زانكۆیێن هەرێمێ هەیە و هەر ئێك ل دووڤ پشكا (كارگێریا بسپۆریا وی ب مەرجەكی تێكرایێ نمرێن دەرچوونێ ژ (٧٠)ێ كێمتر نەبیت[١٩٩] و بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ێ پشكا نڤیسینگەهی - پشكا بیناكاری - پشكا شرۆڤەكرنا نەخۆشیا) هاتینە دامەزراندن[٢٠٠]. بۆ زانین پشتی خواندن بۆ ماوەیێ سالەكێ ل ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ێ ل پشكا (چارەسەركرنا سرۆشتی) و ژ بەر چەند ئەگەرێن تایبەت هاتییە راوەستاندن جڤاتا پەیمانگەهێ بریاردایە دوبارە ل سالا خواندنێ ٢٠٠٢ - ٢٠٠٣ێ بهێتە ڤەكرن[٢٠١]. هەروەسا ژ بۆ پتر پویتەدان ب كەرتێ ساخلەمیێ پشكا سركرنێ (التخدیر) ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ێ هاتییەدامەزراندن و دەست ب وەرگرتنا خویندكاران كرییە[٢٠٢]، دگەل ڤەكرنا پشكا شارستانی ژ بۆ سەرپەرشتیكرنا هەردو پشكێن (رۆپیڤان - بیناكاری)[٢٠٣].

دیسان هەر د بیاڤێ ساخلەمیێ دا پەیمانگەها تەكنیكی دهوك شیایە ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ێ پشكا تیشك ب دامەزرینیت[٢٠٤]، هەروەسا شیایە ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ پشكا (پاراستنا ددانا) ل پشكێن پەیمانگەهێ یێن پزیشكی زێدەكەت، كو ل هەمان سال دەست ب وەرگرتنا خویندكاران كرییە[٢٠٥]. و ل سالا خواندنێ ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ێ پەیمانگەهە یا بەردەوامبوویە د ڤی بیاڤی دا و پشكا (دەرمانسازی) ژی ڤەكرییە[٢٠٦].

ل دووڤ بەرژەوەندیا گشتی و پێدڤیا دەڤەرێ جڤاتا پەیمانگەهێ بریاردایە بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٩ - ٢٠١٠ێ خواندن ل پشكێ (كارگێریا نڤیسینگەهی[٢٠٧]، و كارگێریا كەرەستا)[٢٠٨]، بهێتە راگرتن زێدەباری پشكا ژمێریاری و ل جهێ وێ پشكا رۆژنامەڤانی بهێتە ڤەكرن[٢٠٩]. دگەل ڤەكرنا (پشكا كارگێری یاسا سپێدە و ئێڤاران و پشكا كتێبخانە و زانیاری)[٢١٠]. و دو پشكێن پزیشكی

**خشتەیێ ژمارە (١) پلا زانستی یا مامۆستا و وانەبێژێن پەیمانگەها تەکنیکی - دهوک**

**١٩٩٦ - ١٩٩٧ تاکو ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤**

| پلا زانستی | ١٩٩٦-١٩٩٧ | ١٩٩٧-١٩٩٨ | ١٩٩٨-١٩٩٩ | ١٩٩٩-٢٠٠٠ | ٢٠٠٠-٢٠٠١ | ٢٠٠١-٢٠٠٢ | ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | ٢٠٠٣-٢٠٠٤ | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پرۆفیسۆر | - | - | - | ١ | ١ | ١ | - | - | ٣ |
| پرۆفیسۆر.هـ | - | - | ١ | ٥ | ٤ | ٥ | ٢ | ٦ | ٢٣ |
| مامۆستا | ٣ | ٦ | ٥ | ٥ | ٧ | ٩ | ١٠ | ١٦ | ٦١ |
| مامۆستا. هـ | ١٠ | ٩ | ٨ | ١٦ | ١٩ | ٢٢ | ٣٧ | ٢٩ | ١٥٠ |
| سەرجەمێ | ١٣ | ١٥ | ١٤ | ٢٧ | ٣١ | ٣٧ | ٤٩ | ٥١ | ٢٣٧ |

**خشتەیێ ژمارە (٢) پلا زانستی یا مامۆستا و وانەبێژێن پەیمانگەها تەکنیکی - دهۆك**

**٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ تاکو ٢٠١٠ - ٢٠١١**

| پلا زانستی | ٢٠٠٤-٢٠٠٥ | ٢٠٠٥-٢٠٠٦ | ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ٢٠٠٧-٢٠٠٨ | ٢٠٠٨-٢٠٠٩ | ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ٢٠١٠-٢٠١١ | سەرجەمێ گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پرۆفیسۆر | - | - | - | - | - | - | - | |
| پرۆفیسۆر.هـ | ٣ | ١ | ١ | ١ | ١ | - | ١ | ٨ |
| مامۆستا | ١٨ | ١٥ | ١٥ | ١٠ | ١٣ | ١٨ | ١٤ | ١٠٣ |
| مامۆستا. هـ | ٣٥ | ٣٧ | ٦١ | ٥٢ | ٣٨ | ٦٢ | ٢٩ | ٣١٤ |
| سەرجەمێ سالێ | ٥٦ | ٥٣ | ٧٧ | ٦٣ | ٥٢ | ٨٠ | ٤٤ | ٤٢٥ |

**خشتەیێ ژمارە (٣) پلا زانستی یا مامۆستا و وانەبێژێن پەیمانگەها تەكنیكی - دهۆك ٢٠١١ - ٢٠١٢ تاكو ٢٠١٤- ٢٠١٥**

| پلا زانستی | ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٢٠١٢-٢٠١٣ | ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ٢٠١٤- ٢٠١٥ | سەرجەمێ گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| پرۆفیسۆر | | | | | |
| | - | - | - | - | - |
| | | | | | |
| پرۆفیسۆر.هاێ | | | | | |
| | ١ | ١ | ١ | ٢ | ٥ |
| | | | | | |
| مامۆستا | | | | | |
| | ٨ | ٦ | ٥ | ٥ | ٢٤ |
| مامۆستا. هاێ | | | | | |
| | ٤٠ | ٤٠ | ٤٠ | ٤ | ١٢٤ |
| | | | | | |
| سەرجەمێ سالێ | ٤٩ | ٤٧ | ٤٦ | ١١ | ١٥٣ |



**خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن پەیمانگەها تەکنیکی- دهۆك ١٩٨٩ - ١٩٩٠ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥**

| سالێن دەرچوونێ | رۆیڤان | | بیناکاری | | میکانیك | | چارەسەریا سرۆشتی | | نەخۆشەڤانی | | شرۆڤەکرنا نەخۆشیا | | سرکردن | | کۆما ژمارا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | نێر | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ١٩٩٠/١٩٨٩ | ٢١ | ٧ | | | | | | | | | | | | | ٢٨ |
| ١٩٩١/١٩٩٠ | ١٧ | ٧ | | | ٢٥ | ٤ | | | | | | | | | ٥٣ |
| ١٩٩٢/١٩٩١ | ٤٢ | ٢٠ | | | ٤٨ | ٥ | | | | | | | | | ١١٥ |
| ١٩٩٣/١٩٩٢ | ٣٢ | ١٦ | | | ٢٩ | - | | | | | | | | | ٧٧ |
| ١٩٩٤/١٩٩٣ | ٢٧ | ٤ | | | ١٧ | ١ | | | | | | | | | ٤٩ |
| ١٩٩٥/١٩٩٤ | ١١ | ١ | | | ١٠ | ١ | | | | | | | | | ٢٣ |
| ١٩٩٦/١٩٩٥ | ١٦ | ٤ | | | ٦ | ١ | | | | | | | | | ٢٧ |
| ١٩٩٧/١٩٩٦ | ١٠ | ٣ | | | ٨ | - | | | | | | | | | ٢١ |
| ١٩٩٨/١٩٩٧ | ١٣ | ٨ | | | ١٣ | - | | | | | | | | | ٣٤ |
| ١٩٩٩/١٩٩٨ | ١٨ | ٦ | | | ١٣ | - | | | | | | | | | ٣٧ |
| ٢٠٠٠/١٩٩٩ | ٢٤ | ١٤ | | | ٢٧ | ٧ | ٢٣ | ٥ | | | | | | | ١٠٠ |
| ٢٠٠١/٢٠٠٠ | ٣٠ | ٢٠ | | | ٣٠ | ٣ | ٨ | ٤ | | | | | | | ٩٥ |
| ٢٠٠٢/٢٠٠١ | ٢٩ | ٢١ | | | ٤٤ | ١٥ | | | ١٧ | ١٩ | | | | | ١٤٥ |
| ٢٠٠٣/٢٠٠٢ | ٢٧ | ٧ | ١٣ | ١٣ | ٣١ | ٣٥ | | | ١١ | ١٢ | ١٥ | ١٤ | | | ١٧٨ |
| ٢٠٠٤/٢٠٠٣ | ٢١ | ٦ | ٢١ | ١٤ | ٦١ | ٢٣ | ٩ | ٤ | ١٩ | ١٨ | ١٦ | ١٠ | | | ٢٢٢ |
| ٢٠٠٥/٢٠٠٤ | ١٥ | ٣ | ٢٦ | ١٦ | ٤٤ | ١٢ | | | ٢٠ | ٣٣ | ٢٠ | ٢١ | ١٨ | ٨ | ٢٣٦ |
| ٢٠٠٦/٢٠٠٥ | ٢٥ | ١٦ | ١٦ | ١٣ | ٣٩ | ٨ | | | ١٦ | ٢١ | ٨ | ١٥ | | | ١٧٧ |
| ٢٠٠٧/٢٠٠٦ | ٢٤ | ١٤ | ١٣ | ١١ | ٣٨ | ٦ | | | ١٩ | ١٩ | ١٠ | ١٢ | | | ١٦٦ |
| ٢٠٠٨/٢٠٠٧ | ٢٣ | ١٤ | ٢٦ | ١٣ | ٣٢ | ١ | | | ٢٩ | ٢١ | | | | | ١٥٩ |
| ٢٠٠٩/٢٠٠٨ | ٣١ | ١٦ | ٢٥ | ٨ | ٢٧ | ١٨ | | | ٣٤ | ٣١ | | | | | ١٩٠ |
| ٢٠١٠/٢٠٠٩ | ٥٤ | ١١ | ٢٣ | ٢٥ | ٢٧ | ١٧ | | | ٢٥ | ١٥ | | | | | ١٩٧ |
| ٢٠١١/٢٠١٠ | ٢٩ | ٢٠ | ١٨ | ٢٣ | ٥ | ١٨ | | | ٢٦ | ١٦ | | | | | ١٥٥ |
| ٢٠١٢/٢٠١١ | ٣٣ | ٢٠ | ٢٨ | ٢١ | ١٠ | ١٢ | | | | | | | | | ١٢٤ |
| ٢٠١٣/٢٠١٢ | ٤٠ | ٣٣ | ٢٠ | ٣١ | ٢٠ | ٢٢ | | | | | | | | | ١٦٦ |
| ٢٠١٤/٢٠١٣ | ٣٧ | ١٤ | ٢٣ | ١٨ | ٢١ | ٧ | | | | | | | | | ١٢٠ |
| ٢٠١٥/٢٠١٤ | | | ٢٦ | ٢٥ | ١٠ | ١٥ | | | | | | | | | ٧٦ |
| کۆما ژمارا | ٦٤٩ | ٣٠٥ | ٢٧٨ | ٢٣١ | ٦٣٥ | ٢٣١ | ٤٠ | ١٣ | ٢١٦ | ٢٠٥ | ٦٩ | ٧٢ | ١٨ | ٨ | ٢٩٧٠ |
| ژمارا گشتی | ٩٥٤ | | ٥٠٩ | | ٨٦٦ | | ٥٣ | | ٤٢١ | | ١٤١ | | ٢٦ | | ٢٩٧٠ |

خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچوویێن پەیمانگەها تەکنیکی- دهۆك ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ تاکو ٢٠١٤ - ٢٠١٥

| سالێن دەرچوونێ | تیشك | | پاراستنا ددانا | | دەرمانسازی | | تەندروستی کۆمەل | | ئافرەتان و مندالبوون | | I.T | | دروستکرنا رێکا | | چێکرنا ددانا | | کۆما ژمارا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٢٠٠٦/٢٠٠٥ | ١٣ | ٧ | | | | | | | | | | | | | | | ٢٠ |
| ٢٠٠٧/٢٠٠٦ | | | ٨ | ١٣ | | | | | | | | | | | | | ٢١ |
| ٢٠٠٨/٢٠٠٧ | ٩ | ٧ | ٩ | ٩ | ٢٠ | ٩ | | | | | | | | | | | ٦٣ |
| ٢٠٠٩/٢٠٠٨ | ١٣ | ١٦ | ٩ | ١٧ | ٣٨ | ٢٦ | | | | | | | | | | | ١١٩ |
| ٢٠١٠/٢٠٠٩ | ١٩ | ٢٣ | ١١ | ٢٢ | ٤١ | ١٥ | | | | | | | | | | | ١٣١ |
| ٢٠١١/٢٠١٠ | | | ٢١ | ٢٠ | ٤١ | ٢٢ | ٢٠ | ١٥ | | | | | | | | | ١٣٩ |
| ٢٠١٢/٢٠١١ | | | ١٠ | ٢٠ | ٣٦ | ٢٣ | ٢٨ | ٢٢ | - | ٢٥ | | | | | | | ١٦٤ |
| ٢٠١٣/٢٠١٢ | | | ٢٥ | ١٦ | ٦٠ | ١٨ | | | - | ٤٩ | | | | | | | ١٦٨ |
| ٢٠١٤/٢٠١٣ | | | ١٨ | ١٤ | ٣٠ | ١٦ | ١٣ | ٢٣ | - | ٣٥ | ١٩ | ٨٤ | | | | | ٢٥٢ |
| ٢٠١٥/٢٠١٤ | | | | | ٤٨ | ١٩ | ٣٥ | ١٩ | - | ٥٧ | ٢٦ | ٤٨ | ٣٢ | ٢١ | ٢١ | ١٩ | ٣٤٥ |
| کۆما ژمارا | ٥٤ | ٥٣ | ١١١ | ١٣١ | ٣١٤ | ١٤٨ | ٩٦ | ٧٩ | - | ١٦٦ | ٤٥ | ١٣٢ | ٣٢ | ٢١ | ٢١ | ١٩ | ١٤٢٢ |
| ژمارا گشتی | ١٠٧ | | ٢٤٢ | | ٤٦٢ | | ١٧٥ | | ١٦٦ | | ١٧٧ | | ٥٣ | | ٤٠ | | ١٤٢٢ |
| ژمارا گشت دەرچوویان | | | | | | | | | | | | | | | | | ٤٣٩٢ |

(پشكا نەخۆشەڤانیا ئافرەت و زارۆك بوونێ[٢١١] و پشكا تەندروستی كۆمەل)[٢١٢].

د وارێ پێشخستنا ئاستێ زانستی یێ مامۆستایان پەیمانگەهێ دەلیڤە خۆشكریە ژ بۆ خواندنا بلند ل زانكۆیێن دهۆك و سەلاحەدین و ژ دەرڤەی وەلاتی، وشیایە سالانە ژمارەكا بەرچاڤ یا مامۆستایان د بسپۆرییێن جودا جودا دا بۆ خواندنا ماستەر و دكتۆرایێ بهنێریتە زانكۆیێن ناڤبری[٢١٣].

پشتی زانكۆیا پۆلیتەكنیكی یا دهۆك ل رێكەفتی ٢٠١٢/٨/٧ێ هاتییە دامەزراندن پەیمانگەهێن پارێزگەهێ ژ لایێ كارگێری و زانستی ڤە ب زانكۆیا ناڤبری ڤە هاتنەگرێدان. تا سالا ناڤبری پەیمانگەها تەكنیكی دهۆك شیایە باوەرنامەیا دبلۆمی ب بسپۆرییێن جودا جودا بدەتە پتر ژ (٣٥٥٠) خویندكاران ژ كور و كچان، بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٢ - ٢٠١٣ێ پشكا I.T هاتە ڤەكرن، هەروەسا پەیمانگەهێ بریاردایە خواندن ل هەردو پشكێن (پاراستنا دانا و رۆپیڤان) بهێنە گرتن (راوەستاندن) ول جهی وان هەردو پشكێن (دروستكرنا رێكا وپشكا چێكرنا دانا) بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٣ - ٢٠١٤ێ بهێنە ڤەكرن[٢١٤].

## پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ

ل رێكەفتی ٢٠٠١/١٠/١ێ پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ هاتییەدامەزراندن، و سەر ب دەستەیا پەیمانگەهێن تەكنیكی هەولێر ڤەبوویە. بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠١ - ٢٠٠٢ێ بتنێ پشكا (سیستەمێن كۆمپیوتەری) هەبوویە. بۆ سالا خواندنێ ٢٠٠٢ -٢٠٠٣ێ (پشكا رێڤەبرنا یاسایی و پشكا تەكنەلۆجیا سەرچاڤێن ئاڤێ) ژی ل پەیمانگەهێ زێدەبووینە.[٢١٥] ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ێ پشكەكا پزیشكی ل پەیمانگەهێ بناڤێ پشكا نەخۆشەڤانی زێدەبوویە و ل هەمان وەرزێ خواندنێ دەست ب وەرگرتنا خویندكاران كرییە[٢١٦]. بۆ وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ێ پشكا ژمێریاری پێنجەمین پشكا زانستی بوویە ل پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ هاتییەڤەكرن[٢١٧]. ژ بەر پێدڤییا دەڤەرێ ب كادرێ ناڤنجی و بسپۆر ب وارێ رووپیڤانێ دا، لەورا ل وەرزێ خواندنێ ٢٠٠٧ - ٢٠٠٨ێ پشكا رۆپیڤانێ ل پەیمانگەهێ هاتەڤەكرن، بۆ هەمان سال (٢٧) خویندكارێن كور و كچ لێ هاتینە وەرگرتن[٢١٨].

ژ بۆ پیتەدان ب كەرتێ چاندنێ و گەشەكرنا ئابوورێ دەڤەرێ ب رێكێن زانستی ل ورزێ خواندنێ ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ێ پشكا رەزگەری ل پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ هاتەدانان[٢١٩]. زێدەباری ڤەكرنا پشكا كارگێری یاسا و پشكا ژمێریاری (ئێڤاران)، لێ ژ بەر نەبوونا ستافێ پێدڤی یێن مامۆستایێن بسپۆر پشكا ژمێریاری هاتە دائێخستن، بۆ سالا خواندنێ ٢٠١١ - ٢٠١٢ێ پشكا سیستەمێن كۆمپیوتەر (ئێڤاران) ژی هاتەڤەكرن[٢٢٠].

پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ سال بۆ سالێ پێشكەفتن بخۆڤە دیتییە، نەخاسمە ژ لایێ ڤەكرنا پشكێن زانستی و بەرهەڤكرنا مامۆستایێن بسپۆر و هنارتنا وان ژ بۆ تەمامكرنا خواندنا بلند وەك ماستەر و دكتۆرایێ ل زانكۆیێن دهۆك و سەلاحەدین و ژدەرڤەی كوردستانێ، زێدەباری دابینكرنا ئاڤاهی و كەرەستێن پێدڤی و دروستكرنا لابۆرین خواندنێ و تاقیگەهان و زێدەكرنا هۆلێن خواندنێ، و دابینكرنا بەشێن ناڤخۆیی بۆ خویندكارێن ژ دەرڤەی بازێری[٢٢١]

## ئێكەم جڤاتا پەیمانگەها تەكنیكی یا ئاكرێ:

١- جەهوەر عەلی عەزیز راگر سەرۆكێ جڤاتێ

٢- صالح عەلی فەقی جێگرێ راگری ئەندام

٣- لەتیف محەمەد عەلی س. پشكا سەرچاڤێن ئاڤێ ئەندام

٤- شاكر فەتاح كاك س. پشكا سیستەمێن كۆمپیوتەری ئەندام

٥- هەڤال صەدیق ئیسماعیل س. پشكا رێڤەبرنا یاسایی ئەندام

**خشتەیێ ژمارا خویندکارێن دەرچووێن پەیمانگەها تەکنیکی یا ئاکرێ ل دووڤ سالێن خواندنێ ٢٠٠١ – ٢٠٠٢ تاکو ٢٠١٤ – ٢٠١٥**

| سالێن دەرچوونێ | سیستەمێن کۆمپیوتەری | | سەرچاڤێن ئاڤێ | | رەزگەری | | کارگێری یاسا | | نەخوشەڤانی | | ژمێریاری | | رۆپیڤان | | تەکنەلۆیا زانیاریان | | گشتگیری جۆری | | کۆژمێ سالێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٢٠٠١-٢٠٠٢ | ٦ | ١٦ | | | | | | | | | | | | | | | | | ٢٢ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | ٢٧ | ٢٠ | | | | | ٨ | ٥ | | | | | | | | | | | ٦٠ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٤ | ١٧ | ٨ | ١٦ | ٤ | | | ١٨ | ٨ | | | | | | | | | | | ٧١ |
| ٢٠٠٤-٢٠٠٥ | ١٥ | ١٠ | ١٠ | ٩ | | | ١٩ | ٦ | | | | | | | | | | | ٦٩ |
| ٢٠٠٥-٢٠٠٦ | ١٢ | ٨ | ٥ | ٢ | | | ١٠ | ٣ | | | | | | | | | | | ٤٠ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ٧ | ٤ | | | | | ٣٨ | ٩ | ١٩ | ٥ | | | | | | | | | ٨٢ |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٨ | ١٢ | ٨ | | | | | ٣٥ | ٦ | ٥ | ٣ | ٢٠ | ١٢ | | | | | | | ١٠١ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٩ | ١٩ | ١٧ | | | | | ٢١ | ١٤ | ١٨ | ٢٠ | ٣٤ | ١٢ | ١١ | ٨ | | | | | ١٧٤ |
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ٣٦ | ٣٨ | | | ٤٠ | ٢٨ | ٤٠ | ٢١ | ٢١ | ١٣ | ٨٩ | ٤٤ | ٢٨ | ١٠ | | | | | ٤٠٨ |
| ٢٠١٠-٢٠١١ | ٣٢ | ٣٦ | | | ١٢ | ١ | ١٠٦ | ٨٠ | ٢٨ | ١٩ | ١٢٦ | ٦٩ | ٣٢ | ١١ | | | | | ٥٥٢ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | ٥٠ | ٥٧ | | | ٨ | ١٣ | ١٥١ | ٦٣ | ٤٤ | ٢٩ | ٣٦ | ٩ | ٤٦ | ١١ | | | | | ٥١٧ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | ٥١ | ٦٥ | | | ١٢ | ٩ | ١٣٢ | ٧٥ | ٤٧ | ٢٩ | | | ٤٤ | ١٦ | | | | | ٤٨٠ |
| ٢٠١٣-٢٠١٤ | | | | | ٣ | ٩ | ٩٠ | ٥٥ | ٣٥ | ٢٦ | | | ٣٨ | ١١ | ٦ | ٢١ | | | ٢٩٤ |
| ٢٠١٤-٢٠١٥ | | | | | | | ١٩ | ١ | ٥٥ | ٣٤ | | | ٦٦ | ١٥ | ١٤ | ٣٧ | ٢٠ | ٥٨ | ٣١٩ |
| کۆژمێ گشت سالان | ٢٨٤ | ٢٨٧ | ٣١ | ١٥ | ٧٥ | ٦٠ | ٦٨٧ | ٣٤٦ | ٢٧٢ | ١٧٨ | ٣٠٥ | ١٤٦ | ٢٦٥ | ٨٢ | ٢٠ | ٥٨ | ٢٠ | ٥٨ | ٣١٨٩ |
| کۆژمێ گشتی | ٥٧١ | | ٤٦ | | ١٣٥ | | ١٠٣٣ | | ٤٥٠ | | ٤٥١ | | ٣٤٧ | | ٧٨ | | ٧٨ | | ٣١٨٩ |

هژمارەکا جودا جودا یا بۆیاغان دهێنە بکارئینان وەك: بۆیاغێن سنوسم یێن سپی، بۆیاغێن ئەمولشن یێن ئاڤی، بۆیاغێن دوهنی یێن تەیسۆك و بۆیاغێن وارنیش و ئەیبوکسی.

هەردو بۆیاغێن سنوسم و ئەمولشن دهێنە بکارئینان بۆ بۆیاغکرنا کونکریتی وگێچی، بۆیاغێن دوهنی دهێنە بکارئینان بۆ بۆیاغکرنا کونکریتی و بەران و ئاسنی و داران. بۆیاغێن وارنیش دهێنە بکارئینان بۆ بۆیاغکرنا دارا وەك دەرگەهـ و پەنجەرێن داری. بۆیاغێن ئەیبوکسی ژی دهێنە بکارئینان بۆ بۆیاغکرنا عەمبارێن ئاڤێ و کەرەستەیێن کیمیایی و هندەك کەلوپەلێن تایبەت.

## ٧ -چیمەنتو :

چیمەنتۆ کەرەستەیەکێ ئاڤاکرنێ یە ل سەر شێوەیێ تۆز یان ئارکەکێ رەنگ رساسی. چیمەنتۆ وەك کەرەستەیەکێ هەڤبەند یان پێکڤەگرێدەر دهێتە بکارئینان ژ بەرکو زوو هشك و رەقدبیت و ب ڤێ چەندێ هندەك تایبەتمەندیێن پێکڤەگرێدان و نویسەك وەردگریت، ژ بەرکو ئاڤ دناڤدا هەیە، ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر ئەو بشێت کەرەستەیێن کونکریتی پێکڤە گرێدەت.

چیمەنتو دهێتە بکارئینان بۆ دروستکرنا جەبلێ

وێنەیێ ٢٥



ئەوژی کو پشتی دگەل هندەك کەرەستەیێن دی یێن سرۆشتی دهێتە تێکەلکرن وەك خیزی .

دیرۆکا پەیدابوونا چیمەنتۆیێ بۆ سەردەمێ رۆمانیان دزڤریت لێ ئەو چیمەنتۆیا ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە دهێـە بکارئینان هەتا چەرخێ نوزدێ ژی نەهاتبوو دیارکرن و بکارئینان.

ب شێوەیەکێ سەرەکی چیمەنتۆ ژ تێکەلەکێ بەرێن جیری وەك بەرێن کسلی و تەقنێ پێکدهێت و پاشی هندەك کەرەستەیێن دی یێن بنەرەت ل سەر دهێنە زێدەکرن .

چیمەنتۆ دگەل خیزی ب رێژەیێن گونجایی دگەل ئێك دهێنە تێکەلکرن. پاشی دێ ئاڤ ل سەر هێتە زێدەکرن هەتا دبیتە هەڤیرەکێ نەرم و ل دووڤدا دێ بۆ کارێن ئاڤاکرنێ هێتە بکارئینان وەك پێکڤەگرێدانا بلۆکان یان ژی کارێ لەبخکرنا دیواران و بنبانێ خانییان و فەرشێن ژووران.

هەروەسا چیمەنتو و خیز و بەرێن حەسووی دێ ب رێژەیێن گونجایی دگەل ئێك هێنە تێکەلکرن ژ بۆ ب دەستڤەئینانا هەڤیرەکێ کونکریتی و ژ بۆ پرکرنا بنێ خانییان و دروستکرنا سەربانان. گەلەك جاران ژی شیشکێن ئاسنی دگەل کونکریتی دهێتە بکارئینان ژ بۆ ب دەستڤەئینانا کەرەستەیەکێ کونکریتی یێ ب هێز کو دهێتە بکارئینان ژ بۆ کارێن بنیاتی یێن ئاڤاکرنێ و دانانا ستوونێن خانییان و سەربانان. ل سەردەمێ بەرێ ئەڤ کەرەستەیە ب دەستی و هاریکاریا مەرێلکان و تێکەلکەرێن (خەباتێن) بدائی دهاتنە تێکەلکرن (وینە-٢٥ )(لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆکە دا تێکەلکەرێن (خەباتێن) ناڤەندی یێن ئۆتوماتیکی دهێنە بکارئینان (وینە- ٢٦).

## ٨ - شیشکێن ئاسنی یێن پیلای

ژ کەڤن دا ئاسن ژ ئالیێ مرۆڤان هاتیە بکارئینان خۆ ژ وی دەمی یێ ل شکەفتان دژیان، لێ هێدی هێدی بەرهەم ئینانا ئاسنی پێشکەفت تایبەت پشتی بەرهەمئینانا چیمەنتۆی. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە دا چەندین جۆرێن شیشکێن ئاسنێ پیلا یێن حوولی

وێنەیێ ٢٦



و شیشکێن ئاسنی یێن زڤر و خرك (Deform) دهێنە دروستکرن ب شێواز و قەبارەیێن جودا جودا. هەژی کوتنێ یە ئاسنێ پیلای سەبیکەکە پێك دێت ژ ئاسنێ و کاربونی ب رێژەیەکا تایبەت .

## - پشکا دووی
## ئامیرێن ئاڤاکرنێ ل دەڤەرا دهۆکێ

### ١. مەربێلك:

ئامرازەکێ دەستی یە کو د کەڤندا ئەڤرۆکە ژی دهێتە بکارئینان ژ بۆ مەرەمێن کۆمکرن و تێکەلکرنا

وێنەیێ ٢٧



وێنەیێ ٢٨



کەرەستەیێن ئاڤاکرنێ وەك ئاخ و کسل و گێچ و حەسوو و خیزی. ئەڤ ئامیرە ژ سەرەکی داری یێ گرۆڤر و درێژ پێکدهێت کو فرەهیا وی نێزیکی ٥ سەنتیمەتر و درێژیا وی دناڤبەرا ١٢٠ بۆ ١٨٠ سەنتیمەتران دایە و سەرەکێ پەحن یێ ئاسنی پێڤە هەیە (وینە-٢٧).

### ٢. زەنبیل:

ئامرازەکێ کەڤنە ل سەر شێوەیێ چالەکێ کو درێژیا سەرێ وی نێزیکی ٥٠ سەنتیمەتر و درێژاهیا بنێ وی نێزیکی ٣٠ سەنتیمەترانە و دوو دەستك پێڤە هەنە. دهێتە بکارئینان بۆ هەلگرتن و ڤەگوهاستنا کەرەستەیێن ئاڤاکرنێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی وەك خیز و گێچ و کسل و بەرێن پرت پرت کری(وێنە -٢٨).

وێنەیێ ٢٩



وێنەیێ ٣٠



### ٣. قەزمە:

ئامرازەكێ دەستییە ژ كەڤن هەتا نها ژێ دهێتە بكارئینان ژ بۆ كۆلانا ئاخێ. ئەڤ ئامرازە ژ دو پارچەیان پێكدهێت، ئەوژی دەستكەكێ داری ب درێژیا ٦٠-٨٠ سەنتیمەتران و فرەهیا ٥-٨ سەنتیمەتران. هەروەسا سەرەكێ ئاسنی یێ تیژ( وێنە – ٢٩ ).

### ٤. مەرچ:

ئامرازەكێ دەستی یە كو د كەڤن دا هاتییە بكارئینان و سەردەمێ ئەڤرۆ ژی ل هندەك جهان هێشتا دهێتە بكارئینان ژ بۆ شكاندنا بەران. ئەڤ ئامرازە پێكدهێت ژ دو پارچەیان ئەوژی دەستكەكێ داری ب درێژیا ٥٠-٨٠ سەنتیمەتران و فرەهیا ٣-٤ سەنتیمەتران. هەروەسا سەرەكێ ئاسنی یێ گران كو سەنگا وی دناڤبەرا ٥٠ هەتا ١٠٠ كیلوگرامان دایە (وێنە -٣٠ ).

### ٥. میجرەڤ :

ئامرازەكێ دەستی یێ كەڤنە، ژ دو پارچەیێن ئاسنی و داری پێكدهێت، دهێتە بكارئینان بۆ كۆمكرنا گێچێ و ئامادەكرنا هەڤیرێ گێچێ (وێنە -٣١ ).

### ٦. سێل:

سێنیەكا ئاسنی یا مەزنە و فرەهیا وێ دناڤبەرا

وێنەیێ ٣١



٥٠- ٦٠ سەنتیمەتران دایە و دكەڤن دا هاتییە بكارئینان، ئەڤرۆكە ل هندەكان جهان بكارئینان بۆ ئامادەكرنا هەڤیرێ گێچێ و خیزی و چیمەنتۆی(وێنە – ٣٢ ).

وێنەیێ ٣٢



### ٧.مالنج :

ئامرازەكێ دەستییە د كەڤندا و نها ژی ل هندەك جهان هێشتا دهێتە بكارئینان ژ بۆ رێكخستن و هەڤسەنگكرنا روویێن دیواران و فەرشێ عەردی و سەربانان یێن ب كونكریتێ هاتییە دروستكرن. ئەڤ ئامرازە ژ پارچەیەكا داری یان ئاسنی پێكدهێت، زێدەباری بنكەكێ ئاسنی یێ پەحن ب دووراتیێن (١٠X٢٠) سانیتمەتر ( وێنە- ٣٣ ).

وێنەیێ ٣٣



## ٨. چەمچە (کاجك):

ئامرازەکێ دەستی یە کو د کەڤندا هاتییە و نها ژی دهێتە بکارئینان ژ بۆ رێکخستن و دانانا دیواران وکونکریتێ و هەڤسەنگکرنا روویێن وان. ئەڤ ئامرازە ژ دەستەکەکێ داری و بنکەکێ ئاسنی یێ پەحن ب دووراتیێن (٧X ١٤)-(٢٠X١٠) سانیتمەتر پێکدهێت (وێنە - ٣٤).

## ٩. راستەهێل:

ئامرازەکێ دەستییە ژ کەڤن هەتا نها دهێتە بکارئینان ژ بۆ رێکخستن و هەڤسەنگکرنا روویێن دیواران و روویێن کونکریتی و لەبخا دیواران و بنبانان و راستکرنا روویێ دیوارێن گێچێ ( وێنە — ٣٥ ).

ئەڤ ئامرازە راستەهێلەکێ درێژە یان ژی پارچەیەکا

وێنەیێ ٣٤



وێنەیێ ٣٥





داری یان ئەلەمنیومی یا راست و درێژ یان چوارگۆشە یان لاکێشەیی یە و درێژیا وان دناڤبەرا ١-٣ مەتران دایە.

## ١٠. میزان (قەپان):

ئامیرەکێ دەستییە دهێتە بکارئینان بۆ دیارکرنا روویێ ئاسوویی و ستوونی یێ یەکەیێن ئاڤاهیيان و ژ داری یان ئەلەمنیومی دهێتە دروستکرن و دو پەقیشك یێن تێدا ئێك یا ستوونی و ئێك یا ئاسوویی یە و درێژیا وان دناڤبەرا ٣٠-٢٠٠ سەنتیمەتران دایە ( وێنە — ٣٦ ).

وێنەیێ ٣٦



وێنەیێ ٣٧



### ١١.سەتل:

ئامرازەکێ دەستییە هەتا نها دهێتە بکارئینان. دکەڤن دا ئەڤ سەتلە ژ ئاسنی و ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ژ پلاستیکی دهێنە دروستکرن، ژ بۆ ڤەگوهاستنا کەرەستەیێن وەکی ئاڤێ و کونکریتی دهێتە بکارئینان (وێنە – ٣٧ ).

### ١٢. شاقۆل:

ئامرازەکێ دەستییە هەتا نها دهێتە بکارئینان ژ بۆ دەستنیشاکرنا ستووناتییا یەکەیێن ئاڤاهیان (وێنە – ٣٨).

### ١٣. دەزیێ هۆستای:

دەزیەکی قایمە وەکی بەندکەکی زراڤە وهندەك جاران دەزیێ چللەی ب کار دئینن ژ کەڤن هەتا نها

وێنەیێ ٣٨



وێنەیێ ٣٩



دهێتە بکارئینان ژ بۆ دیارکرنا رێك راوەستیانا دیواران و روویان. هەروەسا ژ بۆ دانانا بنیات و دیوارێن خانییان.

### ١٤. چەکوچ (ماهۆل):

ئامرازەکێ دەستی پێکدهێت ژ دەستکەکێ داری یان پلاستیکی و سەرەکێ ئاسنی دهێتە بکارئینان بۆ لێدانا بزماران ل سەر دیواران و لێدانا قەلەمێن ئاسنی ژبۆ شکاندنا بەرێن رەق و سەبەیێن کونکریتی ( وێنە - ٣٩ ).

### ١٥. دەستگۆرك:

دەستگورگێن پلاستیکی و قوماشی ژ ئالیێ کرێکاران ڤە دهێنە بکارئینان ژ بۆ پاراستنا دەست و تبلێن وان ژ زیانێن کەرەستەیێن ئاڤاکرنێ ( وێنە -٤٠ ).

وێنەیێ ٤٠



وێنەیێ ٤١



### ١٦. دۆسە

هندەك گاریتەیێن داری یان ئەلەمنیومی یان ئاسنی نە ب دووراتیێن ٢٠-٣٠ فرەهی و ٥ سەنتیمەتر ستووراتی و ٤ مەتر درێژاهی. دهێنە بكارئینان ل دەمێ دانانا دیواران و لەبخكرنا وان ب رەنگەكی دێ دووسەیا ل سەر دو بەرمیلێن ئاسنی هێتە دانان و پاشی دێ كرێكار چیتە سەر هەتا بگەهیتە وی ئاستێ پێدڤی ژ بۆ كاركرنێ.

### ١٧. باگوردان:

ئامیرەكێ دەستی یە ژ دو پارچەیان پێكدهێت ئەوژی دەستەكەكێ ئاسنی ب فرەهیا ١٢ مللیمەتران و پارچەیەكا بەری یا مەزن یا لۆلەكی ب درێژیا ٤٠-٦٠ سەنتیمەتر و فرەهیا ٣٠-٤٠ سەنتیمەتر. ئەڤ ئامیرە دهێتە بكارئینان ژ بۆ راستكرنا ئاخێ ل سەر بانان و رێكان.

وێنەیێ ٤٢



### ١٨. نیسكەلە:

دكەڤندا دگۆتنە ڤی ئامرازی (ئەشقیلە). كو پێكدهێت ژ هندەك پارچەیێن داری ل سەر شێوەیێ سێگوشەیەكێ د گۆتنی (جەحشك)و پاشی دێ ب دیواری ڤە هێتە هەلاویستن و پرەكا داری ل سەر هێتە دانان و ل دووڤ دا دێ دووسە ل ئەشقیلەیێ هێتەدانان و پاشی دێ كرێكار ل سەر شول كەن ب تایبەت ل دەمێ لەبخكرنێ.

لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆكە دا هندەك پێستركێن داری یان ئاسنی دهێنە بكارئینان، پێستركا داری ژێ ژ هندەك پارچەیێن داری پێكدهێت كو ب هاریكاریا بزماران پێكڤە دهێنە گرێدان و بۆ كارێن ئاڤاكرن و لەبخكرنێ دهێنە بكارئینان. پێستركێن ئاسنی ژێ ژ بۆریێن ئاسنی و پیلایی پێكدهێن و ب هاریكاریا هندەك بۆرغیبان و چەنگالان پێكڤە دهێنە گرێدان كو ب سانەهی ڤەدبن و دهێنە گرتن (وێنە – ٤٢).

### ١٩. راویە:

وەكی كیسكەكێ نایلونی یان لاستیكی یە كو ژ هەردو لایێن سەری ڤە پێكڤە دهێنە گرێدان و دكەڤندا ژ بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤێ ژ كانی وبركان

وێنەیێ ٤٣



وێنەیێ ٤٤



دهاتە بکارئینان بۆ جهێ کارکرنێ و پتریا جاران ب پشتا دەوارانڤە دکر. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە دا هندەك سەتلێن مەتاتی دهێنە بکارئینان کو ب ترۆمبێلان دهێنە ڤەگوهاستن یان ژی ترۆمبێلێ، تایبەت بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤێ دهێنە بکارئینان (وێنە – ٤٣ ).

**٢٠- سەڤیك**

وەکی سەلکەکا شێوە هەرەمی یا بەرۆڤاژیە یان ژی سندۆقەکە کو ژ شڤکێن هندەك جۆرێن داروباری دهاتە دروستکرن ئەوێن بەربەلاڤ ل دەڤەرێ وەك هەلهەلۆك و گێرات و شیناك. ئەڤ ئامرازە دهاتە بکارئینان بۆ ڤەگوهاستنا بەران و ئاخێ پتریا جاران ب پشتا دەواران یان هەسپان ڤە دکر(وێنە- ٤٤).

## - بشکا سیی
## پاشبەندێن ئاڤاهیان
### ١. دەرگەهـ

ل سەر دەمێ بەرێ هەمی دەرگەهێن ژ ناڤدا ژ دارێن باهیڤ و گویز بەری و سپینداران دهاتنە دروستکرن کو دەپێن وان ب ستووراتیا دناڤبەرا (١-٢) سم و فرەهیا وان دناڤبەرا (٨-١٢) سم دابوون و ئەڤ دەپە پێکڤە دهاتنە رێزکرن و گرێدان ب بزمارێن ئاسنی. ئەڤ دەپە د هاتنە برین ب مشارێن دەستی یان مشارێ مەکینا (کانوینی) و نە د هاتە حولیکرن یان رەنین، قفلەبێن دەرگەهان ژی هەر پارچەیەکا داری بوون کو ل پشت دەرگەهی را دلفلڤی و دچوو

وێنەیێ ٤٥



دناڤ دیوارێ ل پشت دەرگەهی. دەرگەهێ دەرەکی ژی هەر ب دارێن سرۆشتی دهاتە دروستکرن لێ هندەك جاران ب تەخەکا تەنك یا تەنەکەی دهاتە نخافتن (وێنە - ٤٥).

سەر دەمێ ئەڤرۆکە، دەرگەهێن ناڤخۆیی یێن ژوورێن خانی ژ داری یان پلاستیکی دهێنە دروستکرن و دەرگەهێن ژوورێن خزمەتگوزاریان وەك لێنانگەهێ ژ ئەلەمنیومی دهێنە دروستکرن. دەرگەهێ سەرەکی یێ چوونا ژوورڤە ژ دارەکێ قائیم، ئەلەمنیوم، پلاستیك یان ژی شووشەی دهێنە دروستکرن هەروەك دەرگەهێن ئاڤاهیێن بلند و پێشانگەهـ و بازاران. دەرگەهێن گەراجان ژی پتریا جاران ژ ئاسنی دهێنە دروستکرن و قفل و کلیل پێڤە هەنە یانژی ژ لایەکی ڤە ڤەدبیت و یانژی بۆ سەری بلند دبیت، هندەك ژ ڤان دەرگەهان ب دەستی یان ژی ب شێوەیەکێ کەهرەبایی ڤەدبن.

هەژی گۆتنێ یە کو دووراتیێن دەرگەهێن بەرێ د بچووك بوون ب رەنگەکی کو فرەهیا وان دناڤبەرا

وێنەیێ ٤٦



(٧٠- ٩٠) سم و بلندیا وان ژی دناڤبەرا (١٨٠-٢٠٠) سم دابوون. لێ دەرگەهێن ئەڤرۆکە فرەهیا وان دناڤبەرا (٨٠- ١١٠)سم و بلنداهیا وان ژی دناڤبەرا (٢١٠-٢٤٠)سم دانە. دەرگەهێن ئەڤرۆکە ب قوفلێن ئاسنی دهێنەگرتن و چەندین جۆر و شێوازێن جودا جودا هەنە لێ هندەك ژی ب دەستی یان كارەبایی ڤەدبن و هندەك دەرگەهێن تایبەت ب كارتان ڤەدبن وەك دەرگەهێن هوتێل و مولێن گشتی.

## ٢-پەنجەر:

سەردەمێ بەرێ، پەنجەر ژ داری دهاتنە دروستكرن تایبەت ل گوندان، لێ ل باژێران سەرەڕای هەبوونا پەنجەركێن داری، پەنجەركێن ئاسنی ژی هەبوون و هەمی پارچەیێن وان ب بۆرغیيان پێكڤە دهاتنە گرێدان. هەروەسا پەنجەرێن بەرێ ژ تەختەكا تەنك یا شووشەی دهاتنە دروستكرن كو ستووراتیا وان نێزیكی(٣)مللیمەتران بوون و قەبارەیێ وان ژی ب هەڤبەركرن دگەل پەنجەركێن نها قەبارەیێن وان ژی گەلەك بچووك بوون، قەبارەیێ وان نێزیكی (٥٠X٥٠) سم بۆ (١٠٠X١٥٠)سم بوون و بۆ مەرەمێن رێگرتنێ ل گەرماتیێ دهاتنە بكارئینان ( وێنە -٤٦ ).

لێ سەر دەمێ ئەڤرۆكە، چ ل گوندان یان باژێران بیت، پەنجەرك ژ داری یان ئاسنی و ئەلەمنیومی یان هەتا پلاستیكی ژی دهێنە دروستكرن و جۆر و قەبارەیێن جودا جودا هەنە. ل ڤی سەردەمی ل پتریا جاران پەنجەركان ژ دو تەخێن جامان شووشەی

وێنەیێ ٤٧



پێكدهێن ب تایبەت پەنجەركێن ئەلەمنیومی و پلاستیكی و پەنجەركێن دەرەكی ئەوژی ژ پێخەمەت مەرەمێن رێگرتنێ ل گەرماتیێ، دووراتیا دناڤبەرا ڤان هەردو جامان دا نێزیكی (١) سەنتیمەتری یە و یا ڤالایە ژ هەوایی، ئەڤ ڤالاهیيە دبیتە رێگر ل هەمبەر تێرابوورینا گەرماتیێ و دەنگان.

قەبارەیێ پەنجەركێن نها ژ یێن بەرێ مەزنترن و گەلەك جاران پتریا دیوارێ ژوورێ دكەنە پەنجەرك داكو دیمەنەكێ جوان ب دەتە ژوورێ، هەروەسا بلنداهیا وان ژی یێن بەرێ بلندترە كو گەلەك جاران هەتا بانی درێژ دبن.

## ٢. دەرەجك و پێسترك

ل سەردەمێ بەرێ، دەرەجكێن داری و ئاسنی و بەری و تەقنێ دهاتنە بكارئینان. دەرەجكێن داری كو دبێژنێ پێسترك، بەهرا پتر ژ دو قورمێن درێژ یێن داری سپینداری یێن راست و درێژ و هەڤسەنگ ب فرەهیا

(٥-١٠) سم دهاتنه دروستكرن. ئەڤ هەردو داره ب دووراتییا (٤٠- ٦٠)سم ژێكدهاتنه دووركرن و پاشی پارچەیێن داری یێن بچووك ل سەر دهاتنه دانان كو دووراتییا ناڤبەرا هەر پارچەیەكێ بۆ ئێكا دی دناڤبەرا (٣٠-٤٠) سم دابوون ( وێنه- ٤٧ ). ئەڤ پێسترکه ب گوشەیەكا تایبەت ل سەر لایەكێ لێڤا بانی دهاته دانان ب ڕەنگەكی كو سەرەك ل سەر عەردی بوو و سەرێ دی دگەهشته بانی. دەرەجكێن بەران یان تەقنێ ژی دناڤبەرا عەردی و سەربانی دا دهاتنه دروستكرن ب فرەهییا (٨٠-١٢٠)سم و ب دووراتییا (٢٥-٣٠) سم (وێنه – ٤٨).

## - پشكا چوارێ
## یەكەیێن ئاڤاهییان ل پاریزگەها دهۆكێ

یەكەیێن ئاكنجیبوونێ ل پاریزگەها دهۆكێ ژچەندین ژوورێن جودا جودا پێكدهێت كو هەر ئێكێ تایبەتمەندی

وێنەیێ ٤٨



و ئەركێن خۆ یێن تایبەت هەنه. ب شێوەیەكێ گشتی ئەم دشێین ب ڤی ڕەنگی دابەش بكەین:

### ١. جهێ تایبەت بۆ مێهڤانان:

ئێكە ژ گرنگترین ژوورێن یەكەیێن ئاكنجیبوونێ. ل سەردەمێ بەرێ رووبەرێ تەرخانكری بۆ جهێ مێهڤانان تنێ ژوورەك بوو دگۆتنێ (كۆچك)، ئەڤ كۆچكه یا مەزن بوو داكو جهێ هژمارەكا مەزن یا مێهڤانان تێڤە بكەت و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤری كو ل بەرێ خەلك گەلەك ب مێهڤانداری دچوونه مالێن هەڤدوو و روونشتن هەمی دەما ل سەر دوشەك و بەڕكا ول سەر ئەردی بو( وێنه – ٤٩)

لێ ل سەر دەمێ ئەڤرۆكه دا، رووبەرێ تەرخانكری بۆ جهێ مێهڤانان ژ دو ژووران پێكدهێت، ژوورا ئێكێ كو دبێژنێ ژوورا پێشوازیێ (كۆچك) یا تایبەته بۆ مێهڤانێن بیانی، ژوورا دووێ ژی كو هۆلەكا مەزنه یا تایبەته بۆ مێهڤانێن نێزیك و خزمان زێدەباری جهێ ڤەحەویانا ئەندامێن خێزانێ ب خۆیه ژی.

گەلەك جاران ژی خێزانێن نها مێهڤانێن خۆ نائیننه مال بەلكو ل خوارنگەهـ و كافیتریا و سەیرانگەهێن دەرەكی مێهڤان دكەن ئەڤان هەردو ژوورا دو دەركەهـ یێن هەین ئێك بۆ ناڤ خانی و یێ دی بۆ ناڤ مەدخەلێ و باهرا پتر نها روونشتن یا ل سەر قەنەفا ودیوانخانەیان.

وێنەیێ ٤٩



### ٢. جهێ تایبەت بۆ نڤستنێ:

بەری سالێن شێستان ئەڤ جهە بۆ مەرەما نڤستنێ دهاتنە بکارئینان. ل وی دەمی خەلك ل سەر عەردی دنڤست، ئانکو وان چ پاشکۆیێن تایبەت د ژوورا نڤستنێ ڤە نەبوون وەك تەخت و تەوالێت و قومسور و عەلاقا جلکان. ئەڤ یەکەیە د دەستپێکی بوون و چ رووبەرێن تایبەت و دەستنیشانکری دناڤ مال دا نەبوون و هەمی ژوور بۆ وان وەکی ژوورێن نڤستنێ بوون.

لێ ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە، گرنگیەکا مەزن ددەنە ژوورێن نڤستنێ، و هەمی پێدڤیێن نڤستنێ تێدا دهێنە دابینکرن وەك تەخت و قومسور و تەوالێت و سەرشوویا ناڤخۆیی و عەلاقا جلکان. ژ بەر هندێ ژی گرنگیەکا زێدەتر ب ڤان ژووران دهێتەدان و رووبەرێ وان ژی بەرچاڤ دهێتە وەرگرتن. هەردیسان پەنجەرکێن ڤان ژووران ژی تا رادەیەکی د بچووکن داکو تایبەتمەندیەکێ ب دەنە ڤان ژووران و د هەمان دەمدا وەك رێگرێن گەرماتیێ کاربکەن.

### ٣. جهێ تایبەت بۆ خزمەتگوزارییان

**لێنانکەهـ (کوچکدان):**

ل سەردەمێ بەرێ، ل گوندان گرنگییەکا مەزن ب لێنانکەهێ نەدهاتە دان بەلکو وان خوارنا خۆ ژ دەرڤەی مالێ دروستکرن ب رەنگەکی دا کوچکەکێ

وێنەیێ ٥٠



بەران یان تەڤنێ چێکەن و ئاگری ل بن هلکەن و خوارنێ ل سەر دروست کەن (وێنە – ٥٠ )، هەروەسا وان ژوورەکا بچووك تەرخان دکر ژ بۆ هەلگرتنا کەلوپەلێن خوارنێ و قووتی ( وێنە – ٥١ ). پشتی وان خوارن بەرهەڤ دکر ژی دا پارچەیەکا قوماشی رائێخن کو دگۆتنێ (فەرش) و خوارن ل سەر دخوار. پشتی ژ خوارنێ ب داوی دهاتن، کەلوپەلێن خۆ ل سەر رووباری یان کانیکێن ئاڤێ یان ژبەر دەرگەهێ مالێ د شووشتن.

ل بازێران ژی، ئەو ژوورا بۆ لێنانکەهێ دهاتییە تەرخانکرن رووبەرێ وێ گەلەك یێ بچووك بوو کو ژ ٢١ مەترین دووجا نەدبووری، و پتریا جاران تنێ ئامیرەکێ لێنانا خوارنێ کو دبێژنێ «تەباخ» و ئامرازەك بۆ هەلگرتنا کەلوپولان کو دگۆتنێ «کەوانتەر» و درێژیا وێ ژ ٢ مەتران نەدبووری، و ئامرازەك ژی بۆ شووشتنا سێنیکان تێڤە بوون. لێنانکەهـ ب چیمەنتۆی و خیزی دهاتنە لەبخکرن و ب بۆیاغێن دوهنی دهاتنە بۆیاغکرن و پەنجەرکەکا ئاسنی یا بچووك ژی پێڤە هەبوو زێدەباری دەرگەهەکێ ئاسنی.

سیستەمێ ئاڤێ ژی دناڤ لێنانکەهاندا یێ سادە بوو ب رەنگەکی وان تنێ هندەك بۆرێێن ئاڤێ یێن ئاسنی بکاردئینان و گەلەك جاران ئەڤ بۆریە ب پارچەیەکا قوماشی یان سوفی د نخافتن ب تایبەت بۆرێێن ئاڤا گەرم. هەروەسا بنێ ژوورا لێنانکەهێ ژی ب کاشیێ موزایکی دهاتە ئامادەکرن.

لێنانکەهێن ئەڤرۆکە گرنگییەکا مەزن پێ دهێتەدان و رووبەرەکێ مەزنتر یێ عەردی بۆ دهێتە تەرخانکرن ب رەنگەکی بەشەکێ لێناگەهێ وەك خوارنگەهـ دهێتە بکارئینان، هەروەسا گشت پێدڤیێن لێنانکەهێ تێدا هەنە وەك جهێ شووشتنا سێنیکان کو ژ کەرەستێ سونیمەرمەر دهێتە دروستکرن، زێدەباری تەباخ و ئامیرێ شووشتنا سێنیکان و بەفرگر و فرنا کارەبایی و کۆمەکا کەوانتەرێن تایبەت بۆ هەلگرتنا ئامانان کو ب دیواری ڤە دهێنە گرێدان.

هەروەسا دیوار و فەرشێ لێنانکەهێ ب

وێنەیێ ٥١



سیرامیکی یان پورسەلینی یان مەرمەری دهێنە نخافتن. سیستەمێ ئاڤێ ژی بێ پێشكەفتیە ب ڕەنگەكی كو بۆرێن پلاستیكی بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤا پاقژ و ئاڤا پیس دهێنە بكارئینان. پەنجەركێن وێ ژی ب ئەلەمینومی یان پلاستیكی دهێنە دروستكرن، لێ دو دەركەهـ یێن هەین دەرگەهێ ژوورفە وێ ب داری یان ژی ئەلەمنیوم و پلاستیكی دهێتە دروستكرن ودەرگەهی ژدەرڤـە ب پلاستیكی یان ئاسنەكێ تایبەت تێتە دروستكرن.

**خوارنگەهـ :**

ل سەر دەمێن بەرێ هەتا سالێن بەری شێستان، جهەك نەبوو چ ل گوندا یان ل باژێرا ب ناڤێ خوارنگەهـ ل ناڤ خانیدا بەلكو خوارن ل ئەردی و ل ناڤ سێنیەكا مەزن دادنا، بەلێ بشتی سالێن حەفتییا خەلك پێدڤی ب جهەكێ تایبەت بوو ژ بۆ خوارنێ ل ناڤ خانی ل ناڤبەرا كۆچكێ و لێنانكەهێ و ناڤ لینا خوارنكەهـ.

بەلێ پشتی سەرهلدانێ و پشتی سەیرانگەهـ ل ناڤ باژێری پەیدابوین ئەڤ جهە رۆژ بۆ رۆژێ ل ناڤ خانییان هاتە لادان، بەلكو جهەكێ تایبەت ل ناڤ لێنانكەهێ هاتە تەرخانكرن بۆ خوارنكەهێ و مێزەكا تایبەت ل ناڤ لێنانكەهێ هاتە دانان.

**سەرشوو:**

ل سەر دەمێن بەرێ هەتا سالێن بەری شێستان، جهەك نەبوو ب ناڤێ سەرشوو دناڤ خانیدا، بەلكو وان رۆژەك ژ رۆژێـن حەفتیێ كو بەهرا پتر رۆژێن پێنج شەمبی و ئەینی بوون تەرخان دكرن بۆ جل و سەرشووشتنێ. ل ڤێ رۆژێ ئەو دا چنە سەر لێڤێن رووبارەكی یان كانی و بركان و بالاڤا خۆ كەن.

پشتی هینگێ وان گۆشەیەك ژ گۆشێن ناڤ خانی بۆ سەرشووشتنێ تەرخان دكر كو بنێ وێ ب بەران د نخافت، پشتی ماوەیەكی دی وان بنێ وێ ب چیمەنتۆ و خیزی نخافت، چ سیستەمێن تایبەت یێن ڤەگوهاستنا ئاڤێ ژی نەبوون بەلكو وان ئاڤ د مەنجەلێن مەزندا گەرم دكر و ب ترارێ بچووك ئاڤ ل خۆ دكر (وێنە- ٥٢).

وێنەیێ ٥٢



هەروەسا چ سیستەمێن دەرهاڤێژتنا ئاڤا پیس ژی نەبوون بەلكو ئەڤ ئاڤا پیس ب رێكا كونەكێ ل بنێ دیوارێ مالێ دەردكەفت و دچوو سەر جۆكا سەرەكی یا كۆلانێ و ل داوێ هەمی جۆكێن سەرەكی یێن كۆلانێ د گەهشتنە ئێك و ژ گوندی دەردكەفتن.

لێ ل باژێران ژوورەكا بچووك دناڤ خانیدا بۆ سەرشوویێ دهاتە تەرخانكرن و ژ بەران و كسلی دهاتە دروستكرن یان ژی ژ بەران و تەقنێ و یان ژی ژ بلۆكان و ئاخێ و دیوارێن ژ ناڤدا ژی ب تەقنێ و گێچێ دهاتنە نخافتن.

دروستكرنا سەرشوویان پێشكەفتن ب خۆ ڤە دیت هەتا كو ئێدی ب بەران و چیمەنتۆ و خیزی

هاتینە دروستكرن و ل دووڤ دا ب بلۆك و چیمەنتۆ و خیزی، دیوارێن ژ ناڤدا ژی ب سیرامیكی یان لەبخی و چیمەنتۆیێ دهاتنە نخافتن و پاشی ب بۆیاغا دوهنی دهاتنە بۆیاغكرن و بنێ وێ ژی ب چیمەنتۆ و خیزی دهاتە نخافتن، لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆكە بنێ ژوورا سەرشوویێ ب سەبێ یان كاشیێ موزایكی یان سیرامیكی یان ژی هەتا ب مەرمەری ژی دهێتە نخافتن.

هەروەسا تۆرەكا باش یا بۆریێن ڤەگوهاستنا ئاڤا پاقژ و دەرهاڤێشتنا ئاڤا پیس بۆ دەرڤەی خانی تێدا دهێنە دانان. بۆریا دەرهاڤێژتنا ئاڤا پیس دچیتە سەر بۆریا سەرەكی یا كۆلانێ.

سیستەمێ ڤەگوهاستنا ئاڤا پاقژ ژی ژ دو بۆریان پێكدهێت كو ئێك یا تایبەتە بۆ ئاڤا تەزی و یا دی ژی بۆ ئاڤا گەرم كو ب رێكا گەرمكەرێ ئاڤ دهێتە گەرمكرن. هەروەسا ئاڤ ژی ل سەر بانی دناڤ تانكێن ئاڤێ یێن مەزن دا دهێـە هەلگرتن كو ب بلێتا ئاسنی موغەلوەن یان فایبەر كلاس یان ژی پلاستیكی دهێنە دروستكرن. ژ بەركو ئاڤا سەرەكی بەردەم یا بەردەست نینە ژ بەر هندێ كار دخازیتە هندێ ئاڤ دناڤ ڤان تانكان دا بێتە عەمباركرن.

هەژییە بێتەگۆتن نها سەرشوو ب ناڤێ سەرشوویا ناڤخۆیی (سویت) د ناڤ ژوورێن نڤستنێ دهێنەچێكرن و پێدڤیێن وەك (بانیۆ، تەوالیتا رۆژئاڤایی، دەستشوو، دوش) دگەل تۆرا ئاڤاگەرم و سار دەرهاڤێژتنا ئاڤا گران بۆ دهێنەدابینكرن.

**دەستئاڤ (تەوالێت)،**

ل سەر دەمێن بەرێ ل گوندان دناڤ خانیدا جهێن تایبەت بۆ دەستئاڤێ نەبوو ، بەلكو وان پێدڤیێن خۆ ل دەرڤەی گوندی یان ل دۆل و نهالان و پشت گران وبەران و دوور ژ چاڤێن خەلكی د ڤەتاند. لێ ل باژێران رووبەرەكێ بچووك بۆ دەستئاڤێ هەبوو كو ژ مەترەكێ نەدبووری و ژ دەرڤەی مالێ یان ژی دوور ژ ژوورێن پێشوازی و نڤستنێ دهاتە ئاڤاكرن، پتریا جاران ل بەر دەرگەهێ حەوشێ بوو. هندەك جاران ژی دەستئاڤ ل سەر بانی و سەر دیوارێ برەخ جادێ یان كۆلانێڤە دهاتە ئاڤاكرن (وێنە – ٥٣). هەروەسا بۆریەكا تایبەت بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤێ ژی تێڤە هەبوو و حەنەفیەكا براسی ب سەرێ وێ ڤەبوو. جهێ دەستئاڤێ ژی ب مەقعەدەكا رۆژهەلاتی یا پلاستیكی یان كونكریتی دهاتە نخافتن.

دیوارێن وێ ژی ب چیمەنتۆ و خیزی دهاتە نخافتن و پاشی ب بۆیاغا دوهنی دهاتە بۆیاغكرن و بنێ وێ ژی ب سەبا كونكریتی دهاتە نخافتن. پتریا جاران ژی لێنانگەهـ و سەرشوو و دەستاڤ ب رەخ ئێكڤەبوون و دوور بوون ژ جهێ ڤەحەویان و نڤستنێ بەلكو ل نێزیكی دەرگەهێ سەرەكی یێ خانی بوون و بۆریەكا ئاڤێ یا تەزی بەر دەرگەهێ وێ هەبوو.

هندەك جارێن كێم ژی بۆرییەكا ئاڤێ یا گەرم هەبوو دگەل كیزەرێ گەرمكرنا ئاڤێ یان ژی پرێمزێ نەفتێ یان ژی كوچكێ داران. ئەو بۆریێن بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤا گەرم دهاتنە بكارئینان ژ ئاسنی دهاتنە دروستكرن و پتریا جاران ب سۆفێ شووشی یان كانزایی دهاتنە نخافتن ژ بۆ پاراستنا گەرماتیا

**وێنەیێ ٥٣**



ئاڤێ و بۆریان. تورا بۆریێن ئاڤا ڤەخوارنێ ژ دەرڤەی مالان ژی ژ ئاسنێ ئاهین یان ئەسبەستی دهاتنە دروستکرن و دبەر دەرێ خانییان را دچو ودگەل تۆرا ژوورڤە د هاتە گرێدان (وێنە — ٥٤) و ( وێنە- ٥٥).

لێ ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە گرنگییەکا تایبەت ب جهـ و رووبەرێ دەستئاڤێ دهێتە دان ب ڕەنگەکی رووبەرێ وان بوویە نێزیکی ١,٥ م٢ و دو بۆریێن ئاڤێ یێن تەزی و گەرم تێڤە هەنە دگەل تێکەلکەرەکا هەردو ئاڤان، زێدەباری مەقعەدەکێ رۆژهەلاتی یان رۆژئاڤایی یێ فەرفووری.

بۆریێن پلاستیکی یێن ئاڤا تەزی و گەرم دگەل هەبوونا کیزەرێ کارەبایی و دووشا سەرشوویێ و بانیو و حەوزا دوشێ و جاکوزی. تۆرا ڤەگوهاستنا ئاڤا پیس ژی ب رێکا بۆریێن پلاستیکی یێن جۆراوجۆر ژ ئالیێ تیرێ وان ڤە (ژ ئالیێ فرەهیێ ڤە) دهێتە دروستکرن زێدەباری دروستکرنا عەمبارێن هەلگرتنا ئاڤا پیس ل بنی عەردی کو دبێژنێ ڤەستەل و بالوعە و پتربیا جاران ل بن گەراجی دهێنە دروستکرن.

ل هندەك جهێ، ئاکنجیبوونێ، پرۆژەیێن تایبەت بۆ پاقژکرن و ڤاڤارتنا ئاڤا پیس ل دەرڤەی کۆمەلگەهێ دهێنە دروستکرن لێ هەتا نها ل پارێزگەها دهۆکێ ب شێوەیەکی گشتی چ پرۆژەیێن ب ڤی ڕەنگی نەهاتینە دروستکرن.

**جهی دەست شووشتنێ (مەغسەلە)**

**وێنەیێ ٥٤**



ل سەر دەمێن بەرێ ب تایبەت ل گوندان دناڤ خانیدا جهەك نەبوو ب ناڤێ دەستشوو (المغسلە) بەلکو وان دەست و چاڤێن خۆ ژ دەرڤەی خانی ڤە د شووشتن ب رێکا مەسینکەکێ تایبەت، ل هندەك جهان ژی هندەك ئامانێن تایبەت هەبوون دگۆتنێ (جفنی) کو د تایبەت بوون بۆ شووشتنا دەست و چاڤان بەری خوارنێ.

ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە دا ئامرازەکێ تایبەت هەیە بۆ شووشتنا دەست و چاڤ و پێیان دبێژنێ (دەستشوو)(المغسلە) جهەکێ تایبەت دناڤ مالدا بۆ دهێتە تەرخانکرن و پتربیا جاران ئەڤ ئامرازە نێزیکی دەستئاڤ و سەرشوویێ یە. ل دەمێ بەرێ ئەڤ دەستشوویە ژ کەرەستەیێ پلاستیکی دهاتنە دروستکرن لێ نها ژ فەرفووری دهێنە دروستکرن و ل سەر بنکەیەکێ فەرفوری دهێنە دانان و ل بەرامبەری وێ خۆدیکەك و خاولیەك دهێتە هەلاویستن.

**جلشوو**

ل بەرێ چ ئامیرە نەبوون ب ناڤێ جلشوو، بەلکو وان جلێن خۆ د هندەك رۆژێن دەستنیشانکری دا ل سەر رووبار و کانی و برکان دشووشتن، لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆکە دا ئامیرەکێ تایبەت یێ شووشتنا جلکان هەیە و پتربیا جاران دناڤ سەرشوویێ ڤە یان ب ڕەخ ڤە دهێتە دانان.

**- هندەك جهێت دی:**

**گۆڤ**

سەردەمێ بەرێ، ژ بەر خودانکرنا گیانەوەرێن کەهی وەك بزن و چێل و هەسپ و گوهدرێژ و مریشکان ومێشێن هنگڤینی، ئەو پێدڤی بوون چەندین ژووران ب ڕەخ خانیڤە ژ بۆ ڤان گیانەوەران ئاڤا بکەن. پتربیا جاران ژی د ڤان ژوورانڤە جهەکێ تایبەت هەیە بۆ هەلگرتنا ئالفێ گیانەوەران کو دبێژنێ (هاڤر) و جهەکێ تایبەت بۆ ئاڤا وان یا ڤەخوارنێ برەخ هاڤریڤە دروست دکر و مەنجەلەك یان قازانەك د کرە تیدا.

**کۆتان**

ئەڤ جهە ژی یێ تەرخان کری بوو ژ بۆ هندەك

گیانەوەرێن كەهی وەك مریشك و پەز و بزن وهیستر وكەر هەسبان ژ دەرڤەی مالێ ب تایبەت ل وەرزێن بوهار و هاڤینێ. گەلەك جاران ئەڤ كوتانە ل بەر دیوارێ گوڤان دهاتنە دروستكرن و ژ بۆ دروستكرنا وان ژی پشتبەستن ل سەر شەقلە و لەڤەنان دكر كو دا ڤان شەقلان ب رەخ ئێكڤە ل عەردی چكلینن و پاشی ژ بنی هەتا سەری ب شفكێن كێراتان و شیناك و هەلهەلوكان گرێدان، هندەك جاران ژی ب وەریسك و تێلان پێكڤە گرێدان و كوتان ژێ دروستكرن.

**كۆگەهـ**

سەر دەمێ بەرێ ب تایبەت ل گوندان ل پشتا خانی ژوورەكا بچویك هەبوو، ل بەر دیوارێ لایەكێ وێ دیوارەكێ بچویك ب بلندیا ٥٠- ٦٠سم چێدكرن و دارێن ستویر ب رەخێكڤە دادنانە سەر وان دیواران وەكی دۆشكەكی یان مێزەكا نزم و بەرفرەهـ لێ دهات دگۆتنێ ستێرك، قویتێ خۆ د جهال و همبان و تویركاندا دادنانە سەر و دگۆتنێ ستێرك و دگۆتنە وێ ژوورێ مەزەلكا ستێركێ. زێدەباری هەبوونا كۆگەهەكا تایبەت بۆ هەلگرتنا ئالفێ گیانەوەران دگۆتنێ كادین.

بەلێ ل باژێران ژوورەكا تا رادەیەكی مەزن هەبوو ژ بۆ هەلگرتنا كەلوپەلێن خوارنێ و جلكان و تشتێن دی یێن ناڤ مالێ ڤێجا چ ئەڤ ژوورە ل سەر عەردی بیت یان ژی ل بن عەردی بیت كو دگۆتنێ (بنداڤ).

سەر دەمێ نها دو جۆرێن كۆگەهان هەیە، كۆگەهەكا تایبەت ژ بۆ هەلگرتنا كەلوپەلێن خوارنێ بۆ ماوەیەكێ كێم و پتریا جاران ئەڤ كۆگەهە یا ل نێزیكی لێنانگەهێ. هەروەسا كۆگەهەكا دی ژی هەیە ژ بۆ هەلگرتنا تشتێن زێدە یێن ناڤمالێ وەكی جلوبەرگ و قومسور و مەحفیران و قەبارەیێ ڤێ كۆگەهێ ژی پشت بەستنێ دكەتە سەر رووبەرێ خانی.

**بەرسڤك (تەرمە):**

ئەڤ جهە ل بەرسینكێ مەدخەلی یان ژوورێن مێهڤانا وهولێ تێتە دروست كرن و بنێ وێ تێتە سەب كرن و پاشان كاشی كرن وبانێ وێ تێتە نخافتن ج ب كاریتا یان جەمەلونێ یان سەبێ و سینگێ وی یی بەردایە، ودهێتە بكارئینان ژ بۆ پاراستنا سینگێ ژوورا ژ بارانێ وهەتاڤێ

**كۆتەل (المنور)**

جهەكێ تایبەتە دناڤبەرا ژوورێن مالێ دا دهێتە ئاڤاكرن و سەرێ وی یێ ڤەكریە داكو رۆناهیا تێرا بێتە د ژوورانڤە. ئەگەرێ ئاڤاكرنا وێ ژی بۆ هندێ دزڤریت كو دناڤ خانیێن رۆژئاڤایی دا هندەك ژوور هەنە دكەڤنە پشتا خانی و ب دیوارێ وان ژی دكەڤیتە بەر دیوارێ مالا ب رەخ ڤە ژ بەر هندێ دەلیڤە تێدا نینە پەنجەرك تێدا بهێنە دانان. خانیێن رۆژهەلاتی پێدڤی ب ئاڤاكرنا بەلەكونان نینن ژ بەركو ئەڤ جۆرە خانییە د ڤەكرینە و بێی ئاڤاكرنا بەلەكونان رۆناهی دگەهیتە هەمی ژووران.

**دەروازە (مەدخەل):**

ئەڤ جهە ل بەرسینكی ژوورێن مێهڤانان و هۆلا ل خانیێن رۆژئاڤا و ئەڤی جهی دەرگەهەكێ مەزن بۆ دەرڤە یێ هەی و ژ دارێ ساجی یان ئەلەمنیومی یان ئاسنێ لیكدای یان پلاستیكی دهێتە دروست كرن دەركەهەك بو ژوورا مێهڤانان وهندەك جاران دەركەهەك بو هولی یان ناڤ خانی.

هندەك جاران دەستئاڤەكی ل ناڤ مەدخەلی

وێنەیێ ٥٥



دروست دکەن ز بو میڤانان. سەردەمێ بەرێ چ ل گوندان یان باژێران، خانیێن وان یێن رۆژهەلاتی بوون ژ بەر هندێ پێدڤی ب ئاڤاکرنا مەدخەلان ل بەر دەرگەهێ سەرەکی نەبوون، هەلبەت ئاڤاکرنا ڤان مەدخەلان ژ بۆ هندێ یە داکو هرۆبایێن بهێز و مێشومور و مشك و باران و گەرماتی نەهێتە دژوورڤە.

### گەراج

سەر دەمێ بەرێ ب تایبەت ل گوندان، ترۆمبێلێن تایبەت نەبوون ژ بەر هندێ وان چ جهێن تایبەت ژ بۆ راوەستاندنا ترۆمبێلان تەرخان نەدکرن. ل باژێران ژی وان چ گەراج بۆ ترۆمبێلان تەرخان نەدکرن چونکی پتریا جاران خەلکی ترۆمبێلین خۆ بەر دەرگەهی و ل سەر جادەیا گشتی دراوەستاندن. هەروەسا ل دەمێ چێکرنا جادەیان ژی هزرا راوەستاندنا جهێ ترۆمبێلان نەدهاتە کرن ژ بەر هندێ ژی جادەیێن مە یێن کەڤن گەلەك د تەنگ بوون و رەنگە فرەهیا گەلەك ژ وان ژ چوار مەتران نەبۆرین (وێنە – ٥٦).

ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە و ژ بەر زێدەبوونا هژمارا ترۆمبێلان، ئێدی کار دخازیتە هندێ گەراجێن تایبەت دناڤ مالێ دا بهێنە ئاڤاکرن ژ پێخەمەت سەلامەتیا ترۆمبێلێ. ژ بەر هندێ ژی رووبەرەکێ تایبەت بۆ هندێ دهێتە تەرخانکرن دبێژنێ

وێنەیێ ٥٦



گەراج. ئاستێ بلنداهیا گەراجی ژی ژ ئاستێ جادێ بلندترە و فرەهیا وی ژی یا گونجایە و ب دەرگەهەکێ ئاسنی یێ مەزن دهێتە گرتن و ب دەستی یان شێوەیەکێ ئوتوماتیکی و کارەبایی دهێتە کونترۆلکرن.

## - پشکا بینجی

## شێوازێن ئاڤاهیێن ل دەڤەرا دهۆکێ

### ١. شێوازێ ئاڤاهیێن گوندان:

بەرێ هەوێن ئەنفالێن رەش و پشتی ڤان هەوان گوهۆرینێن مەزن ب سەر شێوازێ ئاڤاکرنێن خانیێن گوندان هاتییە. ژ بەرکو خەلکێ گوندان گیانەوەرێن کەهی ب خودان دکرن، ئەو نەچار دبوون نهومێ عەردی بۆ گیانەوەران تەرخان بکەن و نهومێ ئێکێ (نهومێ ل سەردا) ژی بۆ ئەندامێن خێزانێ بەرهەڤ بکەن (وێنە - ٥٧ ).

وێنەیێ



**نهومێ عەردی،**

ئەڤ نهومە ژ هژمارەکا ژوورێــن جــودا جــودا پێکدهێت ژ بۆ خودانکرنا گیانەوەرێن کەهی وەك پەز و بزن و مریشك و هێستر و گوهدرێژ و هەسپان. دبێژنە ڤان ژووران گۆڤ و قەبارەیێ هەر ژوورەکێ ژی پشت بەستنێ دکەتە سەر قەبارەیێ گیانەوەران و هژمارا وان.

ل ناڤ هەر گۆڤەکێ جۆکەك ژ بەرا و ئاخێ یان ژ لبنە و ئاخێ ب فرەهی و درێژاهیێن گونجایی دهاتە دروستکرن ژ بۆ دانا ئالفی بۆ گیانەوەران و دگۆتنێ (هاڤر). ئالیێ دی یێ گۆڤێ ژی هندەك ئامانێن ژ ئاخێ چێکری یان تەنەکەی و مەنجەل دهاتنە دانان و ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گیانەوەران دکرە تێدا. هندەك ژوورێن دی دهاتنە تەرخانکرن بۆ عەمبارکرنا ئالفێ گیانەوەران وەك گەنمی و جەهی و داروبەلگێن بەری و مازیبان، زێدەباری ژوورەکا دی یا تایبەت بۆ هەلگرتنا کەرەستە و پێدڤیێن گیانەوەران وەك کورتان و وەریس و نال و جوهال و سندۆقێن فێقی و جوهالك ونێری و ناڤبارك ...هتد.

ل بەر سینگ و پشتا ڤی خانی دو رێك هەبوون، رێکا بەر پێشیا خانی بۆ هاتنوچوونا مرۆڤان و رێکا پاشیا خانی ژی بۆ هاتنوچوونا گیانەوەران بوو. ب رەنگەکی دەرگەهێ نهومێ عەردی بۆ گیانەوەران ڤەدبوو و دەرگەهێ پێشیێ ژی بۆ بەر سینگێ رێکا پێشیێ ڤەدبوو.

زۆربەی جاران هەڤبەندیێن راستەوخۆ دناڤبەرا نهومێ عەردی و نهومێ ئێکێ دا نەبوون ب تنێ د هندەك کاودانێن دەگمەن دا نەبیت کو ئەوژی ب رێکا هندەك دەرەجکێن بەری یان ئاخێ یان یێن دنگێن تەقنێ بوون. ب ڤی رەنگی وان کونەك ل سەربانێ نهومێ عەردی دکر ب تایبەت بۆ ژوورا عەمبارکرنا ئالفی کو دگۆتنێ (کادین)، وان ب رێکا ڤێ کونێ ئالف دکرە د عەمبارێ ڤە.

هەردیسان وان ژوورەك بۆ خودانکرنا مێشێن هنگڤینی ژی تەرخان دکر ب رەنگەکی کو بۆ ئالیێ جاددا بشتی ب رێکا هندەك پەنجەرکان یان کونێن بچووك یا ڤەکری بوو ژ پێخەمەت هندێ مێش تێرا بهێن و بچن.

**نهومێ ئێکێ(سەلال)،**

ئەڤ نهومە دهاتە تەرخانکرن بۆ هندێ ئەندامێن خێزانێ تێڤە بژین. بەهرا پتر ئەندامێن خێزانێ ب رێکا دەرەجکێن دەرەکی دچوونە نهومێ ئێکێ. ئەڤ نهومە ژ چەندین ژوورێن ژیارێ و خزمەتگوزاریان پێکدهات، ئەوژی ژوورا پێشوازیێ (کۆچك)، ژوورێن نڤستنێ، لێنانگەهـ، سەرشوك، جهێن دەستئاڤی (ئەدەبخانە)،

**پێدڤیاتیێن ساخلەمیێ،**

ئاڤ ب دەستان و سەرملان ب رێکا هندەك ئامانان وەك جەرك و گوسکان و پاشتر ب رێکا تەنەکە و دولکا و مەسینان د ئینا مالێ و هندەکان ژی ب دەواران ب رێکا راوی و تەنەکە و بەرمیلان ژ رووباری یان کانیێ دئینا مال. هەژییە بێژین پتریا کارێن مالێ

وێنەیێ ٥٧



و ئەندامین مالێ ب ئاڤێ ل دەرڤە و ل سەر ژێدەرێن ئاڤێ دهاتەڤەتاندن.

**پێدڤیاتیێن رۆناهیێ**

ئەڤ پێدڤیاتییە ل گوندان گەلەك د سادە و ب ساناهی بوون، هەتا بەری چەند دەهـ سالەكان ل گوندان و باژێران ژی تشتەك ب ناڤێ كارەب نەبوو، ل بەراهیێ چرا و خەتیرە ئامرازێ رۆهنكرنێ بوون، دووڤرا (فانوس و لەمپە و لوكسێن نەفتێ و درەنگتر ژی لوكسێن غازێ پەیدابوون، د دوا قۆناغدا كارەب ل باژێران پاشتر ل گوندان ژی كارەب پەیدا بوو و جهێ ئامرازێن دەسپێكی گرت و مال و خانی پێدڤی ب دابینكرنا پێدڤیاتیێن كارەبێ بوون.

## ٢. شێوازێ ئاڤاهیێن رۆژهەلاتی:

ئاڤاهیێن رۆژهەلاتی یانژی ئاڤاهیێن ڤەكری و كلاسیكی ب ڤی ناڤی دهێنە ناڤكرن چونكی شێوازێ دروستكرنا وان وەكی خانیێن رۆژهەلاتینە یێن كو خەلكێ وان ژ بەر هەژاری و دەستكورتیێ خانیێن خۆ ب ڤی شێوازێ سادە ئاڤا دكەن. د ڤان جۆرە خانییانڤە، لڤینا خەلكێ مالێ یا بەرچاڤ و ئاشكەرایە و پتر دكەڤنە بەر بایی و تیشكا رۆژێ و هندەك جاران باران و بەفرێ ژی (وێنە - ٥٨).

ئێك ژ تایبەتمەندیێن ڤان جۆرە خانییان ئەوە مرۆڤ دشێت ب سانەهی ژوورەكێ ل سەر ڤی خانی زێدەبكەت یان ژوورەكێ راكەت بێی كو كارتێكرنێ بكەتە سەر ژوورێن دی یان شێوازی گشتی یێ خانی، ئانكو د ڤی كاودانیدا خودانێ خانی ل دووڤ پێچێبوونا خۆ، دكاریت خانیێ خۆ د قۆناغ قۆناغدا ئاڤا بكەت، ئانكو مەرج نینە خانی هەمیێ ل سەر ئێك ئاڤا بكەت.

د ڤی شێوازێ خانییاندا، ژوورێن خانی ل سەر دیوارێن دەرەكی دهێنە ئاڤاكرن ب رەنگەكی ل دەستپێكێ دیوارێ پشتی و پاشی دیوارێ هەردو لایان ول دووڤدا دیوارێ پێشیێ دێ هێنە ئاڤاكرن و رووبەرەكێ عەردی ل بەرسینگێ ژووران یان ل نیڤا خانی دهێلنە ڤالا بۆ تەرمەی (بەرسفك)یان ژی باخچێ ناڤ مالێ. پتریا جاران تەرمە ب فرەهیەكا بەرچاڤ ل بەر سینگێ ژووران دهێنە ئاڤاكرن ژ پێخەمەت پاراستنا ژووران ژ تیشكا رۆژێ و باران و تۆز و گلێشی، زێدەباری هندێ تەرمە جهێ هاتنوچوونا ئەندامێن خێزانێ یە و هاڤینا وبوهاران جهێ رونشتنا خێزانێ یە. دەرگەهـ وپەنجەرێن ژووران دكەڤنە سەر تەرمەی وتەرمە ژ سێ لایان ڤە دكەڤتە سەر دیواران و لایێ پێشیێ دكەڤتە سەر ستوونێن داری یان ئاسنی و یان كونكریتی.

ژوورێن كوچكێ ونڤستنێ هەمی برخ ئێك ڤە تێنە ئاڤاكرن ل پاشیا خانی بەلێ ژوورێن لێنانگەهێ وسەرشویێ ودەستئاڤ دوور ژ ژوورێن دی دهاتنە ئاڤاكرن ونزیك دەرگەهێ ژ دەرڤە و برەخ ئێك ڤە.

ژ بو هاتنوچوونا سەر بانی پێستركەكا داری یان ئاسنی و ڤێ دووماهیێ دەرەجكێن كونكریتی د هاتنە بكارئینان.

**وێنەیێ ٥٨**



ل پێشیا خانی باخچەك دهاتە دروست كرن ، وكێم جاران گەراجێ ترومبێلێ دهاتە دروست كرن بەلكو ترومبێلێن خو دهێلانە ژدەرڤە ل سەر جادێ.

هندەك جاران نهومەكی دی یێ ناڤنجی ژی ل سەر خانی دهێتەئاڤاكرن كو پێكدهێت ژ ژوورێن نڤستن و سەرشوو و دەستئاڤ و تەرمەكی.

.٣

## ٤. شێوازێ ئاڤاهیێن رۆژئاڤایی (ئاڤاهیێن گرتی):

ئاڤاهیێن رۆژئاڤایی یان ژی ئاڤاهیێن گرتی و مودێرن ب ڤی ناڤی دهێنە ناڤكرن چونكی شێوازێ دروستكرنا وان وەكی خانیێن رۆژئاڤاییە، پتریا ئەو كەسێن خانیێن خۆ ب ڤی شێوازی ئاڤا دكرن ئەو بوون یێن داهاتەكێ بلند یان ناڤنجی هەی، بەلێ نها ل باژێران كتەكا كێم نەبیت هەمی خانیێن خۆ ب ڤی شێوازی ئاڤادكەن(وێنە– ٥٩) .

ژ تایبەتمەندیێن هەرە سەرەكیێن ڤان خانییان ئەوە د گرتینە تنێ ژ ئالیێ دەرگەهێن دەرەكی نەبیت و ب ڤی رەنگی رێگری ل هەمبەر هاتنا ژوور یا هرۆبا و كێز و مشك و تۆز و باران و گەرماتی و دەنگێن ژ دەرڤە دهێتە گرتن، ژ بەر هندێ خانیێن رۆژئاڤایی ب خانیێن ساخلەم و سەردەم دهێنە نیاسین.

تەرمەك یێ ئێك نهومی یان دو نهوم ل بەر سینكی مەدخەلی دهێتە دروست كرن و دهێتە راوەستاندن ل سەر ستوونەكێ یان دو ستوونێن كونكریتی یان ئاسنی.

هزرا دروستكرنا خانیێن رۆژئاڤایی ل پارێزگەها دهۆكێ پشتی سالێن حەفتیان پەیدابوو ب تایبەت پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ.

د ناڤ خانیێن رۆژئاڤاییدا، هەمی ژوورێن پێشوازی و نڤستنا و خزمەتگوزاریان دناڤ رووبەرەكێ گرتیدا

وێنەیێ ٥٩







دهێنه ئاڤاکرن و هاتنووچوونا دناڤبەرا ڤان ژووران دا ب رێکا مەمەرێن ناڤخۆیی و پتریا جاران ژوورێن خزمەتگوزارییان ژی ل سەر ئێك دیوار دهێنه ئاڤاکرن و سیستەمەکێ بابرنێ (تهویه) یێ باش هەیه.

د ڤان خانییانڤە، باخچەیەك و گەراجەکێ راوەستاندنا ترۆمبێلان ل پێشیا خانی دهێنه دروستکرن و هندەك جاران ژی باخچە و گەراجەکێ دی ژی ل پشتا خانی دهێنه دروستکرن ب تایبەت هەکە ئەو خانی بکەڤیته سەر دو جادەیان ژ ئالیێ پێشی و پاشیێ ڤە.

هەروەسا چەندین ڤالاهی و کوتەل ژ بۆ گوهۆرینا هەوایی و رۆناهیێ د خانیێن رۆژئاڤایی دا دهێنه ڤەکرن کو دبێژنێ (منوار)، ژ بەرکو ئەڤ خانییه ژ هەمی لایاڤە دگرتینه، پێدڤیه گرنگیەکا مەزن ب پاقژیا لێنانگەهـ و سەرشوو و دەستئاڤێ بێته دان داکو بێهن و پیسی دناڤخۆیێ خانیدا بەلاڤ نەبن.

زێدەباری سەرشوویا سەرەکی، هندەك سەرشوویێن دی (سویت) دناڤ ژوورێن تایبەتدا دهێنه ئاڤاکرن ب تایبەت ژوورێن نڤستنێ. د ڤێ سەرشوویێ ژی ڤە هەمی پێدڤیێن ساخلەمیێ تێدا هەنه وەك بانیو و حەوزا دووشێ و مەقعەدەکێ دەستئاڤێ یێ رۆژئاڤایی و دەستشوویێ.

پتریا جاران، خانیێن رۆژئاڤایی ژ دو نهومان پێکدهێن، نهومێ عەردی کو نهومێ سەرەکییه پێکدهێت ژ ژوورا پێشوازیێ، هۆلا بێنڤەدانێ، چەندین ژوورێن نڤستنێ، لێنانگەهـ سەرشوو، دەستئاڤ، کۆگەها قووتی، دەرەجك و هۆلەکا ناڤخۆیی یا بچووك، نهومێ ئێکێ ژی ژ چەندین ژوورێن نڤستنێ و سەرشوو و دەستئاڤێ پێکدهێت.

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ئێدی کەسێن بازرگان و خودان کار پێدڤی ب کۆگەهـان (عمباران) بوون داکو کەلوپەلێن خۆ تێڤە ب هەلگرن، ژ بەر هندێ هزرا دروستکرنا کۆگەهـێن ژێر ئاڤاهی هاتەکرن، ب ڤی رەنگی خانی بوونه سێ نهوم ئەوژی نهوما کۆگەهـێ کو بن عەردی یان پتریا جاران ل سەر عەردی ژی دهێته دروستکرن، نهومێ ئێکێ کو نهومێ سەرەکی یێ خانی یە، و نهومێ دووێ یێ خانی.

نهومێ عەردی کو ژ بۆ دروستکرنا کۆگەهـێ دهێته تەرخانکرن دبیت ل سەر عەردی یان ل بن عەردی بێته ئاڤاکرن و دبێژنێ سەرداب، ئەڤ نهومه دهێته بکارئینان بۆ هەلگرتنا تشتێن زێده و کەلوپەل و قووتی. ل سەر دەمێ ئەڤرۆکه گەلەك ژ ڤان کۆگەهـان ب تایبەت ئەوێن ل سەر عەردی دهێنه دروستکرن بووینه دکانێن بازرگانی و پێشانگەهێن جلوبەرگان و فرنێن دروستکرنا نانی و هندەك کارگەهێن بچویك وەك یێن ئەلەمنیومی ....هتد. هەردیسان بەشەکێ بچووك و جودا ژ سەردابێ بۆ گەراجی دهێته تەرخانکرن.

نهومێ ئێکێ ژی ل سەر نهومێ عەردی دهێته ئاڤاکرن و ژ ژوورێن پێشوازی و نڤستن و خزمەتگوزارییان پێکدهێت و ب رێکا دەرەجکان دگەل نهومێ عەردی دهێته گرێدان یان ژی دبیت هندەك جاران ئاسانسۆر بهێنه بکارئینان.

نهومێ دووێ ژی هەروەکی بەری نها مە ئاماژە پێکری بەهرا پتر یێ تەرخانکریه بۆ ژوورێن نڤستنێ و چوونا ڤی نهومی ژی هەر ب رێکا دەرەجکان یان ئاسانسۆرێ یه و د هندەك ژووران ڤە سەرشوویێن ناڤخۆیی دهێنه ئاڤاکرن.

هەردیسان خانیێن رۆژئاڤایی ب هندێ دهێنه جوداکرن کو رووبەرەکێ تایبەت یێ چوونا ژوور هەیه دبێژنێ دەروازه (مەدخەل) .

گرنگییەکا تایبەت ب سیمایێ دەرەکی یێ خانیێن رۆژئاڤایی دهێته دان، بەری نها دیوارێن ژدەرڤە ب چیمەنتۆ و خیزی دهاتنه لەبخکرن و پاشی ب بۆیاغا ئاڤی (ئەموشن) دهاتنه بۆیاغکرن یان ب نەسری ئانکو شەربەتا جیمەنتویی سپی وئارکێ بەری بکارئینانا ب گێزکەکی یان دولکەکێ تایبەت دهاته رەشاندن ل سەر دیوارێن لەبخ کری یان ژی ب کەرستێ ماربلکس دیوارێ لەبخ کری دهاتنه نخافتن، یان ژی دیوارێن ژ دەرڤە ب بەرێن نەخشاندی و ڤەوراندی دهاتنه ئاڤاکرن و هندەك دەرزێن ناڤبر ب خیز

و چیمەنتۆیا رەش یان یا سپی ل سەر دهاتنەکرن. لێ سەرەدەمێ نها کەلوپەلێن جوانکرنێ یێن زێدەبووین و دیوارێن ژدەرڤە ب بەرێن حەلان و مەرمەری و فلینەیێ فشارکری و ئەلیکوبوند و شووشەی و کونکریتا موکومکی ب دافیت شیشەی (GRC) دهێنە نخافتن.

فەرشێ عەردی ژی بەری نها ب کاشیێ موزاییکی دهاتە نخافتن لێ ئەڤرۆکە ب کاشیێ موزاییکی یی مودیرن و سیرامیك و بۆرسەلین و مەرمەر و کاشیێ پلاستیکی و نایلونی وداری و ئیپوکسی دهێتە نخافتن.

دیوارێن ژووران ژی بەری نها ب چیمەنتۆ و خیزی یان ب گێچێ دهاتنە نخافتن و پاشی ب بۆیاغا دوهنی یان ب ئەمولشنی دهاتنە بۆیاغکرن لێ ئەڤرۆکە زێدەباری لەبخا جیمەنتویێ وگێچێ دیوار ب کاشیێ سیرامیکی و بۆرسەلین و مەرمەر وتەریشێت پلاستیکی وداری دهێنە نخافتن.

بەری نها بنبانێن ڤان خانییان ب لەبخا چیمەنتویێ وگێچێ د هاتنە هونین وهندەك جاران ب تایبەت ئاڤاهیێن مەزن و میری ژ پێخەمەت ڤەشارتنا وائیرە و هێلێن کارەب و سارکرنێ. ل وی دەمی ئەڤ بنبانە کو دبێژنێ بنبانێت هایرب و بنبانێن ئەکوستیك ی دهاتن بکارئینان لێ ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە چەندین شێواز و جۆرێن بنبانێن جوان و هۆنەری دهێنە بکارئینان وەك بنبانێن مەغربی و ئەکوستیکی و جبسوم بۆردی و پلاستیکی و ئەلیکوبوندی و داری و ئەلەمنیومی. ژ بلی بۆ ڤەشارتنا هیلێن کارەب و ڤەگوهاستنا بۆریێن ئاڤێ و بایی، دیمەنەکێ جوان و دیکورەکێ بالکێش پەیدادکەن.

### پێدڤیێن ساخلەمیێ (التأسیسات الصحیة) ل ئاڤاهیێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی،

چەوانیا گەهاندنا ئاڤا پاقژ بۆ ناڤ خانییان وهەروەسا دەرئێخستنا ئاڤا پیس ژ ناڤ خانییان بۆ ژ دەرڤە.

پێشتر بۆریێن ئاسنێ ب تام دای ب توخمەکێ خارسینی (حدید مغلون)بۆ کێشانا ئاڤێ د ناڤ مالاندا بو لێنانگەهێ وسەرشۆکێ ودەستئاڤێ ودەست شویێ دهاتنە بکارئینان، هندیکە بۆریێن ئاڤا گەرم بوون ب هریەکا شیشەیی یان مەعدەنی دهاتنەپێچان ، هەروەسان گیزەرێن نەفتێ و غازێ بۆ گەرمکرنا ئاڤێ د هاتنەبکارئینان وتانکێن چینکوی بو هلگرتنا ئاڤێ ل سەر بانان دهاتنە بکارئینان .

ل لێنانگەهێ سینکەکێ ئاسنی ل سەر قاعیدەکێ ئاسنی یان قاعیدەکێ ژ بۆریێن ئاسنی د هاتە چێکرن و ئاڤا سار و گەرم د برە سەر سنکی و هەردو تێکەل دکرن ب تێکەلکەرەکا کرومی

ل سەرشۆکێ دوشەکێ ئاڤێ دگەل تێکەلکەرا ئاڤا سار و گەرم و هندەك جاران دگەل بانیوەکا چینکوی یان فەرفوری یا درێژ دهێتەدانان.

ل دەستئاڤێ مەقعەدەکێ کونکریتی یان پلاستیکی یان فەرفوری دهاتەبکارئینان دگەل حەنەفیا ئاڤا سار و هندەك جاران تێکەلکەرا ئاڤا سار و گەرم بکار دئینا.

دەست شوەکا پلاستیکی یان فەرفوری بێ مەقعەد دهاتە هلاویستن ل سەر قاعیدەکێ ئاسنی یان بۆریێن ئاسنی.

قەستەل و بەلوعە گەلەك جاران ژ دەرڤەی خانی د هاتە دروست کرن و ل ژێر جادێ.

پشتی سەرهلدانا پیروز سالا ١٩٩١ێ بۆریێن پلاستیکی پەیدابوون تایبەت بۆریێن تورکی و رۆژ بۆ رۆژێ بکارئینانا وان زێدەتر لێهات، و هەر وەسا بۆریێن ئاسنی روژ بو روژ بکارئینانا وان پاش ڤە چوو، هەروەسا بۆریێن پلاستیکی پێدڤی هریا شیشەی نینن.

ژ بو ئاڤا گەرم جۆرەکێ بۆریێت پلاستیکی یێن ب هێز و بەرگریێ ژ گەرمێ بکەن دهێنە بکارئینان

هەروەسان گیزەرێن نەفتێ و کارەبێ بۆ گەرمکرنا ئاڤێ دهێنە بکارئینان و تانکێن چینکوی یان پلاستیکی یان فایبەرگلاسی بۆ هلگرتنا ئاڤێ ل سەر بانان دئێنە بکارئینان .

ل لێنانگەهێ سینکەکێ دو حەوز و دو چەنك ویێ ئاسنی یان سونیمەرمەر ل سەر کاونتەرەکا

ئەلەمنیومی یان داری و ئاڤا سار و گەرم د بنە سەر سنكی وهەردووان تێكەل دكەن ب تێكەلكەرەكا كرومی یان نیكەل ی.

ل سەرشوكێ دوشەكێ ئاڤێ دگەل تێكەلكەرا ئاڤا سار و گەرم و هندەك جاران بانیوەكا فەرفوری و مەقعەدەكا روژئاڤای تێتە دانان.

ل دەستئاڤێ مەقعەدەكا فەرفوری یا رۆژهەلاتی یان رۆژئاڤای تێتە بكارئینان دگەل تێكەلكەرەكا ئاڤا سار و گەرم.

دەست شوەكا فەرفوری ل سەر مەقعەدەكا فەرفوری دگەل تێكەلكەرەكا ئاڤا سار و گەرم تێتە بكارئینان، هندەك جاران ئەڤ دەست شوە تێتە دانان ل سەر كاونتەرەكا داری.

قەستەل و بەلوعە د ناڤ خانی دا د هێتە دروست كرن و ب تایبەتی ل ژێر گەراجی و ب چ شێوەیەكی دەستیری نا ئێتە دان ب دروست كرنا وان ل دەرڤەی خانی یان ئاڤاهی.

**پێدڤیاتیێن رۆناهیێ ل ئاڤاهیێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی:**

ئەڤ پێدڤیاتییە رۆژ بو رۆژ بەرەف پێشڤەچوونێ ڤە دچن.

ل بەری چەند دەهـ سالەكان ل بازێران تشتەك ب ناڤێ كارەب نەبوو، ل بەراهیێ فانوس و لەمپە و لوكسێن نەفتێ و دەرەنگتر ژی لوكسێن غازێ پەیدابوون، د دوا قوناغدا كارەب پەیدا بوو و جهێ ئامرازێن دەسپێكی گرت و مال و خانی پێدڤی ب دابینكرنا پێدڤیاتیێن كارەبێ بوون.

لێ ل دەسپێكێ هێلێن كارەبێ د هاتنە راكێشان ل ناڤ خانییان ب كارئینانا وایەرێن كارەبێ یێن گەور(رصاصی) ئەوێن دو یان سێ وایەرێن رەش و سور وشین دناڤ دا و دهاتنە گرێدان ل سەر دیوار و بانان ب هاركاریا كلیبسێن فافونی و بزمارێن ئاسنی ل سەر لەبخی، و هندەك سویچ و پلاكێن گرۆڤر ورەنگ رش دهاتنە بكارئینان ژ بو هلكرنا كارەبێ و دا ئێنە گرێدان ل سەر پارچەكا دارێ موعاكسی و ل سەر لەبخا دیواران بەلێ بكارئینان ڤی جورێ وایەرا ئەڤرۆكە نەمایە ،هەروەسا گلوپیێن شیشەی یێن تنگستن ( سفر ، ٦٠ و١٠٠ ) وات و فیوزێت رصاصی بكاردئینان .

پاشان وایەرێن سیمنس رەنك سپی یێن دو وایەرێن رەش وشین دناڤ دا هاتنە بكارئینان وئەڤ وایەرە دئێنە گرێدان ل سەر دیواران ب هاریكاریا بزمارێن ئاسنی و پاشان لەبخا دیواران ل سەر تێتە كرن و وایەر بەرزە دبن، و سویچ وپلاكێن سپی یێن چوار گوشە ل سەر بوكسێن چینكوی یێن دەفن كری تێنە بكار ئینان بەلێ بكارئینان ڤی جورێ وایەرا ئەڤرۆكە یێ كێم بووی و بەرەف نەمانێ ڤە د چن.

لێ پشتی سالێن هەشتیا وایەرێن كارەبێ هاتنە راكێشان دناڤ بورێێن ئاسنی یێن موغەلوەن و تێنە بەرزەكرن دناڤ دیوار و بانان دا، و بوكسێن چینكوی یێن دەفن كری دگەل سویچ و پلاكێن رەنگ سپی دهاتنە بكارئینان.

بەلێ ئەڤرۆكە وایەرێن كارەبێ دناڤ بورێێن پلاستیكی را دچن و بوكسێن چینكو وپلاستیكی دگەل سویچ و پلاكێتن سپی وسركێت برێكەر دگەل چەندین جوزا یان فیوزێن ئوتوماتیك وگلوپێن زەر و سپی ونیون و ڤی دووماهیێ گلوپێن لید تێنە بكارئینان .

# - پشكا شەشێ

# چەوانیا ئاڤاكرنا خانییان ل دەڤەرا دهوكێ

## ١- چەوانیا ئاڤاكرنا خانیێن گوندان

ل سەردەمێ بەری ئەنفالێن رەش، دروستكرنا خانییان ب ڤان رێكێن ل خوارێ د هاتە ئەنجام دان.

- راستكرن و پاقژكرنا عەردی ژ بەر و گلێشان ل جهێ پێشنیازكری بو ئاڤاكرنا خانی.

- نەخشەكێشانا عەردی بكارئینانا وبەندكی و دیزاینكرنا وی.

- كولانا بنیاتێ (شەنگستێ)خانی ب كویراتی وفرەهییەكا دیزانكری.

- وپاشی دا ئەڤ پارچا عەردی هێتە نەخشەكێشان، هەژی گۆتنێ یە كو ل بەرێ چ نەخشە و پیڤەر نەبوون بەلكو نەخشەكێشان ب رێكا وی جهی بوو، ئانكو دا پیڤان و دیاركرنا دووراتیێن خانی ب رێكا پێنگاڤ و بهۆستان بیت. هەلبەت ئەڤ دووراتییە د دروست نەبوون بەلكو ب شێوەیەكێ نێزیكەیی بوون.

ل دووڤ دا ژی بنیاتێ خانی ب كووراتی و فرەهیەكا گونجایی دا هێتەكۆلان ئەوژی ل دووڤ سرۆشتێ وێ ئاخێ و پاشی دا بەر دناڤ كۆركا بنیاتی دا هێنە رێكخستن ب شێوەیەكێ هشك (هشكەبەر). پشتی بەر دگەهشتنە ئاستێ عەردی، دا ئاخێ كەنە سەر هەتاكو باش راستبایە و گەهشتبایە ئاستێ سەر عەردی. پاشی دا بەرێن مەزن یان بلۆكێن تەقنێ بۆ دیواران هێنە بكارئینان.

ل دەمێ ئاڤاكرنێ، ئاڤاكرنا جهێ دەرگەهـ و پەنجەرێ ژی دگەل دهاتە كرن هەتاكو ئاڤاكرنا خانی دگەهشتە سەری. پاشی دا گاریتەیێن داری ل سەر لایێن دیواران دانن و دا شەقلەیان دانە سەر گاریتەیان و ل دووڤ دا هندەك بەرێن پەحن یێن حەلانی ل سەر ب رێزكەن و پاشی دا ئاخێ كەنە سەر و ب باگوردانی راست كەن.

پاشی دا هندەك حێسیلكان دانە سەر گاریتەیان و ب پیلایی قائیم كەن و دا دوبارە ئاخێ كەنە سەر حێسیلكان. پشتی ب دووماهیێ هاتنا دروستكرنا نهومێ عــەردی، هەرئێكسەر دا دیوارێن نهومێ ئێكێ دانە سەر دیوارێن نهومێ عەردی وپاشی بانێ نهومێ ئێكی ژی وەكی بانێ نهومێ عەردی دا هێتە دروستكرن، ل وی دەمی چ سیستەمێن ڤەگوهاستنا ئاڤێ نەبوون بەلكو بتنێ هندەك جاران بۆریەكا درێژ هەبوو ئاڤ ب رێكا وێ دچوو كۆلانكێ.

پشتی ب دووماهیێ هاتنا خانی، ئێكسەر دا دەست ب نخافتنا دیواران كەن ب تەقنا سپی و هندەك جاران فەرشێ عەردی ژی ب خیزی یان تەقنێ دنخافت. و ل داویێ ژی پەنجەرك و دەرگەهـ دئێخستنە جهێن وان و جهێ كوچكێ و سوپا داران ژی دروست دكر.

## ٢-چەوانیا ئاڤاكرنا خانیێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی

ل سەردەمێ ئەڤرۆكە، دروستكرنا خانیێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی چ ل گوندان یان باژێران بیت ژ ڤان رێكێن ل خوارێ پێكدهێت:

- راستكرن و پاقژكرنا عەردی ژ بەر و گلێشان ل جهێ پێشنیازكری بۆ ئاڤاكرنا خانی.
- نەخشەكێشانا عەردی بكارئینانا گێچێ و بەندكی و دیزاینكرنا وی.
- كۆلانا بنیاتێ (شەنگستێ)خانی ب كویراتی وفرەهیەكا دیزانكری.
- ب رێزكرنا بەرێن شكاندی دناڤ كۆركا بنیاتیدا ب ستووراتییا ١٠ سەنتیمەتران.
- سەبكرنا بنیاتی ب كونكریتا سادە یان یا بهێز كری ب شیشكێت ئاسنێ .
- ئاڤاكرنا دیواران ل بن ئاستێ بادیلویێ بكارئینانا بەری یان بلۆكێت كونكریتی .
- پركرن ب ئاخا پاقژ هەتا دگەهیتە ئاستێ بادیلویێ دگەل قوتانێ .
- دروستكرنا دیواران ل سەر ئاستێ بادیلویێ ب بلۆكان یان تابوكان.
- سەبكرنا بانێ نهومێ عەردی ب كونكریتا ب هێزكری ب شیشكێت ئاسنی.
- ئاڤاكرنا دیوارێن نهومێ دووێ ب بلۆكان یان تابوكان.
- سەبكرنا بانێ نهومێ ئێكێ ب كونكریتا ب هێز كری ب شیشكێت ئاسنی.
- ئاڤاكرنا دیوارێن بیتونێ ب بلۆكان یان تابوكان.
- سەبكرنا بانێ بەیتونێ ب كونكریتا ب هێز كری ب شیشكێت ئاسنی.
- كێشانا بۆریێن ئاڤا پاقژ و ئاڤا پیس لناڤ خانی.
- كێشانا هێلێن كارەبێ ل سەر دیواران و بن بانان.
- شەربەت كرنا دیوارێن ژ دەرڤەو ژ ناڤ دا ب جەبلا خیز و چیمەنتویێ.
- لەبخكرنا دیوارێن ژ دەرڤە ب لەبخا چیمەنتوی.
- نخافتنا دیوارێن ژوورێن خزمەت گوزاریان ب

سیرامیك و بۆرسەلینی.

- نخافتنا دیوارێن ژوورا پێشوازیێ و هۆلێ ب مەرمەر و سیرامیك و پلاستیکی.

- سەبکرنا عەردی ب کونکریتێ سادە ب ستووراتییا ١٠ سنتیمتران .

- دانانا کاشیێ عەردی (موزاییك، سیرامیك، بۆرسەلین و مەرمەر) ێ.

- دانانا ئیزارێ کاشی ل سەر دیواران ل ناڤ بەرا لەبخا گێچێ و کاشیێ ئەردی.

- لەبخکرنا دیوارێن ژ ناڤدا ب لەبخا چیمەنتویێ یان گێچێ.

- دانانا بنبانێن ناڤنجی و مەغریبی .

- دانانا و کرێدانا یەکەیێن ساخلەمیێ (سنك، دەستشوو، حەنەفی....هتد).

- دانانا و گرێدانا یەکەیێن کارەبایی (گلوپ، نیون، پانك، ، سپلێت ....هتد).

- دانانا وگرێدانا دەرگەهـ و پەنجەران.

- دروستکرن و ئامادەکرنا باخچەیی و گەراجی.

- پاقژکرنا ئاڤاهی و هاڤێتنا گلێشی.

- چاوانییا سەروبەرکرنا سەر بانان:

- سەردەمێن پێشتر سەر بانین کونکریتی دهاتنە نخافتن ب دو تەخێن فلینکوتی پاشتر ب قیری هیتی یان سیالی ودووڤرا تەخەکا ئاخێ و دووڤ وێ را ژی تەخەکا ئاخا باخچەیان دکرە سەر و قالبێن چیمەنتۆی (البلاطات الخراسانیة) ب قەبارەیێ (٨٠×٨٠ سم) ب شتایگەر دهاتەناڤکرن د دانانە سەر و ناڤبەرا شتایگەرا ب کەرەستێ ماستیکێ قیری دهاتەگرتن.

- بەلێ نها بان د هێنە نخافتن ب دو تەخێن فلینکوتی، دووڤرا تەحتیکێ قیری (لباد قیري) یێ ترکی یان ئیرانێ ددانانە سەر و دووڤ وانرا ژی تەخەکا فلینێ ستایروبۆر ب ستووریا (٥- ١٠سم) و دووڤ ڤێ هەمیێ را ب تەخەکا کاشیێ موزاییك یێ ل سەر تەخەکا تێکەلەیێ خیزی و چیمەنتۆی دهێتەنخافتن دگەل هێلانا ناڤبران ب قەبارەیێ (٢- ٣م) و ئەڤ ناڤبرە ب شەربەتا جیمەنتویا سپی دهێنەگرتن هەر وەسا جوینێن فرەهبوونێ (مفاصل التمدد) د ئێنە بکارئینان ل ناڤ بەرا کاشییا ل هەردو میترێت دووجا.


## ژێدەر و پەراوێز

١. المائي,انور, الاكراد في بادينان بحث تأريخي اجتماعي عن منشأ الاكراد و عقائدهم وعاداتهم طبائعهم وادابهم, دهوك ٢٠٠٠.

٢. الدملوجي ,صديق, أمارة بهدينان الكوردية أو أمارة العمادية- تقديم ومراجعة الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني الطبعة الثانية ١٩٩٩.

٣. العباسي,خضر تاريخ بلدة زاخو والجسر العباسي.

٤. يوسف عبدالرقيب الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى الجزء الاول والثاني القسم الحضاري.

٥. فندي عبدالكريم دليل محافظة دهوك وسكفان عبد الحكيم.

٦. بريوسر كونراد المباني الأثرية في شمال بلاد الرافدين في العصور المسيحية القديمة والاسلامية وترجمة الدكتور علي يحيى منصور.

٧. مجلة متين والاعداد ٦٨-١٩٩٧, ٧٠السنة ١٩٩٧, ٩١ لسنة١٩٩٩, ١٠٦ لسنة ٢٠٠٠و ١١٣ لسنة ٢٠٠١.

٨. مجلة دهوك العدد ٢ لسنة ١٩٩٨ , العدد ٢٣ لسنة ٢٠٠٤و العدد ٢٦ لسنة ٢٠٠٥.

٩. البروفيسور الدكتور مسعود كتاني, مدرسة قبا – قبهان ذلك الطود من تاريخ بادينا- العمادية الشمس الافلة, الطبعة الاولى ٢٠٠٩.

١٠. زاخو الماضي والحاضر, سعيد الحاج صديق زاخوي ( سعيد الرزفان) لسنة ٢٠٠٩.

# کەتوارێ چالاکییا ئابووری و سرۆشتێ ب جهئینانا وێ ل پارێزگەها دهۆکێ

**پ. د. خەلیل غازی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

## پێشگۆتن:

پارێزگەها دهۆکێ دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ وەلاتێ عیراقێ و رۆژئاڤایێ هەرێما کوردستانا عیراقێ، سنوورێن وێ ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە دگەل سنوورێ وەلاتێ سوریێ درێژدبیت هەتا ژ لایێ رۆژهەلاتی دگەهیتە رووبارێ زێ مەزن کو ئەڤ رووبارە پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەها هەڤلێرێ ژێکڤەدکەت. پارێزگەها دهۆکێ جهەکێ ستراتیژی یێ هەی ژ بەرکو دبیتە خالێ پێکڤەگرێدانا هەرسێ بەشێن کوردستانێ (کوردستانا عیراقێ و ترکیا و سوریێ). گرنگییا جوگرافی یا ڤێ پارێزگەهێ ل وی دەمی پتر لێ هات دەمێ بوویە دەرگەهەکێ بازرگانی یێ گرنگ بۆ وەلاتێ عیراقێ ب گشتی و بۆ هەرێما کورستانێ ب تایبەتی دگەل وەلاتێ ترکیا و جیهانا ژ دەرڤە.

سەرەرای وان کریارێن ژ ناڤبرن و خرابکرنێ یێن رێکخستی یێن تووشی پتریا کارگەهێن ئابووری یێن پارێزگەهێ و گوند و دەڤەرێن چاندنێ بووین ئەڤێن هاتینە ئەنجامدان ژ لایێ کریارێن لەشکەری ژ لایێ حکوومەتا عیراقێ یا بەرێ ڤە دژی عەرد و گەلێ کوردستانێ، لێ ئەڤ چەندە تا رادەیەکی بەرەڤ باشترچوون ب تایبەت پشتی کاودانێن سیاسی باشتر لێهاتین و هەلبژارتنێن پەرلەمانێ کوردستانێ هاتینە ئەنجامدان و حکوومەتا هەرێما کوردستانێ ل سالا (۱۹۹۲)ێ هاتییە دامەزراندن، پشتی هینگێ لایەنێن حکوومی و نێڤدەولەتی و نەحکوومی بزاڤێن مەزن کرن ژ پێخەمەت دوبارە ئاڤاکرنا پارێزگەهێ هەتا وی رادەی کو دهۆك بوویە ئارامترین پارێزگەها عیراقێ و گرنگترین پارێزگەهـ ژ لایێ ئابووریڤە، هەردیسان ئەڤە بۆ چەندین سالانە بۆ دەڤەرەکا گرنگا بازرگانی دناڤبەرا عیراقێ و هەرێما کوردستانێ ژ لایەکی و دگەل جیهانا ژ دەرڤە ژ لایەکێ دیڤە.

بەری نهو پتریا گوندێن سەر ب پارێزگەها دهۆکێڤە هاتبوونە خرابکرن یان کاڤلکرن، لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆ دوبارە هاتینە ئاڤاکرن و چالاکیێن وان وەکی بەرێ زڤرینەڤە و چەندین دەزگەهێن فێرکاری و ساخلەمیێ لێ هاتینە ئاڤاکرن، هەروەسا رێکێن هاتنوچوونێ دگەهنە پتریا دەڤەران یان ناڤەندێن بازرگانی و چاندنێ ل پارێزگەهێ.

زێدەباری وان پێشکەفتنێن مەزن، پارێزگەها دهۆکێ ژ لایێ ئاڤاکرنا دەزگەهێن فێرکرنێڤە پێشکەفتنەکا هەرە مەزن بخۆڤە دیتییە و ل دەستپێکا ڤان پێشکەفتنان دامەزراندنا زانکۆیا دهۆکێ بوو زێدەباری چەندین پەیمانگەهێن تەکنیکی

ل قەزایێن جوداجودا یێن پارێزگەهێ. ئەم دشێین بێژین كو بەرفەرەبوونا كاودانێن ئێمناهیێ ل هەرێما كوردستانێ بووینە ئەگەر قەبارەیێ چالاكیێن ئابووری مەزنتر لێ بهێت زێدەباری گەشەكرنا وان ل سالێن داهاتی.

ژ پێخەمەت دیاركرنا كەتوارێ چالاكیێن ئابووری ل پارێزگەها دهۆكێ، ئەم دشێین ڤان چالاكیان ل سەر چەندین تەوەران دابەش بكەین، ئەوژی ب ڤی رەنگی:

- تەوەرێ ئێكێ: كەرتێن ئابووری و پێشكەفتنا وان
- تەوەرێ دووێ: ئاكنجیێن پارێزگەهێ و هێزا كاری
- تەوەرێ سیێ: كەتوارێ چالاكیێن وەبەرهێنانێ
- تەوەرێ چوارێ: كەرتێ بازرگانی
- تەوەرێ پێنجێ: كەرتێ پەترۆلێ ل هەرێمێ
- تەوەرێ شەشێ: كاودانێن ژیانێ ل دەڤ ئاكنجیێن پارێزگەهێ

## تەوەرێ ئێكێ: كەرتێن ئابووری و پێشكەفتنا وان

گرنگیا چالاكیێن ئابووری دناڤبەرا دەڤەرێن جوگرافی و گرنگیا وان یا رێژەیی ل كەرتێن ئابووری رۆژ بۆ رۆژێ دزێدەبوونێ دایە ل دەڤ وان كەسێن بسپۆر و تایبەتمەند یێن رادبن ب دانانا پلان و بریارێن سیاسی یێن ئابووری، زێدەباری گرنگیا وان وەك هێمایەكێ دەستنیشانكەر بۆ دانا بریارێن وەبەرهێنانێ یێن تاكەكەسی. ئەو وەلاتێن دڤێن تێكراییێن گەشەكرنێ بلند بكەن پشت بەستنێ دكەنە سەر وان ئەنجامدانا گوهۆرینێن پەیكەری د ئابووریێ خۆ دا دگەل نەخشەیێن جهـ و كارگەهێن ئابووری ب شێوەیەكێ گشتی و یێن پیشەسازی ب شێوەیەكێ تایبەتی. ب ڤی رەنگی ئەو داهاتیێن خۆ ل سەر وەبەرهێنەرێن پێكۆهۆرك دابەش دكەن و دئەنجامدا دشێن شێوازەكێ گونجایی یێ ئابووری ب دەستڤەبینن كو دگەل سرۆشتێ دابەشكرنێ بگونجیت.

پێدڤییە ئەم ل دەستپێكێ ئاماژەیێ ب هندێ بكەین كو قەبارەییێ چالاكیێن ئابووری دهێتە پیڤان ب هژمارا وان پرۆژە یان كارگەهێن تایبەتمەند بۆ چالاكییەكا دەستنیشانكری ل جهەكێ جوگرافی یان كەرتەكێ ئابووری یێ دەستنیشانكری، ل دووڤ ڤاڤارتنا پەیوەندی ب وێ ڤە هەی. ل ڤێرێ كارگەهـ یان پرۆژە دەربرینێ ژ هەمی وان یەكەیێن بنەرەت دكەت یێن تایبەتمەند بۆ ئەنجامدانا هەر چالاكییەكا ئابووری كو مەرەم ژێ پەیداكرنا بەرهەمەكی یان خزمەتگوزاریەكێ بیت، ئانكو هەمی وان پرۆژەیێن چاندنێ و پیشەسازی و خزمەتگوزاری بخۆڤە دگریت یێن هاتینە ڤاڤارتن ل دووڤ ڤاڤارتنا پیڤانەیی یا پیشەسازیا نێڤدەولەتی.

### یەكەم: كەرتێ چاندنێ

ئەو كاودانێن عیراق تێرا بووری هەر ل ل دەستپێكا پەیدابوونا شەرێ عیراق و ئیرانێ ل سالا (١٩٨٠)ێ و پاشی شەرێ عیراقێ دگەل كوێتێ و ل دووڤدا سەپاندنا دوورپێچا ئابووری ل سەر عیراقێ ژ لایێ ئەنجومەنێ ئێمناهییا نێڤدەولەتی بووینە ئەگەرێ زێدە گرنگیدانێ ب كەرتێ چاندنێ و وان ئاسانكاریێن هاتینەكرن ژ پێخەمەت زێدەكرنا بەرهەمێ ناڤخۆیی بێ گشتی ل عیراقێ و هەرێما كوردستانێ، ئەڤ كاودانە بوونە ئەگەرێ چالاكرنا كۆمەكا فاكتەران كو ژ لایێ خۆڤە دبوونە ئەگەرێ هندێ پشت بەستن ل سەر بەرهەمێ كەرتێ چاندنێ یێ ناڤخۆیی بهێتە كرن وەك:

١. كێمبوونا هاوردەكرنا بەرهەمێن خوارنێ ژ دەرڤەی وەلاتی ژ بەركو كریا ئینانا وان گەلەك یا گران بوو، زێدەباری كێمبوونا ئاستێ هنارتنا پەترۆلێ بۆ بازارێن جیهانی و ل دووڤدا راوەستاندنا وێ.

٢. كێمبوونا بەرهەمێن پیشەسازی كو ژ ئەنجامێ راوەستیانا هژمارەكا كارگەهان پەیدابوو كو ئەڤ كارگەهە ئێدی نەشیان كەرەستێن خاڤ و پێدڤیێن شولكرنێ ژ دەرڤە هاوردە بكەن.

٣. كێمبوونا شیانێن كرینێ ژ لایێ خەلكیڤە كو بۆ ئەگەر خەلك پتریا داهاتێ خۆ ژ بۆ كرینا

کەلوپەلێن خوارنێ ب مەزنخیت. ئەڤ کاودان و گوهۆرینە سەر ب هەرێما کوردستانێ ژی هاتبوون، لێ ئەڤ کاودانە گرانتر ل سەر هەرێمێ دراوەستیان ژ بەرکو ژ لایەکی ڤە دووڕپێچا ئابووری ل سەر عیراقێ هاتبوو سەپاندن و ژ لایەکێ دیڤە حکۆمەتا ناڤەندی ژی دووڕپێچ ل سەر هەرێما کوردستانێ سەپاندبوو هەر ژ وێ رۆژا هەرێمێ ژ لایێ کارگێریڤە خۆ ژ عیراقێ جوداکری هەتا رۆژا کەفتنا حکۆمەتا عیراقێ یا بەرێ ل رۆژا ٢٠٠٣/٤/٩ێ.

ژ بۆ ئاشنابوون ل سەر کەتوارێ کەرتێ چاندنێ ئەم دێ ڤی تەوەری ل سەر ڤان خالان دابەش کەین:

## ئێك: رووبەرێن ب کێرهاتی بۆ چاندنێ و دارستان و مێرگێن ب خودانکرنا گیانەوران:

خشتەیێ (١) رووبەرێن گشتی یێن ب کێرهاتی بۆ چاندنێ و دارستان و مێرگێن ب خودانکرنا گیانەوران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠١٥ (ب دۆنەمان)

| قەزا | رووبەر | | |
|---|---|---|---|
| | ئاڤی | دێمی | دارستان و مێرگ |
| دهۆك | ١٩٢٦٦ | ٨٦٣٧٨ | ٣٣٠٨٢٧ |
| سێمێل | ١٠٣١٢ | ٣٠٢٣٩٠ | ١٠٠٩٦٩ |
| زاخۆ | ٢٢٣٢١ | ١٣٩٧٩٢ | ٦٥٠٦٨ |
| ئامێدی | ٩٢٣٢٠ | ٢١٩٦٢٧ | ٣٣٢١٩٨ |
| شێخان | ٨٩٨٩٤ | ٣٣٧٩٨٦ | ٢٣٨٥١٥ |
| ئاکرێ | ٥٣٠٤٤ | ٢٥٢٠٢٣ | ٣٦٩٦٥٨ |
| بەردەڕەش | ٦٠٠٠٠ | ٢٢٠٠٠٠ | ٢٢٤٥٦ |
| گشتی | ٣٤٧١٥٧ | ١٥٥٨١٩٦ | ١٤٥٩٦٩١ |

**ژێدەر: رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، هۆیا پلاندانان و دووڤچوونێ**

## دو: رووبەرێن گشتی یێن هاتینە بکارئینان بۆ چاندنێ:

ژ ئەنجامێ ڤان گوهۆرینان و ژ بەر ئەگەرێن گەشەیا سرۆشتی یا ئاکنجیبان و زێدەبوونا داخوازێن ناڤخۆیی، کەرتێ چاندنێ ل پارێزگەهێ بەرفرەهبوونەکا بەرچاڤ بۆ بکارئینانا رووبەرێن چاندنێ بخۆڤە دیت. ل دووڤ وان داتایێن ل بەردەست هەین رووبەرێ گشتی یێ عەردێ ب کێرهاتی بۆ چاندنێ ل پارێزگەهێ دگەهیتە (١١٩٧٧٢٧) دۆنەمێن عەردی، لێ ئەو رووبەرێ هاتییە بکارئینان بۆ چاندنا بەروبۆمێن جوداجودا دناڤبەرا سالێن (١٩٨٨ هەتا ٢٠١٥)ێ گوهۆرینەکا هەرە مەزن بخۆڤە دیتییە ژ بەرکو سەرژمێری ئاماژەیێ ب هندێ دکەن کو ئەڤ رووبەرێ هاتییە بکارئینان بۆ چاندنێ ل سالا ١٩٨٨ێ نێزیکی (٢٢٣٣٨٦) دۆنەمێن عەردی بوو کو رێژەیا وێ دبوو ١٩٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ عەردێ ب کێرهاتی بۆ چاندنێ، لێ ئەڤ رووبەرێ عەردێ هاتییە بکارئینان بۆ چاندنێ ل سالا (١٩٩٠)ێ گەهشتە نێزیکی (٣١٢٧٦١) دۆنەمێن عەردی و ل سالا (١٩٩٣)ێ گەلەك پتر لێ هات تا وی رادەی رووبەرێ هاتییە ب کارئینان نێزیکی ٧٥٪ێ بوو ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ ب کێر چاندنێ دهات.

ل دەستپێکێ دیاردبیت کو سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ هاتییە بکارئینان بۆ چاندنێ دناڤبەرا سالێن (١٩٨٨-١٩٩٠)ێ گەلەك یێ کێم بوو و ئەڤ چەندەژی بۆ کریارێن لەشکەری یێن ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ یا بەرێ دژی خەلکێ کوردستانێ ب تایبەت هەوێن ئەنفالان هاتینە ئەنجامدان، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر خەلك مال و ملك و گوندێن خۆ ب جهـ بهێلن و دەست ژ عەردێن خۆ یێن چاندنێ بەردەن.

هەردیسان داتایێن خشتەیێ ژمارە ٢ بۆمە دیاردکەن کو رێژەیا مفا وەرگرتنێ ژ عەردێن ب کێرچاندنێ دهێن ل هندەك تێکرایێن چەندجارکی جێگیربووینە ب هەڤبەرکرن دگەل سالا ١٩٨٨ێ سەرەرای هەبوونا هندەك لڤین و گوهۆرینان د رێژەیێن سالێن دناڤبەرا (١٩٩٦-٢٠١٥)ێ دا. لێ ل

**خشتەیێ (٢)**

**سەرجەمێ گشتی یێ روویەرێ عەردێ هاتییە بکارئینان بۆ چاندنێ (دۆنەم) و بەرهەم ئینانێ (تەن) ل پاریزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن ١٩٩٨-٢٠١٥**

| سال | روویەرێ چاندن/ دۆنەم | رێژەیا وی ب هەڤبەرکرن دگەل سەرجەمێ روویەرێ ب | بەرهەم/ تەن | |
|---|---|---|---|---|
| | | | بەروبۆمێ زڤستانێ | بەرۆبومێ هاڤینێ |
| ١٩٨٨ | ٢٢٣٣٨٦ | ١٨,٧ | - | - |
| ١٩٩٠ | ٣١٢٧٦١ | ٢٦,١ | - | - |
| ١٩٩٦ | ٨٥١٢٥٨ | ٧١,١ | - | - |
| ١٩٩٩ | ٧٢٢٥٦٩ | ٦٠,٣ | - | - |
| ٢٠٠٠ | ٧٥٨٨٩٣ | ٦٣,٤ | - | - |
| ٢٠٠١ | ٩٥١٩٣٧ | ٧٩,٥ | - | - |
| ٢٠٠٥ | ٨٢٣٤٥٦ | ٦٨,٧ | - | - |
| ٢٠١١ | ١٠٩٧٣١٥ | ٩٢,٥ | - | - |
| ٢٠١٢ | ١٠٨٤٥٤١ | ٩٠,٦ | ٤٠١٢٣٥ | ٢٧١٣٧٩ |
| ٢٠١٣ | ١٠٢٥٤٩٢ | ٨٥,٦ | ٤٨٩٨٩٣ | ٢٥٠١٢٩ |
| ٢٠١٤ | ٩٥٨٣٩٤ | ٨٠,٠ | ٤٣٢٩١١ | ٢٨٣٣٦٩ |
| ٢٠١٥ | ٩١٣٣٤٢ | ٧١,٧ | ٤٠١٣٢٢ | ٢١٠٢٨٣ |
| ماوەیێ ناڤنجی | ٨١٠٢٧٨ | ٦٧,٤ | ٤٣١٣٤٠ | ٢٥٣٧٩٠ |

سالا ٢٠١١ێ مەزنترین رێژەیا مفا وەرگرتنێ ژ عەردێن ب کێرچاندنێ هاتینە توومارکرن ب برەیا (١٠٩٧٣١٥) دۆنەمان کو دبیتە رێژا ٩٢,٥٪ێ ژ سەرجەمێ روویەرێ گشتی یێ ب کێرچاندنێ دهات.

سەرژمێری دیاردکەن کو پتر ژ ٨٥٪ێ ژ ڤان روویەرێن عەردی بۆ هەردو بەروبۆمێن گەنمی و جەهی هاتینە بکارئینان، هەردیسان پتر ژ ٩٠٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ ڤی روویەری بۆ بەروبۆمێن زڤستانێ هاتییە بکارئینان. هەروەسا وەك تێکراپی رێژەیا مفا وەرگرتنێ ژ عەردێن ب کێرچاندنێ دهێن دوی ماوەیێ مە ئاماژە پێکری د خشتەی دا دگەهیتە ٦٧,٤٪.

کێم بکارئینانا روویەرێن عەردێ ب کێرهاتی بۆ چاندنێ دناڤبەرا سالێن (١٩٨٨-٢٠٠٠)ێ ڤەدگەریت بۆ سروشتێ کارکرنێ ل ڤی کەرتی و رەوشا بەرهەمهێنەرێن وێ، ب رەنگەکی کو ل دووڤدا سالێن ڤەژاندن و گەشبوونێ یێن ل دووڤدا (بلندبوونا بهایێن بەرهەمێن چاندنێ) بووینە ئەگەر ئەڤ عەردە پتر بهێنە بکارئینان بۆ چاندنێ. لێ فاکتەرەکێ دی یێ بوویە ئەگەر هندەك گوهۆرین د ڤان رێژەیاندا پەیدابن ئەوژی هاوردەکرنا بەرهەمێن چاندنێ بوو ژ دەرڤەی وەلاتی ژ بەرکو بازارێ ناڤخۆیی ئێدی هێدی هێدی پربوو ژ هندەك بەرهەمێن وەلاتێن جیران و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر هیچ رەنگەکی پاراستنێ ل سەر بەرهەمێن ناڤخۆیی نەبیت، ل سالێن ل دووڤدا بەرهەمهێنەرێن ناڤخۆیی پێداگیری ل سەر ڤان بەروبۆمان کر لەورا بۆ ئەگەر ئێدی ئەڤ بەروبۆمە ب بهایەکێ گرانتر بهێنە هاوردەکرن و ل دووڤدا ئەڤ

گرانکرنە بۆ ئەگەر دوبارە بەرهەمهێنەرێن ناڤخۆیی ڤان بەروبۆمان بچینن.

## سێ: پرۆژەیێن بەرهەمێ گیانەوەرێ:

ئەگەر ئەم تەماشەی یەکەیێن بەرهەمێ گیانەوەری بکەین، دێ بینین کو هژمارا پرۆژەیێن بەرهەم ئینانا مریشکان دگەهنە ٢٣٠ پرۆژەیان، ژ ڤان پرۆژەیان ٢١٥ پرۆژە یێن بەرهەم ئینانا گۆشتی نە ل دەمەکی کو هژمارا ڤان پرۆژەیان ل سالا دەستپێکێ ب تنێ ٦٣ پرۆژە بوون و ب تنێ بۆ بەرهەم ئینانا گۆشتی هاتبوونە ڤەکرن. هەردیسان سەرژمێری ئاماژەیێ ب هندێ دکەن کو وەبەرهێنان د پرۆژەیێن بخوداکرنا ماسییاندا ژی تا ڕادەیەکی زێدەبوویە ژ بەرکو ل سالا (٢٠١٥)ێ هژمارا پرۆژەیێن بخودانکرنا ماسییان ٨٦ پرۆژەبوون لێ ل سالا (٢٠٠١)ێ ب تنێ ١٣ پرۆژەبوون و ئەگەرێ ڤێ زێدەبوونێ ژی بۆ زێدەبوونا داخوازیێن ناڤخۆیی بۆ بەرهەمێ ماسییان دزڤریت زێدەباری کێمبوونا حەزا خەلکی ل سەر بکارئینانا بەرهەمێن هاوردەکری ژ دەرڤەی وەلاتی، ب پشت بەستن ل سەر بەرهەمێن ناڤخۆیی بوویە ئەگەر هەتا ڕادەیەکی خەلك خۆ دگەل کاودانێن دووریێچا ئابووری بگونجینن ب تایبەت هەرێما کوردستانێ کو د ماوەیێ سالێن بووری دا ژ ئەنجامێ ڤان دووریێچان تووشی ئاریشەیێن هەرە مەزن بوو.

هەردیسان ئەگەر تەماشەی دابەشبوونا جوگرافی یا پرۆژەیێن بەرهەمین گیانەوەری و پرۆژەیێن بخودانکرنا ماسییان بکەین دێ بینین کو ب رێژا ٢٣,٦٪ێ ژڤان پرۆژەیان ل سالا (٢٠٠١)ێ دکەڤنە دناڤ سەنتەرێ پارێزگەهێ دا و رێژەیا قەزایێن دی ژی تا ڕادەیەکی نێزیکی ئێك بوون، لێ ل سالا (٢٠٠٢)

**خشتەیێ (٣)**

**دابەشبوونا جوگرافی یا ڕێژەیی بۆ پرۆژەیێن بەرهەمێ گیانەوەری و ب خودانکرنا ماسییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠١٥**

| قەزا | گۆشتێ مریشکا | هێکێن مریشکا | قەسبخانەیێن مریشکان | جهێن هێکدانانێ | پرۆژەیێن ماسییان | شانەیێن مێشێن هنگیڤنی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ٣٧ | ٠ | | ١ | ٥ | ١٤٢٤٢ |
| سێمێل | ٣٤ | ٢ | ١ | ٢ | ١٢ | ٤٩٦٩ |
| زاخۆ | ٨ | ٠ | ١ | ٠ | ٧ | ٣٣٢٠ |
| ئامێدی | ١٨ | ٠ | ٢ | ٠ | ٧ | ١٨١٨٥ |
| شێخان | ٥٠ | ٠ | ٠ | ١ | ٧ | ٥٩٣٥ |
| ئاکرێ | ١١ | ٠ | ٢ | ١ | ٢ | ٩٥٦٣ |
| بەردەرەش | ٥٧ | ٠ | ١ | ١ | ٤٦ | ٣٧٩٨ |
| گشتی | ٢١٥ | ٢ | ٧ | ٦ | ٨٦ | ٦٠٠١٢ |

ژێدەر:

١- رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ. هۆبا پلاندانان و دویڤچوونێ

٢- رێڤەبەریا سامانێ گیانەوەری ل پارێزگەها دهۆکێ. سەرژمێرێن پرۆژەیێن بەرهەمێ گیانەوەری

ێ گوهۆرینێن مەزن دڤان رێژەیاندا پەیدابوون ژ بەرکو هژمارا ڤان پرۆژەیان ل هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ گەلەك زێدەبوون ب هەڤبەرکرن دگەل قەزایێن دی، ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو زێدەبوونا ڤان رێژەیان ل دەڤەرێ ئەم دگەل یێن دەڤەرێن دی هەڤبەربکەین، بەلکو ئەڤ چەندە ڤەدگەریت بۆ وێ نەیەکسانیێ یا د رێژەیا کێمبوونا پرۆژەیاندا ل ڤان دەڤەراندا پەیدابووی هەروەکی د خشتەیێ ژمارە (٣) ئاماژە پێ هاتییە کرن.

## دووەم: کەرتێ پیشەسازیێن دروستکرنێ

ئەڤ کەرتە هەمی وان چالاکیێن ئابووری بخۆڤەدگریت یێن هاتینە پارڤەکرن ل گۆر پارڤەکرنەکا ستاندەر یا پیشەسازی یا جیهانی کو پێکدهێن ژ پرۆژەیێن بەرهەم ئینانا کەلوپەلێن دەستکرد و نیڤ دەستکرد و کەرتێن ئاڤاکرنێ و کارەبێ، ئەڤ کەرتە وان پرۆژەیان بخۆڤە ناگریت یێن مفای ژ کەرەستەیێن سرۆشتی وەك پەترۆل و کانزایان وەردگرن (د تەوەرێن داهاتی دا دێ بەحسێ ڤان پرۆژەیان کەین). هەردیسان ئەڤ کەرتە ب سەدەها وان کارگەهێن بچویك یێن ل گشت دەڤەرێن پارێزگەهێ هەین بخۆڤە ناگریت، هەردیسان ئەو پرۆژەیێن پیشەسازیێ یێن دەستویردای ژ لایێ رێڤەبەریا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل پارێزگەهێ ژی بخۆڤە ناگرن بەلکو دێ بەحسێ وان د تەوەرێ وەبەرهێنانێ دا کەین. خشتەیێ ژمارە (٤) ئاماژێ ب هژمارا وان پرۆژەیێن پیشەسازی یێن دەستویردای و کارا ژ لایێ رێڤەبەریا گەشەپێدانا

**خشتەیێ (٤)**

**سەرجەمێ گشتی یێ هژمارا یەکەیێن پیشەسازی و دابەشبوونا وان یا جوگرافی ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠١٥**

| قەزا / چالاکیا پیشەسازی | دهۆك | زاخۆ | ئاکرێ | سێمێل | ئامێدی | شێخان | بەردەڕەش | گشتی | رێژە٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خۆراك | ٢٦ | ٢٢ | ٤ | ١٢ | ١ | ٢ | ١ | ٦٨ | ٢٠,٧ |
| کارەب | ٢ | - | - | ٤ | - | - | - | ٦ | ١,٨ |
| کانزایی | ٨ | ٣ |  | ١٦ | - | - | - | ٢٧ | ٨,٢ |
| کەرەستەیێن ئاڤاهییان | ١٤ | ٣٤ | ٨ | ٥٤ | ٣ | ٤ | ٩ | ١٢٦ | ٣٨,٤ |
| نە میتالی | ٣٠ | ١٨ | ٢ | ١٢ |  | ١ | ١ | ٦٤ | ١٩,٥ |
| خزمەتگوزاریێن پشتی فرۆشتنێ | ٤ | ١ | - | ٣ | - | - | - | ٨ | ٢,٥ |
| جۆراوجۆر | ٦ | ٤ | - | ٤ | - | ١ |  | ١٥ | ٤,٦ |
| کیمیایی | - | ٥ | - | ٩ | - | - | - | ١٤ | ٤,٣ |
| گشتی | ٩٠ | ٨٧ | ١٤ | ١١٤ | ٤ | ٨ | ١١ | ٣٢٨ | ١٠٠,٠ |
| رێژە | ٢٧,٥ | ٢٦,٥ | ٣٤,٨ | ٤,٣ | ١,٢ | ٣,٣ | ٢,٤ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ |
| هژمارا کریکاران | ١٧١٧ | ١٣٨٨ | ١٩١ | ٢٩٥٢ | ٧٤ | ١٨٢ | ١١٠ | ٦٦١٢ |  |

ژێدەر: ئەڤ خشتەیە هاتییە ئامادەکرن و رێژە هاتینە دەرئێخستن ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل دووڤ وان داتایێن هاتینە وەرگرتن ژ:- رێڤەبەریا گەشەپێدانا پیشەسازی ل پارێزگەها دهۆکێ.

پیشەسازی ل پارێزگەها دهۆکێ بخۆڤە دگریت.

هەژی گۆتنێ یە کو هژمارا وان پرۆژەیێن دەستویردای ژ ڤان هژمارەیان پترە ژ بەرکو هندەك ژ وان هێشتا نەهاتینە تەمامکرن و هندەکێن دیژی ژ بەر هندەك ئەگەرێن جوداجودا کارناکەن وەك نەبوونا شیانێن هەڤرکیێ ژ بەرکو چ پاراستن ل سەر بەرهەمێن وان نینە ژ بەر بەرهەمێن هاوردەکری.

ژ داتایێن ڤی خشتەی بۆمە دیاردبیت کو رێژەیا هەرە مەزن یا پرۆژەیێن پیشەسازیا دروستکرنێ ل هەرسێ قەزایێن دهۆك و سێمێل و زاخۆ هەنە کو رێژەیا وان دگەهیتە ٨٨,٨٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ پرۆژەیان ل پارێزگەها دهۆکێ.

ئەگەرێ دانانا یەکەیێن پیشەسازی ل هندەك جهان یانژی شێوازێ دابەشبوونا وان یا جوگرافی ب ڤی رەنگی ل سەری بۆ چەندین فاکتەران دزڤریت کو یا ژهەمییان گرنگتر هژمارا مەزن یا ئاکنجیێن خەلکێ یە ل هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ و ئەڤێ چەندێ رۆلێ هەی ل سەر زێدەبوونا قەبارەیێن فرۆشتنا بەرهەمێ ڤان کارگەهان ل ناڤ بازارێن ناڤخۆیی و ل دووڤدا زێدەبوونا داخوازیێ ل سەر ڤان بەرهەمان و وان خزمەتێن دهێنە پێشکێشکرن ژ لایێ یەکەیێن کەرتێ پیشەسازیڤە. زێدەباری دابینکرنا خزمەتێن پەیوەندی پێڤە هەی و دابینکرنا کرێکارێن ئامادە ب شێوەیەکێ باشتر بۆ ب رێڤەبرنا ڤان چالاکییان ب هەڤبەرکرن دگەل قەزایێن دی یێن پارێزگەهێ.

هەورەسا ل سێمێلی ژی ژ نوی دەڤەرەکا پیشەسازی یا پەیدابووی ئەوژی دەڤەرا (کواشێ) یە و ئەگەرێ دروستکرنا وێژی بۆ هندێ دزڤریت کو چەندین پرۆژەیێن پیشەسازی ل ڤێ دەڤەرێ هەبوون، لێ فاکتەرەکێ دیژی یێ گرنگ بوو ئەگەرێ پەیدابوونا ڤێ دەڤەرێ ئەوژی چالاکیێن بازرگانی و وگرنگییا جهێ ڤان دەڤەرێ ل سەر رێکەکا بازرگانی یا گشتی.

سەرەرای وێ گرنگییا تایبەت بۆ دابەشبوونا جوگرافی یا یەکەیێن پیشەسازی رەنگڤەدانێ ل سەر کەتوارێ تایبەتمەندیێن وی جهی دکەن یێن ئەڤ دابەشبوونە ل سەر پەیدابووی، قەبارەیێ بکارئینانێ دهێتە هەژمارتن نیشاندەرەکێ گرنگ ل سەر شیانێن ڤی کەرتی بۆ وەرگرتنا هێزا کاری یێ دهێتە پێشکێشکرن ل ناڤ بازارێ کاری یێ ناڤخۆیی ب تایبەت نەبوونا هندەك داتایێن پێدڤی و هویر ل سەر پارێ دهێتە تەرخانکرن بۆ وەبەرهێنانێ ل ڤان جهان زێدەباری نەبوونا هندەك پیڤەرێن سەردەم ل عیراقێ و هەرێما کوردستانێ کو بشێت ڤاڤارتنەکا گونجایی بۆ ڤان یەکەیان بکەت. ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ کەرتە شیاینە دەلیڤەیێن کاری بۆ (٦٦١٢) کرێکاران د تایبەتمەندیێن تەکنیکی و زانستی یێن جوداجودا دا دابین بکەت.

ل دووڤ پیڤەرێن زانستی و بەرێخودانا کەتوارێ بازارێ ناڤخۆیی، ئەڤ کەرتە هێشتا یێ بچویکە ب تایبەت ئەگەر هەڤبەربکەین دگەل پێدڤیێن بازارێ ناڤخۆیی ژ بەرکو هێشتا کەلوپەلێن هاوردەکری پتریا پێدڤیێن بازارێ ناڤخۆیی دابین دکەن. هەردیسان هژمارا گشتی یا وان کەسێن ل ڤان جهان کاردکەن ژی گەلەك یا کێمە ئەگەر دگەل هژمارا وان کەسان هەڤبەربکەین یێن ل دەزگەهێن حکومی کاردکەن، ئەو پرۆژەیێن کو مە دڤێت دگەل پرۆژەیێن مەزن بهەژمێرێن هژمارا وان ژ تبلێن دەستی نابووریت و دبیت ئەگەرێ وێ بۆ ڤان فاکتەران بزڤریت:

١- دبیت کارگەهـ یان دەزگەهەکێ بچویك بیت و ژ لایێ وەبەرهێنەرەکی و خێزانا وی ب شێوەیەکێ راستەوخۆ دهێتە ب رێڤەبرن.

٢- بکارئینا ئامیرێن سەردەم د کریارا بەرهەم ئینانێ دا یا کێمە.

٣- ئەڤ قەبارەیێ دگەل قەبارەیێێ داخوازیێن ناڤخۆیی یێن سنووردار دگونجن.

ل دووماهیێ ژی ئەم دشێن بێژین کو ئەڤ چەندە پێدڤی ب بەرهەڤکرن و دابینکرنا هندەك بەرنامە و سیاسەتێن ئابووری یێن باش هەیە کو بشێت ببنە پالدەر بۆ ب سانەهیکرنا ڤەکرنا پرۆژەیێن پیشەسازی وەك سیاسەتێن پاراستنا بەرهەمێن ناڤخۆیی و سیاسەتێن پارەپێدانێ وەك قەرزێن بچویك بۆ راسپاردنا هندەك وەبەرهێنەران.

هەروەسا بۆ دەستنیشانكرنا قەبارەیێ كارگەهان و ڤاڤارتنا وان ب شێوەیەكێ كو بگونجیت دگەل وان گوهۆرینێن یێن بەردەوام پەیدادبن د سرۆشتێ كاری دا ل كارگەهێن پیشەسازی.

## سێیەم: كەرتێ خزمەتگوزارییان

كەرتێ خزمەتگوزارییان هەمی وان خزمەتگوزاری و پرۆژەیێن خزمەتگوزاری یێن سەر ب كەرتێ تایبەتڤە بخۆڤەدگریت، لێ ئەڤ كەرتە وان خزمەتگوزارییان بخۆڤەناگریت یێن سەر ب كەرتێ حكومی ڤە وەك خزمەتێن فێركرن و ساخلەمی و ئاڤ و كارەبێ ...هتد كو خزمەتێن خۆ پێشكێشی هژمارەكا مەزن یا خەلكی دكەن. داتایێن كەرتێ خزمەتگوزارییان د خشتەیێ ژمارە (٥) دا هاتینە دیاركرن.

ئەڤ پرۆژەیە ب هندێ دهێنە نیاسین كو قەبارەیێێ وان یێ بچویكە و هژمارەكا كێم یا كرێكاران هەنە، ل ڤێرێ ئەم دشێن ئاماژەیێ ب دو راستییان بكەین:

١. چالاكیێن پتریا ڤان كارگەهـ و پرۆژەیان د وەرزینە و شیانێن هندێ نینن ب درێژاهییا سالێ كاربكەن یان هەڤركییا بازاری بكەن.

٢. نەبوونا شیانێن ب رێڤەبرنا كارگەهـ و پرۆژەیێن مەزن ژ بۆ گرەنتیكرنا بەردەوامییا وان ل سەر بەرەڤانیكرنێ ل سەر هەڤركیێ دگەل كارگەهـ و پرۆژەیێن بچویك كو رەنگە بریڤەبرنا وان پێدڤی ب شیانێن مەزنتر یان سەرمایەكێ مەزنتر بیت.

ل دووماهیێكێ ئەم دشێن بێژین كو نیشاندەرێن ڤان هەرسێ كەرتێن بەری نهو مە بەحس كرین هێمایێ دكەنە سەر هندەك راستییان كو یا ژهەمیان بەرچاڤتر ئەوە پتریا ڤان كەرتان ل هەرسێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ و سێمێلێ خرڤەبووینە. ئەڤ دابەشبوونا رێژەیی و شێوازێ گوهۆرینان تێدا بۆ چەند ئەگەران دزڤریت وەك:

١. ئاكنجیبوونا هژمارەكا مەزن یا خەلكی ل هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ ژ ئەنجامێ مشەختبوونا ژ گوندان یان خرابوونا گوندێن دەوروبەری ڤان قەزایان د ماوەیێ هەردو دەهسالێن بووریدا بووینە ئەگەرێ

**خشتەیێ(٥)**

**دابەشبوونا جوگرافی یا گشت كارگەهـ و پرۆژەیێن خزمەتگوزاری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠١٥***

| قەزا / چالاكیێن خزمەتگوزاری | گشتی |
|---|---|
| خزمەتێن پشتی فرۆشتنێ (چاككرنا ترۆمبێلان) | ٩٣٧ |
| خزمەتێن تەكنیكی و چاككرنێ | ١٦٠ |
| پێشانگەهێن ترۆمبێلان | ٢٢٠ |
| نڤێسینگەهێن خانوبەران | ٢٠٨٢ |
| هوتێل و موتێل | ٢٠٩ |
| پانزینخانە | ١٨٣ |

ژێدەر: ئەڤ خشتەیە هاتییە ئامادەكرن و رێژە هاتینە دەرئێخستن ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە ل دووف وان داتایێن هاتینە وەرگرتن ژ:-

ژوورا بازرگانی و پیشەسازی ل دهۆكێ، ٢٠١٥.

رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆكێ، ٢٠١٥

پەیدابوونا هندەك جۆرێن چالاكییان یێن پەیوەندی ب چاندنێ ڤە نەی.

٢. چالاكیێن چاندنێ بەهرا پتر ل قەزایێن دی یێن پارێزگەهێ هاتینە ئەنجامدان ئەوژی ژ ئەگەرێ هەبوونا رووبەرێن بەرفرەهـ یێن عەردێن ب كێرچاندنێ دهێن و ژێدەرێن ئاڤێ.

٣. گوهۆرینا هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ بۆ دو سەنتەرێن بازرگانی یێن گرنگ ل دەڤەرێ ئەوژی ژ بەر تێرابوورینا رێكا ئێكانە یا عیراقێ كو ژ مووسل دهێت و دناڤ هەرێمێ را دبووریت هەتا دگەهیتە تركیا و ئەڤ رێكە رێكا ئێكانە یا فرۆشتنا گازێ بوو ب شێوەیێ نهێنی ل سەردەمێ دوورپێچا ئابووری.

٤. دگەل ڤان كاودانان و هەبوونا هژمارەكا رێكخراوێن نیڤدەولەتی بووینە ئەگەر چەندین پرۆژەیێن خزمەتگوزاری و پیشەسازی ل ڤان هەردو قەزایان بهێنە بجهئینان.

## تەوەرێ دووێ:
## ئاكنجیێن پارێزگەهێ و هێزا كاری

هێزا كاری هێتە هژمارتن ئەو بەشێ ئاكنجییان یێن ژ لایێ جڤاكیڤە دهێنە تەرخانكرن بۆ ئەنجامدانا هندەك كاروبارێن جڤاكی یێن تایبەت ب بەرهەم ئینانا كەلوپەلان و پێشكێشكرنا خزمەتگوزارییان، ئاشنابوون ب قەبارەیێ و پەیكەرێ بكارئینان و دابەشبوونا وان ل سەر چالاكیێن جۆراوجۆر دێ هاریكاریا مە كەن وەك نیشاندەرێن گرنگ ل دۆر شیانێن كەرتێن ئابووری، هەروەسا ئەڤ نیشاندەرە دێ هاریكاریا كەسێن بسپۆر كەن یێن تایبەتمەند د كێشانا وێنەیێ سیاسەتێن ئابووری و جڤاكی دا.

ژ بەركو مەرەم ژڤی تەوەری دیاركرنا قەبارەیێ بكارئینان و پەیكەرێ وی یێ كاری و پیشەیی یە، زێدەباری دەستنیشانكرنا رێژەیا كەسێن كاردكەن و رێژەیا بێكاریێ، لەورا ل دەستپێكێ یا فەرە ئەم هندەك تێگەهێن سەرەكی یێن كاری و دیاركرنا كاری و ئاكنجیێن چالاك ژ لایێ ئابووریڤە دەستنیشان بكەین ب رەنگەكی كو كریارا شرۆڤەكرنێ پتر یا راستگو و بابەتی بیت.

ژ بەر گرنگیا ڤی بابەتی، ئەم دێ پێدڤی بجهئینانەكا هویر بووین پەیوەندیدار ب پیڤەرێن تایبەت ژ بۆ دەستنیشانكرنا وی بەشێ ئاكنجییان كو ل سەر وان پێدڤییە كارێن ئابووری و جڤاكی یێن جوداجودا ئەنجام بدەن، ژ بۆ ب دەستڤەئینانا ڤێ ئارمانجێ ژی، پێدڤییە ل دەستپێكێ ئەم سێ هێما و نیشاندەران ل دۆر ئاكنجیێن پارێزگەهێ رۆهن بكەین، ئەوژی ئەڤەنە:

- سەرجەمێ گشتی یێ هژمارا ئاكنجیێن پارێزگەهێ و گەشەكرنا وان (زێدەبوونا وان)
- دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ
- پێكهاتنا ژی (تەمەنی- عەمری) یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ

### یەكەم: نیشاندەرێن تایبەت ب ئاكنجییانڤە:

گەشەكرنا قەبارەیێ ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-٢٠١٥)ێ:

ل دەستپێكێ یا پێدڤییە ئەم ئاماژەیێ ب سێ تێبینیێن گرنگ ل دۆر سەرژمێریێن ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ بكەین، ئەوژی بڤی رەنگی:

أ. ئەو داتایێن هاتینە كۆمكرن ل سەر ئاكنجیێن پارێزگەهێ ل بەری سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ، هەردو قەزایێن ئاكرێ و شێخان بخوڤە ناگرن ژ بەركو ئەڤ هەردو قەزایە هینگێ ژ لایێ كارگێریڤە سەر ب پارێزگەها مووسل ڤەبوون. ژ بەر هندێ خەلكێ ڤان هەردو قەزایان دگەل خەلكێ پارێزگەها نەینەوا هاتینە هەژمارتن پشتی كو حكۆمەتا ناڤەندی رابووی ب كێشانا كارگێریێن وان ژ هەرسێ پارێزگەهێن هەرێمێ (سلێمانی و هەولێر و دهۆك).

ب. ژ بەركو حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ نەرابوویە ب چ كریارێن سەرژمێریا ئاكنجیێن هەرێمێ، لەورا ب دەستڤەئینانا هژمارا ئاكنجیێن هەر پارێزگەهەكێ

کارەکێ زێدە بزەحمەتە ب تایبەت ل وان سالێن دکەڤنە بەری سالا (١٩٩٦)ێ.

ت. هەروەسا ئەو داتایێن دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦-٢٠٠٤)ێ ب دەست مە کەفتین ئەوێن ژ لایێ رێکخراوا خوارنا جیهانی (WFP) یا سەر ب نەتەوێن ئێکگرتیڤە هاتینە ئامادەکرن. هەروەسا ئەو داتایێن ڤێ رێکخراوێ ئامادەکرین ل هەر چوار سالێن دووماهیێ پتر جهێ باوەریێ نە ژ بەرکو چەندین پێرابوون هاتبوونە ئەنجامدان ژ پێخەمەت هویربینیا ڤان سەرژمێریان. هەرچەوابیت ئەگەر هندەك کێماسی ژ لایێ وانڤە هەبن ژی لێ ئەو ژێدەرێ ئێکانەیێ ڤان داتایانە.

پ. بۆ سالێن ل دووڤدا ژی، داتا ژ دەستەیا گشتی یا سەرژمێریان ل هەرێمێ، رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ هاتینە وەگرتن.

داتایێن د خشتەیێ ژمارە (٦) دا هاتینە دیارکرن ئاماژەیێ ب هندێ دکەن کو هژمارا خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ نێزیکی شەش جاران پتر لێهاتینە دناڤبەرا سالێن (١٩٩٧-٢٠١٥)ێ دا. بەشەکێ ڤێ زێدەبوونێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو هەردو قەزایێن ئاکرێ و شێخان ژ لایێ کارگێریڤە پشتی سالا ١٩٩١ێ هاتینە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە لێ بەشێ دیژی ڤەدگەریت بۆ گەشەکرنا سروشتی یا هژمارا ئاکنجییان.

هەردیسان ژڤی خشتەی بۆمە دیاردبیت کو تێکرایێ گەشەکرنا ئاکنجییان ٣,٢٪ێ بوو دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ، لێ ژ بەرکو ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٨٧-١٩٩٦)ێ پێکدهێت ژ هندەك زێدەکرنێن نەسروشتی ژ بەر زێدەکرنا ئاکنجییێن قەزایێن ئاکرێ و شێخان لەورا تێکرایێ گەشەکرنێ د ڤی ماوەی دا ل بەر چاڤ نەهاتییە وەرگرتن. لێ تێکرایێ گەشەکرنێ دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦-٢٠١٥) ێ دناڤبەرا ٢,٧٪ - ٣,٥٪ێ بوو.

لێ تێکرایێ گەشەکرنا گشتی یێ ڤی ماوەی نێزیکی ٣,٣٪ێ بوو و ئەڤەژی نێزیکی تێکرایێ گەشەکرنێ گشتی یێ ئاکنجییێن عیراقێ یە.

**خشتەیێ (٦)**

**سەرجەمێ گشتی یێ ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ و تێکرایێن گەشەکرنا وان دناڤبەرا سالێن (١٩٩٧-٢٠١٥)دا**

| سال | سەرجەم |
|---|---|
| ١٩٧٧ | ٢٥٠٥٧٥ |
| ١٩٨٧ | ٣٣٠٣٥٦ |
| ١٩٩٦ | ٦٦٩٤٧٢ |
| ٢٠٠٠ | ٧٤٧٧٨١ |
| ٢٠٠١ | ٧٦٨١٤١ |
| ٢٠٠٥ | ٩٨٧٣٥٢ |
| ٢٠٠٨ | ١٠٨٨٣٦١ |
| ٢٠١٠ | ١١٦١٣٧٨ |
| ٢٠١٢ | ١٢٤٠٤٩٤ |
| ٢٠١٤ | ١٣٧٣٢١٤ |
| ٢٠١٥ | ١٤٢٣٠١٩ |

کێمبوونا تێکرایێ گەشەکرنێ دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦-٢٠٠٢)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن بەری هینگێ دبیت بۆ هندێ بزڤریت کو هژمارەکا مەزن یا خەلکی بەرەڤ دەرڤەی وەلاتی مشەختبوون ب تایبەت دسالێن نۆتاندا.

## دووەم: دابەشبوونا ئاکنجییان ل دووڤ یەکەیێن کارگێری:

ژ داتایێن ژمارە (٧) بۆمە دیار دبیت کو رێژەیا هەرە مەزن یا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل هەرسێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ و سێمێلێ خرڤەبووینە کو رێژەیا وان ب ڤی رەنگی یە (٢٦,٧٪، ١٩,٥٪، ١٣,٤٪)ێ ل دووڤ ئێك. ئەڤ چەندە دیاردکەت کو پتر ژ ٦٠٪ێ ژ ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل ڤان هەرسێ قەزایان دژین. لێ رێژەیا دی ل قەزایێن ئامێدی و بەردەرەش و شێخان دژین. هەلبەت ئەڤ نیشاندەرە بۆ هندەك ئەگەران دزڤرن.

هەردیسان ئەڤ خشتەیە دیاردکەت کو رێژەیا رەگەزێ نێر و مێ ژ قەزایەکێ بۆ قەزایەکا دی یا

جودایە ب رەنگەكی كو ئەڤ رێژەیە پتر د بەرژەوەندیا رەگەزێ نێر دایە كو رێژەیا وان دگەهیتە (٥٠,٩٪)ێ ب هەڤبەركرن دگەل رێژەیا رەگەزێ مێ كو ئەوژی ٤٩,١٪ێ یە.

لێ پێكهاتنا بازێری ئاماژەیێ ب هندێ دكەت كو رێژەیا ئاكنجیێن گوندان ل قەزایێن ئاكرێ و بەردەرەش پترە ژ یا ئاكنجیێن ناڤ بازێری و ئەڤەژی بەروڤاژی قەزایێن دی یە كو رێژەیا هەرە مەزن یا ئاكنجیێن وان ل بازێران دژین نەك گوندان.

## سێیەم: پێكهاتنا ژی و جۆری یا ئاكنجیيان:

پێكهاتنا ژی و جۆری یا ئاكنجیيان دهێتە هەژمارتن ئێك ژ فاكتەرێن هەرە گرنگ ژ بۆ دەستنیشانكرنا قەبارەییێ هێزا كاری د ئابووریێ، ئەنجامدانا چالاكیێن ئابووری و پلا زیرەكی و شیانێن كاركرنێ دگەل ژی و جوداهییا دناڤبەرا رەگەزێ نێر و مێ دا دهێنە گوهۆرین.

ژ بەر نەبوونا چ سەرژمێریێن تێروتەسەل ل سەر ئاكنجیێن پارێزگەهێ كو ڤان نیشاندەران بخۆڤە بگریت، لەورا هەژمارتنا پێكهاتنا ژی و جۆری یا ئاكنجیيان پێنگاڤەكا سەرەكی پێكدئینیت ژ بۆ هەژمارتنا جۆرێ كاری. پێكهاتنا گرۆپێن ژی یێن ئاكنجیيان ژهەردو رەگەزێن نێرومێ هاتینە هەژمارتن كو پشت بەستن هاتییەكرن ل سەر وان سەرژمێریێن هاتینەكرن بۆ ئاكنجیيان د ماوەیێ سالێن بووری دا ب تایبەت ل سالێن دووماهیێ ل عیراقێ و هەرێما كوردستانێ.

پشتی ب دووماهیێ هاتنا كریارا هەژمارتنێ، ئەنجام ب وی شێوەی دەركەفتینە یێن د خشتەیێ ژمارە (٨) دا هاتینە دیاركرن و ئەڤ ئەنجامە دیاردكەن كو ل پارێزگەها دهۆكێ ب تنێ هندەك گوهۆرینێن بچویك پەیدابووینە یێن كو پەیوەندی ب گرنگیا رێژەیی هەی یا هەر گرۆپەكێ ژی ل سەر ئاستێ جۆری د ماوەیێ هەردو سالێن ڤەكۆلین تێدا هاتییە

**خشتەیێ (٧)**

**دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠١٥**

| ژ | دەڤەر | ئاكنجی | | ژمارا خێزانان | رەگەز ٪ | | دابەشبوونا گشتی٪ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارە | رێژە | | نێر | مێ | بازێر | گوند |
| ١ | دهۆك | ٣٧٩١٦٦ | ٢٦,٧ | ٥٨٣٨١ | ٥٣,٤ | ٤٦,٦ | ٩٥,٧ | ٤,٣ |
| ٢ | سێمێل | ١٨٩٩٩٩ | ١٣,٤ | ٢٦٥٢٤ | ٥٠,٤ | ٤٩,٦ | ٧٧,٦ | ٢٢,٤ |
| ٣ | زاخۆ | ٢٧٨١٤٠ | ١٩,٥ | ٤٠٢٦٥ | ٥٢,٨٥ | ٤٧,١٥ | ٩٠,٨ | ٩,٢ |
| ٤ | ئامێدیێ | ١١٢٣٠٤ | ٧,٩ | ١٨٤٧٢ | ٤٩,٠٤ | ٥٠,٩٦ | ٦٨,٢ | ٣١,٨ |
| ٥ | شێخان | ١٤٥٨٥٦ | ١٠,٢٥ | ١٨٢٨٧ | ٤٩,٢ | ٥٠,٨ | ٦٢,٠ | ٣٨,٠ |
| ٦ | ئاكرێ | ١٧٨٢٢٧ | ١٢,٥ | ٢٣٧٩١ | ٤٩,٩٥ | ٥٠,٠٥ | ٤٥,٧ | ٥٤,٣ |
| ٧ | بەردەرەش | ١٣٩٣٢٧ | ٩,٨ | ١٧٩٠٥ | ٥١,٤٨ | ٤٨,٥٢ | ٣٥,٠ | ٦٥,٠ |
| سەرجەم و تێكرا | | ١٤٢٣٠١٩ | ١٠٠,٠ | ٢٠٣٦٢٥ | ٥٠,٩ | ٤٩,١ | ٦٨,٠ | ٣٢,٠ |

**ژێدەر: ئەڤ خشتەیە هاتییە ئامادەكرن و رێژە هاتینە دەرئێخستن ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە ل دووڤ وان داتایێن هاتینە وەرگرتن ژ:-**

**- رێكخراوا خوارنا جیهانی**

**- رێڤەبەریا كەرەستێن ئاهێن خوارنێ ل پارێزگەها دهۆكێ**

ئەنجامدان.

ئەم دشێن تێبینییا ڤان ئەنجامان بکەین:

١. پتر ژ ٤٥٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دبن ژیێ ١٤ سالیێ دانە و ئەڤەژی بەشەکێ گرنگە کو مە ژ هێزا کاری ئینانە دەرێ ژ بەرکو دهێنە هەژمارتن کەسێن نەچالاك ژ لایێ ئابووریڤە و ناکەڤنە دبن ژیێ کارکرنێ ڤە. هەروەسا رێژەیا ٥,٨٪ێ ژی کەسێن دانعەمرن یێن ژیێ وان چوویە د سەر ٦٠ سالیێ دا و ئەڤان ژی هێزا کاری نینە، ئانکو ئەم دشێن بێژین نێزیکی ٥٠٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ ئاکنجیێن پارێگەها دهۆکێ ژ دەرڤەی

خشتەیێ (٨)

پەیکەری ژی یێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ

| گرۆپێن ژی | سەرجەمێ گشتی یێ ئاکنجییان | |
|---|---|---|
| | ژمارە | ٪ |
| ٠-٤ | ٢٤٣٣٣٦ | ١٧,١ |
| ٥-٩ | ٢١٧٧٢٢ | ١٥,٣ |
| ١٠-١٤ | ١٨٧٨٣٩ | ١٣,٢ |
| ١٥-١٩ | ١٦٦٤٩٣ | ١١,٧ |
| ٢٠-٢٤ | ١٣٢٣٤١ | ٩,٣ |
| ٢٥-٢٩ | ٨٨٥١٢ | ٦,٢٢ |
| ٣٠-٣٤ | ٨٨٦٥٤ | ٦,٢٣ |
| ٣٥-٣٩ | ٦٥٤٥٩ | ٤,٦ |
| ٤٠-٤٤ | ٤٩٠٩٤ | ٣,٤٥ |
| ٤٥-٤٩ | ٣٩٨٤٤ | ٢,٨ |
| ٥٠-٥٤ | ٢٩٨٨٣ | ٢,١ |
| ٥٥-٥٩ | ٣١٣٠٧ | ٢,٢ |
| پتر ژ ٦٠ | ٨٢٥٣٥ | ٥,٨ |
| گشتی | ١٤٢٣٠١٩ | ١٠٠ |

ژێدەر: ئەڤ خشتەیە هاتییە ئامادەکرن و رێژە هاتینە دەرئێخستن ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل دووڤ وان داتایێن هاتینە وەرگرتن.

هێزا کاری نە.

٢. رێژەیا رەگەزێ نێر ژ یا رەگەزێ مێ پترە د هەردو گرۆپێن ژی یێن (١٥-٣٤) و (٤٥-٤٩)، لێ ل دەڤ گرۆپێن دی ژمارا رەگەزێ مێ پترە.

٣. پەیکەری ژی یێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دیاردکەت کو پتریا ئاکنجیێن پارێزگەهێ دگەنجن و د ژیێ کارکرنێ دانە و ئەڤ چەندە ب شێوەیەکێ گشتی ل هەرێما کوردستانێ هەمیێ وەکی ئێکە هەروەکی گەلەك وەلاتێن دی یێن د قوناغا گەشەکرنێ دا، ئەڤ چەندەژی بوویە ئەگەرێ زێدەبوونا رێژەیا بێکاریێ.

## چوارەم: پەیکەرێ ب کارئینانێ (هێزا کاری):

مەرەم ژڤی تەوەری شرۆڤەکرنا پەیکەرێ هێزا کاری یە ژ گەلەك لایەناڤە ئەوژی ژ پێخەمەت مەرەما سەرەکی ئەوژی راوەستیان ل سەر ئاستێ پێشکەفتنا ئابووری یاکو ئابوورێ کوردستانێ تێدا دژیت ب شێوەیەکێ گشتی و ئابوورێ پارێزگەهێ ب شێوەیەکێ تایبەت. ئەڤ پەیکەرە (ئەم دشێن بێژینێ پەیکەرێ بکارئینان یان پێکئینانا کرێکارێن راستی کاردکەن) ئاستێ بکارئینانێ ل کەرتێن ئابووری دیاردکەت زێدەباری دابەشبوونا کرێکاران ل دووڤ جۆرێن کاری یێن جوداجودا زێدەباری چەندین دابەشبوونێن دی یێن گرنگ کو هەمی پێکڤە هێمایێ دکەنە سەر پلا پێشکەفتنا ئابووری و ئاستێ بەرفەراڕبوونا وێ ب تایبەت دەمێ ئەم هەڤبەردکەین دگەل قەبارەییێ هێزا کاری و تێکراییێن چالاکیێن ئابووری د ئابوورێ دروستدا.

### ئێك، دابەشبوونا کرێکارا ل دووڤ جۆرێ کاری

کرێکار هاتینە دابەشکرن ل دووڤ جۆرێ کاری ب پشت بەستن ل سەر ڤاڤارتنێن ستاندەرد یێن نیڤدەولەتی، هەروەسا دابەشبوونا وان ل سەر پارێزگەهێن عیراق و هەرێمێ یێن جوداجودا ل بەرچاڤ هاتییە وەرگرتن، زێدەباری دابەشکرنا وان ل دووڤ یەکەیێن ئابووری، ئەڤ داتایە د خشتەیێ ژمارە

**خشتەیێ (٩)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا كرێكاران ل دووف جۆرێ كارێن وان د ماوەیێ هەر ١٢ هەیڤێن بۆری دا (٪)**

| | رێڤەبرنا بلند | تایبەتمەند | تەكنیكی | كارێن نڤێسینێ | خزمەتگوزاری و فرۆتن | كرێكارێن چاندنێ | پیشەیی | كاركرنا ئامیران | پیشەیێن دەستپێكی | نەدیار | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ٢,١ | ١٠,٨ | ٢٣,٥ | ٥,٨ | ١٣,٦ | ٦,٤ | ١٧,٣ | ٨,٣ | ٦,٣ | ٥,٩ | ١٠٠,٠ |
| كوردستان | ١,٧ | ١٠,٥ | ١٢,٥ | ٥,٥ | ١٦,٦ | ١١,٣ | ١٩,٥ | ٨,٢ | ٨,٥ | ٥,٧ | ١٠٠,٠ |
| پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ | ٠,٥ | ١٣,٤ | ٦,١ | ٢,٨ | ١٧,٩ | ١٥,٥ | ٢١,٣ | ١٠,٤ | ٩,١ | ٣,٠ | ١٠٠,٠ |
| باژێر | ٠,٥ | ١٤,٧ | ٧,٨ | ٦,٢ | ٢١,٦ | ٣,١ | ٢٤,٩ | ١٣,٦ | ٥,٦ | ٢,٢ | ١٠٠,٠ |
| گوند | ٠,٣ | ٧,٦ | ٥,٧ | ١,٥ | ٩,٢ | ٣٦,٥ | ١٤,٤ | ٨,٦ | ١١,٨ | ٤,٤ | ١٠٠,٠ |
| گشتی | ١,٠٢ | ١١,٤ | ١١,٢ | ٤,٣ | ١٥,٧٨ | ١٤,٥ | ١٩,٥ | ٩,٨ | ٨,٣ | ٤,٢ | ١٠٠,٠ |

(٩) دا هاتینە دیارکرن.

دڤی خشتەیی دا بۆمە دیاردبیت کو کرێکار ل سەر ٢٠ جۆرێن کاری هاتینە دابەشکرن کو دەستپێدکەت ژ کارێن رێڤەبرنا بلند هەتا وان کەسێن پیشەیەکێ دەست تایبەت، هەروەسا دیاردبیت کو پتریا کرێکاران د گرۆپێ کرێکارێن تەکنیکی دا هاتینە دابەشکرن و ل دووڤدا یێن پیشەیی و پاشی کرێکاران خزمەتگوزاری و فرۆتنێ ب رەنگەکی کو پتر ژ ٥٤٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ کرێکاران ل سەر ڤان گرۆپان هاتینە دابەشکرن، دگەل هەبوونا هندەك جوداهییان د گرنگییا رێژەیی دا. رێژەیا ڤان کەسان ل پتریا پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ژی ل سەر هەمان کار هاتینە دابەشکرن ب رەنگەکی کو رێژەیا وان ژ رێژەیێن کوردستانێ گەلەك جودا نینن.

تێبینییەکا دی دهێتە بەرچاڤ ئەوژی هەبوونا جۆرەکێ گونجاندنا رێژەیی د دابەشبوونا کرێکاراندا ل سەر کارێن جوداجودا دناڤبەرا پارێزگەها دهۆکێ و هەرێما کوردستانێ، هەردیسان پارێزگەهـ ب هندێ دهێتە جوداکرن کو کێمترین رێژەیا کرێکارێن وێ دبوارێ چاندنێ دا کاردکەن. هەرچەندە ئەڤ داتایە ب شێوەیەکێ هەرەمەکی هاتینە وەرگرتن کو گریمانا هەبوونا شاشییان تێدا یا هەی لێ ل دەمێ خواندن و شرۆڤەکرنا داتایان ب شێوەیەکێ بابەتی دێ بۆمە دیاربیت کو ئەڤ داتایە دگەل کەتوارێ چالاکیێن ئابووری ل هەرێما کوردستانێ دگونجن.

زێدەباری ڤێ چەندێ، داتایێن ڤی خشتەی بۆمە دیاردکەن کو پتریا کرێکارێن شولی ئەون یێن شێوازەکێ پرۆفیشینال هەی وەك تایبەتمەندان (ئەندازیار، پزیشك و یێن دی) و پیشەیی و تەکنیکی و کرێکارێن کاردکەن ل چالاکیێن خزمەتگوزاری و کرێکارێن کارپێکەرێن ئامیران و و پیشەیێن دەستپێکی، ئەڤ کەسە نێزیکی ٧٦٪ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێن شۆلی ل هەرێما کوردستانێ پێکدئینن.

رێکخستنا گرنگیا رێژەیی یا دابەشبوونا کرێکاران ل دووڤ جۆرێ کارێ پێشینیازا هەبوونا هژمارەکا سیفەتێن تایبەت یێن ئابوورێ ناڤخۆیی دکەت کو ئەم دشێین ب ڤی شێوەی ب دەستڤە بینین:-

١. زالبوونا وان پیشەیان یێن رەنگڤەدانێ ل سەر پاشڤەمایی یا ئابوورێ ناڤخۆیی ل کەرتێ بەرهەم ئینانێ دکەن، ئەو رێژەیێن دڤان بەشێن بەری نهودا ئاماژە پێ هاتییە کرن بەلگەیە ل سەر هندێ کو ئابوورێ عیراقێ پشت بەستنێ دکەتە سەر وان پیشەیان یێن دەربرین ژ لاوازییا کەرتێن بەرهەمئینانێ یێن پێشەنگدا دکەن ب تایبەت کەرتێ پیشەسازیێ، ئەڤە ل دەمەکی کو دیاردبیت رێژەیەکا هەرە مەزن یا هێزا کاری پێکدهێن ژ کەسێن پیشەیی و خزمەتگوزاری کو ل بەرامبەری وان رێژەیا کەسێن تەکنیکی کێم دبیت.

٢. وەك ئەنجامێ دووماهیێ، پەیکەرێ ئابوورێ ناڤخۆیی (ئەو پەیکەرێ هاتییە پیڤان ل دووڤ هەڤبەشییا رێژەیی یا کەرتێن سەرەکی یێن چاندن و پیشەسازی و خزمەتگوزارییان د دروستبوونا بەرهەمێ ناڤخۆیی یێ گشتی) رەنگڤەدانێ ل سەر جۆرێ کرێکارێن هاتینە بکارئینان دڤی ئابووری دا دکەت، پشت بەستن ل سەر کەرتێ پەترۆلێ و کێماسی یێن هەین د کەرتێن بەرهەم ئینانێ یێن دی دا وەك کەرتێ پیشەسازیێ، بەلگەژی ل سەر ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو پتریا پێدڤیێن خەلکی ژ دەرڤە دهێنە هاوردەکرن.

٣. ل دەمەکی کو کەرتێ چاندنێ نەشێت هژمارەکا مەزن یا کرێکاران بدەتە کاری ئەوژی ژ بەر سرۆشتێ کریارا بەرهەم ئینانێ ل ڤی کەرتی ب تایبەت پشتی وان پێشکەفتنێن مەزن یێن دبوارێ چاندنێ دا ژ لایێ دروستکرنا ئامیران پەیدابووین، لەوراژی ئەو رێژەیا هاتییە دەستنیشانکرن بۆ کرێکارێن چاندن و نێچیرێ بەلگەنە ل سەر هندێ کو کەرتێن دیژی پێشکەفتن بخۆڤە نەدیتیە ژ بەرکو وان کەرتان نەشیایە کرێکارێن چاندنێ یێن ماینە بێ کار بۆ خۆ بەن و بدەنە کاری.

## دوو: دابەشبوونا کرێکارا ل دووڤ چالاکیێن ئابووری

دابەشبوونا ڕێژەیی یا کرێکاران ل دووڤ جۆرێ وان کارێن ئەم ئەنجام ددەن رێکەکە بۆ هندێ ئەم پتر پەیکەرێ هێزا کاری یێ ئابوورێ ناڤخۆیی پێ بزانین، ژ بەرکو ئەڤ چەندە دیاردکەت کا چەوا دابەشبوونا ڕێژەیی یا کرێکاران ل کەرتێن ئابووری یێن جوداجودا هاتینە دابەشکرن و ئارمانجا سەرەکی ژ ڤێ چەندێ ئاشنابوونە ل سەر شیانێن کەرتێن ئابووری ل سەر بکارئێخستنا هێزا کاری یا ناڤخۆیی کو ژ لایێ خۆڤە خزمەتا جووداهییا قەبارەییێ ڤان کەرتان دکەت زێدەباری گرنگییا وێ یا ڕێژەیی د ئابوورێ نیشتیمانی دا. ژ بۆ بدەستڤەئینانا ڤێ ئارمانجێ دێ پشت بەستنێ کەینە سەر وان داتایان یێن دخشتەیێ ژمارە (١٠) دا هاتینە دیارکرن.

گرنگترین تشتێ دڤی خشتەی دا ئاماژە پێ هاتیە کرن هەبوونا لێک نێزیکبوونەکێ بوو دناڤبەرا دابەشبوونێ ل سەر کەرتان و دابەشبوونێ ل دووڤ جۆرێ کاری، ڕێژەیا کرێکاران ل کەرتێ چاندنێ ل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ بلندترە ژ پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەهێن دی یێن هەرێما کوردستانێ. ئەگەر ئەم نموونەکێ ل بەرچاڤ وەرگرین ژ بۆ دابەشبوونێن لایەنی یێن خزمەتگوزارییان، هەروەکی د خشتەی دا هاتیە دیارکرن، دێ بۆمە دیاربیت کو ل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ کەرتێ چاندنێ شیایە پترین ژمارا کرێکاران بدەتە کاری.

تێبینیەکا دی ژ هەژی بیرئینانێ ئەوە کو ڕێژەیەکا بلند یا کرێکاران ل کەرتێ ئاڤاکرنێ کاردکەن ئەڤەژی

**خشتەیێ ١٠**

**دابەشبوونا ڕێژەیی یا تاکەکەسان ل دووڤ چالاکی و جۆرێ کارێ وی دماوەیێ ١٢ هەیڤێن بۆری دا (٪)**

| | دابەشبوونا کارگێری و ژینگەهێ | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | دهۆک | کوردستان | پارێزگەهێن دی | باژێر | گوند | گشتی |
| چاندن و نێچیرکرن | ٦,٩ | ١٢,٨ | ٢٠,٣ | ٤,١ | ٤٦,٩ | ١٥,٥ |
| کانزاکرن و بەردکرن | ٠,٤ | ٠,٥ | ١,٥ | ١,٤ | ٠,٦ | ١,٢ |
| پیشەسازیێن گوهارتنێ | ٢,٤ | ٤,٨ | ٧,١ | ٧,٢ | ٣,١ | ٧,٥ |
| کارەب و پەترۆل | ١,٢ | ١,٢ | ١,٧ | ٢,١ | ٠,٩ | ١,٨ |
| ئاڤاکرن | ١١,٥ | ١١,٠ | ١٢,٢ | ١٣,٨ | ١٠,٨ | ١١,٣ |
| بازرگانی/ تاك و کو | ٧,٣ | ١٤,٣ | ١٤,٦ | ١٧,٣ | ٥,٧ | ١٥,٦ |
| خوارنگەهـ و ئۆتێل | ١,٨ | ١,٩ | ١,١ | ٢,٢ | ٠,٤ | ١,٥ |
| ڤەگوهاستن و پەیوەندی | ٦,٤ | ٧,٢ | ٨,٧ | ١٣,١ | ٧,٢ | ١٠,١ |
| چالاکیێن خانوبەران و پارەگوهۆزان | ١٠,٥ | ٥,١ | ٤,١ | ٤,٨ | ٢,٢ | ٤,٤ |
| کارگێڕیا گشتی | ٢٤,٠ | ١٣,٤ | ٨,٩ | ٩,٨ | ٨,٧ | ٩,٤ |
| فێرکرن | ٧,٨ | ٧,١ | ٨,٨ | ١١,٣ | ٤,٢ | ٨,٤ |
| ساخلەمی و کارێن جڤاکی | ١,٦ | ١,٩ | ٢,٧ | ٢,٦ | ١,٧ | ٢,٧ |
| خزمەتێن دی | ٧,٩ | ١١,٦ | ٤,٨ | ٧,٤ | ٣,٠ | ٧,٢ |
| نەدیارکری | ١٠,٣ | ٧,٢ | ٣,٥ | ٢,٩ | ٤,٦ | ٣,٤ |
| سەرجەم | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ |

رەنگڤەدانێ ل سەر وێ بزاڤا ئاڤەدانێ دکەت یا هەرێما کوردستانێ ب گشتی و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی بخۆڤەگرتی. ل دەمەکی کو رێژەیا کرێکاران ئەوێن ژ گوندان یان دەوروبەری ناڤەندێن باژێران دهێن پتر بوو ژ هژمارا وان کەسێن ژ ناڤ باژێری ب خۆ ڤان کاران دکەن، ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو بزاڤا ئاڤەدانیێ ل ناڤەندێن باژێری بلەزترە بەلکو دبیت ژ بەر هندێ بیت کو دەلیڤا کاری ل گوندان یا کێمە لەورا کرێکار نەچاردبن بهێنە دناڤ ناڤەندێن باژێراندا و کاربکەن کو ل ڤان سالێن دووماهیێ ب تایبەت بشتی کەفتنا رژێما دکتاتوری پێشکەفتنەکا باش بخۆڤە دیدهێتە.

دبیت گرنگترین تشتێ د خشتەی دا ئاماژە پێ هاتیە کرن ئەوە کو کەرتێ پیشەسازیێن گوهارتنێ شیایە کێمترین هێزا کاری ل دەڤ خۆ بدەتە کاری، رێژەیا کرێکارێن ل ڤی کەرتی کاردکەن نێزیکی سێیکا رێژەیا کرێکارێن کەرتێ چاندنێ یە ل هەمی پارێزگەهێن هەرێمێ و پارێزگەها دهۆکێ، هەلبەت ئەڤ چەندەژی بەلگەیەکێ ب هێزە ل سەر پاشکەفتنا ڤی کەرتی کو پەیوەندیەکا راستەوخۆ و نەراستەوخۆ یا هەی د پێشکەفتنا ئابووری دا. ل دووڤ سرۆشتێ کاری ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هژمارەکا فاکتەران دزڤریت کو ل ل دەستپێکا وانژی ئەو سالێن درێژبوون یێن عیراق کەفتیە ژێر دووریێچا ئابووری، زێدەباری وان سالێن درێژ یێن حکومەتا عیراقێ یا بەرێ شەر دگەل هەرێمێ دکرین و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئەڤ کەرتە پاشڤە بمینیت و فرۆشتنا گازێ بۆ مەرەمێن ئاڤاکرن و گەشەکرنێ نەهاتیە بکارئینان، هەروەسا پشت بەستنا کارگەهێن پیشەسازی یێن عیراقێ ل سەر وان ئامیر و کەرەستەیان یێن ژ دەرڤەی وەلاتی د هاتن فاکتەرەکێ دی بوون ژ بەرکو پشتی سەپاندنا دووریێچا ئابووری و سالێن شەری ئێدی ب زەحمەت ئەڤ ئامیرە دگەهشتنە عیراقێ.

ئەگەرێ سەرەکی بوویە رێگر د پێشکەفتنا ڤی کەرتی دا بۆ هندێ دزڤریت کو چ سیاسەتێن ئابووری یێن چالاك نەبوون ژ بۆ دابینکرنا گەشەکێ گونجایی ژ بۆ تایبەتمەندیکرن وهاندانا وەبەرهێنەران داکو بەرێ خۆ بدەنە ڤی کەرتی. ژ لایەکێ دیڤە ئەو سیاسەتێن ژ لایێ وەلاتێن جیرانڤە دهێنە پەیرەوکرن کو بووینە ئەگەر بازارێن ناڤخۆیی ژ بەرهەمێن خۆ پربکەن و بێی هەبوونا سیاسەتەکا دارایی کو ل هەمبەری وان راوەستیت. ژ بەر ڤێ چەندێ دەلیڤەیا قازانجبوونێ نامینیت و ب ڤی رەنگی وەبەرهێنەر ژی بەرێ خۆ ژ ڤی کەرتی ددەنە پاش. هەردیسان گەلەك جاران دێ هندەك بەرهەمێن ب کوالیتییەکا نەباش ژ هندەك کارگەهێن نەباش هێنە هاوردەکرن بێی هەبوونا کونترۆلا جۆری ل سەر ڤان بەرهەمان یان هەر رێکەکا دی کو دژی ڤێ چەندێ ب راوەستیت زێدەباری نەبوونا چ پیشەسازیێن نیشتیمانی کو هەڤرکییا بەرهەمێن دەرەکی بکەت.

ژ لایەکێ دیڤە ئەم دشێین تێبینیا لێکنێزیکبوونەکێ ل سەر شێوازێ دابەشبوونا کرێکاران ل سەر کەرتێن دی بکەین دناڤبەرا پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەهێن دی یێن هەرێمێ و عیراقێ ژ بلی وان کاران نەبیت یێن نەهاتیە دابەشکرن یان جوداکرن وەك خزمەتگوزاریێن دی و کارێن نەدیارکری.

ئەگەر ئەم تەماشەی دابەشبوونا کرێکاران ل سەر ئاستێ عیراقێ ب گشتی بکەین دێ بینین کو هەردو کەرتێن چاندنێ و بازرگانی یا تاك و کو شیاینە پترین رێژەیا کرێکاران ل دەڤ خۆ بدەنە کاری ل دەمەکی کو رێژەیا کرێکارێن ل کەرتێ پیشەسازی ژ نیڤ رێژەیا ڤان هەردو کەرتان کێمترە، ئەڤ چەندەژی سیفەتا ئابوورێ وەلاتێن ژ نوی گەشەدکەن یان وەلاتێن پاشکەفتی دیاردکەت ژ بەرکو ئەڤ ئابوورە دبنە ئەگەرێ زێدەبوونا رێژەیا کرێکاران ل کەرتێ چاندنێ ل سەر حسێبا کەرتێ پیشەسازی.

هەردیسان ئەگەر ئەم تەماشەی دابەشبوونا رێژەیی یا کرێکاران ل سەر ئاستێ گرۆپێن بۆ کەرتێن ئابووری (چاندن و پیشەسازی و خزمەتگوزاری) بکەین، دێ بۆمە دیاردبیت کو کەرتێ پیشەسازی شیایە

نێزیکی ١٥,٥٪ێ ژ هێزا کاری ژ سەرجەمێ گشتی یێ هێزا کاری ل پارێزگەهێ و رێژا ١٧,٥٪ێ ل سەر ئاستێ هەرێمێ بمەزێخیت، ئەڤ چەندەژی دزڤریت بۆ کێمبوونا رێژەیا کرێکاران ل کەرتێ پیشەسازی ل هەرێمێ ئەوا کو بۆ چەندین سالان تووشی هەوێن خرابکرن و ژ ناڤچوونا ئابووری بووی زێدەباری بۆ وان سیاسەتان یێن نەبووینە ئەگەرێ دانانا چ بنەمایێن پیشەسازی یێن چالاك. ئەڤ چەندە حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ نەچارکەت کو دوبارە چاڤخشاندنەکێ د ڤان سیاسەتاندا بکەت ژ پێخەمەت هاندان و پشتەڤانیکرنا وەبەرهێنەران داکو بەرێ خۆ بدەنە ڤی کەرتی ئەوژی ب رێکا گونجاندنا کەشوهەوایەکێ گونجای بۆ وەبەرهێنەرێن ناڤخۆیی و دەرەکی.

سەرەرای هەبوونا رووبەرێن بەرفرەهـ یێن ب کێرهاتی بۆ کەرتێ چاندنێ، لێ کارکرنا خەلکی ل کەرتێ خزمەتگوزاریان ل سەر حسابا کەرتێ چاندنێ هاتییە، زێدەباری هاوردەکرنا بەرهەمێن چاندنێ یێن ئەرزان بووینە ئەگەر بەرهەمێ ناڤخۆیی پێش نەکەڤیت.

## تەوەرێ سیێ:

## کەتوارێ چالاکیێن وەبەرهێنانێ

### ١. وەبەرهێنانا حکۆمی:

هەرچەندە یا ب زەحمەتە ئەم بشێین وی کوژمێ پارەی یێ هاتییە تەرخانکرن ل سەر پرۆژەیێن گەشەکرنێ ژ لایێ حکۆمەتێ ڤە لەورا ئەم دێ پشت بەستنێ کەینە سەر کوژمێن هاتینە تەرخانکرن ژ بەرنامێ گەشەپێدانا هەرێمان.

**خشتەیێ (١١)**

**سەرجەمێ گشتی یێ پارەیێ هاتییە مەزاختن بۆ پرۆژەیان ژ میزانییا گەشەپێدانا هەرێمان دناڤبەرا سالێن ٢٠٠٦-٢٠١١**

| ز | وەزارەت یان کەرت | ژمارە | ٪ | کوژمە د.ع | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | بازرڤانی و گەشتوگوزار | ٧٤٦ | ٢٠,٣ | ٢٠٠٦١٨٨٣٤٣٣٣ | ٢٩,٣ |
| ٢ | چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ | ١٠٢٤ | ٢٤,٥ | ١٢٧٠٧٢٣٨٠٦٠٨ | ١٤,٠ |
| ٣ | ئاڤەدانکرن و کارپێکرن و ئاکنجیبوون و ڤەکرنا رێکان | ١٢١٧ | ١٥,٠ | ٣٥٧٠٨٢٣٩١٦٠٨ | ٢٥,٥ |
| ٤ | کارەب | ٢٧٨ | ١١,٢ | ٣٩٥٦٧١٤٦٢٦٨ | ٥,٤ |
| ٥ | پەروەردە | ١٣٨ | ٥,١ | ٦١٦٦٣٥٠١٢٠١ | ٦,٤ |
| ٦ | ساخلەمی | ٧٠ | ١,٧ | ٣٧٦٤٩٦٦٩٨١٦ | ٣,٣ |
| ٧ | بازرگانی و پیشەسازی | ٣ | ٠,٢ | ١٢٨٢٨٩٣٧٣٧ | ٠,٢ |
| ٨ | خواندنا بلند | ٣ | ٠,٢ | ١١٨٦٠٧٤٢٧٥٠ | ٢,٠ |
| ٩ | رەوشەنبیری و لاوان | ٤٥ | ١,١ | ٣٦٤٩٤٦٠٥١٠٦ | ٣,١ |
| ١٠ | ئەوقاف و کاروبارێن ئایینی | ٥٨ | ٣,٠ | ٣٨٦١٤٩٢٢٥٢ | ٠,٦ |
| ١١ | کار و کاروبارێن کۆمەلایەتی | ٤ | ٠,٢ | ٩٠٧٢٩٤١٩٠ | ٠,٢ |
| ١٢ | کارگێرییا ناڤخۆیی (دیوانا پارێزگەهێ) | ٦٩ | ٣,٦ | ٥٠٧٦٩٥٧١٩٦٥ | ٨,٤ |
| ١٣ | سەنتەرێ پەرەپێدان و گەشەپێدانێ (دیوانا پارێزگەهێ) | ٢٧ | ١,٤ | ٩٨١٧٦٩١٥٠٠ | ١,٦ |
| ١٤ | سەرجەم | ٣٦٨٢ | ١٠٠,٠ | ١٠٦١٢٧٩٥٨٨٢٩٥ | ١٠٠,٠ |

## ٢. وەبەرهێنانا تایبەت:

پشتی دەركەفتنا یاسایا وەبەرهێنانێ ل هەرێما كوردستانێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ، چالاكیێن وەبەرهێنانێ ئاسویەكێ نوی بخۆڤە دیت ئەوژی پشتی كو هاندانا وەبەرهێنەرێن ناڤخۆیی و بیانی هاتییەكرن كو مفای ژ وان دەلیڤەیێن وەبەرهێنانێ ببینن یێن ژ لایێ یاسایێ ڤە چەندین ئاسانكاری بۆ هاتینەكرن. ل دووڤ وان داتایێن بەردەست یێن دەستەیا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل هەرێما كوردستانا عیراقێ د خشتەیێ ژمارە (١٢) هاتینە دیاركرن بۆمە دیاردبیت كو هژمارەكا پرۆژەیێن وەبەرهێنانێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٧-٢٠١٥)ێ هاتییە بجهئینان.

ژ داتایێن ڤی خشتەی بۆمە دیاردبیت كو رێڤەبەریا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل پارێزگەها دهۆكێ د ماوەیێ سالێن بووری دا دەستویری دایە ٢٠١ پرۆژەیێن وەبەرهێنانێ، ژ وان ژی پتر ژ ٦٠٪ێ ئەوبوون یێن دەستویری ل سالێن (٢٠١١- ٢٠١٤)ێ دا وەرگرتین و سەرمایێ گشتی یێ ل ڤان پرۆژەیان هاتییە مەزاختن نێزیكی (٥,٩٤٢) ملیار دولارێن ئەمریكی بوون و نێزیكی ٢٠ ملیون مەترێن جودا یێن رووبەرێ عەردی بۆ هاتییە تەرخانكرن.ئەڤ پرۆژەیە ل سەر هندەك چالاكییان هاتینە دابەشكرن و د خشتەیێ ژمارە (١٣) دا هاتینە دیاركرن.

ژ داتایێن خشتەی بۆمە دیاردبیت كو پرۆژەیێن پیشەسازی و خزمەتگوزاری و پرۆژەیێن ئاكنجیكرنێ دا هژمارا وان ژ هەمییان پترن، ل سەر ئاستێ چالاكیێن ئابووری دیاردبیت كو هەردو كەرتێن ئاكنجیكرن و پیشەسازیێ بەهرا شێری وەرگرتینە ژ كوژمێ سەرمایێ هاتییە تەرخانكرن ل پارێزگەهێ ب رەنگەكی كو نێزیكی ٧١,٠٪ێ ژ سەرجەمێ كوژمێ گشتی یێ سەرمایەی هاتییە تەرخانكرن ئەوژی ل دووڤ وان دەستویریێن هاتینە دان ژ لایێ دەستەیا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل هەرێمێ بۆ ڤان كەرتان. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت كو پێدڤییا ناڤخۆیی بۆ ڤان كەرتان زێدەبووینە زێدەباری وی قازانجێ مەزن یێ ژڤان كەرتان دهێت دگەل كێمبوونا پلا مەترسیێ ب تایبەت د كەرتێ ئاكنجیكرنێ دا. هەردیسان زێدەبوونا داهاتێ هەیڤانەیێ تاكەكەسان

**خشتەیێ (١٢)**

**پرۆژەیێن وەبەرهێنانێ یێن هاتییە بجهئینان ل پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا سالێن ٢٠٠٧-٢٠١٥**

| سال | ژمارا پرۆژەیان | رێژە ٪ | سەرمایە $ | رێژە٪ | رووبەر م٢ | رێژە٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٧ | ٣ | ١,٤٩ | ٦٧٧٨٨٤٦٢ | ١,١٤ | ٣٧٥٥٩ | ٠,١٨ |
| ٢٠٠٨ | ١٠ | ٤,٩٨ | ٢٩٨١٠٠٢٢٥ | ٥,٠٢ | ١٣٧١٣١٣ | ٦,٧٠ |
| ٢٠٠٩ | ١٤ | ٦,٩٧ | ٢٩٥٨٦٦٠٩٢ | ٤,٩٨ | ٢٠٦٣٥٢٣ | ١٠,٠٨ |
| ٢٠١٠ | ١٧ | ٨,٤٦ | ٨٥٣٤٦٢٠١٦ | ١٤,٣٦ | ٦٢٥٥٣٨٨ | ٣٠,٥٨ |
| ٢٠١١ | ٢٦ | ١٢,٩٤ | ٥٢٤٢٠٥٩٣٢ | ٨,٨٢ | ٢١٥١٦٥٥ | ١٠,٥١ |
| ٢٠١٢ | ٤٧ | ٢٣,٣٨ | ٩٨٥٣٦٣٩٣٢ | ١٦,٥٨ | ٣٨٣٥٥٢٢ | ١٨,٧٤ |
| ٢٠١٣ | ٣٦ | ١٧,٩١ | ١٦٨٨١٠٢٩٧٢ | ٢٨,٤١ | ١٩٦٠٢٢٨ | ٩,٥٨ |
| ٢٠١٤ | ٣٨ | ١٨,٩١ | ٣٤٣٦٩٤٠٦٦ | ٥,٧٨ | ٢٠٦٧٠٣٢ | ١٠,١٠ |
| ٢٠١٥ | ١٠ | ٤,٩٨ | ٨٨٥٦٤٥٠٤٦ | ١٤,٩٠ | ٧٢٩٣٣١ | ٣,٥٦ |
| سەرجەم | ٢٠١ | ١٠٠,٠ | ٥٩٤٢٢٢٧٨٦٣ | ١٠٠,٠ | ٢٠٤٧١٥٥٣ | ١٠٠,٠ |

ژێدەر: رێڤەبەریا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل پارێزگەها دهۆكێ، ٢٠١٦.

خشتەیێ (١٣)
هژمارا پرۆژەیێن وەبەرهێنانێ ل دووڤ کەرتێن ئابووری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن (٢٠٠٧-٢٠١٥)

| کەرت | هـژمـارا پرۆژەیان | رێژە ٪ | سەرمایە $ | رێژە٪ | رووبەر م٢ | رێژە٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاکنجیکرن | ٣٨ | ١٨,٩١ | ٢١٣٨٩٦٤٠٣٦ | ٣٦,٠٠ | ٧٦٨٠٢٩٥ | ٣٧,٥٢ |
| بازرگانی | ٢٨ | ١٣,٩٣ | ٣٨٥٧٥٩٨٩٣ | ٦,٤٩ | ٩٦٦٨٤٣ | ٤,٧٢ |
| ساخلەمی | ٩ | ٤,٤٨ | ٤٨٣٤٤١٩٨ | ٠,٨١ | ٢٦٩٧٣ | ٠,١٣ |
| پیشەسازی | ٥٨ | ٢٨,٨٦ | ٢٠٩٨٩٣١٧٣٦ | ٣٥,٣٢ | ٦٤١٣٨٩٢ | ٣١,٣٣ |
| گەشتیاری | ٤٢ | ٢٠,٩٠ | ٧١٩٩٤٩٠١٩ | ١٢,١٢ | ٣١٦٠٨٨٢ | ١٥,٤٤ |
| فێرکرن | ٨ | ٣,٩٨ | ٤٣٠٨٤٦٧١ | ٠,٧٣ | ٨٣٩٣١ | ٠,٤١ |
| چاندن | ٨ | ٣,٩٨ | ٤٤٢١٤٢٩٧٢ | ٧,٤٤ | ١٨٤٢٨١٨ | ٩,٠٠ |
| وەرزشی | ١٠ | ٤,٩٨ | ٦٥٠٥١٣٣٨ | ١,٠٩ | ٢٩٥٩٢٠ | ١,٤٥ |
| سەرجەم | ٢٠١ | ١٠٠,٠ | ٥٩٤٢٢٢٧٨٦٣ | ١٠٠,٠ | ٢٠٤٧١٥٥٣ | ١٠٠,٠ |

ژێدەر، ئەڤ خشتە هاتیە ئامادەکرن ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل دووڤ وان داتایێن هاتینە پێشکێکرن ژ لایێ دەستەیا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل هەرێما کوردستانا عیراقێ.

و خێزانان ب شێوەیەکێ بەرچاڤ پشتی سالا (٢٠٠٤) ێ بوویە ئەگەر فشارەکا مەزن ل سەر ژێکڤەبوونا خێزانان و جودابوونێ پەیدابیت و ئەڤ چەندەژی پێدڤێ ب ئاڤاکرنا یەکەیێن ئاکنجیکرنێ یێن نوی هەبوو. ل دووڤدا هەر ئێك ژ کەرتێن پیشەسازی و چالاکیێن بازرگانی و گەشتیاری ل دووڤ ئێکدا دهێن و رێژەیا مای کو دبیتە نێزیکی ١٣٪ێ بۆ کەرتێن پیشەسازی و فێرکرن و وەرزشێ دمینن. ئەگەر ئەم ڤان پرۆژەیان ل دووڤ کەرتێن سەرەکی دابەش بکەین دێ بینین کو بەهرا خزمەتگوزاریان نێزیکی بەهرا ئاکنجیکرن یە و ل دووڤدا بەهرا پیشەسازیێ دهێت و ل دووماهیێ ژی رێژەیەکا نزم بۆ کەرتێ چاندنێ هاتیە تەرخانکرن.

زێدەباری ئەڤا بەری نهو، ل دووڤ وان داتایێن هاتینە بەلاڤکرن ژ لایێ رێڤەبەریا گشتی یا وەبەرهێنانێ ل پارێزگەها دهۆکێ دیاردبیت کو ژ سەرجەمێ ٢٠١ پرۆژەیێن دەستویردای، ب تنێ ١٠ پرۆژە یێن بیانی نە و ٨ پرۆژە یێن هەڤپشکن و ١٨٣ پرۆژەیێن ناڤخۆیی بوون.

## تەوەرێ چوارێ: کەرتێ بازرگانی

ڤی کەرتی پێشکەفتنەکا مەزن بخۆڤەدیتیە ب تایبەت دگەل دەرکەفتنا کەرتێ تایبەت د ڤی بواری دا و ڤەکێشانا کارگێرێن حکۆمی پشتی سەرهلدانێ، ب ڤی رەنگی بزاڤا بازرگانی بوو چالاکیا سەرەکی یا ئابووریێ هەرێما کوردستانێ ئەوژی ژ بەر جهێ وێ یێ جوگرافی یێ گرنگ کو دکەڤیتە سەر سنوورێن نێڤدەولەتی دگەل و ترکیا و ئیران و سوریێ زێدەباری بەشێن دی یێن عیراقێ، ئەڤ کەرتە شیا تا رادەیەکی بودجەیا گشتی یا هەرێمێ بەرەڤ باشیێ ببەت ئەوژی ب رێکا وەرگرتنا باجێن گومرکێ ب رەنگەکی کو تێکراییێ گرنگیا رێژەیێ یا ڤان باجان پتربوو ژ ٨٠٪ هەتا ٩٠٪ێ ل هندەك سالان ژ داهاتێن هەرێمێ (بەری سالا ٢٠٠٣)ێ. ژ لایەکێ دیڤە ڤێ چەندێ ب شێوەیەکێ نەرێنی کارتێکرن ل سەر هەستیاریا

داهاتێن هەرێمێ ب پەیوەندیێن دەرەکی کر. هەروەسا کۆمپانیێن بازرگانی ل هەرێمێ رۆلەکێ بەرچاڤ د دروستکرنا سەرمایەکێ باش دا و دابینکرنا دەلیڤەیێن کاری و دابینکرنا کەلوپەلێن جۆراوجۆر بۆ خەلکی هەبوو.

## یەکەم: زێدەبوونا هژمارا کۆمپانییان:

هەرێمێ پێشکەفتنەکا باش د بوارێ زێدەبوونا هژمارا کۆمپانیێن بازرگانی دا بخوڤە دیتیە د ماوەیێ سالێن نۆتاندا، د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٩٤-١٩٩٨)ێ هژمارا کۆمپانیێن بازرگانی ل هەرێمێ ژ ١٥١ کۆمپانیان نەدبووری لێ سەرژمێریەکا نوی کو هاتیە بەلاڤکرن ژ لایێ رێڤەبەریا کۆمپانییان ل پارێزگەهێ دیاردکەت کو هەتا نهو ٢٩٣ تایێن کۆمپانیێن بیانی ل پارێزگەهێ هاتینە توومارکرن، زێدەباری هەبوونا ٣٠٥ کۆمپانیێن ناڤخۆیی و ب ڤی رەنگی سەرجەمێ وان دبیتە ٣٣٤٧ کۆمپانی. ئەڤ چەندەژی هێمایێ دکەتە سەر هندێ کو پارێزگەها دهۆکێ خودان هندەك کاودانێن وەبەرهێنانێ یێن هەرەباشە کو کۆمپانیێن جیهانی و عەرەبی و بیانی هاندەت هەڤرکیێ بکەن ل سەر بدەستڤەئینانا دەلیڤەیێن وەبەرهێنانێ ل پارێزگەهێ، هەلەبت ئەڤ چەندەژی بۆ هەبوونا وێ یاسایێ دزڤریت یا مافێن وەبەرهێنەران دپارێزیت.

## دووەم: بازرگانیا هەرێمێ یا دەرەکی:

ئەم نەشێن بازرگانیا دەرەکی یا پارێزگەهێ ژ بازرگانیا گشتی یا هەرێمێ جودابکەین ژ بەرکو ئەڤ بازرگانیە ب تنێ دگەل سێ وەلاتێن بیانی دهێتە کرن یێن کو نێزیکی ٩٠٪ێ ژ بەرهەمێن هاوردەیێن ل بازارێن کوردستانێ پێکدئینن. ل رێزا ئێکێ بازرگانیا باکووری کو دگەل وەلاتێ ترکیایە و هەرێما کوردستانێ ب شێوەیەکێ گشتی و پارێزگەها دهۆکێ پشت بەستنێ دکەتە سەر ڤی وەلاتی کو نێزیکی ٣٥٪ێ ژ پێدڤیێن بازاری پێکدئینن و رێژەیا پارێزگەها دهۆکێ ب تنێ ژ ڤێ رێژەیێ دگەهیتە نێزیکی ٨٠،٠٪ێ، ل دووڤدا ل رێزا دووێ بازرگانیا رۆژهەلاتی دگەل وەلاتێ ئیرانێ دهێت ب رێژەیا ٢٥٪ێ و ئەڤ رێژەیا مای ژی دگەل وەلاتێ چینێ نە کو دبیتە نێزیکی ٣٠٪ێ کو رۆژ بۆ رۆژێ ئەڤ بازرگانییە پتر جهێ خۆ دکەت و کەلوپەلێن وێ هەڤرکیا کەلوپەلێن دی یێن بازاری دکەت ئەوژی ب رێکا ڤەکرنا سەدەها جهێن بازرگانی یێن کەلوپەلێن چینی دفرۆشن.

سەرژمێری دیاردکەن کو قەبارەیێ ئالۆگوریا بازرگانی دناڤبەرا عیراقێ و ترکیا دا ل سالا (٢٠١٣)ێ گەهشتە ١٢ بلیون دولارێن ئەمریکی کو نێزیکی ٧٠٪ێ دگەل هەرێما کوردستانێ بوو و ئەڤ کەلوپەلە ب رێکا گومرکێن سنووری یێن پارێزگەها دهۆکێ را هاتبوون ب تایبەت گومرکا ئیبراهیم خەلیل. ل دووڤدا وەلاتێ ترکیا بزاڤکرن ڤی قەبارەیێ ل سالا (٢٠١٤)ێ بگەهینتە ١٥ بلیون دولاران کو ئەڤەژی ئەو ژمارەیە یا وەلاتێ ئیرانێ ژی بزاڤێ دکەت قەبارەیێ ئالۆگوریا بازرگانیا خۆ دگەل عیراقێ بگەهینتێ ژ بەرکو ژێدەر دیاردکەن کو قەبارەیێ ئالۆگوریا بازرگانی دناڤبەرا عیراق و ئیرانێ ژی هەتا دووماهیێیا سالا بووری گەهشتبوو ١٢ بلیون دولاران و نیڤەکا وێ دگەل هەرێما کوردستانێ بوو.

زێدەباری هەردو وەلاتێن ترکیا و ئیرانێ یێن کو مل ب ملێ هەبوونا خۆ یا ئابووری ل هەرێما کوردستانێ هەبوونا خۆ یا سیاسی ژی ل هەرێمێ هەیە، وەلاتێ چینێ رۆژ بۆ رۆژێ بەرهەمێن خۆ فرێدکەتە بازارێن کوردستانێ کو ئەڤرۆکە شیایە بازارێن مە ب بەرهەمێن خۆ یێن نەباش پڕبکەت ژ بەرکو ئەڤ بەرهەمە گەلەك دئەرزانن و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو بازرگانێن کوردستانێ قەستا ڤی وەلاتی کرییە داکو هندەك بەرهەمێن کوپیکری کو دگەل ژینگەها کوردستانێ بگونجن بینە دناڤ بازاری دا و سالانە قەبارەیێ ئالۆگوریا بازرگانی دگەل ڤی وەلاتی ژی گەهشتییە چوار بلیون دولاران.

لێ هەرێما کوردستانێ ب تنێ بەرهەمێ پەترۆلێ فرێدکەتە دەرڤەی وەلاتی کو ل ڤێ دووماهیێ دەست ب هنارتنا وێ کرییە ب رێکا بەندەرێ جیهان ل وەلاتێ

تركیا و ل دەستپێكا ئەڤ سالە شیا رۆژانە (٥٠٠) هزار بەرمیلان بهنێریت و هەتا كو ئاستێ وێ گەهاندیە (٦٠٠) هزار بەرمیلێن رۆژانە و دگەل هیڤیێن وێ چەندێ كو ئەڤ ژمارە ل پاشەرۆژێ بلندتر لێ بهێت ئەوژی پشتی هەرێما كوردستانێ پتر گرنگیێ ددەتە پیشەسازیا پەترۆلێ.

## سێیەم: دەرگەهێن سنووری و فرۆكخانە:

پارێزگەها دهۆكێ ب گرنگترین دەرگەهێ سنووری یێ هشكاتییێ هەرێمێ و عیراقێ ڤە دهێتە گرێدان ئەوژی سنوورێ ئیراهیم خەلیلە كو وەلاتێ عیراق و هەرێما كوردستانێ ب وەلاتێ تركیاڤە گرێددەت و ژ لایێ دیرۆكیڤە ژی هاتییە پشتراستكرن كو ئەڤ دەرگەهە قەرەبالغترین دەرگەهێ سنووری یێ بازرگانی و گەشتێن ب رێكا هشكاتی بوویە، ژ بلی ڤی دەرگەهی هندەك دەرگەهێن دیژی هەنە لێ گرنگیا وان گەلەك یا كێمە و ب تنێ بۆ مەرەمێن گەشتكرنێ دهێنە بكارئینان. هەردیسان نە ل هەرێما كوردستانێ و نە پارێزگەها دهۆكێ ژ سنوورێن ئاڤی نینن لەورا بارزگانی یا ب ڤێ رێكێ ل هەرێمێ نینە، ژ لایەكێ دیڤە فرۆكخانەیا دهۆكێ (كو نهو یا د قوناغا دروستكرنێ دا) ل پاشەرۆژێ دێ هێزەكا دی یا ئابووری دەتە پارێزگەها دهۆكێ.

## تەوەرێ پێنجێ: كەرتێ پەترۆلێ ل هەرێمێ

ل هەرێما كوردستانێ دو یاسایێن سەرەكی یێن تایبەت د بوارێ پەترۆلێ دا یێن هەین كو شیایەنە پەیكەرێ گشتی یێ ب كارگێریا سامانێ پەترۆلێ ل هەرێمێ رێكبێخیت، ئەوژی یاسایا وەزارەتا سامانێن سرۆشتی و یاسایا پەترۆل و گازێ یە ب رەنگەكی ڤان یاسایان میكانیزما ب رێڤەبرنا سێ فایلێن پەترۆلێ دەستنیشانكرینە ئەوژی ئەڤەنە:

- ب رێڤەبرنا سامانێ پەترۆلێ ل هەرێمێ ئەوژی ب رێكا پێكئینانا كۆمپانیێن پەترۆلێ یێن گشتی.
- برێڤەبرنا داهاتێن پەترۆلێ ئەوژی ب رێكا پێكئینانا سندۆقا داهاتێن پەترۆلێ.
- كاروبارێن وەزارەتێ و پەیوەندیا وان دگەل پێكهاتەیێن پەترۆلی یێن جۆراوجۆر.

یاسایا پەترۆل و گازێ ل هەرێمێ دهێتە هەژمارتن ئێك ژ دیارترین یاسایێن تایبەت ل هەرێما كوردستانێ ژ بەركو شیایە هەر تشتێ پەیوەندی ب پەترۆلێ ڤە هەی رێكبێخیت هەر ژ ب رێڤەبرنا سامانێ پەترۆلێ ب رێكا دروستكرنا كۆمپانیێن سەرەكی یێن پەترۆلێ و ل دووڤدا قوناغێن جوداجودا یێن پیشەسازیا پەترۆلێ وەك قوناغێن ئاشكەراكرن و بەرهەم ئینان و ڤەگوهاستنا وێ، زێدەباری میكانیزما ب رێڤەبرنا داهاتێن پەترۆلێ ئەوژی ب رێكا دروستكرنا سندۆقا كوردستان یا داهاتێ پەترۆلێ زێدەباری رۆل و دەستهەلات و ئەركێن وەزارەتا سامانێن سرۆشتی و پەیوەندیا وان دگەل كۆمپانیێن پەترۆلێ. ژ بۆ ب رێڤەبرنا كاروباران و ل دووڤ یاسایێن پەترۆلێ ل هەرێما كوردستانێ، هژمارەكا كۆمپانیێن پەترۆلێ یێن گشتی هاتینە دامەزراندن و ئەركێ وان ب رێڤەبرنا كاروبارێن پەترۆلێ یە ل هەرێمێ، ئەڤ كۆمپانییە خودان تایبەتمەندیێن مەعنەوی نە و ژ لایێ دارایی و كارگێریڤە د سەربەخۆنە كو دهێنە ب رێڤەبرن ژ لایێ سەرۆك و ئەنجومەنەكێ كارگێری یێ تایبەتمەند كو ژ لایێ جڤاتا وەزیرانڤە هاتینە دامەزراندن و پتریا ئەندامێن پەرلەمانی دەنگ ل سەر دایە.

## یەكەم: بیر و كۆمپانیێن پەترۆلێ ل پارێزگەهێ:

دەربارەی وان كۆمپانیێن دەستوپریا لێگەریان و بەرهەم ئینانا پەترۆلێ هەتا سالا (٢٠١٣)ێ وەرگرتین، مە داتایێن وی د ڤی خشتەیێ داهاتی دا دیاركرینە دگەل جهێ بیرێن لێ كاردكەن و رێژەیا بەشداریكرن و بەهرا هەرێمێ ب رێژەیێن سەدی.

ژ داتایێن ڤی خشتەی دیاردبیت كو (١٨) بیرێن پەترۆلێ ل پارێزگەهێ هەنە و (١٥) كۆمپانیێن هەرێمێ و جیهانی ل سەر كاردكەن كو پتریا وان كۆمپانیێن جیهانی یێن ناڤدارن و ئابوورەكێ باش ل سەرانسەری جیهانێ یێن هەین.

## دووەم: یەدەگێ پەترۆلێ ل هەرێمێ:

یەدەگێ پەترۆلێ ل هەرێما كوردستانێ ب ٤٥ ملیار بەرمیلان دهێتە خەملاندن كو نێزیكی ٣١٪ێ ژ یەدەگێ پەترۆلا عیراقێ پێكدئینیت كو برا وێ (١٤١,٣٥٠) ملیار بەرمیلن. ئەڤ یەدەگێ هەرە مەزن ب شێوەیەكێ جیولوجی ل دو دەڤەرێن سەرەكی ل عیراقێ دابەش دبیت، دەڤەرا ئێكێ پێكدهێت ژ دەڤەرێن چیایی یێن زەنگین ب بیرێن پەترۆل و گازا سرۆشتی كو دهێنە نیاسین ب دەڤەرا پشتینەیا پەترۆلێ ل كوردستانا عیراقێ و دەستپێدكەت ژ (مەندلی، خانەقین، تۆزخۆرماتو، كەركوك، مەخمۆر، دبیكە، بەتمە، عێن زالە) هەتا دگەهیتە هندەك بیرێن پەترۆلێ یێن نێزیكی سنوورێ دناڤبەرا سوریا و عیراقێ دا ل قەزا زومار.

**خشتەیێ (١٤)**

**كۆمپانییێن وەبەرهێنانێ ل پارێزگەهێ و رێژەیا بەشداریێ د بیرێن پەترۆلێ دا**

| ICENCS | | | |
|---|---|---|---|
| SN | LICENCE area | Operator | other PSC Participant |
| ١ | TAWKE | DNO | Genel Energy |
| ٢ | CENTRAL DOHUK | Murghy oil | Petroquest Energy |
| ٣ | SUEVANI | Petroquest Energy | |
| ٤A | SIND-AEDIESAT | Perenco | Oryx Petroleum |
| ٤B | SIND-AEDIWSAT | | |
| ٥ | SARANG | HKN Energy | Marthon oil |
| ٦ | BER BAHR | Genel energy | Gulf keystune |
| ٧ | SHEIKH-ADI | Gulf keystune | |
| ٨ | DOHUK | DNO | Genel Energy |
| ٩ | Al QUSH | ExxonMobil | |
| ١٠ | ATRUSH | General Exploration parteners | TAQA |
| ١١ | SHEIKH | Gulf keystune | MOL &Texas keystone |
| ١٢ | AIN SIFNI | Hunt oil | Afren |
| ١٣ | DINARTA | Hess | Petroceltic |
| ١٤ | AKRI-BIJEEL | MOL | Gulf keystune |
| ١٥ | ROVI | Chevrun | OMV |
| ١٦ | SARTA | Chevrun | OMV |
| ١٧ | BARDA RASH | Afren | Komet Group |
| ١٨ | BAESHIQA | ExxonMobil | |

دەڤەرا دووێ پێکدهێت ژ دەڤەرەکا دەشتی ل باشوورێ عیراقێ کو دەستپێدکەت ژ باکوورێ کەنداڤی ل دەڤەرا بەسرا هەتا دگەهیتە باکوورێ باژێرێ کوت، ژ بەرکو دەرگەهێ هنارتنا پەترۆلا باکووری نهو ب رێکا بەندەرێ جیهان یێ تورکی دهێتە ڤەگوهاستن لەورا دەرگەهێ سەرەکی یێ بازرگانیا پەترۆلا هەرێمێ د پارێزگەها دهۆکێ را دبووریت زێدەباری بۆرییێن هنارتنا گازا سرۆشتی.

## تەوەرێ شەشێ: کاودانێن ژیانێ ل دەڤ ئاکنجییێن پارێزگەهێ

### یەکەم: ژێدەر و قەبارەییێ داهاتێ خێزانێ:

تێکرایێ داهاتێ تاکەکەسی یان خێزانێ دهێتە هەژمارتن ئێک ژ پیڤەرێن سەرەکی یێن ب رێکا وێ ئەم دشێین ئاشنایی شیانێن خەلکی بین ل سەر کرینا تشتان یان ئاستێ وان یێ ژیانێ، لەورا زێدەبوونا ڤێ داهاتی ئێکە ژ ئەرك و ئارمانجێن سەرەکی یێن بەرنامە و سیاسەتێن ئابووری یێن هەمی حکۆمەتان یێن حەزەکا ژ دل هەی بۆ باشترکرنا ئاستێ خۆشگوزەرانییا خەلکێ خۆ. هەلبەت ئێك ژ فاکتەرێن دبنە ئەگەرێ ب دەستڤەئینانا ڤێ ئارمانجێ ژی هەمەجۆرکرنا ژێدەرێن داهاتی و زێدەکرنا رێژەیا هاریکارییا وان کەرتان یێن پترین رێژەیا بهایێ زێدە دابین دکەن ب هەڤبەرکرن دگەل کەرتێن ئابووری یێن دی، هەردیسان دویرکەفتن ژ هندێ کو پشت بەستن ل سەر کەرتەکی ب تنێ بهێتە کرن ئەوژی ژ پێخەمەت بەرقەراربوون و زێدەبوونا ل دووڤ ئێك یا قەبارەییێ داهاتێ راستەقینەیێ تاکەکەسی، زێدەباری ڤێ چەندێ گرەنتییا دابەشبوونا یەکسان ل سەر وان کەسێن دەست د چالاکیێن ئابووری و جڤاکی یێن جوداجودا دا هەی. بۆ ئاشنابوون ل سەر ژێدەرێن داهاتی و قەبارەییێ وی ئەم دێ پشت بەستنێ کەینە سەر وان داتایێن دخشتەیێ ژمارە (١٥) دا هاتین.

#### ئێك: تێکرایێ داهاتێ خێزانێ یێ هەیڤانە

بو راوەستیان ل سەر ژێدەرێن داهاتێ خێزانێ و قەبارەییێ وێ یێ هەیڤانە ل پارێزگەهێن عیراقێ ئەم دێ پشت بەستنێ کەینە سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٥) کو ژمارەیێن وێ یێن نێزیکی ژ وێ سەرژمێریێ هاتینە وەرگرتن ئەوا ژ لایێ دەستەیا

خشتەیێ (١٥)
تێکرایێ داهاتێ خێزانێ یێ هەیڤانە ل دووڤ ژێدەری ل سالا ٢٠١٤ (دولارێ ئەمریکی)

| ز | هەرێم | مووچە | داهاتێ کرێکاران (کەرتێ تایبەت) | داهاتێ مولکداریێ | سەرجەمێ داهاتێن ڤەگوهاستی | سەرجەمێ گشتی د.ع. |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆك | ٨٥٠,٧ | ٤٢٧,٥ | ٣٦٩,٠ | ٩٩,٣ | ١٧٤٦,٥ |
| ٢ | هەرێما کوردستانێ | ٧٧١,٥ | ٤٤١,٠ | ٤٣١,٥ | ١٣١,٠ | ١٧٧٥,٠ |
| ٣ | سەرانسەر عیراقێ | ٥٨٣,٠ | ٣٢٢,٥ | ٢٥٥,٠ | ١٢٧,٥ | ١٢٨٨,٠ |

گشتی یا ئاماریٚ ل هەرێمان ب هەڤکاری دگەل رێکخراوێن نەتەوێن ئێکگرتی هاتییە ئەنجامدان. ئەڤ ژمارەیێن نێزیکەیی ل سەر بنیاتێ بەرسڤێن وان خێزانان هاتینە وەرگرتن یێن بەشداری راپرسینێ بووین و ل دووڤ هژمارەکا ئالییێن تایبەتمەند د بوارێ سەرژمێریاندا ئەڤ ژمارە وەك تێکراییێ داهاتێ هەیڤانە و ژێدەرێ وی پشت بەستن ل سەر هاتییەکرن.

ل دەستپێکێ دڤێت ئاماژەیێ ب هندێ بکەین کو ئەو کوژمێ پارەی یێ ئاماژە پێ هاتییە کرن دڤی خشتەی دا ب دولارێ ئەمریکییە، کو کوژمێ پارەی یێ سەرژمێرییێن عیراقی دا هاتییە گوهارتن بۆ دولارێ ئەمریکی ب بهایێ بازاری ل دەمێ ئامادەکرنا ڤێ راپۆرتێ ئەوژی (١$ =١٢٢٣ دینارێن عیراقی).

١. تێکراییێ داهاتێ هەیڤانەیێ خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ کێمترە ژ تێکراییێ داهاتێ خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن هەرێمێ ئەوژی (٢٨,٥ $)، لێ ب (٤٥٨,٥ $) ژ تێکراییێ گشت پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ پترە.

٢. بەهرا هەرە مەزن یا داهاتێ خێزانێ ل پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ژ مووچەیێ دامودەزگەهێن حکومی دهێت.

و ل سەر ڤێ بنیاتی ئەم دشێین بگەهینە ڤێ راستییێ: خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ و هەرێمێ دەلیڤەیەکا باشتر یا هەی ژ بۆ ب دەستڤەئینانا ژێدەرێن داهاتی ئانکو وان پتر دەلیڤەیێن کاری ژ پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ یێن هەین.

## دو: دابەشبوونا رێژەیی یا خێزانان ل دووڤ گرۆپێن داهاتی:

دابەشبوونا رێژەیی یا خێزانان ل دووڤ گرۆپێن داهاتی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ پیڤەرێن گرنگ یێن دەربرینێ ژ سرۆشتێ دابەشبوونا داهاتی ل هەر وەلاتەکی دکەت، ئەڤ پیڤەرە هندەك بەلگەیێن گرنگ ددەتە دیارکرن ل دۆر رادەیێ نەیەکسانیێ ددابەشبوونا داهاتی دا زێدەباری رادەیێ دابەشبوونا جڤاکی ل سەر تەخێن داهاتی یێن دەستنیشانکری، هەروەسا رادەیێ داکوکیکرنا تاکەکەس و خێزانان د تەخێن دەستنیشانکری دا. هەروەسان ڤی شێوازێ دابەشبوونێ هندەك گرەنتی یێن مەزن هەنە ژ بۆ سەرکەفتنا سیاسەتێن ئابووری یێن مەرەما وان دانانا سنوورەکی یان کێمکرنا ئاستێن هەژاریێ ل دەڤ خەلکی زێدەباری باشترلێکرنا ئاستێ خۆشگوزەرانییا هەمی تەخ و چینێن جڤاکی.

ژ بەرڤێ چەندێ خێزانێن عیراقی هاتینە دابەشکرن بۆ سەر ١٠ تەخێن داهاتی کو دەستپێدکەت ژ تەخا داهاتێ وان یێ هەیڤانە کێمتر ژ ٦٠٠$ هەتا وێ تەخێ یا داهاتێ وان یێ هەیڤانە پتر ژ ٣٠٠٠$ هەروەکی د خشتەیێ ژمارە(١٦) دا هاتییە دیارکرن.

ئەڤ خشتەیە ئاماژەیێ دکەتە سەر هندەك راستییێن گەلەك گرنگ وەك نەیەکسانییا خێزانان ل سەر بنەمایێ تەخێن داهاتی یێن جوداجودا ل پارێزگەها دهۆکێ و هەرێما کوردستانێ و عیراقێ ب گشتی و ئەڤ چەندە خویادبیت دەمێ خێزان دهێنە

**خشتەیێ (١٦)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا خێزانان ل دووڤ تەخێن داهاتی (دولارێ ئەمریکی)**

| ز | هەرێم پارێزگەه | ٦٠٠ و کێمتر | -٦٠٠ ٦٩٩ | -٧٠٠ ٧٩٩ | -٨٠٠ ٨٩٩ | -٩٠٠ ٩٩٩ | -١٠٠٠ ١١٩٩ | -١٢٠٠ ١٤٩٩ | -١٥٠٠ ١٩٩٩ | -٢٠٠٠ ٣٠٠٠ | ٣٠٠٠ پتر | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆك | ١٧,٤ | ٨,١ | ١١,٢ | ٩,٧ | ٧,٢ | ٤,٩ | ٤,٦ | ٩,٢ | ١٧,٧ | ١٠,٠ | ١٠٠,٠ |
| ٢ | کوردستان | ١٥,٨ | ٦,٨ | ٨,٨ | ٨,٣ | ٧,٠ | ٥,٤ | ٤,٧ | ١٠,٠ | ٢١,١ | ١٢,١ | ١٠٠,٠ |
| ٣ | عیراق | ١٨,٢ | ١١,٥ | ١٢,١ | ٩,٦ | ٩,٢ | ٧,٥ | ٨,١ | ٩,٢ | ٨,٨ | ٥,٨ | ١٠٠,٠ |

دابەشکرن ل سەر سێ تەخێن داهاتی، ئەوژی تەخا داهاتێ وان کێم (هەتا ٧٩٩ دولارێن هەیڤانە) و تەخا داهاتێ وان ناڤنجی (ژ ٨٠٠-١١٩٩ دولاران) و تەخا داهاتێ وێ بلند (پتر ژ ١٢٠٠ دولارێن هەیڤانە). ل ڤێرێ ئەم دشێین تێبینیا هندێ بکەین کو ٣٦,٧٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ دکەڤنە دگەل تەخا داهاتێ وان یێ کێم کو رێژا ٣١,٤٪ێ ژ خێزانێن هەرێمێ پێکدئینیت. ل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ رێژەیا تەخا داهاتێ وان یێ کێم دگەهیتە ٤١,٨٪ێ.

ئەو خێزانێن داهاتێ وان یێ ناڤنجی ژێ، رێژەیا خێزانان ل پارێزگەهێ دگەهیتە ٢١,٨٪ێ و سەرەرای نزمبوونا رێژەیێ یا جودا دناڤبەرا پایتەخت و پارێزگەهێن دی دا، لێ ئەڤ چەندە د بەرژەوەندییا تەخێن داهاتێ وان بلند دا دهێت کو ژ داتایێن خشتەی دیاردبیت نێزیکی ٤١,٥٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ ئەون یێن داهاتێ وان یێ هەیڤانە ژ ١٢٠٠ دولاران دبووریت لێ ل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ب تنێ ٣١,٩٪ێ ژ خێزانان داهاتێ وان ژ ١٢٠٠ دولاران دبووریت.

ب هەڤبەرکرنا رێژەیا خێزانێن داهاتێ وان بلند دگەل رێژەییا خێزانانێن داهاتێ وان ناڤنجی و کێم د خشتەیێ بەری نهودا، دێ هژمارەکا راستییان بۆمە دیاربیت.

١. تێکرایێ داهاتێ هەیڤانە یێ خێزانێن هەرێمێ ژ خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ پترە.

٢. شێوازێ دابەشکرنا خێزانان ل سەر هەرسێ تەخێن داهاتی تا رادەیەکی دناڤبەرا پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەهێن دی یێ، هەرێمێ دا وەکی ئێکە.

٣. کێمبوونا رێژەیا تەخێن ناڤنجی ل پارێزگەهێ، ئەڤ چەندەژی د بەرژەوەندییا هەردو تەخێن کێم و بلند دابوو و ئەڤ چەندەژی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ ڤاڤارتنێن قۆناغا دەمکی یاکو عیراق و هەرێم تێرا دبووریت ئەوا ژ ئەنجامێ گوهۆرینێن سیاسی و ئابووری یێن پشتی ٩-٤-٢٠٠٣ێ پەیدابووین.

٤. رێژەیا هەرە مەزن یا خێزانان ل پارێزگەهێن دی

**خشتەیێ (١٧)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا مەزاختنێ ل سەر گشت کەلوپەلێن سەرەکی ب بهایێ بازاری ل دووڤ پارێزگەهان (٪)**

| برگەیێن تێچوونێ | دهۆك | کوردستان | عیراق |
|---|---|---|---|
| خوارن و ڤەخوارن | ٢٧,٢ | ٢٦,٩ | ٣٥,٦ |
| ڤەخوارنێن (کحولی) | ١,٠ | ٠,٧ | ٠,٧ |
| جلوبەرگ و پێلاڤ | ٨,٦ | ٧,٣ | ٦,٧ |
| ئاکنجیبوون و ئاڤ و تێهن | ٢٥,٩ | ٢٦,٧ | ٢٩,٠ |
| کەلوپەلێن ناڤ مالێ | ٥,٧ | ٦,٥ | ٦,٢ |
| ساخلەمی | ٢,٣ | ٢,٠ | ٢,١ |
| ڤەگوهاستن | ١٧,٤ | ١٨,٠ | ١٠,٥ |
| پەیوەندی | ٢,٩ | ٢,٨ | ٢,٥ |
| خۆشگوزەرانی و رەوشەنبیری | ١,٥ | ١,٦ | ١,٥ |
| ڤێرکرن | ٢,٣ | ١,٦ | ٠,٨ |
| خوارنگەهـ و ئۆتێل | ٢,٠ | ١,٨ | ١,١ |
| شتومەك و خزمەتێن گشتی | ٣,٢ | ٤,٢ | ٣,٣ |
| سەرجەم | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ | ١٠٠,٠ |

یێن عیراقێ دکەڤنە دگەل تەخێن داهاتێ وان کێم و ناڤنجی دا، ئەڤە ل دەمەکی کو ل پارێزگەهێن هەرێمێ رێژەیا هەرە مەزن یا خێزانان دکەڤنە دگەل تەخێن داهاتێ وان ناڤنجی و بلند دا.

## دووەم: شێوازێ مەزاختن و تێچوونان

ئەو فاکتەر و گۆراوێن کارتێکرنێ دکەنە سەر شێوازێ مەزاختنێ و بریارێن تاکەکەسی یێن مەزاختنێ گەلەکن و د جۆراوجۆرن وەك ئاستێ داهاتێ هەیڤانە و ئاستێ خواندنێ و پێکهاتەیا ژی یا ئاکنجیبان، هەردیسان جوداهیێن دەڤەرێن جوگرافی ژی کارتێکرنێ ل سەر ڤێ چەندێ دکەت. زێدەباری جوداهیا پێکهاتەیا ئاکنجیبان، ئاستێ باژێربوونێ و ئەو چالاکیێن ئابووری یێن خەلك ئەنجام ددەن. ژ بەرکو کاودانێن سیاسی و ئابووری و جڤاکی ب شێوەیەکێ رێژەیی ژ باژێرەك بۆ باژێرەکێ دی یێ عیراقێ دجودانە ب تایبەت پارێزگەهێن هەرێما کوردستانێ کو خودانا دەستور و پەرلەمان و کارگێریەکا ناڤخۆیی یا تایبەتە و دەستهەلّتێن خۆ یێن تایبەت هەنە یێن گرێدایی ب پەیکەرێ مەزاختنا گشتی و وێنەکرن و بجهئینانا سیاسەتێن ئابووری. ل سەر ڤێ چەندێ جوداهیا د شێوازێ ژیان و پلەیێن خۆشگوزەرانی یێن ئابووری و جڤاکی هاتینە رێکخستن.

لەورا د ڤی تەوەری دا دێ هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا خێزانێن پارێزگەهێ و هەرێمێ و عیراقێ کەین ل سەر چەوانییا دابەشکرنا مەزاختنا خۆ یا گشتی ل سەر برگەیێن مەزاختنێ یێن جۆراوجۆر یێن کو هاتینە پارڤەکرن و رێکخستن ل دووڤ ڤاڤارتنێن ستاندەر یێن جیهانی یێن ئیکگرتی کو ژ لایێ رێڤەبەریێن سەرژمێرباری یێن تایبەتمەند ل نەتەوێن ئیکگرتی پشت بەستن ل سەر هاتییەکرن. ئەڤ ڤاڤارتنە دزڤریت بۆ چەندین فاکتەرێن ئابووری وجڤاکی و مەرەما وان ئاسانکرنا هەڤبەرکرنێن جیهانی و هەرێمی نە. و ژ بۆ مەرەما هەڤبەرکرنێ دێ تەماشەی داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٧) کەین.

ل دووڤ داتایێن ڤی خشتەی دیاربوویە کو برگەیێن تێچوونا مەزاختنان هاتییە دابەشکرن ل سەر ١٢ برگەیێن کەلوپەل و خزمەتگوزاریان کو ل ل دەستپێکا وان خوارن و ڤەخوارن دهێن، تێبینیا هەرە گرنگ د ڤی خشتەی دا ئەوە کو پتر ژ ٧٠٪ێ ژ تێچوونێن خێزانی یێن گشتی بۆ سێ برگەیێن کەلوپەلان یێن سەرەکی هاتینە تەرخانکرن ئەوژی خوارن و ڤەخوارن، جهێن ئاکنجیبوون و تێهن، ڤەگوهاستن. زێدەباری هەبوونا نێزیکبوونەکا مەزن ل سەر شێوازێ دابەشبوونا رێژەیی دناڤبەرا پارێزگەهێن هەرێمێ و تێکرایێ هەرێمێ ژ بۆ برگەیێن ئاماژە پێ هاتییە کرن. ل ڤێرێ جوداهییەکا بەرچاڤ یا هەی ل سەر پارەیێ دهێتە مەزاختن ژ لایێ خێزانانڤە بۆ خوارن و ڤەخوارنێ ل هەرێمێ دگەل پارێزگەهێن دی یێن عیراقی و ئەڤ چەندە نەهاتییە سەر بەرژەوەندیا تێچوونێن ڤەگوهاستنێ.

ئەو جوداهیێن هەین ل سەر رێژەیێن مەزاختنا پارەی بۆ خوارنێ ئاماژەیێ دکەتە سەر نەیەکسانییا رێژەیا تێربوون یان دابینکرنا پێدڤیێن خێزانێ ئانکو خێزانێن ل هەرێمێ ئاستەکێ تێربوونێ یێ بلندتر هەیە ب هەڤبەرکرن دگەل خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ، زێدەباری نێزیکبوونەکێ مەزاختنا پارەیێ تەرخانکری ل سەر جهێن ئاکنجیبوون و تێهن و ئاڤن و کارەبێ دا ژ بەرکو ئەو جوداهیا هەی د مەزاختنا بۆ خوارنێ دا ل رێزا ئێکێ د بەرژەوەندییا مەزاختنا ڤەگوهاستنێ دا هاتییە و ل دووڤدا د بەرژەوەندیا برگەیێن دی یێن تێچوونێ. داکوکیا مەزاختنا گشتی ب رێژەیێن هەرە مەزن ل سەر هەرسێ برگەیێن بەری نهو هاتینە دیارکرن ئاماژەیێ دکەنە سەر جۆرەکێ تێکچوونێ د شێوازێ مەزاختنا خێزاناندا ل گشت پارێزگەهێن عیراقێ، دبیت ئەڤ چەندەژی هێمایێ بکەتە سەر ڤان خالان:

١. ئەڤ کەلوپەل و خزمەتگوزاریە دهێنە هژمارتن برگەیێن گرنگ بۆ خێزانێ، ئانکو ل ڤێرێ تا رادەیەکی و بێبەهرکرن یا ژێ هەی ب هەڤبەرکرن دگەل پێدڤیێن دی یێن ژیانا وان لەورا ئەو ڤێ رێژەیا مەزن یا داهاتێ خۆ ل سەر ڤان برگەیان د مەزێخن.

٢. ئاستێن داهاتی یێن تاکەکەسی و خێزانی نەگەهشتینە وی ڕادەی کو بشێن هندەکێ ژ داهاتێ خۆ ب هەلگرن بۆ وان کەلوپەلان یان خزمەتگوزارییان ب مەزێخن یێن نەسەرەکی یان کێمتر پێدڤی پێ هەی.

٣. بهایێن ڕێژەیی یێن ڤان کەلوپەلان تا ڕادەیەکی دبلندن لەوڕا کڕینا وان دبیتە ئەگەر پارەیەکێ مەزنتر یان پتر نەمینیت بۆ کڕینا برگەیێن دی یێن تێچوونێ.

سەرەرای هەبوونا جۆرەکێ وەکهەڤیا ڕێژەیی د پەیکەرێ دابەشبوونا ڕێژەیی یا تێچوونێن گشتی دناڤبەرا هەرێمێ و پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ، هندەك جوداهیێن مەعنەوی ژی یێن هەین ئەوژی هەکە لِ سەر ئاستێن نزمتر یێن برگەیێن کەلوپەل و خزمەتگوزارییێن جۆراوجۆر بکەین، ل بن سیبەرا ڤێ چەندێ ئەم دشێن ئاماژەیێ ب هندەك تێبینیان بکەین ئەوژی ب ڤی رەنگی:

١. خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ڕێژەیەکا مەزن یا داهاتێ خۆ تەرخان دکەن ژ بۆ ب دەستڤەئینانا پێدڤیێن خۆ ژ خوارن و جهێ ئاکنجیبوون و تێهنێ ب هەڤبەرکرن دگەل هەرێما کوردستانێ.

٢. هەبوونا هێلەکا جوداکەر یا مەزن دناڤبەرا تێچوونێن خێزانی ل سەر ڤەگوهاستنێ ل هەرێما کوردستانێ و عیراقێ و ئەڤەژی بۆ گەلەك ئەگەران دزڤریت وەك گرانبوونا بهایێ سوتەمەنیێ و خێزمەتێن ئامیرێن ڤەگوهاستنێ ژ ترۆمبێلان ژ لایەکی ڤە و ژ لایەکێ دیڤە خێزانێن کوردستانی هژمارەکا مەزنتر یا ترۆمبێلان هەنە.

٣. دەربارەی کەلوپەل و خزمەتگوزارییێن دی، خێزانێن هەرێمێ ڕێژەیەکا مەزنتر ژ داهاتێ خۆ ل سەر ڤان برگەیان دمەزێخن.

هەڤبەرکرن ل سەر بنیاتێ دابەشبوونا ڕێژەیی یا تێچوونێن مەزاختنێن گشتی ب تنێ وێنەیەکێ تەمام ل دۆر سرۆشتێ مەزاختنا پارەیێ کاش نادەتە مە، هەروەکی د خشتەیێ ژمارە (١٨) دا ئاماژە پێ

**خشتەیێ (١٨)**

**تێکراییێ مەزاختنا خێزانان ل سەر گشت کەلوپەلان ب بهایێ بازری ل دووڤ پارێزگەهان ($دولار/هەیڤ)**

| برگەیێن تێچوونێ | دهۆك | کوردستان | عیراق |
|---|---|---|---|
| خوارن و ڤەخوارن | ٣٩٣,٣ | ٤٤٨,٢ | ٣٥٦,٣ |
| ڤەخوارنێن (کحولی) | ١٤,٥ | ١١,٠ | ٦,٩ |
| جلوبەرگ و پێلاڤ | ١٢٤,٨ | ١٢٢,٠ | ٦٦,٨ |
| ئاکنجیبوون و ئاڤ و تێهن | ٣٧٤,٤ | ٤٤٤,٤ | ٢٩٠,٠ |
| کەلوپەلێن ناڤ مالێ | ٨٢,٨ | ١٠٧,٥ | ٦٢,١ |
| ساخلەمی | ٣٣,٤ | ٣٣,٤ | ٢١,٢ |
| ڤەگوهاستن | ٢٥٢,٣ | ٢٩٩,٦ | ١٠٤,٦ |
| پەیوەندی | ٤١,٧ | ٤٦,٣ | ٢٥,٢ |
| خۆشگوزەرانی و رەوشەنبیری | ٢٢,٢ | ٢٧,٣ | ١٤,٥ |
| فێرکرن | ٣٣,٥ | ٢٦,٥ | ٨,٥ |
| خوارنگەه و ئوتێل | ٢٨,٢ | ٣٠,٧ | ١١,٢ |
| شتومەك و خزمەتێن گشتی | ٤٦,٩ | ٦٩,٧ | ٣٣,٥ |
| سەرجەم | ١٤٤٧,٩ | ١٦٦٦,٦ | ١٠٠٠,٨ |

هاتییە کرن کو مەزاختنا گشتی ل هەرێمێ ب گشتی یان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێن وێ ل سەر پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ دکەڤیت، مەزاختنا خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ نێزیکی ٦٠٪ێ ژ وێ یا ل هەرێما کوردستانێ.

د ڕاستی دا ئەڤ چەندە بەرامبەری وان ئاستێن داهاتێ تاکەسکی و خیزانی یە یێن ئاماژەیێ دکەنە سەر جوداهیێن هەڤشێوە د بەشێ تایبەت بێ داهاتێ خێزانێ دا، سەرەرای هندێ کو خێزانێن هەرێمێ پارەیەکێ کێمتر تەرخان دکەن ژ بۆ کڕینا خوارنێ (ب هەڤبەرکرن دگەل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ) لێ کوژمێ پارەیێ کاش یێ تایبەت بۆ ڤێ چەندێ پترە ژ وی یێ ل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ، هەلبەت ئەڤ چەندە ل سەر گشت برگەیێن دی یێن تیچوونێ ژی دهێتە سەپاندن. ب دەستڤەئینانا داهاتەکێ مەزنتر ژ لایێ خێزانێن هەرێمێ ڤە بوویە ئەگەر ئەو پارەیەکێ مەزنتر ژی ب مەزێخن ژ لایەکی ڤە و ژ لایەکێ ڤە هاریکاریا وان کریە ئەو پارەیەکێ مەزنتر ل سەر کەلوپەل و خزمەتگوزاریێن نە پێدڤی ژی ب مەزێخن.

ل دووماهیێ ئەم دشێن بێژین کورتییا بابەتی د دو خالێن گرنگدا دەستنیشان بکەین ئەوژی ئەڤەنە: خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ و هەرێما کوردستانێ پتر دەلیڤە هەیە د قەبارەیێ مەزاختنا گشتی دا هەروەسا دەلیڤە د شێوەیێ دابەشبوونا ڕێژەیی یا ڤێ مەزاختنێ دا ل سەر کەلوپەل و خزمەتگوزاریێن جۆراوجۆر، ئەڤ چەندە هندێ دگەهینیت کو وان شیانێن پتر هەنە ژ بۆ پەیداکرنا پێدڤیێن ژیانا خۆ و تێرکرنا پێدڤیێن خۆ ب تایبەت پێدڤیێن خوارنێ، لێ ڕێژەیێن مەزن یێن مەزاختنێ ل سەر هەرسێ برگەیێن (خوارن، ئاکنجیبوون/ تێهن، و ڤەگوهاستن) بەلگەیە ل سەر نەبوونا شیانێن داهاتێ پارەیێ کاش یا پتریا خێزانان و ل پتریا پارێزگەهێن عیراقێ ژ بەرکو ب شێوەیەکێ گشتی وان جهێن ئاکنجیبوونێ یێن گونجایی نینن زێدەباری ئاریشەیا بلندبوونا تێچوونێن ڤەگوهاستنێ. سەرەرای جوداهیێن ڕێژەیی دناڤبەرا هەرێم و پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ لێ شێوازێ مەزاختنێ ڕەنگڤەدانا ئاستێ داهاتێ وانە ل گشت عیراقێ کو دهێتە ڤاڤارتن ژ تەخێن داهاتێ وان یێ ناڤنجی ل سەرانسەری جیهانی.

تشتێ گرنگی ب دابەشبوونا ڕێژەیی یا خێزانا ل سەر تەخێن گشتی یێن مەزاختنێ، ئەم دشێن پشت بەستنێ بکەسنە سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٩).

ل دووڤ گرنگیا جهی، ئەم دشێن برگەیێن د ڤی خشتەی دا هاتین ل سەر سێ گرۆپێن مەزاختنێ ژ بۆ ب سانەهیکرنا کریارا هەڤبەرکرنێ دابەش بکەین ئەوژی ب ڤی ڕەنگی:

- گرۆپێ ئێکێ (کێم): کێمتر ژ ٤٠٠ دولاران هەتا ٧٠٠ دولاران هەیڤانە
- گرۆپێ دووێ (ناڤنجی): ژ ٧٠٠ دولاران هەتا ١٠٠٠ دولاران هەیڤانە
- گرۆپێ ئێکێ (بلند): پتر ژ ١٠٠٠ دولاران هەیڤانە

ئەڤ خشتەیە ئاماژەیێ دکەتە سەر جوداهییەکا

**خشتەیێ (١٩)**
**دابەشبوونا ڕێژەیی یا خێزانان ل دووڤ برگەیێن مەزاختنێ (٪)**

| پارێزگەهـ | برگەیێن تێچوونێ | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کێمتر ژ ٤٠٠ | ٥٠٠-٤٠٠ | ٦٠٠-٥٠٠ | ٧٠٠-٦٠٠ | ٨٠٠-٧٠٠ | ٩٠٠-٨٠٠ | ١٠٠٠-٩٠٠ | ١٢٠٠-١٠٠٠ | ١٥٠٠-١٢٠٠ | ٢٠٠٠-١٥٠٠ | پتر ژ ٢٠٠٠ | سەرجەم |
| دهۆک | ٨,٦ | ٣,٨ | ٥,٨ | ٥,٣ | ٦,٠ | ٦,٦ | ٦,٢ | ١١,١ | ١٣,٠ | ١٣,٩ | ١٩,٧ | ١٠٠,٠ |
| کوردستان | ٤,٠ | ٢,٠ | ٤,٣ | ٤,٩ | ٤,٩ | ٥,١ | ٥,١ | ١٢,٤ | ١٤,٠ | ١٥,٨ | ٢٧,٦ | ١٠٠,٠ |
| عیراق | ١٢,٢ | ١١,٠ | ١١,٨ | ١١,٦ | ١٠,٤ | ٨,٧ | ٦,٥ | ٩,٩ | ٨,١ | ٥,٧ | ٤,١ | ١٠٠,٠ |

بەرچاڤ ل سەر داکوکیکرنا خێزانان ل سەر مەزاختنێن جۆراوجۆر دناڤبەرا پارێزگەهێن هەرێمێ و عیراقێ دا، ئەم دشێن ڤان ئاماژەیێن مە ژ خشتەی وەرگرتین ب ڤی رەنگی کورت بکەین:

١. نێزیکی ٢٣,٥٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەهێ ژ تەخا مەزاختنا کێمن، لێ ٤٦,٦٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ و ١٥,٢٪ێ ژ خێزانێن هەرێمێ دکەڤنە دگەل ڤێ تەخێ.

٢. نێزیکی ١٨,٨٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەها دهۆکێ و ١٥,١٪ێ ژ خێزانێن هەرێمێ دهێنە هەژمارتن دگەل تەخا مەزاختنا وان یا ناڤنجی لێ ئەڤ رێژە ل جهێ، دی یێن عیراقێ ٢٥,٦٪ یە.

٣. نێزیکی ٥٨,٠٪ێ ژ خێزانێن دهۆکێ و ٦٩,٧٪ێ یێن هەرێمێ ژ تەخا مەزاختنێن بلندە، لێ ب تنێ ٢٧٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ژ ڤێ تەخێ نە.

د راستی دا ئەڤ رێژەیە هێمایی دکەنە سەر هندەك جوداهیێن بنەرەتی ددابەشبوونا خێزانان ل سەر تەخێن مەزاختنێ دناڤبەرا هەرێما کوردستانێ و ب هەرسێ پارێزگەهێن خۆڤە دگەل پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ، ل دەمەکی کو نێزیکی ٤٦,٦٪ێ ژ خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ ژ تەخا داهاتێ کێمن و ئەڤ خێزانە هەیڤانە کێمتر ژ ٧٠٠ دولاران دمەزێخن ئەڤە ل دەمەکی کو نێزیکی ٧٠٪ێ

**خشتەیێ (٢)**
**مووچە و داهاتێ کارێن ئازاد (دولارێ ئەمریکی)**

| مووچەیێن هەیڤانە | کێمترین ئاست $ | بلندترین ئاست $ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| حکۆمی(ژ بلی پلەیێن تایبەت) | ٢٠٠,٠ | ٢٠٥٠,٠ | پشت بەستنێ دکەتە سەر بروانامە و سالێن خزمەتێ |
| رێڤەبەرێن گشتی | ٢٤٥٠,٠ | ٣٢٧٠,٠ | |
| مامۆستایێن زانکۆیێ | ٩٨٠,٠ | ٣٦٨٠,٠ | |
| سەرۆکێن زانکۆیان | ٥٠٠٠,٠ | ٦٠٠٠,٠ | |
| راگرێن کولیژ و پەیمانگەهان | ٣٢٧٠,٠ | ٤٠٠٠,٠ | |
| شیرەتکار | ٢٤٥٠,٠ | ٤٩٠٥,٠ | |
| بریکارێن وەزارەتان | ٣٢٧٠,٠ | ٤٩٠٥,٠ | |
| وەزیر | ٥٧٠٠,٠ | ٦٥٤٠,٠ | |
| ئەندام پەرلمان | ٧٠٠٠,٠ | ٧٠٠٠,٠ | |
| کارێن ئازاد (نەشارەزایی) | ٤٩٠,٠ | ٧٣٥,٠ | |
| کارێن ئازاد (نیڤ شارەزایی) | ٦٥٠,٠ | ٩٨٠,٠ | |
| کارێن ئازاد (شارەزایی) | ١٢٢٥,٠ | ٢٠٠٠,٠ | دبیت پتر لێ بهێت ل دووڤ سرۆشتێ پیشەی |
| کارێن ئازاد (شیرەتکاری- بسپۆر) | ٢٥٠٠,٠ | ٦٠٠٠,٠ | دبیت پتر لێ بهێت ل دووڤ دەمژمێرێن کاری و پیشەی |

ژ خێزانێن هەرێمێ هەیڤانە پتر ژ ١٠٠٠ دولاران دمەزێخن و نێزیكی ٢٧,٦٪ێ هەیڤانە پتر ژ ١٠٠٠ دولاران د مەزێخن.

هەرچەندە ئەڤ چەندە دگەل تەخێن داهاتێ خێزانێ ل گشت عیراقێ ناگونجیت كو هێمایێ دكەتە سەر هندێ رێژەیا كێمتر ژ وان هاتینە ڤاڤارتن دگەل تەخا داهاتی یا هەڤشێوە دگەل تەخا مەزاختنێ، ئەڤ چەندەژی ڤەدگەریت بۆ وان داخۆیانێن زێدەروی تێدا هاتیە كرن ل سەر مەزاختنێ ژ لایێ خێزانانڤە ژ لایەكی و داخۆیانێن تایبەت ب داهات و ژێدەرێ ویڤە ل لایەكی دی كو بنەراتدا كێمترە ژ بهایێ وی یێ راستەقینە.

ئەڤ حالەتە دناڤ هەمی جڤاكاندا یێ هەی لەورا ڤەكۆلەر و كەسێن د ڤی بواری دا كاردكەن تووشی گەلەك ئاریشە و ئاستەنگان دبن د رازیكرنا وان كەساندا یێن بەشداریێ د سەرژمێری و راپرسیناندا دكەت داكو راستیێا قەبارەیێ و ژێدەرێ داهاتێ خۆ یێ هەیڤانە و مەزاختنێن خۆ بێژن. لێ ئەڤ چەندە چ كارتێكرنێن مەعنەوی ناكەتە سەر شرۆڤەكرنێن هەڤبەركرنێ دناڤبەرا یەكەیێن كارگێری و جوگرافی دا ژ بەركو تایبەتمەندی و پیڤەرێن هەمی د ئێككگرتینە.

ب پشت بەستن ل سەر ڤێ چەندێ ئەم دشێین دووپاتیێ ل سەر هەبوونا جوداهیێن مەزن د ئاستێن مەزاختنا خێزانی و دابەشبوونا رێژەیی ل سەر هەمی جۆرێن كەلوپەل و خزمەتگوزاریان دناڤبەرا هەرێما كوردستانێ و خێزانێن پارێزگەهێن دی یێن عیراقێ دا بكەین.

**خشتەیێ (٢١)**

**بهایێن نهو یێن خزمەتگوزاریێن سەرەكی (دولارێ ئەمریكی)**

| | كێمترین $ | بلندترین$ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| كرێیا یەكەیێن ئاكنجیبوونێ (شوقە) | ٤٠٠,٠ | ٢٠٠٠,٠ | |
| كرێیا یەكەیێن ئاكنجیبوونێ (خانی) رووبەرێ كێمتر ژ ٢٠٠م٢ | ٦٠٠,٠ | ٢٠٠٠,٠ | |
| كرێیا یەكەیێن ئاكنجیبوونێ (ڤلە) و جهێن بازرگانی (بنگەهێن كۆمپانی و رێكخراوان) | ٣٠٠٠,٠ | ١٢٠٠٠,٠ | |
| مەزاختنێن سالانە یێن خواندنا زانكۆیێن تایبەت (بهایێن تووماكرنێ) ژ بلی مەزاختنێن ژیانا رۆژانە و ئاكنجیبوون و هاتنوچوونێ | ٢٠٠٠ | ١٠٠٠٠,٠ | ل دووڤ تایبەتمەندیێ |
| مەزاختنێن سالانە یێن خواندنا تایبەت/ بێی زانكۆ | ١٠٠٠,٠ | ٦٠٠٠,٠ | |
| بهایێن سوتەمەنیێ (پانزین) و نەفتا سپی | ٥٠٠,٠ | ٦٠٠,٠ | لیترەكا ب تنێ |
| تێكرایێ بهایێ كارەبا یەكەیێن ئاكنجیبوونێ | ١٥٠,٠ | ٨٠٠,٠ | |
| تێكرایێ بهایێ كارەبا یەكەیێن ئابووری | ١٠٠٠,٠ | ٥٠٠٠,٠ | ل دووڤ سرۆشتێ چالاكیێ |
| تێكرایێ بهایێ مەزاختنا خوارنا چوار كەسان | ٤٥٠ | ١٤٠٠,٠ | |
| تێكرایێ تێچوونا ل سەر پێدڤیێن مەزاختنێ یێن سەرەكی بۆ خێزانێ (بێی مەزاختنێن خۆشگوزەرانی و گەشتێن دەرەكی) | ٨٠٠ | ٥٠٠٠ | هندەك خێزانێن زەنگین بخۆڤە ناگریت |

## سێیەم: نیشاندەرێن كرێ و مووچە و بهایان:

گوهۆرینێن د كرێیاندا ئێكە ژ گرنگترین نیشاندەرێن هێمایێ دكەنە سەر ئاستێن داهاتی یێن تەخێن مەزن یێن جڤاكی ب تایبەت پشتی كو دیاربووی ژێدەرێ داهاتی یێ رێژەیەكا هەرە مەزن یا خەلكێ عیراقی و هەرێمێ پشت بەستنێ دكەتە سەر مووچەیان. هەروەسا بهایێن كەلوپەلان ژی ئێكە ژ دەستنیشانكەرێن هەرە گرنگ بۆ ئاستێ ژیان و سرۆشت یان شێوازێ مەزاختنا خێزانی ل سەر گرۆپێن كەلوپەل و خزمەتگوزارێن جۆراوجۆر. داهاتێ بلند نە بەلگەیە ل سەر ئاستێ خۆشگوزەرانییەكا باشتر، ژ بەركو بلندبوونا كرێیان و مەزاختنێن هاتنوچوون و پەیوەندیان و جۆرێن دی یێن خزمەتگوزاریان كونترۆلێ ل سەر شیانێن كرینێ ب پارەیان دكەت و ل دووڤدا پیڤەرێ گرنگتر ژی دهاتێ راستەقینەیە. ژ بۆ تەمامكرنا وێنەیێ ئاستێ ژیانێ یێ ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ ئەم دێ بزاڤێ كەین گرنگیێ دەینە ئاست یانژی تێكراێن كرێ یێن زاڵ ل هەرێما كوردستانێ و بهایێ هندەك خزمەتگوزاریان.

### ئێك: تێكرایێ كرێ و مووچەیان ل كەرتێن گشتی و تایبەت:

د ڤی بەشی دا دێ ئاماژەیێ كەینە سەر مووچەیێن كێم و بلند و یێن زاڵ ل هەرێما كوردستانێ، هەروەسا مە كوژمێ مووچەیێ فەرمانبەرێن حكۆمی ڤەگوهاستییە بۆ دولارێ ئەمریكی ئەوژی ب پشت بەستن ل سەر خشتەیێن فەرمی یێن وەرگرتنا مووچەیان ل وەزارەتا دارایی و ئابووری یا هەرێما كوردستانێ، لێ بو مووچەیێ كرێكاران ب تایبەت ل كەرتێ تایبەت مە پشت بەستن كرییە سەر وان پێزانینان یێن ژ دەستە و سەندیكایێن كرێكاران ل هەرێمێ و سەرژمێرێن راستەوخۆ هاتینە وەرگرتن.

د ڤی خشتەیی دا دیاردبیت كو جوداهیەكا مەزن یا هەی دناڤبەرا كێمترین و بلندترین مووچەیێن گرۆپێن ئاماژەپێكری. هەروەسا ئەڤ مووچە ژ هندەك پلەیێن وەزیفی ناگرن ب تایبەت رێڤەبەرێن گشتی و سەردا وەك ئیفادە و گەشت و ترۆمبێلێن تایبەت و پارچەیێن عەردی و جهێن ئاكنجیبوونێ. لەورا داهاتێ گشتی یێ ڤان پلەیێن وەزیفی پتریا جاران ب رێژەیەكا مەزن پترە ژ وان ژمارەیێن د خشتەیی دا هاتین.

### دوو: بها و كرێ:

هەرچەندە گوهۆرین یا بهایێ پتریا كەلوپەل و خزمەتگوزارییاندا ل بازارێ ناڤخۆیی پەیدابووی لێ مە پشت بەستن كرییە سەر بهایێ كەلوپەل و خزمەتگوزاری و كرێن خانییان ئەوێن د تووماریێن گشتی دا هەین زێدەباری تێبینێن مەیدانی و وەرگرتنا بۆچوونێن راستەخۆ ژ پەیوەندیدار د ماوەیێ هەیڤێن بووری دا ل سالا ٢٠١٥ێ هەروەسا ل سالا ٢٠١٤ێ ژی.

هەروەسا گوهۆرینێن وەرزی ب تایبەت رویدانێن ڤێ دووماهیێ یێن هەرێما كوردستانێ ب تایبەت هاتنا ژمارەیەكا مەزن یا ئاوارەیان پشتی ٢٠١٤/٦/١٠ێ ل بەرچاڤ هاتییە وەرگرتن.

ل دەستپێكێ دڤێت ئاماژەیێ ب هندێ بكەین كو ئەو ژمارەیێن د خشتەی دا هاتین تێكرایێ گشتی یێ خێزانایە لەورا بلندترین ئاستێ مەزاختنێ یێ هندەك خێزانان (كو ب رێژەیەكا نەیا كێم بەلكو دبیت پتر ژ ١٠٪ێ ژ خێزانێن كوردستانێ) پترە ژ وان ژمارەیێن د خشتەیی دا هاتین. هەروەسا د خشتەی دا تێبینیا هندێ دكەین كو هندەك شێوازێن مەزاختنێ یێن زێدە هەنە كو ئەو ب تنێ مەزاختنا وان پترە ژ ١٥٠٠٠ دولاران هەیڤانە.

# روو ب رووبوونا گەندەلیێ ل پارێزگەها دهۆك
## (سەربۆرەکا یاسایی)

محەمەد حەسەن عومەر بەرواری
وەرگێران: سالح یوسف سوفی

**پێشگۆتن:**

پشتی لیژنا تایبەت یا پرۆژێ (ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆك) پەیوەندی ب مە کری بۆ ئامادەکرنا ڤەکۆلینەکا یاسایی ل سەر پارێزگەها دهۆك و سەرباری گەنگەشەیێن مە یێن بەرفرەهـ دگەل سەرۆکێ لیژنێ بۆ دەستنیشانکرنا بابەتێ باشتر بۆ ڤەکۆلینێ ژ لایێ یاسایی ڤە ل سەر پارێزگەها دهۆك و کا کیژ بابەت چێترە پەیوەندی ب دیرۆکا دادگەهێن پارێزگەهێ ڤە هەبیت، هەرچەندە ئەز ب خۆ ژی ل وێ باوەرێ بووم کو ئەڤە بابەتەکێ گرنگە، لێ ژ بەر نەبوونا چ ژێدەرێن ڤەکۆلینێ ل سەر دیرۆکا ڤان دادگەهان کێم مابوو ئەڤ کارە نەهێتە کرن، چونکی مە خۆ ژێدەرەك ژی ل دۆر ڤی بابەتی نەدیت، هەروەسا ئەرشیفێ دادگەهێن پارێزگەها دهۆك ژی ل سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ هاتبوو سۆتن و تالان کرن، ژ بەر هندێ چ ل بەر دەستێ مە نەما ژ بلی هندەك دادوەرێن کەڤنێن دادگەهێن پارێزگەهێ داکو چاڤپێکەڤتنان دگەل بکەین، لێ ئەڤە بەس نینە بۆ ئەنجامدانا ڤەکۆلینەکا تیروتەسەل کو ببیتە ئێك ژ بابەتێن (ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆك)، چونکی ڤەکۆلینێن هۆسا پێدڤی هندێ نە دەهکێن بهێت ژی زیندی بمینن، ژ بەر هندێ، من چ بابەت نەدیتن کو ببیتە دەرۆك بۆ ڤێ چەندێ ژ بلی پەنابرنە بەر سەربۆرەکا یاسایی یا ل پارێزگەها دهۆك ل ژوورا پارێزەرێن وێ ب تنێ هاتییە روودان و ل چ پارێزگەهێن دی یێن هەرێمێ چێ نەبووی کو ئەو ژی روو ب رووبوونا وێ گەندەلیێ بوو یا ل ناڤ ناڤەندێن سەندیکا پارێزەران ل سەرانسەری هەرێمێ هەبوو، ئەو ژی ئەوە کو هژمارەکا زۆر یا پارێزەران ل ژوورێن پارێزەران د ئێك دەمدا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکرن، لێ کارێ مە تنێ دێ ل سەر لقێ پارێزگەها دهۆك و ژوورێن وێ بیت وەك نموونەیەك داکو چاڤ لێ بهێتە کرن.

دبیت خواندەڤان پرسیارێ بکەت کا ئەرێ ئارمانجا مە ژ چوونە ناڤ ڤێ روو ب رووبوونێ چییە یا دبیت مرۆڤ سەرساخ ژێ دەرنەکەڤیت؟ یان ئەو چ ئەگەرن مە پال ددەن هەلویستێن هۆسا وەرگرین کو دبیت ب دەهان یان ب سەدان کەس هەبن هەلویستێن جودا جودا ل سەر هەبن، چونکی چو پێ نەڤێت، گەلەك ژ وان، ژ بەر ڤان هەلویستان زیاندارن و دێ رەخنەیێن دژوار ل مە گرن، نەخاسمە ژی کو پتریا وان یان

بەرپرسێن هۆب و پشکێن یاسایی یێن فەرمانگەهێن خۆ بوون یان هەتا فەرمانبەرێن مافپەروەرێن وان فەرمانگەهان بوون، گەلەك ژ وان پارێزەران ئەم شیرەت کرین دەست ژ ڤێ دۆسیێ(بادەکێ) بەردەین و پرسیار دکرن کا ئەرێ بەرژەوەندیا مە چییە سەرێ خۆ بئێشینین و نەرحەتیێ بۆ خۆ چێ کەین، نەخاسمە ژی کو ئەم د دەستەیا کارگێرییا لقێ سەندیکا پارێزەرێن دهۆك دا نەبووین، بەلکی تنێ مە پۆستێ سەرۆکاتییا لیژنا فەرعییا رێسایێن رەفتارێ پیشەیی وەرگرتییە کو ئەو ژی لیژنەیەکا خۆبەخش یا بێ بەرامبەرەکێ ماددی یە، داکو دگەل خواندەڤانێ هێژا راستتر بین ژی، گەلەك جاران ڤان داخوازی و شیرەتان کارڤەدانێن باش هەبوون و دبوونە پالدەر کو پتر هزرێ د وان پێنگاڤان دا بکەین یێن مە ل بەرە بهاڤێژین یان ئەوێن ب راستا مە هاڤێتین و کا ئەرێ دێ شێین پتر بەردەوامیێ پێ دەین، یان ڤێ مەسەلێ بۆ ئێکێ دی بهێلین؟

ب راستی دوو پالدەر بۆ ڤی کارێ مە هەبوون، یێ ئێکێ: ل دەمەکێ نە یێ دوور ژ دەستپێکرنا ڤێ روو ب رووبوونێ، من ل رۆژا ٢٠١١/١/٥ێ خواندنا خۆ یا ئەکادیمی ل خواندنێن بلند تمام کربوو و ببوومە خودان باوەرناما ماستەرێ د ڤەکۆلینێن ئاشتیێ و چارەکرنا ڤێکنەکرنان (ناکۆکییان) دا ل زانکۆیا دهۆك/ کولیژا یاسا و رامیاری ب هەماهەنگی دگەل زانکۆیا ئاشتیێ یا سەر ب نەتەوێن ئێکگرتی، بابەتێ ڤەکۆلینا ناما من یا ماستەرێ ژی ب ناڤێ (ڤێکنەکرنێن ناڤخۆیی و رۆلێ گەندەلیێ د پەیدابوونا وان دا، (عیراق ل ناڤبەرا ٢٠٠٣-٢٠٠٨ێ وەك نموونە) بوو، ڤی بابەتی گەلەك دەرگەهـ ل بەر مە ڤەکرن بۆ خۆ داهێلانا ناڤ بەریەرێن گەندەلیێ و جۆر و ئاوایێن وێ و شوینوارێن وێ یێن جودا جودا و رێ یێن روو ب رووبوون و ژ ناڤبرنا وێ، نەخاسمە ژی ل عیراقێ و ژ وانا ل هەرێما کوردستانێ ژی، ڤێجا پێدڤی بوو بیاڤەکی بۆ وان تیۆر و هزر و نێرینان پەیدا بکەین یێن د وێ ڤەکۆلینێ من دا من پشتا خۆ پێ گەرم کری، هەر رەوشەکا بەر ڤەکۆلینێ بکەڤیت، هەر

زوی ژی مە ئەو بیاڤ ل ژینگەهەکێ دیت کو ئەم ب خۆ ژ ژینە و گەلەك گرنگە رەوشا وێ بهێتە چاککرن کو ئەو ژی ژینگەها پیشەیێ پارێزەریێ یە، دبیت ژی ئەڤە پالدەرێ دووێ بیت بۆ ڤی کارێ من و هەڤکارێن دی یێن من ڤێجا چ د لیژنێ دا بن یان ژی د دەستەیا کارگێرییا لق دهۆك یێ ژوورا پارێزەرێن دهۆك دا بن، ڤێجا هەکە ژیوارێ ڤی پیشەی بهێتە چاك کرن، ژ چەند لایەکان ڤە دێ مفادار بین، ل پێشییا وان ژی ئەوە کو ئەز شیایمە پشکەکا ڤەکۆلینا خۆ یا زانستی ل سەر ژینگەهەکا ب کێر پراکتیککرنێ دهێت پراکتیك بکەم، ژ بەرکو ئەڤ ژینگەهە ژ هەر لایەکێ دی دیمۆکراتیتر و ئازادترە، چونکی ژ وی دەمێ هاتییە پێك ئینان، هەلبژارتن لێ دبەردەوامن و ئەوێن هەلبژارتی ژی ل بن بازنەیا رۆناهیێ نە، چونکی سەرکردایەتیکرنا چەندین دەستەیێن پارێزەران ب هەمی جوون و کێشەیێن وان ڤە کارەکێ ب ساناهی نینە، ژ بەرکو هەر پارێزەرەکی کەسایەتییەکا یاسایی (شخصیة اعتبارية) هەیە، هندەك جاران ژی کاروبار تێکەلی ئێك دبن دەمێ کەسایەتییا وی دهێتە دەستنیشان کرن کا ئەرێ پارێزەری کەسایەتییەکا خۆرستی ب تنێ هەیە یان ل ئۆفیسا خۆ یا پیشەیێ خۆ تێدا ب رێڤە دبەت کەسایەتییەکا مەعنەوی ژی هەیە، یاسایا تایبەت یا پارێزەریێ هژمارە ١٧ یا سالا ١٩٩٩ێ یا مافێن گرنگ و ترسناك ، دەستەلاتێ ددەتێ بەرەڤانیێ ژ بریکاردارێن (موکل) خۆ بکەت و پارێزبەندییەکا (حصانة) وەسا ددەتێ چ خودان پیشەیێن دی ئەو پارێزبەندی نەبن، بەلکی وی ماف هەیە ب نڤیسارێن فەرمی یێن یاسایی پەیوەندیێ ب لایەنێن فەرمی بکەت ئەو لایەن چەند دبلند بن، ژ بەر هندێ، هەکە ئەم شیاین گەندەلیێ ل ڤێ ژینگەهێ راوەستینین، ئەڤە مە سەرکەڤتنەکا ئەکادیمی د ساخلەمییا وا تیۆران دا ب دەستڤە ئینا یێن من د ڤەکۆلینا خۆ دا بەحس کرین، هەروەسا ئەڤە دێ هندێ گەهینیت کو ئەم دگەل هەڤالێن خۆ یێن هێژا ب رێیا سەربۆرەکا دەستپێکی شیاینە چەندەکی ژ سەرفەرازی و پێشکەڤتنێ د پێگەهێ

سەندیکا پاریزەرێن هەرێمێ دا ل پاریزگەها دهۆك ب جهـ بینن، داکو ڤێ جارێ پاریزگەها دهۆك د دۆسیەکا گەلەك ب زەحمەت دا پێش پاریزگەهێن دی بکەڤیت و ببیتە خودان تایبەتمەندی د وی بیاڤی دا کو ئەو ژی دۆسیا روو ب رووبوونا گەندەلیێ یە و ببیتە سەربۆرەکا پێشەنگ چاڤ لێ بهێتە کرن و سەنگەکێ بدەتە دەستەلاتا یاسایێ و ب رێیا ئامادەکرنا پاریزەرێ راستیبێژ و ب روومەت یێ ماف و ئەرکێن خۆ دزانیت دادپەروەریێ ب جهـ بینیت.

ژ بەر هەمی ئەگەرێن من گۆتین مە ئەڤ ڤەکۆلینا تایبەت ل سەر لقێ سەندیکا پاریزەران ل پاریزگەها دهۆك و ژوورێن دی یێن وێ ل قەزایێن پاریزگەهێ ئامادە کر و ڤەکۆلین هەر ژ سالا ۲۰۱۰ێ هەتا ۲۰۱۳/٤/۳ ڤەدگریت، پشتی هنگی ژی مە زانی کو ئەڤ چالاکییە ل پاریزگەها دهۆك ب تنێ هاتییەکرن و ل پاریزگەهێن دی یێن هەرێما کوردستانێ نەبوویە، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو ئەڤە ژی دبیتە تشتەکێ ئێکانە و تایبەتمەندییەکە داکو ڤەکۆلین و دووڤچوون ل سەر بهێتە کرن و د ناڤ (ئینسکلۆپیدیا پاریزگەها دهۆك) دا بیت.

ب گشتی مە ئەڤ ڤەکۆلینە ب چارچۆڤەکی دا وەسا دا رێکئێخستییە کرییە کو دو ڤەکۆلینان ب خۆڤە بگریت و داوییەك ژی بۆ پێشنیازان هەبیت و ب ڤی ئاوایێ خوارێ:

ڤەکۆلینا ئێکێ: پێدڤی و رێنمایێن روو ب رووبوونا گەندەلیێ، ئەڤ ڤەکۆلینە ژی بۆ چەند برگەیەکان دهێتە دابەش کرن:

ئێك: رێکارێن پێدڤی بۆ دەستنیشانکرنا گەندەلان

دوو: ئێلکلاکرنا هەلویستێ تاکی یان کۆمێ.

سێ: دەستنیشانکرنا دەمێ گونجای بۆ راگەهاندنا روو ب رووبوونێ.

چوار: کۆمکرنا رایا گشتی یا پشتەڤانان بۆ کێشەیا خۆ.

پێنج: حەزوڤیانا خوبەخشا ب راستا.

شەش: خۆدوورئێخستن ژ ب کەسینیکرنا هەلویستان (شخصنە المواقف).

حەفت: بنەجهکرنا وەکهەڤیێ ل ناڤبەرا هەمیان.

هەشت: نووکرنا خوونگەرمیێ(جۆش وخرۆشێ) ل نك چالاکڤانان.

ڤەکۆلینا دووێ: ڤەگوهاستنا روو ب رووبوونێ بۆ بۆ قووناغەکا نوو (فەرمی) و ئەڤ ڤەکۆلینە بۆ برگەیێن خوارێ دهێتە دابەش کرن:

ئێك: قۆناغا ئێکێ/ لیستا ئێکێ.

دوو: قۆناغا دووێ/ لیستا دووێ.

سێ: قۆناغا سێێ/ لیستا سێێ.

چوار: قۆناغا چوارێ/ لیستا چوارێ.

پێنج: قۆناغا پێنجێ/ لیستا تایبەت ب لایەنێ لەشکەری.

شەش: قۆناغا شەشێ/ لیستا شەشێ.

ل داویێ ژی ڤەکۆلین ب کۆمەکا پێشنیاران ب داوی دهێت.

ل داویێ ژی بۆ پتر مفا وەرگرتن و پێداچوونێ، مە پاشبەندەك بۆ نڤیسارێن پەیوەندی ب ڤێ ڤەکۆلینێ ڤە هەین دانایە.

## ڤەکۆلینا ئێکێ
## پێدڤی و رێنمایێن روو ب رووبوونا گەندەلیێ

ل ڤێرە ب رێیا بسپۆرییا خۆ یا ئەکادیمی ب رێ و میکانیزمێن دەستنیشانکری یێن نەهێلانا گەندەلیێ، یان ژی ب رێیا سڤکە سەربۆرا خۆ بۆ بەرسینگگرتنا ڤێ ئێشا ترسناك، ئەم دێ کۆمەکا هۆ و میکانیزمان دەستنیشان کەین کو پێدڤییە یێ بسپۆری د ڤی چارچۆڤەی دا هەی ل دووڤ بچیت، ئەڤ هۆ و میکانیزمە ژی ئەڤەنە: (ئەنجامدانا کارێ پێدڤی بۆ دەستنیشانکرنا گەندەلان- ئێکلاکرنا هەلویستێ تاکی یان کۆمێ- دەستنیشانکرنا دەمێ گونجای بۆ راگەهاندنا روو ب رووبوونێ - کۆمکرنا رایا گشتی یا پشتەڤانان بۆ کێشەیا خۆ - حەزوڤیانا خۆبەخشا ب راستا - خۆدیرئێخستن ژ ب کەسینیکرنا هەلویستان - بنەجهکرنا دادپەروەریێ ل ناڤ هەمیان - نووکرنا گیانێ جۆش وخرۆشێ

ل ناڤ چالاکڤانان)، ڤێجا ئەو کینە سەرپێچییا یاسایێ دکەن و قەبا دەستهەلاتێ دخوازن؟ ئەو چ هەلویستە؟ ئەو دەمێ گونجای کیژکە؟ چەوان دێ رایا گشتی یا پشتەڤانان بۆ کێشەیێ هێتە کۆم کرن؟ مەبەست ژ حەزوڤیانا ب راستا چییە؟ پاشی، رامان ژ ب کەسینیکرنا هەلویستان چییە؟ چەوان دادپەروەری دێ هێتە بنەجهـ کرن؟ چەوان گیانێ جۆش وخرۆشێ ل ناڤ چالاکڤانان دێ هێتە نووکرن؟

## ئێك: ئەنجامدانا كارێ پێدڤی بۆ دەستنیشانكرنا گەندەلان:

ل دەستپێکێ پێدڤییە وان کەسان دەستنیشان بکەی یێن سەرپێچییا یاسایێ دکەن، کی ژ وانە یێن سالۆخەتێ یاسایی یێ سەرپێچیێ ل سەر دهێتە ب جە ئینان؟ هشیاربی شاشیێ د وێ چەندێ دا نەکەی، چونکی ئەڤە دێ تە ئێخیتە د شاشیێ دا و دبیت تووشی لێپرسینێ ببی، چونکی هووربینی نەکرن رامانا وێ ئەوە دبیت تو یێ یێن دی و ناڤ ودەنگیا وان دئێخییە د مەترسیێ دا، یان هەر چ نەبیت تو یێ وان دکەیە د ناڤ بەحس و خەبەران دا لێ ئەو د بێگونەهن، هەرچەندە د هەلویستێن هۆسا دا هەر دێ رێژەیەکا شاشیێ هەبیت، کو ل دەستپێکێ ئەڤە ب سەرێ مە ژی هاتبوو دەمێ دیاربووی کو ناڤێن هندەکێن بۆ سەندیکا گشتی یا هەڤلێر هاتینە بلند ژ بێ ئاگەهی(سهو) بوویە و وان ب گرێبەستێن بەروەخت کار دکرن کو ئەو ژی هژمارەکا گەلەك کێم بوون و هژمارا وان ژ دوو ناڤان زێدەتر نەبوو، ئینا مە ب خۆ داخوازا لێبۆرینێ ژێ کر، دبیت ژی دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە هەمی لایەنێن مەسەلێ، بۆ دیار دبیت کو هەر شەرەکی قوربانییێن خۆ هەنە و دبیت ژی ئەڤ هەردووە ژی قوربانی یێن بێگونەهـ بن، سوپاس بۆ خودێ وان ب سینگەکێ بەرفرەهـ ئەو لێبۆرین ژ مە قەبوول کر و باش د هەلویستێ مە گەهشتن کو ئارمانجا مە یا بلند رزگارکرنا یاسایێ و ب جهئینانا بەرژەوەندیا گشتی و بەرژەوەندیا پارێزەرێن ب راستایە ژی.

د ڤێ رەوشا مە دا، سەرپێچیکەر ئەو بوون یێن د ئێك دەم دا فەرمانبەریا گشتی و پیشەیێ پارێزەریێ دکرن (ئانکو پارێزەرێن فەرمانبەر) و هژمارا وان یا تەخمینی ل ناڤبەرا چارێك و سێکا کۆما گشتیی یا پارێزەران بوو، هەر بۆ نموونە، ژ ٧٠٠-٨٠٠ پارێزەرێن ل ژوورا پارێزەرێن دهۆك توومارکری، دیار بوو کو ٢٠٠-٣٠٠ د گەل وان سەرپێچیکەران دهێنە پۆلێن کرن، دەستنیشانکرنا وان ژی نە کارەکێ ب ساناهییە، دڤێت مرۆڤ پلانەکێ دانیت و خۆ بەرهەڤ بکەت و هەر ئالاڤەکێ پێدڤی بەردەست بکەت ئەڤە ژی ب رێیا کۆمکرنا ناڤان و پێکۆلێن بەردەوام بۆ رازیکرنا جهێن تایبەتمەند یێن کارێ وان پەیوەندی ب بەرژەوەندیا گشتی و بەرژەوەندیا سەندیکایێ و پارێزەران ڤە هەی دهێتە کرن، چونکی رازینەبوونا سەرۆکان کارەساتەکا مەزنە و هەمی کار و خەباتان بەرزە دکەت و ب ئاڤێ دا بەردەدەت، پشتی هنگی ژی کارکرن بۆ پەیداکرنا نڤیسارێن فەرمی یێن لایەنێن پەیوەندیدار بۆ زوو دەستنیشانکرنا وان و دانا دەمەکێ دەستنیشانکری بۆ وان و ترساندنا وان ب دەستەلاتا یاسایێ داکو دەستپێکەریێ (دەستپێشخەریێ) بکەن و خۆ بۆ یاسایێ بچەمینن، ب راستی ژی دبێژین کو ئەو بۆ سێ جوونان دهێنە دابەش کرن، جوونا ئێکێ ئەو بوون یێن ب راستا هاتینە دوورئێخستن چونکی ماوەیێ یاسایی ب سەرڤە چووبوو ژ بەرکو وان ب ئێکجاری ناسنامەیێن خۆ یێن ژ سەندیکا پارێزەران دەردکەڤتن نوو نەکربوون و پیشەیێ پارێزەریێ نە کربوون، هەرچەندە هێشتا دو سال ب سەر دوورئێخستنا وان نە بۆری بوون ژی، لێ وان داخواز ژ مە ب خۆ کرن ناڤێن وان ل سەر لیستێ زێدە بکەین داکو بەری بهێنە دامەزراندن، خزمەتا وان بۆ پارێزەریێ بهێتە ل قەلەمدان، کو ئەو ژی هژمارەکا کێم بوون ژ پێنج کەسان نەدبۆری یان پیچەك پتر بوون، هەمی ژی فەرمانبەرێن دادگەها دەڤەرا لێزڤرینا دهۆك (محكمة منطقة أستئناف دهوك) ب تنێ بوون، ئانکو ناڤێن وان وەك خۆبەخش هاتبوون و وان ئنیەتەکا خراب نەبوویە.

لێ جوونا دووێ ئەون یێن ئەم د قۆناغا ئێکێ یان د پشکا ئێکێ دا شیاین ناڤێن وان بلند بکەینە سەندیکا گشتی ل هەڤلێر، یان ئەون یێن ب رێیا لیژنەیا فەرمیا بۆ وێ چەندێ هاتییە راسپاردن کو هەر من سەرۆکاتییا وێ دکر ناڤێن وان هاتینە بلندکرن، هندەك ژ وان ب دلێ خۆ ناسنامەیێن خۆ رادەست کربوون پشتی رازی بووین کو مەسەلە ب رژدی هاتییە وەرگرتن و بوویە مەسەلەیەکا فەرمی، رەوشا ڤان ژی باشتر بوو ژ جوونا سیێ یێن بەردەوام بووین ل سەر سەرپێچیکرنێ و رژدبوونێ ل سەر ماندەلکرنێ، بەلکی گەلەك جاران قەبا لیژنێ ژی دخواستن هەکە دیار ببیت ئەو فەرمانبەر بن، لێ سەرباری هندێ، ب رێیا نڤیسارێن فەرمی یێن فەرمانگەهێن وان و فەرمانێن دامەزراندنا وان و دەست ب کارکربوونا وان، بۆ لیژنێ دیار بوو کو ئەو فەرمانبەرن، ئەڤە ترسناکترین جوونن چونکی پێکولا سەختەکرنێ و خۆڤەدزینێ ژ یاسایێ دکەن.

## دوو: ئێکلاکرنا هەلویستێ کەسینی یان کۆمی:

دبێژن (ژیان هەلویستە)، ئەڤە ئەو گاڤا ئێکلاکەر بوو یا سەرانسەری رەوشێ گوهوڕی بەرامبەری وان گەهگیر(هەلپەرست)ێن رەوشان ب خرابترین شێوە بۆ بەرژەوەندیا خۆ ب کار دئینن و بەرژەوەندییا گشتی پشتگوهـڤە دهاڤێژن و زێدەگاڤیێ ل سەر یاسایێ دکەن، ئەو هەلپەرستێن مشەخۆرن یێن ل سەر سامانێ گشتی دژین کو ل هەمی سەردەمان هەنە، ئەڤە مەسەلەیەکا خۆرستییە، لێ ئەو تشتێ ب راستا جهێ حێبەتیبوون و چریسەتێ یە ئەوە هژمارا وان ب ئاوایەکێ بەرچاڤ و ترسناك زێدە بوویە! دبیت ژی ئەز ژێدەرێ ڤێ چەندێ بزڤرینمە هەبوونا ژینگەهەکا گەندەل یا جڤاکی، یا دبیتە هاندەر بۆ زێدەبوونا وان، هەروەسا دگەل نەترسیانێ ژی ژ ب جهئینانا یاسایێ، دێ ئەڤە بیت یا مرۆڤ پێشبینی دکەت.

«ڤێجا ئەو هەلویست چییە؟» ئەو هەلویستێ پشتا حێشترێ ڤراندی (هەروەکی عەرەب دبێژن)، ئەو بوو یا ل داوییێ مە دودلییا خۆ ئێکلا کری و مە خۆ ئێکدل کری، ڤێجا ژ بەرکو پیشەیێ مە پارێزەرییە و پشکدارێن خەمێن هەڤکارێن خۆ یێن دی نە، ئەم یێ وێ ململانێیا نەڕەوا دبینین یا ئەو باندا پارێزەرێن فەرمانبەر دکەن، وان کارتێکرنەکا نەرێنی ل سەر داهات و کێشە و پیشەیێ مە هەیە و گرنگیێ نادەنە پیشە و ناڤ ودەنگییا پارێزەرییێ، چونکی ئەو د بنەکۆك دا هەست ب ژێیاتیێ بۆ وی پیشەی ناکەن، وان باوەرییەکا تمام هەیە کو ئەو پارێزەر هاتینە داکو ب ساناهیترین و ب زویترین دەم پارەی کۆم بکەن و ل داویێ دەستێ یاسایێ دێ گەهیتە وان، کو ئەڤە ژی ژ هەڤدەستێ وان یێن کێم دا بەرامبەری هەڤدەستێ پارێزەرێن دی یا رۆهن و ئەشکەرایە، ئەڤە ژی ژ بەر دو ئەگەران:

یا ئێکێ: ئەو مەسەلێ وەسا دبینن ئەو پارێ بۆ وان ژ پیشەیێ پارێزەرییێ دهێت چ نینە بەلکی تنێ زێدەهییەکە (سەربارکەکە)، چونکی وان مووچەیێن هەیڤانەیێن گەلەك باش هەنە و ل ناڤبەرا (٧٥٠٠٠٠-٢٠٠٠٠٠٠) دینارێن عیراقی نە، ئانکو هەبوونا ژێدەرێن بنەجهێن داهاتی وەلێ دکەن ژ گەرەنتیکرنا ژیارا خۆ پشتراست بن، بەرۆڤاژی هەڤکارێن دی یێن وان ئەوێن تنێ ئەڤ پیشەیە ژێدەرێ ژیارا وانە.

یا دووێ: ئەو گرنگیێ نادەنە کێشەیێن هەڤوەلاتییان، چونکی بەرەڤانیکرن ژ زۆریلێکری و بێگونەهان پێدڤی هندێیە ل پێشیێ بەرەڤانی ب خۆ باوەری ب یاسایێ و پێدڤییا سەرورەرییا وێ هەبیت، کو ئەڤە ل سەر وان پارێزەران ب خۆ ب جهـ ناهێت، چونکی ئەو ب خۆ سەرپێچییا یاسایێ دکەن و د ئێك دەم دا فەرمانبەرییا گشتی و پیشەیێ پارێزەرییێ دکەن، هەروەکی پرنسیپێ یاسایی یێ کەڤنێ فرەنسی ژی دبێژیت (یێ چ نەبیت، چ نادەت).

یا سیێ: زانیارێن وان یێن یاسایی و شارەزایی یا وان یا پیشەیی ژ پارێزەرێن دی کێمترە، ڤێجا دێ بینی پترییا جاران ئەو پشتا خۆ ب پارێزەرێن دی یێن خودان سەربۆر گەرم دکەن ڤێجا چ ب پرسیارکرنێ

بیت یان ژی ب پشکدارکرنا وان بیت د وان کێشە و دادخوازی(دەعوا)یان دا و دابەشکرنا هەقدەستی ل ناڤبەرا خۆ، چونکی بۆ وان خەم نینە ناڤ ودەنگێ ب دەستڤە بینن، بەلکی خەما وان یا ئێکانە پارە کۆمکرنە، هەروەسا ئەم وەك بەرپرسێ لیژنا فەرعییا ڕێسایێن ڕەفتارێ پیشەیی ل سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك، مە دیت هەمی دبێزار و دلگران بوون ژ زێدەبوونا هژمارا وان سەرپێچیکەران و بێهنا وان تەنگ بوو، مە تێبینی دکر هەمی د نەرازی نە، لێ بێی هندێ بوێرن ناڤەکی ژ ناڤێن وان سەرپێچیکەران پێشکێش بکەن، ئەڤە ژی یان ژ بەر ژ ترسیانێ بوو یان ژی داکو نەکەڤنە د شەڕەنیخێن وەسا دا یێن ژ شیانێن وان مەزنتر بن.

دڤێت وێ چەندێ ژی بێژین کو هەر جار ژ بەر وێ بەرپرسیارییا مە هەی وان بلەز قەستا مە دکر و ل سەر وێ چەندێ رژدی ل مە دکرن، مە ژی تنێ ئەو پێ چێ دبوو قەستا بەرپرسێ وی دەمی یێ سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك هەروەسا نوینەرێ پارێزەران ل دهۆك ل جڤاتا سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ - عیراقێ بکەین، لێ هەردەم بەرسڤ ئەو بوو کو سەندیکا گشتی ل هەڤلێر سۆزدایە ب زووترین دەم دەستپێکەرێ بکەت و پێڕابوونەکا گرنگ و پێنگاڤەکا مەزن د دۆسییا (فەرمانبەرێن پارێزەر) دا بهاڤێت، دڤێت وێ چەندێ ژی بێژین کو ئەم دوو جاران چووینە نك نوینەرێ ژوورا پارێزەرێن دهۆك و مە پێشنیارا خوڤەکێشانێ ژ سەرۆکاتییا لیژنێ کریە هەکە چ ڕێکارێن ب ڕاستا دەرهەڤێ وان نەهێنە کرن، نەخاسمە دەمێ مە دیتی ناڤێ ئێك ژ وان سەرپێچیکەران د لیستا ناڤێن وان پارێزەران دا هاتییە یێن دادگەهێ ل سەر حسابا گەنجینەیا دەولەتێ پێسپارتن(ئینتیداب) کرین بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ گونەهبارێن هەژار[1]، یان دەمێ مە مامۆستایەك[2] دیتی پیشەیێ پارێزەریێ دکەت و سەرەدانکەران دچەوسینیت و هەقدەستێن ئاشۆپی ژێ وەردگریت کو هندەك جاران ئەو کرێ ژ ڕێژەیا یاسایێ ڕێپێدای(ئانکو ڕێژەیا ٢٠٪ ێ) دبۆریت، وی دەمی هەرچەندە مە ئەو گازی دکرنە بەرامبەری لیژنێ و مە ب دژواری پاشڤە دبرن کو ئەو تشتێ ئەو دکەن سەرپێچییا یاسایی یە و کارەکێ بێ ڕەوشتییە، لێ هەلویستێن جودا جودایێن وان بۆ مە تشتەکێ نشکاڤەیی بوون، چونکی هندەك ژ وان قەب دخواستن و ب دفنبلندی ڤە دگۆتن کو ئەم نەشێین چ لێ بکەین چونکی هەمی وێ چەندێ دکەن، لێ دا بینی ئێکێ دی یێ دەروێ دکەت و سووندێ دخۆت کو تنێ یێ ب گرێبەست وی کاری دکەت، ئێکێ دی ژی داخواز ژ مە دکر دگەل دادپەروەر بین و ئامادەبوونا خۆ دەردبڕی ناسناما خۆ ڕادەست بکەت هەکە ئەم بشێین ناسنامەیێن هەمییان ڤەکێشین و کار ب پرنسیپێ وەکهەڤیێ بکەین، هەروەسا هندەکێن دی ژی هەردەم هەجەتا وێ چەندێ دگرتن کو ژ بەرکو ئەو مافپەروەرێن فەرمانگەهێن خۆنە و داهاتێ وان یێ دارایی یێ کێمە، ژ بەر هندێ پارێزەریێ دکەن وەکی وان نوشدارێن فەرمانبەر ئەوێن سپێدێ ل نەخۆشخانەیێن گشتی یێن حکومی و ئێڤاری ژی ل کلینیکێن تایبەت(اهلی) ل سەر کیسێ خۆ یێ تایبەتی و ب کرێ یێن باش کار دکەن، وان ئەڤ هەمی بەهانە بۆ هندێ دئینان داکو بشێن د ئێك دەم دا فەرمانبەرییا خۆ یا سپێدەهییان و پارێزەرییا خۆ یا ئێڤارییان بکەن و ب ڤی ئاوایی بەردەوام بن، هەتا ڕۆژا ژڤانێ هاتی، ڤێجا وێ ڕۆژێ مە گۆتە هێژایێ نوینەرێ ژوورا پارێزەران کو شاندەکێ سەندیکا گشتی یا پارێزەران ل هەڤلێر ڕۆژا پاشتر دێ سەرەدانا مە کەت بۆ زانینا کێشەیێن سەندیکایێ و دێ بزاڤا چارەکرنا وان کەت و هەکە وە هەر سکالایەك یان پرسیارەك هەبیت هوون دشێن پێشکێشی وێ لیژنا پەیوەندیدار بکەن، چونکی ب سەرۆکاتییا جێگرێ نەقیبێ سەندیکایێ یە.

وی دەمی پێدڤی بوو ئەم هەلویستێ خۆ ئێکلا بکەین، چونکی ئەڤە ئەو دەلیڤە بوو یا ژ مێژە ئەم ل هیڤیێ و ب هەر بهایەکی بیت نابیت ژ دەست خۆ بکەین، لێ دەمێ مە هزرا خۆ د لایەنێ دی یێ مەسەلێ دا دکر مە هزرا قەبارێ وێ ڤێکنەکرن و دەرز

و گڤاشتنێ دکر یا ئەو مەسەلە ل پشت خۆ دهێلیت و کا ئەو گڤاشتن و هەلویستێن جودا جودا دێ ب چ قەبارەیێ بن، دڤێت وێ چەندێ ژی ژ بیر نەکەین کو گەلەك ژ وان و ب حوکمێ سالێن هەڤالینی و پێکڤە کارکرنێ، ئەو هەڤکاری و هەڤالینی نامینیت و دبیت ببیتە نەیارییەکا بەرچاڤ و ئەشکەرا، ڤێجا تو بێژی ئەم دەرهەڤێ ڤی ئەرکی دەرکەڤین؟

ب ئاوایەکێ گشتی، مە پێکۆل دکر وان پرسیارکرنان پشتگوهڤە بهاڤێژین یان ژی پاشبێخین هەتا دەمێ وان دهێت، مە مەسەلە بۆ وێ دەلیڤە یان گاڤا گونجای یا بهێت دهێلا دەمێ دکەڤینە بەرامبەری هەلویستەکێ وەسا یێ پێدڤی ئێکلاکرنێ بیت، ژ بەر هندێ، وێ رۆژێ هەر ژ نیڤرۆ هەتا درەنگی شەڤێ هەمی کار و خەباتا مە کۆمکرنا مەزنترین هژمارا بەردەستا وان فەرمانبەران بوو یێن ناسنامەیێن پارێزەریێ هەین، ئینا مە ب پشتەڤانیا بیردانکا خۆ و هندەك هەڤالێن گەنج، نەخاسمە یێن ژ مە بچویکترێن[٣] پتر ژ مە زانیاری ل سەر وان سەرپێچیکەران هەین، چونکی ب راستی مە گەلەك ژ ون نە دنیاسین، مە کۆمەکا ناڤێن پارێزەرێن خودان ناسنامە کۆم کرن و ب ڤێ چەندێ شیاین ٧٩ ناڤان کۆم بکەین کو پێدڤی بوو سەندیکا گشتی هووربینیێ د ناڤێن وان دا بکەت کا ئەرێ ئەو د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکەن یان نە.

هەر چەوان بیت، وێ رۆژا داوی یا هەیڤا خزیرانا سالا ٢٠١١ ێ مە هەلویستێ خۆ ئێکلا کر، وی دەمی ب ژۆرکەڤتین و ئەم ژ وێ کۆمبوونا ب ئامادەبوونا لیژنا مێهڤان یا سەندیکا گشتی یا هەڤلێر هاتییە گرێدان گیرۆ بووین و گەلەك پارێزەران داخـواز ژ شاندێ سەندیکا گشتی دکرن ب رژدی هەلویست بەرامبەری ڤێ دیاردا ترسناك (ئانکو ئەوێن د ئێك دەم دا پارێزەریێ و فەرمانبەریێ دکەن) بهێتە وەرگرتن، لێ بەرسڤا سەرۆکێ شاندی یا رۆهن و ئەشکەرا بوو، وی گۆت: «براینۆ.. هوون پارێزەرێن دهۆك تنێ بێزارییا خۆ دەردبرن، لێ سکالایێن فەرمی پێشکێش ناکەن داکو ڤەکۆلینێ تێدا بکەین»، دوبارە دەنگەدەنگ ل

ناڤبەرا ڤی و یێ هە بلند بوو، پاشی مە دەستێ خۆ بلند کر و مە دستویری خواست رێیا مە بهێتە دان پشکداریێ د گەنگەشەیێ دا بکەین، ئەم هەتا وێ گاڤی ژی د دوودل بووین کا ئەرێ لیستا من ب ناڤێن وان بەرگومانان یێن سەرپێچییا یاسایێ کرین ئامادە کری پێشکێش بکەین یان نە؟ وی دەمی من دەست ب پێشگۆتنەکا ئاسایی کر و من خۆ دانیاسین و کارێ لیژنا خۆ دیار کر و رۆهن کر کو ئەڤ مەسەلە بوویە دیاردەیەکا بەربەلاڤ و ئەگەرێ سەرەکیێ وێ وێ ژی ژ بەر وان هەلبژارتنایە یێن سەندیکا ب لقێن خۆ دکەت بۆ هەلبژارتنا نەقیبێ سەندیکایێ و ئەندامێن جڤاتا وێ و بەرپرس و ئەندامێن لقێن وێ، چونکی وی دەمی هەمی یاسا دهێنە پشتگوهڤەهاڤێتن و هەمی بزاڤێ دکەن هەمییان خۆ فەرمانبەران ژی، داخواز کەنە دەنگدانێ، چ پێ نەڤێت بەری هنگی ژی کاری بۆ ئەندامەتییا وان د سەندیکایێ دا دکەن ڤێجا خۆ ل سەر کیسێ کاندید یان لایەنێن دی ژی بیت، مە دیت ژی کو رۆژا هەلبژارتنان فەرمانبەر و ئەفسەرێن پۆلیسان و پێشمەرگەیان و.. هتد. دەنگێ خۆ ددەنە ڤی و یێ دی، لێ نۆکە گەهشتییە سەرێ دفنێ و دڤێت ب هەر بهایەکی بیت ڤێ ئالۆزیێ ب داوی بینین، مە گۆتە وان وە ناڤ دڤێن! دێ باشە، هەر نۆکە دێ لیستەکێ ب ناڤێ وان پێشکێشی وە کەم کو ژ دوهی وەرە من ل سەر گومانلێکریان ئامادە کریە، وی دەمی بیستەکێ بێدەنگی کەڤتە قولاچێن هۆلا کۆمبوونێ و حێبەتیبوون ل سەر دێمێ هەمییان یێ دیار بوو، هندەکان پشتەڤانی کر و ژ کەیفان دا دەستقوتان، لێ هندەکێن ل هەوارییان دا و خۆ نەرازی کرن و ژ هۆلێ دەرکەڤتن، هەروەکی یێ دبێژن: «هوون کینە هەتا ل دژی مە راوەستێن یان رێگریێ ل مە بکەن پیشەیێ خۆ نەکەین؟»».

پاشی لیژنێ لیست ژ مە وەرگرت و سۆزدا هووربینیێ د مەسەلێ دا بکەت، هەرچەندە ژی کو باش هووربینی د دەستنیشانکرنا هندەك ناڤان دا نەهاتبوو کرن ژ بەرکو مە ئەو دەستهەلات نەبوو بۆ ب دەستڤەئینانا وان ناڤان و فەرمانێن دامەزراندنا وان پەیوەندیێ ب

لایەنێن پەیوەندیدار بکەین، لێ سەندیکا پارێزەران تێکەهشتن بۆ ڤێ چەندێ هەبوو و ئەڤ مەسەلە ل بەرچاڤ وەرگرت، ئینا من لیستەکا دەستپێکێ ئامادە کر و کار تێدا کر ئەڤە ژی ب رێیا پێگیرکرنا وان پارێزەران بوو کو بەلگەنامەیێن وەسا بینن پێ بهێنە سەلماندن ژ لایێ لایەنێن دەستنیشانکری ڤە نەهاتینە دامەزراندن، ب ڤێ چەندێ دیار بوو کو هندەك ژ وان د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکەن، ئینا ئەو ژ پارێزەریێ هاتنە دوورئێخستن، لێ دیار بوو یێن دی هێشتا ب گرێبەست کار دکەن و سەرباری مووچەیێن وان یێن زۆر، لێ نە فەرمانبەرێن گشتی نە، هەر بۆ نموونە، ئەوێن ماوەیێ دوو سالانە ل کۆمسیۆنا بلندا سەربەخۆییا هەلبژارتنان کار دکەن.

ب ئاوایەکێ گشتی، ئەو لیستا دەستپێکێ ئێکەمین پێنگاڤا وێرەك بوو و پالدەرەك بوو کو سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ پێنگاڤێن فەرمی و رژدتر و پتر جهێ باوەریێ بهاڤێژیت.

## سێ: دەستنیشانکرنا دەمێ گونجای بۆ راگەهاندنا روو ب رووبوونێ.

ل سەر دەمێ گونجای، مە ژ دل بۆ وی دەمێ چاڤەرێکری کار کر، دبیت ئێك بێژیت، ئەو دەمێ گونجای کیژ بوو؟ دەمێ گونجای ئەوە باشترین دەم بهێنە دەستنیشان کرن کو پێشبینی دهێتە کرن پێکۆلا تە دێ سەرکەڤتنێ تێدا ئینیت بۆ نەهێلانا گەندەلیێ، هەر بۆ نموونە، هەیاما من ئەو لیستا دەستپێکی راگەهاندی گونجایترین دەم بوو بۆ نەهێلانا گەندەلیێ کو ئەڤە ژی ئێکسەر پشتی راگەهاندنا سەرۆکێ هەرێمێ هێژا مەسعود مستەفا بارزانی بوو بۆ بەرنامێ چاکسازیا سەرانسەری د هەمی کەرت و سازیان دا ل رۆژا سێشەمبی رێکەڤتی ٢٠١١/٦/١٤ێ، ڤێجا هەکە بلندترین دەستەلات دەستپێکەری بۆ وێ چەندێ کر، باشترە ئەڤە ببیتە پالدەرەك بۆ یێن دی، هەرچەندە ڤێ چەندێ گرێدانەکا ئێکسەر دگەل یا دی نینە، لێ سەرانسەری مەسەلێ د ئێك چەپەر دایە، چونکی دژایەتیکرنا گەندەلیێ ب کارێ هەڤپشك و گشتی نەبیت ناهێتە کرن، ڤێجا هەکە هەر بەرپرسەك چەند یێن نزم و چەند یێ بلند بیت کار بۆ ب جهئینانا یاسایێ کر، هەمی سازی دێ ژ دیاردە و ئێشا هەمی جۆرێن گەندەلیێ رزگار بن، لێ پرسیار ئەوە ئەرێ هەکە مە ئەڤ لیستە بەری بەرنامێ چاکسازیيان یان هەتا سالێن بەری هنگی ژی راگەهاندبا، ئەرێ سەندیکا پارێزەران و سازیێن دی دا وەکی ئەڤرۆ ب ئەرێنی دا بەرێ خۆ دەنە ڤی هەلویستی؟ ئەز پشتراست دیتن وبۆچوونا خۆ یا کەسینی دیار دکەم و دبێژم (نەخێر).

ژ بەرکو ئەڤرۆ لڤینا جڤاکی یا جیاوازە و دکەڤیتە بن باندۆرا هزرەکا نوو و نەشێوازەکێ رۆهن و ئەشکەرا و د هەمی سازیێن حکۆمی و سازیێن جڤاکێ سڤیل و گڤاشتنێن جاددێ و ئۆپۆزسیۆنێ و هەتا د حزبێن حوکمدار دا ژی، هەمی یێ کار دکەن بۆ موخل و بێژینکرنا ڤێ قۆناغێ، هەروەکی ئەو تشتێ دوهی رێپێدای ئەڤرۆ یێ قەدەغە بیت، هەرچەندە یاسایێن گشتی هەر ئەو یاسانە، هەردەم وان کاران حەرام دکەن و سزایێن خۆ هەنە، وەسا دیارە ژی شۆرشێن بهارا عەرەبی دەنگڤەدانەکا رۆهن و ئەشکەرا ل سەر جاددا کوردستانی هەبوویە، لێ رامانا ڤێ ئەو نینە کو دڤێت ئەم ل دەمێن دی ب ئێکجاری دەستان داهێلین و بەرسینگێ گەندەلیێ نەگرین، لێ پێدڤییە ئەم دهشیار بین، چونکی گەندەلکاران ژی رەهـ وریشالێن خۆ کوور داهێلاینە ناڤ عەردی.

هەر چەوان بیت، ئەو چاکسازی بوونە ئەگەرێ دامەزراندنا دەستەیا دەستپاکیێ یا تایبەت ب هەرێمێ ڤە و دانانا یاسایێن پەیوەندی ب نەهێلانا گەندەلیێ ڤە هەین و هندەك یاسایێن دی یێن پەیوەندی ب رێسایێن رەفتارێ فەرمانبەریێ و یێن دی ڤە هەین...

## چوار: کۆمکرنا رایا گشتی یا پشتەڤانان بۆ کێشەیا خۆ:

ژ بەرکو سەندیکا پارێزەران ب ترسناکترین سەندیکا دهێتە ل قەلەمدان، چونکی وان پارێزەران ب خۆ ڤە دگریت یێن ئەرکێ سەر ملێن وان بەرەڤانیکرنە ژ سەروەریا یاسایێ و دژایەتیکرنا

هەمی جۆرێن زۆلم و زۆری و ژ ناڤبرنا هەمی جۆرێن گەندەلیێ، ئەو پێغەمبەرێن(هنارتیێن) راستیێ و دادپەروەریێ نە و پشکدارێن سەرەکی نە د کارێ دادوەریا کوردستانێ دا، ژ بەر هندێ، هەکە گەندەلی گەهشتە وان پارێزەران، دێ بیتە گەف ل سەر سەرانسەری کەرتێ دادوەریێ و پاشی ل سەر جڤاکی و سلامەتیا وی، ژ بەر هندێ، پێدڤی بوو ئەو پارێزەرێن تووشی ڤێ دەردەسەریێ بووین بهێنە لێك کۆم کرن بەرامبەری وان سەرپێچیکەران، ڤێجا چەند بنگەهـ یێ بەرفرەهـ بیت، هەلویستێ جەماوەری هند دێ یێ پشتەڤانێ تە بیت بۆ روو ب رووبوونا سەرپێچیکەران، ژ بەر هندێ پشتەڤانی بنواشەیە، چونکی هەکە مرۆڤی پشتەڤاتیا زۆرینەیێ نەما بۆ وی تشتێ دکەت، کارێ وی، خۆ هەکە یێ دروست بی ژی، گەفا ژ ناڤچوون و بەرزەبوونێ ل سەرە، ژ بەر هندێ، سەرباری هندێ کو هەر ژ دەستپێکێ مە هەست کریە دەمێ مە ئەو لیست راگەهاندی، مە خۆ دانایە بەر دەرێ تۆپێ، لێ ب رێیا پەیڤێن پشتڤانیکرنێ ژ لایێ هەمی هەڤالێن پارێزەرڤە، بەلکی خۆ هندەك جاران ژ لایێ سەرپێچیکەران ب خۆ ڤە ژی یێن دانپێدان ب سەرپێچیا خۆ دکرن و پەشێمانبوونا خۆ ژ وێ کریارێ دەربرین و ئامادەیی یا خۆ بۆ رادەستکرنا ناسنامەیێن دیار دکرن، باوەرییەکا تمام بۆ مە چێ بوو کو کارێ مە کارەکێ بهادارێ مرۆڤاتیێ ب راستایە، بەلکی هەتا گەلەك رێڤەبەرێن مە سەرەدانا وان ژی دکرن و دەستخۆشی ل ڤێ کارێ مە دکرن وان ب کارەکێ (نیشتمانی، چاکسازیا جڤاکی، ڤیانا ڤی پیشەی، دژایەتیکرنا جۆرێن گەندەلیێ، هاندانا خودان پیشەیێن دی بۆ پاراستنا پیشەیێن خۆ داکو چاڤ ل پارێزەران بکەن، کارەکە یێن دی نەکرییە) یان هەر ناڤەکێ دی یێ تە دڤێت دانە سەر ل قەلەم ددان، هۆسا، هەرچەندە لایەنێ دی گڤاشتن ل سەر مە هەبوون، لێ ڤێ هاندانێ وەرەیێن مە بلند دکرن، بەلکی ئەم هان ددان پتر پێشکێش بکەین و ل خالەکێ نەراوەستێین و مە وەرارەکا بەرچاڤ نەبیت، ئەڤ بنگەهێ مللی یێ هەڤکارێن تە یێن دەردەسەری ژ ڤێ دیاردێ دیتین و پشتەڤانیا تە دکەت و بەرێخودانێن پشتگیریکرنێ ژ لایێ یێن دیڤە، گەلەك جاران ناڤ و زانیاری ل دۆر سەرپێچیکەران پێشکێشی لێژنا مە دکرن و پێدڤی بوو ئەم هووربینیێ ل سەر بکەین، بەلکی نەچار دبووی ژی دەستهەلاتێن وێرەك بدەیە خۆ چونکی تو دزانی کارێ تە کارەکێ هەژییە و تو یێ راستی و یێ دی یێ شاشە، ئەڤە بوو یا ئەم پالداین داخوازا هاریکاریێ هەتا ژ هندەك سەرپێچیکەران ب خۆ ژی بکەین، کو ئەو ناڤێن هەڤالێن خۆ یێن سەرپێچیکەر پێشکێش بکەن، بەرامبەری وێ چەندێ هنارتنا ناڤێن بۆ ڤۆناغێن گیرۆتر بهێنە پاشئێخستن، هەروەکی مە د بەرپەرێن بۆری دا ئاماژە ب وێ چەندێ دای.

ب ئاوایەکێ گشتی، ژ رەهـ ورویشال هەلکێشانا گەندەلیێ پێدڤی هێز وحەزوڤیانەکا مەزن و هاریکاریا هەمی کەسانێن ب روومەتە، هەکە نە، ب راستی قوربانیدان دێ یا مەزن بیت.

## پێنج: حەزوڤیانا ب راستا و خۆبەخش:

ب راستی، هەبوونا حەزوڤیانا ژ دل و خۆبەخش شەنگستێ سەرکەڤتن و سەرنەکەڤتنا سەرانسەری پرۆسێ یە، ب هەبوونا حەزوڤیانا ب راستا بۆ یێن هەر کارەکی دکەن، چ یێ نەڤێت دێ بیتە ئەگەرێ سەرکەڤتنێ، خۆ هەکە ئەنجامێ داویێ وێ روو ب رووبوونێ پشکەك ژی بیت، ئەڤ حەزوڤیانە ژی نابیت بێی رازیبوونا تمام یان وان کەسان بیت یێ رادبن، هەروەسا داکو ئەڤ حەزوڤیانە ب رازیبوونەکا تمام بیت، پێدڤییە حەزوڤیانەکا خۆبەخش و بێ بەرامبەر بیت و بەرامبەری چ گوژمێن پارەی نەبیت، لێ بۆ پالدان و پێشڤەبرنا وێ حەزوڤیانێ، هندەك جاران ئەوێن یێ رادبن پێدڤی پەیڤێن هاندانێ یێن نەفەرمی نە ژ لایێ وی جەماوەرێ مفا ژ وێ پرۆسێ دیتی، یان هەتا نڤیسارێن فەرمی یێن سوپاسنامە و رێزگرتنێ بۆ قوربانیدانا وان د روو ب رووبوونا گەندەلیێ دا، کو مەبەستا مە یێ خۆبەخشییە، ئانکو د بنیات دا ئارمانجا کەسێن ب ڤی کارێ روو ب رووبوونێ رادبن

بۆ ب دەستڤەئینانا پاداشتەكێ مادی نەبیت، هەكە نە، تنێ دێ بنە هندەك فەرمانبەرێ نەهاندەرێن كارەكی ئەنجام ددەن یێ چ داهێنان بۆ دانانا باشترین رێ و میكانیزمان بۆ نەهێلانا گەندەلیێ ب خوڤە نەگریت، لێ رامانا ڤێ ئەو نینە وان هەر چ نەبیت مافێ ب دەستڤەئینانا خەرجیێن هاتن وچوونا خۆ نەبن، لێ نەبوونا ڤان خەرجییان ب خۆ ژی، دڤێت وان نەدەتە پاش ژ بەردەوامبوونێ د ڤی كاری دا، ڤێجا خۆ ل سەر كیسێ وان یێن تایبەتی ل سەر دەم و زەحمەتی و دارایی یا وان ب خۆ ژی بیت، چونكی كارێ وان ژ هەر كارەكێ دی بلندترە، ب رامانەكا دی، دڤێت باوەرییەكا تمام بۆ چێ ببیت كو روو ب رووبوونا گەندەلیێ ژ لایێ وان ڤە بوویە كێشەیا وان یا سەرەكی و ئەم گەرەنتیێ ددینە وان كو ئەو دێ هەست ب خۆڕازیبوونێ كەن و دێ هەست كەن ژی كو جیاوازی ل ناڤبەرا وان و یێن دی هەیە، چونكی كێمن ئەوێن دوێرن روو ب رووبوونێ بكەن، نەخاسمە ژی هەكە گەندەلخواز ل ناڤ جڤاكی مشە بن.

كارێ لیژنا فەرعی یا دهۆك یا سەر ب سەندیكا پارێزەران/ لقێ دهۆك ڤە یا بۆ دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ هاتییە راسپاردن، ب راستی كارەكێ خۆبەخش بوو و ئارمانجا سەرەكی ژێ پێشئێخستنا پیشەیێ پارێزەریێ بوو ژ هەر عەیبەلۆكرن و كرێتكرنەكێ ژ لایێ هندەك پارێزەرێن سەرپێچیكەرێن یاسایێ ڤە، هەروەسا تنێ بۆ سەرفەرازكرنا ڤی پیشەی بوو، ژ بەر هشیارییا زۆر ئەندامێن ڤێ لیژنێ (ل پێشیا وان هێژا وریا سەعدی ئەحمەد نەقیبێ پارێزەرێن هەرێما كوردستانێ یێ دەستێ هاریكاریێ درێژ كری و هەر ژ دەستپێكێ ل سەر ڤێ دۆسیێ یێ رژد بوو، هەروەسا دڤێت رۆلێ هندەك ئەندامێن جڤاتا سەندیكایێ ژ بیر نەكەین، بلا سۆروسۆر ژی بێژین نەهەمیان، چونكی هندەكان هەلویستەكێ هەڤدژ و نەرێنی ژێ هەبوو، بەلكی مخابن ئاستەنگ ژی ل بەرامبەری ڤێ سەربۆرێ چێ دكرن و پشتەڤانیيا لایەنێ دی دكرن، دبیت ژی بەرژەوەندیيا وان یا كەسۆكی ب سەر بەرژەوەندیيا گشتی و ب سەر بەرژەوەندیيا زۆرینەیا مەزن یا وان پارێزەران كەڤتبوو یێن وان نوینەرییا وان دكرن، هەروەسا رۆلێ ئەرێنی یێ ئەرشەد تاهر هەمزانی بەرپرسێ ژوورا پارێزەران ل دهۆك د ڤی چارچۆڤەی دا)، سەندیكا پارێزەرێن كوردستانێ، هەروەسا بەرپرسێ ژوورا پارێزەرێن دهۆك ژی ب نڤیسارا خۆ یا هژمارە ٤٦٩٩ یا رۆژا ٢٠١١/١٢/٨ێ پاداشتەكا سوپاسیكرن و رێزگرتنێ ئاراستەی هێژایان ئەندامێن لیژنا راسپاردییا ڤێ دۆسیێ كرن و تێدا هاتییە:

(رەنج و خەباتا وە یا رێكخستی و بەردەوام د ئەنجامدانا ئەركێ خۆ دا بۆ دەستنیشانكرنا وان پارێزەران كو ئەو ب خۆ فەرمانبەر ژی بوون د سازیێن حكۆمی یێن هەرێمێ دا، جهێ رێزگرتنا مەیە و ڤێ رێزگرتنێ پێشكێشی هەوەیێن هێژا دكەین، هیڤیخوازین ل سەر كارێ خۆ بەردەوام بن، سەخمەراتی پاراستن و پێشئێخستنا پیشەیێ پارێزەریێ).

ئەڤ سوپاسنامە ل سەر هەمی تایێن سەندیكایێ ل سەرانسەری پارێزگەهێن هەرێما كوردستانێ هاتە گشتاندن و لبەك ژێ د دۆسییا كەسینی یا وان پارێزەرێن ناڤبری دا هاتە پاراستن.

## شەش: خۆدویرئێخستن ژ ب كەسینیكرنا هەلویستان:

ئەڤ بڕگەیە ئێكە ژ گرنگترین رێنمایێن پێدڤییە مرۆڤ ل دووڤ بچیت و كاری پێ بكەت داكو ژ ڤەشاشتن و شوینوارێن رووب رووبوونا تاكە كەسی رزگار ببیت، ئەڤە ژی ب رێیا وێ چەندێ نێرین ئاراستەی هەمی پشتەڤانان بهێنە كرن بۆ روو ب رووبوونا گەندەلیێ یان ب كێمی ئاراستەی لیژنا پەیوەندیدارا ڤێ دۆسیێ بهێنە كرن، ل دەستپێكا ڤێ مەسەلێ ئەم نەچار بووین ب تنێ خۆ د ڤی بابەتی هەلكەین، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ ب نەرێنی یان ئەرێنی بەرێ رۆناهیێ بكەڤیتە مە، هەكە وی دەمی شیان هەبان ڤی هەلویستی بكەینە هەلویستەكێ گشتی، ب سینگەكێ بەرفرەهـ دا پێشوازییا وێ چەندێ كەین، لێ مە چ رێ یێن دی نەبوون، چونكی ل دەستپێكا

هەر داخوازییەکێ یان دۆزەکا دەستپێنکی هەمی وەك بینەر بەرێ خۆ ددەنێ و دمیننە ل هیڤییا ئەنجامان و کا ئەرێ کەتا تەرازی ب کیژ لایی دا دێ هێتە داکێشان، ڤێجا هەکە دیتن زیان د کێشەیێ دایە، هەمی دێ حاشاتیێ ل خودانێ وێ کەن و خۆ ژێ دەنەپاش، لێ هەکە دیتن یا دبەرژەوەندییا وی دایە و کێشەیا وی د قۆناغا سەرکەڤتنێ دایە، دێ ملێ خۆ دەنە ملێ وی و دێ خۆ دەنە دگەل، ئەم کەسێ ب ڤێ چەندێ عەیبەلۆ ناکەین، چونکی نەریتێ مرۆڤی و خۆرستێ وی دهۆسانە.

ب ئاوایەکێ گشتی، ل دەستپێکێ بەرهنگاری گڤاشتنان بووین، هەتا وێ رادەی گەلەك هەڤکار و هەڤال و کەس وکارێن مە پەیوەندی ب مە دکرن و دالەهی لێ مە دکرن هەروەکی (خودێ نەکەت) ئەو تشتێ ئەم دکەین تاوانەك بیت، ئەم ژی ل سەر گەنگەشەیان دبەردەوام بووین و ل دووڤ شیانان مە پێکۆل دکر مەسەلێ نەکەینە مەسەلەیەکا کەسینی، مە دگۆتنێ: (براینۆ.. مە ئەڤە تنێ بۆ ب جهئینانا یاسایێ کرییە و ئەرکێ یاسایی یێ مە وەك سەرۆکێ لیژنا رەفتارێ پیشەیی یێ فەرعی ل دهۆك ڤێ چەندێ ژ مە دخوازیت)، هندەك جاران مەسەلە دگەهشتە رادێ تۆرەبوونێ و شەرەدەڤێ، دا بینی ئێك یێ ب ناڤێ هەڤالینیێ یان مرۆڤانیێ گازندێ دکەت، ئێکێ دی یێ هەلویستێ مە ب دوور ژ رەوشتی و بەلکی فهێت ژی وێنە دکەت چونکی ناڤێن وان هاتینە بلند کرن و سکالا ل دژی وان هاتینە توومارکرن و ئەم بێ نان وخوێ ژی نیشا داین، وێ چەندێ ماندەل ناکەین ژی کو وی دەمی مە خۆ لێ تۆرە دکر و مە بەرسڤ وان ددا و دگۆتێ کو رەوشت ئەوە مرۆڤ دەست ژ تالانکرنا مالێ گشتی بەردەت و بۆ خودێ هەڤالێ خۆ بڤێت، چونکی هەر ئەوە یێ شیانا دانا رزق و دان ودکاکێ وان هەی. (ان یتقی الله فی زملائه فهو ینافسهم فی قوتهم و ارزاقهم).

لێ پتریا وان روو ب رووبوونان دگەل هندەك برایان بوو کو وەك ئەفسەرێن سەربازی کار دکرن، پاشی هندەکێن دی پێکۆلا کۆمکرنا ئیمزایێن پارێزەران کرن و داخواز کرن ئەندامێن دەستەیا کارگێڕییا سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك بهێنە گوهۆرین، لێ هەر زوو ئەڤ پێکۆلە ژی بەرهنگاری شکەستنەکا مەزن بوو، چونکی ئەوێن داخوازا ئیمزاکرنێ ژێ هاتییە کرن رەت کربوون، ئەوێن ئیمزا کرین ژی هژمارەکا کێم بوون و تنێ ئەو بوون یێن زیان ژ بریارێن لیژنا فەرعی دیتین.

هۆسا گڤاشتن دبەردەوام بوون و هەتا مەسەلە گەهشتە وی رادەی هندەك ژێ ب ئەشکەرایی گەفا ب کارئینانا هێزێ بکەن، لێ مە گرنگی نەداێ، چونکی ئەم دپشتڕاست بووین کو ئەوێ راست بیت و ل سەر هەقیێ بیت و هێزا یاسایێ ل پشتا وی بیت، دێ یێ سەرفەراز و سەرکەڤتی بیت، بەرۆڤاژی یێن دی یێن سەرپێچییا یاسایێ دکەن، دڤێت ئەو بترسن، چونکی ئەو بەرامبەری هێزا یاسایێ لاوازن، داکو یێ دادپەروەریێ بەرامبەری وان یێن روو ب رووبوونێ دگەل دکەی، دڤێت تو یێ بابەتی(ئۆبجێکتیڤ) بی، بابەتیبوون(ئۆبجێکتیڤیزم) ژی ل سەر تە پێدڤی دکەت دەلیڤە و دەمەکێ گونجای بدەیە وی کەسێ تە دڤێت ئەو ب دلێ خۆ ناسنامەیا خۆ رادەست بکەت، دڤێت تو وان رێکاران ژی رابگەهینی دەرهەقێ وان یێن سەرپێچیێ دکەن و ئەو راگەهاندن ژی گەلەك جاران بهێتە بەلاڤ کرن، ڤێجا چ ب هەلاویستنا نڤیسارێن سەندیکا گشتی و فەرعی ل تابلۆیێ ئاگەهدارییان یێ لقێ سەندیکایێ ل دهۆك بیت یان ژی ب رێیا دەزگەهێن جودا جودایێن راگەهاندنێ بیت داکو پەیام ب زووترین دەم بگەهیت.

ب راستی ژی هەر ل دەستپێکێ مە پارێزەرێن دهۆك بۆ رۆژنامەیێن خۆجهی و هندەك جاران ژی بۆ رۆژنامەیێن عیراقی یێن ل بەغدا دەردکەڤتن و ب هەردو زمانێن عەرەبی و کوردی رادگەهاندن هەبوون، هەر بۆ نموونە، ئەڤە رۆژنامەیا(ئەڤرۆ)یە یا ب زمانێ کوردی ل بازێرێ دهۆك دەردکەڤیت، پێشەنگا رۆژنامەیێن خۆجهی بوویە د ڤەکۆلینێن رۆژنامەڤانی و چاڤپێکەڤتنان دا ڤێجا چ دگەل ئەندامێن دەستەیا کارگێڕییا لقێ دهۆك یێ سەندیکایێ یان ژی دگەل سەرۆك و ئەندامێن لیژنا پەیوەندیدار و تایبەتیبا

دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ بیت، ئەو ژی د هژمارا خۆ یا ٨٦٢ یا رۆژا ٢٠١٢/١/١٠ ێ دا، هەروەسا رۆژنامەیا (المدی) یا عیراقی هژمارە ٢٣٧٢ یا رۆژا ٢٠١٢/١/٢١ێ، یان کۆڤارا حەفتیانەیا (الصوت الاخر) یا عیراقی هژمارە ٣٧٢ یا ٢٠١٢/١/٢٥ێ، مە د وان رۆژنامە و کۆڤاران دا ب ئەشکەرایی و ل رۆژا رۆهن هەر پێنگاڤەکا مە د وێ دۆسیێ دا دهاڤێت و هژمارا ناڤێن پارێزەرێن هەرێمێ یێن ژ لیستا پارێزەران هاتینە دوورئێخستن و نڤیسارێن هاتی ب هژمارە و دیرۆکا وان ل دۆر سەرپێچیکەران و دەمێ بۆسەرپێچیکەران هاتییە دەستنیشان کرن داکو ناسنامەیێن خۆ رادەست بکەن یان دەست ژ فەرمانبەریێ بەردەن بەلاڤ دکرن، دەرگەهـ ل بەر وان یێ ڤەکری بوو فەرمانبەریا گشتی یان پیشەیێ پارێزەریێ هەلبژێرن.

## حەفت: بنەجهکرنا دادپەروەریێ ب وەکهەڤیێ ل ناڤبەرا هەمیان:

گرنگترین تشت د سەرانسەری ڤێ کێشەیێ دا ئەو بوو فەرمان دەرهەڤێ هەمیان و وەکی ئێك بهێتە ب جهـ ئینان ڤێجا وان ئەو ل چ پۆست بن و چ تاگری و نێزیکاتی ژ مرۆڤی هەبن، هەروەسا ئەو چەند بۆ هەمیان بهێتە راگەهاندن داکو هەست ب راستی و رژدیا مەسەلێ بکەن و هەست بکەن ژی کو ئەوێن ب وی کاری رادبن یێ ل سەر هەمیان ب جه دئینن و ئەڤە بوو یا مە ب دروستی ب جهـ ئینای و ئەم گەلەك پێدڤی هندێ بووی کو هەمییان باوەری ب مە بهێت، ژ بەر هندێ، مە ناڤێ دوو کەسان کرە د لیستا دووێ دا کو ژ هەر ئێکێ دی نێزیکی مە بوون، ئێك ژێ برازایا من بوو و یێ دی ئێك بوو ژ پسمامێن من، ڤێ چەندێ دەڤێن هەمیان دانانە سەرێك و هەر ئێکێ هزر دکر خۆ ژ ڤێ کریارا مە نەرازی بکەت و مە گونەهبار بکەت، هەڤالێن وی دا بێژنێ کو مەسەلە هەمیان ڤەدگریت و ئارمانج ژێ چاکسازیا ب راستایە و دگۆتن: (جوامێرۆ.. وی مەسەلە ل سەر نێزیکترین کەس وکارێن خۆ ب جهـ ئینایە، ڤێجا چەوان ل سەر تە و یێن دی ب جهـ نائینیت)، دبیت ئەڤە بیت یا دڤێت هەر ئێك ژ مە بکەت داکو هەر ئێکێ دی گوهداریا پەیڤا وی بکەت و وێ پەیڤێ کاریگەریا خۆ ل سەر هەبیت، هەروەکی دبێژن ژی: (بەری داخوازا چاکسازیێ ژ ئێکی بکەی، ژ خۆ دەست پێ بکە).

## هەشت: ڤەژاندنا گیانێ خوونگەرمیێ (جۆش وخرۆشێ) ل ناڤ چالاکڤانان:

تشتەکێ گەلەك گرنگ هەیە، ئەو ژی ئەوە کو داکەڤتن هندەك جاران ژی دبیت سەرکەڤتن دەستێن مرۆڤی سست بکەن و خرخالا روو ب رووبوونێ خۆش ب رێڤە نەچیت، ئەڤە ژی یان ژ بەر بێ هیڤی بوونێیە یان ژ بەر پشتراستبوونێیە ژ وی تشتێ ب دەستڤە هاتی و مەترسیا ئێك ژ ڤان مەسەلان ژی ژ یا دی کێمتر نینە، چونکی هەردووان شوینوارێن نێگەتیڤ ل سەر سەرانسەری پرۆسا روو ب رووبوونێ هەنە، دبیت ژی مە ئەڤە د قۆناغا سیێ یا ڤێ روو ب رووبوونێ دا باش تێبینی کربیت، د ڤێ قۆناغێ دا ئەندامێن لیژنێ هەست کرن کو دەستکەڤتیێن ب راستا ب دەستڤە ئینانە ژ بەرکو د هەردو قۆناغێن دەستپێکێ دا ل دۆرێن ١٥٥ ناسنامەیێن پارێزەرێن سەرپێچیکەر و یێن د ئێك دەم دا فەرمانبەریا گشتی و پیشەیێ پارێزەریێ دکرن ڤەکێشاینە، ژ بەر هندێ، ئەم گەلەك پێدڤی لڤاندنا سەرانسەری ڤێ پرۆسێ بووین، دبیت ژی ئەڤە هاتبا ب جهـ ئینان هەکە هاتبا هەستکرن کو هێشتا مەترسی هەیە و بەردەوامە و هێشتا کێشە ب داوی نەهاتییە، روو ب رووبوون ژی بەردەوامە وەکی چەوان باشی و خرابی بەردەوامە.

یا دووێ ژی، گەریان بوو ل میکانیزمەکا نوو بۆ باشترکرنا کارێ چالاکڤانان د ڤێ روو ب رووبوونێ دا، ئانکو شداندنا رەگەزێ خوونگەرمیێ (جۆش وخرۆشێ) ل ناڤ وان، ئەڤ هەردوو مەسەلە ژی نە هند ب ساناهی نە، لێ مەسەلە ب چالاکڤانان ب خۆڤە گرێدایە و کا چەند پێگیری و باوەری ب کێشەیا خۆ هەنە، پاشی کا وان چەند دەم هەیە،

چونکی دڤێت ژ بیر نەکەین کو ئەو پارێزەرن و کارێن خۆ هەنە و ئەو کار بارگرانی نە ل سەر ملێن وان و ئەو داخوازا مافێن وەلاتییان و سەرەدانکەرێن خۆ دکەن و دڤێت ئەو وان پشتکوهڤەنەهاڤێن، هەکە نە، دێ خۆ بەرهنگاری لێپرسینا یاسایی کەن.

## ڤەکۆلینا دووێ
## ڤەگوهاستنا روو ب رووبوونێ بۆ قۆناغەکا نوو (یا فەرمی)

ب راستی مە هزر نە دکر کو ئەو لیستا مە بلند کری، سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ دێ هندە گرنگیێ پێ دەت، سەندیکایێ ئەو لیست ل هۆلا ئەرشیفی هەلاویست کو هەمی فایلێن تایبەتێن پارێزەرێن سەرانسەری هەرێمێ لێ هەنە و هەر پارێزەرەکێ بۆ نووکرنا ناسنامەیا خۆ سەرەدانا سەندیکایێ دکر ناڤێ وی د وێ لیستێ دا دهاتە هووربینی کرن، ڤێجا هەکە ناڤێ وی تێدابا، ناسنامەیا وی نە دهاتە نووکرن، بەلکی نڤیسارەك رادەستی وی دهاتە کرن داکو بکەهینیتە وی لایەنێ ئەو فەرمانبەریێ لێ دکەت، داکو ب بەرسڤنامەیەکێ هەلویستێ خۆ دیار بکەت کا ئەرێ فەرمانبەرێ وێ وەزارەتێ یان وێ سازیێ یە یان نە، هەرچەندە ئەڤ ئاوایە ژی گەلەك یێ هووربین نەبوو، لێ سەرکەڤتن و لڤینەکا گرنگ د ڤێ دۆسیا ترسناك و گرنگ دا هەبوو.

ب ئاوایەکێ گشتی و پشتی بۆرینا ل دۆرێن بیست رۆژان ل سەر وێ لیستا مە ب ناڤێن پارێزەرێن سەرپێچیکەر پێشکێش کری و ل بەر رۆناهیا وێ سەندیکا پارێزەران چەند رێکارەك ئەنجام داین و ئەو بکروڤەکێشا ل ناڤ هەمی پارێزەران ب گشتی و یێن ژوورا پارێزەرێن دهۆك ب تایبەتی دەنگڤەدای، هێژا وریا سەعدی ئەحمەد نەقیبێ پارێزەران و هندەك ئەندامێن جڤاتێ سەرەدانا ژوورا پارێزەرێن دهۆك کرن، ئەڤ سەرەدانە بوو ئەگەرێ پێکئینانا لیژنەیەکا تایبەت بۆ دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ و ب فەرمی دەستهەلاتدانا وێ لیژنێ، هەروەسا دوویات کر کو جڤاتا سەندیکایێ پێنگاڤێن گرنگ هاڤێتینە و ب نڤیسارا خۆ یا هژمارە ۱٥۹۳ یا رۆژا ۲۰۱۱/٦/۳۰ێ پەیوەندی ب نڤیسینگەها سەرۆکێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ کریە و تێدا بەحسێ وێ چەندێ هاتیە کرن کو ئارێشەیەك ل سەر وان پارێزەرێن فەرمانبەر هەیە و ل دووڤ یاسایا پارێزەریێ هژمارە ۱۷ یا سالا ۱۹۹۹ێ کریارا وان ب تاوانا سەختەکرن(احتیال)ێ دهێتە ل قەلەمدان، هەروەسا تێدا هاتبوو کو ماوەیێ هەیڤەکێ ب تنێ دەلیڤە بێتە دان ئەو پارێزەرێن فەرمانبەر ناسنامەیێن خۆ ڤەگێرینن، هۆسا سەرۆکاتیا دیوانا سەرۆکاتیا جڤاتا وەزیرێن هەرێمێ گشتاندنەك ب نڤیسارا هژمارە ۲۰۷۸ ل رۆژا ۲۰۱۱/۸/۲٤ێ ئاراستەی هەمی وەزارەتـان کر و نڤیسارا ناڤبریا سەندیکایێ و پشتگیریەك ژی هەڤپێچ کر کو تێدا پشتگیریا ناڤەرۆکا وێ دکەت و دەملدەست پێدڤیا کارپێکرنا وێ دکر.

ب ئاوایەکێ گشتی، پرۆسا بلندکرنا ناڤان د ڤێ قۆناغێ دا کو مۆرەکا فەرمی وەرگرتبوو، ب شەش قۆناغێن خوارێ را بۆری:

### ئێك: قۆناغا ئێکێ/ لیستا ئێکێ:

ئەڤ قۆناغە قۆناغا ئێکێ بوو یا ب رێیا پشتەڤانیا سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ و ب رێیا وان نڤیسارێن فەرمی یێن پەیوەندی ب جڤاتا وەزیران کری بۆ چارەکرنا دۆسیێ یا کو بابەتێ ڤێ گۆتارێ یە مۆرەکا فەرمی وەرگرتی، ب راستی وەزارەتان ژی کار ب وێ نڤیسارێ کر و ب نڤیسار ناڤێن هەمی مافپەروەرێن ل نك خۆ هەبن رادەستی جڤاتێ کرن و وێ ژی بۆ سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر هنارتن، سەندیکایێ ژی پشتی کارێ خۆ ل سەر تمام کری هندەك ژ وان نڤیسارێن پەیوەندیدار ئێکسەر بۆ من هنارتنە دهۆك داکو هووربینیێ ل سەر بکەم، ئەڤە ژی بۆ هندەك کارێن تەکنیکی و هۆنەری یێن دبیت دپێدڤی بن بۆ مەسەلا پێکئینانا لیژنا تایبەتمەند و دەستهەلاتا پێدڤیا وێ لیژنێ.

هندەك فەرمانبەران ب خۆ ژی ناسنامەیێن خۆ ئینانە سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك و من ب خۆ ژێ وەردگرتن هەتا نێزیکی ٥٠ ناڤان کۆمبووین، ژ بەر وێ خۆشیا زۆر یا بۆ مە چێ بووی و ژ بەر هەستکرن ب بێنفرەهیێ بۆ ڤێ دەستکەڤتا مەزن ئەم نەشیاین خۆ ل هیڤیا کۆمکرما ناڤێن دی بگرین، ئینا من نڤیسارەك ب ناڤێ سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك ل بن سەرپەرشتیا هێژا بەرپرسێ وێ لقێ دارێت و هەر ژ لایێ وی ڤە هاتە ئیمزا کرن و وی ئەو ناڤ ب نڤیسارا هژمارە ١٦٥٠ ل رۆژا ٢٠١١/١١/١ ێ بۆ سەندیکا گشتی یا هەڤلێر هنارتن، بۆ زانین و پێداچوونێ ژی لبەك ژێ بۆ سەرۆکاتیا دادگەها لێزڤرینا دهۆك هنارت، وێ نڤیسارێ ناڤێن وان پارێزەران و هژمارێن ناسنامەیێن وان و دیرۆکا ئەندامەتیا وان د سەندیکایێ دا و هژمارە و دیرۆکا فەرمانێن ویزاری یێن دامەزراندنا وان ب خۆڤە گرتبوو، مە هەمی ئەو ناسنامەیێن وەرگرتین و لبێن فەرمانێن ویزاری دگەل نڤیسارا ناڤبری هەڤپێچ کرن داکو هووربینی تێدا بێنە کرن و ژێ پشتراست ببن هەکە هەر شاشییەك تێدا هەبیت.

پشتی سەندیکایێ هووربینی د وان ناڤان دا کری و پشتراست بووی کو ئەو پارێزەرن و فەرمانبەریا گشتی ژی دکەن، وی دەمی فەرمانەکا کارگێری ژ لایێ جڤاتا سەندیکایێ ڤە ب نڤیسارا هژمارە ٤١٨٨ یا ٢٠١١/١١/١٦ێ بۆ دوورئێخستنا وان ژ پیشەیێ پارێزەریێ دەرکەڤت و تێدا هاتبوو ژی کو دەمێ فەرمانبەریا گشتی و پیشەیێ پارێزەریێ بۆ وان ب خزمەتا پیشەیێ پارێزەریێ نەهێتە ل قەلەمدان، هەروەسا شیرەتکاریا یاسایی یا وان ل کۆمپانیێن گرێبەست دگەل کرین ب شیرەتکارێن یاساناس نەهێنە ل قەلەمدان، ئەڤ نڤیسارە هاتە گشتاندن و بۆ هەر ئێك ژ جڤاتا دادوەریا هەرێمێ، جڤاتا وەزیران، رێڤەبەریا گشتی یا کۆمپانییان و توومارکەرێ کۆمپانییان/ لقێ دهۆك، سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك و هەمی تایێن دی یێ سەندیکایێ ل سلێمانیێ و هەڤلێر و کەرکوك، توومارێن وان یێن کەسایەتی و بۆ فایلێن وان یێن تایبەتی یێن کۆمپانییان هاتە هنارتن، سەندیکا ب ڤێ چەندێ ژی نەراوەستیا، بەلکی لیستا ناڤبری ل پێگەهێ خۆیێ ئەلیکترۆنی ژی بەلاڤ کر[٤]، ئەڤە ژی بۆ راگەهاندنا رۆهن وئەشکەرایا وان ناڤان و هەردەمێ ئێك ژ وان رژدی ل سەر ئەنجامدانا پیشەیێ پارێزەریێ کر، دێ حەوالەی دادگەها ڤەکۆلینان هێتە کرن داکو بگەهیتە سزایێ خۆ یێ دادپەروەرانە.

## دو: قۆناغا دوویێ/ لیستا دووی:

ئەڤ قۆناغە ژ هەر قۆناغەکا دی فەرمیتر و پێشکەڤتیتر بوو، چونکی د ڤێ قۆناغێ دا کار ل سەر ب جهئینان و جێبوونا وێ تشتی هاتە کرن یێ د دەمێ خۆ دا دگەل نەقیبێ سەندیکایێ رێککەڤتن ل سەر هاتییە کرن کو لیژنەیەکا فەرمیا فەرعی ل دهۆك بۆ دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ بهێتە پێکئینان و بەرپرسێ لقێ سەندیکا پارێزەران ل دهۆك ب فەرمی دەستەلاتێ بدەتە لیژنێ داکو ب فەرمی ب کارێ خۆ رابیت و بەرشیانییا سەرەدانێن وێ بۆ فەرمانگەهـ و سازیێن فەرمی یێن باژێری، ب ڤی ئاوایی سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك نڤیسارا هژمارە ١٨١٣ ل رۆژا ٢٠١١/١٢/٥ ێ ئاراستەی سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ کر و وی دەمی من ب خۆ و پشتی گەنگەشەکرنێ دگەل بەرپرسێ ژوورا پارێزەرێن دهۆك، ئەندامێن وێ لیژنێ ژێگرتن، پاشی پەیوەندی دگەل هێژایان دلۆڤان کەمال محەمەد خەیات و دژوار جەمیل شەریف ناڤبری هاتە کرن و هەردوو رازی بوون ڤی کارێ بەرکەڤتی بکەن، ژێگرتنا مە ژی بوو هەردووان ل سەر شەنگستەیەکێ رۆهن هاتبوو ئاڤا کرن کو ئەو ژی ئەو دەستپاکییە یا پێ دهاتنە نیاسین و ئەو وێرەکیی یە یا وان هەی، بۆ زانین ژی، هەردو پارێزەرێن شیرەتکارن، مە تێبینی کر کو یێ ئێکێ چەندەکێ ژیانا خۆ ل وەلاتێن رۆژئاڤا بۆراندییە ب دروستی ژی ل ئەلمانیا و تبعەتێ وان یێ باش وەرگرتییە، وەکی: راستی و رژدیێ بۆ تمامکرنا ڤی ئەرکی و باش پێگیریکرنێ ب ژڤانان، لێ یێ دووێ، مە خوونگەرمی و گیانێ گەنجاتیێ ل نك دیت کو

ئەم د لیژنەیەکا هۆسا دا یا بەرسینگێ گەندەلیێ دگریت، پێدڤی وێ چەندێ بووین.

پشتی هنگی ئێکسەر ب نڤیسارا هژمارە ١٨٤٦ یا رۆژا ٢٠١١/١٢/١٤ێ ژ لایێ سەرۆکێ سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك ب فەرمی دەستهەلات ب مە هاتە دان و تێدا ئەو دەستهەلات دامە سەرەدانا هەمی فەرمانگەهێن پەیوەندیدارێن پارێزگەها دهۆك بکەین بۆ دەستنیشانکرنا وان پارێزەرێن مووچەی ژ سازیێن فەرمی یێن حکۆمی وەرگرن داکو بۆ سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر بهنێرین، وی دەمی ب تنێ بێهنا من هات، چونکی مەسەلە ژ بەرێخودانا کەسایەتی دەرکەڤتبوو و ببوو مەسەلەیەکا فەرمی و ب ناڤێ سەندیکایێ ڤە هاتە گرێدان، ب راستی مە ژی هەر ژ رۆژا ٢٠١١/١٢/١٤ێ چ دگاڤ و دەم ژ دەست خۆ نەکرن، نەخاسمە ژی کو د وێ هەیامێ دا دوو مەسەلێن دی هەبوون، یا ئێکێ: بێنڤەدانا دادگەهان بوو کو د وێ بێنڤەدانێ دا دشیاین سەرەدانا فەرمانگەهان بکەین بەری رۆژا ٢٠١٢/١/١ێ بهێت، چونکی پشتی وێ رۆژێ ئەو بێنڤەدان ب داوی دهێت و وەرزێ کارێ پارێزەران دڤەژیت و دادگەە مشتی دادخوازیان دبن، هەروەسا تشتێ ترسناکتر د مەسەلێ دا ئەوە کو ژ وێ رۆژێ دەرگەهێ نووکرنا ناسنامەیان دهێتە ڤەکرن و بەری بشێین مەسەلێ کۆنترۆل بکەین و ناڤێن وان دوور بێخین، دبیت گەلەك بشێن ناسنامەیێن خۆ نوو بکەن، ڤێجا مە هەڤرکی ل گەل دەمی دکر، یا دووێ ژی: هاتنا نڤیسارەکا نوو بوو ب هژمارە ٤٧٤٢ ل رۆژا ٢٠١١/١٢/١٢ێ ژ سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر کو یا رۆهن و ئەشکەرا بوو و دوویاتی ل سەر نڤیسارا خۆ یا بەری هنگی دکر و گازیا دویماهیێ ئاراستەی هەمی پارێزەرێن سەرپێچیکەرێن وەك فەرمانبەر ل سازی یێن هەرێمێ یان سازیێن فیدرال کار دکرن دکر و تێدا هاتبوو کو هەیڤەکا دی بۆ وان هاتییە درێژ کرن ئانکو هەتا رۆژا ٢٠١١/١٢/٣١ێ و پشتی رۆژا ٢٠١٢/١/١ێ دێ حەوالەی دادگەهێن تایبەتێن ڤەکولینێ هێنە کرن و ئەڤ نڤیسارە ئاراستەی هەمی تایێن سەندیکا پارێزەران ل سەرانسەری

هەرێما کوردستانێ هاتە کرن.

ل سەر ڤی بنواشەی، لیژنا فەرعی یا تایبەتمەند و پەیوەندیدار ب ڤێ دۆسیێ ل رۆژا ٢٠١١/١٢/١٤ێ دەست ب کارێ خۆ کر و د ئێکەمین رۆژا کارکرنا خۆ دا سەرەدانا پارێزگەها دهۆك کر نەخاسمە ژی هێژا جێگرێ پارێزگاری، وی ژی ب رێیا دوبارە ئاراستەکرنا نڤیسارەکا فەرمی ب هژمارە ٨٤٧٤ یا رۆژا ٢٠١١/١٢/١٨ێ هاریکاریا خۆ بۆ لیژنێ دەربری و ئەو نڤیسار ل سەر هەمی فەرمانگەە و سازیێن پارێزگەهێ، چ ل ناڤ سەنتەرێ پارێزگەهێ و چ ژی ل قەزا و ناحیان گشتاند و لبەکا ئۆرجینال یا نڤیسارا ناڤبری رادەستی مە کر کو هەر ب ناڤەرۆکا نڤیسارێن بەری هنگی بوو.

ب ئاوایەکێ گشتی، ئەو فەرمانگەهـ و سازیێن پەیوەندی پێ هاتییە کرن هژمارا وان گەهشتە ٨٣ فەرمانگەهـ و سازیێن فەرمی، هەروەسا پارێزگەهێ ناڤێن هەمی وان فەرمانبەر و مافپەروەران رادەستی مە کرن یێن ل سەر میلاکێ فەرمانگەهێن پارێزگەهێ ب خۆ کار دکەن، هەر ژ جێگرێ پارێزگاری و هەمی قائیمقام و رێڤەرێن ناحییان هەتا فەرمانبەرێن فەرمانگەها یاسایی.

ژ وێ رۆژێ مە ئێکسەر سەرەدانا وان فەرمانگەهـ و سازیان دکر و د چارچۆڤێ ڤێ ڤۆناغێ دا سەرەدانا دۆرێن ٣٠ فەرمانگەهـ و سازیێن خوارێ هاتە کرن: دادگەها دەڤەرا لێزڤرینا دهۆك ب هەمی دادگەهێن وێڤە ل پارێزگەهێ وێ قەزایێ وێ، فەرمانگەها پارێزگەها دهۆك، سەرۆکاتیا ساخلەمیا دهۆك، سەرۆکاتیا باژێرڤانیا دهۆك، سەرۆکاتیا زانکۆیا دهـۆك، رێڤەبەریا گشتی یا پـەروەردا دهۆك، رێڤەبەریا باژێرڤانیێن دهۆك، رێڤەبەریا وەبەرهێنانا دهۆك، رێڤەبەریا گەشت وگوزارا دهۆك، رێڤەبەریا رەگەزنامەیا عیراقی ل دهۆك، رێڤەبەریا چاندنا دهـۆك، رێڤەبەریا ب جهێنانا دهۆك و هەمی فەرمانگەهێن وێ ل قەزایان، فەرمانگەها دادنڤیسیا دهۆك ب هەمی تایێن وێڤە، فەرمانگەها توومارکرنا خانووبەرەی ل دهـۆك و هەمی تێبینەرێن وێ،

رێڤەبەریا ب کارئێخستن و مەشق وراهێنانا پیشەیی ل دهۆك، رێڤەبەریا چاڤدێریا جڤاکی ل دهۆك و هەمی فەرمانگەه و سەنتەرێن وێ، رێڤەبەریا کار و دابینکرنا جڤاکی ل دهۆك، رێڤەبەریا بەلاڤکرنا بەرهەمێن گازێ ل دهۆك، باجا داهاتی ل دهۆك، باجا خانووبەرەی ل دهۆك، هەمی بانکێن حکومی ل دهۆك، رێڤەبەریا گەنجینەیا گشتی، رێڤەبەریا چاڤدێریا دارایی، رێڤەبەریا گومرکێن دهۆك، رێڤەبەریا گومرکێن ئیبراهیم خەلیل ل زاخۆ، رێڤەبەریا پۆلیسێن دهۆك، رێڤەبەریا خانەنشینییا دهۆك، فەرمانگەها سنیلەیێن دهۆك و سەرکردایەتییا هێزێن کوردستانێ (سەرەدانەکا دەستپێکییە و پێدڤی سەرەدانێن دی یە).

ب گشتی، لیژنە د ڤێ قۆناغێ دا شیا لیستەکێ ب ١٠٥ ناڤێن پارێزەرێن فەرمانبەر ئامادە بکەت، ب راستی ژی هەمی فەرمانگەهێن سەرەدانا وان هاتییە کرن هاریکاری دگەل لیژنێ دکرن و ناڤێن هەمی مافپەروەرێن خۆ رادەستی مە دکرن، مە ژی ناڤێن وان دگەل ناڤێن پارێزەرێن دی هەڤبەر دکرن ڤێجا چ ئەو بانە یێن ناڤێن وان د خشتەیا پارێزەرێن سالا ٢٠١٠ێ دا هەبین یان ژی ناڤێن وان پارێزەرێن نوو بن یێن ناڤێن وان د کۆڤارا وەرزیا (پارێزەر) د هژمارێن ٢٢ و ٢٣ و ٢٤ یێن سالا ٢٠١٠ێ دا یا ژ لایێ سەندیکا پارێزەران ڤە دەردکەڤیت دهاتنە بەلاڤ کرن، چونکی وان د وان هژماران ناڤێن هەمی پارێزەرێن پشتی سالا ٢٠١٠ ێ بووینە ئەندامێن نوو یێن سەندیکایێ دهاتنە بەلاڤ کرن، چ پێ نەڤێت ژی، ناڤێن وان د خشتەیێ پارێزەرێن سالا ٢٠١٠ێ دا نە دهاتن و دڤیا لیژنێ خۆ ل هیڤیا نووکرنا ناسنامەیان و دەرکەڤتنا خشتەیێ نوویێ سالا ٢٠١١ێ گرتبا، کو ڤێ چەندێ ژی دەمەك ڤەدکێشا، ژ بەر هندێ نەچار بووین پشتا خۆ ب وان هژمارێن کۆڤارا (پارێزەر) گەرم بکەین، هەرچەندە ئەڤە پرۆسەکا ب زەحمەت و ئالۆز بوو.

هەروەسا ل ڤێ داویێ پێشهاتەکا نوو هاتە روودان کو ئەو ژی لڤینا داواکاری(دۆزگەری)یا گشتی یا باژێرێ دهۆك بوو، فەرمانگەها داواکاریا گشتی ل دهۆك نڤیسارەکا فەرمی ب ناڤ ونیشانێن (فەرمانبەرێن هەلگرێن ناسنامەیا پارێزەریێ) ب هژمارە ٣٧١ ل رۆژا ٢٠١١/١١/١٤ێ بۆ ژوورا پارێزەرێن دهۆك هنارتی داکو وان ب ناڤێن پارێزەر ئاگەهدار بکەت یێن هەڤدەم فەرمانبەریا گشتی ژی ل فەرمانگەهێن دەولەتێ دکەن، داکو حەوالەی دادگەهێ بهێنەکرن و ڤەکۆلین دگەل بهێتەکرن چونکی ئەو تشتێ وان کری ب تاوانا سەختەکاریێ دهێتە ل قەلەمدان دگەل پێدڤیبوونا گشتاندنا وان ناڤان ل سەرانسەری فەرمانگەهێن پارێزگەهێ داکو پارێزەرێن سەرپێچییا یاسایێ کرین ژ یێن دی بهێنە ڤاڤارتن، ب راستی هەر ئەڤە بوو یا لیژنێ د نڤیسارا هژمارە ٥١ یا رۆژا ٢٠١٢/١/٩ێ یا سەندیکا پارێزەران/ لقێ دهۆك بلندی کریە سەندیکا پارێزەرێن هەرێمێ وتێدا داخواز کری کو خشتەیەکی ب ناڤێن پارێزەرێن سالا ٢٠١١ێ، یان هەر چ نەبیت لیستەکێ ب ناڤێن پارێزەران بدەنە لیژنێ داکو کارێ وێ ب ساناهی بکەڤیت، ب گشتی و د چارچۆڤێ ڤێ نڤیسارێ دا ناڤێن ١٠٥ پارێزەرێن سەرپێچیکەر هاتنە بلند کرن، ئانکو هژمارا کۆما ناسنامەیێن د هەردوو قۆناغێن ئێکێ و دووێ دا هاتینە ڤەکێشان گەهشتە ١٥٥ ناڤان.

پاشی گەلەك نەڤەکێشا هەتا بریارا هژمارەیا ٤٥٢ یا رۆژا ٢٠١٢/١/٢٢ێ یا کارگێریا جڤاتا سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر بۆ دوورئێخستنا وان یێن ناڤێن وان د لیستا دووێ دا بوون و هژمارا وان ١٠٥ ناڤ بوون دەرکەڤتی، ڤێ بریارێ هەر ناڤەرۆکا بریارا کارگێریا بەرێ یا قۆناغا ئێکێ ب خۆڤە گرتبوو دگەل زێدەکرنا دوو بەندێن نوو، ئەو ژی (هەلوەشاندنا هەر رەفتارەکێ یاسایی یێ ژ لایێ کەسانێن ئاماژە پێ هاتییە دان هاتییە کرن هەکو د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکرن، ژ بەرکو ئەو کارێن نەرەوا بووینە، هەروەسا نەچارکرنا سەرپێچیکەران کو باجێن ناساندنێ (الباجات التعريفية) یێن خۆ یێن تایبەت ب شۆڤێریا ترۆمبێلێن پارێزەران ڤەگێرینە سەندیکا پارێزەران، هەکە نە، دێ بەرهنگاری لێپرسینا یاسایی بن).

## سێ: قۆناغا سیێ/ لیستا سیێ:

ئەڤ قۆناغە ئەوە یا ئێکسەر پشتی رۆژا ٢٠١٢/١/٩ێ دەستپێکری، ئانکو پشتی وێ رۆژا لیژنێ نڤیسارا فەرمی ب ناڤێن پشکا دووێ یا سەرپێچیکەران بۆ سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر هنارتی، ب راستی ژی ئەڤ قۆناغە وەکی قۆناغێن دی ژ لایێ لەزێکرن و هەڤرکانێ دگەل دەمی یا ب هێز نەبوو، ئەڤە ژی دبیت ژ بەر مژوولبوونا ئەندامێن لیژنێ بیت ب کارێ پیشەیێ پارێزەریێ ڤە، هەر بۆ نموونە، ژ بەر هاتنا دادخوازییان و بەرەڤانیکرنی ژ بریکاردار(موکل)ان، نەخاسمە ژی کو ئەڤە هەڤدەم بوو دگەل دەستپێکا سالا نوو، کو پشتی بێنڤەدانا فەرمییا دادگەهان، ئەڤ دەمە دبیتە دەستپێکا کارێ وان بۆ پتریا دادخوازیێن مەدەنی و بارێ کەسایەتی، دشیاندا نینە ژی گازندە ل ئەندامێن لیژنێ بێتەکرن، چونکی ئەو دنەچارن پیشەیێ خۆ بکەن ژ بەرکو ژێدەرێ ئێکانەیێ داهاتێ وانە، هەروەسا ژ بەرکو جۆرەکێ کارێ ل سەرێك کۆمبووی هەیە، ژ لایەکێ دیڤە، ژ بەرکو ئەو ئەندام پشتڕاست ببوون کو ب رێژەیا ٦٠-٧٥٪ ژ کارێ خۆ ئەنجامداینە یان بێژین ژی سەرکەڤتن تێدا ب دەستڤە ئینایە، لێ سەرباری وێ هەمیێ، گەلەك گیرۆ نەبوون، بەلکی دشیێن ب بێنڤەدانا شەرکەری ناڤ بکەین، لێ بێنڤەدانەکا کورت، هۆسا، پشی نێزیکی حەفتییەکێ ژ دەستپێکرنا ڤێ قۆناغێ دوبارە دەست ب سەرەدانا فەرمانگە و سازیێن حکۆمی کرن و ل سەر وێ چەندێ بەردەوام بوون.

هەر چەوان بیت، باشترین دەستکەڤتێ بەردەستێ ڤێ قۆناغێ ب دەستڤە هات و رەوشا پارێزەر و سەندیکا پارێزەران باشتر لێ هات کو ئەو ژی بلندبوونا وان کرێیان بوو یێن پارێزەرێن ژ هەردو جوونێن (ب) و (ج) ئانکو کرێ یێن شارەزا و شیرەتکاران ژ وان کۆمپانییان وەردگرتن یێن وەك شیرەتکارێن یاسایی لێ کار دکرن، هەرچەندە هندەك ژ وان گوژمەکێ کێم کو ژ ٣٠٠ دۆلارێن ئەمریکی زێدەتر نەبوو وەردگرتن، لێ پشتی سەرکەڤتنا هەوا بەرەڤانیکرنێ یا ئەم پێڕابووین، نزمترین کرێیا وان گەهشتە ٨٠٠-١٠٠٠ دۆلارێن ئەمریکی، ئەڤ گوهۆڕینا بەردەستا هاتییەکرن، بەرێ کار و خەباتا لیژنا پەیوەندیدار یا دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ و سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ ژی بوو، ئەگەرێ سەرەکی ژی ڤەکێشانا ناسنامەیێن پارێزەرێن فەرمانبەر بوو کو سەرجەمێ ناسنامەیێن د ڤێ قۆناغێ دا هاتینە ڤەکێشان پتر ژ ٢٠٠ ناسنامەیێن پارێزەرێن سەرپێچیکەر بوون، کو د ڤێ قۆناغێ ب تنێ دا ٤٧ ناسنامەیێن پارێزەریێ بۆ سەندیکا پارێزەرێن هەرێمێ هاتبوونە بلند کرن، هەروەسا فەرمانا فەرمی ژی ب هژمارە ١٤٢٠ ل رۆژا ٢٠١٢/٣/١٢ێ ژ سەندیکایێ دەرکەڤت و ل سەر سازی و وەزارەت و دادگەهێن پەیوەندیدار هاتە گشتاندن، ژ وانا: جڤاتا دادوەرییا هەرێمێ، وەزارەتا داد، رێڤەبەرییا گشتی یا توومارکرنا کۆمپانییان، توومارکەرێ کۆمپانییان ل دهۆك و لقێ سەندیکا پارێزەرێن دهۆك.

## چوار: قۆناغا چوارێ/ لیستا چوارێ:

ئەڤ قۆناغە دەرئەنجامێ رەوشێن نوو بوو، چونکی هندەك لایەن و سازییان رەت دکرن بەرسڤا نڤیسارێن سەندیکا پارێزەران بدەن، هەرچەندە ژی وان نڤیساران پتریا جاران پشتەڤانیا نڤیسارێن ئێکسەر ژ جڤاتا وەزیران دەردکەڤتن دکرن، لێ وان لایەنان (کو ژ بەر خۆپاراستن و ژ ترسا ناڤزڕاندنێ ناڤێن وان دپارێزین و ئەشکەرا ناکەین)، درژد بوون ل سەر هەلویستێ خۆ و ناڤێن وان فەرمانبەرێن خۆ دیار نەدکرن یێن هەڤدەم پیشەیێ پارێزەریێ ژی دکرن و ب ئەشکەرایی ژی، هندەك جاران ب ئاوایەکێ زاردەڤ داخواز دکرن خۆ بۆ دەمەکێ نە دەستنیشانکری خۆ ل هیڤیێ بگرین هەتا وی دەمێ کاروبارێن خۆ و هندەك کاروبارێن دی ب سەروبەر دکەن کو ئەو کاروبار ل نك سەندیکایێ دروهن و ئەشکەرا نەبوون.

ب ئاوایەکێ گشتی و پشتی بۆرینا دەمێن درێژ، لێ هەروەکی دیار چاڤەرێبوونا سەندیکایێ و لیژنەیێن وێ توخیبێن خۆ بەرامبەری وێ چەندێ هەبوون، ئینا مە

ل لیژنا فەرعی وەكی بەرێ دەستپێكەری د دۆسیيا تايبەتا پارێزەرێن فەرمانبەرێن دهۆك دا كر، هەرچەندە ژی ئەو كەسێن وەك فەرمانبەر ل نك وان سازيیان كار دكرن بۆ ليژنێ د بەرنياس بوون، لێ مە هەردەم ل ليژنێ پێكۆل دكر بەری هەر ناڤەكی بلند بكەين، فەرمانا دامەزراندنا وی ژ وی لايەنی ب دەست خۆ بێخين يێ لێ كار دكەت، لێ مە چ رێ پێن دی نەبوون، ژ بەر هندێ، ليژنێ ل ڤێ قۆناغێ و ب پشتگەرميا شارەزايی يا خۆ و بێی هەبوونا چ فەرمانێن ويزاری پێن دامەزراندنا وان، ناڤێن وان كەسان بلند كرن.

هەر د ڤێ قۆناغێ دا نڤيسارەكا نوو يا سەنديكا پارێزەران ب هژمارە ٣٩١ يا ٢٠١٢/١/١٧ێ ب ناڤ ونيشانێن (كێشەيا فەرمانبەرێن هەلگرێن ناسنامەيێن پارێزەريێ) دەركەڤت و ئاراستەی سەرۆكێ جڤاتا وەزيران كر كو ئەڤە ژی دوبارەكرنا ناڤەرۆكا نڤيسارێن وێ پێن بەری هنگی بوو، لێ د ڤێ نڤيسارێ دا تەكەز ل سەر هندەك وەزارەتان هاتە كرن پێن هاريكاری نەكرين و ناڤێن فەرمانبەرێن خۆ پێن سەرپێچيكەرێن ياسايێ ديار نەكرين، ژ بەر هندێ، جڤاتا سەنديكايێ د رووِنشتنا خۆ يا رۆژا ٢٠١٢/١/١٢ێ دا بريارا دەمدرێژكرنێ دا هەتا رۆژا ٢٠١٢/٣/١ێ وەك ژڤانا داويێ بۆ وان فەرمانبەرێن سەرپێچيكەر، كو پشتی هنگی حەوالەی دادوەريێ بهێنە كرن داكو بگەهنە سزايێ خۆ يێ دادپەروەرانە، ئينا جڤاتا وەزيران ب نڤيسارا خۆ يا هژمارە ٤٥٠ يا رۆژا ٢٠١٢/٢/١٥ێ پشتەڤانييا ڤێ نڤيسارێ كر و ب سەر هەمی وەزارەتان دا هاتە گشتاندن داكو ناڤەرۆكا وێ بهێتە ب جهـ ئينان.

ب ئاوايەكێ گشتی دبيت مرۆڤ وەسا تێ بگەهيت كو پەيوەنديكرنا بەردەوام يا سەنديكا پارێزەران دگەل جڤاتا وەزيران و دەمدرێژكرن و مۆلەتدانێن داويێ بۆ سەرپێچيكەران، دەليڤەدان بيت بۆ هەر ئێكێ بەهانەيەكا نەديار هەبيت يان يێ ژێ بێئاگەهـ بيت ژ بەر هەر ئەگەرەكێ، يان ژی دەليڤەدان بيت بۆ سەرپێچيكەری داكو ل دووڤ شيانان ل خۆ بزڤريت و ل داويێ بهێتە سەر رێيا راست، هەروەسا ئەڤ نڤيسارە نيشانێ گيانێ مێرخاسيێ يێ جڤاتا سەنديكايێ و نەقيبێ وێ يە ژی، كو خەمساريێ تێدا ناكەن و دەست وتبلێن وان سست نابن كو چەند جاركی ڤێ مەسەلێ پێشكێشی سەرێ دەستهەلاتا ب جهئينانێ ل هەرێمێ (ئانكو جڤاتا وەزيران) بكەن و جارجارە وان سازيیان هانددەت و بيرا فەرمانبەرێن سەرپێچيكەرێن وان دئينيتەڤە كو چ دوور چ نێزيك دەستێ ياسايێ دێ گەهيتە وان، من ب خۆ ژی باوەرييەكا تمام هەبوو كو پێدڤييە هندەك جاران ياسا دەرهەڤێ وان پێن سەرپێچيێن مەزن دكەن و ركمانەيی پێ دكەن و خۆ دفنبلند دكرن بهێتە ب جهـ ئينان داكو پێن دی ژی بهێنە پاشڤەبرن و سەرپێچيێن وەسا نەكەن، هەر بۆ نموونە، هەكە دو يان چوار يان پتر حەوالەی دادوەريێ بهێنە كرن داكو رێكارێن ياسايی دەرهەڤێ وان بهێنە وەرگرتن، ئەڤ رێيە دێ ژ هەر رێيەكا دی سەركەڤتيتر بيت، هەروەكی دبێژن (هند يێ هشك نەبە بشكێی و هند يێ تەڕ نەبە بهێيە گڤاشتن)، د ئەنجامدا ژی، هەمی ب لەز دێ ناسنامەيێن خۆ رادەستی لايەنێن پەيوەنديدار كەن، داكو چارەنڤيسێ وان وەكی چارەنڤيسێ هەڤالێن وان پێن سەرپێچيكەر نەبيت.

سەنديكا ب وێ چەندێ ب تنێ يا مە ل سەری گۆتی نەراوەستييا، بەلكی ب نڤيسارا خۆ يا هژمارە ١٣٦١ يا رۆژا ٢٠١٢/٣/١ێ پەيوەندی ب هندەك لايەنێن نەفەرمی پێن مەكتەبێن پارتێن سياسی پێن جودا جوداێن هەرێما كوردستانێ ژی كر داكو ئەو ژی وەك لايەنێن سياسی پێن كاريگەری ل سەر كادر و ئەندام و تاگرێن خۆ هەبين هاريكاريێ د ڤێ مەسەلێ دا بكەن، هەروەسا ئەو تشتێ ئەڤ قۆناغە ژ قۆناغێن دی جودا كری ئەوە كو ليژنا فەرعی يا تايبەتمەند د ڤێ دۆسيێ دا شيا رازيبوونا نەقيبێ پارێزەرێن هەرێما كوردستانێ بۆ پێكئينانا ليژنەيەكا فەرعييا بەروەخت ل قەزا زاخۆ ب دەستڤە بينيت چونكی هژمارەكا زۆر يا پارێزەرێن ل وێرێ هەنە و دەستهەلاتێن وێ ليژنێ ژی وەكی وان بن پێن ليژنا فەرعييا تايبەتمەند يا دهۆك هەبن كو ل بن سەرپەرشتييا وێ و سەنديكا

پارێزەران/ لقێ دهۆك بیت و ئەڤ لیژنە ژ پارێزەرێن هێژا رەمەزان عیسا ئەحمەد وەك سەرۆك و مەسعود محەمەد سەدیق و دلشاد محەمەد حەمید وەك ئەندام پێك دهات.

لیژنا مە ئەو چەند ل بەرچاڤ وەرگرت كو هێژاێین ناڤبری ل سەر بنەمایێ رژدیێ د كارێ خۆبەخش و بێلایەنیێ د كاری دا بێنە ژێگرتن كو ئەو ب شارەزایی و دەستپاكی و وێرەكیێ د بریاردانێ دا دبەرنیاس بوون، هۆسا، ئەو لیژنە ل دووڤ دەستەلاتدانا فەرمی ب نڤیسارا هژمارە ۷۷٤ یا ۲۰۱۲/٦/۲۸ێ یا سەندیكا پارێزەران/ لقێ دهۆك هاتە دامەزراندن و هەتا نۆكە ئەو لیژنە ل سەر كارێ خۆ بەردەوامە و شیایە ناسنامەیێن نێزیكی ۲۹ كەسێن د ئێك دەم دا فەرمانبەرێیا گشتی و پیشەیێ پارێزەریێ ل زاخۆ دكەن ڤەكێشیت و ناڤێن وان بلند بكەت.

هەر چەوان بیت، لیژنا فەرعییا زاخۆ شیا هژمارا وان سەرپێچیكەرێن ناسنامەیێن وان هاتینە ڤەكێشان بگەهینیتە ۲٦۸ ناسنامەیان ئانكو ٦٦ ناسنامە د ڤێ قۆناغێ ب تنێ دا، ب ڤێ چەندێ ژی كۆما گشتی یا ڤێ قۆناغێ یا هەردو لیژنەیێن دهۆك و زاخۆ گەهشتە ۳۰۳ێ سەرپێچیكەران و هژمارا فەرمانگەهێن لیژنێ د هەردوو قۆناغێن سێیێ و چوارێ دا سەرەدانا وان كرین گەهشتە نێزیكی ۸۰ فەرمانگەهـ و سازی یێن فەرمی و نیڤ فەرمی كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە:

(دادگەها لێزڤرینێ یا دهۆك، رێڤەبەریا ئامارێ، رێڤەبەریا ب كارئێخستن و مەشق و راهێنانا پیشەیی، سازیا شەهیدان، رێڤەبەریا پاسپۆرتان ل دهۆك، رێڤەبەریا هاتن وچوونا دهۆك، زانكۆیا نـەوروز یا تایبەت كو فەرمانبەرێن وێ ل سەر میلاكێ وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەكۆلینێن زانستی نە، رێڤەبەریا ڤەگوهاستن و گەهاندنا دهۆك، ئێكەتیيا مافپەروەرێن كوردستانێ/ لقێ دهۆك، رێڤەبەریا بەلاڤكرنا كارەبێ، رێڤەبەریا وزەیێ ل دهۆك، رێڤەبەریا ئاڤا دهۆك، رێڤەبەریا ئاڤدانێ، رێڤەبەریا تاقیگەهێن ئاڤاكرنێ، سەركردایەتییا هێزێن كوردستانێ (فەرماندە)، رێڤەبەریا پاراستنا ژینگەهێ، رێڤەبەریا بانكا خانووبەرەی، پەیمانگەها هونەری/ پشكا یاسایێ، جڤاتا پارێزگەها دهۆك، رێڤەبەریا پەروەردا قەزا دهۆك، رێڤەبەریا شوینواران، رێڤەبەریا بەرهەڤانیا شارستانی، فەرمانگەها كۆچ وكۆچبەران، رێڤەبەریا رەگەزنامە و بارێ شارستانی، رێڤەبەریا رۆشنبیری، رێڤەبەریا زانیاریێن فەرمانبەران، رێڤەبەریا گەشەپێدانا پیشەسازی، رێڤەبەریا نشینگەهێ، رێڤەبەریا وەرزش و لاوان، فەرمانگەها سكرا، رێڤەبەریا سینەمایێ، رێڤەبەریا قوبتی(تەموینێ)، رێڤەبەریا ئاهێن خوارنێ و دەخل ودانی، رێڤەبەریا گشتی یا كارەبێ، فەرمانگەها بەلاڤكرنا كارەبا زاخۆ، رێڤەبەریا پۆلیسێن پاراستنا ژینگەهـ و دارستانان، رێڤەبەریا گشتی یا كارتا زانیاریان، رێڤەبەریا پیڤانسازی و كۆنترۆلا جۆرەیی، رێڤەبەریا پۆلیسێن گۆمركێن دهۆك، رێڤەبەریا گشتی یا راگەهاندنێ، رێڤەبەریا پاراستنا خەرجییان، رێڤەبەریا ئەوقاف و كاروبارێن ئاینی، رێڤەبەریا چاڤدێریا بازرگانی، رێڤەبەریا ئاسایشا دهۆك، رێڤەبەریا سۆلینان، رێڤەبەریا خانووبەرەیێن دەولـەتـێ، رێڤەبەریا گۆمركێن دهۆك، رێڤەبەریا پۆلیسێن پارێزگەها دهۆك/ تاوان و لڤینان، قائیمقامییا قەزا ئامێدیێ، رێڤەبەریا مینان، رێڤەبەریا هەوالگریا سەربازیا فیدرال/ لقێ دهۆك، نڤیسینگەها پەرلەمانێ كوردستانێ/ دهۆك، رێڤەبەریا پۆلیسێن پاراستنا چالاكیێن مەدەنی یان نەهێلانا ئاژاوەگێریێ، رێڤەبەریا ڤێتێرنەریێ، سەنتەرێ پێشمەرگە، پلاندانانا داتایان (المعلوماتی)، سەنتەرێ رێزان بێ زانیاریان، رێڤەبەریا گۆمركا كۆمپانییان، رووپیڤا جیۆلۆجی، رێڤەبەریا ڤەكۆلینێن چاندنێ، رێڤەبەریا ئاڤا ژێر عەرد، رێڤەبەریا پۆستە و گەهاندنێن دهۆك، هێزا سەربازیا پاراستنا ژینگەهێ، سەنتەرێ ساخلەمییا دەروونی، چاڤدێریا بازرگانی ل زاخۆ، فەرمانگەها ساخلەمییا زاخۆ، فەرمانگەها ڤەگوهاستنا زاخۆ، سەرۆكاتییا شارەوانییا زاخۆ، رێڤەبەریا چاندنا زاخۆ،

فەرمانگەها چاڤدێریا جڤاکی ل زاخۆ، نڤیسینگەها پەرلەمانێ کوردستانێ/ زاخۆ، رێڤەبەریا پاسپۆرتێن گۆمرکێن ئیبراهیم خەلیل، فەرمانگەها ئاڤا زاخۆ، دادگەها بەراهیێ یا زاخۆ و قائیمقامیا زاخۆ).

سەرجەمێ وان فەرمانگەهـ و سازیێن سەرەدانا وان هاتینە کرن هەر ژ پێکئینانا هەردو لیژنێن فەرعی ل دهۆك و زاخۆ یێن تایبەت ب دۆسیا پارێزەرێن فەرمانبەر ڤە و هەتا تمامبوونا قۆناغا چوارێ یان لیستا چوارێ یا ناڤان، هژمارا وان گەهشتە دۆرێن ۱۱۰ فەرمانگەهـ و سازیان، ب ئاوایەکێ گشتی، هێشتا جڤاتا سەندیکا پارێزەران کارێ خۆ ب داوی نەئینای، هەتا د رۆونشتنا خۆ یا ٦٨ ێ یا رۆژا ۲۰۱۲/٥/۳۱ێ دا بریارەکا ئێکلاکەر دەرئێخستی و دەلیڤە دا فەرمانبەرێن هەلگرێن ناسنامەیا پارێزەریێ هەتا رۆژا ۲۰۱۲/۷/۱ێ ناسنامەیێن خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، سەندیکا دێ سکالایا سزادانێ دەرهەقێ وان لڤینیت، بۆ زانین ژی، هەر ئەڤە بوو یا سەندیکایێ ل سەر پێگەهێ خۆ یێ ئەلیکترۆنی (http://www.parezar.org) بەلاڤ کری.

نە هەر ئەڤە، بەلکی سەندیکایێ ئەڤ مەسەلە کرە دۆرهێلەکێ بەردەست ئەڤە ژی دەمێ دوبارە ب ناڤەرۆکا نڤیسارا بۆری، ب نڤیسارا خۆ یا هژمارە ۲۲٤۹ یا رۆژا ۲۰۱۲/٦/٦ێ پەیوەندی ب سەرۆکاتیا جڤاتا وەزیران کری، کو ئەو نڤیسار ل سەر هەمی سازیێن هەرێما کوردستانێ، ژ وانا ل سەر وەزارەت و سەرکردایەتیێن سەربازی ب هەمی پێکهاتێن خۆڤە بهێتە گشتاندن، هەر ئەڤە بوو یا دیوانا جڤاتا وەزیران ب نڤیسارا خۆ یا هژمارە ۱٥۷۰ یا رۆژا ۲۰۱۲/٦/۲٦ێ کار پێ کری.

## پێنج: قۆناغا پێنجێ/ لیستا پێنجێ:

ئەڤ قۆناغە ژ هەر قۆناغەکا دی یا بەری نۆکە ب زەحمەتتر بوو، ب راستی دبیت ئەگەرێ سەرەکیێ ڤێ چەندێ ژ بەر وێ گرێدانا ڤێ قۆناغێ بیت ب بژارەیا ژ هەمیان ب زەحمەتترڤە کو ئەو ژی (لایەنێ سەربازی)یە، کو دبیت ئەڤ بژارەیە ئەگەرێ بەلاڤبوون و ڤەگرتنا ڤێ دیاردێ بیت یا ئەڤ (پەرتووکە) چارەسەریا وێ دکەت، سۆروسۆر دبێژم کو بەری سالا ۲۰۰۳ یێ هژمارەکا کێم یا ئەفسەرێن سەربازی هەبوون یێن دوێران د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و وی کاری بکەن، هەرچەندە ژی پارێزەرێن دی گەلەك جاران نەرازیبوونا خۆ دەردبرین و سەندیکایێ پەیوەندی ب لێڤەگێرێ(مەرجەعێ) خۆ دکر، لێ ب نڤیسار بەرسڤ دهاتەدان کو چ فەرمانبەر ب فەرمانێن ویزاری نەهاتینە دامەزراندن، بەلکی ئەوێن هەیی گرێبەستن ئانکو مەسەلە ژ وان ناگریت، ئەم دێ بێژین ژی کو ئەو بوون یێن بەری هەر ئێکێ دی ئەو سەرپێچی کرین، لێ کریارا وان یا وی دەمی و نەبوونا چارەکرنێن ب راستا بۆ وێ کێشێ، فەرمانبەرێن دی ل هەمی کەرتێن حکۆمی پالدان بوێرن چاڤ ل وان بکەن بێی هندێ هزرا ترسەکێ بکەن، ب گشتی وی دەمی هژمارا وان گەلەك نەبوو، لێ روودانا ژ هەمیان بەرچاڤتر یا بوویە ئەگەرێ زێدەبوونا وان پشتی شەرێ ئازادیا عیراقێ و رزگارکرنا وێ بوو ژ دەستێ رژێما بەعس، ژ لایێ هێزێن هەڤپەیمان ڤە ب سەرکردایەتیا ئەمریکا، ئەڤ رووێدانە بوونە ئەگەرێ گیرۆبوونا مووچەیێن گەلەك ژ وان و هندەك ژ وان پالدان قەستا پیشەیێ پارێزەریێ بکەن، ئینا هەر زوو ل دووڤ پێشبینی یێن مە تەخمین کرین رێژەیا وان گەهشتە ۱٥-۲۰٪ ێ ژ سەرجەمێ گشتیێ پارێزەران و دبیت ژ وێ رێژەیێ زێدەتر ژی بیت، بەلکی گەلەك ژ وان پتر ژ خودانێن وی پیشەی ب خۆ ژی کار دکرن، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو ئەوێن د ناڤ رێزێن لەشکەری دا ل هەرێما کوردستانێ کار دکەن پتر حەژێکرن ل سەر ڤان هەیە، ب ئاوایەکێ گشتی، ئەڤە بوو ئەگەرێ هندێ و ژ بەر هندەك ئەگەرێن دی ژی فەرمانبەر ژی چاڤ ل وان بکەن، نە هەر ئەڤە، بەلکی هەردەمێ مە سەرەدانا فەرمانگەهەکا مەدەنی یان سازیەکا وەزارەتا ناڤخۆ کریا، فەرمانبەرێن وان گلە وگازندە ژ مە دکرن و ژ مە دپرسین کا ئەو چییە یا مە دگەل ئەفسەرێن سەربازی کری، مە وەك ئەندامێن لیژنێ ژی سۆز دداین کو یاسا دێ ل سەر هەمیان هێتە ب

جهـ ئینان ڤێجا فەرمانبەرێ سەرپێچیکەر ل کیرێ کار بکەت، یاسا سەروەرە و ئەڤەیە یا بۆ کار دکەین.

هەروەسا مە پێنج جاران سەرەدانا لایەن و سازیێا پەیوەندیدار و تایبەت ب وان ل دهۆك کر، جارا ئێکێ نەشیاین بگەهینە بەرپرسێ وێ، لێ جارا دووێ بەرپرسێ نڤیسینگەها وێ ئەم حەوالەی بەرپرسێ کارگێریێ خۆ کرین و فەرماندایێ ناڤێن هەمی هەلگرێن باوەرناما بکالۆریۆسا یاسایێ رادەستی مە بکەت، وێ بەرپرسی داخـواز ژ مە کر پشتی حەفتییەکێ جارەکا دی سەرەدانا وێ بکەین داکو ناڤێن هەمی مافپەروەران ل هەمی سازیێن سەر ب وان ڤە پێشکێشی مە بکەت، پشتی حەفتییەکێ و پشتی چەندین جاران مە پەیوەندی پێکری و پشتی چەندین پاشئێخستنێن زۆر، هەجەتا وێ چەندێ گرت کو دڤێت نڤیسارەکا فەرمی ژ سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ ئاراستەی وان بکەین، مە ژی ئەو نڤیسار ب دەست خۆ ئێخست و مە بۆ وان بر، لێ دوباره ئەم حەوالەی نڤیسینگەها بەرپرسێ گشتیێ وێ سازیێ کرین و مە هێژایێ ژێگۆتی نەدیت، لێ گەهشتینە رێڤەبەرێ نڤیسینگەها وێ، وی ژی ب ئەرێنی سۆزدا مە و پشتی نێزیکی هەیڤەکێ و سەرباری چەندین جارێن پەیوەندیکرنێ، لێ ئەم نەشیاین چ بەرسڤا ب دەست خۆ بێخین، ئینا نەچار بووین دوبـارە دەست ب پێکۆلێن خۆ بکەینەڤە و جارەکا دی لێژنا مە سەرەدانا وان بکەت داکو دیدارێ دگەل هێژایێ بەرپرس بکەت، لێ بێ مفا بوو، بەلکی ڤێ جارێ ئەم حەوالەی بەرپرسێ ژمێریاریێ کرین و مەسەلە وەکی خۆ ما، کورت وکرمانج، هەتا نڤیسینا ڤان رێزکان ژی ناڤێن مە داخواز کرین رادەستی مە نەکرینە، ئینا وەك ئەرکەکێ ل سەر ملێن خۆ، نەچار بووین ناڤێن وان یێن مە دزانین وەك ئەفسەرێن سەربازی کار دکەن بدەینە سەندیکا پارێزەران ل هەڤلێر ئەڤە ژی بۆ پشتراستبوونێ بوو کارێ راستە ئەفسەرن یان نە، داکو هەکە ئەو چەند ل سەر دیار بوو ناڤێن وان ژ لیستا سەندیکایێ بهێنە دوورئێخستن و پیشەیێ پارێزەریێ لێ بهێتە قەدەغە کرن، هژمارا وان ژی ١٤ ناڤ بوون کو ئەو ل ناڤ ناڤەندێن پارێزەران دبەرنیاس بوون و هەر ژ بەر هندێ ئەم ب وان حەسیاین، ب ڤێ چەندێ ژی ب زەحمەتترین دۆسییا ڤێ کێشەیێ هاتە چارەکرن، هەرچەندە کو هەکە لایەنێ پەیوەندیدار ب نڤیسارەکا فەرمی رادەستی مە کربا، دا ئەم ئارمانجا خۆ یا بلند یا ب جهئینانا یاسایێ ب دەستڤە ئینین، لێ مە وەك ئەندامێن لێژنا پەیوەندیدارا ڤێ دۆسیێ، مە ب ڤێ پێرابوونێ وژدانا خۆ رحەت کر.

## شەش: قۆناغا شەشێ/ لیستا شەشێ:

پشتی وێ دەنگەدەنگ و گۆتگۆتك و گڤاشتنێن د قۆناغا ئێکێ دا هاتینە رووادان هەرچەندە ئەوێن ناڤێن وان هاتینە بلندکرن هژمارەکا کێم بوو، ئەڤ قۆناغە هات و گەلەك ب ساناهیتر بوو ژ قۆناغێن دی، ئەڤ قۆناغە کورت هاتە ڤەبرین، ل شووونا ژ بەر دامەزراندنێن نوو یێن سالا ٢٠١٣ێ بۆ جارا دووێ سەرەدانا هەمی سازیان بهێتە کرن، ناڤ ل نك لێژنا بلندا دامەزراندنان هەبوون، ب ڤێ چەندێ ژی کارێ مە گەلەك ژ بەرێ ب ساناهیتر کەڤت و ئێکسەر نڤیسارەکا فەرمی ژلایێ سەندیکا پارێزەرێن هەرێمێ ڤە رادەستی لێژنا ناڤبری یا ل باژێرێ دهۆك هاتە کرن، سەرۆکێ لێژنێ و ئەوێ ئەو کار دکر هاریکارییەکا تمام کرن و ناڤێن هەمی دەرچوویێن کولیژێن یاسایێ یێن سالا ٢٠١٣ێ کو هژمارا وان ٨٢ ناڤ بوون رادەستی مەکرن، ئەڤە ژ بلی وان مافپەروەرێن ئێکسەر ب رێیا جڤاتا دادوەریێ بۆ دادگەها لێزڤرینێ یا دەڤەرا دهۆك هاتینە دامەزراندن، ئەڤە ژی ژ بەر وێ چەندێ کو دادوەری دەستهەلاتەکا خۆسەرە و دامەزراندنا وان ژی ب رێیا دەستهەلاتا دادوەریێ یە کو مەبەست ژێ جڤاتا دادوەرییا هەرێما کوردستانێ یە، ئینا سەرەدانا سەرۆکاتییا دادگەها لێزڤرینێ یا دەڤەرا دهۆك هاتە کرن و ناڤێن دامەزراندی یێن خۆ یێن سالا ٢٠١٣ێ رادەستی مە کرن کو هژمارا وان هەشت ناڤ بوون، پشتی هووربینیکرنێ د وان ناڤان دا و هەڤبەرکرنا وان دگەل ناڤێن پارێزەرێن د

خشتەیێ پارێزەرێن سالا ٢٠١٢ ێ دا هاتین، شیاین وان مەزراندییان دەستنیشان بکەین یێن هێشتا ئەندامێن سەندیکایێ بوون کو هژمارا وان ٥٠ کەس بوون، مە ژی ناڤێن وان بلند کرنە سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ داکو ناڤێن وان ژ تووما را پارێزەران بهێنە دوورئێخستن.

رۆژا ٢٠١٣/٣/٢٨ێ جڤاتا سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ د روونشتنا خۆ یا ٩٠ێ دا ب فەرمانا هژمارە ١٨٢٦ یا رۆژا ٢٠١٣/٤/٣ێ بریاردا کارێ لیژنا مە یا ل دهۆك بهێتە راگرتن داکو لیژنەیەکا دی یا گشتی هەر بۆ وێ ئارمانجێ و بۆ وێ دۆسیێ ل سەرانسەری تایێن سەندیکا پارێزەرێن دهۆك بهێتە پێك ئینان، وەسا دیارە ژی ئەڤ مەسەلە هەڤدەم بوو دگەل گەلەك نێزیکبوونا لیژنێ ژ تمامکرنا کار وئەرکێ خۆ، تشتەکێ نەیێ بەرزەیە ژی کو ئەندامێن لیژنێ هەر ژ بەر وێ ئەگەرێ ل رۆژا ٢٠١٣/١/٩ێ دەست ژ کارکێشانێن خۆ پێشکێش کربوون، لێ وی دەمی جڤاتا سەندیکا پارێزەران ب فەرمانا هژمارە ٩١٣ یا رۆژا ٢٠١٣/٢/٧ێ ئەو دەست ژکارکێشان رەت کربوون، دبیت ژی دوبارە پەیوەندیکرنا سەندیکا پارێزەران دگەل هەمی وەزارەتێن حکۆمەتا هەرێمێ ل دووڤ نڤیسارا هژمارە ١٩٨١ یا ٢٠١٣/٤/١٦ێ و پێشکێشکرنا پێشنیارەکێ بۆ دەرئێخستنا فەرمانەکێ بۆ پێکئینانا لیژنەیەکا تایبەت ل دیوانا هەر وەزارەتەکێ ژ وان وەزارەتان بۆ ب جهئینانا یاسایێ بیت دەرهەقێ هەر ئێکێ د ئێك دەم دا فەرمانبەریا گشتی و پیشەیێ پارێزەریێ دکر و نەچارکرنا وان کو پێدڤییە سەرەدانا سەندیکا پارێزەران بکەن بۆ وەرگرتنا ناسنامەیێن ئەندامەتییا خۆ د وێ سەندیکایێ دا، نڤیسار بۆ سێزدە سازیێن فەرمی یێن پەیوەندیدار هاتە ئاراستە کرن و ئەڤ نڤیسارە ل سە بنەمایێ وێ پێشنیارێ هات یا لیژنا مە ئێکسەر پێشکێشی سەندیکایێ کری، یان هەتا وی تشتێ د ناڤەرۆکا نڤیسارا دەست ژ کارکێشانێ دا هاتی کو د لیستا پاشبەندێن ڤێ گۆتارێ دا هاتییە هەڤپێچ کرن، هەکە دیوانا جڤاتا وەزیران یان وەزارەتا دارایی هەر کەسێ دهێتە دامەزراندن پێگیر کربا سەرەدانا سەندیکا پارێزەران بکەت داکو گەردەنئازاکرنێ ژ سەندیکایێ وەرگریت هەروەکی سەندیکایێ پێشنیار کری و ناسنامە و باجا خۆ یا تایبەت ب ترۆمبێلێن پارێزەران و هەر تشتەکێ دی یێ پەیوەندی ب سەندیکایێ ڤە رادەست کربان وەك مەرج بۆ دەستپێکرنا وی بۆ کارکرنێ ل فەرمانبەریا گشتی، پتریا کێشێ دا هێتە چارە کرن و ب کریار و گەلەك ب ساناهی کۆنترۆل ل سەر ڤێ دیاردا ترسناك دهاتە کرن و پێدڤی نەبوو لیژنەیێن فەرعی بۆ دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ بهێنە پێك ئینان.

ل داویێ ژی، سەرجەمێ گشتیێ وان ناڤێن بۆ سەندیکایێ هاتینە بلند کرن ٣٦٩ ناڤ بوون، لێ پشتی هووربینیکرنێ ژ لایێ سەندیکایێ ڤە، هژمارا ئەوێن ل دهۆك ناسنامەیێن وان هاتینە ڤەکێشان هەتا ب داویهاتنا ڤێ ڤەکۆلینێ گەهشتییە ٣٢٤ ناڤان ب تنێ، ئەڤە ژی ژ بەر ئەگەرێن جودا جودا، ژ وانا: هندەك ژ وان بەری هنگی ناسنامەیێن خۆ پێشکێش سەندیکا گشتی کربوون بێی هندێ لقێ دهۆك ئاگەهـ ژێ هەبیت و هندەکێن دی پشتی هەیامەکێ ڤەگەریان و دەست ژ فەرمانبەریا گشتی ڤەکێشان داکو جارەکا دی پیشەیێ پارێزەریێ بکەن، هەروەسا تێبینییەکا گرنگ ژی هەیە دڤێت ئاماژێ پێ بدەین، ئەو ژی ئەوە کو هژمارا ئەوێن ناڤێن وان ب شاشی یان ژ بێئاگەهی یان ژ ژێدەرێن نە یێن هوور هاتین هژمارا وان تنێ چوار ناڤ بوون و ئەم ب ناڤێ لیژنەیا خۆ و ب ناڤێ ژوورا پارێزەرێن دهۆك داخوازا لێبورینێ ژێ دکەین و هیڤیخوازین د مە بگەهن و د لێبۆرینا مە قەبوول بکەن، چونکی مرۆڤ هندی پێکۆلێ بکەت کارێ خۆ ب هووربینی ئەنجام بدەت، هەر دێ تووشی شاشی و بێئاگەهیان بیت، کو ئەڤە ژی تبعەتێ مرۆڤییە، ئەم مرۆڤ هۆسا نەتمام هاتینە دان و ئافراندن، ڤێجا رەوشا وان پارێزەران هاتە راستڤەکرن و ئەندامەتییا وان بۆ سەندیکا پارێزەران هاتە ڤەگەراندن، ب ڤێ چەندێ ژی داخوازێ ژ خودایێ مەزن دکەین ئەم د کارێ خۆ دا دسەرکەڤتی بین و سەرکەڤتن هەر ژ خودێ مەزنە.

## داوی چەند پێشنیارەك

ڤەکۆلینێن ئەکادیمی و زانستی وەسا راهاتینە ب کۆمەکا دەرئەنجام و راسپاردەیان ب داوی بهێن، هەرچەندە ئەم پەیڤا (راسپاردەیان) ل ڤێرە ب باش نزانین، هەروەکی مامۆستایێ مە یێ هێژا دکتۆر ئەحمەد سلێمان صەفار د پتریا گەنگەشەیێن خۆ دا بۆ نامەیێن ماستەرێ دبێژیت کو پتریا جاران راسپاردە د کۆنگرەیان دا دهێنە ب کار ئینان ژ بەرکو ئەو کۆنگرە ب راسپاردەیان ب داوی دهێن و نە د ڤەکۆلین و پەرتووکان دا، ژ بەر هندێ، باشتر دبینین ب (پێشنیار) ناڤ بکەین یێن ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە دهێنە پێشکێش کرن، هەر چەوان بیت، ژ بەرکو ئەڤ گۆتارە نە ڤەکۆلینەکا ئەکادیمییە، بەلکی گۆتار سەرهاتیێ و سەربۆرەکە خودانێ وێ تێرا بۆرییە و ب ڤێ فۆرم و ناڤەرۆکێ دۆکیۆمێنت کریە، ب ئاوایەکێ گشتی مە د ڤێ گۆتارێ دا پێگیری ب چ رێسایێن زانستی یێن هەژی گۆتنێ نەکریە، چونکی ئارمانج ژێ ئاخڤتنە دگەل ئاقلێ کۆمێ (العقل الجمعي)، نە یا ئاراستەکریە بۆ ئاقلێ دەستەیا بژارە ب تنێ، بەلکی بۆ خەلکێ ئاسایی و گشتییە، ژ بەر هندێ، مرۆڤ دبینیت چ ژێدەر بۆ ڤێ گۆتارێ نەهاتینە ب کار ئینان، بەلکی پشت ب بیردانك و سەربۆرا نڤیسەرێ گۆتارێ هاتییە گەرم کرن ، هۆسا، مە تنێ بەحسێ پێشنیارێن ل خوارێ کریە:

ئێك: باشترین چارە بۆ ڤێ کێشەیێ و هەر جۆرەکێ دی یێ گەندەلیێ، د بنەرەت دا ل سەر رۆل و کاریگەریا دەزگەهێ داواکاریا گشتی راوەستایە، هەروەسا کار کرن بۆ چالاککرنا ڤی دەزگەهی، چ پێ نەڤێت دێ بیتە ئەگەرێ ئاڤاکرنا سازیێن رۆهنکار(شەفاف) و گەلەك دوور ژ گەندەلیێ، ڤێجا رەوش هۆسایە و هەکە ئەم شیاین کەسانێن خودان شیان و باشێن وێرەك و شارەزا ژێ بگرین و ل بەرسینگێ گەندەلیێ راوەستێین، وی دەمی دشێین بێژین کو روو ب رووبوونا گەندەلیێ د بەرژەوەندیا باشیێ و دژی خرابیێ دێ یا ئێکلاکەر بیت، کو ئەڤە ژی پێدڤی ئەنجامدانا راستڤەکرنێن یاسایی یە د یاسایا داواکاری یا گشتی یا هەرێما کوردستانێ دا، لێ چ زیان نینە دەستەیا سەربەخۆییا ژ ناڤبرنا گەندەلیێ هەبیت، لێ ل وێ باوەرێ مە کو دبیت ئەڤ دەستەیە ل بن گڤاشتنێن جادێ پەیدا بوویە پتر ژ هندێ پێنگاڤەك بیت ڤەکۆلین ل سەر هاتبنە کرن، چونکی چێتر بوو دەزگەهێ داواکاریا گشتی بهێتە چالاك کرن و هەکە ئەڤە سەرنەکەڤتبا، وی دەمی ئەو پرۆژە هاتبا ڤەکۆلان، لێ هەبوونا دوو دەزگەهان بۆ چاڤدێریکرنا رەوایی یا(شەرعیەتا) یاسایان و پێرابوونێن حکۆمی و دادوەری، پتریا جاران دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا هەڤدژیا دەستهەلاتان (تعارض الصلاحيات) هەروەکی د عیراقا فیدرال دا هاتییە روودان، ل وێرێ پرنسیپێ ژێکجوداکرنێ ل ناڤبەرا هەر سێ دەستهەلاتان و پشکنەرێن گشتی یێن ل هەمی وەزارەتێن عیراقی هەیە، هەروەسا هەبوونا دەستەیا دەستپاکییا سەربەخۆییا گشتی و لیژنا پەیوەندیدارا نەهێلانا گەندەلیێ یا سەر ب جڤاتا وەزیرێن عیراقێ و دەزگەهێ چاڤدێریا دارایی و لایەن و سازیێن دی، لێ ئەو چییە ل عیراقێ دهێتە روودان ژ بلی هەڤدژیا دەستهەلاتان و مانا عیراقێ ل پێشیا دەولەتێن ژ بلندبوونا پیڤەرێن جیهانی یێن هەمی جۆرێن گەندەلیێ دنالیت.

دوو: لێ ل سەر بابەتێ ڤێ گۆتارێ کو ئەو ژی چارەکرنا دۆسییا وان کەسایە یێن د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکەن، بۆ بەردەوامیدان و گەرەنتیکرنا مانا سەرکەڤتنا ڤی کاری ب ئاوایەکێ دۆمدرێژ، پێشنیار دکەین لیژنەیەکا هەردەمی ل سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ و لیژنەیێن فەرعی ل هەر پارێزگەهەکێ بهێنە دانان کو کارێ وان بەردەوام دووڤچوونا ڤێ دۆسیێ بیت و کاری بۆ نووکرنا میکانیزمێن وەسا بکەت سەرکەڤتن د ڤێ دۆسیێ دا بەردەوام بیت، نەخاسمە ژی ل دەمێ ئەنجامدانا هەلبژارتنێن (دەوری) یێن سەندیکایێ و تایێن وێ و دەرمالەیێن هەیڤانە بۆ ئەندامێن وان لیژنەیان بهێنە ڤەبرین بۆ خەرجیێن ب ستۆیێ خۆڤە دگرن و کار وخەباتا بەردەوام دکەن، ئەڤە ژی

بۆ بەردەوامیدانا روو ب رووبوونێ بێی هندێ بێتاقەت و بێزار ببن، هەرچەندە ژی سەندیکا پارێزەرێن هەرێمێ ب مەردینی پارە و پاداشت بۆ لیژنەیێن مە یێن فەرعی ل دهۆك و زاخۆ مەزاختین، لێ مەسەلە نە تنێ خەرجیێن بەروەختن، بەلکی پێدڤی خەرجیێن بەردەستێن (نثرية) بەردەوامن.

سێ: تشتێ مە د چارچۆڤێ ڤەکۆلینا ئێکێ یا ڤێ گۆتارێ دا گۆتی، تنێ هندەك رێنمانە یێن د سەربۆرا خۆ د ڤی بیاڤی دا گەهشتیمێ و تشتەکێ مسۆگەرە ژی ئەوێ ڤێ ل ڤێ رێکێ بچیت، دێ ئاستەنگ کەڤنە د رێ دا، لێ دێ هندەك هۆ و میکانیزمێن دی بۆ چارەکرنا وان ئاستەنگان بینیت، هەروەکی دبێژن ژی (پێدڤیبوون ماکا داهێنانێ یە)، مرۆڤ چارەیێن نوو بۆ وان کێشە و گرفتاریان دبینیت یێن ل ژیواری روو ب روویێ وی دبن، لێ رێنمایێن من پێشنیار کرین، ل وێ باوەرێ مە رێنمایێن گشتی بن و دبیت هەر کەسەك بشێت کار پێ بکەت و هندەك هۆیێن نوو ژی پەیدا بکەت، چونکی هەر سەربۆرەکێ تایبەتمەندیا خۆ هەیە.

چوار: پێشنیار دکەین سەندیکا پارێزەران رێککەڤتن دگەل دیوانا جڤاتا وەزیران و وەزارەتا دارایی و ئابووری یان هەمی وەزارەتێن حکومەتا هەرێما کوردستانێ هەبیت دەمێ حکومەت خودان باوەرنامەیێن بکالۆریۆسا یاسایێ دادمەزرینیت و نڤیسارەکا فەرمی ئاراستەی سەندیکا پارێزەرێن هەرێما کوردستانێ بکەت بۆ رۆنکرنا گەردەنئازایی یا وی کەسێ پێدڤییە بێتە دامەزراندن و بۆ سەندیکایێ رابگەهینیت کو ئەو کەس هاتییە دامەزراندن، ئارمانج ژ ڤێ رێکارێ ژی دوورئێخستنا ناڤێ وی یە ژ توومارا پارێزەران و ڤەکێشانا ناسنامەیا وی و هەمی پێدڤیێن دی یێن وی یە یێن پەیوەندی ب سەندیکایێ ڤە هەین (وەکی باجا پارێزەران یا تایبەت ب ترۆمبێلان و هەر تشتەکێ دی)، ل وێ باوەرێ مە ژی ئەڤە چارەیا سەرکەڤتی بیت بۆ ڤێ کێشەیێ.

پێنج: هەروەسا پێشنیار دکەین ل هەیاما رێخۆشکەرنێ یا هەلبژارتنێن سەندیکا پارێزەران و ل دەمێ هەلبژارتنان ب خۆ ژی دەستەلاتێن لیژنەیا ژێگۆتی بهێنە بەرفرەهـ کرن، ئانکو وان دەستەلاتا هووربینیکرنێ د ناڤێن هەمی هەلبژێران دا هەبیت و هەردەمێ دیار بوو کەسەك د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دکەت رێیا وی نەهێتە دان پشکداریێ د پرۆسا دەنگدانێ دا بکەت، هەروەسا وان ب نڤیسارەکا فەرمی دەستەلات هەبیت و نەقیبێ پارێزەران باوەرێکەرەکی(معتمد) بۆ لڤاندنا سکالایەکا سزایی دژی سەرپێچیکەران راسپێریت.

شەش: ئەندامێن ڤان لیژنەیان ل سەر بنەما و پیڤەرا ب ئێکجاری دووری ژ حزباتیێ هێنە ژێگرتن و سەخلەتێن ل خوارێ ل بەرچاڤ بێنە وەرگرتن: (یێ پێگۆتی بیت ب رژدیێ د کارێ خۆبەخش و دەستپاکی و وێرەکی و پیشەکاری و بێلایەنیێ د بریاردانێ دا).

حەفت: ئەم پێشنیار دکەین و تەکەزێ ل سەر حەوالەکرنا وان کەسان بۆ دادگەهان دکەین یێن رژدیێ ل سەر سەرپێچیکرنا یاسایێ دکەن و د ئێك دەم دا پیشەیێ پارێزەریێ و فەرمانبەریا گشتی دا دکەن، نەخاسمە ژی ئەوێن ناسنامەیێن وان هاتینە ڤەکێشان، لێ جار جارە پێکۆلێ دکەن ڤەگەرێنە کریارا خۆ یا بەرێ و هندەك ژ وان سەرەدانا ڤێ دادگەهێ یان فەرمانگەهـ و سازیا هەنێ دکەن و پرۆپاگەندا وێ چەندێ دکەن کو ئەو پارێزەرن، یێن هۆسا چ دگەل مفا ناکەت ژ بلی لڤاندنا سکالایان دەرهەقێ وان و ل وێ باوەرێ مە هەکە ئەڤە دگەل وان هاتەکرن دێ بنە چام بۆ یێن دی، دێ بینی هەمی دێ ژ هێز و سەروەریا یاسایێ ترسن، گرنگ نینە ژی کییە یێ دەستپێکەریێ د ڤێ سکالایێ دا دکەت، ڤێجا چ سەندیکا پارێزەران یان داواکاریا گشتی یان هەتا فەرمانگەهێن حکومی بن یێن بۆ ڤێ چەندێ سەرەدانا وان هاتییە کرن، یان هەتا ئەو دادگەه ژی بن یێن ئەو کەس ل بەرامبەری وان ئامادە دبن و ناڤێن سەرپێچیکەران رادەستی وان هاتینەکرن، چونکی ئەگەرێ سەرەکیێ پەیدابوونا ڤێ کێشەیێ نەترسیانە ژ ب جهئینانا یاسایێ و دەستپێکەرینەکرنا

چ لایەنێن پەیوەندیدارە بۆ پێشکێشکرنا سکالایێن سزادانێ، چونکی مرۆڤ ب خۆرستێ ژی هەکە نەهێتە نەچار کرن یاسایێ ب جهـ نائینیت، هەکە نە، دێ ل بازێرێ بەرکەڤتی و بێ کێم و کاسی بین و ب ئێکجاری پێدڤی دادگە و بنگەهێن پۆلیسان و سازێن ئاسایشێ نابین، ب راستی ژی لیژنا مە شیا هندەکێن ژ سەندیکا پارێزەران هاتینە دوورئێخستن و بریکاری بۆ وان وەك پارێزەر هاتینە رێکخستن رژدیێ ل سەر کرنا پیشەیێ پارێزەریێ دکەن دەستنیشان بکەت، ئەم ژی دێ سکالایێن سزادانێ دەرهەقێ وان لڤینین داکو بگەهنە سزایێ خۆ یێ دادپەروەرانە و ببنە چام بۆ هەر ئێکێ دی یێ پێکۆلێ بکەت دروڤێ پارێزەریێ دانیتە سەر خۆ.

هەشت: پێشنیار دکەین تەئکید ل سەر کێمکرنا فێرکرنا تایبەت(ئەهلی)یا نۆکە بهێتە کرن، یان هەر چ نەبیت گرنگی ب دانانا پیڤەرێن رژد یێن فێرکرنا جۆرەیی (یا تایبەت و حکۆمی) بهێتە دان، چونکی ب راستی نۆکە تێك ئالۆزیانەك ل ناڤبەرا زانکۆیێن حکۆمی و تایبەت هەیە، هەرچەندە ژی ئەڤە تشتەکێ بڤێت نەڤێتە، لێ نابیت چاڤ ل ڤێ هژمارا زۆر یا دەرچوویێن کولیژێن یاسایێ بهێتە نقاندن، هەتا وەلێ هاتییە هەمی یاسایێ بخوونن و باوەرنامەیێن یاسایێ ب دەستڤە بینن، لێ ل ڤێرە پرسیار ئەوە، ئەرێ جڤاك ب رێیا سازێن خۆ دێ شێت ڤێ هژمارا زۆر یا دەرچوویان وەرگریت، چونکی دادگەهـ و سازێن حکۆمی و ژوورێن پارێزەران مشتی یاساناسان بووینە، هەتا وەلێ هاتینە تووشی بێکاریا ماسکدار ببین، وەسا دیار دبیت ژی کو ڤان زانکۆیان تنێ هژمارەکا زۆر یا پارێزەران پێشکێش کرین بێی هندێ گرنگی ب کوالیتیی یا وان هاتبیتە دان، هەروەسا ئەڤا مە دیارکری دروستە بۆ زانکۆیێن حکۆمی ژی بهێتە گۆتن، چونکی ل دووڤ خشتەیێ پارێزەرێن سالا ٢٠١٢ ێ یێن بازێرێ دهۆك ب تنێ دیار دبیت کو ئەوێن وێ سالێ ب تنێ ناسنامەیێن خۆ نوو کرین هژمارا وان گەهشتبوو ٩٩٩ پارێزەران، لێ پارێزگەها سلێمانیێ هژمارا وان گەهشتبوو ١٢٤٣ پارێزەران و ل هەڤلێرا پایتەخت ژی هژمارا وان ژ ٢٠٦١ پارێزەران زێدەتر بوو، ئانکو هژمارا سەرجەمێ وان گەهشتبوو ٤٣٠٢ پارێزەران ل ناڤ هەرێما کوردستانا عیراقێ، ڤێجا تۆ بێژی جڤاکێ مە پێدڤی ڤێ هژمارا زۆر یا ئاشۆپی یا پارێزەران بیت؟!

نەهـ: لەز د ب جهئینانا وێ تشتی دا بهێتە کرن یێ د یاسایا پەیمانگەها دادوەریا هەرێما کوردستانێ دا هاتی کو دڤێت پێشکێشەر خواندنا دیپلۆمێ ب رێیا پەیمانگەها دادوەریێ تمام بکەت و مەرجێن وێ یێن دەستنشانکری هەبن، پاشی مۆلەتا پیشەیێ دادوەریێ پێ بهێتە دان، هەروەسا پێدڤییە ئەندامەتییا وی د سەندیکا پارێزەران دا بهێتە راگرتن هەتا وی دەمێ دەست ب خواندنێ ل وێ پەیمانگەهێ دکەت، ئەڤە سەرباری پێگیرکرنا هەمی پارێزەرێن ئەندام و ژ هەمی پلە و جوونان کو پشکداریێ د خولێن شیاندنێ دا بکەن.

## ژێدەر

١. ئێك ژ وان یێن وەك رێڤەبەرێ هۆبا یاسایی ل فەرمانگەهەکا پارێزگەها دهۆك کار دکر، ب هەجەتا سەرەدانێن کاروبارێن یاسایی یان داکرنا(ب ژۆرئێخستنا) دادخوازێن پەیوەندی ب فەرمانگەها وی ڤە هەبن، ژ فەرمانگەها خۆ دەردکەڤت، لێ ئارمانجا وی ژ وێ دەرکەڤتنێ ب ژۆرئێخستنا دادخوازێن پێسپارتنێ(ئینتیدابێ) بوو، نەخاسمە ژی د دادخوازێن بەرامبەری دادگەها کەتن و تاوانێن سنێلان، من هویربینی د فایلان دا کر و من ناڤێ وی د هژمارەکا بریارێن وێ دادگەهێ دا دیت وەك پارێزەرێ راسپارتی(مونتەدب)، من ئەو گازی کر و ب دژواری پاشڤەبر و من گۆتێ کو دێ ناڤێ وی بلند کەمە سەندیکا گشتی و هەکە نەچار بووم، خۆ ژ پێشکێشکرنا سکالایەکا یاسزادانێ ل دژی وی نادەمە پاش، ڤێجا کەسەکێ هۆسا بینە پێش

# پارێزگای دهۆك
# بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە کتێبی کوردیدا
## ١٩٣٧- ٢٠١٦

**بەرهەڤکردن: بوار نوورەدین**

## پێشەکی

بیبلیۆگرافیا، پێویستییەکی زانستییە و کارئاسانی بۆ لێکۆڵەران دەکات، کتێبخانەی کوردیش، لەم بوارەدا هەژارە، کاتێك لێکۆڵەران بۆ دەستەبەرکردنی سەرچاوە ڕوو لە کتێبخانەکان دەکەن، ماندووبوون و کات و خەرجیی زۆریان پێویستە، تا دەستیان بە سەرچاوەکان دەگات، ئەمەش ئەو ئەرکەیە، کە بیبلیۆگرافیا جێبەجێی دەکات.

بەرهەڤکردنی بیبلیۆگرافیای گشتی و تایبەت، ئەرکێکی ئاسان نییە و چەند گرفتێکیان هەیە، کە هەندێکیان کێشەی کتێبی کوردی و کتێبخانەکانی کوردستانن، وەك: نەبوونی کتێبخانەی نیشتمانی، ئەرشیڤی تایبەت بە لایەنە کاراکانی کۆمەڵگە، نالەباریی دۆخی سیاسیی کوردستان، نەبوونی دەزگای تایبەت بە دابەشکردنی کتێبی کوردی، هەروەها لە دوای ڕاپەڕینیشەوە، هیچ ناوەندێکی حکومی و ناحکومی، بایەخی تایبەتی بە بەرهەڤکردنی (بیبلیۆگرافیا) نەداوە...هتد.

جگە لە بیبلیۆگرافیای گشتی، پێویستە بیبلیۆگرافیای تایبەتیش، بۆ زۆربەی ئەو بابەتانە هەبێت، کە لە نێو: کتێب، کۆڤار، ڕۆژنامە و تەنانەت ماڵپەڕەکانیشدا بڵاوکراونەتەوە، وەك: کەسایەتی، بۆنە و ڕووداوی مێژوویی، شار و ناوچەکان، چین و توێژەکانی کۆمەڵگە...هتد. لە بیبلیۆگرافیای تایبەتدا، بایەخ و پێگە و ڕەنگدانەوەی کرۆکی بابەتەکە، خۆی بەسەر کار و پرۆژەکەدا دەسەپێنێت.

هەواڵی (ئینسکلۆپێدیای پارێزگای دهۆك)، ناوەڕاستی حوزەیرانی ٢٠١٦، پێم زانیوە و وەك نووسەرێکی (ناوچەی سلێمانی)یش، خۆشحاڵ بووم بەشداری تێدا بکەم، لەبەر ئەمە پەیوەندیم بە (د.زرار سدیق)ـەوە کردووە و ئەویش (م.موسەدەق تۆڤی) پێ ناساندووم، دوای ئاگادارکردنەوەیان لە ئاست و توانای هاوکاریکردنم بۆ ئینسکلۆپیدیاکە، پەسەندیان کردووە.

سوپاسی زۆرم بۆ مامۆستایان: موسەدەق تۆڤی و خالید ساڵح، کە ئەم سێ بیبلیۆگرافیایەیان فراوانتر کردووە و کۆمەڵێك کتێبیان خستووەتەسەر، کە هەندێکیان بەرچاومان نەکەوتوون و بواردوومانن، هەندێکیشیان کتێبی دوای سنووری بیبلیۆگرافیاکانی ئێمە بوون، واتە کتێبی دوای ساڵی ٢٠١٠، بۆ بیبلیۆگرافیای یەکەم و دووەم، هەروەها کتێبی دوای ساڵی ٢٠٠٤، بۆ بیبلیۆگرافیای سێیەم.

## ئەم بیبلیۆگرافیایە

تەوەرەی یەکەم و دووەمی ئەم هەوڵە، لە پرۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠، چاپی یەکەم، تاران، ٢٠١٦) وەرگیراوە، کە ١٢ بەرگ و ٥٠٢٦ لاپەڕەیە. تەوەرەی سێیەمیش، لە کتێبی (بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆریی کوردی ١٨٦٠- ٢٠٠٤، پێشەکی و پێداچوونەوە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، بڵوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٤) وەرگیراوە، کە لە ساڵی ٢٠٠٦ـەوە کارم لەسەر ئەمەیان کردووە.

بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیایە، پێویستە زانیاری لەسەر هەر دوو پرۆژەکە هەبێت، چونکە بۆ ئاگاداریی و خوێندنەوەی پێشەکییەکانیان، هەست بە ناتەواوی ئەم سێ بیبلیۆگرافیایە دەکرێت.

ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتە، نەدەکرا هەموو ئەو بابەتانەی تێدا کۆبکرێتەوە، کە پەیوەندییان بە ناوچەکانی پارێزگای دهۆکەوە هەیە، وەك: هەندێ لایەنی مێژوویی و بە تایبەت مێژووی (پارتی دیموکراتی کوردستان) و هەندێ لە سەرکردە کەسایەتییەکانی، هەروەها (ئێزدییەکان)...هتد، تەنها هەندێ کتێب دانراون، کە چەند بابەتێکیان گشتی بوون و پەیوەندییان بە پارێزگای دهۆکەوە هەبووە. ئەگەر خوای گەورە هاوکارمان بێ، بیبلیۆگرافیای تایبەت بۆ ئەوانیش ئامادە دەکەین.

## کورتکراوەکان

چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم

چ: چاپخانە/ ش: شوێن/ ژس: ژمارەی سپاردن/ س: ساڵ/ ل: لاپەڕە

ق: قەوارە (بە سانتیمەتر و (پانی)ی پێش (درێژی)ی نووسراوە)

چاپخانە:

و- وەزارەت/ ز- زانکۆ/ ك- کۆلێژ

کۆڕ...: کۆڕی زانیاریی عێراق و کۆڕی زانیاریی کورد



